**پێناسەی کتێب**


**ناوی کتێب،** سوودەکانی شەڕ

**ناوی نووسەر،** ئاری بن مۆناشێ

**وەرگێڕانی بۆ فارسی،** د. مسعود انصاریان

**وەرگێڕانی بۆ کوردی،** عەبدوڵڵا حەسەنزادە

**دیزاینی بەرگ و ناوەوە،** ئەییوب شەهابیڕاد

**تایپ،** وەرگێڕ

**هەڵەبڕی،** مستەفا مەعرووفی

**پێداچوونەوە،** عەلی بداغی

**نۆرەی چاپ،** چاپی دووهەم - ٢٠٢١

**تیراژ،** ١٠٠٠ دانە

**نرخ،** ٩٠٠٠

## ئەمەگناسی

پاش بڵاوبوونەوەی چاپی یەکەمی ئەم کتێبە خوێنەری وردبین و برای شیرینم کاک کەماڵی حەسەنپوور ریزە تێبینییەکی زۆر جوانی لەسەر وەرگێڕانەکە بۆ ناردبووم کە بە خۆشی و شانازییەوە هەموویانم لە چاپی دووەمدا گونجاندوون. زۆر سوپاسی کاک کەماڵ دەکەم و ئاواتمە خوێنەری وامان زۆر بن و کۆمەک بکەن کتێبی کوردی چەندی بکرێ خاوێنتر و بێ کەموکوڕیتر بڵاو بێتەوە.

عبدالله حسنزادە

٣٠/٦/٢٠٢١

# پێرست:

# پێش‌وتاری (مترجم فارسی)

وتارەکانی ئەم کتێبە بەشێک لە ڕووداوە مێژوویی‌یە بەئازارەکانی ساڵانی ۱۹۸۰ی ئێران دەگێڕنەوە. ئەم کتێبە یەکێک لە بەڵگە ڕوون و ئاشکراکانی خەیانەتی بەرچاوی کاربەدەستانی حکوومەتی ئاخوندیی ئێران دەرهەقی گەل و وڵاتی ئێرانە.

ئاخوندە ئێرانییەکان هەر لە یەکەمین ڕۆژەکانەوە کە بە فێڵ و دەغەڵکاری پاڵیان وە کورسیی دەسەڵات دا، ڕایانگەیاند کە سیاسەتی دەرەوەیان -خۆیان گوتەنی- خەبات دژی ئەمریکای جیهانخۆر (شەیتانی گەورە)، و ئازادیی سەرزەمینی قودس (فەلەستین) لە نیری ئیسرائیلە. بەڵام وتارەکانی ئەم کتێبە دەمامک لە ڕوخساری ڕیاکارانە و فێڵبازانە و گەندەڵیی کاربەدەستانی حکوومەتی ئاخوندی دادەماڵن و بە ڕوونی نیشان دەدەن کە مەلاکانی حکوومەتی ئاخوندیی ئێران، بۆ بەرپەرچدانەوەی هێرشی عێراق بایی ۸۰ میلیارد دۆلار چەک-وچۆڵەیان لە ئیسرائیل کڕیوە و بەشێکی گرنگی ئەو دراوەشیان بە قازانجی خۆیان پاشقول داوە و خستوویانەتە حیسابی خۆیان لە بانکەکانی دەرەوەی وڵات. بۆنموونە، دووەمین جار کە وەرگێڕی ئەم کتێبە لەلایەن «ئەنجومەنی بیریارانی ئێرانی»یەوە دارایی نەغدیی مەلاکان لە بانکەکانی دەرەوەی لە تەلەڤزیۆنە ئێرانییەکانی ناوچەی واشینگتۆن دی سی دا لەقاو دا، دارایی تەنیا سێ کەس لەوان بەم-جۆرە بووە:

دارایی عەلی‌ئەکبەری هاشمیی ڕەفسەنجانی لە «یۆنیۆن دو بانک»ی سویس،لقی ژێنێف ۳۸۳\۳ میلیۆن فرانکی فەڕانسە، ژمارەی ڕەمزەکەی ۲۲\٦٤\۱۸۳، لە بانکی «سۆسیتە ژەنراڵ» لقی زووریخ ۳٤٦\۷ میلیۆن دۆلار، ژمارەی ڕەمز ۳۰۰\٦٤\۱۸۳...، لە بانکی «شپار گاسە» لقی سیبوورگی ئەڵمان ۲۸۹\۹ میلیۆن مارک، ژمارەی

ڕەمز٣٩٥٧..١٤٢١، لە «کریدیت بانک»ی سویس لقی لۆزان، ٤٣٨ میلیۆن فرانک، ژمارەی ڕەمز١٢٧..١٢٧٣\٣٢٣.

دارایی سەید عەلیی خامەنەیی لە «کریدیت بانک»ی سویس لقی ژنێڤ`٢٦٦ میلیۆن دۆلار، ژمارەی ڕەمز ٧٨٢ -B.C.p، لە بانکی «سۆسیتە ژەنڕاڵ»، ٥٢٤ میلیۆن دۆلار، ژمارەی ڕەمز ٨٣٣-٢٣-٥٠٠پ.

دارایی ئەحمەدی خومەینی لە بانکی «سۆسیتە ژەنڕاڵ» ٤٣٥ میلیۆن دۆلار، ژمارەی ڕەمز ١٣٢١\٧٣٢..١٥٠٠، لە «دریسدنا بانک» لقی دوسلدۆرفی ئەڵمان، ١٦٧\١٤ میلیۆن مارک، ژمارەی ڕەمز ٨١٤٥٣١\٧٣٢، لە بانکی «شپار گاسە» لقی فرانکفۆرتی ئەڵمان ١٤٨ میلیۆن مارک، ژمارەی ڕەمز ٧٥٦٢-٧٠٠-٢٢.

نووسەری ئەم کتێبە بە ڕوونی ئاشکرای دەکا کە بۆخۆی لەلایەن دەوڵەتی ئیسرائیلەوە ڕاسپێردراوە بۆ وەرگرتن و دانی تەنیا ٥٢ میلیۆن دۆلار بە مەلاکان بۆ ئازادکردنی بارمتە ئەمریکاییەکان. هەروەها بە ڕوونی باس دەکا، بڕێکی زۆر لەو هەشتا ملیارد دۆلارەی بۆ کڕینی چەکوچۆڵە خەرج کراوە، وەک بەرتیل دراوە بە ئاخوندەکان. بێجگە لەو چەکوچۆڵەیە کە بەشی زۆری کۆنە و لەکارکەوتوو بووە، لە چوار قوژبنی دنیا چەکوچۆڵە کڕراوە و وەک نووسەری کتێبەکە دەڵێ بە نرخێکی خەیاڵی بە حکوومەتی کۆماری ئیسلامی فرۆشراوە، بەجۆرێک کە ڕێکخراوە هەواڵگرییەکانی ولاتانی ئەمریکا و ئیسرائیل پاش ئەو هەموو خەرجە بێجێیە کە لە سوودی کڕین و فرۆشتنی ئەو چەکوچۆڵەیە کردوویانە، هێشتا هەرکامێکیان ٧٥٠ میلیۆن دۆلار پاشەکەوتیان لە حیسابە نهێنییەکانی خۆیاندا هەیە.

لە نێو ٢٤ کتێبدا کە تائێستا بە زمانەکانی فارسی و ئینگلیزی نووسیومن، ئەمە سێیەمین کتێبە کە وەریدەگێڕمە سەر زمانی فارسی. ئەمن لەبەر ئەم چەند هۆیەی خوارەوە بڕیارم داوە ئەم کتێبە بکەمە فارسی:

وتارەکانی ئەم کتێبە پەردە لەسەر بەشێکی گرنگ لە پێوەندییە نهێنییەکانی مەلاکان بەتایبەتی دەگەڵ ولاتانی ئەمریکا و ئیسرائیل لا دەدەن و ئەو ڕووداوە سیاسییانەی ١٥ساڵی ڕابردووی ولاتەکەمان کە تا ئێستا لە هیچکام لەو کتێبانەدا کە لەبارەی ئێرانەوە چاپ کراون باسیان نەکراوە، ئاشکرا دەکەن.

نووسەری ئەم کتێبە کە ڕاوێژکاری هەواڵگریی سەرۆکوەزیری ئیسرائیل بووە، بۆخۆی لەلایەن ئیسرائیلەوە بەرەسمی بەرپرسی جێبەجێکردنی ئەو ڕووداوانە بووە کە لەم کتێبەدا باسی کردوون.

لەو دیدارانەدا کە بۆخۆم لە واشینگتۆن دی سی دەگەڵ نووسەری ئەم کتێبە (بەڕێز ئاری بن مۆناشی)م هەبوون، ڕاستوێژی و ئاکاری دروستی زۆریان کار تێکردم. بەتایبەتی پێویستە ئاماژە بەوە بکەم کە بەڕێز Kevin Keating کە لە لایەن کۆمپانیای K Video وە بە سەفەر بۆ ولاتانی جۆراوجۆر خەریکی وتوویژ و فیلمگرتن لە بەشێکی سەرۆک و کەسایەتییە گرنگە نێونەتەوەیی‌یەکانە لەبارەی ئەو ڕووداوانەوە کە لەم کتێبەدا باس کراون، بە منی گوت کە ئەو دەگەڵ زۆر سەرۆک و کەسایەتیی نێونەتەوەیی قسەی کردوە و هەموویان قسەکانی نووسەری ئەم کتێبەیان پشتڕاست کردۆتەوە.

هەروەها دەبێ بڵێم کە ئاری بن مۆناشیش وەک بێرتراند ڕاسێل فیلسووفی سەدەی بیستەم ناوی دەرکردوە و ژیاننامەی ئەو یەکێک لەو دوو کتێبەیە کە پێشتر کردوومنە فارسی، تەنانەت وەختێک باسی کردەوە و ڕەفتاری دۆستانی خۆشی دەکا، بە ڕاستوێژییەکی شیاوی ستایشەوە خۆ لە باسی ڕەفتار و کردەوەی گەندەڵکارانەیان نادزێتەوە و هەروەک بێرتراند ڕاسێلیش هەموو کار و کردەوەی باش و خەراپی خۆی و پێوەندییە جۆراوجۆرەکانی دەگەڵ خەڵکی دیکە بە ڕاستوێژییەکی شیاوی ستایشەوە باس دەکا.

وتارەکانی ئەم کتێبە جیهانبینییەکی تایبەتی دەدا بە خوێنەر و ڕوونبینییەکی زیندوو لە کردەوە و دژکردەوە سیاسییە جیهانییەکان

و نەخشــی نادیــار و سەرســوڕهێنی ڕێکخــراوە هەواڵگرییــەکان لــە دروستکردنی ڕووداوە سەیرە نێونەتەوەیی‌یەکاندا دەدا بە خوێنەر. بابەتــەکانی ئــەم کتێبــە نیشــان دەدەن کــە ڕێکخــراوە هــەواڵگری و جاسووسییەکانی وڵاتانی دنیا بە زەبری دراو و تەکنۆلۆژی دوژمنانی خۆیان بێ‌ئەوەی هەستی پێ‌بکەن دەخەنە خزمەتی ئامانجە سیاسی و جاسوۆسییەکانی خۆیانەوە و بە دەستی داوخوازانەی ئەوان خوێنی دژبــەران و ناحــەزانی خۆیــان -لەهــەر کــوێی جیهــان بــن- دەکەنــە قوربانیی قازانجە نیشتمانییەکانی خۆیان.

نێوەرۆکی ئەم کتێبە داستانی تاڵی کۆمەڵێک تەڵەکەبازی بە ڕواڵەت مەزهەبییە کە شمشێریان لەبن عەبای مەزهـەبیی خۆیاندا شاردۆتەوە و بۆ دابینکردنی قازانجە تاکەکەسی و چینایەتییەکانی خۆیان، دەبنە داردەستی بێگانــان و بــە چــەکی هەڵخەڵــەتێنی مەزهــەب، نەتەوەیــەکی پێشــڕەو دەگەڕێننــەوە قــووڵایی نــەزانی و دواکــەوتوویی ســەدەکانی پێشتر و فڕێی دەدەنە نێو تاریکستانی هەژاری و نەداری و بێبەشی.

«ســانتایانا» فیلسووفی (ئـەمریکایی) بـە ڕەگـەز ئیسـپانیایی دەڵـێ: «ئەوانــەی لــە مێــژووی ڕابــردووی خۆیــان بــێ‌ئاگــا دەمێننــەوە، مەحکوومن بەوەی دووپاتەی بکەنەوە». ئەمن وەرگێڕانی ئەم کتێبە کە دەرخەری بەشێکی زۆرکەم لە خەیانەت و ستەمی دینیی مەلاکان بە مێژووی نیشتمان و خەڵک و وڵاتە خۆشەویستەکەمانە، پێشکەشی هاونیشــتمانە بــەڕێزەکان دەکــەم، بــەو ئاواتــە کــە ئەنــدازیاران و بنیاتنــەرانی ئێرانــی ئــازادی ســبەینێ ڕێگــا نــەدەن، تەنانــەت لــەو حکوومەتــە لاییــک و ئازادانــەش‌دا کــە دواڕۆژ لــە وڵاتەکەمانــدا وەدی دێـن، چینـی مفتـەخۆری مـەلا ببنـە مووچـەخۆری سـامانی نیشـتمانیی ئێمە و ئازادیی ئێمە لە فەتای بوونی خائین و پاشکەوتووی ئەم تاقمە حیلەبازە بپارێزن.

دوکتۆر مەسعوودی ئەنساری

(واشینگتۆن دی سی) سێپتامبری ۱۹۹۳

# سەرەتا

بەیانییەکی زووی ڕۆژێکی بەهاری ١٩٩٠ (١٣٦٩) ئەمن لە بەندیخانەی ناوەندیی شاری نیویۆرک لەسەر تەختەکەم ڕاکشابووم، مێشکم ئاڵۆز بوو و خەوم لێنەدەکەوت. چاوم بڕیبووە میچی زۆر چکۆڵەی ژوورەکەم، شۆقی چرا فلۆرسەنتەکە لە چاوانمدا ڕەنگی دەدایەوە، بەڵام چاوە بێجووڵەکانی من کاریان لەو نەدەکرد. هێندێ جاریش چاوێکم بە کەلوپەلی خەمهێنەری ژوورەکەمدا کە بریتی بوون لە دەستشۆرێک و ئاودەستێک و دوو کۆمۆد (دۆلاب)ی کانزایی، دەخشاند.

ئەمە یەکێک لە بەندیخانە فیدراڵەکانی ئەمریکایە کە ئێستا ببووە شوێنی ژیان و دانیشتنی من. دیارە زیندانێکی زۆر سامناکیش نەبوو. لەم زیندانە خەبەرێک لە تاوانکارانی پیاوکوژ و زیناکارانی بەزۆر نەبوو. دراوسێ سپیپێستە زیندانییەکانم کە لەچاو زیندانییە ڕەش-پێست و ئیسپانیاییەکان لە پلەیەکی بەرزتردا بوون، زۆربەیان تاوانبارانی سپیپێستی یەخەسپی (مووچەخۆر) بوون. «جان گۆتی»

John Gotti، ڕێبەری ڕێکخراوی مافیا پێشتر بۆ ماوەیەک لێرە زیندانی بووە و بە زەمانەت (کەفالەت) ئازاد کراوە. (ئەو لە دادگادا بێ‌تاوان ناسرا، بەڵام دواتر گەڕێندرایەوە بەندیخانە). «عەدنان کاشۆقی» Adnan Kashoggi چەند شەوێکی لەم زیندانەدا بەسەر بردوە و «جۆ دۆهێرتی» Joe Doherty شۆرشگێڕی ئیرلەندی، لە هەموو ئەو ماوەیەدا کە ئەمن زیندانی بووم، ئەویش لێرە زیندانی بوو.

هەلومەرجی بەندیخانە زۆریش سامناک نەبوو و هیچ وەک زیندانی «ئێل ڕێنۆ»ی ئەیالەتی ئۆکلاهوما -کە وەختێک منیان لە ناوچەیەکی ئەمریکاوە دەبردە ناوچەیەکی دیکە لەوێ مابوومەوە- نەدەچوو. حەشیمەتی زیندانیش زۆر نەبوو، زەنازەنای بێزارکەر نەدەهاتە بەر گوێ و فەرمانبەرانی زیندان وەک فەرمانبەرانی زۆر بەندیخانەی شار و ئەیالەتەکان ڕەفتاری دڕندانەیان بەرامبەر زیندانییەکان بەکار نەدەهێنا. ئەم زیندانە فیدڕاڵە تا ڕادەیەکی زۆر وەک هۆتێلە هەرزانە پلە سێیەکان دەچوو، بەو جیاوازییە گرنگەوە کە مرۆڤ نەیدەتوانی لێی‌بچێتە دەر.

لەسەر نهۆمی بنەوەی قەرەوێڵەکەی من «نیک لانتە» Nick Lante کە دواتر بە تاوانی فرۆشتنی هێرۆئین لە «پاکەتی پیتزا»دا مەحکووم بوو، خەوتبوو و پرخەی دەهات. چارەنووسی من بۆچی هاتە ئێرە؟ بۆچی چارەنووس ژیانی منی دەگەڵ ئەم پیاوە لەم زیندانەدا لێک گرێ دا؟ بۆچی تووشی ئەم ڕۆژە هاتم؟

ڕووداوەکانی چەند مانگی ڕابردوو وەک بریسکە بەبەر چاومدا تێپەڕین. پاییزی ساڵی ١٩٨٩ ئەمن لەوپەڕی سەرکەوتندا بووم - لاوێکی ٣٧ساڵەی خەڵکی ئیسرائیل کە خاوەنی هاوسەرێکی جوان، کارێکی ئابڕوومەندانە لە دەفتەری سەرۆکوەزیری و بڕێکی باش دراو لە بانک بووم و وڵاتی ئوسترالیا بۆ بەسەربردنی دوو حەوتوو مۆڵەتی پشوو چاوەڕێم بوو. پاشان ڕۆژێک گیرام و بە تۆمەتێکی

ناڕاست کە گۆیا ویستوومە سێ فڕۆکەی گوازتنەوەی .C-13 بە ئێران بفرۆشم لە لۆس‌ئەنجلێس کەوتمە زیندان.

دیارە ئەمن ماوەیەک بوو چاوەڕێ بووم هەرکاتێک بێ لە ئوسترالیا، ئیسرائیل یان ئەمریکا تووشی ڕووداوێک بم. ئەمن نەمدەتوانی جۆر و سروشتی ئەو ڕووداوە پێش‌بینی بکەم، بەڵام لەوکاتەوە کە «ئەمیرام نیر» Amiram Nirی دۆستم نۆڤەمبەری ساڵی ١٩٨٨ واتە دوو ساڵ پاش ئەوەی دەرکەوتبوو ئەو دەستی لە مەسەلەی ئێران-کۆنتڕادا هەبووە، لە ڕووداوێکی گوماناویی فڕۆکەدا گیانی لەدەست دابوو، هەمیشە نیگەران بووم.

ئێستاش چاوەڕوانییەکەم وەدی هاتبوو - تۆمەتی کڕین و فرۆشتنی چەک‌وچۆڵە. دەبێ پێ لەوە بنێم کە ئەم بابەتە تاڕادەیەکیش دەبووە هۆی ئەوەی خەیاڵم تەخت بێ. چونکە بە کەوتنەزیندان هەرنەبێ لە مەترسیی مردن ڕزگار ببووم. کەس نەیدەتوانی لە بەندیخانەیەک کە لەژێر چاوەدێریی ئەمریکادا بوو بمکوژێ.

بەڵام لەلایەکی دیکەوە، ئەو ناهەقییەی لێم کرابوو، قورسایی دەخستە سەر مێشکم و بەتوندی ئازاری دەدام. ئەمن لەڕاستیدا ببوومە نیشانەی تیری حکوومەتەکانی ئەمریکا و ئیسرائیل. ڕەفتاری ئەمریکاییەکان بەدژی من پاساوهەڵگر بوو. ئەمن زانیارییەکی زۆرم لەسەر مامەڵەی چەک‌وچۆڵەی ڕێکخراوی CIA دەگەڵ ئێران و عێراق هەبوو. لەڕاستیدا ئەمن هەڕەشەم کردبوو کە ئەگەر CIA فرۆشتنی چەکی شیمیایی بە سەددام حوسێن، سەرکۆماری عێراق، ڕانەگرێ، مەسەلەکە لەقاو دەدەم و دەیخەمە بەر چاوی هەمووان. سروشتییشە کە ئەمریکاییەکان حەزیان لە کارێکی وا نەبوو.

بەڵام تێگەیشتنی ئەوە کە ئیسرائیلییەکان، واتە نەتەوە و حکوومەتی خۆم کە تەواوی تەمەنم لە ڕێگای خزمەت بەواندا گوزەراندبوو، لەدژی من ڕاست ببوونەوە، بۆ من کارێکی ئاسان نەبوو.

ئەمن خزمـەتی دەوڵـەتیم وەک فەرمانبـەری دۆزینـەوەی ڕەمزەکانی پێوەنـدیی نهێنـی لـە بەشـی ئێـران لـەمـاوەی سـێ سـاڵ خزمـەتی سـەربازیدا لـە سـاڵی ١٩٧٤ تـا ١٩٧٧ دەسـت پێکردبـوو، دواتـر وەک فەرمانبـەرێکی ناسـەربازی بۆ مـاوەی دە سـاڵ خزمـەتی دەوڵـەتیم لـە بەشـی هـەواڵگریی سـوپا لـە ئیـدارەی پێوەندییـەکانی دەرەوەدا کـە ڕێکخراوێکی زۆر سەنگین بوو درێژە پێدابوو و لە ساڵی ١٩٨٠وە لـە کۆمیتـەی هاوبەشـی پێوەندییـەکانی ئێـران و ئیسرائیلیشـدا کـارم کردبوو. سـەرەنجام، وەک ڕاوێژکاری تایبـەتیی هـەواڵگریی سـەرۆک-وەزیـر ئیسـحاق شـامیر، مـاوەی دوو سـاڵ وەک نوێنـەرێکی گـەڕۆکی سیاسـی ڕاسـتەوخۆ لـەژێر چـاوەدێریی سـەرۆکوەزیـردا ببوومـە فەرمانبەری چارەسەری مەسەلە و گیروگرفتە سیاسییەکان.

هـەر ئـەو خزمەتـە نهێنییانـەم بـە ئیسـرائیل ئێسـتا ببوونـە هـۆی زینـدانیکـرانم. کاتێـک پێوەندییـە جۆراوجۆرەکـانی ئیسـحاق شـامیر دەگـەڵ PLO «ڕێکخـراوی ئـازادیخوازی فەلەسـتین» لـەقاو دران و بوونـە هـۆی نیگـەرانیی حکوومـەتی ئیسـرائیل، دەبـوو کەسـێک لـەو داستانەدا ببێتە قوربانی. ئەو کەسە ئەمن بووم.

بـەمجۆرە چارەنووسـی مـن کێشـرایە ئـەم زیندانـە و ئـەم قەرەوێلـە کـانزاییـیە. بـەو فکرانـەوە چـاوم بڕیبـووە فلۆرسـەنتەکە و خـەوم لـێ-نەدەکەوت. ئەمن بەو بڕوایەوە کە خزمەتەکانم بۆ زیندووومانی وڵاتـی ئیسـرائیل و نەتـەوەی جوولەکـە زۆر گـرنگن، خزمەتـەکانم دابوونـە دەسـتی حکوومـەتی ئیسـرائیل. بـەڵام ئێسـتا کەوتبوومـە زینـدان، چارەنووسـم کـەوتبووە مەترسـییەوە و هـیچ کـەس ئامـادە نـەبوو یارمەتییەکم بدا. هەرکات خاوەنکارەکانم پێویستییان پێم بوو ئەمن لە خزمەتیاندا بـووم، بـەڵام کاتێک ئـەمن پێویسـتیم بـەوان هـەبوو، ئـەوان پشتیان تێکردم. ئیسحاق شامیر سەرۆکوەزیری ئیسرائیل کە ئـەمن زۆرم ڕێز بۆی هەبوو و لـە دەیـەی ١٩٤٠ڕا لەگـەڵ بـاوکم ئاشنا بـوو،

دەستی لە گرفتارییەکەی مندا هەبوو. پاش زیندانیکرانم، دوو پارێزەر (وەکیل) لەلایەن حکوومەتی ئیسرائیلەوە هاتبوونە سەردانم و داوایان لێکردبووم پێ لە تاوانەکانم بنێم، بەرامبەر بەو تۆمەتانە کە - درابوونە پاڵم بێدەنگ بم، شوێنێک بۆ ژیانی خۆم لە جیهاندا هەڵ- بژێرم و بە بێناوی درێژە بە ژیانی خۆم بدەم. ئەمن سەرپێچیم لە قبووڵی ئەو پێشنیارە کردبوو و ئێستا حکوومەتی ئیسرائیل بە ئاشکرا حاشای لەوە دەکرد کە ئەمن هەرگیز کارم بۆی کردبێ.

ئەمن ئەو هەڵوێستەی حکوومەتی ئیسرائیل بەرامبەر بەخۆمم بە چاوەڕواننەکراو نەدەزانی، بەڵام چاوەڕوانیی کۆمەگ و پشتیوانیم لەوکەسانە هەبوو کە کارم لەگەڵ کردبوون و خۆشمدەویستن. دیارە ڕێگای وا هەبوون کە ئەوان بتوانن بێئەوەی ژیان و پێگەی دەوڵەتیی خۆیان بخەنە مەترسییەوە بێنە یارمەتیم، بەڵام هیچکام لەوان لەوبارەیەوە کارێکیان نەکرد. هەموو ئەمانە تەنانەت حاشایان لەوە کرد کە بشمناسن.

هاوسەرەکەی خۆم لە ئیسرائیلەوە بە تەلەفون پێیگوتم کە ناتوانێ هیچ کارێکم بۆ بکا. ئەو تەنانەت لە هاتن بۆ نیویۆرکیش خۆی پاراست. خوشکەکانیشم لەترسان خۆیان لە پێوەندی و وتووێژ لەگەڵ من پاراست. هەموو دۆست و ئاشناکانم جگە لە دایکم کە لەلایەن حکوومەتی ئیسرائیلەوە هەڕەشەی لێکرابوو، خۆیان لە من دوور گرتبوو. ئەمن هەرگیز لە ژیانمدا ئەوەندە هەستم بە تەنیایی نەکردبوو.

ئەو ڕێگایانە کە دەمتوانی بۆ دواڕۆژی خۆم هەڵیانبژێرم ئەمانە بوون:

دەمتوانی سەر بۆ ئەو پێشنیارانە دانوێنم کە پارێزەرە ئیسرائیلییەکان پێیان کردبووم – بەرامبەر بە تۆمەتەکانم بێدەنگ بم، پێ لە گوناحی خۆم بنێم، لەگەڵ داواکاری گشتیی دادگا ڕێککەوم،

خۆم بێقەدر و ئابڕوو بکەم، دراوێکی یەکجار زۆر لە حکوومەتی ئیسرائیل وەرگرم،و بە بێدەنگی لە قوژبنێکی ئەم جیهانە درێژە بە ژیانم بدەم.

ڕێگای دووەم ئەوە بوو کە حاشا لە هەموو گوناحێک بکەم، بەڵام لەبارەی ئەسڵی ڕووداوەکانەوە هیچ نەڵێم و چاوەڕێ بم بزانم تا زەمانی دادگاییکردنم ئەم کارە چ‌ئاکامێکی دەبێ.

ڕێگایەکی دیکەم ئەوە بوو کە ئەوەی بەسەرم هاتبوو بەئاشکرایی بدەمە میدیاکان، حاشا لە هەر کردەوەیەکی خیلاف بکەم، مل بۆ دادگاییکردن ڕاکێشم و بۆ بەرگری لە خۆم وردەکاریی ڕووداوەکان ئاشکرا بکەم و بڵێم کە بە نوێنەرایەتیی حکوومەتی ئیسرائیل و بەفەرمانی ئەو بە میلیارد دۆلار چەک و تەقەمەنیم بە حکوومەتی کۆماری ئیسلامی فرۆشتوە و لەڕاستیدا ئەوەی کردوومە بە ئاگاداری و هاوکاریی تەواوی حکوومەتی ئەمریکا بووە.

بۆ هەڵبژاردنی یەکێک لەو سێ ڕێگایەی باسم کردن زۆرم بیر کردەوە و وام هاتە بەر چاو کە هەڵبژاردنی ڕێگای یەکەم لە هەموان ئاسانترە. چونکە بە هەڵبژاردنی ڕێگای یەکەم دەمتوانی بچمەوە وڵاتی خۆم، زەماوەندەکەم بکەم، هیچنەبێ کچەکەم ببینم، لەوانە بوو کارێکی شیاو و ئابڕوومەندانە بۆخۆم پەیدا بکەم و بەو دراوە کە هەمبوو ژیانێکی ئاسوودە بگوزەرێنم. بەڵام لەوحاڵەدا دەبوو پێ لە تاوانێک بنێم کە هەرگیز نەمکردبوو، لەئاکامدا کەسایەتی و بایەخی مرۆیی من بۆ هەتاهەتایە لەبەین دەچوو. لە هەمووی خەراپتر ئەوە بوو کە بیرەوەریی چارەنووسی شوومی «ئەمیرام نیر» لە قووڵایی مێشکمدا جێی خۆی کردبۆوە. ڕێی تێدەچوو ئەمنیش وەک ئەو لەو یەکدوو ساڵەدا بکوژرێم بۆئەوەی بە یەکجاری دەنگم ببڕێ و ئیمکانی دروستکردنی هەر جۆرە مەترسییەک لەلایەن منەوە بۆ حکوومەتی

ئیسڕائیل بە لەقاودانی ئەو هەموو نهێنییە کە لە سینەمدا کەڵەکە ببوو، لەبەین بچێ.

هەڵبژاردنی ڕێگای دووەم لە ڕاستیدا هیچ بەهرە و ئومێدێکی بۆ من تێدا نەبوو. جگەلەوەش لە ژیان لەنێوان ترس و هیوادا بێزار و ماندوو ببووم.

بەڵام لەبارەی هەڵبژاردنی ڕێگای سێیەمەوە، ئاشکرایە کە بەپێی ڕێوشوێن و بڕیارە ڕەسمییەکانی وڵاتی ئیسرائیل ئەمن سوێندێکم خواردبوو کە ڕێگای ئاشکراکردنی نهێنییەکانی کارەکەمی پێنەدەدام. بەڵام چونکە لەم کاتەدا ئەمن لەلایەن حکوومەتی ئیسرائیلەوە کرابوومە ئامانج و ئەو حکوومەتە منی دەرکردبوو، ئیدی خۆم پابەند بە لەبەرچاوگرتنی ئەو بڕیار و ڕێوشوێنانە کە لەنێوان من و خاوەن-کارەکانی پێشوومدا هەبوون، نەدەزانی. ئیدی هەموو ئەو هەلومەرجە لەبەین چووبوو. ئەگەر ئەمن دەستم بە لەقاودان کردبا، مانای ئەوە بوو کە هەرگیز چاوم بە ئیسرائیل ناکەوێتەوە و دەبێ بۆ هەمیشە لە دیتنی کچەکەم بێبەش بم. لەوانە بوو پاسپۆرتەکەم بەتاڵ بکرێتەوە و کارپەیداکردنم بۆ دژوار ببێ. بەوحاڵە هەڵبژاردنی ئەم ڕێگایەم زۆر پێ ڕاست و کردەنی بوو، چونکی ڕێگای مەرگ و لەنێوچوونمی دادەخست. هەمیشە کوشتنی کەسانێک کە خاوەنی پلەی بەرزی کۆمەڵایەتین دژوارتر لە کوشتنی خەڵکی ئاسایییە. کاتێک ئەتۆ شتێک دەڵێی کە حکوومەت نایەوێ کەس باوەڕی پێبکا کوشتنت دەبێتە هۆی ئەوەی خەڵک زۆرتر باوەڕ بە قسەکانت بکەن.

لەلایەکی دیکەش، ڕەفتاری حکوومەتی ئیسرائیل لەگەڵ من زۆری تووڕە کردبووم. ئەمن لەو کەسانە نیم کە بەئاسانی دەبنە قوربانیی نادادپەروەری. ئەمن پێم باشترە لەو حاڵەتەدا بەرامبەر بە بێدادگەری ڕاوەستم و خەبات بکەم.

سەرەنجام، ئەمن هەستم کرد ئەگەر ڕوو بکەمە لەقاودان بۆ خەڵک زۆر بەسوود دەبێ. خەڵک دەبێ لەو ڕووداوانە کە لە دە ساڵی ڕابردوودا لەوان و چاپەمەنی و میدیاکان شاردراونەوە ئاگادار بن. خەڵک دەبێ بزانن ئەمریکا و ئیسرائیل چۆنیان پێشی جێگیربوونی ئاشتی و ئارامی لە ناوچەدا گرتوە، چۆن حکوومەتی ئەمریکا هێشتا چەکە کیمیاوییەکان دەداتە سەددام حوسێن و چۆن «ڕۆناڵد ڕەیگان» و «جۆرج بووش» بۆ سەرکەوتن لە هەڵبژاردنی سەرکۆماریی ساڵی ١٩٨٠ی ئەمریکادا بە دانی چەک و تەقەمەنی بە ئێرانییەکان ئەوانیان هان دا ئازادکردنی بارمتە ئەمریکایییەکان وەدوا بخەن و زۆر ڕووداوی گرنگی دیکەی لەو جۆرە.

ئەمن لەخۆمم پرسی، «داخوا کەس ئەم قسانە لە من وەردەگرێ؟ داخوا حکوومەتەکانی ئەمریکا و ئیسرائیل حاشا لەو قسانەی من دەکەن، بە شێتم دەناسێنن و بایەخ و ئابڕووم دەبەن؟». ئەنجامدانی ئەوکارە لەلایەن حکوومەتەکانی ئەمریکا و ئیسرائیلەوە زۆر کردەنی دەهاتە بەر چاو. بەڵام لەلایەکی دیکەوە، داستانی «واتێرگێت»م وەبیر دەهاتەوە کە هەرچەند هەوڵیان دا یەک لە دوای یەک حاشا لە هەموو ڕووداوەکانی پێوەندیدار بەو بابەتەوە بکەن، بەڵام سەرەنجام ڕاستییەکە ئاشکرا بوو.

لەو بەیانییەی ڕۆژەکەی بەهاردا، ئەمن سەرەنجام ڕێگای سێیەمم هەڵبژارد. حاشام لە هەموو کردەوەیەکی خیلاف کرد و ئاخرەکەشی لە دادگادا سەر کەوتم. ئەمن ئەوەی ڕووی دابوو، هەموویم دایە میدیاکان و ئێستاش ئەوا ئەم کتێبەم لەبارەی خزمەتەکانم لە ڕێکخراوی جاسووسیی ئیسرائیلدا نووسیوە.

دیارە نێوەرۆکی ئەم کتێبە زۆر جوان نیە و ئەمنیش شانازی بەو نەخشەوە ناکەم کە لە دروستکردنی ڕووداوەکانی داستانی ئەم کتێبەدا هەمبووە. ئەمە سەربردەی دەیەی ١٩٨٠یە - کە داستانی

دراوی بێئەندازە، تەماحکاریی تێرنەخۆرە، گەندەڵی و بەرتیلخۆری و تاوانکاریی نهێنی و شاردراوە دەگێڕێتەوە. نێوەرۆکی ئەم کتێبە، سەربردەی حکوومەتی نادیار لەڕێگای بێسیمەوەیە، ئەو نیشان دەدا کە چۆن هێندێ کەس کە لە چەند ڕێکخراوی جاسووسیدا کار دەکەن ڕەوتی سیاسیی حکوومەتەکانیان بەدەستەوە دەگرن و بێئەوەی خۆیان تووشی هیچ بەرپرسیارییەک بەرامبەر بە خەڵک بکەن، کەلکی خەراپ لەو متمانەیە وەردەگرن کە خەڵک داویانەتە کورسینشینە دەوڵەتییەکان، میدیاکان بە لاڕێدا دەبەن و بە فێڵوتەڵەکەی جۆراوجۆر خەڵکی فریو دەدەن. نێوەرۆکی ئەم کتێبە هەروەها سەربردەی شەڕەکان، سوپاکان، چەکوچۆڵە و مەرگی سەدان و هەزاران ئینسانە. لەم کتێبەدا سەربردەی ئەو شەڕانە شی دەکرێتەوە کە بەرنامەکەیان بە دەستی ژەنراڵەکان لە مەیدانەکانی شەڕدا داناڕێژرێ، بەڵکوو لەلایەن ئەو پیاوە ئاسوودەژیاوانەوە دادەنرێ کە لە ژوورگەلێکی ڕەحەت و ئاسوودە کە دەزگای خاوێنکردنەوەی هەوایان تێدا دامەزراوە، دانیشتوون و بەرامبەر بە ڕەنج و ئازاری ئەندامانی کۆمەڵ بێخەمن و مێشێکیان لێ میوان نیە.

ئەم کتێبە هەم گێڕانەوەی ڕووداوەکانە و هەم لەقاودان. ئەم کتێبە هەروەها بۆ تۆبە لە گوناحان نووسراوە. ئەمن هیوادارم کە نووسینی سەربردەکەم تا ڕادەیەک ڕوونکردنەوەی ئەو هەڵە سامناکانە بێ کە لە دەیەی ۱۹۸۰دا ڕوویان داوە و کۆمەگ بە لەسەرکارلاچوونی ئەوانە بکا کە ئەو ڕووداوە سامناکانەیان خوڵقاندوە.

ڕەنگە تێوەگلانی ڕووداوە سیاسییەکان هەر لە سەرەتاوە لە چارەی من نووسرابێ. ئەمن ساڵی ١٩٥١ (١٣٣٠ی هەتاوی) لە تاران، ئێران وەزگی دایکم کەوتم. دایکوبابم کە ژنومێردێکی دەوڵەمەندی جوولەکەی عێراقی بوون، ساڵی ١٩٤٥ (١٣٢٤) لە بەغدا زەماوەندیان کردبوو و هەر ئەو ساڵە بە سەفەر چووبوونە ئێران و لە تاران نیشتەجێ ببوون. کورتی کەینەوە، کۆتایی ساڵی ١٩٥٠ و سەرەتای ساڵی ١٩٥١، ئەوان چوونە ئیسرائیل تا بزانن دەکرێ بچنە ئەم وڵاتە. لەم سەفەرەدا (لە شاری ئورشەلیم) دایکم منی وەزگ کەوت. بەڵام دایکوبابم بڕیاریان دا بۆ ئەو کاتە بگەڕێنەوە ئێران کە بە هۆی ئاڵۆزیی نێوخۆوە تووشی چەند بەرەکی ببوو.

ماوەیەک دوای گەڕانەوەی دایکوبابم بۆ ئێران، ئەنجومەنی قانوونданانی ئەم وڵاتە گەڵاڵەی نیشتمانیکردنی نەوتی پەسند کرد. کۆمپانیای نەوتی ئێران و ئینگلیز لە ئێران چووە دەر و موحەممەدی موسەددیق سەرۆکوەزیری ئەم وڵاتە خۆی لە بەرامبەر خەڵک و وڵاتێکدا دیتەوە کە ناکۆکیی توندی ڕێبەرانی سیاسی، ئەوانی ڕووبەڕووی یەکتر کردبۆوە و ئاڵۆزیی شەقام لەم وڵاتەدا ببووە باوی ڕۆژ و دەستەبەندیی نێوان ئەوانی لێکەوتبۆوە. دەبێ بزانین کە جوولەکە عێراقییەکان کە زۆر پێشکەوتوو بوون و فەرهەنگی خۆرئاوا و ئورووپایان وەرگرتبوو و بە بەشێک لە جوولەکە پێشکەوتووەکان دەژمێردران، دەگەڵ جوولەکەکانی ئێران کە خۆیان بە ئێرانی بەڵام بە ئایینێکی جیاوازەوە دەزانی تێکەڵاوییەکی زۆریان نەبوو.

پاڵنەری ئەو جوولەکە ئێرانییانە کە کۆچیان بۆ ئیسرائیل دەکرد، زۆرتر باری ئابووریی هەبوو. بۆیە ئەوانە پاش کۆچکردن بۆ ئیسرائیل بەرامبەر بە وڵاتی تازەیان هەستوسۆزێکیان نەبوو. هۆی کۆچکردنی جوولەکە ئێرانییەکان بۆ ئیسرائیل بە دڵنیایی بەکاربردنی

ستەم بەدژی وان نەبوو. لە ئێران هەستی دژی یەهوودی، تەنانەت لە سەردەمی ڕێژیمی ئێستاشدا زۆر کەمە. لە باری مێژوویی‌یەوە، کووڕووشی مەزن، پادشای ئێران ئازادیی دابووە جوولەکەکان و دواتر دینی ئیسلامیش مووسایيگەری و پێغەمبەرانی یەهوودیی بەڕەسمی ناسی. تەنانەت، ڕەزاشای پەهلەوی، بابی دواپادشای ئێران،هەرچەند لەکاتی شەڕی دووەمی جیهانیدا لایەنی نازییەکانی گرت، بەڵام هەرگیز ڕەوشتی دژی یەهوودیگەریی هیتلەری ڕەچاو نەکرد و زۆربەی ئێرانییەکان لە هەستی دژایەتیی یەهوودییان کە لە ئورووپا بەربڵاو بوو، بێبەری بوون.

ئەندامانی کۆمەڵی جوولەکە عێراقییەکان کە لە تاران دەژیان، پێوەندیی نیزیکیان دەگەڵ یەکتر هەبوو و بۆخۆیان خاوەنی باشگا (یانە)، کلیسا و قوتابخانەی تایبەتی بوون. بەوحاڵە زۆربەی منداڵانی جوولەکەی عێراقی لە تاران لە قوتابخانەی کۆمەڵگەی ئەمریکایی-یەکانیان دەخوێند. لەو قوتابخانەیەدا زمانی یەکەم ئینگلیزی و زمانەکانی دواتر فەڕانسەیی و فارسی بوون. لە ماڵەوەش منداڵانی جوولەکەی عێراقی بەپێی فەرهەنگ و نەریتی دایکوبابیان بە زمانی عەرەبی قسەیان دەکرد. بۆیە، ئەمنیش وەک زۆر لە کیژ و کوڕانی جوولەکەی عێراقی بە چوار زمان پێ‌گەیشتم. (دواتر زمانەکانی عیبری و ئیسپانیاییش فێر بووم)، بەڵام لەبارەی کەسایەتیی نیشتمانیمەوە دەبێ بڵێم ئەگەرچی لە ئێران لەدایک ببووم، هیچوەخت هەستم بە ئێرانی‌بوون نەدەکرد، بەڵکوو خۆمم بە جوولەکە دەزانی.

ئەمنیش وەک هەموو کوڕانی جوولەکە فێر کرام کە لە تەمەنی ١٣ ساڵییەوە بەپێی ئایینی مووسایی نوێژان بکەم. زۆربەی منداڵانی جوولەکەی عێراقی، پاش تەواوکردنی قوتابخانەی ناوەندی، بۆ درێژەدانی خوێندن لە زانکۆ دەنێردرانە ئەمریکا. ئەگەرچی منداڵانی جوولەکە عێراقییەکان شانازییان بە یەهوودی‌بوونی خۆیانەوە دەکرد،

بەڵام دایکوبابەکانیان حەزیان نەدەکرد ئەوان پاش تەواوکردنی خوێندن بگەڕێنەوە ئیسرائیل. چونکە ئەوان ئیسرائیلیان بە نەتەوەیەکی هەژار دەزانی کە لە کۆچبەرە هەژارەکان و جوولەکەکانی ئورووپای خۆرهەڵات پێکهاتبوو. باڵیۆزخانەی ئەمریکا لە ئیسرائیل بە باشی ئاگاداری وەزعی جوولەکە عێراقییەکان بوو و بە ئاسانی ڤیزای چوونەئەمریکای دەدا بە لاوەکانیان. بەشی زۆرتری ئەو لاوانە لە ئەمریکا ژنیان دێنا و لەوێ دەمانەوە.

لەنێو جوولەکە عێراقییەکاندا باوکی من «گورجی» Gourdji، تاڕادەیەک ڕێگای خۆی لە دابوشوێنی جوولەکەکان جیا کردبۆوە. خوێندنی لە قوتابخانەی فەرانسەیی ئالیانس لە بەغدا تەواو کردبوو و پێش ئەوەی لە ئێران جێی خۆی بگرێ، زۆر جار بە سەفەر چووبووە وڵاتانی هیندوستان و فەڕانسە و فەلەستین و یەکیەتیی سۆڤیەت و ماوەیەکی زۆر لەم وڵاتانە ژیابوو.

ئەو، ساڵی ١٩٤٠ (١٣١٩) چووبووە پاڵ ڕێکخراوی تێرۆریستیی جوولەکە LEHI کە کورتکراوەی «خەباتگێرانی ڕێگای ئازادیی ئیسرائیل»ە. هەرچەند ئەو ڕێکخراوە بە دەستەڕاستی بەناوبانگ بوو، بەڵام زۆربەی ئەندامەکانی پێشتر لە بزووتنەوەی کۆمۆنیستیدا بیوون. ئەوانە زیاتر بەناوی ئەندامانی گرووپی Stern دەناسران. وشەی Stern لە ناوی «دیڤید ستێرن»David Stern وەرگیرابوو کە لە ناحەزانی سەرسەختی بریتانیا بوو.

«ئیسحاق شامیر» کە دواتر کرا بە سەرۆکوەزیری ئیسرائیل جێ-نشینی «دیڤید ستێرن» بوو. «ئیسحاق شامیر»یش وەک ئەوەی پێش خۆی هەستێکی توندی دژی بریتانیایی هەبوو و تەنانەت ئامادە بوو بۆ [نەجاتی] گیانی جوولەکەکان دەگەڵ کاربەدەستانی نازی بکەوێتە وتووێژ. ئەو پێشنیاری بە کاربەدەستانی نازی کردبوو کە ئەگەر ئەوان ڕێگا بدەن ئەو جوولەکانەی لە ئۆردووگاکانی ئورووپادا

ڕاگیـراون کـۆچ بـۆ سـەرزەمینی فەلەسـتین بکـەن شـانبەشـانی سەربازانی ئەڵمانی بەدژی بریتانیا شەڕ دەکا. هەروەک چاوەڕوان دەکـرا حکوومەتـەکانی ئـەمریکا و بریتانیـا و ڕاپـەڕینی کرێکـاریی یەهوودییان، بە ڕێبەرایەتیی «دێڤید بن گوریۆن» David Ben Gurion کە لە نیۆیۆرک خۆی شاردبۆوە، بە هەموو تواناوە ئەو بەرنامەیەیان پووچـەڵ کـردەوە و پـەیڕەوانی «سـتێڕن» تەنانـەت بـەهۆی یەهوودییانی دیکەی فەلەستینەوە لەبەین بران.

«ئیسـحاق شـامیر» و هاوڕێیـانی لـە گرووپـی «سـتێڕن» هـەتا ئێستاش هەر دژی ئەمریکان. چونکە باوەڕیان وایە کە ئەمریکایی-یەکان بە یارمەتییەکی کەمیش دەیانتوانی پێشی قەتلوعامی شەش میلیۆن یـەهوودیی ئوروپا بگرن. پاش ئـەوەی دەوڵـەتی ئیسـڕائیل دامـەزرا، ڕێگای بـە زۆربـەی ئەوانـەی سـەر بـە گرووپـی «سـتێڕن» بوون نەدا بچنە ئەو وڵاتە. چونکە حکوومەتی هاوپەیمانیی کرێکار کە دەسـەڵاتی ئیسـڕائیلی بەدەسـتەوە گـرت بـە گومـان و ڕەشبینییـەوە دەیڕوانیـە ئەنـدامانی گرووپی «سـتێڕن»، دیـارە «ئیسـحاق شـامیر» بۆخـۆی جیـاواز بـوو، چونکـە ببـوو بـە یـەکێک لـە ئەنـدامانی گرنگـی «مۆسـاد» Mosad، «ڕێکخـراوی هـەواڵگریی ئیسـڕائیل». «بـن گوریـۆن»، سـەرۆکوەزیـری ئیسـڕائیل لـەبارەی ئیسـحاق شـامیرەوە گوتوویە: «ئەگەر ئەو تێرۆریستە با تێرۆریستی من بێ».

بـاوکی مـن کاتێک بۆی دەرکەوت کە حکوومـەتی ئیسـڕائیل ڕووی خۆش بە مانەوەی ئـەو لـەم وڵاتـە نیشـان نـادا، چـووە ئێـران، لـەوێ دوکـانێکی دانـا و دەگـەڵ براکـەی کەوتـە کـاری هـەناردەکردن و هاوردەکردن (صادرات و واردات). بۆنموونـە ئـەو لـە وڵاتی یەکیـەتیی کۆمارەکانی سۆڤیەت، کەوڵ و چەرمی گرانبـایی دێنا. پاشـتر ئـەو لـە دەیـەی ١٩٥٠دا مۆڵـەتی هێنـانی ترومبێلـی بێنـز و بـووش و کەلوپـەلی یـەدەکیی ئـەو دووانـە بـۆ ئێرانـی وەرگـرت. بـەڵام بـاوکم، هەمیشـە

چاوەڕێ بوو دۆخی سیاسیی ئیسرائیل بگۆڕێ تا ئەو بتوانێ کۆچ بکا بۆ ئەو وڵاتە.

ئەمن زۆر ئۆگری گوێگرتن لە قسەکانی باوکم و سەفەرەکان و باوەڕە فەلسەفییەکانی بووم. هێندێ جار دەچووینە سەربانی خانووە سێنهۆمەکەمان کە کەوتبووە باکووری شاری تاران و لەوێ ماوەیەکی درێژ پێکەوە پیاسە و وتووێژمان دەکرد. کاتەکانی دیکە، لە شوێنێکی سێبەری حەوشەی ماڵەکەمان ئەو کارەمان دەکرد. لەحاڵێکدا قوتابخانەی ئەمریکاییەکان منی فێری زمانی جۆراوجۆر، ماتماتیک و مێژوو و جوگرافیا دەکرد، بەڵام لە باوکم دەرسی ژیان فێر دەبووم.

باوکم چێژی لە گێڕانەوەی ئەزموونەکانی لە یەکیەتیی کۆمارەکانی سۆڤیەت وەردەگرت. لەحاڵێکدا ئەمن و سێ خوشکەکەم لەنێو لافاوی ئەو پڕوپاگاندەیە کە لە دەیەکانی ۱۹۵۰ و ۱۹٦۰ بە سوودی ئەمریکا لە ئێران برەوی هەبوو، گەورە ببووین. لەو پڕوپاگاندەیەشدا یەکیەتیی کۆمارەکانی سۆڤیەت وەک وڵاتێکی بەڵالێدراو دەناسێندرا، بەڵام باوکم دەیگوت: «بابەت پێچەوانەی ئەوەیە کە ئێمە دەیبیستین، لە وڵاتی سۆڤیەت ئێوە (لەسەر شەقامەکان) هەژار و نەدار نابینن. هەموو کەس لە سۆڤیەت لانی کەمی ژیانێکی سادەی هەیە و دەوڵەت پێداویستییە بنەڕەتییەکانی ژیانی بۆ خەڵک دابین کردوە. ئەگەرچی خەڵکی شووڕەوی لە کار و بازرگانیدا زۆر سەرکەوتوو نین، بەڵام لە نەداریی توند و برسیەتیی نیزیک بەمەرگیشدا نین. ژیان بەلانی کەمی پێویستییەکانی گوزەرانەوە لەوە باشترە کە مرۆڤ لەبرسان بمرێ».

ئەمە ڕەفتارێک بوو کە باوکم بۆ شیکردنەوەی جیاوازیی نێوان ژیانی خۆرهەڵات و خۆرئاوا بۆ منداڵەکانی بەکاری دێنا. بەمجۆرە دەردەکەوێ کە باوەڕی فەلسەفیی باوکم دەربارەی کەسێک کە لە

کۆمەڵگەیەکی دەوڵەمەندی وەک ئەمریکا دەژی نائاسایی دەهاتە بەر چاو. باوکم بیروباوەڕ و بۆچوونەکانی خۆی بە ئاشکرا دەردەبڕی و هەربۆیە بێگومان لە کۆمەڵی جوولەکە عێراقییەکاندا خەڵکی دیکە قبووڵیان نەدەکردن.

ئەگەرچی بابم هاوبیری و پێوەندیی سۆزداریی دەگەڵ سۆسیالیزم هەبوو، حکوومەتی هاوپەیمانیی کرێکاری فەرمانڕەوای ئیسڕائیلی قبووڵ نەبوو. هۆی ئەمەش باوەڕە ئیدئۆلۆژییەکانی بابم نەبوون، بەڵکوو هۆی ڕەشبینیی باوکم بەرامبەر بە حکوومەتی هاوپەیمانیی کرێکاری ئیسڕائیل ئەوە بوو کە دەسەڵاتدارانی سۆسیالیستی حکوومەتی ئیسڕائیلی وەک «جووتیاران»ێک دەدی کە ئامانجی بنەڕەتییان دەوڵەمەندکردنی خۆیان، بە قیمەتی بێسەرەوبەرەیی ئابووری بوو. بابم پێی وابوو کە هەڵسووڕێنەرانی حکوومەتی ئیسڕائیل بە ئاشکرا جوولەکەکانی خۆرهەڵاتی نێوەڕاست بێ لەبە ڕچاوگرتنی پلەی خوێندەوارییان بە هاونیشتمانی پلە دووی ئیسڕائیل دەژمێرن. بێجگە لەوەش «سۆسیالیست»ەکانی حکوومەتی هاوپەیمانیی کرێکار بەوپەڕی سەرسوڕمانەوە هەودای ژیانی خۆیان دەگەڵ سەرمایەدارە ئەمریکاییەکان لێک با داوە.

باوکی من پشتیوانیی لە «گاهال» Gahal (کە ئەمڕۆ بە حیزبی لیکوود دەناسرێ) دەکرد کە تێکەڵاوێکە لە حیزبی «هێرووت»ی «مەناخیم بێگن» و حیزبی کرێکاری ئیسڕائیل. هەرچەند پەیڕەوانی حیزبی لیکوود لەبەر هاوبەندی و ئۆگریی قووڵی جوولەکایەتی، خۆیان بە خۆپارێز (محافظەکار) دەزانی، ئەوان هەروەها پشتیوانییان لە بەرنامەی پێشکەوتووی سۆسیالیستی دەکرد و ڕێبەرانیان، مەناخیم بیگن و ئیسحاق شامیر بۆ پەیڕەوانی ئەو حیزبە بە قارەمانی نیشتمانی دەژمێردران. ئەمن «گاهال» -حیزبی لیکوودی ئەمڕۆ- دەگەڵ پیرۆنیستە ئارژەنتینییەکان -ئەو دەستەڕاستییانە کە خۆیان بە

نوێنەری ڕاستەقینەی خەڵکی ئارژەنتین دەزانن بەراورد دەکەم. حیزبی هاوپەیمانیی کرێکار، کە دواتر ناوی بوو بە «حیزبی کرێکار»، لایەنگری دامەزراندنی پێوەندیی نیزیک دەگەڵ ئەفریقای باشوور و پچڕینی پێوەندیی سیاسی دەگەڵ وڵاتی یەکیەتیی کۆمارەکانی سۆڤیەت بوو. لەلایەکی دیکەوە، حیزبی لیکوود هەوڵی دا پێوەندیی سیاسی دەگەڵ وڵاتی یەکیەتیی کۆمارەکانی سۆڤیەت دامەزرێنێ و پێوەندییەکانی دەگەڵ ئەفریقای باشوور کەم بکاتەوە.

بەهۆی ئەوەی لە باوکمی فێر ببووم، ئەمن لەو ساڵانەدا کە لە تاران دەمخوێند، بەتوندی ئاشقی شۆڕشی جیهانی ببووم. -بەڵام (نەک) بە بزووتنەوەی چەکدارانە، بەڵکوو بە شێوەی ئارامی دابەشکردنی سامان- بەوپێیە باوەڕی سیاسیی سەردەمی لاوەتیی من ئەوە بوو کە کۆنترۆڵی ناوەندیی ئابووری و شێوەکانی ژیانی ئینسانی، بە یەکەمین هەنگاوی پێویست بۆ فێرکردنی کۆمەڵانی خەڵک و ئامادەکردنیان بۆ کۆمەڵگەیەکی ئازاد دەژمێردرێن.

ژووئیە (تەمووز)ی ساڵی ١٩٦٦، وەختێک ١٤ بەهارم تەمەن بوو، بەهۆی ئەوەی ئەمن جوولەکەیەکی عێراقی بووم کە لە قوتابخانە ئەمریکایییەکانم خوێندبوو، هەستم دەکرد لە ئێران زۆر بێگانەم. وەک زۆربەی ئەو کەسانەی باڵق دەبن و هەوڵ دەدەن کەسایەتیی خۆیان بناسن، ئەمنیش لە جێیەک دەگەڕام کە لەوێ خۆم بە غەریبە نەزانم. ئەو شوێنەوارەی ئامۆژگارییەکانی باوکم لەسەر باری دەروونیی منیان دانابوو بووە هۆی ئەوەی بڕیار بدەم بچمە ئیسرائیل و لەوێ بژیم. پاش دانی ئەم بڕیارە، دایکم کە خاتوونێکی تێگەیشتوو و بەئەزموون بوو – من و خوشکەکانم «کلاریس» Claris، «ئیڤۆن»، وEvon «ستێلا» Stellaی بردە ئیسرائیل و ئەمن و «ستێلا» لە قوتابخانەی نێونەتەوەیی ئەمریکایی لە «کفار سماریاهوو» Kfar Smaryahuی باکووری شاری تەل ئەبیب ناومان نووسی و دەستمان

بە خوێندن کرد. دوو خوشکی گەورەترم لە کۆلێژ ناویان نووسی. پێنج ساڵ دواتر، بابم و دایکم لە تارانەوە هاتنە ئیسرائیل و ئێمە لە هەموو بارێکەوە لە سەرزەمینی ئیسرائیل جێگیر بووین.

لێرە ئەمن دەتگوت لە دوو دنیادا دەژیم کە لە هەربارێکەوە بۆمن خۆش بوو. زۆربەی قوتابییانی قوتابخانەی ئەمریکایی‌یەکان، سپی-پێست یان منداڵی دیپلۆماتە بێگانەکانی دانیشتووی ئیسرائیل بوون. لە قوتابخانەکەی ئێمە منداڵانی جوولەکەی ئەو ناوچەیە زۆر نەبوون و هەرچەند ئەمن هێندێ جار وەزعی خۆم کەمێک ناسروشتی دەدی بەڵام بەهەرحاڵ ژیانمان بە ئاسوودەیی دەچووە پێش و هەمووومان پێکەوە دەحاوایەوە. کۆتایی هەموو ڕۆژێک کاتێک لە قوتابخانە دەگەڕامەوە لە «ڕامات گان» Ramat Gan کە کەوتبووە دەوروبەری تەل ئەبیب، شوێنی ژیانی ئێمە، دەگەڵ منداڵانی ئیسرائیلی تێکەڵاو دەبووم. جارناجارێک دەچوومە گەڕان، دۆستێکی کچم دەگەڵ خۆم دەبردە سینەما یان پێکەوە بۆ پیاسەیەکی دووروودرێژ دەچووینە قەراغ دەریا کە ٣،٤ کیلۆمیتر لە شوێنی دانیشتنی ئێمە دوور بوو.

دۆستە ئیسرائیلییەکانم پاش تەواوکردنی خوێندن دەچوونە خزمەتی سەربازی و هاوڕێ ئەمریکایی‌یەکانم بۆ چوونەزانکۆ دەچوونەوە ئەمریکا. بەڵام ئەمن دووبارە خۆم لە بارێکی ناسروشتیدا دیتەوە. چونکە ئەمن هێشتا پاسپۆرتی ئێرانیم هەبوو و بۆیە نەمدەتوانی بچمە خزمەتی سەربازی. ئەمە بووە هۆی ئەوە کە بچمە «کیبووتز» (کێڵگەی سۆسیالیستی-کەڵخۆز). ئەگەرچی ئەمن ئەوکاتە جوولەکەیەکی ئۆرتۆدۆکس[1] نەبووم، بەڵام هەرنەبێ جوولەکەیەکی

---

١-جوولەکەی ئۆرتۆدۆکس بە کەسێک دەڵێن کە بەوجۆرەی خاخامەکان و ڕێبەرانی ئایینی لێکی دەدەنەوە باوەڕی بە بنەما و ڕێوشوێنەکانی کتێبە ئایینییەکان هەبێ و شێوەکانی ژیانی پێشکەوتووی ئەمڕۆ دەگەڵ ئەو بنەما و ڕێوشوێنانە ڕێک بخا. (مترجم فارسی)

پابەندی ئایین بووم و ڕێزم بۆ بنیات و بنەما ئایینییەکان هەبوو و جێبەجێم دەکردن. ئەمن تەنیاکەس بووم کە لە کێلگەی هاوبەشی سۆسیالیستیدا، ئارەقچن (کڵاوی تایبەتی جوولەکەکان)م لەسەر دەنا. هەرچەند ئەمن بە تەواوی شێوەی ژیانی ئورووپاییەکانم قبووڵ نەبوو، بەڵام پێمخۆش بوو شێوە و بنیاتە فەلسەفییەکانی ئەوان تاقی بکەمەوە. سەیر ئەوەیە هەر ئەمە بووە هۆی ئەوەی بۆ هەموو تەمەن تووشی قۆرتوپێچ و تەونوبەستەکانی دنیای سیاسەت بم.

ئەمن هەموو ڕۆژێ نیوەی وەختی خۆم لە کێلگەی هاوبەشی «میشمار هەشرۆن» Mishmar Hashron خەریکی فێربوونی زمانی عیبری دەبووم و کاتەکانی دیکەی ڕۆژیش دەگەڵ منداڵانی ئیسرائیلی داخوازانە کاری زۆر دژواری جیاکردنەوەی ماسییە نێر و مێیەکانی قزلئالا (سەلەموون)م لە حەوزەکانی ماسیدا دەکرد. هێندێ وەخت، شەوانەش لە نانەواخانەی کێڵگە کارم دەکرد بۆئەوەی نانی فرۆشتن بۆ بەیانییان ئامادە بکەم.

لەو ساڵەدا (١٩٦٩) هاوژوورەکانم دوو داخوازی ناجوولەکە بوون کە ساڵەکانی دوای تەمەنی ٣٠ ساڵیی خۆیان بەسەر دەبرد. یەکێک لەوان «مایکل دێنیس ڕۆهان» Dennis Rohan Michael, ئەندامی کلیسای خودا لە ئوسترالیا و یەکی دیکەشیان ئەمریکاییەکی مەسیحیی پرۆتستان بوو بەناوی «ئارتەر». هۆی ئەوە کە ئەوان هاتبوونە کێڵگە هاوبەشەکەی ئێمە ئەوە بوو کە پێیان وابوو عیسای مەسیح بە ئیلهام فەرمانی پێداون کە بێنە سەرزەمینی پیرۆز. کار لە کێڵگەی هاوبەش بۆ ئەو جۆرە کەسانە وەک ژیان لە کۆمەڵێکی ئابووری بوو کە دەگەڵ باوەڕە دینی و میتافیزیکییەکانیان دەهاتەوە و ئەوانی دەخستە جێگەیەکەوە کە بتوانن فەرمانەکانی خوا بەجێ بگەیەنن. چونکە ئەوان لە کێڵگەی هاوبەشدا کاریان دەکرد ناچاریش نەبوون خەرجی مانەوەیان بدەن.

«ڕۆهان» پیاوێکی کەڵەگەتی ڕەقەڵە بوو بە مووی تەنک و قاوەیی-یەوە و ئەو گومانەی بۆ دروست ببوو کە لە ئیسرائیل دەبێ بە پادشا تا ڕێگا بۆ گەڕانەوەی مەسیح بۆ سەر زەوی خۆش بکا. بەڵام گومانی «ئارتەر» کەمێک دەگەڵ ڕۆهان جیاواز بوو، بەو مانایە کە ئەو پێی وابوو گەڕانەوەی مەسیح بۆ سەر زەوی نیزیکە و قەومی یەهوود دەبێ بۆخۆی، خۆی ڕزگار بکا. ئەو پابەندی ئەو باوەڕە بوو کە خواوەند دەوروبەری دووهەزار ساڵ لەوە پێش تاقانە کوڕەکەی بۆ ناردوون، بەڵام ئەوان ئامادە نەبوون وەری‌بگرن.

ژیان لە کێڵگەی هاوبەش حاڵەتێکی شێتانەی هەبوو. ئەمن هەموو هەوڵم بۆ لەداوخستنی کچان و ڕاکێشانیان بۆ سەر قەرەوێڵەکەم بەکار دەبرد. کاتێک مرۆڤ دەگەڵ دوو هاوژووری خۆرئاوایی کە خاوەنی بیروباوەڕی میتافیزیکین، لە کێڵگەیەکی هاوبەشدا دەبێتە هاودەم، ژیان لەو جێیە تەنیا لە کارکردن و ئەنجامی ئەرکە مەزهەبییەکاندا کورت ناکرێتەوە. دیارە ڕۆهانیش مرۆڤێک و خاوەنی مەیلە ئینسانییەکانی خۆی بوو. ئەو ئاشقی مامۆستایەکی جوان بوو کە هەموو ڕۆژێ بۆ دەرس‌گوتنەوە دەهاتە کێڵگەی هاوبەش. دوایە وێنەی خۆی دەگەڵ یادداشتێک بۆ ئەو مامۆستایە نارد و لەو یاداشتەدا نووسی کە ڕۆژێک دەبێتە پادشای ئیسرائیل و پێی‌خۆشە ئەو ببێ بە شاژنی، بەڵام ئەو مامۆستایە هیچ گوێی پێ‌نەدا.

شەوانە ڕۆهان جلێکی خاکی‌ڕەنگی دەکردە بەر کە وەختی کارکردن لە کێڵگە کەلکی لێ‌وەردەگرت و لەگەڵ من باسی «تێمپڵ ماونت» Temple Mount لە ئورشەلیمی دەکرد. «تێمپڵ موونت» بۆ موسوڵمانان پاش مەککە و مەدینە، بە پیرۆزترین جێگە دەژمێردرێ. لەم شوێنە «مسجد الاقصی» لەسەر شاخێک دروست کراوە و شوێن‌پێیەک لەسەر جێیەکی هەیە کە دەڵێن موحەممەد پێغەمبەری موسوڵمانان لەو شوێنەوە چۆتە ئاسمان.

ڕۆهان بە منی گوت کە ئێمە دەبێ ئەم مزگەوتە وێران بکەین و لە جێگاکەی پەرستگەی پیرۆزی خۆمان دروست بکەین. هەروەها گوتی، بۆ ئەوەی عیسای مەسیح بێتەوە سەر زەوی ئێمە دەبێ پەرستگەیەکی سێیەم دروست بکەین، بەڵام هەتا ئەم مزگەوتە لەبەین نەبەین ئەم کارەمان پێناکرێ. ئاشکرایە کە پەرستگەی دووەم پێشتر لەلایەن ڕۆمییەکانەوە لەبەین براوە.

هێندێ جار دەمدی دوو پیاو کە ئارەقچنیان لەسەر بوو دەهاتنە سەردانی ڕۆهان. ڕۆهان بە منی گوت ئەو دووکەسە سەر بە «ئەنجومەنی بەرگریی یەهوودییان» بوون. ئەو ئەنجومەنە ڕێکخراوێکی توندڕۆی دەستەڕاستی بوو کە لە نیۆیۆرک بوو و لەلایەن خاخام «مەیر کاهان» Meir Kahaneوە بەڕێوە دەبرا. ڕۆهان هیچوەخت بە منی نەگوت چۆن دەگەڵ ئەو کەسانە ئاشنا بووە. مانگێک دوای ئاشنابوونی من دەگەڵ ڕۆهان، ڕۆژێک ئەو جانتایەکەی تێکنا و چووە ئۆرشەلیم و پێی‌گوتم «دەچمە ئۆرشەلیم تا زەمینە بۆ دەرکەوتنەوەی مەسیح ئامادە بکەم». کاتی دەرکەوتن لە کێڵگەی هاوبەش ڕۆهان چاکەت و پانتۆڵ (کۆت و شەڵوار)ێکی ڕازاوەی کردە بەر و کراواتی لێدا و ئەم بابەتە منی خستە سەرسوڕمانەوە. پاشان ئەو دەستە ڕەقەڵەکانی بەرەو من ڕاوەشاندن و دوای بەجێ‌هێنانی فەرمانی ئیلاهی کێڵگەی بەجێ هێشت.

دوو مانگ دواتر بیستم کە ڕۆهان ئەوەی بە منی گوتوە بەڕاستی بووە. پاش چوونی وی بۆ ئۆرشەلیم میدیاکان خەبەریان دا کە ئاگریان لە «مسجد الاقصی» بەرداوە. بە بڵاوبوونەوەی ئەو خەبەرە موسوڵمانانی جیهان تووڕە بوون و هاودینانی خۆیان بۆ جیهاد (شەڕی پیرۆز) بەدژی ئیسرائیل بانگهێشتن کرد. دیارە هێندێ ڕۆژنامەی عەرەبی نووسییان کە هێلیکۆپتەرە سەربازییەکانی ئیسرائیل بۆمبای ئاگرکەرەوەیان لە مزگەوتەکە داوە، بەڵام بەپێی ئەو

زانیارییانەی هەمبوون، وای بۆ دەچووم کە مەسەلەکە تەواو غەیری ئەوەیە کە ڕۆژنامە عەرەبییەکان نووسیویانە و ئەمەش زوو پشتڕاست کرایەوە.

دوای ئەوە ڕۆژێک ئاگادار بووم کە ڕۆهان لە ژوورەکەی خۆم چاوەڕێی دیتنمە. کاتێک دەگەڵی بەرەوڕوو بووم دیتم کە ئەو هێشتا جلکە ڕازاوەکانی لەبەردان. ئەو پێیگوتم: «ئەمن ئێستا لە ئۆرشەلیم دێمەوە و تکا دەکەم ڕێگام بدەی پشووی کۆتایی حەوتوو لێرە بگوزەرێنم». دیارە هێشتا کەس قەرەوێڵەکەی ئەوی نەگرتبۆوە.

ئەمن باسێکم لە دەنگوباسی ئاگرتێبەردانی «مسجد الاقصی» نەکرد و پێمگوت: «لەلایەن منەوە مانەوەی تۆ لێرە هیچ گیروگرفتێکی نیە، بەڵام دەبێ بزانی ئەگەر بتەوێ لە چەند ڕۆژ زیاتر لێرە وەمێنی دەبێ کاربەدەستانی کێڵگەی هاوبەش ئاگادار بکەی و دووبارە ناو بنووسی».

ئەو شەوە، لەحاڵێکدا «ئارتەر»یش لەوێ بوو، ئەمن قسەم دەگەڵ ڕۆهان کرد و ئەمجارە باسی ئاگرتێبەردانی «مسجد الاقصی»شم هێنایە پێش و پرسیم: «داخوا ئاگرتێبەردانی «مسجد الاقصی» نیشانەی ئەوەیە کە پەرستگەی سێیەم بەزوویی دروست دەکرێ؟».

ڕۆهان وەڵامی دایەوە: «بەڵێ».

«ئەتۆش دەستت لە ئاگرتێبەردانی مزگەوتدا هەبوو؟».

«ئەو کارەی خوا بەدەستی من جێبەجێ کرا.»

«ڕۆهان ئەتۆ دەزانی تەواوی دنیا بەدوای ئەو کەسەدا دەگەڕێ کە ئەو کارەی کردوە، ئەتۆ لەمبارەیەوە چ دەکەی؟».

«ئەمن خۆم تەسلیم دەکەم».

ئەمن نەمدەزانی بەڕاستی ڕۆهان ئەو کارەی کردوە و دەبێ باوەڕ بە قسەکانی بکەم یان نا، بەڵام دەمزانی دەبێ ئەم کارە بکرێ و

ڕۆهان دەبێ تەسلیمی کاربەدەستانی دەوڵەت بکرێ. چونکە هەموو دنیا لەسەر ئەو ڕووداوە سەرکۆنەی ئیسرائیلیان دەکرد.

ئەو بەڵێنی دا ئەو شەوە لە کێڵگەی هاوبەش بمێنێتەوە و داوای لە ئێمە کرد لێی گەڕێین بە ئارامی بخەوێ.

ئارتەر ڕووی تێکرد و گوتی: «ڕۆهان، ئەمن هەموو ئەمشەو دوعا بۆ ڕۆحی تۆ دەکەم».

بەیانیی ڕۆژی دواتر لە ڕۆهانم پرسی: «شەمچە (شقارتە)ت پێیە؟»

وەڵامی دایەوە: «دیارە پێمە، ئەمن ئەوم لە ڕێی چاکەدا بەکار بردوە».

پاش نانی بەیانی، لەسەر ئیزنی ڕۆهان چوومە تەلەفونێکی گشتی، ژمارە ۱۰۰ی پۆلیس تایبەتی ڕووداوە لەنەکاوەکانم گرت، خۆمم ناساند و ڕوو بە ئەفسەرێکی ژن کە تەلەفونەکەی هەڵگرتبوو گوتم، ئەو پیاوەی هەموو ئیسرائیل بۆی دەگەڕێ لە ژوورەکەی من لە کێڵگەی هاوبەشە. کاتێک لە قسەکانمدا گوتم ئەو کەسە ئوسترالیایی-یە، ئەفسەرەکە گوتی لەو تەلەفونە بێتام و گاڵتەجاڕانەم زۆر بۆ هاتوە و بۆیە حەوسەلەم بەسەر چووە، بەوحاڵە بە وردی گوێی بۆ قسەکانم ڕاداشت.

٤٥ دەقیقە دوای تەلەفونەکەی من، کێڵگەی هاوبەشی ئێمە لەلایەن گاردی سنووری ئیسرائیل و ئەندامانی پۆلیسی نیوەنیزامی کە خاوەنی یۆنیفۆرمی سەوز و چەکی قورس بوون، کەوتە بەر هێرش. ئەوان گەمارۆی ئەو بەشەیان دا کە ژوورەکەی منی لێبوو. پاشان سێ ئەفسەر کە جلکی ناسەربازییان لەبەردا بوو بۆ لای ژوورەکەی ئێمە هاتن و لە دەرگایان دا. دوای ئەوە ڕۆهانیان گرت و لەحاڵێکدا ڕەفتارێکی میهرەبانانەیان لەگەڵ دەکرد کەلەپچەیان کرد و بە تۆمەتی سووتاندنی شوێنێکی پیرۆز دەگەڵ خۆیان برد.

ئەمجار من و ئارتەر بە سەروسەکوتێکی نارێکەوە کە نیشانەی کارکردن لە کێڵگەی هاوبەشدا بوو سەفەری ئۆرشەلیممان کرد. پۆلیس ئێمەی لە هوتێلی «کینگ دیڤید» کە یەک لە باشترین هوتێلەکانی ئۆرشەلیم بوو دانا. دوایە ئێمە چەند سەعات لەبارەی ڕۆهانەوە لێکۆڵینەوەمان لەگەڵ کرا. کاتێک باسی دیداری کەسانی سەر بە «ئەنجومەنی بەرگریی یەهوودییەکان»م کرد، ئەوانەی تاقیقاتیان لێدەکردم ڕاچەنین و گوتیان، ئەتۆ هەرگیز نابێ باسی ڕۆهان و پێوەندیی ئەو لەگەڵ «ئەنجومەنی بەرگریی یەهوودییەکان» بکەی.

یەکێک لە ئەفسەرە پلەبەرزەکانی پۆلیس گوتی: «نابێ هیچ شوێنەوارێک لە دەستبوونی جوولەکەکان لەو ڕووداوەدا هەبێ».

ڕۆهانیان هەرگیز لەسەر کردنی ئەو تاوانە دادگایی نەکرد. ئەو لە دادگایەکی هەمووانیدا پێی لە تاوانەکەی نا. پاشان خستیانە ژێر پشکنینی دەروونی و دوای ئەوە لەلایەن دادگاوە بە نەخۆشی دەروونی ناسرا و ناردیانە نەخۆشخانەی دەروونی لە باشووری حەیفا.

سێ مانگ دواتر ڕۆهان هاتە ئاپارتمانێک (شوققە) کە ئەمن لە «ڕامات گان» گرتبووم و تێیدا دەژیام، گوتی: «ئەمن هەڵاتووم، بەڵام نیگەران مەبە. ئەمن بۆ سەردانی تۆ هاتمە ئێرە و دووبارە دەچمەوە ئەو جێیە».

ئەمجارە ڕۆهان وردەکاریی سووتمانەکەی مزگەوتی گێڕایەوە و گوتی کە ئەوکارە بە هاوکاری و کۆمەگی «ئەنجومەنی بەرگریی یەهوودییەکان» ئەنجام دراوە. بەڵام ئەو پێی وابوو پارێزەرەکەی «ئیسحاق توونیک» -کە دوایە کرا بە بەرپرسی ڕاگەیشتن بە شکایەتەکانی خەڵک بەدژی دەوڵەت- خەیانەتی بەو کردوە. چونکە ترساوە ئەگەر ڕۆهان لە دادگا لێکۆڵینەوەی لەسەر بکرێ، لەوانەیە

باسی دەستهەبوونی «ئەنجومەنی بەرگریی یەهوودییەکان» لەو ڕووداوەدا بێتە گۆڕێ. کاربەدەستە قەزاییەکان منیان بانگ نەکرد، چونکە دەترسان ئەمنیش لە دادگادا باسی «ئەنجومەنی بەرگریی یەهوودییەکان» بکەم.

لەم دیدارەدا ڕۆهان ڕووی کردە من و پرسی: «ئەرێ ئێرە سۆڤیەتە کە تۆمەتی شێتی لە پیاوی خوا دەدەن و دەی‌نێرنە شێتخانە».

هەموو ئەو ڕووداوانە ئەو پرسیارەیان خستە مێشکی منەوە کە: بەڕاستی لەم دنیایەدا دادپەروەری هەیە؟ لە هێندێ بارەوە دەکرێ بڵێین سیستمی دادپرسیی ئیسرائیل یەکێک لە بەویژدانانەترین سیستمە قەزاییەکانی جیهانە. بەو حاڵە بەهۆی لەبەرچاوگرتنی قازانجە دەوڵەتییەکان ڕۆهانیان کردە قوربانیی ئەم جۆرە چارەنووسە. ڕۆهان ئامادە بوو پێ لە تاوانی خۆی بنێ و بۆ ماوەی دە ساڵ یان تەنانەت پتریش لەسەر بیروباوەڕی خۆی بچێتە زیندان، بەڵام هەرلەوکاتەدا، حەزی دەکرد پاڵنەرەکەی بۆ ئاگرتێبەردانی «مسجد الاقصی» بە ئاگاداریی هەمووان بگەیەنێ. کەچی، سیستمی دادپرسیی ئیسرائیل ئەوی لە کەلکوەرگرتن لەو دەرفەتە بێبەش کرد.

ڕۆهان دوای ئەوەی ئەو ڕۆژە قسەکانی دەگەڵ من باس کردن، خۆی بە کاربەدەستانی ئەو بوارە ناساند و سێ مانگ پاشتر دووریان خستەوە بۆ ئوستڕالیا.

ساڵی ۱۹۷۲ کاتێک ئەمن لە زانکۆی «بار ئیلان» Bar Ilan خەریکی فێربوونی زانستە سیاسییەکان و مێژووی نوێ بووم و هەر لەوکاتەدا هەوڵم دەدا مۆڵەتی دەرسگوتنەوە وەدەست بخەم، دەگەڵ خوێندکارێکی زانکۆ بە ناوی «عادل موحەممەد ئاتامنا» ئاشنا بووم، ئەو عەرەبێکی فەلەستینیی هاونیشتمانی ئیسرائیل و خەڵکی گوندی

«کفار کارا» Kfar Kara بوو کە ئیسرائیل دوای شەڕی ١٩٦٧ داگیری کردبوو. ئەو کاتە ئەمن ئاپارتمانێکی چووکەڵەم لە «قریە ئۆنۆ» Qiryat Ono بەکرێ گرتبوو کە زۆر لە زانکۆ دوور نەبوو، عادلیش هەر لەو دەوروبەرە ئاپارتمانێکی بەکرێ گرتبوو، چونکە گوندەکەی دوو سەعات بە ترومبێل لە تەل ئەبیب دوور بوو. ڕۆژێک ئەو منی بانگ کرد بۆ ماڵەکەی خۆیان لە گوندێکی نەریتیی عەرەبی، بەڵام لەنێو کۆمەڵگەیەکی خۆرئاوایی. کاتێک ماڵەکەیانم لەو گوندە دیت سەرم سوڕما کە ئەو چۆن دەتوانێ لە دوو دنیا بژی.

خانمە خاوەنماڵە یەهودییەکەی عادل، دواتر بەو ناوە کە ئەو عەرەبە، ئەوی لەو شوێنە دەرکرد و ئەمە بووە هۆی دۆستایەتیی زیاتری من و عادل. چونکە ئەمن پێمزانی کە عادل لاوێکی دەست-تەنگە و بۆیە بڕیارم دا هەروەخت لەماڵی دایکوبابم جێگیر بووم ئاپارتمانەکەم بدەم بەو. ئەمە بووە هۆی ئەوە کە ئەو من بە برای خۆی ناو بەرێ. یەکێک لە دواڕۆژەکانی ساڵی ١٩٧٢ عادل پێیگوتم: «ئەمن کارێکم بۆ تۆ دۆزیوەتەوە. داخوا پێتخۆشە لە قوتابخانەی ناوەندیی گوندەکەی ئێمە دەرسی زمانی ئینگلیزی بڵێیەوە؟».

ئەمن ئەو فکرەم زۆر وەبەر دڵ کەوت. لەو سەردەمەدا مامۆستای جوولەکەی داخوازی گوتنەوەی زمانی ئینگلیزی زۆر بوون، بەڵام هیچیان حەزیان نەدەکرد لە گوندێکی عەرەبی دەرسی زمانی ئینگلیزی بڵێنەوە. هەرچەند ئەمن هێشتا خوێندنم تەواو نەکردبوو و مۆڵەتی گوتنەوەی دەرسی زمانی ئینگلیزیشم وەرنەگرتبوو، بەڵام دەمتوانی مۆڵەتێکی کاتی بەدەست بێنم. بەمجۆرە هەموو ڕۆژێ بە ئۆتۆبووس بە دوو سەعات دەچوومە گوندەکەی عادل و بە دوو سەعات دەهاتمەوە و لە حەوتوودا سێ جار دەرسی ئینگلیزیم بە کیژوکوڕانی تەمەن ١٢ تا ٢٠ ساڵ دەگوت.

ڕۆژێکیان لەنەکاو و بەشێوەیەکی چاوەڕواننەکراو نامەیەکم لە دەفتەر (نووسینگە)ی سەرۆکوەزیری ئیسرائیلەوە بۆهات. کورتەی نامەکە ئەمە بوو: «بەڕێز، ئێمە کارێکی زۆر سەرنجڕاکێشمان بۆ ئێوە هەیە کە دوارۆژیشی درەوشاوەیە. بۆیە حەز دەکەین ئێوە بۆ قسەلێکردنی بێنە تەل ئەبیب».

نامەکە ئادرەس و مێژووی نووسرانی هەبوو، لە نامەکەدا نووسرابوو کە ئەگەر نەتوانم بچمە تەل ئەبیب دەبێ بە تەلەفۆن «کۆهاڤا» Kohava ئاگادار بکەمەوە.

لەو کاتەدا ئەمن لەگەڵ دۆستێکی کچ کە سێ ساڵ لە من گەورەتر بوو، بە تازەیی خزمەتی سەربازیی تەواو کردبوو و کاری بۆ «شاباک» SHABAK -پۆلیسی نهێنیی ئاسایشی نێوخۆیی- دەکرد تێکەڵاو بووم. کاتێک نامەکەم پێنیشان دا زەردەیەکی هاتێ و گوتی: «ئەم نامەیە یان هی (شاباک)ە یان هی (مۆساد). چونکە ئادرەسەکەی هی ڕێکخراوی (شاباک)ە. پێموایە دەیانەوێ کارێکی گەورەت بدەنێ».

ئەو ئادرەسەی دەبوو بیچمێ، لە ئاپارتمانێکی ئاساییدا بوو. ئەمن لە پلیکانەکان وەسەر کەوتم، گەیشتمە نهۆمی سێیەم و لەدەرگام دا، پیاوێکی لاو دەرگای لێکردمەوە و ڕێنوێنیی کردم بۆ ژوورێک و گوتی دەبێ ماوەی دە دەقیقە لەوێ سەبر بگرم. دواتر زانیمەوە کە تەواوی ئەوماوەیە، لەو شوێنە لەژێر چاوەدێریدا بووم.

پاشان پیاوێک کە یەکەمساڵەکانی دەیەی پەنجای تەمەنی دەگوزەراند، بانگی کردمە ژوورێکی گەورە. کاتێک لەوێ دانیشتم بێ-ڕاوەستان گوتی:

«هەرچی ئێستا پێت دەڵێم دەکەوێتە بەر قانوونی ڕاگرتنی نهێنییە ڕەسمییەکان. ئەتۆ هەقت نیە بابەتەکانی ئەم وتوویژە بۆ کەس بگێڕیەوە یان تەنانەت لەبارەی ئەم دیدارە و شوێنی دیدارەکەوە قسە

بۆ کەس بکەی. زەحمەت نەبێ ئەم کاغەزە کە لەمەودوا تۆ دەخاتە بەر ڕێوشوێنی پاراستنی نهێنییەکان، ئیمزا بکە».

ئەو پەڕە کاغەزێکی پێنیشان دام و ئەمن ئیمزام کرد.

ئەو گوتی: «ئێمە لە پێشینەی تۆمان کۆڵیوەتەوە».

«ئێوە کێن و باسی چپێشینەیەک دەکەن؟».

«مەبەستم مەسەلەی مسجد الاقصیيە. لەبارەی ئەو کۆمەگەوە کە بە ئێمەت کرد، ئێمە لێکۆڵینەوەی پێویستمان کردوە».

لە شێوەی قسەکردنیڕا تێگەیشتم کە ئەوان لەوەی داوایان لێ-کردبووم باسێک لە دەستبوونی «ئەنجومەنی بەرگریی یەهوودییان» لە ڕووداوی ئاگرتێبەردانی مسجد الاقصیدا نەکەم و ئەمنیش لەو بارەیەوە هاوکاریم کردوون ڕازی و خۆشحاڵن. بەڵام ئەو بەئاشکرا ئاماژەی بەم بابەتە نەکرد.

ئەمن دووبارە لەوم پرسی: «ئێوە کێن؟».

«ئێمە سەربە دەفتەری سەرۆکوەزیرین و ئاسایشی نێوخۆیی دەوڵەتی یەهوودی لەژێر سەرپەرستیی ئێمەدایە. ئەتۆ دەبێ خۆشحاڵ بی کە بانگ کراوی تێکەڵ بە بنەماڵەی ئێمە بی».

ئەو دوایە ڕوونی کردەوە کە ئێستاش نابێ پێشنیارەکەیان وەک بانگهێشتنی تەواو بۆ خزمەت دابنێم. چونکە ئەوان دەبێ لەباری ئەمنیەتییەوە لێکۆڵینەوەی پتر لەسەر پێشینەی من بکەن و ئەمنیش دەبێ لە چەند تاقیکردنەوە دەربچم. بەڵام گوتی بە هەرحاڵ پێشینەکەت منی قانیع کردوە کە پێشنیاری کارت پێبکەم.

«هەرچەند ئەتۆ هێشتا هاونیشتمانەتیی ئیسراییلت نیە، بەڵام بەدەستی دینی و ئەمە ڕێگات پێدەدا بچیە خزمەتی سەربازیی هەمووانی». لەو بارەیەوە ئەو ڕاستی دەکرد. لەوکاتەدا ئەمن لە هەوڵی بەدەستهێنانی هاونیشتمانەتیی ئیسراییلدا بووم و ساڵی ١٩٧٣ دواقۆناغی ڕۆتینیاتی ئەم کارەم تەواو کردبوو.

خانەخوێیەکەم گوتی: «تەنانەت ئێمە دەتوانین دەرفەتێکی باشتر لە چوونی خزمەتی سوپا بدەین بە تۆ. ئەتۆ دەتوانی قەرارومەدارێک دەگەڵ ئێمە ئیمزا بکەی کە لانی کەم پێنج ساڵ کار بۆ ئێمە بکەی و هەر لەو گوندە کە ئێستا خەریکی دەرسی زمانی ئینگلیزی دەڵێیەوە، درێژە بە کارەکەت بدەی. لەوحاڵەدا ئەرکی تۆ تەنیا ئەوە دەبێ کە هەرچەند وەخت جارێک وەلامی پرسیارەکانی کەسێک بدەیەوە کە بەرپرسی ئاسایشی ئەو ناوچەیەیە. هەرلەو کاتەدا کە ئەتۆ لەو قوتابخانەیەی کاری لێدەکەی مووچە وەردەگری، ئێمەش مووچە و بەراتێکت بۆ دەبڕینەوە. ئەگەر ئەرکەکەت بە باشی ئەنجام بدەی و لێت ڕازی بین لەوانەیە ببی بە سەرۆکی ئاسایشی ئەو ناوچەیەش و سەرەنجام ڕێی تێدەچێ لە وڵاتێکی بێگانەش کارێکت پێبسپێردرێ. بە هەرحاڵ بەمجۆرە داهاتووی تۆ کراوە و ڕووناک دەبێ».

ئەمن بێئەوەی هیچ بڵێم تەماشایم ذەکرد.

«ئەگەر لەگەڵ ئەم پێشنیارە موافیق بی، ئێمە بێڕاوەستان تاقیکردنەوەکانت وەڕێ دەخەین».

پرسیم: «ئێوە دەتانەوێ ئەمن ببمە Manyak (وشەیەکی عیبرییە بە مانای هەواڵگر؟).

ئەو چاوەڕوانی دژکردەوەیەکی وا نەبوو. بۆیە کەمێک دەفکرەوە چوو.

«نا،نا -ئێمە دەمانەوێ ئەتۆ ببیە فەرمانبەرێکی نهێنی بۆ ئابڕوودارتر و ڕەسەنترین ڕێکخراوی دەوڵەتی ئیسرائیل. ئێمە حەز دەکەین بەشێک لە باری ئاسایشی دەوڵەتی یەهوودی کە ئەمن خۆم پێموایە شانازییەکی گەورەیە، بخەینە سەر شانی تۆ».

ئەو لەڕاستیدا دەیەویست لەسەر دۆستەکانم وەک عادل، جاسووسی بکەم.

گوتم: «نا، سوپاست دەکەم ئەمن ئامادە نیم دۆستەکانم پێوە بکەم».

«بەڵام ئەمانە عەرەب، واتە دوژمنانی ئێمەن».

«ئەم قسە بێبنەمایانە ببڕەوە، ڕاستە ئەوان عەرەبن، بەڵام بە هاونیشتمانی ئیسرائیل دەژمێردرێن».

بە بیستنی ئەم قسەیە لەنەکاو هەموو گیانی بوو بە ڕق و تووڕەیی و گوتی: «دەزانی ئەگەر پێشنیارەکەم ڕەت کەیەوە چیت لێدەکەن، تۆ دەبەنە سوپا».

«ئەمن حەز لە خزمەتی وڵاتەکەم دەکەم، بەڵام پێمخۆش نیە ببمە هەواڵگر».

لەحاڵێکدا دواقسەکانی لەگوێمدا دەزرینگانەوە ئەوێم بەجێهێشت. دواقسەکانی بەمجۆرە بوون: «ئێمە ماوەی حەوتوویەک مۆڵەتت دەدەینێ کە باوەڕی خۆت بگۆڕی. پاش ئەوە ئیدی کار تەواوە».

کاتێک هاتمەوە ماڵێ، کچەکەی دۆستم چاوەڕێم بوو. ئەمن هەرچی ڕووی دابوو بۆم گێڕایەوە.

دۆستە کچەکەم گوتی: «ئەتۆ شێتی؟»، و ماوەی حەوتوویەک هەوڵی دا قانیعم بکا کە پێشنیاری گۆڕین قبووڵ بکەم. بەڵام ئەمن هەرگیز پێوەندیم پێوە نەگرتنەوە.

ساڵێک دواتر، ساڵی ١٩٧٣، کە ئەمن هاونیشتمانەتیی ئیسرائیلم بەدەست هێنابوو و هێشتا خەریکی گوتنەوەی دەرسی زمانی ئینگلیزی بووم، نامەیەکی دیکەم بۆ هات. ئەمجارە نامەکە هی وەزارەتی بەرگری بوو کە بۆ وتووێژێک بانگیان کردبوومە تەل ئەبیب. ئەوان دەیانویست کارێکی زۆر تایبەتیم بدەنێ کە پێوەندیی بە سیستمی سەربازیی ئایندەمەوە هەبوو.

کاتێک بۆ وتووێژەکە چوومە ئادرەسەکە، دیتم کە ناوەندەکەیان لە ئاپارتمانێکی دیکەدایە. ژنێکی گەنج دەرگای لێکردمەوە و ڕێنوێنیی

کردم بۆ دەفتەری پیاوێکی قەڵەو و خەپەتۆڵە و بێموو کە خۆی بە سەرهەنگ دووەم «ساسۆن» Sasson ناساند. ئەو دۆسیەیەکی کردەوە و گوتی، گۆیا قەرارە بەم زووانە ئەمن بچمە خزمەتی سەربازیی هەمووانی. پاشان گوتی پێشنیارێکم بۆت هەیە، بەڵام پێش ئەوەی بۆم باس بکا کە چیە، داوای لێکردم کاغەزی قانوونی پاراستنی نهێنییەکان ئیمزا بکەم. ئەمجار پەڕە کاغەزێکی لەپێش دانام و داوای لێکردم ئیمزای بکەم. ئەم بابەتە منی خستە حاڵەتی deja vuەوە.[٢]

ئەتۆ دەبێ ماوەی سێ ساڵ لە سوپادا خزمەت بکەی، بەڵام ئەگەر تاقیکردنەوەکانت سەرکەوتووانە تێپەڕێنی و لەباری پێشینەی ئەمنیەتییشەوە وەزعت ڕوون بێ و پشتڕاست بکرێتەوە، ئێمە قەرارومەدارێک بۆ دووساڵ خزمەتی زیادی لە سوپادا دەگەڵ تۆ ئیمزا دەکەین و لەسەریەک خزمەتی تۆ لە سوپا پێنج ساڵ زیاد دەکا. لەوحاڵەدا ئێمە شوێنێکی زۆر تایبەتیت پێدەدەین و دەشتنێرینە فێرگەی ئەفسەران.

ئەمن گوتم: «شتی چاکە. کەنگێ دەتوانم خزمەتەکەم دەست پێ- بکەم؟».

«ئەتۆ کەنگێ ئامادە دەبی بچیە خزمەتی سوپا؟».

«خوێندنی من دەوروبەری کۆتایی ئەمساڵ تەواو دەبێ».

---

[٢]-حاڵەتێکی دەروونی یان گومانییە کە هێندێ وەخت بۆ مرۆڤ دێتە پێش و وا بیر دەکاتەوە وەزعێکی هاتۆتە پێش کە لە ڕابردووشدا بۆی هاتوتە پێش. بۆ نموونە، هێندێ جار مرۆڤ تووشی دیمەن یان مەوقعییەتگەلێک دەبێ کە پێی وایە لە ڕابردووشدا دەگەڵیان بەرەوڕوو بووە، وەک ئەوە کە مرۆڤ خانوو بەرەیەک دەبینێ و وا بیر دەکاتەوە کە پێشتریش دیتوویەتی، یان بۆنێک بەبەر لووتی هەڵلا دێ و وا دەزانێ کە لە ڕابردووشدا ئەو بۆنەی بۆ هاتوە (مترجم فارسی).

کاتێـک چوومـە خزمـەتی سـوپاوە بـەهۆی پلـەی خوێنـدەواری و دەسەڵاتم بەسەر زمانەکانی فارسی و ئینگلیزی و عەرەبیدا کردیانمە فەرمانبەری بەشی هەواڵگریی سوپا. دیارە، تا ئەوکاتەی داوایان لێ‌نەدەکردم جاسووسـی لەسـەر دۆستەکانم بکەم، گیروگرفتێکم دەگەڵ ئەنجامدانی خزمەتی هەواڵگری نەبوو.

ئەمن خۆم بە هی ئیسرائیل دەزانی و پێمخۆش بوو خزمـەتی ئەم وڵاتـە بکەم،ئێستا ئەگـەر ئـەو خزمەتـەی پێم دەسپێردرا، سـەنگین و باش بووایە ئـەمن بە سۆز و ئۆگرییـەکی زیاترەوە توانـای کارکردنم دەبـوو. ئـەمن ڕازی بـووم بـۆ لێکۆڵینـەوەی پێشـینە ئەمنییـەکانم لـە خزمەتیاندا بم.

وەسـبەینێ‌ڕا ئـەم کـارە دەسـتی پێ‌کرد. دەیان پرسیارنامەیان دایە دەسـتم کـە پرسـیارەکانیان پێوەنـدییان بـە ڕابـردووی مـن، نـاوی ئەنـدامانی بنەماڵـە و دۆسـتانم و هـەروەها کەسـانێکەوە هەبـوو، کـە ناسـێنەری مـن بـوون. پـاش ئـەوە مـاوەی سـێ‌ڕۆژ خسـتیانمە ژێـر تاقیکردنەوەی دەروونی و توانا تاکەکەسییەکانم.

دوای ئـەنجامی ئـەو تاقیکردنەوانـە، بڕیـار درا ئـەمن لـە بەشـی دۆزینەوەی کۆدی ئێران –لە یەکەی نیشـانەی (ڕەمز)ە زانیارییەکاندا دەست بەکار بکەم. بەڵام دیارە چون ئەمن لە یەکەیەکی هەواڵگریدا کـارم پـێ‌سـپێردرابوو، دەبـوو هێنـدێ تاقیکردنـەوەی دیکـەی وەک تاقیکردنەوەی جەستەییشم کە تایبەت بە کار لە یەکە هەواڵگرییەکاندا بوو، گوزەراندبایە.

ڕۆژی ٦ی مـانگی مـەی (ئـەیار)ی ١٩٧٤یـان وەک یەکـەم ڕۆژی خزمـەتی مـن دیـاری کـرد، کاتێـک پرسـیارم لـێ‌کـردن بـۆچی کـاتی دەستبەکاربوونم ئەوەندە درەنگ دیاری کراوە، گوتیان پێش ئەوەی دەست بە خزمەت بکەی دەبێ دەورەیەکی سەرەتایی دۆزینەوەی کۆد (ڕەمز) ببینم کە لـە ڕۆژەکـانی نێوەڕاسـتی مـانگی نۆڤەمبـەری سـاڵی

١٩٧٣دا دەست پێدەکا. پاشان دەرکەوت کە دەورەی فێرکاریی من لە یەکەیەکی پیادەی تایبەتی بە ناوی «گۆلانی» Golani بەڕێوە دەچێ و ئەمن دەبێ لەوێدا دەورەیەکی تایبەتی خەراپکاری بە هۆی کەرەسەی تەقینەوەوە ببینم. دواتر دەبێ بچمە دەورەی ئەفسەری و پاشان لە یەکەی دۆزینەوەی کۆددا دەستبەکار بکەم.

پرسیم، داخوا ئەو هەموو فێرکاری و تەشریفاتە بۆ کەسێک کە قەرارە لە بەشی دۆزینەوەی کۆددا کار بکا، حەتمییە؟ وەلامیان دامەوە کە ئەمن زۆر پرسیار دەکەم. سەرهەنگ «ساسۆن» پێی‌گوتم ئەگەر بەڵێن بدەم دوو ساڵ زێدە خزمەت لە سوپادا بکەم، بۆ سێ ساڵ خزمەتی سەربازی دەمنێرنە یەکەیەکی ئاسایی. ئەمن بەڵێنم دا پێنج ساڵ لە سوپادا خزمەت بکەم و بەرگەی ئەو بەڵێننامەیەم ئیمزا کرد.

لە کاتی دیتنی دەورەی دۆزینەوەی کۆددا، ئەمن دەگەڵ شێوەی ئێرانیی «کریپتۆگرافی» Cryptography[٢] ئاشنا بووم. بەدەم فێربوونی زانیارییەکانی ئەم دەورەیەوە ئەمن فێر بووم کە نوێنەرایەتییە سیاسییەکانی ئێران لە ولاتانی جۆراوجۆری دنیا کەلک لە ماشێنی سویسیی «هاگلین» Haglin وەردەگرن. بەوجۆرە کە نوێنەرایەتییە سیاسییەکانی ئێران دەقی بەڵگەنامە و نووسینەکانیان بە زمانی فارسی، بەلام بە ئەلفوبێی ڕۆمی ئامادە دەکەن و ئەمجار بە ماشێنی هاگلین کۆدیان بۆ دادەنێن.

لە دەورەی دۆزینەوەی کۆددا کە فێری چۆنیەتیی دۆزینەوە و خوێندنەوەی ئەو کۆدانەیان دەکردین کە بە ماشێنی هاگلین ئامادە کرابوون، ئیسرائیلییەکان تەکنیکێکیان دەست کەوتبوو کە تەنانەت بێ

---

[٢]- زانستی کردنەڕەمز و لەڕەمزدەرهێنانی نامە و بەڵگەنامەکان بە نیشانە تایبەتییەکان. (مترجم فارسی)

ئاگــاداری لــه خــاڵی دەســتپێکردنــی کــار لــه ماشــێنی کۆددانــانی «هاگلین»دا بە کامپیووتەر دەیانتوانی کۆدەکە بدۆزنەوە. بەڵام لەو بارەیەوە گیروگرفتێک هاتە پێش، بەو جۆرە کە ئێرانییەکان بڕیاریان دا کــەلک لــه شــێوەی دووکــۆدی وەربگــرن، بەومانایــە کــە نامــە نهێنییــەکانی خۆیــان لەپێشــدا دەکردە کۆد و دوایە ئەو کۆدانەشیان دووبــارە دەکــردەوە کــۆد و بــەوجۆرە کــەس نــەیدەتــوانی نامــە دووکۆدییەکان بخوێنێتەوە. تەنیا ڕێگا کە دەرەتانی بە ئیسرائیلییەکان دەدا نامــە و برووســکە دووکۆدییــەکان بخوێننــەوە، ئــەوە بــوو کــە دەستیان بە کتێبێکی ڕەش ڕابگا کە هەموو حەوتوویەک بە کیسەی پەیکی سیاسی بۆ نوێنەرایەتیی سیاسیی ناڕەسمیی ئێران لە «ڕامات گان» دەنێردرا.

وەختێک کیسەکانی پەیکی سیاسیی ئێران دەگەیشتنە «فڕۆکەخانەی بن گۆرین»، پێش ئەوەی فەرمانبەری تایبەتیی نوێنەرایەتیی سیاسیی ئێران لە تەل ئەبیب، وەریان بگرێ، لەبەر هۆی ئەمنیەتی ٢٤سەعات لە فڕۆکەخانە دەمانەوە. ئەم ماوەیە دەرفەتی بە «شاباک» دەدا کە بەرنامــەی خــۆی لــەبارەی تەســلیمکردنــی نێوئــاخنی کیســەکانەوە جێبەجێ بکا. کیسەکانی پەیکی سیاسی، عادەتەن مۆرومۆم دەکرێن، بەڵام ڕێکخراوی شاباک فەرمانبەری کارامە بۆ کردنەوە و دووبارە مۆرومۆمکردنەوەی ئەو کیسانەی هەبوون. بۆیە ئەو فەرمانبەرانە لە ماوەی ئەو ٢٤ سەعاتەدا کە کیسەکانی پەیکی سیاسی لە فڕۆکەخانە دەمانەوە، مۆرومۆمەکانیان دەکردنەوە و وێنەیان لە کتێبی ڕەش کە کلیلی کۆدەکانی نامەنووسینی تێدا بوو دەگرت و دووبارە دەیان-بەستنەوە. جارێکیان فەرمانبەرانی «شاباک» لە دووبارە مۆرومۆم-کردنــەوەی کیســەکەدا وردەکــاریی پێویســتیان نــەکردبوو. بۆیــە فەرمانبــەری تایبــەتیی نوێنەرایــەتیی سیاســیی ئێــران کــە عادەتــەن کیســەکانی پــەیکی سیاســیی وەردەگــرتن، هەســتی پــێکــرد، بــەڵام

ئیسرائیلییەکان بە ئاسانی توانیان بە دانی بەرتیلێکی باش بەو، دەمی ببەستن. ئەم ڕووداوە بۆ ئێمە بەڕاستی سەرکەوتنێکی نەخوازراو بوو و کاری ئێمەی زۆر ئاسان کرد. چونکە لەوەوپاش فەرمانبەرەکە بۆخۆی وێنەی لە کتێبە ڕەشەکە هەڵدەگرت و دەیدایێ.

دوای ئەوەی دەورەی دۆزینەوەی کۆدم تەواو کرد، منیان لە یەکەی ۸۲۰۰ لە لقی ناعەرەبیی «سیگینت» Sigint لە ئیدارەی دۆزینەوەی کۆد خستە کار. یەکەی ۸۲۰۰ کەوتبووە پێگەیەک کە چەندین خانووبەرەی بێتۆنیی سپی و خۆڵەمێشیی هەبوون و لە نزیک یانەیەک لە دەوروبەری شار، لە دە کیلۆمیتریی باکووری تەل ئەبیب هەڵکەوتبوو. لە نزیک وێ، لەسەر سەکۆیەکی بڵندتر خانووبەرەیەکی سپی و خۆڵەمێشیێ هەبوو کە پێیان دەگوت «ڤیلا»، ئەم خانووبەرەیە هی ڕێکخراوی مۆساد بوو و عادەتەن دیدارە ڕەسمی و ئیدارییەکان و کۆبوونەوە زۆرنهێنییەکان لەوێ ڕێکدەخران، دەوری کیلۆمیترێک دوور لەوێ چەندین پێگەی هەواڵگری و فێرگەی تایبەتی هەواڵگری و جاسووسی هەبوون.

بەشە جۆراوجۆرەکانی یەکەی ۸۲۰۰ لەژێر چەترێکی زۆر توندی ئەمنیەتیدا بوون، بەو مانایە کە هیچ کەس ئەگەر مۆڵەتی ڕەسمیی نەبایە نەیدەتوانی لە بەشێکیەوە بچێتە بەشێکی دیکە. فەرماندەی ئەو یەکەیە سەرهەنگ «یوول بن پۆڕات» Yoel Ben Porat بوو کە بە «بافی» بانگیان دەکرد. «بافی» کورتکراوەی ناوی خۆی بە زمانی عیبرییە. کەسی دووەمی ئیدارەی دۆزینەوەی کۆد سەرهەنگ دووەم «ساسۆن بی شاک» بوو کە منی بەناوی سەرهەنگ دووەم «ساسۆن» دامەزراندبوو.

فەرماندەی بەشی دۆزینەوەی کۆد، سەرهەنگ «ڕۆبن ییرادۆر» Reuben Yirador بوو کە چەند ساڵ پێش توانیبووی کەشفێکی گەورە بکا، داستانەکە بەو جۆرەیە کە ساڵی ۱۹۷۲ سەرهەنگ «یی ڕادۆر»

بەڵگەیەکی دەزگای هەواڵگریی سۆڤیەتی کە بەشێوەی ئاسایی نەکرابووە ڕەمز، کەشف کردبوو. «پیتر ڕایت» Peter Wright کارمەندی ڕێکخراوی بریتانیایی MI-S ئەم باسەی لەژێر ناوی (جاسووسگر) Spycatcher لە کتێبی خۆیدا هێناوە، بەڵام ئاماژەی بەو ڕاستییە نەکردوە کە ئیسرائیلییەکان ئەو کۆدەیان لە «ڕۆم» کەشف کردوە.

سەرهەنگ «یی ڕادۆر» ئاگادار ببوو کە سۆڤیەتییەکان کەلوپەل و دەزگای جاسووسی و هەواڵگرییان لە دەفتەری «گوڵدا مایەر» سەرۆکوەزیری ئیسرائیلدا داناوە و لە هەموو کار و کردەوەیەک کە لە دەفتەرەکەیدا دەگوزەرێن ئاگادار دەبن. ئەو دەزگا جاسووسییانە دوو تیکنیسیەنی خەڵکی سۆفیەت دایان‌نابوون کە کۆچیان کردبووە ئیسرائیل و لە دەفتەری گوڵدا مایەر کاریان دەکرد. هەواڵی جاسووسیی کارمەندانی سۆڤیەت لە ئیسرائیل بەهۆی کەسێکەوە هاتە دەر و بووە هۆی ئەوە کە ئەو دوو تیکنیسیەنە کە پێشتر لەلایەن ئیسرائیلەوە گیرابوون، بێ‌سەروشوێن بن.

هەواڵی دەرکەوتنی جاسووسی و هەواڵگریی سۆڤیەت لە دەفتەری گوڵدا مایەر سەرۆکوەزیری ئیسرائیل نیشان دەدا کە سۆڤیەتییەکان لە بەشێکی زۆری ئەو کاروبارەیساڵی ١٩٧١ لە دەفتەری سەرۆک-وەزیری ئیسرائیل گوزەراون ئاگادار بوون، نابێ لەبیرمان بچێ کە ساڵی ١٩٧٢ بۆ ئیسرائیل ساڵێکی گرنگ بوو. چونکە لەم ساڵەدا سۆڤیەتییەکان زۆر چاویان لەسەر ئیسرائیل بوو، گوڵدا مایەر لە فینلاند چاوی بە لیۆنید برێژنێڤ کەوتبوو و نەخشەکەی ئەوی لەبارەی دابین‌کردنی ئاشتی لە خۆرهەڵاتی نێوەڕاستدا ڕەت کردبۆوە. لە ئاکامی ئەو دیدارە و هەروەها دانانی دەزگای جاسووسی لە دەفتەری گوڵدا مایەردا سۆڤیەتییەکان زانیارییەکی زۆریان لەبارەی بۆچوون و بەرنامەکانی ئیسرائیلەوە دەست کەوت و دایانن بە ئەنوەر

سـادات سـەرکۆماری میسـر. زۆر وێدەچـێ کـە ئـەو زانیارییانـەی سۆڤیەتییەکان لەبارەی ئیسرائیلەوە دابوویانە ئەنوەر سادات کۆمـەگی بـە بڕیـاری ئـەو دەربـارەی هێرشـی سـاڵی ١٩٧٣ بـۆ سـەر ئیسـرائیل کردبێ. چونکە ئـەنوەر سـادات پێی وابـوو هێرش بۆ سـەر ئیسـرائیل، ئەم وڵاتە ناچار دەکا بچێتە پای وتوویژ لەبارەی پەیمانی ئاشتییەوە.

سـەرۆکایەتیی لقـی یەکـەی ٨٢٠٠ کـە ئـەمن کـارم لـێدەکـرد، لـە ئەسـتۆی خـاتوونێکی بەسـاڵداچوو بـوو بـەناوی «شـوولامیت ئینگرمەن» Schulamint Ingerman. ئەو یەکێک لە باشترین شارەزایانی کۆددانـان و ڕەمزکردنـەوەی ئیسـرائیل بـوو و دوو جـار بـەهۆی خزمەتـەکانی بـە ئەمنیـەتی ئیسـرائیل توانیبـووی گـەورەتـرین خـەڵات وەربگـرێ. خـاتو شـوولامیت ژنێکـی لەبـەردڵان بـوو کـە ئەوەنـدەی بایـەخی بەکاروبارەکـەی دەدا، بـە سەروسیمای خـۆی ڕانەدەگەیشت. ئەوکاتـەی ئـەمن چوومـە لقی کۆددۆزینـەوە، «خـاتو ئینگرمـەن» منـی دەگەڵ گرووپی شـەش کەسی ئێرانـی کـە لـەوێ کاریـان دەکرد ئاشنا کرد.

سیستمی کۆددانـانی «ڕێکخـراوی ناتـۆ» و هـەروەها سـۆڤیەتییەکان وەک سیسـتمی کۆددانـانی ئیسـرائیلییەکان بـە دەگمـەن دەکرایـەوە. چونکـە عادەتـەن ئـەوان سیسـتمی کۆددانـانی خۆیـان دەگـۆڕی. بـەڵام کردنەوەی سیستمی کۆددانانی ئێرانییەکان کە پێوەندیی بـە چۆنیـەتیی کاری منەوە هـەبوو، کارێکی دژوار نـەبوو. هۆیەکەشـی ئـەوە بـوو کـە خـاڵی دەسـتپێکی کـار (کتێبـی ڕەش) لـە کیسـەی پـەیکی ئێرانییـەکان دەدزرا. کاری من تەنیا ئـەوە بـوو کـە وەریانگێڕم. بەوحاڵـەش هێنـدێ جار کە دەستمان بە کتێبی ڕەش ڕانەدەگەیشت، کردنـەوەی ئـەو کۆد و ڕەمزانەی لە نامەگۆڕینەوەدا بەکار دەبران دەبووە حەتمی.

ڕۆژێکیـان کـە ئـەمن ئەفسـەرنیگابان بووم و دەگـەڵ خـانمێکی گـەنج کارم دەکرد، بڕیارم دا کۆدێک کە لە دەوروبـەری نیشـانەی «نوختـە»

کە لە زمانی فارسیدا مانای «نیشانەی کۆتایی ڕستە» دەدا، دانرا بوو، بکەمەوە. نیشانەی «نوختە» زۆرتر لەو تەلگرافانەدا بەکار دەبرا کە لە تاران بۆ ئیسرائیل یان لە ئیسرائیلەوە بۆ تاران بەڕێ دەکران. ئێرانییەکان پیتی Wیان بۆ جیاکردنەوەی مەودای نێوان وشەکان بەکار دەبرد، بەڵام کامپیووتەری ئێمە جۆرێک بەرنامەڕێژی کرابوو کە پیتی Wی فڕێ دەدا. ئەمن کامپیووتەرەکەم فێر کرد کە W بێنێتەوە نێو بەرنامە و سەرنج بداتە نیشانەی «نوختە» لەملاولەولای. ئەمن گەیبوومە ئەو باوەڕە کە ئەگەر بتوانین پێوانەیەکی دیاریکراو لە دووپاتەبوونەوەی ئەم «نوختە» و مەودایانە بدۆزینەوە، دەتوانین کۆدەکە بکەینەوە. دەورووبەری نیوەشەو بوو کە ئێمە بەسەرکەوتنەوە دەستمان بەو ئامانجە ڕاگەیشت. بە وەدەستهاتنی ئەو سەرکەوتنە ئیدی بۆ کردنەوەی کۆدەکان پێویستیمان بە کتێبی ڕەش نەما. بەو سەرکەوتنە ئەمن و خانمێکی گەنج کە ئەو شەوە پێکەوە کارمان دەکرد لەخۆشییان هاوارمان کرد. ئەمن بێڕاوەستان تەلەفونم بۆ خاتو شولامێت و سەرهەنگ یی ڕادۆر و سەرهەنگ بافی و سەرهەنگ دووەم یی شاک کرد. ئەوان گوتیان هەر ئێستا دێینە ئیدارە.

تەنیا گیروگرفتی من ئەوە بوو کە ئەو شەوە بەپێچەوانەی ڕێوڕەسم جلکی یۆنیفۆڕمم دەبەر نەکردبوو، بەڵکوو چونکە بە پایسیکل (دووچەرخە) لە «ڕامات گان»ەوە هاتبوومە ئیدارە پانتۆڵێکی کورتم دەپێدا بوو. دووچەرخەلێخوڕین لەنێوان «ڕامات گان» و ئیدارەکەی ئێمەدا کارێکی خۆش بوو. کەمێک دوای سەعات ٣ی بەیانی، کاربەدەستە کەشخەکانی یەکە گەیشتنە ئیدارە، ئەوپەڕی ڕەزامەندی و خۆشحاڵیی خۆیان دەربڕی و پیرۆزبایی سەرکەوتنم لەکردنەوەی کۆدەکەیاندا لێکردم. بەڵام هەر لەوساتەدا «بافی»

لەنەکاو ڕووی تێکردم و بەڕوویەکی گرژەوە گوتی: «نیگابانییەکەت کەنگێ تەواو دەبێ؟».

گوتم: سەعات هەشتی بەیانی.

گوتی: «سەعات هەشت و پێنج دەقیقەی بەیانی دەبێ بێیە دەفتەری من و لەسەر بێنەزمی و سەرپێچی، خۆت بۆ دادپرسیی سەربازی ئامادە بکەی».

هەموو ئەوانەی لە ژوورەکە بوون، تێکچوون.

قسەکانم بەو ڕستەیە پچڕان: «جارێکی دیکە کە کۆدێک دەکەیەوە دەبێ حەتمەن یۆنیفۆرمی سەربازیت لەبەردا بێ».

سەعات هەشتی بەیانی دەستێک جلکی یۆنیفۆرمی سەربازیم بە ئەمانەت وەرگرت و چوومە دەفتەری «بافی». ئەو دەسبەجێ گوتی کە بەهۆی ڕەفتاری بەپێچەوانەی نەزم، منی بە ١٤ڕۆژ زیندان سزا داوە. دوایە دەستووری پێدام دانیشم. ئەمن دەستوورەکەیم بەجێ هێنا و دانیشتم. ئەمجار زەردەخەنەیەکی لەسەر ڕوخساری دەرخست و گوتی: «بەڵام ئەمن ئەو حوکمی سزادانە هەڵدەپەسێرم. شۆفێرەکەم لە دەرەوەی ئیدارەیە، پێی بڵێ بتباتەوە ماڵێ. لە ماڵێ حەمام بکە و ڕیشت بتاشە و لەماوەی سەعاتێکدا وەرەوە ئێرە.

ئەمن فەرمانەکەیم هووبەهوو بەڕێوە برد. پاشان من و هەموو ئەندامانی بەشی ئێرانی بردە لای سەرۆکی ڕێکخراوی هەواڵگریی سوپا، سەرلەشکر «شلۆمۆ گەزیت» Shlomo Gazit و هەموومان ئافەرین و ستایشمان لێکرا.

ژیان لە سوپادا بەختەوەری دینێ یان هەرنەبێ ئەمن وا بیر دەکەمەوە.

لە نێوان ساڵەکانی ١٩٧٥ و ١٩٧٧ دا، بەشی کاروباری ئێران لە یەکەی ٨٢٠٠ دەیتوانی پەیامە بەکۆدکراوەکان لە ئێرانییەکان خۆیان خێراتر بخوێنێتەوە. کاتێک نامە و پەیامە ئێرانییەکان دەگەیشتنە دەفتەری ئێمە، ئێمە ئەوانمان دەدایە کامپیووتەر، پاشان وەرمان-دەگێڕان و دەماندان بەو هەواڵگرییانە کە ئەو نهێنییانەیان بۆ گرنگ بوون و کەلکیان لێوەردەگرتن. کردنەوەی ڕەمزەکانی نامە و تەلگرافی ئێرانییەکان ببووە هۆی ئەوەی دەرگای دنیایەک زانیاریی بەنرخ لەمسەرئەوسەری دنیا بەڕووی ئیسرائیلدا بکرێتەوە.

ئێمە بەهۆی وێستگەیەکی سەتەلایت کە کەوتبووە «بێت ئیللا» Bet Ella لە بناری چیاکانی «جوودیا» Judea کە نیوسەعات بە ترۆمبێل لە ئوورشەلیم دوور بوو، نیشانە و ڕەمزە تەلگرافییەکانی ئێران و هەروەها نیشانەکانی دیکەمان دەست دەکەوتن. بێجگە لەوە، یەکەی ٨٢٠٠ وێستگە هەواڵگرییەکانی، لە باکووری ئیسرائیل، سینا و دەرەوەی ئیسرائیل و ئەوبەری دەریاکان لەبەر دەستدا بوون. ئەم وێستگە جاسووسی و هەواڵگرییانە زۆر بەتوانا و خێرا بوون و لە خانووبەرەی ئاسایی ولاتانی ژاپۆن، ئیتالیا و ئەتیووپیدا کە بەهیچ جۆر سەرنجی خەڵکیان ڕانەدەکێشا دامەزرابوون و هەموو نیشانە هەواڵگرییەکانیان لە نێوخۆ و دەرەوەی وەزارەتی دەرەوەی ئێران، دەرباری شاهەنشاهی، ساواک و ڕێکخراوە هەواڵگرە سەربازییەکانی ئێران وەردەگرت. فەرمانبەرە ئیسرائیلییەکان دەزگاکانی جاسووسی و هەواڵگریی خۆیان لەسەر تاران کە ناوەندی سەرەکیی هەواڵ و زانیاری و تەلگرافیی سیاسی بوو و هەروەها نوێنەرایەتییە سیاسییەکانی ئێران لە ولاتانی دەرەوە میزان دەکردن و هەموو زانیاری و ئاگادارییە سیاسییە پێویستەکانیان بۆ کەلکوەرگرتن بەدەست دێنان.

لە ڕێژیمی شادا ئێران دەگەڵ ئەو ولاتانەی پێیان‌دەگوترا «ولاتانی نەرمڕۆی عەرەبی لایەنگری ئەمریکا» وەک میسر، ئۆردۆنی هاشمی

و میرنشینه یەکگرتووەکانی عەرەب و کووەیت پێوەندیی باشی سیاسیی هەبوو. بۆیە بە لەبەردەستدابوونی کۆدە هەواڵگرییەکانی ئێران، پێویست نەبوو ئێمە بۆ کۆکردنەوەی زانیاری لەسەر ئەو وڵاتانە داوای کۆمەگ لە ئەمریکا بکەین. چونکە بە لەدەستدابوونی ڕەمز و نهێنیی ئەو نامە و تەلگرافانە کە کاربەدەستە جۆراوجۆرە نهێنییەکان لە وڵاتانی بێگانەوە دەیانناردنە تاران، ئێمە لە تەواوی نهێنی و ڕەمزە خەبەرییەکانی وڵاتانی عەرەبی ئاگادار دەبووین. جگە لەوەش، ئێرانییەکان پێوەندیی باشیان لەگەڵ وڵاتانی بلووکی سۆڤیەت هەبوو و لەڕاستیدا، ئەوەی سۆڤیەتییەکان دەگەڵ ئێرانییەکانیان دێنایە گۆڕێ، ئێمە لێی ئاگادار دەبووین. جۆرێکی دیکەی بڵێین؛ ئێرانییەکان بێئەوەی بۆخۆیان پێبزانن ئەو زانیارییانەیان دەدا بە ئێمە.

دیارە بنیاتێکی زۆر گرنگی دیکەی خەبەرییش هەبوو کە ئیسرائیلییەکان بەهرەیان لێوەردەگرت ئەویش ئەردەشیری زاهیدی سەرۆکی نوێنەرایەتیی سیاسیی ئێران لە ئەمریکا بوو. ئەردەشیری زاهیدی ڕاپۆرتەکانی نوێنەرایەتیی سیاسیی ئێران لە ئەمریکای ڕاستەوخۆ دەنارده دەفتەری شا لە دەربار. ئەو ڕاپۆرتانە هەموو ئەو بابەت و دەنگوباسانەی لە پێتەختی ئەمریکا دەربارەی ناوچەی خۆرهەڵاتی نێوەڕاست لە ئارادا بوون و هەروەها دەستپێشخەرییە کانی ئەمریکا دەربارەی ئاشتیی خۆرهەڵاتی نێوەڕاست و پێوەندی- گرتنەکانی ئەم وڵاتە دەگەڵ «ئەنوەر سادات» سەرکۆماری میسریان دەگرتەوە.

لەحاڵێکدا ئێمە لە نامەنووسینی نوێنەرانی سیاسیی ئێران بەهرەی گرنگمان وەردەگرت، ئەو ڕاستییەشمان بۆ دەرکەوت کە زۆر لەو بابەت و دەنگوباسانە کە لەنێوان تاران و نوێنەرایەتییە سیاسییەکانی ئێران لە وڵاتانی بێگانە دەهاتن و دەچوون پووچ و بێبنەما بوون. بۆ وێنە ئێمە بۆمان دەرکەوت کە هێندێک لە سەرۆکانی نوێنەرایەتییە سیاسییەکانی ئێران لە وڵاتانی دەرەوە، ئەو سەروتارانەیان کە لە

ڕۆژنامــەکانی شــوێنی کاریانــدا دەنووســران وەردەگیــرا و بــەناوی لێکۆڵینـەوە و هەڵسـەنگاندنی خۆیـان لـە حـاڵوئـەحواڵ و دەنگوباسـی گرنگـی ولاتـی شـوێنی ئەرکەکـەیان بـۆ تـاران بـەڕێ دەکـرد. یـەکێک لەوانـە سـەرۆکی نوێنەرایـەتیی سیاسـیی ئێران لـە ئیسـڕائیل بـوو کـە سەروتارەکانی ڕۆژنامەی Jeruslaem postی کە تەنیا ڕۆژنامە بـوو لـە ئیســڕائیل بــە ئینگلیــزی بــڵاو دەبــۆوە، دەکردنــە فارســی و بــەناوی لێکدانەوە و هەڵسەنگاندنی خۆی لە دەنگوباس و وەزع و حاڵی ڕۆژی ئیسڕائیل ڕاستەوخۆ بۆ وەزیری دەرەوەی ئێرانـی دەنـارد. ئـەمکـارە هێندە بە بەردەوامی دەکرا کە ئێمە سەرەنجام بڕیارمان دا بۆ دەست-پێوەگرتنی وەخـت، سـەروتاری ڕۆژنامـەی Jerusalem post ببـڕین و بیخەینە سەر ئەو کاغەزە تایپکراوانە کە لـە کامپیووتـەر دەهاتنـە دەر و پەیامی بەکۆدنووسراویان تێدا بوو و بینێرین بۆ ئەو فەرمانبەرە کە دەنگوباسی ئیسڕائیلی هـەڵدەسـەنگاند. دیـارە چـون ئـەو کەسـانە زۆر وەخـت سـەروتاری ڕۆژنامـەکانیان دەخوێندەوە، کارەکـەیان زۆر بـۆ ئاسان دەبوو.

لە یەکەی ۸۲۰۰ ئێمە هەمیشە کاری ئیداریمان نەدەکرد.

بەیانیی ڕۆژی هەینی ۲ی ژووئیە (تەمووز)ی ۱۹۷٦، فەرمانم پێکرا کـە خـۆم بـە دەفتـەری سـەرهەنگ «یـی شـاک» بناسـێنم. زۆر لـەو ئەفسەرانەی دیکەش کە هـەموویان لـە زمانـە جۆراوجۆرەکانی دنیادا کارامە و شارەزا بوون، لەوێ ئامادە بوون. سـەرهەنگ «یـی شـاک» دەسـتووری پـێدایـن دەگـەڵی بچینـە دەفتـەری سـەرهەنگ «یووسـف زەیرا» Yosef zeira کە فەرماندەیەکی زۆر سەختگیر و ڕووگرژ بوو.

سـەرهەنگ زەیـرا دەرگـای دەفتەرەکـەی داخسـت و گـوتی: «لـەم ساتەوە تا بەیانیی ڕۆژی یەکشەممە دەبێ هەمووتان ون بن. دەبێ نـە بچنەوە ماڵەکانتان و نە دەست لە تەلـەفون بـدەن. ئێوە دەبێ بـە هـەر ڕێگایەکدا بۆتـان دەکـرێ خۆتـان ون بکـەن بـەجۆرێک کـە هـیچکـەس شوێنەوار و نیشانە و خەبەرێکی لێتان نەبێ».

هیچکام له ئەفسەرەکان نارەزایەتییان دەرنەبڕی. ئێمە نەماندەزانی مەسەلە چیە، بەڵام هەرچۆنی بێ ئەمە بناخەی کاری ئێمە بوو و ئەندامانی بنەماڵە و دۆستانمان دەگەڵی ئاشنا بوون.

سەرهەنگ «زەیرا» لێی زیاد کرد: «ئێوە دەبێ سەفەرێک بۆ کینیا بکەن. ئیسرائیل بڕیاری داوە بۆ ڕزگاریی گیانی موسافیرانی ئیسرائیلی و نائیسرائیلیی ئەو فڕۆکە جێتەی ئێرفرانس کە ڕۆژی ٢٧ی ژوئەن لە ڕێگای «تەل ئەبیب» بۆ «پاریس» دزرا، هێرشێکی کۆماندۆیی بکاتە سەر «عەینتەبە» Eintebbe. ئەندامانی تاقمی تێرۆریستیی «بادر ماینهۆف» Baader Meinhof فڕۆکەکەیان سەرەتا لە ڕۆم نیشاندۆتەوە، پاشان پێیان با داوەتەوە بەرەو ئاتێن و سەرەنجام لە فڕۆکەخانەی «عەینتەبە» نیشاندوویانەتەوە. موسافیرە نائیسرائیلییەکان ڕۆژی هەینی ئازاد کراون.

لەوکاتەدا پێوەندیی نێوان ئیسرائیل و «عیدی ئەمین» سەرکۆماری وەختی ئۆگاندا گەیبووە خەراپترین حاڵەتی مومکین. «عیدی ئەمین» کە یەکلایەنە خۆی کردبووە سەرکۆماری ئۆگاندا، پێشتر بە دۆستێکی نزیکی ئیسرائیل دەژمێردرا و بەهۆی کوودەتایەکەوە کە پاشکۆی سەربازیی پێشووی ئیسرائیل لە ئۆگاندا بەناوی سەرهەنگ «برووخ بارلێڤ» Barlev Brauch بەرنامەڕێژی و ڕێبەریی کردبوو، سەرکۆماریی ئۆگاندای دەست کەوتبوو. بەڵام ئێستا کە سەرهەنگ موعەممەر قەززافی سەرکۆماری لیبی، قەولی بە گەلانی ڕەشپێستی ئەفریقا دابوو کە ئەگەر پێوەندییەکانیان دەگەڵ ئیسرائیل بپچڕێنن کۆمەکی ماڵییان پێدەکا، ئۆگاندا مەیلی بەلای قەززافیدا شکابوو، بۆیە پێوەندیی ئیسرائیل و ئۆگاندا بەرەو ناسەقامگیری و نەمان ڕۆیشتبوو. بەوحاڵە، ئەمین هێشتا کەلکی لە نیشانەکانی پاراتروپر وەردەگرت کە تایبەت بەو سەربازانەیە کە دەورەی هاتنەخوار لە فڕۆکە بە چەتری نەجاتیان دیوە و کاتێک ئەو لە ئیسرائیل دەورەی دەدی، حکوومەتی ئیسرائیل پێی دابوو.

دیاره وردەکاریی ڕزگارکردنی فڕۆکە ئیسرائیلییەکە لە فڕۆکەخانەی «عەینتەبە» هەموو دەیزانن. ئەوەی لەو داستانە بە شاراوەیی ماوەتەوە، بەلایەکە کە هەرنەبێ بەسەر یەکێک لەو گرووپانە هات کە پشتیوانی ئەو عەمەلیاتە بوون. بەوجۆرە کە ئێمە ڕاهێنرابووین بە سواریی جێتێکی ٧٠٧ی هێزی هەوایی بچینە نایرووبی کە قەرار بوو وەک وێستگەیەکی هەواڵگیری کەلکی لێوەرگیرێ. بەرنامەکە وا ڕێکخرابوو کە ئێمە بە فڕۆکە بچینە نایرووبی، فڕۆکەکە لە فڕۆکەخانەی نایرووبی ڕاوەستێ و ئێمە بە وەکارخستنی دەزگاکانی هەواڵگیریی خۆمان و کەلکوەرگرتن لە شەپۆلەکانی دەنگی ڕادیۆ، ئەگەر پەیامێک بە زمانە جۆراوجۆرەکان بە شەپۆلەکانی دەنگدا تێپەڕی و بەرنامەی وەڕێکەوتنی تیمی نەجاتی ڕاگەیاند، لێی ئاگادار بین. ئەرکی من چاوەدێریی ئەو هەواڵانە بوو کە بە زمانی فارسی بەڕێ دەکران.

ئەگەرچی ئێمە لەجێدا لەبەر شارەزاییەک کە لە زمانە جۆراوجۆرەکاندا هەمانبوو ناردرابووینە ئەو مەئموورییەتە، بەلام فێر کرابووین کە بۆ عەمەلیاتی شەڕیش ئامادە بین تا ئەگەر پێویستی بە هێزی مرۆیی زیاتر هەبوو، ئێمە یەکەم گرووپ بین کە دەبوو بچینە پشتیوانی و یارمەتیی یەکەی ئامادە لە مەیدان لە فڕۆکەخانەی «عەینتەبە». تازە تێدەگەیشتم کە بۆچی لەسەرەتای چوونم بۆ خزمەت، دیتنی دەورەی کەرەسەی تەقینەوە لە بەرنامەکەمدا دانرابوو.

بۆیینگی ٧٠٧ کە لە فڕۆکەخانەی ئیسرائیل هەڵفڕی، هیچجۆرە نیشانەیەکی نەبوو. منیان بە هەموو کەرەسەی هەواڵگیرییەوە لە پشتەوەی فڕۆکە و نیزیک تەوالێتەکە دانابوو و پێیان گوتبووم کە لە تەواوی ماوەی عەمەلیاتی نەجاتدا ئەمن دەبێ لەو جێیە نەبزووم. لەکاتی فڕینی فڕۆکەکەدا، تەوالێتەکانی لەکار کەوتن و کەمێک پێش خۆرهەلات کە فڕۆکەکە لە فڕۆکەخانەی نایرووبی نیشت، دەزگای هەواکێشەکەشی خەراپ بوو. لەوکاتەدا کە فڕۆکەکە بۆ ڕاوەستان

بەرەو سووچێکی تاریکی فڕۆکەخانە، کە بۆیان دانابوو دەڕۆیشت، ئارەق لە سەروسیمامان هەڵدەچۆڕا. بەڕاستی وەختێک خۆر ئاوا بوو و شەو داهات ئیدی لەبەر بۆگەن و گەرمای سەخت هێزمان لەبەر بڕابوو.

بە پێچەوانەی عەمەلیاتی کۆماندۆیی و هێرش بۆ سەر «عەینتەبە»، ئەمن بێجگە لە گوێگرتن لە تەقەتەقی گووشی (سماعە) و هەوڵی پێشگرتن لە ڕشانەوە کارێکم نەبوو. ئێمە بە ڕادەی پێویست خواردن و ئاومان لەبەر دەست بوو، بەڵام ئەمن نەمدەتوانی دم لە خواردن بدەم. نازانم پاش چەند سەعات، ئەو تەکنیککارانەی لە فڕۆکەکەدا بوون، توانیان تەوالێتەکان و دەزگای هەواکێشی فڕۆکەکە چاک بکەنەوە و لەوە بەدوا ئەمن دەمتوانی بۆ گەڕان بەدوای دەنگوباسگەلێکدا کە لەوانە بوو بە فارسی بەڕێ بکرێن تاڕادەیەک بە ئاسوودەیی گوێ بۆ دەزگاکە ڕابگرم.

چەند سەعات دواتر دەنگی هاوارێک وەخۆی هێنایەوە. دەنگی ئەو هاوارە نیشانەی سەرکەوتنی عەمەلیاتی نەجات بوو. مەئمووریەتی نەجاتەکە بە سەرکەوتنەوە کۆتایی هاتبوو. مەئمووریەتی ئێمەش - ئەگەر بکرابا پێی بگوترێ مەئمووریەت- تەواو ببوو. کاتێک گەڕاینەوە فڕۆکەخانەیەک لە باکووری ئیسرائیل، میللەتی ئیسرائیل نوقمی شادی و خۆشحاڵی بوو. هەموو ئەوانەی بەجۆرێک لەو مەئمووریەتەدا بەشدار بوون، بێ گوێدانە ئەرکێک کە لە عەمەلیاتی نەجاتی فڕۆکەکەدا لە ئەستۆیان بوو، وەک قارەمان ڕێزیان لێگیرا. خاتوونێکی گەنج کە لەو وەختەدا دۆستی من بوو، کاتێک لە ڕووداوەکە ئاگادار بوو، لەوە کە لەنەکاو و بێخەبەردان ون ببووم لێم خۆش بوو و لەکاتێکدا توند دەباوەشی گرتبووم، سەروچاوی ماچ دەکردم. ئەمن هەوڵم دا تێیبگەیەنم کە کاری من لەو مەئمووریەتەدا تەنیا ئەوە بووە کە لە قوتوویەکی ساردیندا لە پەنا تەوالێتێکی بۆگەن دانیشم و ئاگام لە تەقەتەقی گووشییەکانم بێ. بەڵام ئەو قسەکانی

منی بە نەبوو دانان. ئەو گوتی، بەهەرحاڵ من وەک قارەمانێک چاو لێدەکا.

شەوێکی ساڵی ١٩٧٦ کاتێک ئەمن لە یەکەی ٨٢٠٠ نیگابان بووم، برووسکەیەکم خوێندەوە کە لە نوێنەرایەتیی سیاسیی ئێران لە «رامات گان»ەوە بۆ تاران بەرێ کرابوو. بە خوێندنەوەی ئەو برووسکەیە کەوتمە ئەو فکرەوە کە هەستی بینایيم لە گوازتنەوەی دەقی ئەو برووسکەیە بۆ مێشکمدا بەهەڵە چووە. چونکە نێوەرۆکی ئەو برووسکەیە بۆ من جێی باوەڕ نەبوو. سەرۆکی نوێنەرایەتیی ئێران لە ئیسرائیل لەو برووسکەیەدا باسی دیدارێکی کردبوو کە دەگەڵ نوێنەری «کۆمپانیای فڕۆکەسازیی لاکهید» لە ئیسرائیلی هەبووە. سەرۆکی نوێنەرایەتیی سیاسیی ئێران باسی کردبوو کە نوێنەری «کۆمپانیای فڕۆکەسازیی لاکهید» پێی‌گوتوە کە ئەو کۆمپانیایە، ٣\٥میلیۆن دۆلاری بەرتیل داوە بە«شیمۆن پرێز» وەزیری ئەوکاتی بەرگریی نیشتمانیی ئیسرائیل. بە خوێندنەوەی ئەو برووسکەیە کەوتمەوە یادی دەنگۆی پرشووەریی بەرتیلدانی «لاک-هید» لە ژاپۆن کە ئەو وڵاتەی تووشی قەیران کردبوو، بەڵام تا ئێستا هیچکەس لەبارەی تێوەگلانی ئیسرائیل لەو جۆرەکارانەوە شتێکی نەبیستبوو.

نێوەرۆکی ئەم برووسکەیە دەرخەری ساتوسەودای فرۆشتنی فڕۆکەی C-١٣٠ بە ئیسرائیل و ئیمکانی کڕینی فڕۆکەی زیاتری لەوجۆرە لەلایەن ئیسرائیلەوە و خۆپاراستن لە کڕینی جۆری دیکەی فڕۆکە لەلایەن ئەم وڵاتەوە بوو. ئەمن جارێکی دیکە وەرگێڕراوی برووسکەکەم سەیر کردەوە و دڵم حەسایەوە کە لە وەرگێڕانیدا هیچ هەڵەیەکم نەکردوە. لەوکاتەدا سەرهەنگ دووەم «یی شاک» لەجێی سەرهەنگ «یی ڕادۆر» ببووە فەرماندەی بەشەکەی ئێمە و سەرهەنگ «یی ڕادۆر» هەروا لە هەواڵگریی سوپادا ئەرکی خۆی بەجێ دەگەیاند. سەعات دەوروبەری نیوەشەو بوو. بەڵام چونکە

ئاگاداری سروشتی ئاژاوەسازی هەواڵی ئەو برووسکەیە بووم، تەلەفونم بۆ ماڵی «یی شاک» کرد. «یی شاک» بە خەواڵوویی وەڵامی تەلەفونەکەی دایەوە.

گوتم: «بەڕێز، ئێوە دەبێ هەر ئێستا بێنە ئیدارە».

«هیوادارم مەسەلەکە هێندە گرنگ بێ کە پێویست بکا لەم وەختەی شەودا بێمە ئیدارە».

«ئەگەر مەسەلەکە گرنگییەکی تایبەتیی نەبووایە، لەم وەختەی شەودا زەنگم بۆ لێنەدەدای. بابەتەکە بێئەندازە ناسکە».

«ئەگەر بابەتەکە بەڕادەی ڕاگەیاندنی شەڕ بەدژی ئیسرائیل لەلایەن میسرەوە، گرنگ نەبێ دەڵێم گونانت دەربێنن کە بەو شەوە درەنگە لەنێو نوێنی خەوم دەردەکێشی».

گوتم: «مەسەلەکە تەنانەت لەوەش گرنگترە».

٢٠ دەقیقە دواتر سەرهەنگ «یی شاک» بە یۆنیفۆرمی سەربازی بەڵام بە ڕیشی نەتاشراوەوە گەیشتە ئیدارە و گوتی: «چبابەتێک ڕووی داوە کە پێت وایە ئەوەندە گرنگە؟».

پێمگوت، دانیشێ و کامپیووتەرەکە بخوێنێتەوە. گوتی بە فارسی ناتوانم بیخوێنمەوە. پێمگوت ئەمن بە ئەنقەست وەرمنەگێڕاوە. پاشان نێوەرۆکەکەیم وشە بە وشە بۆ وەرگێڕا. وەختی وەرگێڕانی نێوەرۆکی برووسکەکە ئەوەندە دەنگم نزم کردبوو کە سەربازێکی ژن کە لەوسەری ژوورەکە خەریکی کار بوو، گوێی لە قسەکانم نەبوو. پاش ئەوەی سەرهەنگ «یی شاک» لە نێوەرۆکی بڕووسکەکە ئاگادار بوو، داوای لێکردم دووبارە بۆی وەرگێڕم.

پاشان گوتی: «لەوەی دەیڵێی دڵنیای؟».

«بەڵێ بەڕێز،ئەوپەڕی دڵنیاییم هەیە».

نێوەرۆکی بڕووسکەکە تەنانەت ژمارەحیسابی براکەی «شیمۆن پرێز»یشی تێدابوو کە دەبووایە بەرتیلەکە بخرێتە ئەو حیسابەوە لە ئورووپا. دەبێ بگوترێ کە سەرۆکی نوێنەرایەتیی سیاسیی ئێران لە

ئیسرائیل ئەگەر ئەوەی لێدەرکەین کە سەروتارەکانی ڕۆژنامەی وەردەگێڕا و بەناوی هەڵسەنگاندنی خۆی لە بارودۆخی ئیسرائیل دەینارده تاران، لە هەموو بارێکەوە پیاوێکی جێی متمانه بوو.

«یی شاک» تەلەفونەکەی هەڵگرت و داوای لە «بافی» کرد دەسبەجێ بێتە ئیدارە. کاتێک «بافی» گەیشتە ئیدارە ئەمن برووسکەکەم وەرگێڕابوو. «بافی» نێوەرۆکی بروسکەکەی خوێندەوە و نێوچاوانی تێکنا. چونکە ئەو پێوەندییەکی نزیک و باشی دەگەڵ «پرێز» هەبوو، دوای چەند ساتێک هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا.

ئەو بە ئارامی و بە لێبڕاوی گوتی: «ئەمن دەمەوێ دەقی ئەسڵیی ئەم برووسکەیە، وەرگێڕراوەکەی و هەموو پێشینەیەک کە پێوەندیی بەم برووسکەیەوە هەبێ لەنێو ببرێ.»

گوتم: «ئەم کارە کردەنی نیە. چونکە دەنگوباس و کاروباری پێوەندیدار بە نوێنەرایەتییە سیاسییەکانی بێگانە لە نێوخۆی ئیسرائیل لەلایەن «شاباک»ەوە کۆنترۆڵ دەکرێ نەک ڕێکخراوی سەربازی و هەربۆیە «شاباک» ئەو برووسکانەی لە کۆنترۆڵدایە کە دێنە خانووبەرەی نوێنەرایەتیی سیاسیی ئێران یان لێییەوە دەردەچن». «شاباک» هەموو ڕۆژێ برووسکەکانی بۆ دەناردین. ئێمە لە ڕەمزمان دەردێنان و بەیانیی زووی ڕۆژی دواتر، «شاباک» داوای لێدەکردین هەموو برووسکەکانی دەگەڵ وەرگێڕراوەکانیان بۆ بنێرینەوە. بەمجۆرە بە فڕێدانی بابەتەکە لە کامپیووتەری ئێمە، مەسەلەکە چارەسەر نەدەکرا. چونکە، کامپیووتەری «شاباک»یش پێشینەیەکی وانی بۆخۆی ڕادەگرت.

بەهەرحاڵ، بەیانیی ڕۆژی دواتر، بۆ یەکەمجار «شاباک» لەبارەی ناردنەوەی برووسکەکەوە پرسیارێکی لێنەکردین. ئەو ڕۆژە بەرلەوەی ئەمن لە ئیدارەوە بەرەوماڵ بیمەوە، بانگ کرامە دەفتەری «بافی». ئەو بەمنی گوت: «ئێمە هەموومان دەزانین ئەتۆ ئەفسەرێکی

باش و پیاوێکی نیشتمانپەروەری و ئاشقی وڵاتەکەتی، و ئەمن دڵنیام کە لەم بابەتە خەبەرێک ناچێتە دەر».

ئەو ژنە گەنجەی لەگەڵ من کاری دەکرد، خێرا گوازرایەوە شوێنێکی دیکە لە یەکەی ٨٢٠٠ لە باکووری ئیسرائیل و پاش ماوەیەکی کورت سەرهەنگ «بن پوورات» پلەی بۆ سەرتیپی بەرز کرایەوە و دوایە بە وتەبێژی ڕەسمیی وەزارەتی بەرگریی ئیسرائیل دیاری کرا. ئەمن بەڕاستی نازانم «پرێز» ئەو بەرتیلەی وەرگرت، یان نا. نازانم پاش ئەوەی ئەمن لە بەڵێنەکەی خۆم دەرچووم و بابەتەکەم دەگەڵ سەرۆکەکانم باس کرد، ئەوان بابەتەکەیان «دیزەبەدەرخۆنە» کرد یان نا، بەڵام ئەوی بۆمن ڕوونە ئەوەیە کە هیچ کاتێک لەبارەی ئەو بەرتیلدان و بەرتیلوەرگرتنەوە خەبەرێک نەچووە دەر و خەڵکی ئیسرائیل لێی ئاگادار نەبوون.

سەرەتاکانی ساڵی ١٩٧٧ سەرهەنگ «یی شاک» بە منی گوت دەبێ بچمە ئیتالیا و لە وێستگەی هەواڵگیریی یەکەی ٨٢٠٠دا کار بکەم. بە بیستنی ئەو خەبەرە زەنگی مەترسی لە گوێمدا لێدرا. چونکە بەتازەیی دووکەس لە ئیشکەرانی ڕێکخراوی هەواڵگریی سەربازیی ئیسرائیل کە لەو وێستگەیە کاریان دەکرد،کوژرابوون و هەرچەند هیچکەس بەرپرسایەتیی کوشتنی وانی وەئەستۆ نەگرتبوو، بەڵام وای بۆ دەچوون کە کاری (PLO) ڕێکخراوی ڕزگاریدەری فەلەستینە.

پاش کوشتاری قارەمانانی ئیسرائیلی لە یارییەکانی ئۆلەمپیکی ساڵی ١٩٧٢دا شەڕێک لەنێوان «مۆساد» و گرووپێکی فەلەستینی بەناوی «سێپتامبر (ئەیلوول)ی ڕەش»دا هەڵگیرسابوو. ئەوان لە هەر دەرفەتێکدا بۆیان ڕەخسابا، یەکتریان دەکوشت. ئێمە ئاگادار ببووین کە کەسێک لە نوێنەرایەتیی سیاسیی ئیسرائیل لە ڕۆم، ناو و کارەکانی سوپای ئیسرائیل و ئیشکەرانی ئەمنیەتی دەداتە فەلەستینییەکان. هێندێک نیشانە هەبوون کە هەر لەگەڵ چوونم بۆ ڕۆم، دەبمە ئامانجی فەلەستینییەکان. ئەوە ڕاستە کە هێندێک

دەمەسات لە ژیانی مرۆڤدا هەن کە گیانی بۆ وڵاتەکەی دەخاتە مەترسیی نەمانەوە، بەڵام ئەمن پێمخۆش نەبوو یەک لەو کەسانە بم کە لە هیچوخۆڕایی دەبنە قوربانی.

گوتم: «ئەمن ناچمە ئەو مەئموورییەتە. ئێوە دەتوانن چیتان پێ-خۆشە بیڵێن یان هەرکارێک دەتانەوێ بیکەن، بەڵام ئەمن ئامادەی ئەو مەئموورییەتە نیم».

«یی شاک» زۆر تووڕە بوو و گوتی: «لەو حاڵەدا ئەتۆ بەهۆی سەرپێچییەوە دادگایی سەربازی دەکرێی».

وەڵامم دایەوە: «قەیدێ ناکا، هیچنەبێ زیندوو دەمێنم».

بەیانیی ڕۆژی دواتر بانگ کرامە ڕێکخراوی ئیداریی ئەفسەران، جێیەک کە دوو پۆلیس چاوەڕێم بوون. بەتاوانی سەرپێچیی سەربازی بردیانمە دادگایەکی تایبەتیی سەربازی. ئەمن پارێزەرێکم بۆخۆم هەڵنەبژارد. دادگای تایبەتی بە گوناحباری ناسیم و بە ١٤ ڕۆژ زیندان و هێنانەخواری پلە لە سەروان (ملازم)ەوە بۆ گرووبان (عەریف) مەحکوومی کردم. پێشم گوترا کە ئیدی چوونەسەری دوو ساڵ زێدە خزمەت لە سوپاشمدا نابێت و پاش ئەوەی خزمەتی ئاسایی سەربازیم تەواو کرد، لە خزمەت ئازاد دەکرێم.

بۆ گوزەراندنی ١٤ڕۆژ زیندانەکە ناردیانمە زیندانێکی سەربازی لە نزیک حەیفا. خاتو «شوولامیت ئینگرمەن» کە سەرۆکی ئیداریم بوو، چاوەڕێم بوو کە پێم بڵێ سەرهەنگ «یی شاک» دادگەریی پێویستی دەرهەقی من ڕەچاو نەکردوە و بۆیە ئەو چۆتە لای سەرۆکی ڕێکخراوی هەواڵگریی سەربازی و قانیعی کردوە کە بمبەخشێ. دەبێ ئەوەش زیاد بکەم کە تەنیا کەسێک دەتوانێ حوکمی دادگایەکی سەربازی هەڵوەشێنێتەوە کە پلەی سەرلەشکر، یان هەورازتری هەبێ.

«شوولامیت» گوتی: «ئەگەر دووبارە بەڵێنی دووساڵ زێدەخزمەت لە سوپادا ئیمزا بکەی، دەسبەجێ پلەکەت وێدەدرێتەوە».

لەوکاتەدا کەمتر لە مانگێکم مابوو خزمەتی ئاسایی سەربازیم تەواو بێ و ئەگەر بەڵێنی دووساڵ زێدەخزمەتم ئیمزا کردبایە، دەبوو دووساڵی دیکە وەک ئەفسەرێکی سوپا درێژە بە خزمەت بدەم. ئەم ڕووداوە دەرفەتی دامێ کە لەژێر قەرارومەداری دووساڵ زێدەخزمەتی خۆم دەربچم. بۆیە بە سەرهەنگ «یی شاک»م گوت: «لەوە کە بەخشیوتم، سوپاسگوزارم، بەڵام حەز ناکەم درێژە بە زێدەخزمەتەکەم بدەم».

ئەگەر بمەوێ ڕاستگۆ بم، دەبێ بڵێم لە ئەنجامدانی ئەو ئەرکەی پێیان سپاردبووم، ماندوو ببووم. ئەمن کۆدەکەم کردبۆوە و پێمخۆش نەبوو دوو ساڵی دیکە لەوێ بمێنمەوە. ئەمن ڕووم لە لایەکی دیکە بوو. دەمەویست لە قووڵترین ڕیزی هەواڵگری و جاسووسیی ئیسرائیل: ئیدارەی پێوەندییەکانی دەرەوەی هێزەکانی بەرگریی ئیسرائیل یان هەواڵگری و جاسووسیی سەربازیدا کار بکەم. ئەمن حەزی بەرزەفڕیم هەبوو و بەو توانا و کارامەیی و پێشینە بێوێنەیە کە هەمبوو، هەستم دەکرد کە کارکردن لە ئیدارەی پێوەندییەکانی دەرەوەی هێزەکانی بەرگریی ئیسرائیلدا وەڵامی هەستی بەرزەفڕییەکەم دەداتەوە.

ئەمن توانیم وتووێژێک لەگەڵ دەفتەری سەرۆکی کارسپێری (کارگزینی)ی هەواڵگری و جاسووسیی سوپادا بکەم. لەو وتووێژەدا ڕوونم کردەوە کە ئاواتمە وەک کارمەندێکی ناسەربازی لە ڕێکخراوی هەواڵگری و جاسووسیی سوپا لە ئیدارەی پێوەندییەکانی دەرەوەدا کە نیزیک بە تەواوی کارمەندەکانی ناسەربازی بوون، کار بکەم.

ڕۆژی سێیەمی مانگی مەی (ئەیار)ی ساڵی ١٩٧٧ بە تەواوبوونی خزمەتی سەربازییەکەم، لەخزمەت ئازاد کرام. دوای ئەوە لە چەند وتووێژدا، بۆ وێنە وتووێژێک دەگەڵ سەرۆکی ئیدارەی پێوەندییەکانی دەرەوە، سەرهەنگ «مایر مایر» Meir Meir بەشدار بووم.

ئەو گوتی: «پێموایە ئێمە دەتوانین لە شارەزایی تۆ لە زمانی فارسیدا کەلک وەرگرین.»

هەرلەو کاتەدا «مۆساد» کارێکی بۆ بەشداری لە عەمەلیاتێکی خۆی لە ئورووپا پێ پێشنیار کردم، بەلام چونکە چاوم بڕیبووە کارێک لە ئیدارەی پێوەندییەکانی دەرەوە، ئەوم ڕەت کردەوە. «شاباک»یش پێشنیاری پێکردم لە یەکەی پێوەندیدار بە ئێران لەو ڕێکخراوەدا دەست بەکار بکەم. ئەگەر ئەو پۆستەم وەرگرتبا لەوانە بوو لە دواڕۆژدا بگوازرێمەوە وەزارەتی دەرەوەی ئیسرائیل. بەلام حەزم لەوکارەش نەدەکرد. ئەمن بۆخۆم دەمزانی لەدوای چی عەودالم.

سەرەنجام پەیامەکە هاتەوە. ئیدارەی پێوەندییەکانی دەرەوەی هێزەکانی بەرگریی ئیسرائیل منی وەرگرتبوو.

دیارە ئەگەر زانیبام لەوێ چباسە، لەوانە بوو چوون بۆ ئورووپا بە سلامەتتر بزانم و ئەوم لە پێوەندی دەگەڵ ئیدارەی پێوەندییەکانی دەرەوە بە باشتر زانیبا.

ڕۆژی ١٥ی ئووت (ئاب)ی ساڵی١٩٧٧، یەکەمین ڕۆژی چوونی من بۆ ئیدارەی پێوەندییەکانی دەرەوەی هێزەکانی بەرگریی ئیسرائیل یان ڕێکخراوی هەواڵگری و جاسووسیی سوپا بوو. چۆن دەتوانم ئەو ڕۆژە لەبیر بکەم، گوویی ڕاستەم بەهۆی کیسی ددانەوە بە توندی هەڵمسابوو و ئەو زیپکانەی لەسەر ژێدەنگەکانم هاتبوون قسەکردنیان زۆر بۆ دژوار کردبووم. ماوەی سێ حەوتووی خایاند هەتا لەشساغیی خۆمم بەدەست هێنایەوە و گەڕامەوە باری ئاسایی. بە هەرحاڵ، جاسووسەکانیش بنیادەمن.

ئیدارەی پێوەندییەکانی دەرەوەی هێزەکانی بەرگریی ئیسرائیل کە لەڕاستیدا ئەرکی هەواڵگری و جاسووسیی سوپای ئەم وڵاتەی بەجێ دەگەیاند، یەکێک لە موعتەبەرترین ڕێکخراوە هەواڵگرییەکانی ئیسرائیل بوو. پێشینەی مێژوویی ئەم ڕێکخراوە دەگەڕایەوە سەر «کۆمیسیۆنی ئاگرانات»ی ساڵی ١٩٧٣ کە بە فەرمانی سەرۆکوەزیر بۆ لێکۆڵینەوە لەبارەی تەنەخیی ڕێکخراوە هەواڵگرییەکانی ئیسرائیل لەکاتی هێرشی لەنەکاوی میسر و سووریە بۆ سەر ئیسرائیل لە ڕۆژی «یوم کیپوور»ی ساڵی ١٩٧٣دا دامەزرابوو. «کۆمیسیۆنی ئاگرانات» پاش بەدواداچوونی پێویست، ڕاپۆرتێکی نهێنیی ئامادە کرد و بۆ لابردنی کەموکوڕییەکان هێندێ پێشنیاری کرد کە چەند دانەیان دەسبەجێ لەلایەن حکوومەتی ئیسرائیلەوە جێبەجێ کران. یەکێک لەوان کە بۆخۆم بەباشی لێی ئاگادارم، ئەوە بوو کە هەواڵگریی سوپا دەبێ بکرێتە ڕێکخراوێکی هەواڵگریی گەورەتر کە لە «مۆساد» بەتواناتر بێ. لەئاکامی ئەم ئاڵوگۆڕەدا، ئاسایشی نیشتمانیی وڵات و هەرچی پێوەندیی بە کاروباری ئاسایش و ئارامیی وڵاتەوە هەبوو بەتەنیا خرایە ژێر بەرپرسایەتیی سەرۆکی هەواڵگری و جاسووسیی سوپا. بەجۆرێکی دیکە بڵێین، چاوەدێری بەسەر ئاسایشی نیشتمانیی وڵاتدا لە دەستی ڕێکخراوە هەواڵگری و جاسووسییەکانی دیکەی

وڵات هاتە دەر و بەتەواوی درایە دەستی هەواڵگری و جاسووسیی سوپا.

یەکی دیکە لە پێشنیارەکانی «کۆمیسیۆنی ئاگرانات» دروستکردنی ئیدارەی پێوەندییەکانی دەرەوەی هەواڵگریی سوپا بوو. ئەم ڕێکخراوە لە یەکەیەکی پێشتر کە پێی دەگوترا «پێوەندییەکانی بێگانە» دروست بوو. کاتێک ئەمن لەساڵی ١٩٧٧دا، تێکەڵ بە «ئیدارەی پێوەندییەکانی دەرەوە» بووم ئەم ڕێکخراوە چوار لقی هەبوون بەم شێوەیە:

١-لقی کۆمەکگەیاندن (SIM) کە لە ڕێگای ئەوەوە یارمەتیی تایبەتی دەدرایە وڵاتانی دیکە و «بزووتنەوە ڕزگاریخوازییەکان». بە دروستبوونی SIM، ڕێکخراوی «مۆساد» کە پێشتر بەرپرسی گەیاندنی یارمەتییەکانی دەرەوە بوو، بوو بە ئەڵقەیەکی پێوەندی لە نێوان وڵاتانی دەرەوە و SIMدا.

٢-ئەو لقە کە ئەمن یەکەمجار بەهۆی ئەوەوە دامەزرام و پێیان-دەگوت RESH-RESH لەزمانی عیبریدا بۆ گوتنی پیتی R بەکار دەبرێ. لقی R بەرپرسی پێکهێنانی پێوەندی دەگەڵ تۆڕە هەواڵگرییەکانی دەرەوە و دان و وەرگرتنی زانیاری دەگەڵ وان بوو. ڕێکخراوی «مۆساد»، لقێکی پانوبەرینی هەبوو بەناوی «تێڤێل» Tevel کە هەر ئەو ئەرکانەی لقی Rی بەجێدێنا، و کاتێک لقی R دروست کرا و جێی گرت، هێندێ گیروگرفتی بۆ«تێڤێل» دروست کرد. بەو جۆرە کە لقی R لەبەرامبەر ئەو زانیارییانەدا کە لە وڵاتانی دەرەوەی وەردەگرتن، دەبوو هێندێ زانیارییان بداتێ. ئەوەش کە وڵاتانی خۆرئاوایی حەزیان دەکرد وەری بگرن، زۆرتر زانیاریی تەکنیکی لەبارەی سیستمی چەکوچۆڵەی سۆڤیەت و بەجۆرێکی دیکە بڵێین، زانیاریی سەربازی بوون. چونکە ڕێکخراوی «مۆساد» بە دروستبوونی لقی R ئیدی دەستی بەو بەشانە ڕانەدەگەیشت کە کاروباری سەربازییان لێکدەدایەوە، ئیدی ناچار بوو بۆ بەدەست-هێنانی زانیاری دەستی یارمەتی بۆ لقی R درێژ بکا. ئاکام ئەوە بوو

کە «تیڤێل» کە وەختێک ڕێکخراوێکی بەهێز بوو، ناچار بوو وەک بەشی پێوەندی کار بۆ لقی R بکا.

٣- لقی سێیەم پێی‌دەگوترا «پێوەندیی دەرەوە» و ئەرکی چاوەدێری بەسەر پاشکۆ سەربازییەکان و ئەو ئیشکەرانەی سوپای ئیسرائیلدا بوو کە لە ولاتانی دەرەوە خەریکی کار بوون. ئەم لقە هەروەها بەرپرسی پێوەندی دەگەڵ ئیشکەرانی سەربازیی ولاتانی دەرەوە و پاشکۆ سەربازییەکانی دەرەوە لە ئیسرائیل بوو.

٤-لقی چوارەم پێی‌دەگوترا «هەواڵگریی١٢» و لقێکی پێوەندیی گشتی دەگەڵ ڕێکخراوی «مۆساد» بوو.

بێجگە لەو چوار لقەی لەسەرەوە باسمان کردن، پێوەندییەکانی دەرەوە خاوەنی ئەفسەرێکی عەمەلیاتییش بوو کە بە شێوەی ڕاستەوخۆ لەژێر چاوەدێریی سەرۆکی ئەو ئیدارەیەدا کاری دەکرد. ئەفسەری عەمەلیاتی، بەرپرسی کاروباری لۆژیستیکی وەک پاسپۆرتەکان، ئەو کۆنفرانسانەی پێوەندییان بە دان و وەرگرتنی زانیارییەوە هەبوو، کیسەکانی پەیکی سیاسیی دیپلۆماتی کە دەهاتنە ئیسرائیل یان لەوێوە دەردەچوون، کارە ئەمنیەتییەکان و شتی وا. ئەو ساڵۆنانەی کۆنفرانسی ئیدارەی پەیوەندییەکانی دەرەوەش کە دیدارە نهێنییە هەواڵگرییەکانیان تێدا بەڕێوە دەچوون لەژێر چاوەدێریی ئەفسەری عەمەلیاتیدا بوون.

بێجگە لەوەی ئەمن کارم بۆ لقی R دەکرد، دەفتەری سەرۆکی هەواڵگریی سەربازی پێی‌سپاردبووم کە دەگەڵ ئێرانییەکانیش کار بکەم. دەفتەری سەرۆکایەتیی هەواڵگریی سەربازی، پێی‌خۆش بوو کەسێک کە ئاگاداریی پێویستی لەبارەی ئێرانەوە هەیە، دەگەڵ ڕێکخراوی هەواڵگریی ئێرانییەکانیش پێوەندیی ڕاستەوخۆی هەبێ. لەو سەروبەندەدا نوێنەری «مۆساد» لە تاران کەسێکی زۆر بێ‌مایە بوو و سەرەنجام سەرۆکانی «مۆساد» و «تیڤێل» ڕێککەوتن، لەتاران بانگی بکەنەوە، جێگری پاشکۆی سەربازی، سەرهەنگ

«ئیسحاق کەهانی»یش کە وەک نوێنەری ئیدارەی پێوەندییەکانی دەرەوە لە تاران کاری دەکرد تاڕادەیەک لە کارەکانیدا ناسەرکەوتوو بوو، چونکە زمانی فارسیی نەدەزانی و نەیدەتوانی هەلومەرجی ئێران تێبگا.

لە ڕۆژەکانی کۆتایی مانگی سێپتامبر (ئەیلوول)ی ساڵی ١٩٧٧دا ئەمن هەمیشە لە نێوان تەل ئەبیب و تاران لەسەفەردا بووم. هۆیەکەشی ئەوە بوو کە ئەمن لە تاران لەدایک ببووم و هێشتا لە ئێران منیان وەک ئێرانیی دەناسی، و هەرچەند لەو کاتەدا هاونیشتمانەتیی ئیسرائیلم بەدەست هێنابوو، بەڵام هێشتا بە پەیڕەوی قانوون و ڕێوشوێنەکانی ئێران دەژمێردرام. چونکە ئێرانییەکان دوو هاونیشتمانەتی بە ناقانوونی دەزانن، ئەمن نەدەبوو پاسپۆرتی سیاسیی خاریجیم کە حکوومەتی ئیسرائیل بۆی دەرکردبووم، هەبێ. گیروگرفتەکە بەوە چارەسەر کرا کە حکوومەتی ئیسرائیل پاسپۆرتێکی سیاسیی بۆ دەرکردم کە شوێنی لەدایکبوونمی تێدا نەنووسرابوو و ئەمن تەنیا ئەو کاتەی دەچوومە تاران کەلکم لێ-وەردەگرت.

لە دواساڵەکانی دەیەی ١٩٦٠دا لە نێوان ئێران و ئیسرائیل پێوەندیی سیاسی دامەزرا و ئێرانییەکان لە «ڕامات گان» باڵیۆزخانەیەکی تەواویان دامەزراند کە بریتی بوو لە باڵیۆزێک، کونسوولێک، پاشکۆیەکی بازرگانی، پاشکۆیەکی سەربازی و نوێنەرێکی «ساواک». بەڵام، خانووبەرەکەی شێوەی ڕواڵەتیی باڵیۆزخانەیەکی ڕەسمیی نەبوو. چونکە نە لەسەر دەرگاکەی نیشانەیەک هەبوو و نە ئاڵایەکی لەسەر هەڵدرابوو.  بە ڕواڵەت باڵیۆزخانەی سویس لە ئیسرائیل پارێزگاریی قازانجەکانی ئێرانی لە ئەستۆ بوو. بەڵام کەسانێک کە بۆ کاروباری خۆیان دەچوونە باڵیۆزخانەی سویس، ڕێنوێنی دەکران بچنە باڵیۆزخانەی نارەسمیی ئێران لە «ڕامات گان».

ئیسـرائیلیش باڵیۆزخانەیـەکی نارەسـمیی وەک باڵیۆزخانـەی نارەسمیی ئێران لـە ئیسرائیلی لـە تـاران دامەزرانـدبوو. خانووبـەرەی باڵیۆزخانـەی [ئیسـرائیل لـە] ئێـران لـە شـەقامی «کـاخ» بـوو. بـەڵام لەحاڵێکدا هیچ نیشانەیەکی باڵیۆزخانەبوونی لەسەر دەرکودیوارەکەی نەبوو، هەمووکـەس دەیزانـی ئـەوە باڵیۆزخانـەی ئیسرائیلە. هـۆی ئـەو شێوە زیرەکانەیە ئەوە بوو کە شا دەترسا ئەگەر بەرەسمی پێوەندیی رەسمی دەگـەڵ ئیسـرائیل دامـەزرێنێ، پێـوەندییـەکانی دەگـەڵ وڵاتـانی عەرەبی بپچڕێن. دیارە عەرەبەکان بە تەواوی لـە بـوونی نوێنەرایـەتیی سیاسیی ئێران و ئیسرائیل لـە خـاکی وڵاتـانی یـەکتردا ئاگادار بوون. بەڵام بەکاربردنی ئەو فێڵە دەبووە هـۆی ئـەوەی عـەرەبـەکان بابەتەکە بە نەدیتراو دابنێن.

سـەفەرەکانی مـن بـۆ تـاران سـەرهەنگ «کـەهانی» و رێکخـراوی «مۆسـاد»یـان زۆر نـارەحـەت کردبـوو. چونکـە ئـەوان بـە نیازخـەراپی پێیـان وابـوو سـەفەرەکانی مـن بـۆ تـاران، ئـەنجامـدانی بەشـێک لـە ئەرکـەکانیان پـەک دەخـا. بـەڵام بەهـەرحاڵ ئـەوان بەرامبـەر بـە کاروبارەکـەی مـن لـە تـاران بێدەنگییان هـەڵبژارد، چونکـە سـەرۆکی بەهێزی رێکخراوی هەواڵگریی سوپا منی ناردبووە ئەو مەئمووریەتە.

لە تاران ئەمن عادەتەن چاوم بە نوێنـەری سـاواک و فەرمانبـەرانی سـوپای ئێـران دەکـەوت. ئـەم دیدارانـە زیـاتر لـە ژوورەکـەی مـن لـە هۆتێل «کارلتۆن» کە زۆر لە باڵیۆزخانەی نارەسمیی ئیسرائیل دوور نەبوو، بەرێوە دەچوون.

بێجگـە لـە دان و وەرگرتنـی زانیـاری لـەبارەی عێـراق و وڵاتـانی دیکـەی عـەرەبی، کارمەنـدانی هـەواڵگریی ئێرانیش و منـیش زانیـاریی تەکنیکیمان دەگۆڕیەوە. بۆ وێنە لەوکاتەدا ئیسرائیل لە رێکخـراوی سـە نعەتە سەربازییەکانی ئەم وڵاتە، خەریکی دروستکردنـی تانکێـک بـوو بەناوی «مێرکاوا» Merkava. ئەوانەی ئەو تانکانەیان دروست دەکرد، پێیانخۆش بوو لە پێکهاتەی وەرەقەی کانزایی ئەو تانکانە ئاگادار بن

کـه ئینگلیزییـەکان دروسـتیان کردبـوون و لـە دروسـتکردنـی پێشکەوتووترین تانکەکانیاندا بەکار برابوون و هێندێک لەو تانکانەش بەدەستی ئێرانییەکانەوە بوون. ئەو کانزایە پێی دەگوترا کانزای «چوبحان» Chobhan و لە بەرامبەر ئەو ڕاکێت و مووشەکانەدا کە ڕاستەوخۆ پێیەوە دەنران خۆڕاگر بوو. بۆ بەجێهێنانی فەرمانی سەرۆکەکانم تکام لە ئێرانییەکان کرد، ئەگەر دەکرێ لە ڕێگای ئیدارەی پێوەندیی دەرەوەی خۆیانەوە، نموونەیەک لەو کانزایەمان بدەنێ.

هاوتا ئێرانییەکەم گوتی: «تەنیا ڕێگا بۆ ئەوەی داخوازەکەت جێبەجێ بکرێ ئەوەیە کە ئێمە بەدەنەی تانکێکت بۆ ببڕین».

ئەوان ئەو کارەیان کرد. پارچە کانزایەکیان لە بەدەنەی تانکێکی خۆیان بڕی، لە سندووقێکی داریان خست و بە مۆری پەیکی سیاسی ناردیانە ئیسرائیل. ئەم کارە تانکەکەی وانی لەکار نەخست، بەڵام قایمییەکەی کەم کردەوە. چونکە بەدەنەی تانکەکە دەبوو بە کانزایەکی نزمتر پینە بکرێ. دواتر، لە سەرەتای ساڵەکانی دەیەی ١٩٨٠دا ئینگلیزییەکان بۆیان دەرکەوت کە تانکەکانی «مێرکاوا» لە جۆری ئەو کانزایە دروست کراون کە ئەوان لە تانکەکانی خۆیاندا بەکاریان بردوون.

ئەگەرچی شا لەوکاتەدا بەڕەسمی ناکۆکییەکانی خۆی دەگەڵ عێراقی چارەسەر کردبوون، بەڵام چونکە ئیسرائیل و ئێران هەردووکیان عێراقیان بە دوژمنی هاوبەشی خۆیان دەزانی، ئێمە دەگەڵ ئێران زۆرمان زانیاری لەبارەی عێراقەوە پێک دەگۆڕیەوە. ئێمە هەروەها هێندێ زانیاریمان لەبارەی کاری ئەو گرووپە ئێرانییانەی دژی شا کە لە لوبنان دەژیان، دەدایە ئێرانییەکان. دەنگوباسی پێوەندیدار بە شۆرشی ڕووبەگەشەی ئێران، لەپێشدا لەلایەن شیعە ئێرانییەکانی دژی شاوە کە لە لوبنان دەژیان دەگەیشتە دەرەوە.

ئەمن بە دۆستە ئێرانییەکانمم گوت: «ئێوە دەبێ زۆر وشیار بن، چونکی ئێمە پێمانوایە ئێوە لە داهاتوودا دەگەڵ گیروگرفتێکی گەورە بەرەورووو دەبن».

بێجگە لەو دیدارانە کە ئەمن دەگەڵ بەرپرسە هەواڵگرییەکانی ئێرانم هەبوون و لەواندا زانیاریمان پێک دەگۆڕینەوە، ئەرکێکی دیکەش لە تاران بەمن سپێردرابوو. بەوجۆرە کە دەبوو ڕاپۆرتێک لەسەر کاروباری حیزبی ژێرزەمینیی توودەی ئێران کە گرووپێکی لایەنگری سۆڤیەت بوو، ئامادە بکەم. لە ئاکامی ئەو دیدارە توێژەرییانەدا کە لە زانکۆی تاران ئەنجامم دان، دەگەڵ دوو دۆستی تایبەتی بوومە ئاشنا کە دواتر لە ژیانی من و لە مەیدانی پێچەڵپووچی سیاسیی خۆرهەڵاتی نێوەڕاستدا ڕۆڵی گرنگیان یاری کرد.

یەکێک لەو دووکەسە خۆی ناو نابوو مەحموودی ئەمیریان کە دیارە ناوێکی ساختە بوو و خەریکی نووسینی تێز (نامە)ی دوکتۆراکەی لەبارەی «مارکسیزم»ەوە بوو. هۆی ئەوە کە ئەو کەلکی لە ناوی ساختە وەردەگرت ئەوە بوو کە لە دواساڵەکانی دەیەی ١٩٦٠دا بەهۆی چالاکیی ڕووخێنەرانە لەلایەن «ساواک»ەوە گیرابوو. پاش ئەوەی لە زیندان ئازاد کرابوو، ئێرانی بەجێهێشتبوو، چووبووە باکۆ لە سۆڤیەت کە نیزیکی سنوورەکانی ئێرانە و هەتا ساڵی ١٩٧٩، کە بە ناوی ساختە و بە پاسپۆرتی فەڕانسەیی گەڕایەوە ئێران، لە باکۆ ژیابوو. ئەو وەک ئێرانییەک کە لە فەڕانسە لەدایک بووە ولەوێ ژیاوە، هاتەوە ئێران. ئەو بە باشترین شێوەی گونجاو کەسییەتیی ڕاستەقینەی خۆی شاردبۆوە.

دوای ئەوەی بووینە دۆستی یەکتر و ئەمن بە کەسییەتیی ڕاستەقینەی ئەوم زانی، بۆی ئاشکرا کردم کە ئەو یەکێک لە ئەندامە گرنگەکانی حیزبی توودە و سەرپەرستی پێوەندییەکانی دەرەوەی ئەم حیزبە بووە. ئەم پیاوە خاوەنی خوێندەوارییەکی زۆر بەرز بوو و باوەڕی بە «ئامانج» هەبوو. هەرچەند ئەو دەیزانی ئەمن ئەندامی

ڕێکخراوی هەواڵگریی ئیسرائیلم، بەو حاڵە متمانەی پێدەکردم و تەنانەت ئەم بابەتەشی لەگەڵ باس کردم.

کەسێکی دیکە کە ساڵی١٩٧٧، لە زانکۆی تاران دیتم، سەید مەهدیی کاشانی بوو کە خەریکی نووسینی تێزی ماستەرەکەی لە بارەی «پێکەوەژیانی شیعە [و سوننە] لە باشووری عێراق بوو. ئەو کوڕی ئایەتوڵڵا سەید ئەبولقاسمی کاشانی بوو کە لەو سەردەمەدا یەکێک لە ڕێبەرانی شیعەی دژبەری ڕێژیم بوو و لە شاری قوم دەژیا. مەهدیی کاشانی چەند ساڵ لەمن گەورەتر بوو و ئەویش وەک ئەمیریان بەهۆی چالاکیی دژی ئەمنیەتی بەدژی شا، کەوتبووە بەندیخانە.

دیدار و ئاشنایەتیی من دەگەڵ ئەو دوو کەسە زۆریش بە ڕێکەوت نەبوو. لە ڕاستیدا بەشی لێکۆڵینەوە و بەدواداچوونی ڕێکخراوی هەواڵگریی سوپای ئیسرائیل بە منی ناساندبوون. ئیسرائیل ڕایەڵکەیەکی هەواڵگریی لەنێو تاراندا هەبوو کە لە جوولەکەکانی ئەو شارە پێکهاتبوو و زانیارییەکی بەنرخی دەربارەی هێزەکانی دژبەری ڕێژیم لە پێتەخت هەبوو. کاشانی و ئەمیریان هەردووکیان منیان بە دۆستانی خۆیان لەنێو گرووپەکانی دژبەری ڕێژیمدا ناساند. قسەکانی ئەو کەسانە وایانکرد، باوەڕ بکەم کە ڕێژیمی شا خەریکی لەبەریەک-هەڵوەشانە. بۆیە لە سەرەتای ساڵی ١٩٧٨دا هێندێ ڕاپۆرتم بۆ ئیسرائیل ئامادە کردن و بە لێبڕاوییەوە گوتم ڕێژیمی شا تەمەنێکی زۆری نەماوە. هەروەها لە ڕاپۆرتەکانمدا گوتم هێزە دژبەرەکان ئیدی بە گەشبینییەکی هەڵقولاو لە ئارەزووەوە قسە لە ڕووخاندنی ڕێژیمی شا ناکەن. بەڵکوو بۆ یەکەمجار لە گەشبینیی هەستەکی بەولاوەتر دەڕۆن و بە ڕاسترەوییەکی کرداری قسە دەکەن.

ئەمن لە ڕاپۆرتەکانمدا گوتم گرووپە دەرسخوێندووەکان و چینی ناوەندیی ئێران لە ڕێژیمی ئێستا ماندوو و بێزار بوون. توێژەکانی سەرەوە نوقمی گەندەڵی بوون، قیمەتەکان بە شێوەیەکی سەرسوڕهێن دەچنە سەرێ، بەرهەمی کەرەسەی خواردەمەنی لە

ئێران کە ڕۆژێک سەرچاوەی شتوومەکی خواردەمەنی لە خۆرهەڵاتی نێوەڕاست بووە لە ئاکامی شۆڕشی سپیی شا و لەنێوچوونی سیستمی دەرەبەگایەتیدا، تووشی وەستان بووە. شا زەوییەکانی لەنێو جووتیاراندا دابەش کردوە کە ئەوان خۆشحاڵ بکا، بەڵام لەڕاستیدا بەوکارە بناخەی ژیانی وانی لەنێو بردوە. لە دەورانەکانی پێشتردا ئاغا و دەرەبەگەکان هەموو پێداویستییەکانی کشتوکاڵیان، وەک تۆو، بازاڕی فرۆشتن، ئامرازی گوازتنەوە، ئاو و هتد بۆ وەرزێران دابین دەکرد، بەڵام لەوکاتەوە کە زەوییە کشتوکاڵییەکان لە دەستی دەرەبەگەکان هاتوونە دەرێ و لەنێو وەرزێراندا دابەش کراون، ژێرخانی ژیانی جووتیاران لەنێو چووە. ئێستا دیار نیە کێ دەبێ بازاڕی فرۆشتنی بەرهەمەکانی کشتوکاڵ بۆ جووتیاران دابین بکا.

شا ئاگای لە ژیانی خەڵک نەبوو، ئەو سەرنجی خستبووە سەر سوپا، نەک بەرهەمهێنانی کەرەسەی خواردەمەنی. لەئاکامدا بەرهەم-هێنانی بەرهەمە خۆراکییەکان لە ئێران کەموزۆر ڕاوەستابوو و ساڵی ١٩٧٨ بەشی پتری کەرەسە خۆراکییەکان لە دەرەوەڕا دەهاتە وڵات. دیارە جووتیاران بە ڕێگای جۆربەجۆردا ژیانی خۆیان تێدەپەڕاند، ژیانی دەوڵەمەندەکانیش دابین بوو، چونکە بۆ ئەوان کڕینی کەرەسەی خۆراکیی لەدەرەوەڕاهاتوو کارێکی دژوار نەبوو. بەڵام ئەوانەی لەو ئاڵوگۆڕانە بەئازار بوون کە شۆڕشی سپی پێکی هێنابوون، دەرسخوێندووەکان و ئەندامانی چینی نێونجی بوون.

توێژە دەرسخوێندووەکان و چینی نێونجی هەموو هەوڵیان ئەوە بوو ژیانی خۆیان لە بەرامبەر ئەو قیمەتانەدا کە بەشێوەیەکی سەرسوڕهێن چووبوونە سەرێ، بگوزەرێنن. گیروگرفتێکی دیکە کە قورسایی دەخستە سەر ئەم وەزعە ژێرخانی ژیان لە شاری تاران بوو. بەڕێوەبردنی باری تڕافیک (هاتوچۆ) لە دەستی بەرپرسانی ئەوبەشە هاتبووە دەر و تڕافیکی شار کەوتبووە حاڵەتی وەستانەوە. کاتێک لە ڕاپۆرتەکانمدا نووسیم تڕافیکی تاران یەکێک لەو هۆیانەیە

کە سەر دەکێشنە ڕووخانی ڕێژیمی شا، سەرۆکەکانم لە ئیسرائیل بە من و بۆچوونەکانم لەو بارەیەوە پێ‌کەنین. بەڵام، بەڕاستی وابوو. هەمووکەس دەیزانی خەڵک لە بەفیڕۆدانی چەندین سەعات وەخت، لە هاتوچۆی نێوان ماڵ و شوێنی کاردا ماندوو و بێزار ببوون.

شکی تێدا نیە کە ئەندامانی چینی نێونجی، پێشڕەو و جڵەوکێشی شۆرش بوون، بەڵام شیعە بنئاژۆکان بەپەلە خزانە ڕیزی ئەوانەوە. وتووێژەکانم دەگەڵ دۆستانی شیعەی سەید مەهدیی کاشانی، گومانی بۆ نەهێشتمەوە کە ئەوان مزگەوتەکانیان کردۆتە بنکەی بزووتنەوەی خەڵک دژی ڕێژیمی شا و هێندێ ڕێکخراوی شۆرشگێڕی زۆر کارامەیان لە مزگەوتەکاندا پێک‌هێناوە. ناڕەزایەتیی گشتی گەیشتبووە زانکۆ، ناوەندی دەرس‌خوێندووەکان و مزگەوتەکان و لەو جێگایانەدا پەرەی ئەستاندبوو. لە ڕاپۆرتێکدا کە لە فێوریە (شوبات)ی ساڵی ۱۹۷۸دا ناردبوومە ئیسرائیل ئاماژەم بە «ڕایەڵکەی مزگەوتەکان» و نەخشیان لە بزووتنەوەی شۆرشگێڕانەی خەڵکدا کردبوو، بەڵام لێکۆڵەرانی ڕێکخراوی هەواڵگریی سوپا و «مۆساد» ئەویان لەڕادەبەدەر بە تیئۆریکی و خەیاڵی زانی و سەرنجیان پێ‌نەدا.

ئەمن دڵنیا بووم کە بناخەی زانیارییەکانم ڕاست‌ودروستە و هەڵسەنگاندنم بۆ بارودۆخی ئێرانیش ڕاست و واقیع‌بینانەیە. چونکە دەمتوانی دەگەڵ ئەوانەی پێوەندیم پێوە دەگرتن بە زمانی خۆیان و تا ڕادەیەکیش بە هاوفکری قسە بکەم. بۆیە توانیبووم لە قووڵترین توێیە کانی کۆمەڵی ئێراندا کە تا ئەودەم هیچ فەرمانبەرێکی هەواڵگریی ئیسرائیل نەیگەیشتبوویە، برۆمە پێشەوە. لە ئاکامی ئەو وردبوونەوەیەدا کە لە قووڵایی کۆمەڵی ئێراندا بەکارم بردبوو، گەیشتمە ئەو باوەڕە کە زۆر ناخایەنێ ڕاست‌ودروستیی بۆچوونەکانم لەبارەی وەزعی سیاسیی ئێران و دواڕۆژەکەی دەسەلمێندرێ.

دەگەڵ بارودۆخێکی ناسەقامگیر کە لە ئێران هەبوو، سەرۆکەکانم لە ئیدارەی پێوەندییەکانی دەرەوەی ڕێکخراوی هەواڵگریی سوپای ئیسرائیلدا، بڕیاریان دا لە ناوچەیەکی دیکەی دنیا -ئەمریکای ناوەند و باشوور- کەلک لە خزمەتەکانی من وەربگرن. بێجگە لە ئێران، هەناردەی گرنگی سوپایی ئیسرائیل ڕاستەوخۆ بۆ ئەو دوو ناوچەیەش دەچوو و بە وڵاتانی ئەو ناوچانە دەفرۆشرا. لەوە بگوزەرێ، ڕایەڵکەیەکی تایبەتییش کە «ئاریەل شارۆن» Ariel Sharon کە ئەودەم وەزیری کشتوکاڵی ئیسرائیل بوو، بەڕێوەی دەبرد، خەریکی فرۆشتنی ئەو هەناردانە بە وڵاتانی ئەمریکای ناوەند و باشوور بوو. بە سەرنجدان بەوەی لەوکاتەدا مەیلێک بەرەو حکوومەتە دەستەچەپییەکان لە وڵاتانی ئەو ناوچەیەدا هەبوو، ئەو مەترسییە دروست ببوو کە ئەگەر لەو وڵاتانەدا حکوومەتگەلی دەستەچەپی دابمەزرێن، بازاڕی فرۆشتنی کەرەسەی جەنگیی ئیسرائیل لەو وڵاتانەدا دادەخرێ. بۆ نموونە، هەروەخت «بەرەی ئازادیخوازی نیشتمانیی سەندی نیستا» FSLN لە نیکاراگوا، ئەنستازیۆ سۆمۆزا دیبیل Anastasio Somoza Debile سەرکۆماری ئەو وڵاتەی لەسەر کار لابردبایە و بۆخۆی دەسەڵاتی بەدەستەوە گرتبا، لەوانە بوو چەکوچۆڵە و کەلوپەلە سەربازییەکانی خۆی لە وڵاتی سۆڤیەت دابین بکا و بۆیە بازاڕی فرۆشتنی کەلوپەلی سەربازیی ئیسرائیل لەو وڵاتە دادەخرا.

لەبەر ئەوەی ئاگادار ببووین کە حیزبی توودەی ئێران پێوەندییەکی نیزیکی لەگەڵ فەرماندەکانی «بەرەی ئازادیخوازی نیشتمانیی سەندی نیستا» هەیە، سەرۆکەکانم لە ئیسرائیل داوایان لێکردم بزانم دۆستە ئێرانییەکانم دەتوانن دیدارێک لە نێوان کاربەدەستێکی هەواڵگریی ئیسرائیل و فەرماندەکانی «سەندی نیستا» ڕێک بخەن. هەرچەند ئەمن حەزم دەکرد هەموو وتووێژەکانم دەگەڵ ئەو ئێرانییانەی

پێوەندیم دەگەڵیان هەیە، لەسەر ئاڵوگۆڕە بەرەوپێشەکانی ئێران بن، بەو حاڵە فەرمانی سەرۆکەکانمم بەجێ‌گەیاند.

ئەمن لە چۆنیەتیی پێوەندیی نێوان حیزبی توودە و «سەندی نیستا» دڵنیا نەبووم، بەڵام پێم وابوو حیزبی توودە لە ڕێگای پێوەندییەکانی دەگەڵ مۆسکۆ و هاواناوە توانیویەتی پێوەندی دەگەڵ «سەندی نیستا»ش دامەزرێنێ.

بە هەرحاڵ، لە ئەمیریانم پرسی: «دەتوانی دیدارێک لە نێوان بەرپرسێکی هەواڵگریی ئیسرائیل و (سەندی نیستا)دا ڕێک بخەی؟».

وەڵامی دایەوە: «لەوبارەیەوە هەوڵی خۆم دەدەم». ئەمن لە چۆنیەتیی وەڵامەکەی ئەوڕا توانیم تێ‌بگەم کە ئەم کارە بێ گیروگرفت سەر دەگرێ.

دوای ماوەیەکی کورت، ئەمیریان پێوەندیی دەگەڵ گرتم و گوتی کاردروستایی پێویست بۆ دیداری یەکێک لە بەرپرسە هەواڵگرییەکانی ئیسرائیل دەگەڵ «سەندی نیستا» کراوە. سەرۆکەکانم بە بیستنی ئەو بابەتە زۆر خۆشحاڵ بوون و تەنانەت بەپەلە ئەو کەسەیان دیاری کرد کە دەبوو بچێتە ئەمریکای ناوەندی. ئەو کەسە خودی من بووم. کاتێک لە بڕیاری وان لەوبارەیە ئاگادار بووم، زانیم هۆی ئەو بڕیارە ئاقڵانەیەیان چیە. سەرۆکەکانم دەیانەویست بۆ پاراستنی گیانم ماوەیەک لە وڵاتی ئێرانم دوور بخەنەوە. هەرچەند هۆشدارەکانی من لەبارەی ئەو شۆڕشە سامناکەوە کە لە ئێران بە دژی شا لە گەشەکردندا بوو، بەجیددی وەرنەگیرابوون، بەوحاڵە هەموو ئەو شتانەی ئەمن لەوبارەیەوە دابوومنە ئیسڕائیل، بەپێی ڕەوتێک کە لەئارادا بوو درابوونە ئەمریکا و ئەمریکاییەکانیش بەنۆرەی خۆیان ڕاپۆرتەکانی منیان بۆ کاربەدەستە هەواڵگرییەکانی ئێران بەڕێ کردبوون. بەو جۆرە ئەمن کەوتبوومە دۆخێکی زۆر ناسکەوە و بۆیە سەرۆکەکانم هەستیان کردبوو کە پێویستە هەرنەبێ بۆماوەی چەند حەوتوو لە ئێران دوور بکەومەوە.

دیاره مەئمووریەت بۆ «نیکاراگوا» ئەوەندەش قەپرغەگیر نەدەهاتە بەرچاو. هیچکەس نەیدەزانی فەرماندەکانی «سەندی نیستا» چۆن پێشوازی لەمن دەکەن و کاتێک چوومە مەڵبەندی ژێر کۆنترۆڵی وان، بۆ چۆنیەتیی ڕەفتار لەگەڵ من چبڕیارێک دەدەن. هەروەها دەبێ لەبەر چاومان بێ کە لەو مەئمووریەتەدا ئەمن تەواو تەنیا بووم و پشتیوانێک لەئارادا نەبوو کە بۆ ئەنجامی مەئمووریەتەکە یارمەتیم بدا. ئەمن دەبوو ئەو مەئمووریەتە بەوپەڕی شاراوەیی ئەنجام بدەم. چونکە لەبەر هۆی ئەمنیەتی و بۆئەوەی نەوەکا قۆڵی ڕاستی «نیکاراگوا» بە بوونی من لەو ناوچەیە بزانێ و لە ئاکامدا گیانم بکەوێتە مەترسییەوە، تەنانەت ڕایەڵکەی هەواڵگریی ئیسرائیل لە ئەمریکای ناوەندییشیان لە مەئمووریەتی من ئاگادار نەکردبوو.

ئەمن پێمخۆش نەبوو بێئەوەی جێنشینم هەبێ، کارەکەم لە ئێران و بەتایبەتی لە هەلومەرجێکدا کە نائارامییەکی توندی تێدا بوو، تەنانەت بۆ ماوەیەکی کورتیش بەجێ بێڵم. بەڵام لەلایەکی دیکەوە، مەئمووریەتە تازەکە بۆ من هەژێنەر بوو.

لە کۆتایی مانگی مارس (ئادار)ی ١٩٧٨دا، بە فڕۆکە چوومە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و لەوێڕا چوومە «ماناگوا» Managoa پێتەختی «نیکاراگوا». ساڵی ١٩٣١ بوومەلەرزە شاری «ماناگوا»ی لەگەڵ عەرز تەخت کرد، چوار ساڵ دواتریش سووتمانێکی گەورە زۆری زیان بە شارەکە گەیاند و ساڵی ١٩٧٦ دووبارە بوومەلەرزەیەکی گەورە ئەو شارەی هەژاند و ئێستاش شەقامەکانی ئەو شارە ببوونە مەیدانی شەڕی نێوان سەربازانی «سامۆزا» و «سەندی نیستا».

بزووتنەوەی دەستەچەپیی «نیکاراگوا» هێشتا کردەوەی خائینانەی ساڵی ١٩٣٤ی باوکی سامۆزای لەبیر نەچووبوو. چونکە لەو ساڵەدا، «سامۆزا» کە ڕێبەریی گاردی نیشتمانیی لەئەستۆ بوو، ڕێبەری نیشمانپەروەر «ئۆگوستوو سەندینۆ» Augusto Sandinoی کە ناوی

بزووتنەوەی «سەندی نیستا» لە ناوی ئەو وەرگیراوە، بانگ کردبووە میوانداریییەکی ڕەسمی و لەوێ کوشتبووی. بەڵام ئێستا بە بوونی ٥٠٠٠٠٠ کەسی بێماڵوحاڵ، ٣٠٠٠٠ کوژراوی شەڕی سیاسیی نێوان حکوومەتی «سامۆزا» و «سەندی نیستا» و ئابوورییەکی داڕماو، هەمووکەس دەیزانی کە عومری ڕێژیمی «سامۆزا» بەزوویی کۆتایی دێ.

هەر لەگەڵ گەیشتن بە هوتێل «ئینتر کۆنتینانتاڵ» کە تەلارێکی گەورە بوو لە شاری «ماناگوا» سەری گەیاندبووە عاسمان، تەلەفونم بۆ ژمارە تەلەفونێک کرد کە نوێنەرێکی FSLN لە واشینگتۆن پێی-دابووم. خانمێک کە تەلەفونەکەی هەڵگرت پێیگوتم کە بەیانیی ڕۆژی دواتر دێتە سەردانم.

ئەو، سەری سەعاتی دیاریکراو هاتە سەردانم. جلکەکانی بریتی بوون لە پانتۆڵێکی جین، بلووزێکی شینی کاڵ و جووتێک کەوشی ڕەحەت. ئەمن هەمیشە دیمەنی سەردانەکەی ئەوم لەبیرە... بەژنێکی - بڵند، ئەندامێکی باریک، دوو چاوی شین، ڕەنگێکی زەیتوونیی کاڵ و قژێکی ڕەشی ترووسکەدار، پێکهاتەی لەشولاری بوون. دەگەڵ دەستدرێژکردن بۆلای من، زەردەخەنەی خۆشحاڵی لەسەر ڕوخساری دەرکەوت.

«ناوم (ماری فێرناندا) ( Marie Fernandaیە. ئێمە سەفەرێکی کەمێک درێژمان لە پێشدایە».

ئەمجار بردمیە دەرێ و بە پێکەنینێکی ئارام و بێدەنگەوە ڕێنوێنیی کردم بۆ لای ترومبێلە فیاتە ڕەنگزەرد و کۆنەکەی کە قوڕی تێ-هەڵسوابوو. ئەم ترومبێلە بۆمن شادیخوڵقێنترین و خەمبزوێنترین بیرەوەرییەکانی ژیانە.

هێشتا دەوروبەری ١٠کیلۆمیتر لە «ماناگوا» دوور نەکەوتبووینەوە کە تووشی یەکەمین پرسگەی سەربازی بووین. «ماری» کارتی چاپەمەنیی خۆی کە ئەوی وەک ڕۆژنامەنووسێکی کۆلۆمبیایی

دەناساند دەرهێنا و بە سەربازەکانی پرسگەی دەوڵەتی گوت، ئەو بۆ نووسینی ڕۆمانێک دەچێتە باکوور. زۆر بە سادەییش منی وەک هاوسەفەری خۆی ناساند. ئەوان بە دەستڕاوەشاندن ڕێگایان دا بڕۆین.

هەروا کە بە ڕێگادا دەڕۆیشتین، گۆلە (دریاچە) جوانەکەی «ماناگوا» سەرنجی ڕاکێشاین، جادەکە باریکتر بۆوە و کەندوقووڵەکانی جادە وەهۆش خۆیان هێناین، بەڵام هەرنەبێ لە هاتوچۆی ئامرازە ماتۆڕییەکان کەمتر بۆوە. سەعاتێک دواتر گەیشتینە شارێکی چکۆڵە. تەماشای هەرکوێمان دەکرد، سەربازانی گاردی نیشتمانی دەهاتنە بەرچاو. ئەو سەربازانە ڕێگای هەردوولای شارەکەیان داخستبوو. سەربازانی گاردی نیشتمانی پێیانگوتین ئەگەر درێژە بە ڕێگاکەمان بدەین گیانمان دەکەوێتە مەترسییەوە، چونکە دەگەینە ئەو بەشانە کە بەدەست هێزە شۆڕشگێڕەکانەوەن.

«ماری» بە سەربازەکانی گوت: «ئەمن ناچارم بچمە ئەو ناوچەیە، چونکە دەبێ دەنگوباسی شەڕ ئامادە بکەم».

پاش بیست دەقیقە گەیشتینە پرسگەیەکی دیکە کە سەربازەکانی بە تیرباری ڕووسی نیشانەیان لێگرتبووین.

«ماری» گوتی: «ئەمانە هێزە دۆستەکانن و ترومبێلەکەی من دەناسن». ئەمن بە بیستنی قسەکانی کە مژدەی ئەمینبوونیان تێدا بوو خۆشحاڵ بووم.

کۆمەڵێک پیاوی لاو کە جلوبەرگ و نیشانەی نیوەسەربازییان هەبوو و «کەلاشینکۆف»یان لە شاندا بوو لێمان نزیک بوونەوە. دوای سڵاو و بەخێرهێنان ڕێبەندانە تێلدڕووەکەیان لەسەر ڕێمان لابرد و ئێمە درێژەمان بە ڕۆیشتن دا.

بە گەیشتن بە ناوچەی دەسەڵاتی FSLN ، «ماری» ئەو حاڵەتی تووڕەیی‌یەی نەما و بە حاڵەتێکی ئارامەوە درێژەی بە لێخوڕین دا.

ئێستا ئەمنیەتی ناوچەکە دەنگی وی دلێرتر کردبوو و دیار بوو کاتی ئەوە هاتوە ئەوەی لە دڵیدایە هەڵیڕێژێ.

بۆیە، بە دەنگێک کە زۆری تووڕەیی پێوە دیار بوو پێی گوتم: «ئەمن سەر لە کاری ئێوە دەرناکەم. ئێوەی ئیسرائیلی و جوولەکە کە ئەو هەموو زەجرەتان کێشاوە، ئێستا کۆمەگ بە (سامۆزا)ی نازی دەکەن و چاوتان لەوە نیە کە چیی بەسەر خەڵکی نیکاراگوا هێناوە».

ئەمن قسەیەکی زۆرم بۆ گوتن نەبوو. ئەو ڕاستی دەکرد. ئێمە کۆمەگی «سامۆزا»مان دەکرد.

قسەکەی بەوەندە تەواو نەبوو. ئەو درێژەی دایە: «زۆر جێی بەدبەختییە کە وڵاتی ئێوە کە لەسەر بناخەی بەرامبەریی مافی مرۆڤی سۆسیالیستی دامەزراوە بۆتە دەوڵەتێکی فاشیست و کۆمەگی دەوڵەتە دیکتاتۆرە نازییەکانی ئەمریکای باشوور دەکا».

ئەمن بێدەنگ بووم تا ئەو قسەکانی بکا. ئەمجار وردەوردە شوێنە لادێییە بەپیتەکان دەگەڵ ئەو تیشە بەردانە کە سەریان لەنێو گیا سەوز و زەمەندەکان دەرهێنابوو، وەدەر کەوتن.

ئەمن بەباشی سەرنجم دابووە نوکتەیەک کە لە مێشکی ئەودا بوو، و دەمەویست بابەتی وتووێژەکە بگۆڕم. بۆیە لێمپرسی: «ئەتۆ ئینگلیزی لە کوێ فێر بووی؟».

«لە ئەمریکا. چەند ساڵێک لەوێ ژیاوم». پاشان لە حاڵێکدا دەنگی پڕ بوو لە گەورەیی و تووڕەیی، گوتی: «پێت وانەبێ هەموومان جووتیارین. دەگەڵ ئەوەی ئەم شۆڕشە بۆ جووتیاران دەکرێ، بەڵام بەهۆی ڕووناکبیرانی پیشەیی‌یەوە بەڕێوە دەبرێ».

پێی‌گوتم کە دەمباتە ناوەندی فەرماندەیی سەربازیی «سەندی نیستا» بۆ ئەوەی مەبەستەکانمیان دەگەڵ بێنمە گۆڕێ و «هیوادارم داخوازەکانت باش و ئەرێنی بن». دیارە ئەمن داخوازێکی تایبەتیم بۆ گوتن نەبوو. کاری من ئەوە بوو بزانم کاتێک «سەندی نیستا» لە

نیکاراگوا دەسەڵات دەگرێتە دەست، ڕێبازی سیاسیی وان چی دەبێ و هەوڵ بدەم ڕێگاکانی پێوەندی دەگەڵ وان هەڵسەنگێنم.

لێرە ئیدی ئامرازەکانی هاتوچۆ جێی خۆیان دابوو بەو جیپانە کە پڕ بوون لە لاوانی کەلاشینکۆف‌بەدەست. ئاشکرا بوو کە ئەم بەشە لە وڵاتی «نیکاراگوا» لە دەستی «سەندی نیستا»دایە. ئەو ڕێگایەی ئێمە بڕیبوومان درێژ بوو و هەواش گەرم بوو. لەکاتی ئاژۆتندا ئێمە بۆ خواردنەوەی ساردەمەنی و بەنزین‌وەرگرتن کە بەنزین‌خانەکانیان هەموو کۆن بوون و بە پۆمپی دەستی کاریان دەکرد لە شارە چکۆڵەکان ڕادەوەستاین. لێیم پرسی، بەنزینی خۆتان لە کوێ دابین دەکەن؟

وەڵامی دایەوە: «بۆمان دێنن. ئێمە (سەندی نیستا) هەموو شتێکمان لە کۆنترۆڵدایە و پێداویستییەکانی خەڵک دابین دەکەین».

سەرەنجام گەیشتینە پێگەیەکی سەربازی کە لەلایەن کەسانێکی زۆرەوە دەپارێزرا. کاتێک نیگابانەکان چاویان بە ماری کەوت، کشانەوە و ئەو چووە پێگەکە.

گوتی: «بەخێر بێی بۆ ناوەندی فەرماندەیی هێزە سەربازییە ناوچەیی‌یەکانی (سەندی نیستا)». پاشان ئەفسەرێک کە یۆنیفۆرمی تەواوی دەبەردا بوو و خۆی بە «ئەفسەری پێوەندییەکانی دەرەوە» ناساند، منی بردە خانووبەرەیەک کە هەموو پارچە و بەشەکانی لەپێشدا دروست کرابوون و پاشان لە دروستکردنی خانووبەرەکەدا لێکدرابوون، منی بردە ژوورێک کە بۆ مانەوەم لەبەر چاو گیرابوو و قەرەوێڵەیەک و حەمامێکی ڕەحەتی هەبوو. ڕوون بوو کە شەوەکە لەوێ بەسەر دەبەم. ویلایەکی وەک ئەوەی منیشیان دا بە«ماری» کە لە پەنا ژوورەکەی من بوو.

«ماری» هاتە ژوورەکەی من و لەسەر قەرەوێڵەکە دانیشت. پێی گوتم کە تەمەنی ٢١ ساڵە و لە بەشی پێوەندییەکانی دەرەوەی

«سەندی نیستا» کار دەکا و لێشی زیاد کرد کە: «لەوانەشە ڕۆژێک بکرێمە وەزیری دەرەوەی نیکاڕاگوای ئازاد».

ئەو زۆر جیددی و گەرم دەهاتە بەرچاو. ئەمن دەمەویست ئەو زەردەخەنە درەوشاوەیە کە پێشتر لە ڕوخساریمدا بینیبوو، جارێکی دیکە ببینمەوە.

پێمگوت: « (ماری فێرناندا) دەکرێ ئەمن بە (فرێدی) Freddiت ناو بەرم.

پرسیارەکەم ئەوی هێنایە پێکەنین و وەڵامی دایەوە: «دیارە».

لە پێوەندیی من و ئەودا جۆرەشەرمێکی ناخۆش و نەخوازراو هەبوو. ئەمن بە توندی شیفتەی ئەو ببووم و ئەویش ئەم بابەتەی بۆ دەرکەوتبوو. لێمپرسی: «بۆچی گوێمان لە دەنگی تەقە نیە؟ ئەگەر شەڕێک هەبێ، شەڕێکی زۆر ئارامە!».

«ئێرە کەموزۆر ئارامە. گەورەترین شەڕەکان لە مەودایەکی دوور لێرە لە نزیک (کۆستاریکا)ن. بەڵام بە زوویی (سامۆزا) کاری تەواو دەبێ». ئەم قسەیەی کرد و لە ژوورەکەم وەدەر کەوت.

دوانیوەڕۆی ئەو ڕۆژە بردیانم بۆ ژووری فەرماندە. ئەو پیاوێکی چاویلکەدار بوو کە لە نێوەڕاستی دەیەی ٣٠ی تەمەنیدا بوو. بە گەرمی دەستی دەنێو دەستی نام و سڵاوی لێکردم و بە بێفیزی منی بە هاوڕێکانی ناساند.

ئەو بە ئینگلیزییەکی تەواو کە نەختێک ڕاوێژی ئیسپانیۆلیی پێوە دیار بوو گوتی: «هیوادارم سەفەر بۆ (ماناگوا)ت بەدڵ بووبێ و بە زوویی لەوێش یەکتر ببینین». ئێمە لە ژوورەکە دانیشتین و ئەو بەڕاشکاوی گوتی کە «سەندی نیستا»کان حەز دەکەن پێوەندییان دەگەڵ ئیسرائیل هەبێ.

ئەو لێی زیاد کرد: «ئێمە زۆر ڕێز بۆ ئیسرائیل دادەنێین. ئێمە دەگەڵ جوولەکەکان و ئەو بەڵایانەی بە سەریان هاتوون هاودەردین، چونکە لەمێژساڵە ئێمە لە وڵاتی خۆمان دەگەڵ ئەوجۆرە هیتلەرە

بەرەوڕووین. ئەمە بەڕاستی جێی داخە کە حکوومەتی ئێوە بە فرۆشتنی چەکوچۆڵە کۆمەگ بە (سامۆزا) دەکا». ئەمە قسەیەک بوو کە ئەمن دووەمجار بوو دەمبیست. بەڵام ئەمجارەیان لە زمانی کاربەدەستێکی پایەبەرزەوە. ئاشکرایە کە ئەمن چاوەڕوانی بیستنی ئەو قسەیە بووم.

وەختێک نۆرەقسەی من هات، بە کورتی بیروبۆچوونی ئیسرائیلییەکانم لەبارەی پێوەندی دەگەڵ ولاتانی ئەمریکای ناوەندییەوە بۆ باس کرد. هەروەک پێشتر بە «فرێدی»م گوتبوو، بۆ فەرماندەکەشم ڕوون کردەوە کە ئەمن بەرامبەر بەو چەکوچۆڵە زۆرە کە ئیسرائیل بە «سامۆزا»ی دەفرۆشێ، دیفاعێکم نیە. ئیسرائیل تانک و موسەلسەل (ڕەشاش) خومپارە (هاوەن) و بە زوویی هێلیکۆپتەریش دەفرۆشێ. ئەمن دەمتوانی بە وتارێکی درێژ و بەکاربردنی وشەگەلی چەورونەرم، بڵێم گوناحی ئەوکارە لە ئەستۆی بازرگانانی ئازادی چەک و تەقەمەنیی شەڕە کە ئەو چەکوچۆڵەیە بە «سامۆزا» دەفرۆشن و ئیسرائیل نابێ لەسەر ئەوە سەرکۆنە بکرێ. دیارە ئەو شێوە وتارە دەیتوانی ڕەزامەندیی ئیسرائیلیش بەدەست بێنێ، بەڵام ئەمن دەمزانی کە خانەخوێیەکانم بە چاکی شارەزای ڕاستییەکانن.

بەوحاڵە مێشکی من بە تەواوی لە وەڵام بەتاڵ نەبوو. پێمگوتن: «ئێمە ئاگادارین کە گرووپێک لە (سەندی نیستا)کان لەلای دوژمنانی ئێمە PLO لە لوبنان دەورەیان دیوە». فەرماندەی ناوبراو بە بیستنی ئەم قسەیە شانی هەڵتەکاند:

«جەنابی (بن مۆناشێ)، ئێمە لەگەڵ دوژمنانی خۆمان لەشەڕداین و دەبێ لەو شەڕەدا سەر کەوین. ولاتی ئێوە کەرەسەی شەڕ بە (سامۆزا) دەفرۆشێ و ئێمە لەلای PLO دەورە دەبینین. کێ دەبێ داوەری بکا کێ لەسەر هەقە؟ تەنیا تکای من لە ئێوە ئەوەیە کە بە حکوومەتەکەتان بڵێن واز لە پڕچەککردنی (سامۆزا) بێنێ و لایەنی

خەڵکی نیکاراگوا بگرێ. ڕێگای ئەوکارە ئەوەیە کە تا ئەو جێیەی دەتوانن، بە دانی یارمەتیی پزیشکی بە ئێمە یان دامەزراندنی نەخۆشخانەی مەیدانی دەست پێبکەن. هێشتا دەبێ خوێنێکی زۆر بڕژێ».

ئەمن داخوازەکانی ئەوم یادداشت کرد و ئێمە توانیمان بەهۆی بەشی پێوەندییەکانی دەرەوەی «سەندی نیستا» لە ئەمریکای باشوور پێوەندیی دەگەڵ دامەزرێنین. دیارە ئەمن هیچ دەسەڵاتێکم بۆ دانی بەڵێنی کارێک نەبوو. ئەمن چووبووم بۆئەوەی چۆنیەتیی بیرکردنەوەیان بزانم و پێیان بڵێم کە ئیسرائیل پێیخۆشە، کاتێک «سەندی نیستا» لە نیکاراگوا دەسەڵاتی گرتە دەست، هەروەک پێشوو باڵیۆزخانەی خۆی لە «ماناگوا» بپارێزێ و دەشتوانین لەنێو ئەوان و ئەمریکادا نێوبژیوانی بکەین.

خانەخوێیەکانم گوتیان لە هەرهەنگاوێک بۆ دابینکردنی ئاشتی و ئارامی لە خۆرهەڵاتی نێوەڕاست پشتیوانی دەکەن – بەڵام پێشیان لەسەر ئەوە داگرت کە دەبێ ئیسرائیل PLO بەڕەسمی بناسێ.

فەرماندەی «سەندی نیستا» گوتی: «هەرچەند ئێمە مافی بوونی ئیسرائیل بەڕەسمی دەناسین، بەڵام PLO ش بە نوێنەری ڕاستەقینەی خەڵکی فەلەستین دەزانین». ئاکامی ئەم وتوویژە ئەوە بوو کە خانەخوێیەکانم، نەیاندەویست لای یەکێک لەو دوو لایەنە بگرن.

بەدەم خواردنەوەی ئەو چا شیرنەوە کە بۆیان هێنابووین، فەرماندەی ناوبراو درێژەی بە قسەکانی دا: «لە سۆسیال-دێموکراتەکانەوە بگرە هەتا کۆمۆنیستەکانی سۆڤیەت، ئێمە لە هەمووان جیاوازین. سەندی نیستاکان بزووتنەوەیەکی زۆر ئازادیخوازن. کاتێک ئێمە لە نیکاراگوا دەسەڵات بەدەستەوە بگرین هەڵبژاردنی ئازاد دەکرێ. ئێمە بۆ خاتری خەڵکی نیکاراگوا بووین بە جڵەوکێشی شۆرش. ئێمە دژی بازاڕی ئازاد نیین، بەڵام پێمان وانیە جووتیاران دەبێ لەبرسان بمرن».

فەرماندەی ناوبراو بە قسەکانی خۆی لەو نیکاراگوایەی «سەندی نیستا»کان دروستی دەکەن، وێنەی وڵاتێکی سۆسیالیستی بە ئازادیی چاپەمەنی، ئازادیی بیروڕادەربڕین، ئازادیی پەروەردە و فێرکردن، خزمەتە لەش‌ساغییەکان، کاری زۆر و ئاسایشی گشتییەوەی دەکێشایەوە.

ئەمن بۆ فەرماندەم ڕوون کردەوە کە: «ئەمن لە ئێرانیش کە لەوێش شۆرشێک لە پەرەگرتندایە، کارم کردوە». فەرماندە بە پێکەنینەوە وەڵامی دایەوە: «کەوایە، دەبێ لە کارکردن لەوێ چێژت وەرگرتبێ».

ئەو حەزی دەکرد بزانێ داخوا پاش ڕووخانی شا، حیزبی توودە لە حکوومەتی ئێراندا بەشدار دەبێ یان نا. ئەمن بۆم ڕوون کردەوە کە ڕێژیمی شا لە ئێران خەریکە دەڕووخێ، بەڵام باوەڕ ناکەم کە حکوومەتی دەستەچەپی لە داهاتووی ئەم وڵاتەدا جێیەکی هەبێ، بەڵکوو ڕێبەرە تازەکان مەزهەبی دەبن.

«کەوایە ئەو وڵاتە دەگەڕێتەوە سەردەمە تاریکەکان!».

«سەردەمە تاریکەکان بێ و هەرچی بێ، پێم‌وایە لە دواڕۆژدا مەزهەب حوکمی ئەم وڵاتە دەکا، نەک ڕێوشوێنە گەلییەکانی جێگای پەسندی هەمووان».

دوای ئەوە نانی شەویان داینێ. هەوای شوێنەکە لەبەر دووکەڵی سیگاری «مارلبۆرۆ»ی خانەخوێیەکانم خەست و قورس ببوو.

ئەمن گوتم: «ئەمریکایی‌یەکان هەموو شتێکیشیان خەراپ نیە». فەرماندە لەو قسەیەم کەوتە پێکەنین.

پاشان گەڕامەوە ژوورەکەم، دوای چەند ساتێک «فرێدی» هاتە ژوورەکە و پرسی: «وتوویژەکانتان چۆن بوون؟» وەڵامم دایەوە، باش بوون. ئەو دەستی کرد بە قاوەدروستکردن.

لێدانی دڵم چووبووە سەر، بەڵام هی قاوەخواردنەوە نەبوو.

بەیانیی ڕۆژی دواتر، ئێمە بەرەو باشوور کەوتینە ڕێ. کاتی بەجێ-هێشتنی ئەوێ دیسان «سەندی نیستا»کان ڕێزیان بۆ هاوڕێ دڵڕفێنەکەم دانا. وەختێک گەیشتینەوە بەشی ژێر کۆنتڕۆڵی حکوومەتی «سامۆزا»، ترومبێلی فیاتی «فریدی» دەستی بە نامیهرەبانی کرد و دوای دەنگێکی نائاسایی و هەڵچوونی هەڵم، ڕادیاتۆرەکەی تەقی. بەخۆشیەوە ئەم ڕووداوە لە نزیک گوندێکی چووکەڵە هاتە پێش. ئێمە چووینە ڕێستوورانێکی چکۆڵە کە لەوێ هەبوو و تەلەفونمان بۆ میکانیک (فیتەر)ێک کرد. چاککردنەوەی ترومبێلەکە چەند سەعاتێکی دەبرد، بۆیە ئێمە نەماندەتوانی، پێش سەعاتی قەدەغەی هاتوچۆ بچینەوە پێتەخت. ئەگەر کەسێک دوای سەعاتی قەدەغەی هاتوچۆ چووبایە شار دەکەوتە بەر دەسرێژی گوللە.

کافە ڕێستوورانەکە تەنیا یەک ژووری هەبوو کە کەوتبووە نهۆمی دووەم و دوو تەختی تێدا بوون. «فریدی» بە گەرمی ماچی کردم و گوتی حەز دەکا بۆ حەسانەوە بچێتە سەر جێ. ئەمنیش چوومە سەر جێیەکەم، بەڵام مێشکم بە توندی خەریکی پێداچوونەوەی ڕووداوەکانی ڕۆژی پێشتر بوو. بیری «فریدی» کە بە ئارامی لە تاریکایی ژوورەکەدا هەناسەی دەدا، مێشکمی بەجێ نەدەهێشت. بێگومان ئەو ژنەجووتیارێکی ئاسایی نەبوو. بێجگە لە جوانییەکەی، ئەو خاوەنی مێشکێکی تیژ بوو. لەپێشدا سەرنجم دایە خەوە ئارامەکەی ئەو و پاشان بۆخۆم خەوتم.

کەمێک دوای نیوەڕۆی ڕۆژی دواتر ئێمە گەیشتینە هوتێل «کۆنتینانتاڵ». «فریدی» گوتی دەیەوێ لە شاردا بمگێڕێ. ئێمە ئەو قاوە خەستەمان دەخواردەوە کە لە «ماناگوا» دروستیان دەکرد و لە دەوروبەری شار دەگەڕاین. ئەو گڵکۆی «ڕۆبین داریۆ» Ruben Dario ی شاعیری پێنیشان دام و بردمیە ئەو بەشانەی شار کە لە بوومەلەرزەکەی ساڵی ١٩٧٢دا وێران ببوون و دووبارە دروستیان کردبوونەوە. ئەو شەوەی دەگەڵ من بەسەر برد. بۆنی دڵگری لەشی

و درەوشـــانەوەی چـاوە شـــینەکانی منیـــان لـــەخۆم بێخەبـــەر کـــرد. بەڕاستی ئەمن یەکەم کەس بووم کە ئەو شەوە ئەوم بەدەست گرت.

سـەعات ١٠ی بـەیانیی ڕۆژی دواتـر بـەجێی هێشـتم. ئـەمن تەلـەفونم بۆ ئیسـڕائیل کـرد و ڕاپۆرتم دایـەوە کـە هـەموو شـتێک بـە باشـی بـە ئاکام گەیشت. لای نیوەڕۆیە لە سالۆنی پێشـوازیی هوتێلـەوە تەلـەفونم بۆ کرا. پێشخزمەتی هوتێلەکە گوتی، سێ کەس هاتوونە سەردانی مـن و ئەمن حەتمەن دەبێ بیانبینم.

هـەر کـە هاتنـە ژوورەکـەم، تـوانیم بـزانم چکـارەن. ئـەوان خـاوەنی جلوبەرگی ڕەش بوون و ورگیـان لـەبن چاکەتەکانیانـەوە دەرپـەڕیبوو. دیار بوو ئەوانە فەرمانبەری ئەمنیەتی دەوڵەتی بوون. گەورەکەیان کە پیاوێکی قۆچـاغ بـوو بـە قژێکـی شـانەکراو و ڕێـکوپێکـەوە، دەسـبەجێ پرسی:

« چەند ڕۆژی ڕابردووت لە کوێ بەسەر بردوە و کارت چیە؟ ».

«پێوەندیی بە ئێوەوە نیە».

مسـتێکی لـە مێـزی قاوەخواردنەوەکـە ڕاکێشـا و گـوتی: «دیـارە پێوەندیی بە ئێمەوە هەیە. ئەگەر تا ئێستا نەتزانیوە، ئێستا دەبێ بزانـی کە لە نیکاراگوا هەموو شتێک پێوەندیی بە ئێمەوە هەیە».

ئـەمن پـێمگـوتن، هـەتا پێوەنـدی دەگـەڵ سـەرۆکی نوێنەرایـەتیی سیاسیی وڵاتی خۆم نەگرم، دەگەڵ وان قسـە ناکـەم و ئەگـەر ڕێگـاش نەدەن تەلەفونی بۆ بکەم، دەبێ چاوەڕوانی هاتنەپێشـی «ڕووداو»ێـک بـن کـە ئاکامەکـەی ئێسـتا پـێشبینـی نـاکرێ. ئـەوان ژمـارە تەلـەفونی نوێنەرایەتیی سیاسیی ئیسڕائیل لە «ماناگوا»یان دۆزیەوە و بۆخۆیان تەلەفونیان بۆ باڵیۆزخانە کرد و دەیانەویست بزانن دەگەڵ کێ قسـە دەکـەم. هەرچەنـد ئـەمن نـاوی سـەرۆکی نوێنەرایـەتیی سیاسـیی ئیسـڕائیل لـەو وڵاتەشـم نـەدەزانی، چونکـە بـوونم لـە «مانـاگوا» بـە باڵیۆزخانە ڕانەگەیەندرابوو، گوتم دەمـەوێ دەگـەڵ باڵیۆزی ئیسـڕائیل قسە بکەم. کاتێک پێوەندیی تەلەفونی لە بەینی من و باڵیۆزدا بەرقەرار

بوو، به زمانی عیبری پێمگوت ئەمن هاونیشتمانێکی ئیسرائیلم و بۆ حکوومەت کار دەکەم.

سەرۆکی نوێنەرایەتیی سیاسیی ئیسرائیل دەسبەجێ وەڵامی دایەوە ، هیچکەس لەو بارەیەوە ئێمەی ئاگادار نەکردوە.

«دەزانم ئێوە لە بوونی من لەم وڵاتە بێخەبەر بوون، بەڵام تکا دەکەم تەلەفون بۆ سەرهەنگ «مایرمایر» Meir Meir سەرۆکی پێوەندییەکانی دەرەوە بکە، ئەو لە مەسەلەکە ئاگادارت دەکاتەوە. ئەم کارەش دەسبەجێ بکە، چونکە لەوانەیە تووشی گیروگرفتێکی گەورەتر بی».

«وەک؟».

«وەک ئەوە کە هەوڵ بدەی ئەفسەرێکی هەواڵگریی ئیسرائیل لە زیندانی نیکاراگوا ئازاد بکەی».

ئەودەم سەعات بەکاتی نیکاراگوا ۱۲\۳۰ی دوانیوەڕۆ بوو، بەڵام لە ئیسرائیل شەو بوو. هێشتا ڕێی تێدەچوو سەرهەنگ «مایر» لە دەفتەری کارەکەی مابێ.

ئەمن تەلەفونەکەم دانا و چاوەڕوانی ئاکامی تەلەفونەکە مامەوە. ماوەی دە دەقیقەی ناخۆش کە لەو ماوەیەدا ئەمن و کارمەندە ئەمنیەتییەکانی نیکاراگوا ڕووبەڕووی یەکتر دانیشتبووین و تێکەوە ڕامابووین، تێپەڕی. بە ئاشکرا دیار بوو کە حەوسەلەی وان خەریکە تەواو دەبێ. ئەمجار زەنگی تەلەفون لێیدا. ئەو باڵیۆزی ئیسرائیل بوو کە گوتی، هەر ئێستا دێتە هوتێل. چەند دەقیقە دواتر، ئەو بە پەلە هاتە هوتێل. لەپێشدا بە ساردی تەماشای کردم و دوایە بە فەرمانبەرە ئەمنیەتییەکانی گوت:

«ئەمن بەرپرسایەتیی بوونی ئەم پیاوە لە نیکاراگوا وەئەستۆ دەگرم. ئێوە لەو بارەیەوە نیگەران مەبن. ئەو سبەینێ لەم وڵاتە دەچێتە دەر. ئەو ماجەراجوویەکی (مغامر) ئیسرائیلییە کە لە دەوری ئەمریکای لاتین سەرگەرمی سەفەرە».

ئاشکرا بوو کە مەئمووورە ئەمنیەتییەکان، باوەڕ بە قسەکانی باڵیۆز ناکەن، بەڵام هەقیشیان نەبوو خۆ دە وەزعی هاونیشتمانێکی ئیسرائیلی هەڵقوتێنن کە کەوتۆتە ژێر سەرپەرستیی سەرۆکی نوێنەرایەتیی سیاسیی ئەو وڵاتە.

هەر کە فەرمانبەرە ئەمنیەتییەکان هوتێلەکەیان بەجێهێشت، باڵیۆز بە ڕقەوە سەیرێکی منی کرد. دیارە لە ئیسرائیلەوە پێیان‌گوتبوو ئەمن کێم، بەڵام لەوە قەڵس بوو کە لە بوونی من لەو وڵاتە بێئاگا بووە. ئەو دەیەویست بزانێ ئەمن لەم وڵاتە چاوم بە کێ کەوتوە هەتا ڕاپۆرتێک لەو بارەیەوە ئامادە بکا. ئەمن پێم‌گوت کە ئیسرائیل لەو بارەیەوە ئاگاداریی پێویستی دەداتێ و تا ئەوکاتەی ئەو لە هوتێل بوو، ئەمن بەرامبەری ڕاوەستابووم و بە زەردەخەنەوە میوانداریم لێدەکرد.

ئەو شەوەم دەگەڵ «فرێدی» گوزەراند. ژمارە تەلەفونەکانی ماڵێ و دەفتەری کارم لە تەل ئەبیب و هوتێل کارلتۆنی تارانم دایە. بەیانیی ڕۆژی دواتر کە چوومە فرۆکەخانە هەستم کرد وەک گریەیەک لە گەروومدا پەیدا بووبێ. چونکە بەجێهێشتنی «فرێدی» زۆری ناڕەحەت کردبووم.

چەند حەوتوو دواتر لە مانگی ئاوریل (نیسان)دا تەلەفونی بۆ دەفتەرەکەی تەل ئەبیبم کرد. ئەو هاتبووە «لیسبۆن»ی پۆرتوگال و پێشنیاری بە من دەکرد، ئەگەر بتوانم مۆڵەتێک وەربگرم تا پشوویەکی کورت پێکەوە لە ئاتێن بگوزەرێنین. لەبەر ئەوەی حکوومەتی ئیسرائیل مۆڵەتێکی زۆرم پێ قەرزدار بوو، کارەکەم ڕێک-خست و بە فرۆکە چوومە ئاتێن.

دوو ڕۆژی یەکەمی مانەوەمان لە ئاتێن بەڕاستی ئەفسانەیی بوون. ئێمە دەست لەنێو دەستی یەک لە دەوروبەری شاری دێرینی ئاتێن پیاسەمان دەکرد. ڕۆژی سێیەم، ڕووی تێکردم گوتی دووگیانە.

لێی‌پرسیم: «ئێستا چبکەین؟».

چاوەڕێی بیستنی بابەتێکی وا نەبووم و نەمدەزانی چۆن وەڵامێکی بدەمەوە.

ئەو گوتی:«وا دیارە ئێمە ژن‌ومێردێکی چارەنووس‌نادیار و بێ-داهاتووین».

ئەو بە گوتنی ئەم قسەیە، ویستی مەسەلەکە زۆر بە سادەیی تێپەڕێنێ. ئەو کاتۆلیکێکی سۆسیالیست، «سەندی نیستا» بوو کە دەبوو پەیڕەوی دیسیپلینی حیزبی بێ. بەڵام ئەمن جوولەکەیەک بووم کە کارم بۆ ڕێکخراوی هەواڵگریی ئیسرائیل دەکرد و وڵاتەکەم کەرەسەی شەڕی بە بێزراوترین دوژمنانی ڕێکخراوی وان دەفرۆشت. تێکەڵاویی ژیانی من لەگەڵ ئەو، دەیتوانی بۆ هەردووکمان ئاکامی ناخۆشی کەسی و سیاسی و پیشەیی بەدواوە بێ.

پێم‌گوت: «بۆ ئێمە بێ‌ئەندازە دژوار دەبێ پێکەوە منداڵەکەمان گەورە بکەین. ئێمە لە دوو نوختەی جیاوازی دنیادا دەژیین».

«بەڵێ، بەڵام لەبیرت نەچێ کە هەمیشە دوو عونسوری ناوەکیەک یەکتر ڕادەکێشن.»

بەڵێ، ئەوە ڕاست بوو کە ئەو جوان، خوێن‌گەرم، شیرن و دڵڕفێن بوو و دەگەڵ هەموو ئەو ژنانەی تا ئێستا دیتبوومن فەرقی هەبوو. ئەمن بەڕاستی شەیدا و خوازیاری ئەو بووم و تەنانەت حەزم لە ڕاگرتنی منداڵەکەشمان دەکرد. بەڵام، لەلایەکی دیکەوە دەمزانی ئەگەر پێوەندیی من و ئەو ئاشکرا بێ، لەباری ئەمنیەتییەوە من بە مەترسیدار دادەنێن و کارەکەشم دەکەوێتە مەترسییەوە. بە سەرنجدان بە هەموو ئەمانە، دڵم شتێکی پێ‌دەگوتم و مێشکم شتێکی دیکە.

سەعاتەکانی دواتری ئەو ڕۆژە، ئێمە بە ئوتوبووس چووینە «سوونیۆن» Sounion، ئەو جێیە کە دەریای ئادریاتیک و مەدیتڕانە دەبن بە یەک. لەکاتێکدا سەیری ئەو نوختەیەمان دەکرد کە ئەو دوو

دەریایە یەکیان دەگرتەوە، ڕووی تێکردم و گوتی: «ئەمن پێم وانیە هیچوەخت بتوانم منداڵەکەم لەبەر بەرم».

«بەڵام ئێمە یەکتر باش ناناسین. نە ئەمن دەزانم ئەتۆ کێی و نە ئەتۆ دەزانی ئەمن کێم».

ئەو تەماشایەکی من و لای سەرەوەی کرد و لەحاڵێکدا تینی زەردەخەنەیەک، ددانە سپییەکانیی لەنێو پێستە زەیتوونییەکەیەوە دەردەخست، ماچی کردم و گوتی: «بەڵام ئەمن دەمەوێ منداڵەکەمان ڕابگرم».

لەحاڵێکدا مێشکم ڕەوانیی جارانی نەبوو، گوتم: «زۆر باشە، کەیفی خۆتە. لەوانەیە چارەنووس وابێ».

بەڕاستییش چارەنووس وابوو.

لە ئاوریلی ١٩٧٨دا سەرۆکەکانم بۆچوونەکەمیان دەبارەی نزیک-بوونی شۆرشی ئێرانەوە قبووڵ کرد. پاشان هەر لەو مانگەدا کۆنفرانسێک بە بەشداریی شارەزایانی ڕێکخراوەکانی «مۆساد»، «هەواڵگریی سەربازیی ئیسرائیل» و CIA بە مەبەستی دان و وەگرتنی زانیاری لە تەل ئەبیب پێکهات کە ئەمنیش ئەندامێکی ئەو کۆنفرانسە بووم. لە لایەکی مێزەکە کارمەندانی ڕێکخراوەکانی «مۆساد» و «هەواڵگریی سەربازیی ئیسرائیل» و لە لایەکەی دیکەی، کارمەندانی CIA دانیشتبوون و ڕاپۆرتەکەی من لەبارەی بارودۆخی ئێرانەوە لە نێویاندا بڵاو کرایەوە. ئەمجارە، کاتێک سەرنجیان بۆلای نێوەرۆکی ڕاپۆرتەکەم ڕاکشا، دڵم داخورپا.

یەکێک لە توێژەرانی هەواڵگریی ئەمریکایی، نەزەری من لەبارەی بارودۆخ و دواڕۆژی ئێرانی بە پووچ و بێکەلک دانا و ڕەتی کردەوە. ئەو لێی زیاد کرد، ئەوەی ئەم ڕۆژانە لە تاران ڕوو دەدا، لەڕاستیدا هاتوهاواری تاقمێک منداڵی بەقاووقیژ لە شەقامەکانە و خۆپیشاندانی خەیابانی لە ئێران لە ساڵەکانی دەیەی پەنجاوە هەمیشە هەبووە. ئەم کۆنفرانسە زۆر دۆستانە ڕێکنەخرا. کارمەندانی دوو لای مێزەکە

لەبارەی ئێران و دوارۆژی ئێرانەوە بیروباوەڕی ناوەکیەکیان هەبوو و بەردەوام بە توندی بۆچوونەکانی یەکتریان ڕەت دەکردەوە. ئێمە هەوڵمان دەدا بە نوێنەرانی ئەمریکا بڵێین کە بارودۆخی ئێستای خۆرهەڵاتی نێوەڕاست لە گۆڕاندایە و ئیسرائیل ئیدی ناتوانێ لە بەرامبەر عەرەبەکاندا پشت بە پشتیوانیی ئێران ببەستێ. لە ڕابردوودا وا دانرابوو هەروەخت ئیسرائیل بکەوێتە بەر هێرشی عەرەبەکان، ئەمریکا لە ڕێگای ئێرانەوە و بە کەلکوەرگرتن لە خاکی ئەو وڵاتە بێتە کۆمەگی ئیسرائیل. بەڵام، ئێستا ڕێژیمی شا لە حاڵی هەڵوەریندا بوو و لەئاکامدا، ئەمنیەتی ئیسرائیل کەوتبووە لاوازی و مەترسییەوە. ئەمە ڕاستییەکی سادە بوو کە هیچکەس نەیدەتوانی گومانی لە دروستبوونیدا هەبێ.

بەڵام لێکۆڵەرە ئەمریکاییەکان گوێیان بەو قسانە نەدەدا.

گوێنەدانی کارمەندە هەواڵگرە ئەمریکاییەکان بەو ڕاستییانە، ڕاست وەک ئەوە بوو کە زللە لە ڕێکخراوی هەواڵگریی ئیسرائیل و بەتایبەتی لە من بدەن. دواتر زەبرێکی دیکەشی لێزیاد بوو.

پریزیدێنت جیمی کارتەر لە وتارێکی هەمووانیدا گوتی کە شای ئێران، دۆست و هاوپێوەندی ئەمریکایە و وەک گابەردێک لە خۆرهەڵاتی نێوەڕاستدا لەسەر پێیە. بەڵام ئێمە ناتوانین ئەو جۆرە قسانە بخەینە نێو باوەڕەکانمان. ئەمریکاییەکان نەک هەر هۆشدارەکانی ئێمە لەبارەی ئێرانەوەیان بە «نەبوو» دانا، تەنانەت زەحمەتی ئەوەشیان بەخۆیان نەدا کە هەرنەبێ بۆخۆیان لێکۆڵینەوەیەکی تایبەتی لە بارودۆخی ئێران بکەن. ئەوان بە تەواوی لەو مەترسییانە غافڵ بوون کە ڕوویان کردبووە شا.

لە کۆتایی ئەو ساڵەدا سەرەنجام حکوومەتی کارتەر پێی لەوە نا کە ڕێژیمی شا دوارۆژەکانی تەمەنی دەگوزەرێنێ. لە دیسامبر (کانوونی یەکەم)ی ساڵی ١٩٧٨دا، CIA، ڕێکخراوی هەواڵگریی ئیسرائیل و «ساواک»ی بۆ جێبەجێکردنی گەڵاڵەیەک بە مەبەستی کوشتنی

ئایەتوڵڵا خومەینی، ئەو ڕووحانییە ئیسلامییە کە لە پاریسەوە، ڕێبەرایەتیی چالاکییەکانی دژی شای دەکرد، بانگهێشتن کرد. ئەو گەلاڵەیە کە لەلایەن «ڕافی ئەیتان» Rafi Eitan ڕاوێژکاری دژەتیرۆریستیی سەرۆکوەزیری ئیسرائیلەوە، ئامادە کرابوو، بریتی بوو لەوە کە تیمێکی ئیسرائیلی بێ ئیزنوەرگرتن لە کاربەدەستانی حکوومەتی فەڕانسە بە فڕۆکە بچێتە ئەو وڵاتە و خومەینی لەنێو بەرێ. دوای ئەوە هەر لەو ڕۆژەدا، بە پەلە، ژەنراڵە ئێرانییەکان حکوومەتی سەربازی لە وڵاتدا ڕابگەیەنن و پاش مانگێک کە نەزم و ئاسایش لە وڵاتدا بەرقەرار بوو، ساواک دەستبەکار بێ، یان ژەنراڵەکان لەسەر کار لابەرێ یان بیانگرێ و دەسەلاتی تەواو بداتەوە دەست شا.

ئەم گەلاڵەیە لە تیۆریدا ناشیرین نەبوو، بەڵام شانسی جێبەجێ-کردنی نەبوو و هێزی ئینسانی بۆ ئەنجامدانی زۆر لاواز بوو، هیچ ڕێی تێنەدەچوو شا بۆ بەڕێوەبردنی ئەو بەرنامەیە پشتی ساواک و ژەنراڵەکان بگرێ. هێزە دژبەرەکان بەتەواوی نفووزیان کردبووە نێو سوپا و ساواک و جگە لەوەش، بەرپرسە سەرووەکانی ئەو ڕێکخراوانە بەتوندی خەریکی کۆکردنەوەی ئەو دارایی‌یانە بوون کە بە شێوەی ڕەوا یان ناڕەوا بەدەستیان هێنابوو، بۆ ئەوەی پێش گەیشتنی ڕۆژی شۆرش لە وڵات ڕابکەن.

بەوحاڵەش، ئیسرائیلییەکان بۆ پووچەڵکردنەوەی شۆرشی دژبەرانی ڕێژیمی شا، بێکار دانەنیشتبوون و لە هەوڵی ئامادەکردنی پێویستییەکانی لەنێوبردنی خومەینیدا بوون. بۆ جێبەجێکردنی ئەو بەرنامەیە، ئیسرائیلییەکان سەرهەنگ «ئاسەف هەفتێز» Assef Heftez سەرۆکی گاردی تایبەتیی پۆلیسی سنووریی ئیسرائیلیان کە تیمێکی کۆماندۆیی بەکار و کارامە بوو و بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی فڕۆکەڕفێنی و هەر ڕووداوێکی تیرۆریستیی دیکە ئامادە کرابوو، هەڵبژاردبوو کە بە فڕۆکە بچێتە فەڕانسە و هێرش بۆسەر شوێنی

مانەوەی خومەینی لە دەوروبەری پاریس ڕێبەری بکا. گومانێک نیە کە ئەو تیمە دەیتوانی بە سەرکەوتنەوە بەرنامەکە جێبەجێ بکا و بێ بەرەوڕووبوونەوە دەگەڵ هەرجۆرە گیروگرفتێک بگەڕێتەوە ئیسرائیل. بەڵام خەڵک وەفاداریی خۆیان بۆ شا لەدەست دابوو و بۆیە وەک پێویست ئامادە نەبوون پاش کوژرانی خومەینی پشتیوانیی لێبکەن.

بەوحاڵە مەئموریەت درا بە «یووری لووبڕانی» Uri Lubrani سەرۆکی نوێنەرایەتیی سیاسیی ئیسرائیل لە ئێران کە تازە خانەنشین کرابوو، بۆ ئەوەی مەسەلەکە دەگەڵ شا باس بکا. شا دەسبەجێ موخالەفەتی دەگەڵ کرد.

شا بە «لووبڕانی»ی گوت: «ئەمن ڕێگا نادەم، ئێرانییەکان لەوە زیاتر قەلاچۆ بکرێن. ئەگەر بڕیار بێ ژەنراڵەکان حکوومەتی سەربازی دامەزرێنن، دەبێ لە شەقامەکانی تاران دەست بە خوێنڕێژی بکەن. ئێمە خۆمان سەروسامان بە دۆخەکە دەدەین».

ئەمە باوەڕێکی تازە بوو. شای ئێران لێرەدا نیگەرانیی لەبارەی خەڵکی ئێرانەوە دەردەبڕی.

«لووبڕانی» بە ڕێکخراوی هەواڵگریی ئیسرائیلی گوت کە نە شا ئیدی دەتوانێ لە دەسەلاتدا بمێنێ و نە ژەنراڵەکان دەتوانن کودەتا بکەن. وڵات بەکردەوە کەوتۆتە دەستی ڕێبەرە شیعەکان و تەنیا ڕۆژگار کارەکە یەکلا دەکاتەوە.

دیسامبری ساڵی ١٩٧٩، بڕیارم دا هەڵەکانی کاربەدەستانی CIA دەربارەی وەزعی ئێران بەچاوی واندا بدەمەوە. لەوکاتەدا ئەمن هەم لەسەر ئەوەی ڕاپۆرتەکانی پێشوومیان ڕەت کردبۆوە لێیان توورە بووم و هەم ڕەفتارەکەیانم بەرامبەر بە خۆم بە سووکایەتی دەزانی. هەتا کۆتایی ساڵی ١٩٧٨، هیچ کارێکیان لەسەر ئەو زانیارییانە کە ئێمە لەبارەی ئێرانەوە دابوومانێ ئەنجام نەدابوو و ئێستا کە دەرفەت لەدەست چووبوو و زۆر درەنگ ببوو، ئەوان بەرنامەیەکیان

دارڕشتبوو کە نەکھەر جێبەجێکردنی نامومکین بوو، بەڵکوو دەبووە هۆی خوێنڕێژییەکی پتریش.

بە تەلەفون بە کاربەدەستێکی CIAم گوت: «ئێوە باشترە لەجیاتی ئەوەی پێتان وابێ هەمیشە بۆچوونەکانتان دروستن، کەمێکیش گوێ بۆ نەزەری خەڵکی دیکە ڕادێرن». لەبیرم نیە لە وەختی ئەو وتووێژە تەلەفونییەدا کێ یەکەمجار تەلەفونەکەی پچڕاند.

هەر لەومانگەدا (دیسامبری ١٩٧٨)، کاتێک واز لە گەڵاڵەی لەنێوبردنی ڕووحوڵلا خومەینی هێنرا، هەوڵ درا گفتوگۆیەک دەگەڵ خومەینی ڕێک بخرێ. ئیسرائیل دەیەویست بزانێ، کاتێک کە ئەو دەسەڵاتی ئێران بەدەستەوە دەگرێ، بەرنامەکەی چدەبێ. مەناخیم بگین، سەرۆکوەزیری ئیسرائیل مووافەقەتی دەگەڵ باوەڕی ڕێکخراوە هەواڵگرییەکانی ئەم وڵاتە کرد کە دەیانگوت گفتوگۆ دەگەڵ خومەینی زیانێکی لێناکەوێتەوە. بەڵام کێشەکە ئەوە بوو کە کێ لەلایەن ئیسرائیلەوە دیدار و گفتوگۆ دەگەڵ خومەینی بکا.

ئەم ئەرکە بە کەسێک سپێردرا کە کەمکەس دەیتوانی بیر بکاتەوە ئەو بۆ ئەوکارە دیاری دەکرێ. ئەم کەسە ڕووت بن دێڤید Ruth Ben David بوو.

لە سەرەتاکانی دەیەی ساڵی١٩٥٠دا ئەو خانمە کاتوولیکە فەڕانسەیییە، جوان و میهرەبانە لە پاریس دەژیا و ئەو جوولەکە ئۆرتۆدۆکسە توندڕەوانەی ئۆرشەلیمی کە سەردانی پاریسیان دەکرد، دەخستە بەر میوانداری و میهرەبانیی خۆی. یەکێک لەو جوولەکانەی سەری پاریسیان دا، خاخام «ئەمرام بلاو» Amram Blau ڕێبەری فیرقەیەکی ئۆرتۆدۆکسی جوولەکە لە ئۆرشەلیم بوو کە بەناوی «نێتووری کارتە» Neturei Karte بە مانای «نیگابانی قەڵا» دەناسرا. ئەم کەسە خێزانەکەی لەدەست دابوو و بە دوای ژنێکدا دەگەڕا. «ئەمرام بلاو» بە خاتو «ڕووت بن دێڤید» کە جوانێکی سەرسوڕهێن بوو ناسێندرا و چەندین سەعات هاودڵی و هاونشینیی دەگەڵ دەکرد.

سەرەنجام ئەو دووە هەستی ئەڤین و سۆزدارییان بۆ یەکتر پەیدا کرد و بڕیاریان دا پێکەوە زەماوەند بکەن. خانمی «ڕووت بن دیڤید» ئاینی گۆڕی و بوو بە جوولەکەی ئۆرتۆدۆکس.

مێردی «ڕووت بن دیڤید»، پێش مردنی زۆرجار سەفەری تورکیەی دەکرد و لەو سیمینارانەدا کە خاخامە جوولەکەکان و مەلا شیعەکان بۆ دان و ستاندنی مەزهەبی و ئەوە کە چۆن دەتوانرێ ئیلاهیات بهێنرێتە نێو حکوومەتە زەمینییەکان، بەشدار دەبوو. لەو سەفەرانەدا «ڕووت بن دیڤید»یش دەگەڵ مێردەکەی دەچووە تورکیە و دەگەڵ ڕووحوڵڵا خومەینی کە ئەوکات دوور خرابۆوە بۆ تورکیە، ئاشنا بوو. دوای مردنی خاخام «بلاو» کوڕێکی کە لە ژنەکەی پێشووی بوو، ڕێبەرایەتیی «نێتووری کارتە»ی بە ئەستۆوە گرت. بەڵام ڕێبەرایەتیی ئەو فیرقەیە بەکردەوە لە دەستی «ڕووت بن دیڤید»دا بوو.

مەناخیم بگین، سەرۆکوەزیری ئەوکاتی ئیسرائیل، مەئمووریەتی دا بە «ڕووت بن دیڤید» لە پاریس کە بچێتە لای خومەینی و نەزەری لەبارەی پێوەندی دەگەڵ ئیسرائیل و هەروەها بیرکردنەوەی لەبارەی جوولەکەکانی ئێران دوای بەدەسەڵاتگەیشتن بپرسێ.

خومەینی بە خۆشحاڵییەوە ڕاسپاردەکەی «مەناخیم بگین» دۆستی دێرینی خۆی وەرگرت. خومەینی بە «ڕووت»ی گوتبوو کە ئەو تەنیا ژنە کە ئامادەیە لە ژوورێکی داخراودا دەگەڵی دابنیشێ. «ڕووت» لە شوێنی مانەوەی خومەینی دیدارێکی درێژی لەگەڵ کرد و دوایە یەکسەر ڕاپۆرتی دیدارەکەی دەگەڵ خومەینیی دایەوە بە «مەناخیم بگین».

بەپێی ئەو بابەتانە کە لە ئاکامی دیداری «ڕووت» دەگەڵ خومەینیدا لە دەفتەری سەرۆکوەزیریی ئیسرائیلەوە بۆ لێکۆڵەران نێردرابوو، دیداری «ڕووت» دەگەڵ خومەینی زۆر دۆستانە بەڕێوە چووبوو. خومەینی بە ئاشکرا بە «ڕووت»ی گوتبوو کە یەهوودییەکانی ئێران بە هاونیشتمانی ئێران دادەنرێن و ئیسلام ڕێز

بۆ مووساییگەری و هەموو ئەو ئایینانە دادەنێ کە تووشی بیدعەت و گەندەڵیی بیروباوەڕ نەبوون. خومەینی لێی زیاد کردبوو کە ڕێگا نادا بەهاییەکانی ئێران درێژە بە ڕێوڕەسمە ئایینییەکانی خۆیان بدەن، چونکە شەرعی ئیسلام، ئەو پێغەمبەرانە کە پێش موحەممەد هاتوون، وەک مووسا و عیسای مەسیح، بە پێغەمبەری ڕاستەقینە دەژمێرێ. بەڵام هەرکەس دوای موحەممەد ئیددیعای پێغەمبەرایەتی و نێردراویی خوای کردبێ وەک بیدعەتکار دەناسێ و بیدعەتکارانیش دەبێ ئیعدام بکرێن. موحەممەد لەڕاستیدا کۆتایی پێغەمبەران بووە. خومەینی هەروەها بە «ڕووت»ی گوتبوو دەوڵەتی ئیسرائیل لە سەرزەمینی فەلەستین جۆرێک بیدعەتە و نابێ دەوڵەتێکی وا لە سەرزەمینی فەلەستیندا هەبێ. خومەینی ئاماژەی بەو بابەتەش کردبوو کە مەککە و مەدینە دەبێ لەژێر نیری سعوودییەکان ئازاد بکرێن.

بەمجۆرە پەیامی خومەینی بە بگین زۆر ڕوون و ئاشکرا بوو: ئیسرائیل نابێ هیچ نیگەرانییەکی لە دامەزرانی حکوومەتێکی ئیسلامی لەلایەن ئێمەوە هەبێ. بەرنامەی کاری ئێمە لەپێشدا ڕووبەڕووبوونەوە دەگەڵ دوژمنە عەرەبەکانمانە. پاش ئەوەی حیسابی خۆمان دەگەڵ عەرەبان ڕوون کردەوە، ئەو وەخت بیر لە ئیسرائیل دەکەینەوە.

ئیسرائیلییەکان بە بیستنی ئەم خەبەرە زۆر خۆشحاڵ بوون. بەپێی ئەو خەبەرە هێندێک وڵاتی عەرەبی -ئۆردۆنی هاشمی، عێراق، عەرەبستانی سعودی، کووەیت، میسر و میرنشینە یەکگرتووەکانی عەرەب بە زوویی دەگەڵ دوژمنێکی غەددار و سەرکوتکەر بەرەوڕوو دەبوون. ئەم وڵاتانە لەمەودوا نەکهەر دەبێ دەستوپەنجە دەگەڵ ئیسرائیل نەرم بکەن، بەڵکوو دەگەڵ ئێرانیش دەبێ لەشەڕدا بن. شا لە ساڵانی کۆتایی حکوومەتەکەی لە ئێراندا، دەگەڵ عەرەبەکانی دۆستی ئەمریکا کە ئامادەی هاوپەیوەندییەکی مەرگهێن دژی ئیسرائیل

بوون نزیک ببۆوە و دەگەڵیان کەوتبووە یەک ڕیزەوە، بەڵام بە لەبەرچاوگرتنی ئاسۆیەکی ڕوون و هیوابەخش کە ئێستا پێشبینی دەکرا بە هاتنەسەرکاری ئیسلامییە بنئاژۆکان بێتە دی، وا دەردەکەوت کە سەرنەگرتنی بەرنامەی کوشتنی خومەینی خۆشبەختییەکی بەرچاو بۆ ئیسرائیل بووە.

کەمێک دوای کریسمەسی ساڵی ١٩٧٨، ئەمن داوای مۆڵەتم کرد. سەرۆکەکانم زۆر بە خۆشحاڵی داواکەمیان قبووڵ کرد. چونکە ئەمریکایییەکان لە پێچەقاندنم لەسەر لێکدانەوەکانم لەبارەی بارودۆخی ئێرانەوە نارەحەت بوون و بۆیە سەرۆکەکانم پێیان ناخۆش نەبوو ماوەیەک ئەمن لە مەیدانەکە دوور بکەومەوە. ئەمن پێشتر تەلەفونم بۆ «ماناگوا» کردبوو و قەرارومەداری پێویستم دەگەڵ «فریدی» دانابوو. ئەمن بە فڕۆکە چوومە «لیسبۆن» لە پرتوگال و بە تاکسی چوومە هوتێل «پەنتا». «فریدی» پێش من گەیشتبووە وێ. ئەمن لە مانگی ئاوریلەوە چەند جارم ئەو دیبوو، بەڵام ئەم جارە لەگەڵ جارەکانی پێشوو زۆری فەرق هەبوو. تۆلی هاتبووە پێش و کێشی زیاد ببوو. دوو مانگی دیکە منداڵەکەمان لەدایک دەبوو.

پێمگوت: «چەند جوان بووی».

ماوەی دوو حەوتوو کە هەموو ساتەکانی پڕ لە شادی و پیرۆزی بوون دەگەڵ وی لە پۆرتوگال بووم. هەروا کە لە قەراغی ئوقیانووسی ئەتلانتیک لە «ستۆریل» Storil پیاسەمان دەکرد، ئەو باسی ئەو کاردروستایییەی دەکرد کە بۆ لەدایکبوونی منداڵەکەمانی کردبوو.

ئەمن دەستیم گرت و گوتم: «ئەمن خۆشحاڵم کە بڕیارمان دا منداڵەکەمان ڕابگرین».

ئەو لە وەڵامدا بە زەردەخەنەیەک خۆشحاڵیی نیشان دا، لەو پێکەنینانە کە لە وڵاتی شەڕلێدراوی «نیکاراگوا» دڵمی ڕفاندبوو.

لەوکاتەدا «سەندی نیستا»کان کەموزۆر شەڕەکەیان بردبۆوە و تەنانەت چەند ڕۆژ بوو کە لە ئووتی ئەو ساڵەدا، کۆشکی نیشتمانییان گرتبوو.

گوتم: «وادیارە لەوانەیە بە زوویی ببیە وەزیری دەرەوەی «نیکاراگوا»». بەڵام دیارە ئەو قسەیەم بە نیوەگاڵتەیەک پێگوت و وریا بووم نەوەکا لە دڵی گران بێ.

زەمان چەند زوو تێپەڕی. ئێستا وەختی ئەوە هاتبوو ئەمن بچمەوە تەل ئەبیب، ئەو گوێی بۆ قسەکانم ڕادەداشت و لەسەرەخۆ دەستی بەزگیدا دێنا.

ئەو گوتی: «نیگەران مەبە. هەرکاتێک دەرفەتت هەبوو بە زوویی دەمانبینیەوە.»

ئەمن ئەوم لە باوەش کرد. بیرم کردەوە، دەبێ خواحافزیی لێ-نەکەم. ژیان بێئەو بۆ من کارێکی ئاسان نەبوو.

سـەعات ١٢ و ٣٠ دەقیقـەی ڕۆژی ١٦ی ئـاوریلی ١٩٧٩[٤]، چـوار هێلیکۆپتـەر لـە دەوروبـەری کۆشـکی نیـاوەران هەسـتان و لەحاڵێکدا پەروانەکانیان بەفریان ڕادەماڵی لە حەوادا کەوتنە فڕین. ئەگەر یەکێک لەو دەوروبـەرە بیویسـتایە شـا بکوژێ، قـەت نـەیدەتوانی بزانـێ کـام لـەو هێلیکۆپتەرانـە «ئەعلاحـەزرەتی پیـرۆز، شاهەنشـای ئاریـامیهر، موحەممـەد ڕەزاشـای پەهلـەوی، شاهەنشـای ئێـران، شـای شـایان، سێبەری خوا، ناوەندی جیهان»ی تێدایە.

ڕاپۆرتــەکانی کاربەدەســتانێ هــەواڵگری وایــان نیشــان دەدا کــە ڕۆیشتنی شا لە ئێران دەبێتە هـۆی ئاڵوگۆڕی ئاژاوەگێڕانە لـە ئێران. پێش‌بینی کرا کە ئەم ڕووداوە، بۆ مانی ئیسـرائیلیش مەترسـیدار دەبـێ و سـەرەنجام دەبێتە هـۆی کێشـەیەکی توندی بیروبـاوەڕی لـە نێـوان وڵاتـی مـن و ئـەمریکادا. لـەو ڕاپۆرتانـە کـە ڕێکخـراوە هەواڵگرییـەکان لـەبارەی دواسـاتەکانی وێسـتانێ شـا لـە ئێران ئامادەیان کردبـوون و ئەمن لێکم دانەوە، تەنیا یەک شتم دەست کەوت، ئەویش ئەوە بوو کـە ئەوکاتەی شا و شـاژنەکەی لـە فڕۆکەخانـەی مێهرئابـاد لـە هێلیکۆپتـەر دابەزین و دوو ئـەفسـەری گـاردی شاهەنشـاهی چۆکیـان لەبـەر دادا و لاقـەکانییان مـاچ کـرد، ئـەو سـاتانە لەڕاسـتیدا دواسـاتەکانی چـل‌سـاڵ پاشایەتیی ئەو بوون. ئەو ئیدی نەدەهاتەوە وڵاتەکەی.

یـەکێک لـە ئەفسـەرانی گـاردی شاهەنشـاهی لێـی‌پرسـی: «ئێـوە چ-ماوەیەک لە دەرێ دەمێننەوە؟».

لەحاڵێکدا شاژنە فەرەح قژە ڕەنگ بەڕووەخاسـەکانیی لـەژێر کڵاوە چەرمەکەیدا خڕ کردبوونـەوە و قۆڵی دە قۆڵی شـا کردبـوو، شـا بـە تەڕدەستی وەڵامی دایەوە: «بەستراوەتەوە بە باری لـەش‌سـاغیمەوە».

---

[٤]-ژانویە ڕاستە. چونکە شا ٢٦ی بەفرانباری ١٣٥٧ی هەتاوی ڕۆیشت کە دەیکردە ١٦ی ژانویەی ١٩٧٩. (وەرگێڕ)

لەوکاتەدا هەموو لەشی شا بە نەخۆشیی سەرەتان کونکون ببوو و ئەو وەک مرۆڤێکی نابووت دەهاتە بەرچاو.

شاژنە فەرەح گوتی: «ئەمن پێموایە ئازادیی ئەم وڵاتە و یەکپارچەیی خەڵکەکەی لەجێی خۆی دەمێنێ. ئێمە ئیمانمان بە گەل و فەرهەنگی ئێران هەیە. ئەمن دەزانم کە خوا هەمیشە پشتیوانی خەڵکی ئێران دەبێ».

بەڵام وا دیار بوو خوا خەریکە نارەزایەتیی خۆی نیشان دەدا. دوکانەکان، بانکەکان، و ئیدارە دەوڵەتییەکان پەکیان کەوتبوو، خەڵک ڕژابوونە شەقامەکان و دروشمی «بمرێ شا»یان دەدا. زۆر لە دۆستە نیزیکەکانی شا ئەویان بەجێهێشتبوو. ئەو بنەماڵە دەوڵەمەندانە کە شا باشی دەناسین، لەپێشەوە چەندین میلیۆن ڕیاڵ دراوی خۆیان کردبوو بە دۆلار، فرانکی فەرانسە و مارکی ئەڵمان و هەڵاتبوون بۆ وڵاتانی خۆرئاوا و لای خزمەکانیان، و تەقوتۆقی تفەنگەکان و دەنگی شینوشەپۆری خەڵک لەسەر گۆڕە تازەکانیان بەجێ هێشتبوو.

بەرهەمهێنانی نەوت ڕاوەستابوو. دەیان کەشتیی بارهەڵگر لە خەلیجی فارس لەنگەریان گرتبوو، چاوەڕێ بوون کە کاربەدەستانی گومرگ بچنەوە سەر کارەکەیان و بارەکانیان بەتاڵ بکەن. مۆسکۆ فڕۆکەیەکی ناردبووە ئێران تا ٧٠ کەس پسپۆڕی دۆزینەوەی نەوت و خێزانەکانیان بەرێتەوە سۆڤیەت. ئەمریکایییەکان و هەموو خاریجییەکان بە پەلە بۆ بەجێهێشتنی ئێران هێرشیان کردبووە سەر فڕۆکەکانی هێزی هەوایی ئەمریکا. بە ڕاستی ئێران لە کۆنترۆڵ دەرچووبوو، هەر خۆپێشاندەرێکی بێئازۆی کفنپۆش کە لە لایەن هێزە ئەمنیەتییەکانەوە کوژرابوو، دەسبەجێ یەکی دیکە سەری لە زەوی هێنابووە دەر و جێیەکەی پڕ کردبۆوە.

کاتێک شاهەنشا و شاژن پێیان خستە بۆیینگە ڕەنگ زێوین و شینەکەوە، دوو ئەفسەر داوخوازانە ڕووبەڕووی یەکتر وێستابوون و جڵدێک قورئانیان بەدەستەوە گرتبوو کە ئەوان بە بنیدا تێپەڕن. پاشان لە حاڵێکدا ئاژاوەگێرانی شەقام [!!] لەخۆشییان هاواریان دەکرد و پەیکەرەکانی شای شایانیان ورد دەکرد، شا مستێک خاکی لە زەوی هەڵگرت، خستیە گیرفانی و سواری فڕۆکە بوو،و فڕۆکە لە ئاسمانی بێهەتاودا دەستی بە فڕین کرد. لەم ساتەدا فەرمانڕەوایی شا کۆتایی هاتبوو.

کاتێک دەرکەوت کاری شا تەواو بووە، ئیسرائیل بە پەلە بۆ پاراستنی قازانجەکانی دەستبەکار بوو. لە یەکێک لە دوافڕۆکەکانی «ئێل عال» El Alدا کە پێش داخرانی فڕۆکەخانەی تاران چووە ئەو شارە، ئیسرائیل ٤٨ فڕۆکەوانی بە جلوبەرگی ناسەربازییەوە سوار کردبوو.

چەند ڕۆژ دواتر فڕۆکەوانانی ئیسرائیل بە هاوکاریی تەواوی فەرماندەی هێزی هەوایی ئێران[٥] -کە دوایە ئیعدام کرا- ٤٨ جێتی F-14یان لە ئێران بردە دەرێ و بردیاننە پێگەیەک لە باکووری سینا. (ئەم فڕۆکانە دواتر بەهۆی ئیسرائیلەوە بە تایوان فرۆشران). ئەم فڕۆکانە ئەمریکا لە سێپتامبری ١٩٧٨دا تەحویلی ئێرانی دابوون. تەحویلدانی ئەو فڕۆکانە بە ئێران لەو کاتەدا یەکێک لە نیشانەکانی بێخەبەریی حکوومەتی کارتەر لە بارودۆخی ئێران بوو. ئەمریکا ئەو فڕۆکانەی تەنانەت پێش ئەوەی بدرێن بە هێزی هەوایی ئەمریکاش، دابوون بە ڕێژیمی شا و شاش کە ڕێژیمەکەی خەریکی داتەپین بوو، نرخەکەیانی بەزیادەوە دابووە ئەمریکا. ئەمریکا بەوە خۆشحاڵ بوو کە ئیسرائیل بەوجۆرەی باسمان کرد ئەو فڕۆکانەی لە ئێران بردنە

---

٥- فەرماندەی هێزی هەوایی لەوکاتەدا سوپابود ئەمیر حوسەینی ڕەبیعی بووە. (مترجم فارسی)

دەر. چونکە پێی وابوو کارە باشەکەی ئیسرائیل بەجێ بووە و پێشی ئەوەی گرتوە کە ئەو فڕۆکانە بکەونە دەستی خەڵکی نەخوازراو.

ئەنجومەنی پادشایەتی و ئەنجومەنی بەرزی سەربازی کە بۆ ئەوە پێکهاتبوون لە نەبوونی شادا چاوەدێریی کاروباری ڕۆژانەی وڵات بکەن نەیانتوانی ئەرکەکەیان بەجێ بگەیەنن و شاپووری بەختیار، سەرۆکوەزیر کە یەکێک لە لایەنگرانی موسەددیق، ئەندامی بەرەی نیشتمانی و دوا سەرۆکوەزیر بوو کە لەلایەن شاوە دانرابوو، چونکە دەیەویست بە هاوکاریی گرووپە دژبەرەکان حکوومەت بەسەر وڵاتدا بکا، ئەویش ئیفلیج ببوو و نەیدەتوانی کارێک بکا. ڕۆژی یەکەمی فێوریییەی ساڵی ١٩٧٩، ئایەتوڵڵا ڕووحوڵڵا خومەینی لەنێو شادمانیی خەڵکی هەژاوی تاراندا لە پاریسەوە گەیشتەوە ئێران. دە ڕۆژ دواتر شاپووری بەختیار خۆی شاردەوە و پاشان نیشتمانی بەرەو پاریس بەجێ هێشت[٦].

پاش ئەوەی خومەینی لە ئێران هاتە سەر کار، خانووبەرەی باڵیۆزخانەی ئیسرائیل لە تاران لە لایەن ڕێژیمی تازەوە درا بە «ڕێکخراوی ئازادیخوازی فەلەستین» PLO و بوو بە باڵیۆزخانەی PLO.

لەوکاتەدا هەرچەند باڵیۆزخانەی ئەمریکا لە تاران کاری خۆی دەکرد، بەڵام پێوەندیی نێوان ئیسرائیل و ئێران بە تەواوی پچڕا.

---

[٦] -شاپووری بەختیار لە ئووتی ١٩٩١دا لە پاریس تیرۆر کرا. (لێکۆڵینەوەی پۆلیسی فەڕانسە دواتر ئاشکرای کرد کە بەختیار و یەکێک لە هاوکارانی بە ناوی سرووشی کەتیبە بەدەستی سێ تیرۆریستی حکوومەتی کۆماری ئیسلامی کە لە دەفتەری نوێنەرایەتیی ئێران لە پاریس کاریان دەکرد، بەشێوەیەکی دڕندانە بە کێردی قەسابیی ئاشپەزخانە کوژراون و تەنانەت دووکەس لە تیرۆریستە ئیسلامییەکان دەستگیریش کراون.) ئەوەی لە نێو پەڕانتێزدا هاتوە کاری مترجمی فارسییە.

لە جەنگەی ئەو ڕووداوانەدا، ١٧ کەس لە ئیشکەرانی ڕەسمیی باڵیۆزخانەی ئیسرائیل دەگەڵ چەند کەسی دیکە کە هێشتا لە تاران مابوون، خۆیان شاردەوە و دوایە بە فڕۆکەیەکی هێزی هەوایی ئەمریکا چوونە فرانکفۆرت و لەوێوە بە «ئێل عال» گەڕانەوە تەل ئەبیب.

خومەینی بە وەدەستهێنانی ئەو سەرکەوتنە مەزنە، هەروەک ئێمە لە مانگەکانی پێشتردا پێشبینیمان کردبوو، ڕۆژی هەوەڵی ئاوریل لە ڕێفراندۆمێکی گشتیدا ئێرانی بە ناوی وڵاتێکی کۆماریی ئیسلامی ڕاگەیاند.

یەکەمین کەس کە حکوومەتی شۆرشگێڕی خومەینی کردیە سەرۆکوەزیر مەهدیی بازەرگان بوو. مەهدیی بازەرگان ئەندامی بەرەی نیشتمانی و یەکێک لە لایەنگرانی موسەددیق بوو و لەڕاستیدا خومەینی بۆیە ئەوی کردە سەرۆکوەزیر تا ببێتە نوێنەری وی بۆ دروستکردنی هاوسەنگییەک لە نێوان مەزهەبییە بنئاژۆکان و چینی نێونجیدا. مەهدیی بازەرگان پێی وابوو سۆڤیەتەکان و ئەمریکایی-یەکان هەردووکیان بەدخواز و نیازخەراپن، بەڵام ئەمریکاییەکانی پێ لە کۆمۆنیستە خوانەناسەکان باشتر بوو. ئەو باوەڕی بە بۆچوونی خومەینی نەبوو کە دەیگوت ئێران بێپشتیوانیی یەکێک لە زلهێزەکان دەتوانێ لەسەر پێی خۆی ڕاوەستێ. ئەو بە ئاشکرا نیشانی دەدا کە حەز دەکا پێوەندییەکان دەگەڵ ئەمریکا ئاسایی بکاتەوە. بازەرگان ڕێگای دا باڵیۆزخانەی ئەمریکا لە تاران درێژە بە کاری خۆی بدا و پێوەندیی ئاسایی دەگەڵ ئەمریکای درێژە پێدا.

بەڵام گرووپە بنئاژۆ توندڕەوەکان، ئەمریکایان بە «شەیتانی گەورە» دەزانی و حەزیان دەکرد نە ئەمریکاییەکان لە ئێران بمێنن و نە ئێران هیچ پێوەندییەکی دەگەڵ ئەمریکا هەبێ. بۆیە گرووپی سیاسیی بازەرگان کەوتە بەرامبەری گرووپی بنئاژۆی توندڕەو و

ئەم دوو گرووپە کەوتنە ململانەیەکی توندی دەسەڵات. وا دەهاتە بەر چاو کە ئەو ڕووداوانەی باس کران هیچ هیوایەکیان بە باش-بوونەوەی پێوەندییەکانی ئێران و ئیسرائیل نەهێشتۆتەوە. ئیسرائیل لە حاڵێکدا هێشتا خەریکی لستنەوەی ئەو برینانە بوو کە لە ئاکامی دەرکران لە تاراندا هەڵیگرتبوون، هەر لەو حاڵەدا لە ڕێگای ڕێکخراوە هەواڵگرییەکانیەوە بە وردی بارودۆخی نالەباری ئێرانی خستبووە ژێر چاوەدێری.

بە پێچەوانەی ڕاپۆرتە هەواڵگرییەکانی ئەمریکا، ئاگاداریی ئێمە لە بارودۆخی ئێران نیشانی دەدا کە بارودۆخی نێوخۆی ئێران بە خێرایی بەرەو ناخۆشی دەڕوا. ناکۆکیی نێوان گرووپە جۆراوجۆرە مەزهەبی و سیاسییەکان لە پەرەگرتندا بوو، بەڵام لە هەمووی گرنگتر ئەوە بوو کە هیچ مەترسییەک هەڕەشەی لەسەرکارلابردنی لە مەزهەبی و مەلاکان نەدەکرد. ئێمە هەروەها قانیع ببووین کە ڕووبەڕووبوونەوەیەکی نێوان وڵاتانی عەرەبی و ئێران کە ئاکامەکەی شەڕی ئێران و عێراقی دراوسێی بوو خەریکە ڕوو دەدا. ئیسرائیل زۆری دۆست لەنێو سوپای ئێراندا هەبوون کە هەموویان ڕقیان لە عێراق بوو. هەرچەند عێراق کۆمەڵێکی زۆری شیعەی لە باشووری ئەو وڵاتە هەیە، بەو حاڵە دوژمنایەتییەکی لەمێژینە لە نێوان ڕێبەرە سوننییەکانی عێراق و ئێرانییانی شیعە لەئارادا بوو.ساڵی ١٩٧٥، لە نێوان ئێران و عێراقدا ناکۆکی و پێکدادانێکی سنووری ڕووی دابوو، بەڵام شا بە ئیمزای ڕێککەوتننامەیەک چارەسەری کردبوو. ئێستاش ڕێژیمی تازە نێوەرۆکی ئەو ڕێککەوتنەی بەڕەسمی نەدەناسی و ئیددیعای دەکرد کە یەکاوی عەرەبان (شط العرب)، واتە ڕێگای گرنگی گەیشتنی عێراق بە خەلیجی فارس ڕێگای ئاویی ئێرانە و بەحرەینیش بەشێک لە خاکی ئێرانە.

یەکێک لە هەوەڵین نیشانەکانی لێکدانی نێوان عەرەبەکان و ئێران، لە کاتی سەردانی عەبدوسسەلام جەللوود، پیاوی دەستی ڕاستی سەرهەنگ قەززافیدا کە بۆ پێشکەشکردنی پیرۆزبایی ڕێبەری لیبیا بە ڕێژیمی تازە هاتبووە ئێران، دەرکەوت. کاتێک جەللوود لە تاران بوو خانەخوێ ئێرانییەکانی لەبارەی چارەنووسی شێخ مووسا سەدر، یەکێک لە ڕێبەرانی شیعەی باشووری لوبنانەوە کە لە شەڕی ساڵی ١٩٧٨دا، کاتی سەفەری بۆ لیبیا ون ببوو، پرسیاریان لێکرد. دەبێ بزانین کە پاش ونبوونی شێخ مووسا سەدر لە لیبیا وا باس دەکرا کە چونکە ئەو بە شێوەی پەیڕەوانی شیعە فەڕزە مەزهەبییەکانی بەجێ هێناون نەک وەکوو خەڵکی سوننیمەزهەبی لیبیا، بۆیە خەڵکی لیبیا کوشتوویانە. ئێرانییەکان،سێ حەوتوو جەللوودیان لە تاران ڕاگرت و ڕێگایان نەدا ولاتەکەیان بەجێ بێڵێ هەتا وەلامی پرسیارەکەیان دەداتەوە. سەرەنجام، دوای ئەوەی سەرهەنگ قەززافی بۆخۆی پێوەندیی دەگەڵ خومەینی گرت و داوای لێکرد جەللوودی ئازاد بکا، ئێرانییەکان ئازادیان کرد بچێتەوە ولاتی خۆی.

یەکی دیکە لە نیشانەکانی ناکۆکی و ناسازگاریی نێوان ئێران و عەرەبان دەرکردنی ئیشکەرانی «ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەلەستین» لە ئێران بوو. پاش ئەوەی فەلەستینییەکان جێگیر بوون، لە کۆبوونەوەکانی ئەو عەرەبانەدا کە لە باشووری ئێران دەژیان و هاونیشتمانی ئێران بوون، دەستیان بە پڕوپاگەندەی پانعەرەبیسم و سۆسیالیزم کرد و بۆیە دەسەلاتدارانی حکوومەتی ئیسلامی دەستووریان دا بێجگە لە ئیشکەرانی باڵیۆزخانەی PLO لە تاران، هەموو کەسانی سەر بەو کۆمەڵە لە ولات دەربکرێن.

بەدوای ئەو ڕووداوانەدا، ڕووداوێکی دیکە خەریک بوو بێتە پێش. لە سەرەتای مانگی سێپتامبری ١٩٧٩دا کاربەدەستە هەواڵگرییەکانی ئیسرائیل لە بەغداوە خەبەریان دا کە عێراق سەرگەرمی

خۆئامادەکردن بۆ هێرشێکی تەواو بۆسەر باشووری ئێرانە. ئامانجی بەغدا لەو هێرشە ئەوە بوو کە پارێزگای نەوتەلانی خووزستان کە نزیکی خەلیجی فارس و لەسەر سنووری عێراقە بخاتە سەر خاکی خۆی. عێراق هێندێک بەڵگەی لەدەستدا بوون کە بە ئاسانی لە جێبەجێکردنی ئەو بەرنامەیەدا سەرکەوتوو دەبێ. وەک ئەوە کە دوای شۆرش شیرازەی نەزم لە سوپای ئێراندا لەبەریەک چووبوو. بەشی زۆرتری ژەنراڵەکان و دەریاسالارەکان یان لە وڵات هەڵاتبوون یان ئیعدام کرابوون. تۆمەتی وان ئەوە بوو کە لە ئەنجامی ئەرکی خۆیاندا تەنەخییان کردبوو، ڕێگایان دابوو فڕۆکەوانە ئیسرائیلییەکان جێتە F-14 کان لە پێگەکانی ئێرانەوە بەرەو دەرەوە هەڵفڕێنن.

تەنیا ئەفسەری گرنگ کە هێشتا زیندوو بوو، ئەدمیراڵ ئەحمەدی مەدەنی[٧] فەرماندەی هێزی دەریایی بوو. ئەحمەدی مەدەنی لە ساڵەکانی دەیەی ١٩٦٠دا گەنجترین ئەدمیراڵی هێزی دەریایی شا بوو کە ساڵی ١٩٧٠ بە تۆمەتی گەندەڵی ناچار بوو دەست لە کار

---

- [٧]ئەحمەدی مەدەنی کە ڕۆژنامەکانی دوای شۆرش بە سەرهەنگ سەید ئەحمەدی مەدەنی ناویان دەبرد، لە ڕێژیمی شادا ئەفسەرێکی ئاسایی بوو، بەڵام لەبەر ئەوەی کەوتبووە بەر ڕقی شا، حکوومەتی خومەینی کردیە وەزیری بەرگری و پاشان فەرماندەی هێزی دەریایی و پارێزگاری خووزستان. دەنگوباسی ڕۆژنامەکانی دوای شۆرش نیشان دەدا کە سەرهەنگ مەدەنی لە گوێلەمستی بۆ ڕێژیمی خومەینیدا هەنگاوێکیش لەپێش ئاخوندەکانەوە بوو بەڕادەیەک کە شێخ سادقی خەلخالی قەسابی مێشکنەخۆشی ڕێژیمی خومەینی کە هەزاران کەسی بێگوناحی بەناوی حاکمی شەرعی شۆرش بە کوشتن دا، تاریفی سەرهەنگ ئەحمەدی مەدەنیی کردوە و قەدرزانیی لێکردوە. مەدەنی بناخەی سوپای ئێرانی کز و نابوود کرد و هەزاران ئازادیخوازی بەناوی دژی شۆرش دایە دەست جووخەکانی ئیعدام.(شۆرشی ٥٧ لە ئاوێنەی چاپەمەنیدا، بەرگی یەکەم، شەهرامی جاویدپوور، ساڵی ١٩٩٢. بەتایبەتی لاپەڕەکانی٧٢، ٧٩، ٨٩، ١١٣، ١٤٣،١٥٦، ١٦٥، ١٧٥ و٢٩٥ سەیر بکەن). ژێرنووسەکە هی مترجم فارسییە.

بکێشێتەوە. هەرچەند مەدەنی حاشای لەو تۆمەتانە کرد کە درابوونە پاڵی، بەڵام بەو حاڵە ناچار بە کشانەوە لە خزمەت بوو.

ئەگەرچی شا ئامادە نەبوو هیچکەس تەنانەت بە زمانی داخراو و بەئاماژەش ڕەخنەی لێبگرێ، بەڵام مەدەنی دوای کشانەوە لە خزمەت، دەنگی لە ڕەخنەگرتن لە شا هەڵبڕیبوو. مەدەنی دوای دەستلەکارکێشانەوە ماوەی ١٠ ساڵ لە زانکۆ جۆراوجۆرەکانی ئێران دەرسی گوتەوە، بەڵام هەمیشە لەژێر گوشاری کاربەدەستانی ڕێژیمی شادا بوو. هەتا هەستی دژایەتی دەگەڵ شا بەرەو بەربڵاوبوون دەچوو، مەدەنییش زۆرتر دەبووە خۆشەویستی دژبەرانی شا و دوای شۆرشیش دەسبەجێ لە فێوریەی ساڵی ١٩٧٩دا خومەینی ئەوی کردە فەرماندەی هێزی دەریایی و وەزیری بەرگری. لە ئاوریلی ١٩٧٩دا مەدەنی لە وەزارەتی بەرگری کشایەوە و کرا بە پارێزگاری ناوچەی ستراتیژیکی خووزستان کە کەوتبووە سنووری عێراق و لە هەموو کاروباری بەرگریدا ڕاوێژکاری نزیکی خومەینی بوو.

کاتێک خەبەری هێرشی نیزیکی عێراق بۆ ئێران گەیشتە تەل ئەبیب، ئێمە بە بیستنی ئەو هەواڵە زۆر نیگەران بووین. ئێمە پێمان وابوو سوپای ئێران لە بەرامبەر هێرشی عێراقدا توانای بەرەنگاریی نیە و بیرۆکەی دروستکردنی «عێراقی مەزن» کە پاشەکەوتە نەوتییەکەی لە دنیادا -لە سۆڤیەت و عەرەبستانی سعوودییش پتر دەبێ - ڕێکخراوی هەواڵگریی ئیسرائیل و هەروەها ڕێکخراوی سیاسیی ڕێبەرییەکەشی دەخاتە لەرزین.

ئەگەرچی مەناخیم بگین سەرۆکوەزیری ئیسرائیل ئومێدێکی زۆری بە کارێکی ئەرێنی لە لایەن ئەمریکاوە نەبوو، بەوحاڵەش بۆخۆی ڕاپۆرتە هەواڵگرییەکانی لەبارەی هێرشی نیزیکی عێراق بۆ سەر ئێرانەوە بۆ کارتەر سەرکۆماری ئەمریکا دەناردن. بگین لەبەر ئەوەی

کارتــەر ئیســڕائیلی بــەزۆر ناچــار کردبــوو ڕێککەوتننامــەی ئاشــتیی «کەمپ دیڤید» قبووڵ بکا، ئەوی نـاخۆش دەویسـت. بگین پێی وابـوو ئـەو ڕێککەوتننامەیـەی ئاشـتی بۆتـە هـۆی ئـەوە کـە ئیسـڕائیل سـینا لەدەســت بــدا، نــەبووە هــۆی ئاشــتییەکی هەمەلایەنــە و کێشــەی فەلەســتینییەکانی هــەروا بــە هەڵاوەســراوی لــە ملــی ئیســڕائیلدا هێشتۆتەوە. بگین بۆیەی ئەو ڕێککەوتننامەیە ئیمزا کردبوو کە کارتـەر ئەوی بۆ ئەو کارە خستبووە ژێر گوشارەوە. «عێزەر وایزمەن» Ezer Weizman وەزیــری بــەرگریی نیشــتمانی و «مۆشــێ دایــان» Moshe Dayan وەزیــری دەرەوەش هــەردووک بــۆ خۆشــیرینکــردن لــە لای ئـەمریکایییـەکان پێیـان لەسـەر ئـەوە دادەگرت کە بگین مـل بـۆ ئـەو ڕێککەوتننامەیە ڕابکێشێ. بێجگە لـەوەش، لەحاڵێکدا بگین، هـەڵوەرینی ڕێژیمـی شـای بـە حـەتمی دەزانـی، بـەڵام سـەرنخوونیی لەنـەکاوی شـا بەدەســـتی ئـــاژاوەگێڕانی [!!] ئێــران و هاتنەســـەرکاری توندــڕەوە شـیعەکان لـە ئێرانـی بـە ئاکـامی ڕاسـتەوخۆی بێکیفایـەتیی کارتـەر دەزانــی. بگــین هەمیشــە بــاوەڕی وابــوو کــە دەکــرا لــەجیاتی ئــەو ڕووداوەی لە ئێران قەوما، ڕێژیمێکی لایەنگری خۆرئاوا لە ئێران بێتە سەر کار.

ئەوکاتەی ترسی ئیسڕائیل لە هێرشی نزیک بە ئەنجامی عێراق بۆ سـەر ئێـران زیـاتر دەبـوو، بگـین بـە ئاشـکرا بـە کارتـەری گـوت کـە ئـەمریکا دەبێ دەسبەجێ لـە حکوومـەتی مەهـدیی بازەرگـان کـە دژی توندڕەوە شیعەکانی ئێران بوو پشتیوانی بکا. بازەرگان، حەزی دەکرد لەگەڵ ئەمریکا بکەوێتە گفتوگۆ، ئامادە بوو کۆمەگی ئەمریکا بۆ نوێ-کردنەوەی سوپای ئێران قبووڵ بکا. بەڵام کارتـەر و دەوروبەرەکەی، بەتایبــەتی ڕاوێژکــاری ئەمنیــەتی نیشــتمانی «زبیگنیــۆ برژینســکی» Zbignew Brzeinski پێشـنیارەکانی بگـین بـۆ پشـتیوانی لـە بازەرگانیـان ڕەت کردەوە. لەحاڵێکدا ئێمە پێمان دادەگرت کە دەبێ فکرێکی کارساز

بـۆ ئێـران بكـرێ، بۆچـوونی بـێجێـی ئـەمریكا، لـە كارتـەر و دەوروبەرەكەیـەوە بگرە تـا لێكۆڵـەرانی CIA و ڕێكخراوی هـەواڵگریی سـەربازیی سـوپای ئـەمریكا، ئەوە بـوو كە دەبێ لێگەڕێین بەرەبەرە ئێران لەنێو خۆیدا لەبەریەک هەڵوەشێ و پاشان ڕێبەرێكی ڕاستەقینە كە لایەنگری ئەمریكا بێ، لە نێوخۆ دەربكەوێ.

لـە كۆتـایی سـێپتامبری ١٩٧٩دا كـە دیـدارێک بـۆ دان و وەرگرتنـی زانیاری لە نێوان كاربەدەستانی هەواڵگریی ئەمریكا و ئیسرائیلدا پێک-هـاتبوو و ئـەمنیش لـەوێ بـووم، ئیسـرائیل نیگـەرانیی توندی خـۆی لـە بارودۆخی ئێران ئاشكرا كرد. ئەم دیدارە كە لە یەكێک لە سـاڵۆنەكانی كۆنفرانسـی ڕێكخـراوی هـەواڵگریی ئیسـرائیل پێکهاتبوو،لێكۆڵـەرانی هەواڵگریی CIAو ڕێكخراوی هەواڵگریی سوپای ئـەمریكا و لێكۆڵـەرانی «مۆسـاد» و ڕێكخـراوی هـەواڵگریی سـوپای ئیسـرائیلی تێدا بەشـدار بـوون. دیـداری باسـكراو لـە لایـەن ڕێكخراوەكـەی مـن، واتـە ئیدارەی پێوەندییە دەرەكییەكانەوە سەرپەرستی دەكرا.

دیدارەكـە بـە خوێندنـەوەی ڕاپـۆرتی یارمەتیـدەری ڕێكخـراوی هەواڵگریی سوپای ئیسرائیل لە كاروباری توێژینەوەدا دەست پێكرا، لێكۆڵەرانی دیكەی هەواڵگریی ئیسرائیل و یـەک لـەوان بۆخـۆم، هێندێ ڕاپۆرتمان لەبارەی هێرشی نزیک بە ئەنجامی عێراق بۆسـەر ئێران و شـوێنەوار و ئاكامـەكانی بـۆ ئـەمریكا و ئیسـرائیل ئامـادە كردبـوو و بەتایبـەتی پێمـان لەسـەر مەترسـییەک داگرتبـوو كـە لەلایـەن عێراقـەوە هەڕەشەی لە ئێران دەكرد.

هـەر قسـەیەک كـە نوێنـەرانی ئـەمریكاییـەكان لـەو كۆنفرانسـانەدا دەیانكرد، نیشانەی خەمساردیی ئـەمریكا بەرامبـەر بـە حـاڵ و وەزعـی خۆرهـەڵاتی نێوەڕاسـت، بـێخەبـەریی ئـەم وڵاتـە لـە ڕووداوە سیاسـییەكانی ڕۆژی ئـەم ناوچەیـە یـان هـەرچی نـاوی دەنێـی، بـوو. دوكتـۆر «جـاک ڤێرۆنـا» Jack Verona، سـەرۆكی شـاندی ئـەمریكایی

جێگری ڕێکخراوی هەواڵگریی سوپای ئەمریکا لە کاروباری تەکنیکیدا بوو. بەڵام شارەزای کاروباری خۆرهەڵاتی ناوین نەبوو. ئەویش هەروەک هاوڕێکانی ڕابردووی، ئامانجی ئەوە بوو کە لەبارەی کەلوپەلی سەربازیی دروستکراوی سۆڤیەت زانیارییەکی ورد بەدەست بێنێ. هەروا کە لەو دیدارەدا دانیشتبووم، نەمتوانی خۆ لەو بیرە ببوێرم کە بەڕاستی ئەمریکاییەکان سەریان لە بەفر ڕۆکردوە.

لە «ستانسفیڵد توورنێر» Stansfield Turner سەرۆکی ڕێکخراوی CIA چاوەڕوان نەدەکرا کە بارودۆخی ڕۆژ بە باشی تێبگا، بەڵام هەرنەبێ جێگرەکان و هاودەستەکانی وەک «ڕابێرت گەیتس» دەبوو بارودۆخی ڕۆژی ئەو ناوچەیە بناسن. چونکە «ڕابێرت گەیتس» لە ساڵەکانی دەیەی ١٩٨٠دا وەختێک لە ئەنجومەنی ئەمنیەتی نیشتمانیی ئەمریکا کاری دەکرد،لەگەڵ گەورە ئەفسەرانی هەواڵگریی ئیسرائیل لەبارەی ڕووداوەکانی خۆرهەڵاتی ناوینەوە دیداری کردبوو. «ڕابێرت گەیتس» گەنج و ئارام بوو و بە کارناسی کاروباری سۆڤیەت دەناسرا و پێیان دەگوت بەردەستی «جۆرج بووش». بە دڵنیایی ئەو بارودۆخی ڕووبەتەقینەوەی ناوچەی خۆرهەڵاتی نێوەڕاستی دەزانی، بەوحاڵە دەنگی نەدەکرد.

بێ لەبەرچاوگرتنی ئەوە کە «گەیتس» ئاگای لە بارودۆخی خۆرهەڵاتی ناوین هەبوو یان نا، ڕوون بوو کە ئەمریکا لە مەترسییەکانی ئەو ناوچەیە نەدەگەیشت، یان نەیدەویست تێبگا. بەپێی هەڵسەنگاندنی هەواڵگریی ئیسرائیل، سەددام حوسێن نەخشەی کێشابوو کە عێراق بکاتە دەسەڵاتێکی ئەتۆمی و بۆخۆی بۆمبی ئەتۆمی بەرهەمبێنێ. ئێمە باوەڕمان وابوو کە سەددام دەیەوێ لەپێشدا باشووری خۆرهەڵاتی ئێران بە چەکە ئاسایی و نائەتۆمییەکان بەدەست بێنێ، پاشان هەڕەشە لە وڵاتانی عەرەبی خاوەننەوتی خەلیجی فارس و عەرەبستانی سعوودی بکا و خۆی

بکاتـە دەسـەڵاتێکی ناوچـەیی و ئـەمجار بـە پشـتبەسـتن بـە چەکـە ئەتۆمییەکان سەرکەوتنی خۆی بپارێزێ.

دیارە هەموو بەرنامەکانی سەددام حوسێن کردەنی نەبوون، بەڵام گرتنی خووزستان بە ئاسانی مومکین بوو. ئەو هـەروەها بـە ئاسـانی دەیتوانی دەستی بە چەکی ئەتۆمی ڕابگا.

ئەمریکا گوێی نەدەدایە دۆخی ناسەقامگیری حکوومـەتی بازەرگان. ئێرانییەکان جڵەوی کارەکانیان لەدەست دەرچووبوو و ترسـیان ڕێ- نیشتبوو. ئـەوان هـەوڵیان دەدا سـەرنجی خـەڵکی دیکە بۆ لای خۆیـان ڕابکێشـن. چونکـە ئەگـەر عێراقییـەکان بەسـەریاندا زاڵ بوونایـە، شۆرشی ئیسلامی لە مێژوودا بە هۆیەک بۆ وێرانیی ئێران دەژمێردرا و ئەم وڵاتە بەڕاستی لەنێو دەچوو.

بازەرگان، سەرۆکوەزیری ئێران بە توندی پێویستیی بە کەرەسـەی شـەڕی ئـەمریکایی هـەبوو و دەیەویسـت ئـەمریکا لـە بەرامبـەر هەڕەشـەی عێراقدا کۆمـەگ بـە ئێران بکا. بۆیـە، ئـەوە ئەرکی کارتـەر بوو کە پشتیوانی لە بازەرگان و حکوومەتەکەی بکا، هاوسـەنگیی هێز لە خۆرهەڵاتی ناویندا بپارێزێ و بە پێچەوانـەی دژایەتییـەکی زۆر کە لەنێوخۆدا دەگـەڵی دەکرا بازەرگـان لـە سـەرووی حکوومـەتی ئێرانـدا ڕابگرێ. لەلایەکی دیکەوە، لەنێوخۆی ئێران بەتونـدی گوشـار دەخرایـە سـەر بازەرگـان کـە لـە سیاسـەتی دەرەوەی خۆیـدا، ڕەفتـاری دژی ئـەمریکایی بـەکار بـەرێ. بۆ ڕاوەسـتان لـە بەرامبـەر ئـەو گوشـارانەدا بازەرگان پێویستیی فەوریی بە کۆمەگی ئەمریکا و ناردنی کەرەسـەی شەڕ لە ڕێگای هـەواوە هـەبوو. کـەچی ئـەمریکا نـەکـهـەر هیچ وەخت کۆمەگی نەکرد، بەڵکوو بڕیاری دا کاری بەکاری ئێران نەبێ.

ڕوانین و ڕەفتاری کورتبینانـەی حکوومـەتی ئـەمریکا بۆ ئیسـڕائیل زۆر مایـەی نائومێـدی و تـرس بـوو. تـەنیا کـار کـە ئیسـڕائیل لـەو بگرەوبەردەیـەدا دەیتـوانی بیکـا، ئـەوە بـوو کـە نیگەرانییـەکانی لـە

بارودۆخی خۆرهەڵاتی ناوین نەکهەر بۆ ئەمریکایی‌یەکان، بەڵکوو بۆ دۆستە ئورووپایی‌یەکانیشی دووپاتە بکاتەوە. بەڵام ئاشکرایە کە لەوکاتەوە ناوی فەڕانسە لە پێرستی دۆستانی ئیسرائیل بۆ ئەم کارە ڕەش کرابۆوە، چونکە حکوومەتی فەڕانسە پێشتر تەکنیسیەن و ئامرازەکانی بەرهەمهێنانی بۆمبی ئەتۆمی و هەروەها ڕێئاکتۆری ئەتۆمیی خستبووە بەر دەستی عێراق و ئەم وڵاتەی بۆ دروست- کردنی بۆمبی ئەتۆمی ئامادە دەکرد.

سەرەنجام ڕۆژی ٤ی نۆڤامبر (تشرینی دووەم)ی ١٩٧٩، کارەکە یەکلایی کرایەوە. ئەمریکا هەنگاوێکی بۆ یارمەتیدانی بازەرگان هەڵنەهێنایەوە و تاقمی توندڕەو بەسەریدا زاڵ بوو. بەوجۆرە کە توندڕەوەکان بۆ ئەوەی سەرنجی خەڵک بۆلای خۆیان ڕاکێشن، ژمارەیەک لە خوێندکارانی ڕادیکاڵیان هان دا هێرش بکەنە سەر باڵیۆزخانەی ئەمریکا لە تاران و دیپلۆماتە ئەمریکایی‌یەکان بەبارمتە بگرن. توندڕەوەکان پاش بەبارمتەگرتنی دیپلۆماتەکان و ئیشکەرانی باڵیۆزخانەی ئەمریکا لە تاران، گوتیان تەنیا وەختێک دیپلۆماتە ئەمریکایی‌یەکان ئازاد دەکەن کە شا بۆ دادگایی‌کردن بدرێتەوە بەوان. ڕۆژی دوای ئەو ڕووداوە بازەرگان دەستی لەکار کێشایەوە.

کارتەر، سەرکۆماری ئەمریکا لەجیاتی ئەوەی ڕووداوەکە زۆر بەگرنگ لەقەڵەم نەدا، بۆخۆی بەرپرسایەتیی وتوویژ بۆ چارەسەری کێشەی بارمتەکانی وەئەستۆ گرت و بەو کارە کۆمەگی بە ئامانجی ڕادیکاڵەکان کرد. چونکە، بەوکارەی گرنگی و بایەخی بێ‌ئەندازەی بارمتەکانی پشتڕاست کردەوە و ناڕاستەوخۆ قبووڵی کرد کە ئەمریکا دەبێ بۆ ئازادکردنیان نرخێکی گران بدا. ئەم کارە گەورەترین هەڵە بوو کە کارتەر دەی‌توانی بیکا. کارتەر بەوە کە مەسەلەی بارمتەکانی کردە یەکێک لە گرنگترین ئەو کارە نیشتمانی و نێونەتەوەیی‌یانە کە بۆخۆی دەبێ چارەسەریان بکا، بەڕاستی خۆشی کردە بارمتە.

کارتەر دەسبەجێ گەمارۆی ئابووریی خستە سەر ئێران. هەموو دارایییە نەغدییەکانی ئێران لە بانکەکانی ئەمریکای دەست بەسەردا گرت و ئەو ڕووداوەی کردە قەیرانێکی سەختی نیشتمانی. کارە هەڵنەسەنگێندراو و نابەجێیەکانی کارتەر بەرامبەر بە ڕووداوی بارمتەگیری لە تاران، وڵاتەکەی سووک کرد و ئەو سووکایەتییەی کە ئێرانییەکان پێشتر بەوکارە بە ئەمریکایان کردبوو، چەند بەرامبەر کرد و دەستی ئێرانیان بۆ کارەکانی دیکەی دژی حکوومەتی کارتەر ئاوەڵاتر کرد.

لەو بگرەوبەردەیەدا، حکوومەتی کارتەر بۆ چارەسەری قەیرانی بارمتەگرتن، بە ئارامی خەریکی هێندێک کاری سەرسوڕهێنی دیکە بوو. بەو جۆرە کە سێ برای ئێرانی بەناوەکانی سیرووس، جەمشید و ڕەزای هاشمی کە لە ئەمریکا دەژیان، خۆیان لە کاربەدەستانی حکوومەتی کارتەر نزیک کردەوە و گوتیان کە هێندێ پێوەندییان لەگەڵ ئێران و ئەحمەدی خومەینی (کوڕی ڕووحوڵڵا خومەینی) هەیە و دەتوانن لە دۆستایەتیی خۆیان دەگەڵ ئێران و ئەحمەدی خومەینی بۆ ئازادکردنی بارمتە ئەمریکایییەکان بەهرە وەرگرن. برایانی هاشمی هەروەها گوتیان ئەوان دەگەڵ ئامۆزاکانی عەلیئەکبەری هاشمیی ڕەفسەنجانی (کە دواتر بوو بە سەرکۆماری ئێران و ئەوکاتەش لە دامودەزگای خومەینیدا بە پیاوێکی دەستڕۆیشتوو دەژمێردرا) دۆستن و ئامادەن کار بۆ ئازادکردنی بارمتەکان بکەن. کارتەر پێشنیاری وانی قبووڵ کرد و خۆی کردە داردەستی وان.

تائێستا کەس نەیتوانیوە بە تەواوی تێبگا کە حکوومەتی کارتەر چۆنی متمانە بە برایانی هاشمی کرد. برایانی هاشمی هیچوەخت نەیانتوانی دەگەڵ هیچ کاربەدەستێکی گرنگی ئێرانی وتوویژ بکەن، بەڵام لە ڕێی فرۆشتنی هێندێ کەلوپەلی شەڕ بە ئێرانەوە دراوێکی زۆریان بەدەست هێنا. برایانی هاشمی کەلکیان لەو نفووزە وەرگرت

که بە ڕۆژێک لە کۆشکی سپی بەدەستیان هێنابوو و بەناوی ئەوە کە سەرنجی ئێرانییەکان بۆ ئازادکردنی بارمتەکان ڕادەکێشن، دەستیان بە فرۆشتنی ڕادەیەکی کەم کەلوپەلی شەڕ بەوان کرد.

واسیتەی پێوەندیی برایانی هاشمی لە ئێران کەسێک بوو بەناوی «نەجد ڕانکۆنی» کە زاوای ڕەفسەنجانی و ڕێبەری بزووتنەوەی دەروێشی بوو. لەو کاتەدا ڕانکۆنی، بەپێچەوانەی خەزووری پێوەندیی دەگەڵ گرووپی پاسداران هەبوو. ئەو ڕاستەوخۆ دەستی بە ئەنجومەنی بەرزی شۆرش کە دەسەڵاتی بنەڕەتیی ئێرانی لەدەستدا بوو، ڕانەدەگەیشت. بە هەرحاڵ، ڕانکۆنی هیچ دەرەتانی ئەوەی نەبوو کە بتوانێ بۆ ئازادیی بارمتەکان وتووژێکی جیددی لەنێوان ئەمریکاییەکان و ئێرانییەکاندا وەرێ بخا.

شێوەکاری نابەجێ و بێهوودەی کارتەر لەبارەی قەیرانی بارمتەگیرییەوە، هێندێ لە کارناسانی کاروباری هەواڵگریی ئەمریکای کە پێوەندییان بەم وڵاتەوە نەبوو، تووڕە کرد. لە دیسامبری ساڵی ۱۹۷۹دا، یەکێک لە ئەفسەرانی بەناوبانگی خانەنشینکراوی CIA بەناوی «مایلز کاپلەند» Miles Copelad کۆمەڵێک لە ئەفسەرانی CIA و هاوکارەکانیانی کە بەهۆی ئەدمیراڵ «تێرنێر»ەوە لە کار لادرابوون و زۆر لە حکوومەتی کارتەر و ڕێبەرایەتیی CIA ناڕازی بوون، لە دەوری یەکتر کۆ کردەوە. «میلێز کۆپلەند» ساڵی۱۹۵۳ کە شا لەو ئاڵۆزییەدا کە دوای نیشتمانیکردنی نەوتی ئێران بەهۆی موسەددیقەوە لەسەر کار لادرابوو، بۆ گێڕانەوەی شا بۆ سەر دەسەڵات کۆمەگی بە «کەرمیت ڕۆزڤێلت» Kermit Roosvelt کردبوو، پاش ئەوەی CIA سوپای ئێرانی بە دژی موسەددیق پرچەک کردبوو،ئەفسەرانی CIA بە جانتای پڕ لە سەد دۆلارییەوە بە فڕۆکە چوونە ئێران و پاش گەیشتنیان بە ئێران چوونە بازاڕی تاران و هەرکەس هاواری کردبا «بژی شا»، پووڵیان دەدایە.

«کووپلەنـد» دۆسـتی نزیکـی جـەمال عەبدونناسـر، سـەرکۆماری پێشـووی میسـر بـوو و بـە کەسـێکی دژی ئیسـرائیل بـە ناوبانـگ بـوو. کاربەدەسـتە هەواڵگرییـەکانی ئیسـرائیل باوەڕیـان وابـوو کـە «کووپلەند» ساڵی١٩٥٦، بەرپرسی گوشاری ئەمریکا بۆ سەر وڵاتـانی ئینگلسـتان و فەڕانسـە و ئیسـرائیل بـووە بـۆ چوونـەدەر لـە سـینا. ئیسرائیلییەکان هـەروەها لـەو بڕوایـەدا بـوون کـە «کووپلەنـد» هـۆی گوشاری ئەمریکا بۆ سەر ئیسرائیل بۆ چوونـەدەر لـە سینا بووە. لـە جەنگەی گوشاری ئەمریکا بۆسەر ئیسرائیلدا بۆ چوونـەدەر لـە سینا، یەکیـەتیی سـۆڤیەت پـەلاماری هـەنگاریا (مەجارسـتان)ی دا، بـەڵام ئـەمریکا هـیچ دژکردەوەیـەکی بەرامبـەر بـەو مەسـەلەیە نیشـان نـەدا. بەرپرسـایەتیی ئـەو ڕووداوەش خرابـووە ئەسـتۆی «کووپلەنـد» و لەسەر ئەوە سەرکۆنە کرابوو. بەو حاڵە دەبێ بزانین کە «کووپلەنـد» لێکۆڵەرێکی زۆر کارامەی هەواڵگری بوو. هەر لەبەر ئـەوەش ڕێزێکی تایبەتییان بۆ دادەنا.

بێجگـە لـەو کۆمەڵـە ئەفسـەرە لـەکارلادراوەی CIA کـە لـەدەوری «کووپلەنـد» کـۆ ببوونـەوە، «ویلیـام کەیسـی»یـش کـە یـەکێک لـە ئەفسـەرانی پێشـووی هـەواڵگری و دۆسـتی نزیکـی «ڕۆناڵد ڕەیگـان» کاندیدی سەرکۆماری لە حیزبی کۆمارخوازەکان بوو، ڕەگەڵ گرووپی «کووپلەند» کەوت. یـەکی دیکـە لـەو کەسـانەی چوونـە پـاڵ گرووپـی «کووپلەند»، «ڕۆبێرت مەک فارلین» Robert McFarlane، گەمییـەوانی یەکەمی پێشووی هێزی دەریایی ئـەمریکا بـوو کـە لـە ڤێتنـام و زۆری دیکە لەو ڕووداوانەدا کە پێوەندییان بـە CIA وە هـەبوو، بەشـدار ببوو. گرووپـی «کووپلەنـد» گەیشـتبووە ئـەو ئاکامـە کـە کارتـەر و دە وروبەرەکـەی توانـای چارەسـەرکردنی قـەیرانی ئێرانیـان نیـە. ئـەو گرووپـە هـەروەها لـەباری گرنگیـی سـتراتیژیی ئێرانـەوە بـە تـەواوی دەگەڵ ئیسرائیل هاوباوەڕ بوون. گرووپی «کووپلەند» و حکوومـەتی

ئیسرائیل هەردووکیان دەیانەویست دڵنیا بن کە لەکاتی هێرشی عێراق بۆ سەر خووزستاندا، هێزە ئێرانییەکان لەو شەڕەدا ناشکێن و هەروەها حەزیان دەکرد دڵنیا بن کە هەڵە گەورەکانی پریزیدێنت کارتەر دووپاتە نابنەوە.

بۆ یەکەمجار دیدارێک لەنێوان «میلیز کووپلەند» و ئەفسەرانی هەواڵگریی ئیسرائیلدا لە ماڵێکی گەڕەکی «جۆرج تاون» لە دەوروبەری واشینگتۆن دی سی پێکهات. ئیسرائیلییەکان ئامادە و خۆشحاڵ بوون بۆ چارەسەری قەیرانی ئێران جگە لە بەرنامەکانی کارتەر پەیڕەوی لە هەر دەستپێشخەرییەک بکەن. «دیڤید کیمچە» David Kimche، سەرۆکی «تێڤێل» Tevel، یەکەی پێوەندییەکانی دەرەوەی «مۆساد» و گەورە ئەفسەری کاربەدەستانی هەواڵگریی ئیسرائیل، لەو دیدارەدا بەشدار بوون. ئەو لە سێپتامبری ١٩٧٩وە ڕیزە عەمەلیاتێکی نهێنیی بۆ کۆمەگ بە ئێران دەست پێکردبوو و هێندێ کەلوپەلی چووکی جەنگی و کەرەسەی یەدەکیی بە ئێران فرۆشتبوون. ئەم کەلوپەلانە لە ڕێگای ئەفریقای باشوور و بەهۆی تیمە لۆژیستیکییە هەواڵگرییەکانی ئەو وڵاتەوە ناردرابوونەوە. ئەو عەمەلیاتە کاتی خۆی لە سەرۆکانی «مۆساد»، «هەواڵگریی سەربازیی ئیسرائیل» و هەروەها سەرۆکوەزیری ئەم وڵاتە شاردرابۆوە. «کیمچە» بۆ درێژەدانی بەرنامەکەی پێویستیی بە کەسێک هەبوو کە لە کاروباری هەواڵگریی پێوەندیدار بە ئێرانەوە شارەزا بێ و بتوانێ لە بارودۆخی ئەم وڵاتە ئاگاداری بکا. بۆیە، منی بۆ ئەنجامی ئەم ئەرکە هەڵبژارد و تکای لە سەرهەنگ «مایەر» سەرۆکی ئیدارەی پێوەندییەکانی دەرەوە کرد من لەسەر بوودجەی «مۆساد» دەگەڵ وی بنێرێتە واشینگتۆن. «مایەر» پێشنیارەکەی قبووڵ کرد و بۆیە من ناردرامە واشینگتۆن.

گرووپی «کووپلەند» و ئیسرائیلییەکان گەڵاڵەیەکی دووده‌میان بۆ ڕێگاچارەی قەیرانی خۆرهەلاتی نێوەڕاست ئامادە کرد. یەکیان ئەوە بوو کە بە دیپلۆماسییەکی ئازاد دەگەڵ ئێرانییەکان بکەوینە گفتوگۆوە و لەلایەکی دیکەشەوە، نەخشەیەک بۆ ئازادکردنی بارمتەکان ڕێک-بخەن و بە جێبەجێکردنی بێئەوەی گیانی بارمتە ئەمریکایی‌یەکان کە ١٤ کەسیان ئازاد کرابوون و ٥٢ کەسیان هێشتا لە تاران لە بەندا بوون، بکەوێتە مەترسییەوە، ئازادیان بکەن.

بۆ جێبەجێ‌کردنی بەشێک لەو بەرنامەیە، «ئارل بریان» Earl Brianیەکێک لە ئاشنایانی بازەرگان سەرۆکوەزیری پێشووی ئێران، لە ژانویەی ساڵی ١٩٨٠دا، دیدارێکی دەمودەستی بە بەشداریی «مەک فارلین» و بازەرگان و خۆی بۆ وتوویژ دەربارەی چارەسەری قەیرانی بارمتە ئەمریکایی‌یەکان لە تاران ڕێکخست کە باڵیۆزخانەی ئێران لە «ئۆتاوا» Ottawa سەفەری بەشدارانی کۆنفرانس بۆ تارانی ڕێکخست. هەرچەند گرووپی بازەرگان لە نۆڤامبری ١٩٧٩دا لە دەسەلات وەلا نرابوو، بەوحاڵە ئەو زۆر لە خومەینی و مەهدیی کەڕرووبی ئەندامی ئەنجومەنی بەرزی شۆڕشی ئێران کە بەرپرسی پێوەندییەکانی دەرەوەی وڵات بوو، نیزیک بوو.[٨]

بریان تاڕادەیەک شارەزای زمانی فارسی بوو. کاتێک «بریان» لە حکوومەتی «ڕۆناڵد ڕەیگان»دا لە کالیفۆرنیا، وەزیری لەش‌ساغی و خۆشگوزەرانی بوو، دەگەڵ حکوومەتی ئێران کەوتبووە گفتوگۆ و بڕیار بوو گەڵاڵەیەکی لەش‌ساغیی هەمووانیی بۆ ئامادە بکا کە هەرگیز جێبەجێ نەکرا. لە ساڵەکانی نیوەی دەیەی ١٩٧٠دا «بریان» بەردەوام سەفەری تارانی دەکرد و دەگەڵ بازەرگان ببووە ئاشنا.

---

٨-بازەرگان هێشتا لە تاران دەژیا و لە کۆمەڵگەی مەلاکاندا زۆری نفووز هەبوو. بازەرگانیان وەک ئەڵقەی پێوەندیی نێوان مەلاکانی ئێران و خۆرئاوا قبووڵ کردبوو. (مترجم فارسی)

هۆی ئەوە کە «مەک فارلین» لەو سەفەرەدا بۆ هاوڕێیەتیی «بریان» دیاری کرابوو، ئەوە بوو کە ئەو یەکێک لە هاودەستانی «جان تاوەر» سەناتۆری بەهێزی کۆمارخواز و سەرۆکی کۆمیتەی خزمەتە سوپاییەکانی سەنا بوو کە لە ڕێگای «گەیتس»ەوە پێوەندیی دەگەڵ CIA هەبوو، و هەروەها لە یەکێک لە بەربژێرەکانی سەرکۆماری لە لایەن حیزبی کۆمارخواز «جۆرج بووش»یش نیزیک بوو. ئیسرائیلییەکانیش زۆر پێیان لەسەر سەفەری ئەم دووانە بۆ ئێران دادەگرت، چونکە هەردووکیان پێوەندیی تایبەتییان دەگەڵ کۆمەڵگەی هەواڵگریی ئیسرائیل هەبوو.

پێوەندیی «بریان» و «مەک فارلین» دەگەڵ کۆمەڵگەی هەواڵگریی ئیسرائیل لە ساڵی ١٩٧٨، واتە لەو ساڵەوە کە «ڕافی ئەیتان» Rafi Eitan، ڕاوێژکاری تازەی دژی تێرۆریستیی «مەناخیم بگین»، سەرۆکوەزیری ئیسرائیل سەفەری ئەمریکای کردبوو، دەستی پێ-کردبوو. «ئەیتان» باوەڕی وابوو کە ئەمریکا زانیارییەکی زۆری لەسەر چالاکیی تێرۆریستە فەلەستینییەکان لە چوار دەوری جیهان کۆ کردۆتەوە، بەڵام نەیداوە بە ئیسرائیل. ئامانجی سەفەری ساڵی ١٩٧٨ی «ئەیتان» بۆ واشینگتۆن ئەوە بوو کە لە نێوخۆی ئەمریکا ڕایەڵکەیەک دروست بکا کە بەهۆیەوە بتوانێ ئەو زانیارییانە بەدەست بێنێ. خەرجی بەرنامەی عەمەلیاتیی «ئەیتان» لە بوودجەی ڕێکخراوی چووکەڵەی هەواڵگریی وەزارەتی بەرگری «لاکام» Lakamدابین دەبوو. «لاکام» لەڕاستیدا بە «بەشی پێوەندییە زانستییەکان»ی ڕێکخراوی هەواڵگریی سوپای ئیسرائیل حیساب دەکرا و ئەرکی کۆکردنەوە و دان و وەرگرتنی زانیاریی تەکنۆلۆژی و زانیاریی پێوەندیدار بە پیشەسازیی جەنگیی وڵاتانی دەرەوە بوو.

ئەوکاتەی «ئەیتان» سەردانی واشینگتۆنی دەکرد، بە سەناتۆر «جان تاوەر» گەورە هاوکارەکەی، «مەک فارلین» ناسێندرا. دواتر

«ئەیتان» زۆر بە «مەک فارلین»ەوە بەسترایەوە و گەیشتە ئەو ئاکامە کە ئەو بتوانێ مۆرەیەکی بەسوود بۆ ئیسرائیلییەکان بێ. پاشان «مەک فارلین»ی بانگهێشتن کردە ئیسرائیل و ئەوان پاش یەک دوو دیدار زۆر لە یەکتر نیزیک بوونەوە و دڵسۆزی یەکتر بوون. «مەک فارلین» دۆستە تازەکەی (ئەیتان)ی بە ژمارەیەک لە دۆستانی و یەک لەوان «ئارل بریان» کە پێوەندییەکی گرنگی هەواڵگریی هەبوو، ناساند.

هەموو ئەو کەسانە دەستیان بەو زانیارییانە کە «ئەیتان» بەدوایاندا دەگەڕا، ڕادەگەیشت. لەوەش بگوزەرێ ئەوانە سەر بە کۆمارخوازان بوون و کۆمارخوازانیش لەو وەختەدا بە هەموو توانایانەوە هەوڵیان دەدا بگەڕێنەوە کۆشکی سپی. ئەو کۆمەڵە بە باشی دەگەڵ ئیسرائیلییەکانی چینەکانی خوارەوە ڕێککەوتن و ساڵی ١٩٧٨، هەموو ئەو زانیارییانەی دەکەوتنە دەستی کۆمیتەی خزمەتگوزارییە سوپایی-یەکانی سەنا، بە ڕێگایەکی دیکەدا دەچوونە سەر مێزەکەی «ئەیتان».

بەپێی ئەوەی گوترا، دەتوانین تێبگەین کە بۆچی ئیسرائیلییەکان حەزیان دەکرد «مەک فارلین» و «بریان» بە یەک فرۆکەی بازرگانی لە ئورووپاوە بچنە تاران و چاویان بە بازەرگان بکەوێ. یەکەمین دیدارەکانی ئەو کەسانە لە ژانویەی ١٩٨٠دا بوونە هۆی بەسترانی ڕیزە کۆنفرانسێکی یەکجار نهێنی کە لە خەڵکی ئەمریکایان شاردنەوە، بەڵام ئەو کۆنفرانسانە شوێنەواری زۆر گرنگیان لەسەر ئەو ڕووداوانە دانا کە لە مانگەکانی دواتردا لە خۆرهەڵاتی نێوەڕاست هاتنە پێش. «مەک فارلین»، «بریان» و بازەرگان ڕێککەوتن کە لە سەرەتای مانگی مارس (ئادار)ی ١٩٨٠دا لە مادرید دیدارێک ڕێک-بخەن و باس لە قەیرانی بارمتەگیری بکەن. بڕیار درا مەهدیی کەڕرووبی و یەکێک لە هاوکارانی نزیکی «ڕۆناڵد ڕەیگان»یش کە

دواتر دەستنیشانی دەکەن بۆ بەشداری لەو دیدارەدا بانگهێشتن بکرێن.

پاش ئەوەی «بریان» و «مەک فارلین» ئێرانیان بەجێهێشت چوونە ئیسرائیل و چاویان بە «رافی ئەیتان» کەوت و ئەویان لە وردەکارییەکانی دیداری خۆیان لە تاران ئاگادار کردەوە. بەڕاستی کەمتر ڕووداوێک هەبوو کە لە تاران ڕوو بدا و ئیسرائیل لێی ئاگادار نەبێ.

چەند حەوتوو دوای یەکەم دیدار کە لە ژانویەی ساڵی ١٩٨٠دا لە تاران پێکهات، دۆستی دێرینم سەید مەهدیی کاشانی کە ئەو ڕۆژانەی لە زانکۆی تاران سەرگەرمی کاری هەواڵگری بووم دەگەڵی ببوومە ئاشنا، تەلەفونی بۆ ماڵەکەم لە ئیسرائیل کرد. ئەمن پاش ئەوەی لە تارانەوە گەڕامەوە ئیسرائیل هەمیشە دەگەڵ کاشانی لە پێوەندیدا بووم و ئەو منی لە ڕووخانی نیزیکی ڕێژیمی شا ئاگادار کردبوو. سەید مەهدیی کاشانی کوڕی «ئایەتوڵڵا سەید ئەبولقاسمی کاشانی» زۆر بە ڕاشکاوی و سادە گوتی، ئێران بۆ هێزە سوپایی-یەکانی پێویستیی بە چەکوچۆڵە هەیە.

وەڵامم دایەوە: «نازانم چەندە دەتوانم یارمەتیت بدەم. بۆخۆت دەزانی ئەمن لەوبارەیەوە دەسەڵاتێکم نیە».

«بەڵام ئەتۆ پێوەندیت دەگەڵ ئەوانە هەیە کە ئەوکارەیان لە دەست دێ. بتەوێ نەتەوێ ئەمن دێمە سەردانت، ئەمن ئێستا لە ئورووپام و بلێتێکی ئێرفرانسم بۆ ئیسرائیل ڕێزێرڤ کردوە».

«ڕاوەستە، ئەتۆ چپاسپۆرتێکت هەیە؟ خۆ دەزانی ناتوانی بە پاسپۆرتی ...».

«نیگەران مەبە، ئەمن بەڕێوەم».

ئـەو، ژمـارە فڕینەکـەی دامـێ و ئـەمنیش مەسـەلەکەم دەگـەڵ سەرۆکەکانم باس کرد. ئەوان گوتیان لە فڕۆکەخانە پێشوازیی لێ-بکەم.

لە کۆتایی مانگی فێوریەدا، کاشانی بە پاسپۆرتێکی فیلیپینییەوە گەیشتە فڕۆکەخانەی نێونەتەوەیی بن گۆریۆنی تەل ئەبیب. باوکی دۆستی نیزیکی «فێردینان مارکۆس» سەرکۆماری فیلیپین بوو و کاشانیی چووک ببووە هاونیشتمانی شانازی (فەخری)ی فیلیپین. نیزیکەی دوو ساڵ لە دوایین دیدارم لەگەڵ ئەو تێپەڕیبوو، بەڵام ئەو هەروەک جاران پیاوێکی جوانچاک و خۆشگوزەران بوو کە دەیەی سی ساڵیی تەمەنی دەگوزەراند، جلوبەرگێکی شینی ڕازاوەی دەبەردا بوو و جانتایەک و کیفێک و جێجلوبەرگێکی پێبوو. بەخێراتنم کرد و بە دابی ئێرانییان سێ جارمان یەکتر ماچ کرد. دوایە بە ترومبێل بردمە هۆتێل هیلتۆنی تەل ئەبیب.

بەیانیی ڕۆژی دواتر ئەو بۆ خواردنی نانی بەیانی هاتە ئاپارتمان (شقە)ی دایکوبابم لە «ڕامات گان». ئێمە بە زمانی فارسی پێکەوە دەدواین.

ئەو گوتی: «ئەمن هەم وەک دۆستێک هاتوومە ئێرە و هەم لە لایەن حکوومەتەکەمەوە پێمسپێردراوە بێمە وڵاتەکەتان. ئێمە بۆ فڕۆکەکانمان پێویستیمان بە ئامراز و کەلوپەلی یەدەکی هەیە و نرخەکەشیان دەدەین».

ئەمن ئەوەی پێشتر پێمگوتبوو، بۆم دووپاتە کردەوە و گوتم ئەمن بۆ بەجێهێنانی داخوازەکەی هیچ دەسەڵاتێکم نیە. بەڵام، بەڵێنم پێدا بۆ بەجێگەیاندنی ویستەکەی هەوڵی خۆم بدەم.

بەهۆی هەستێکی تایبەتی ڕەشبینی کە ئێمە و ئێرانییەکان بەرامبەر عێراق هەمانبوو، ئەمن بە باشی گرنگیی کۆمەگ بە ئێرانییەکانم دەزانی و بۆیە بێ کاتبەفیڕۆدان، سەرۆکەکانمم لە مەسەلەکە ئاگادار

کـردەوە و تەلـەفونم بـۆ دەفتـەری سـەرۆکی هەواڵپرسـیی سـوپا، سەرلەشکر «یووشوو ئاساگی» کرد و دەگەڵ سەرۆکی ستادەکەی، سـەرگورد «مۆشـێ هـەبرۆنی» Moshe Hebroniیش باسـەکەم هێنایـە گـۆڕێ. کاتێـک داواکـەی کاشـانی و وەزعـی وی لـە ئیسـڕائیلم شـی کـردەوە، «هـەبرۆنی» پێـی گـوتم کـە دەسـبەجێ بیبەمـە ڕێکخـراوی ناوەندیی ئیدارەی پێوەندییەکانی دەرەوەی هەواڵگریی سوپا.

کاشـانی لـە چاوپێکـەوتنی ژەنـڕاڵ «سـاگی»دا بـە وردی باسـی دیدارەکەی «مەک فارلین» و «بریـان» لە تارانی گێڕایەوە. بەڵام لە قسەکانیدا ئاماژەی بە بابەتێک کرد کە تـازە بوو. بـەو جۆرە کە ئـەو ئەمریکایی‌یە پایەبەرزەی قەرار بووە لـە مادرید چاوی بـە کـەڕووبی بکـەوێ و لـەبارەی بارمتـە ئـەمریکایی‌یەکانـەوە قسـەی دەگـەڵ بکـا، کاندیدی سەرپەرستی ململانەی هەڵبژاردنی سەرکۆماریی «رەیگـان»، واتە «ویلیام کەیسی» بووە.

کاشـانی گـوتی کـە گرووپـی نهێنیـی «میلـز کۆپلەنـد» دەزانـێ کـە هـەرجۆرە موعامەلەیـەک دەگـەڵ ئێرانییـەکان بکـرێ، دەبـێ ئیسـڕائیلی تێدا بێ، چونکە هـەر کەرەسـەیەکی شـەڕ بە ئێران بفرۆشـرێ، دەبێ بەهۆی لایـەنێکی سـێیەمەوە کە ئیسـڕائیلییەکانن جێبـەجێ بکـرێ. ئـەو هەروەها باسی بابەتێکی کرد کە «مـەک فـارلین» و «بریـان» دەگـەڵ «ڕافی ئەیتان» باسیان نـەکردبوو. بەومانایە کە «کەیسـی» دەیـەوێ، ڕێبەری حیزبی کرێکاری ئیسڕائیل، شیمۆن پرێز کە وا دەهاتـە بـەر چـاو ببێتـە جێ‌نشـینی «بگین»، بانگهێشـتن بکـا تـا لـەو دیدارانـەدا کـە خەریکە بۆ فرۆشتنی کەرەسـەی شـەڕ بـە ئێران ڕێکبخرێن، بەشـدار بێ و ڕێگاوشوێنی فرۆشتنی ئەو چەکانە ڕێک بخا.

ئەو خەبەرانەی کاشانی ئاشکرای کردن، زەنگی نیگـەرانیی لـە گـوێی «ساگی»دا زرینگاندەوە. ئەو دەسبەجێ تەلـەفونی بـۆ «ڕافی ئـەیتان» کرد و ئـەو بـۆ بیسـتنی خەبـەرەکانی کاشـانی هاتـە دەفتـەری ژەنـڕاڵ

«ساگی». کاشانی ئەو باسانەی پێشتر بۆ ئێمەی کردبوون دووبارە بۆ «ئەیتان»ی وەرد دانەوە و ئەمە «ئەیتان»ی بەتوندی تووڕە کرد. ئاشکرا بوو ئەگەر قەرار بایە ڕێبەری حیزبی دژبەری دەوڵەتی وەخت (بگین) لەو دیدارە نهێنییانەدا بەشدار بێ، گیروگرفتێکی بەرچاو دەهاتە پێش.

ژەنراڵ «ساگی» بە کاشانیی گوت کە داخوازەکەی بۆ کۆمەگی سەربازی بە سەرۆکوەزیر ڕادەگەیەنێ و داواشی لێکرد بۆ وەرگرتنی وەڵامی داخوازەکانی چەند ڕۆژێک لە ئیسرائیل بمێنێتەوە.

بەیانیی ڕۆژی دواتر، ئەمن بانگ کرامە دەفتەری سەرۆکی هەواڵگریی سوپا و ئاگادار بووم کە سەرۆکوەزیری ئیسرائیل ڕووی خۆشی بۆ فرۆشتنی چەکوچۆڵەی ئائەمریکایی نیشان داوە و بە باشتریشی زانیوە کە کوشندە نەبن. ئێرانییەکان بۆ فڕۆکە F-14کانیان پێویستییان بە کەلوپەلی یەدەکی هەبوو، بەڵام بڕیار درابوو کە لەجیاتی وان، تەگەر (تایە)ی فڕۆکەکانیان پێبفرۆشرێ. ئەم بڕیارە لە ڕاستیدا وەک جووڵەیەکی دۆستانە بەرەو دۆستانی ئێرانی بوو کە ئەگەر کاربەدەستانی حکوومەتی کارتەر پێیانزانیبا، زیانی لە شێواندنی پێوەندییەکانی ئەمریکا و ئیسرائیلدا لە فرۆشتنی پارچە فەننیەکان کەمتر نەدەبوو. ئێمە دەمانزانی ئەگەر ئەمریکایییەکان بەو موعامەلەیەیان زانیبایەوە، ناڕەحەت دەبن، چونکە کۆماری ئیسلامیی ئێرانیان، بە تایبەتی لە بارەی کەلوپەلی سەربازییەوە، بە تەواوی خستبووە ژێر گەمارۆ.

پاشان لە هوتێل، ئەمن توانیم موعامەلەیەک دەگەڵ کاشانی بکەم، بەوجۆرە کە ئێمە ٣٠٠ تەگەر بۆ فڕۆکەکانیان، هەریەکی بە ٩٠٠ دۆلار کە نرخێکی زۆر گران بوو و ئێمە لە هەر تەگەرێک ٤٠٠ دۆلارمان دەست دەکەوت، بەوان بفرۆشین. ئەمن بەکاشانیم گوت کە

دراوی ئەو تەگەرانە دەبێ بە نەغد و پێش تەحویلدرانیان بدرێ بە ئێمە، کاشانی گوتی: «ئێوە متمانەمان پێناکەن؟».

پێمگوت، ئەمن بۆ دانی قیمەتی ئەو تەگەرانە بەرامبەر بە کارخانەی بەرهەمهێن بوومە بەرپرس. لەپاشان دەستەکانمم بۆ لای درێژ کرد و گوتم: «ئەمن لە کوێ دەتوانم دراوی ئەو کالایانە، پێشەکی بدەم».

کاشانی، بە پێکەنینێک وەلامی دامەوە.

چەند ڕۆژ دواتر کاشانی لە حالێکدا لە جیاتی چەک توانیبووی تەگەری فرۆکە بکرێ –کە دیارە لە هیچ باشتر بوو- ئیسرائیلی بەجێهێشت. پاش چەند ڕۆژ حیسابێکی لە بانکی «وۆرمز» Wormsی ژنێڤ کردەوە و ٢٧٠ هەزار دۆلاری تێکرد. دواتر تەلەفونی بۆ کردم و گوتی: «دراوەکە لە حیسابدا ئامادەیە. تکایە پێم بلێن چ ڕۆژێک لاستیکەکانمان پێدەگەن». لەو نێوەدا ژمارە تەلەفونێکیشی دامێ کە هەروەخت پێویست بوو لە پاریس پێوەندیی پێوە بکەم.

پاش ئەوەی کاری موعامەلەکەم دەگەڵ «کارخانەی لاستیکسازیی ئالیانس» Allianceی ئیسرائیل تەواوکرد و دەستەبەری دانی قیمەتی تەگەرەکان بووم، بۆ وەرگرتنی مۆڵەتی بەڕێکردنی لاستیکەکان چوومە SIBAT، بەشی هەناردەی بەرگریی دەرەوە لە وەزارەتی بەرگری. وەرگرتنی مۆڵەتی ناردنەدەری هەناردەی بەرگری، عادەتەن کارێکی دژوار و ئالۆز بوو و پێویستیی بە تەشریفاتێکی زۆری ئیداری هەبوو. بەلام بە کۆمەگی سەرگورد «هەبرۆنی» ئەم کارە بە ئاسانی جێبەجێ بوو.

ئەمن توانیم مۆڵەتێکی سپی بۆ هەناردەکردنی ٣٠٠ تەگەری بێ-مارک وەربگرم. دوایە چوومە کارخانەکە. کاربەدەستانی کارخانە گوتیان، لابردنی مارکی لاستیکەکان پێویستیی بە کات هەیە و بۆیە ناتوانن دەسبەجێ تەحویلیان بدەن. ئەمن پێشنیارم کرد مارکەکە بە گەرمکردن لابەرن.

سێ ڕۆژ دواتر، دوو سندووقی دار کە لاستیکەکانیان تێدا بوو و مارکی «باری دیپلۆماتیک»یان لێدرابوو، بە فڕۆکەی «ئێل عال» لە ئیسرائیلەوە ناردرانە ئوتریش. لە ئوتریش ئیشکەرانی باڵیۆزخانەی ئیسرائیل لە فڕۆکەخانە، مارکی دیپلۆماتیکیان لەسەر سندووقەکان سڕیەوە و دوایە لە شوێنی باری «ئێل عال» لە فڕۆکەخانەڕا بردیاننە شوێنی «ئیران ئێر» و دایانن بە کارمەندانی ئێرانی. لەو کاتەدا ئەمن بە فڕۆکە چوومە ژنێڤ و لەو ٢٧٠ هەزار دۆلارە کە کاشانی لە حیسابی بانکیی کردبوو، چەکێکی ١٥٠ هەزار دۆلاریم بە ناوی «کارخانەی لاستیکسازیی ئالیانس» لە ئیسرائیل ڕاکێشا. چەکێکی ١٤هەزار دۆلاریم بە ناوی «ئێل عال» بۆ هاتوچۆ و بیمە ڕاکێشا و چەکێکی سێیەمیشم بە ١٠٦ هەزار دۆلاری نەغد ڕاکێشا و کاتی هاتنەوە بۆ ئیسرائیل، بردم لەسەر مێزی سەرۆکی هەواڵگریی سوپام دانا و گوتم: «ئەمە قازانجی ئێمە.لە فرۆشتنی تەگەرەکانە».

ژەنراڵ «ساگی» پێکەنی و گوتی: «بەڕاستی سەودایەکی پڕسوود بوو».

ئەو سەودایە، یەکەمین هەنگاو بوو کە بۆ دابینکردنی زێدە بوودجەیەک بۆ کۆمەڵگەی هەواڵگریی لیکوود هەڵێنرایەوە[٩].

ئەو سوودەی لە فرۆشتنی تەگەرە فڕۆکەکان بە ئێران دەست کەوت، بەڕاستی بوو بە بناخەی سەرمایەیەکی زۆر کە دواتر گەیشتە سەدان ملیۆن دۆلار و لە خەڵک شاردرایەوە. شاردنەوەی سەرمایەیەکی وا زۆر، لە مێژووی عەمەلیاتی نهێنی و ژێر زەمینیی جیهاندا بێوێنە بووە.

دیار نەبوو چۆن حکوومەتی کارتەر لەو موعامەلەیە ئاگادار بوو. بۆیە ڕۆژی ٢٧ی ئاوریل، کارتەر تەلەفونی بۆ مەناخیم بگین

---

[٩](چونکە بە سەودایەکانی دواتر، ئەو بوودجەیە زیاد دەکا و دەگاتە سەدان هەزار دۆلار و لەڕاستیدا حکوومەتێکی ئازاد لەنێو دەوڵەتی ئیسرائیلدا دروست دەکا، بۆیە لەمەودوا ئەم بوودجەیە پێیدەگوترێ سەرمایەی ڕەش. مترجم فارسی).

سەرۆکوەزیری ئیسرائیل کرد و بەمجۆرە گلەیی لێکرد: « داخۆ دروستە لەحاڵێکدا دیپلۆمات و هاونیشتمانانی ئەمریکا لە ئێران بە بارمتە گیراون، ئێوە کەرەسەی شەڕ بەو وڵاتە بفرۆشن؟».

«بگین»، لە وەڵامی پرسیارەکەی کارتەردا هیچی نەگوت کە نارەحەتی بکا. بە دڵنیایی ئەگەر کارتەر زانیبای لەنێوان ئێرانییەکان، ئیسرائیلی و ئەمریکاییەکاندا وتووێژێک بۆ ئازادیی بارمتەکان لە گۆڕێدایە، لە خەفەتان وەزگی دەدا. پریزیدێنت کارتەر، لەو کاتەدا دەبوو بە هەر بابەتێک کە پێوەندیی بە ئێران و بارمتە ئەمریکایی-یەکانەوە هەبێ، لەسەر هەست بووبێ. ئەم بابەتە تەنیا چەند ڕۆژ دوای شکستی تراژیکی عەمەلیاتی نەجاتی نیزامیی ئەمریکا بۆ ئازادکردنی بارمتەکان کە ناوی نرابوو «عەمەلیاتی چنگوڕکی هەڵۆ»، ڕووی دابوو.

شەوی ٢٤ی ئاوریلی ساڵی ١٩٨٠، چوار فڕۆکەی C-130 کۆمەڵێکی پتر لە سەد کەسیان بە فەرماندەریی سەرهەنگ «چارلز بێکویت» Charles Beckwith بردە شوێنێکی بیابانیی ئێران کە ناویان نابوو «بیابانی یەک». ئەو کۆمەڵە قەرار بوو بگوازرێنەوە بۆ ٨ هێلیکۆپتەری هێزی دەریایی کە لە ڕێگایەکی دیکەوە دەگەیشتنە وێ. بەپێی ئەو بەرنامەیەی دانرابوو قەرار بوو هێلیکۆپتەرەکان لە «بیابانی یەک» سووتەمەنی وەرگرن و کۆماندۆکان بەرنە شوێنێک لە ٥٠ مایلیی تاران کە ناویان نابوو «بیابانی دوو». قەرار بوو کۆماندۆکان لەوێڕا بە کامیۆن بچنە ناوەندی شاری تاران و بارمتەکان ئازاد بکەن.

بەرنامەی ناوبراو لە «بیابانی یەک» تووشی شکست هات. یەکێک لە هێلیکۆپتەرەکان پێش دەستپێکردنی بەرنامەکە لەکار کەوت، دووی دیکەیان لە باهۆزی لمدا گیریان کرد و چوارەمیش بەتوندی دەگەڵ فڕۆکەیەکی C-130 لێکیان دا. بەوپێیە عەمەلیاتی نەجات پێش دەست-پێکردن شکستی هێنا. پرسیارێک کە دەمایەوە ئەوە بوو کە داخۆ چ-

کەسێک لەنێو حکوومەتی کارتەردا ئەو بەرنامەیەی بۆ ئابڕووبردنی ئەو دارشتبێ. سەرنجڕاکێش ئەوەیە کە «ئۆلیڤێر نۆرت» Oliver North و «جان سینگلاب» John Singaaub یش کە دواتر لە سەردەمی حکوومەتی «ڕەیگان»دا لە ڕووداوی ئابڕووبەری ئێران کۆنتراوە گلان، لە ئەندامانی عەمەلیاتی ناسەرکەوتووی ناوبراو بوون.

ئاوریلی سالّی ١٩٨٠ دوو جاری دیکەش هەوڵ درا بۆ ئازادیی بارمتە ئەمریکاییەکان، هێندێ وتوویژ بکرێن. «یاسر عەرەفات» ڕێبەری PLO کە ئەودەم لایەنی سووریەی گرتبوو، بۆ ڕاکێشانی سەرنجی کارتەر چووە ئێران تا لەبارەی بارمتەکانەوە قسە دەگەڵ خومەینی بکا. بەلام ئێرانییەکان بێحورمەتییان پێکرد. هەر لەو سەروبەندەدا، وەزیری دەرەوەی ئەلجەزایر، «عەبدولعەزیز بووتەفلیقە» کە بە دیپلۆماتێکی بەتوانا دەناسرا، چاوی بە گرووپێک لە ڕێبەرانی ئێران و یەک لەوان. خومەینی کەوت و لەبارەی ئازادیی بارمتەکانەوە قسەی لەگەڵ کردن. بەلام چونکە نەیتوانی دەستەبەری فرۆشتنی چەک بە ئێرانییەکان بێ مەئموورییەتەکەی تووشی شکست بوو.

لەو بگرەوبەردەیەدا، مانگی مارس، یەکەمین دیداری نێوان مەهدیی کەڕرووبی، ئەندامی ئەنجومەنی بەرزی شۆڕشی ئێران و «ویلیام کەیسی» هاوکاری ڕەیگان لە هۆتێل «ریتز» Ritzی مادرید پێکهات. لەم دیدارەدا جگە لە مەهدیی کەڕرووبی لەلایەن ئێرانەوە، دۆستەکەی من کاشانی و یەکێک لە ئیشکەرانی وەزارەتی بەرگریی ئێران بە ناوی دوکتۆر ئۆمشی Omshei و لەلایەن ئەمریکاشەوە جگە لە «ویلیام کەیسی» دوو کەسی دیکە بەشدار بوون. یەکێک لەوان «مەک فارلین» و ئەوی دیکەش کەسایەتییەکی سەرسوڕهێن، واتە «دۆناڵد گرێگ» Donald Gregg بوو کە لە ئەنجومەنی ئەمنیەتی نیشتمانی، لەژێر چاوەدێریی «برژنیسکی»دا کاری دەکرد. ئەمن لەوە کە «کەیسی» لەو دیدارەدا هاودەستێکی کارتەری دەگەڵ بوو، سەرم

سـورِ مـا. بـەڵام قسـەیەک کـە کاشـانی لـەبارەی بـوونی یـەکێک لـە هاودەسـتەکانی کارتـەرەوە بـە منـی گوتبـوو، دەگـەڵ زانیارییـەک کـە «مـەک فـارلین» لـەو بارەیـەوە دابـووی بـە ئێمـە ڕێـک دەهاتـەوە و پاشانیش درا بە «ڕافی ئەیتان».

«مەک فارلین» هەروەها ڕاپۆرتی دا کە «کەیسی» بە جودا چاوی بە «شیمۆن پریز» ڕێبەری حیزبی دژبەر کەوتوە و باسـی ئەوەی بۆ کردوە کە حەز دەکا کەرەسـەی شـەڕ بدرێ بە ئێران. کاشـانی گوتی «شیمۆن پریز» بە جیا چاوی بە مەهدیی کەڕرووبییش کەوتوە. هۆی ئەوە کە ئـەمریکایی‌یـەکان پێیـان لەسـەر ئـەوە دادەگرت کـە «پریـز» چاوی بە کەڕروبی بکەوێ ئەوە بوو کە باوەڕیـان وابـوو هاوپـەیمانیی لیکـــوود خـــەریکی هەڵوەرینـــە و هـــەر دەمەســـاتێک وێ دەچـــێ هـــەڵبژاردنێکی تـــازە لـــە ئیســـڕائیل بکـــرێ. «پریـــز» هـــەوڵی دابـــوو دیـدارەکانی دەگـەڵ ئێرانییـەکان و ئـەمریکایی‌یـەکان لـەژێر پـەردەی چاوپێکـەوتنێکی دۆسـتانە دەگـەڵ «ئـادۆلفۆ سـوارێز» Adolfo Suarez سەرۆکوەزیری ئیسپانیادا ئەنجام بدا و بەو جۆرە بیان‌شارێتەوە.

هـەروەک «مـەک فـارلین» ڕاپـۆرتی دابـوو بـە «ئـەیتان»، یەکـەمین دیـداری مادریـد بـەو مەبەسـتە کرابـوو کـە لـەبارەی پێوەندییـەکانی دواڕۆژی ئـەمریکا و ئێرانـەوە لێکدانـەوەی پێویسـت بکـرێ و بابـەتی نـاردنی کەرەسـەی شـەڕ بـۆ ئێـران لـە بەرامبـەر هێرشـی نیزیـک بـە ئەنجامی عێراق بۆ سـەر ئـەو وڵاتـەدا بکەوێتـە بـەر بـاس و گفتوگۆ. هـەروەها لـەم دیـدارەدا لـە بـارەی ئـازادکردنی دراوەکـانی ئێـران لـە بانکەکانی ئەمریکا و گوشاری حکوومـەتی ئێران بـۆ سـەر خوێندکارە ڕادیکاڵەکان بۆ ئازادکردنی بارمتە ئەمریکایی‌یەکانەوە، باس و گفتوگۆ کرابوو. لەم دیدارەدا بەڕاشـکاوی قـەرار وابـوو ئێران کـاری پێویسـت بۆ ئاسـایی‌کردنـەوەی پـەیوەندییـەکانی دەگـەڵ ئـەمریکا ئـەنجام بـدا و هـەنگاوی پێویسـت لـەو بارەیـە بهـاوێژێ. کـەڕرووبی لـەبارەی ئـەم بابەتـەوە بـە جیـددی گوتبـووی کـە ئێـران بـۆی نـاکرێ پێوەندییـەکانی

دەگەڵ حکوومەتی کارتەر ئاسایی بکاتەوە و لیشی زیاد کردبوو کە ئەو و ئەنجومەنی بەرزی شۆرش زۆر خۆشحاڵ دەبن کە ئاسایی-بوونەوەی پێوەندییەکانی ئێران دەگەڵ ئەمریکا بە ئارامی، لەکاتێکدا ڕوو بدا کە کۆمارخوازەکان دێنە سەر کار.

بەشدارانی دیداری مادرید، ڕێک کەوتبوون کە دیدارێکی دیکەش لە مانگی مەی (ئەیار)دا ئەنجام بدرێ. لە کاتی بەرپابوونی دیداری دووەمدا، ئێرانییەکان داخوازەکانی پێشوویان دووپاتە کردنەوە و پێیان چەقاند کە سوپاکەیان بە هۆی هەڕەشەکانی عێراقەوە، پێویستیی هەنووکەیی بە کەرەسەی شەڕ هەیە و بۆ ئەنجامدانی ئەوکارە ئەوان ئامادەن دەگەڵ هەرکام لە کاربەدەستانی حکوومەتی کارتەر کە بتوانێ ئەوان لە ئەنجامدانی موعامەلە بۆ فرۆشتنی کەرەسەی شەڕ دڵنیا بکا، دەسبەجێ بکەونە وتوویژەوە.

کاتێک بگین، سەرۆکوەزیری ئیسرائیل، لە دیداری نهێنیی «پرێز» دەگەڵ کەرڕووبی لە مادرید ئاگادار بوو، بە توندی هەڵچوو و «پرێز»ی بانگ کردە دەفتەری خۆی و هۆشداری پێدا کە ئەگەر ئەو لەمەودوا بەبێ ئاگاداریی حکوومەتی ئیسرائیل لەو کارانە بکا، کارەکەی بە خەیانەت دەژمێردرێ و ئەو دەبێ باجی کارێکی وا هەرچی هەبێ، بدا.

بەم جۆرە بڕیار درا ڕیزە دیدارێکی نهێنی لە نێوان کاربەدەستانی «سەرکێش»ی CIA و کۆمارخوازەکان لەلایەک و ئێرانییەکان لەلای دیکەدا بەڕێوە بچێ و هەرچەند ئیسرائیلییەکان لەو دیدارانەدا بەشدار نابن، بەو حاڵە نێوەرۆکی باسەکانی ئەو دیدارانە بە ئاگاداریی وان بگا. بەڵام سەرکۆماری ئەمریکا و دیارە خەڵکی ئەمریکاش دەخرێنە تاریکایی و بێئاگایی تەواوەوە.

خوسـرەوی فەخریـە، قـومێکی لـەو پەرداخـە بیرەیـەی بەدەسـتیەوە بـوو، خـواردەوە و بـە مۆرەمـۆرە چـاوی لـێکـردم. ئـەو پیـاوێکی کورتـــەباڵا و خەپەتۆڵــە بــوو و ئەملاوئــەولای دوگمــەکانی ئـــەوی قەڵەوتریش نیشان دەدا.

ئەو گوتی: «جـەنابی بن مۆناشـێ، ئـەمن زۆر جیددی قسـە دەکـەم. ئێمە دەمانەوێ دەگەڵ ئـەمریکاییـەکان موعامەلە بکـەین، بـەڵام نـەک ئـەو ئەمریکاییانــە کـە ئێسـتا دەسـەڵاتیان بەدەسـتەوەیە. ئێمــە بــۆ بەڕێوەبردنی ئەم بەرنامەیە پشت بە ئیسرائیل دەبەستین».

یەکـەمین ڕۆژەکـانی مـانگی مـەی (ئـەیار)ی ١٩٨٠ بـوون و یەکـەمین دیدارە نهێنییەکانی نێوان «کەیسی» و کەڕرووبی دوو مانگ پێشتر لە مادریـد پێـک هـاتبوون. بـەڵام، تـاران پێـیخـۆش بـوو ئیسـرائیلیش دە مەسەلەکەوە گلێنێ تا دڵنیا بێ کە کارەکە بە باشی و بێهەڵـە دەچێتـە پێش.

ئـەمن بـە فڕۆکـە چوومـە ڤییـەن تـا چـاوم بـە فەخریـە، یـەکێک لـە هاوکارانی ئایەتوڵڵا هاشمی ئەندامی ئەنجومـەنی بـەرزی شـۆڕش (کـە چەنـد سـاڵ دواتـر تیـرۆر کـرا)، بکـەوێ. ئـەمن ئـەو سـەفەرەم بـە دەسـتووری سـەرۆکی ڕێکخـراوی هـەواڵگریی سـوپا کـرد. ئـەو داوای لێکردبووم، پێوەنـدیم دەگـەڵ دۆسـتە ئێرانییەکانم بپارێزم. لەحاڵێکدا دۆستی لەمێژینـەم، سـەید مەهـدیی کاشانییشـم لەگـەڵ بـوو، گەیشـتمە هۆتێل هیلتۆن. فەخریـەش هـەر لـەوێ بـوو. ئێمـە لـە ژوورەکـەی ئـەو چاومـان بـە یـەکتر کـەوت. فـەخریـە بـەدەم قسـەکردنەوە، هـەورێکی ئەستووری دووکەڵی سیگاری لەسەر ڕاوەستابوو.

ئەو گوتی: «جەنابی بن مۆناشـێ، ئـەمن بە ڕاشکاویت قسـە دەگـەڵ دەکەم. ئێمە دەمانـەوێ خۆمـان لـە هەڕەشـەی ئـەو کابرا مونافیقە کـە دەسـتنێژی خۆرئاوایـە، ڕزگـار بکـەین -دیـارە مەبەسـتی سـەددام حوسێن بوو- بەڵام، نامانەوێ پێوەندییەکمان دەگەڵ کارتەر هەبێ».

بە ئاسانی دەکرا نائومێدی لە قسەکانیدا هەست پێبکەی،هەروا کە گوێم بۆ قسەکانی گرتبوو، دیتم سیگاری دواتریشی گەیشتە بنی.

گوتم: «لێرەدا گیروگرفتێک هەیە کە ناکرێ لەبەر چاو نەگیرێ. کارتەر ئێستا سەرکۆماری ئەمریکایە و تەنیا سەرکۆمارە کە خاوەنی دەسەلاتی قانوونییە - دووپاتی دەکەمەوە کە خاوەنی دەسەلاتی قانوونییە- کە دەگەڵ ئێوە بکەوێتە وتووێژەوە».

فەخریە، بە ئارامی پێکەنی و گوتی: «پێویست نیە ئێوە ئەوەندە پارێز بکەن. هەروەک ئێوەش دەزانن، بۆ ئێمە بەتەواوی ڕوونە گیروگرفتێک کە ئێران بۆی دروست کردوە دەبێتە هۆی ئەوە کە ئەو هەڵبژاردنی کۆتایی ئەمساڵ بدۆڕێنێ. بە لەبەرچاوبوونی ئەم ڕاستییە ئێمە دەمانەوێ دەگەڵ کۆمارخوازەکان و CIA بکەوینە موعامەلەیەکی نهێنییەوە.

لە حاڵێکدا دەمزانی، ئەوەی ئەو پێی‌گوتم، بەڕاستی ڕەوت و سیاسەتی ڕەسمیی ئێرانە، داوام لێکرد، ئامانجی بنەڕەتی لەوەی گوتی، بە ئاشکرا باس بکا.

«ئەمریکا پیاوەکانی خۆی [بارمتەکان] وەردەگرێتەوە، دراوی ئێمە لە بانکەکانی ئەمریکا ئازاد دەکرێ و ئێمەش کەرەسەی پێویستی شەڕ لە ئیسرائیل وەردەگرین، و هەمووی ئەمانەش بە مۆری ئاغا ئەمریکایی‌یەکانی ئێوە ئەنجام دەدرێن. هەرچەند ئەمریکایی‌یەکان عادەتەن بۆ متمانە نابن، بەلام بۆ ئەو موعامەلەیە، ئێمە دەمانەوێ متمانەیان پێبکەین».

فەخریە ئاشکرای کرد کە لە دیداری دواتردا کە کۆتایی مانگی مەی لە مادرید پێکدێ، کەڕووبی دووبارە چاوی بە «کەیسی» دەکەوێ. دیارە لەو دیدارەدا پیاوێکی دیکەش کە نوێنەری دووەمین کاندیدی سەرکۆماریی ئەمریکا «جۆرج بووش»ە، بەشدار دەبێ. ئەو کەسە «ڕابێرت گەیتس»ە.

«گەیتس» چەند جار بۆ بەشداری لەو دیدارانەدا کە بابەتی هەواڵگرییان تێدا ئاڵوگۆڕ دەکرا، سەفەری تەل ئەبیبی کردبوو. ئەو یەکێک لە ئیشکەرانی ڕەسمیی CIA بوو کە هێندێ جاریش کاری بۆ ئەنجومەنی ئەمنیەتی نیشتمانی دەکرد. ئەو کاتەی «جۆرج بووش» سەرۆکی CIA بوو، ئەو ببوو بە یەکێک لە هاوکارە نزیکەکانی. کەمێک پێش شۆرشی ئێران «گەیتس» چەندین جار چووبووە ئیسرائیل تا پێوەندی دەگەڵ کاربەدەستانی کۆمەڵگەی هەواڵگریی ئیسرائیل بگرێ و لەبارەی بارودۆخی ناسەقامگیری ئێرانەوە قسەیان لەگەڵ بکا. ئەمن چەندین جار ئەو و هاوکارەکانیم لە حاڵ و وەزعی ئێران ئاگادار کردبوو. ئەمن دوای پێوەندی دەگەڵ ئەو بە زوویی تێگەیشتم کە هەرچەند ئەو وەک لێکۆڵەری بارودۆخی سۆڤیەت بە ناوبانگ بوو، بەلام وەک ئەوە نەدەچوو کە لەبارەی یەکیەتیی سۆڤیەتەوە زانیارییەکی زۆری هەبێ و واش دەهاتە بەر چاو کە بۆخۆشی ئۆگریی بەم کارە نەبێ. کاربەدەستانی هەواڵگریی ئیسرائیل بۆیان دەرکەوتبوو کە ئەو دەگەڵ «ئاریەل شارۆن» Ariel Sharon، «مایک هەراری» Harari Mike و بۆ فرۆشتنی کەرەسەی شەڕ بە وڵاتانی ئەمریکای ناوەندی ڕیزە پێوەندییەکی دامەزراندوە.

لە دیداری دووەمدا کە کۆتایی مانگی مەی لە مادرید پێکهات «ڕابێرت گەیتس» ڕۆڵگێڕێکی تازە بوو. ئەم دیدارەش هەروەک دیدارەکەی پێشوو لە هۆتێل «ریتز» بەڕێوە چوو. بەشدارانی ئەمریکایی لەو دیدارەدا بێجگە لە «گەیتس» بریتی بوون لە: «ویلیام کەیسی»، «ڕابێرت مەک فارلین» و «ئارل بریان». نوێنەرانی ئێرانیش کە لەو دیدارەدا بەشدار بوون بریتی بوون لە: مەهدیی کەڕرووبی، سەید مەهدیی کاشانی، ئەحمەدی ئۆمشی، و ئەمجارە کەسێکی دیکەش لە گرووپی ئێرانییەکان زیاد ببوو، ئەویش هەر ئەو خوسرەوی فەخریەیە بوو کە ئەمن لە ڤییەن دیتبووم. لەو کاتەدا

سروشتی کەسیی بەشدارانی ئەمریکایی کۆنفرانس ڕوونتر ببوو. «کەیسی» وەک نوێنەری «ڕەیگان» بەشداری کۆنفرانس بوو، لەحاڵێکدا «گەیتس» هەرچەند بەڕەسمی یارمەتیدەری سەرۆکی CIA «ستنسفیلد تێرنێر» بوو کە لە لایەن کارتەرەوە دانرابوو، بەڵام لەڕاستیدا بە نوێنەرایەتیی «جۆرج بووش» لەو کۆنفرانسەدا بەشدار ببوو.

ئەم دیدارە هیچ ئیسرائیلییەکی تێدا نەبوو. هەرچەند ئیسرائیل بڕیاری دابوو قامک لەسەر لێدانی دڵی ئەو کردەوە و دژکردەوانە هەڵنەگرێ، بەڵام نەیدەویست بە ئاشکرایی لەو ڕووداوانەدا دیار بێ. یەکێک لە هۆکارە گرنگەکانی ئەم کارە تەلەفونی پڕتووڕەیی کارتەر بۆ بگین پاش فرۆشتنی تەگەرە فڕۆکەکان بە ئێران بوو. لەلایەکی دیکەوە بگین دەترسا ئەگەر کۆنگرەی ئەمریکا بە بەشداریی ئیسرائیلییەکان لە دیداری ئێرانییەکان و ئەو ئەمریکایی‌یانە کە سەربە حکوومەتی ڕەسمیی ئەمریکا نەبوون، بزانێ، وا لێکبدرێتەوە کە ئیسرائیل لە هەوڵی لەسەرکارلابردنی حکوومەتی قانوونیی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادایە.

وەک ڕابردوو، ئیسرائیلییەکان لەبارەی دیداری دووەمەوە زانیاریی پێویستیان لە کاشانی، «مەک فارلین» و «بریان» وەرگرت. لەم دیدارەدا بەوجۆرەی کاشانی ئاگاداری کردم، بڕیار درا کۆمارخوازەکان بەڵێن بدەن پاش بەدەستەوەگرتنی دەسەڵات لە ژانویەی ساڵی ۱۹۸۰دا [۱۹۸۱ وەرگێڕ]، دراوە ڕاگیراوەکانی ئێران لە بانکەکانی ئەمریکادا ئازاد بکەن و ئیسرائیلییەکانیش لەسەر فرۆشتنی کەرەسەی شەڕ نەکەونە بەر سەرکۆنەی کۆمارخوازان یان کۆنگرە و لەبەرامبەردا ئێرانییەکان، دەسبەجێ بارمتە ئەمریکایی‌یەکان ئازاد بکەن.

کاشانی گوتی: «ئاری، پێت خۆشە ڕاستییەکت پێ بڵێم؟ ئەم ئەمریکایی یانە نایانەوێ بارمتەکانیان ئازاد بکرێن، ئەوان ئێستا پێشنیارێکی دیکەیان خستۆتە ڕوو، بەوجۆرە کە ئەندامێکی زۆر پایەبەرزی حکوومەتی دادێی ئەمریکا چاوی بە حوججەتولئیسلام کەڕرووبی بکەوێ و لەبارەی وردەکارییەکانی موعامەلە دەگەڵ ئێرانەوە بڕیار بدا. گومانی تێدا نیە کە ئەمانە دەیانەوێ یاری بە کات بکەن».

هۆی ئەوەی کاشانی بە منی گوت، ئاشکرا بوو. ئەگەر بارمتە ئەمریکایی یەکان دەسبەجێ ئازاد کرابان، بە سوودی کارتەر کە هێشتا سەرکۆمار بوو، تەواو دەبوو. ئێمە خەبەرمان زانی کە برایانی هاشمییش هەر لەوکاتەدا لەلایەن حکوومەتی کارتەرەوە پێوەندییان بە کاربەدەستانی ئێرانەوە کردبوو. بەڵام، ئاشکرا بوو کە چونکە ئەوان نەیان دەتوانی لەلایەن ئیسرائیلییەکانەوە بەڵێنی فرۆشتنی کەرەسەی شەڕ بە ئێرانییەکان بدەن، قسەکەیان بڕی نەدەکرد.

کاشانی پێی سەیر بوو کە: «بۆچی ئەمریکایی یەکان بە ئاشکرا ناڵێن کە نایانەوێ بەرلە ژانویە بارمتەکانیان ئازاد بکرێن».

بەوپێیە، ئێمە لە سەرەتای ساڵی ١٩٨٠وە دەمانزانی کە ئێرانییەکان ئامادە بوون گفتوگۆیەکی جیددی لەبارەی ئازادکردنی بارمتەکانەوە بکەن. هەروەخت ئەوان توانیبایان لە ڕێگای ئیسرائیلەوە کەرەسەی ئەمریکایی شەڕ وەربگرن، بارمتە ئەمریکایی یەکان ئازاد دەکران. ڕاستە کە ئەوان حەزیان نەدەکرد ڕاستەوخۆ موعامەلە دەگەڵ کارتەر بکەن، بەڵام ئامادە بوون ئەم کارە لە لایەن CIA و بەهۆی ئەوەوە جێبەجێ ببێ. بە هەرحاڵ، کاشانی و من گومانمان نەبوو کە کۆمارخوازان و یارانی نارەسمیی ئەوان CIA دەیانەویست کارتەر لە تاریکایی و بێئاگاییدا ڕابگرن و بە جۆرێک کە قازانجی ئەوانی تێدا بێ درێژە بەگفتوگۆ دەگەڵ ئێرانییەکان بدەن.

دەنگوباسی هەواڵگری کە هەمیشە دەگەیشتە ئیسرائیل، نیشاندەری جێگیربوونی هێزە عێراقییەکان لە سنووری خۆرهەڵاتی عێراق دەگەڵ ئێران بوو. ئەگەرچی سۆڤیەتییەکان، کەرەسەی شەڕیان دەدا بە عێراق، بەڵام مۆسکۆ ئەوەندە لە ئەنجامدانی ئەوکارە دوودڵ بوو کە هەمیشە بەهۆی نوێنەری نیوەڕەسمیی KGB لە ئیسرائیل، واتە «کلیسای ئۆرتۆدۆکسی پیپاڵ ناسیۆ»[10] هەوڵی دەدا لە بارودۆخی ئێران ئاگادار بێ. لە ساڵی ١٩٦٧ەوە کە پێوەندیی نێوان ئیسرائیل و سۆڤیەت پچڕابوو، سۆڤیەت لە ڕێگای کەسانێکەوە کە پێوەندییان دەگەڵ KGB هەبوو، پێوەندیی بە ڕێکخراوە هەواڵگرییەکانی ئیسرائیلەوە دەگرت. لەم کاتەدا پاراستنی قازانجەکانی سۆڤیەت لە ئەستۆی باڵیۆزخانەی فینلاند بوو. بەهەرحاڵ، ئەو پرسیارانەی سۆڤیەت لەبارەی بارودۆخی ئێرانەوە لە کاربەدەستە هەواڵگرییەکانی ئیسرائیلی دەکردن، بێوەڵام دەمانەوە، چونکە لەوانە بوو سۆڤیەت ئەو زانیارییانەی لە ئیسرائیلییەکانی وەردەگرت بدا بە عێراق و ئیسرائیلیش ئەوەی نەدەویست.

کاتێک دەنگی تەپڵی شەڕی نێوان عێراق و ئێران، لە ئورووپا بیسترا، گرووپەکانی دژ بە حکوومەتی کۆماری ئیسلامی لە دەرەوەی ئێران تینیان بۆ ئەمریکا هێنا کە داوا لە ئیسرائیل بکا بۆ وەڕێخستنی کودەتایەک لە ئێران یارمەتییان بدا، بەڵام، حکوومەتی ئیسرائیل کە لەو کاتەدا پێی وابوو قازانجی ئیسرائیل لەوەدایە کە ئەم وڵاتە ڕێژیمی خومەینی لە دەسەڵاتدا بیلێتەوە، وەڵامی داخوازەکەی ئەمریکای نەدایەوە.

لە نیوەی مانگی ژووئیەی ساڵی ١٩٨٠دا، دەوری دوو حەوتوو دوای ئەوەی «ڕەیگان» و «بووش» بوونە کاندیدای سەرۆکایەتی و

---

[10] کلیسای ئۆرتۆدۆکسی ڕووسی بۆخۆی پاپی هەبوو و نوێنەری ڕەسمیی ئەو لە ئورشەلیم ناوی Russian Orthodox Papal بوو.

جێگری سەرۆکایەتیی ئەمریکا، سێیەمین دیداری مادرید ڕێکخرا. لەو ماوەیەدا هێندێ دیداری دیکەش لە نێوان برایانی هاشمی -کە لەلایەن حکوومەتی کارتەرەوە کرابوونە نوێنەر بۆ گفتوگۆ دەربارەی ئازادکردنی بارمتەکان- و ئێراندا ڕێکخران. لەو دیدارانەشدا داخوازەکانی پێشوو، دەگەڵ پێوەندییەکانی ئێران و ئەمریکا لە حکوومەتی ڕەیگان - بووشدا کەوتنە بەر باس و گفتوگۆ. ئەگەر لە دیدارەکانی پێشوودا، ئەمریکایی‌یەکان بە ئاشکرا نەزەری خۆیان دەرنەدەبڕی، ئەمجارە ئیدی لێک ئاشکرا ببوون و کارتەکانی یاری لەسەر مێز دانرابوون: ئەمریکایی‌یەکان بە هیچ جۆر پێش ٢٠ی ژانویەی ١٩٨١ ئامادە نەبوون لەبارەی بارمتەکانەوە دەگەڵ ئێران بکەونە وتوویژ. ئەوان هەروەها گوتیان بە پێچەوانەی داخوازی تاران، هەتا کۆمارخوازەکان لە ئەمریکا دەسەلات بەدەستەوە نەگرن، ڕێگا نادەن ئیسرائیل کەلوپەلی شەڕ بە ئێران بفرۆشێ.

کاشانی لە تەلەفونێکدا کە لە ئورووپاوە بۆی کردم گوتی: «ڕاستە ئەو خەڵکە دەیانەوێ خۆشەویستیی خۆیان لەنێو خەڵکی ئەمریکادا بپارێزن، ئەدی بۆ ڕازی نابن زیندانییەکانیان هەتا دوای هەڵبژاردنەکانی نۆڤامبر ئازاد بکرێن؟».

گوتم: «ئەمن وەڵامێکم بۆ ئەو پرسیارە نیە. بۆچی ئەم پرسیارانە لە دۆستە ئەمریکایی‌یەکانت ناکەی؟» بەڵام بەڕاستی وەڵامی پرسیاری کاشانی، ڕوون بوو. کۆمارخوازەکان دەیانەویست ئەوەندە سەبر بگرن هەتا هەموو شانازییەکانی ئازادبوونی بارمتەکان دەچێتە حیسابی خۆیانەوە.

سەرەتای مانگی ئووت، دەستووری کارێکی سەیروسەمەرە کە نیشانەی پێویستییەکانی ڕۆژ بوو لە دەفتەری سەرۆکوەزیری ئیسرائیلەوە بە ڕێکخراوی هەواڵگریی سوپای ئەم وڵاتە ڕاگەیەندرا. بەپێی ئەم دەستووری کارە کە لەلایەن ژەنراڵ «ساگی»یەوە لە

کۆبوونەوەیەکدا کە بە فەرمانی ئەو ڕێکخرابوو، بۆ من و هەموو کارمەندانی هەواڵگریی ئیسرائیل خوێندرایەوە، کابینەی ئیسرائیل بڕیاری دابوو لەسەر بناخەی پێویستییەکانی ڕۆژ، هێزە ئەمنیەتی و سەربازییەکانی ئیسرائیل هاوکاریی پێویست دەگەڵ ئەو دەستەیە لە پیاوانی ئەمریکا بکەن کە ئەندامی حکوومەتی ئێستا یان سەر بە لایەنگرانی ئەو حکوومەتە نەبوون. بە شێوەیەکی دیکە بڵێین، سەرۆکوەزیری ئیسرائیل بە دەرکردنی ئەو دەستووری کارە ڕێگای بە ڕایەڵکەی هەواڵگریی ئیسرائیل دەدا دەگەڵ کارمەندانی کۆمارخوازی ئەمریکایی هاوکاری بکەن.

ئێستا کە دەستووری کاری سەرۆکوەزیری ئیسرائیل کە وەزارەتی بەرگریی ئەم وڵاتەشی بەدەستەوە بوو، کۆسپی سەر ڕێگای پێوەندیی ڕاستەوخۆ دەگەڵ ئێرانییەکانی لابردبوو، ئەمن و کارمەندانی هەواڵگریی ئیسرائیل، دەبوو فکرێکمان بۆ کۆمەگکردن بە ئێران لە شەڕی دژی عێراقدا کردبایەوە. بەڵام دیارە دەبوو وردبینی و بەپارێزیی پێویستیشمان لەو بارەیەوە بەکار بردبایە. لەڕاستیدا نەدەبوو حکوومەتی کارتەر، لەو کارانە کە دەکران ئاگادار بێ. ژەنراڵ «ساگی» بەتایبەتی وەبیری هێنایەوە کە سەرۆکوەزیر هێشتا زۆر وشیارە کە نەوەکا ئەو فکرە دروست بێ کە ئیسرائیل خەریکی ڕووخاندنی حکوومەتی قانوونیی ئەمریکایە.

نیوەی دووەمی ئووت، کاتێکی زۆر سەرنجڕاکێش بوو، ئەمن بە ژمارە تەلەفونێک کە تایبەتی شوێنی ژیانی کاشانی لە پاریس بوو پێوەندیم دەگەڵ گرت. کاشانی لەوکاتەدا هەمیشە بە فڕۆکەی خۆی لە تارانەوە سەفەری هەموو جێیەکی دەکرد و پێوەندیی دەگەڵ منیش پاراستبوو.

پێیم گوت: «خەبەری خۆشم بۆتان هەیە. ئێمە ئامادەی کۆمەگین. پێرستی پێویستییەکانتان ئامادە بکەن».

لەمبەری تەلەفونەکەوە دەمتوانی، دەنگی ئەو هەناسەیە ببیسم کە لەخۆشییان هەڵیکێشا. ئەو گوتی: «ئاری، زۆر خۆشحاڵم کە ئەو خەبەرە دەبیسم. تکایە سڵاوی من بە دایکت بگەیەنە. ئەمن هێشتا تامی خواردنەکانی ئەوم لەبن دداندایە».

بە پێشنیاری کاشانی دیدارێکمان لە ئامستردام ڕێکخست.

لەوم پرسی: «پێت وایە دیدارەکەمان لەوێ ئەمن دەبێ و کەس جاسووسیمان لەسەر ناکا؟».

پێکەنی و گوتی: «نا،نا، ژنانی هولەندی زۆر جوانن».

چاەڕوان بووم کاشانی لە ئامستردام بەتەنیا ببینم. بەڵام لە نیوەی مانگی ئووتدا کە ئێمە لە هۆتێل مێریاتی ئەو شارە یەکترمان دی، ئەو ٦ کەس لە کاربەدەستانی وەزارەتی بەرگریی دەگەڵ خۆی هێنابوون. ئەم بابەتە بووە مایەی سەرسوڕمانم، بەڵام ئەمن تەنیا بووم.

هەر حەوت کەسی وان جلوبەرگی زۆر ڕازاوەیان دەبەردا بوو و یەکێک لەوان خەریکی بیرەخواردنەوە بوو کە لە ئێران قەدەغە کراوە. یەکێک لە هاوڕێکانی کاشانی ناوی سیرووسی حوسێنزادە بوو. ئەو بە زمانی عیبری قسەی دەکرد و کاری بۆ «ساواما» دەکرد (کە ناوی شۆڕشگێڕانەی «ساواک»ی شا بوو). سیرووسی حوسێنزادە ڕوونی کردەوە کە ئەو پێشتر ئەندامی ساواک بووە و لەلای «شاباک» ڕێکخراوی پۆلیسی نهێنی و ئەمنیەتی نێوخۆی ئیسرائیل دەورەی دیوە و دەورەیەکیشی لە دژیهەواڵگریدا دیتوە. «بەڵام دوایە کە پیاوخەراپی و ستەمکارییەکانی سەرۆکەکانم لە ساواکدا دیت، خۆم لە هاوکاری دەگەڵ وان بوارد و تێکەڵ بە شۆرش بووم».

بەهەرحاڵ، پاش ئەوەی هێندێکمان قسە لێرولەوێ کرد، ئەوان پێرستێکی ٥٠ لاپەڕییان لە پێویستییەکانی خۆیان پێنیشان دام کە هەموو ئەو کەرەسە و ئامرازانەی تێدا بوون کە میللەتێک کە.خۆی بۆ شەڕ ئامادە دەکا پێویستیی پێیان دەبێ، وەک فڕۆکە، تانک،

مووشەکی دژی هەوایی و دژی تانک، گوللەی تۆپە جۆراوجۆرەکان، پارچە جۆراوجۆرەکانی فڕۆکە، خومپارە، نارنجۆک و زۆر کەلوپەلی یەدەکیی دیکە.

ئەوان پێیان داگرت کە پێویستیی هەنووکەیی‌یان بەو ئامرازانە هەیە. یەکێکیان بە منی گوت: «هەر کە ئێوە دەستبەکار بوون، ئێمە بە نیشانەی نیازپاکی لە پێشەوە یەک میلیارد دۆلاری ئەمریکاییتان لە هەر بانکێک بتانەوێ لە ئورووپا بۆ دەحیساب دەکەین».

پاشان بابەتی بارمتە ئەمریکایی‌یەکان هاتە گۆڕێ. ئەمن گوتم: «ئازادیی وان پێوەندیی بە ئێمەوە نیە، بەڵکوو پێوەندیی بە ئەمریکایی‌یەکانەوە هەیە و ئەوانن کە دەبێ بڕیاری یەکجاری بدەن. لەڕاستیدا تۆپەکە لە زەمینی واندایە».

کاشانی پێی داگرت کە حیسابی هۆتێلەکەی من بدا. وەختێک ئەمن هۆتێلم بەجێ دەهێشت، ئەو پێشنیاری پێ‌کردم دەگەڵی بچمە ئیسپانیا و دووسێ ڕۆژ لەو ماڵە بەسەر بەرم کە ئەو بۆ گوزەراندنی کاتی پشوودان لە «ماریلا»ی ئیسپانیا هەیەتی. پاشان پێکەوە بەرەو تەل ئەبیب هەڵفڕین. ئەمن نەمدەویست بە ڕەتکردنەوەی بانگهێشتنەکەی بی‌ڕەنجێنم. بۆیە پێمگوت، لەپێشدا دەبێ دەگەڵ ئیدارەکەم قسە بکەم. ئەمجار تەلەفونم بۆ تەل ئەبیب کرد و پێویستییەکانی وان و هەموو شتێکم بە سەرگورد «هەبروونی» سەرۆکی ستادی ژەنڕاڵ «ساگی» ڕاگەیاند.

سەرگورد «هەبرۆنی» گوتی: «بانگهێشتنەکەی بۆ ئیسپانیا قبووڵ بکە. دەگەڵی بچووە ئیسپانیا و ئەگەر ویستیشی بێتە ئیسرائیل تا لەبارەی پێداویستییە جەنگییەکانی ئێرانەوە ڕوونکردنەوەی زیاتر بدا، با ئەوکارەش بکا».

لە فڕۆکەخانەی «شیفۆل»ی ئامستردام، کاشانی پێی داگرت کە پووڵی بلیتی دووسەرەی «ماریلا» بدا. عیشقبازی دەگەڵ

ئیسـرائیلییەکان دەسـتی پـێکردبـوو و ئـەو پێوەندییـە بـە شـێوەی نارەسمی ئێستا ببووە ڕەسمی. ماوەی سێ ڕۆژ ئێمە لە ماڵە میچ-سوورەکەی ئەو کە بەسەر دەریای مەدیترانەیدا دەڕوانی بە هۆی ژنێکی پێشخزمەتەوە کە خەڵکی ئەفریقای باکووری بوو، میوانداری کراین. ئەو لەوەی ئێران سەرەنجام لە سایەسەری ئەمریکاوە توانیبووی کەرەسە و ئامرازی شەڕ لە ئیسرائیل بکڕێ، هەستی بە خۆشحاڵی دەکرد.

هـەر وا کـە ئـەو شـەوە گەرمـەی ئیسـپانیا قوممـان لـە فنجانـە چایەکانمان دەدا، پێمگوت: «ئێستا نابێ زۆریش وەپێش ڕاستییەکان بکەوین، هێشتا مەرحەمەتی ڕاستەقینەی ئەمریکایییەکان ڕووی تێ-نەکردووین، تەنیا لە تاریکاییدا سەرێکمان بۆ ڕاوەشاوە. هێشتا «ساگی» پێرستی پێویستییەکانی ئێوەی نەدیوە و دڵنیا نیم، هەموو ئەو شتانەمان هەبێ کە ئێوە پێویستتانن».

کاشـانی بـۆ چوونەئیسـرائیل کـەلکی لـە پاسـپۆرتە فیلیپینییەکـەی وەرگرت. ڕۆژی دواتر پاش قاوڵتی لە ماڵی دایکوبابی من، کاشانی کەوتەوە یادی دژکردەوەی ژەنڕاڵ «ساگی» لە یەکەمین دیداریاندا و لەو بارەیەوە دەستی کرد بە پێداگرتن. داستانەکە ئەوە بوو کە کاتێک کاشانی بۆ یەکەم جار چاوی بە «ساگی» کەوتبوو، پاش وردبوونەوە لە پێرستی پێویستییەکانیان گوتبووی: «دیارە،ئێمە زۆر خۆشحاڵ دەبین لەبارەی فرۆشتنی پێویستییەکانی سوپای ئێرانەوە هاوکاریتان بکەین، بەڵام بە ئەمانەتەوە دەبێ پێت‌بڵێم هەتا حکوومەتی تازە لە ئەمریکا دەسەڵات بەدەستەوە نەگرێ، دەستی ئێمە کراوە نابێ. زۆر لـەو کەرەسـە جەنگییانـە و پارچـە یەدەکییـەکانیان دروستکراوی ئەمریکان. بەڵام بە دڵنیایی ئەوەندەی پێویستیتان بە چەکوچۆڵەی دروستکراوی ئیسرائیل هەبێ، ئێمە داخوازەکانتان هەڵدەسەنگێنین».

ئێستا نۆرەی من بوو کە میوانداری لە دۆستەکەم بکەم. بۆیە، کاشانیم بۆ گەڕان بردە دەوروبەری ئۆرشەلیم و بەتایبەتی «هیبرۆن» واتە ئەو جێیە کە گڵکۆی ئیبراهیم، بناخەدانەری دینەکانی یەهوودی و ئیسلامی لێیە. موسوڵمانان و جوولەکەکان پێیان وایە ئیبراهیم بناخەدانەری باوەڕی یەکخواپەرستی بووە و هەر بۆیە ئەو بە باوکسالاری دینەکانیان دەزانن و بە گڵکۆکەی دەڵێن «حەرەمی ئیبراهیم». موسوڵمانان دەیانەویست لە شوێنی گڵکۆکەی ئیبراهیم، مزگەوت دروست بکەن، بەڵام جوولەکەکان دەیانەویست کەنیسەی لێ دروست بکەن. سوپای ئیسرائیل ڕێگەچارەیەکی مامناوەندیی هێنا کە پەیڕەوانی هەردوو ئایینەکە قبووڵیان کرد. بەوجۆرە کە ئەو شوێنە جارێک وەک مزگەوت و جارێک وەک کەنیسە کەلکی لێوەربگیرێ.

هەروا کە لە دەوروبەری ئۆرشەلیم پیاسەمان دەکرد، کاشانی لێی-پرسیم: «ئاری، ئەتۆ چۆنی بۆ دەچی؟ پێت وایە ئێمە دەتوانین هەموو پێویستییەکانی سوپای ئێران بەهۆی ئێوەوە دابین بکەین؟»

«هەروەک سەرۆک بەمنی گوت، ئێمە هەر کارێکمان بۆ ئێوە لەدەست بێ، بۆتان دەکەین. لەبیرت نەچێ کە دوژمنی ئێوە دوژمنی ئێمەشە».

ڕۆژی ٢ی سێپتامبری ١٩٨٠ کە عێراقییەکان لە یەکەم تێکهەڵچوونی سنووری دەگەڵ ئێران هێرشیان کردە سەر باشووری ئەو وڵاتە، نیگەرانییەکانی ئیسرائیل وەدی هاتن. لەڕاستیدا یەکەمین ڕۆژی هێرشی عێراق بۆ ئێران ڕۆژی ٢٢ی سێپتامبری ١٩٨٠ بوو کە شەڕێکی هەشت ساڵەی بەدوادا هات. سەددام حوسێن بڕیاری دابوو،لەپێشدا کۆنترۆڵی خۆی بەسەر ئاوەکانی ئەروەندڕوود (شط العرب)دا قایم بکا و پاشان چاڵە نەوتەکانی خووزستان، پارێزگای باشووری خۆرئاوای ئەم وڵاتە لە خەلیجی فارس بێنێتە بەر دەستی خۆی. پاش ئەو پەلامارە، سەربازانی عێراق هێرشیان بردە نێوخۆی

سـەرزەمینی ئێـران، بـەڵام سـوپای عێـراق ئەوەنـدەی ئێمـە بیرمـان کردبۆوە، باش و کارامە نەبوو. هێزی هەوایی عێراقیش لە هەوڵی لەنێوبردنی هێزی هەوایی ئێراندا لێهاتوویی نیشان نەدا. عێراقییەکان خێرا لە بەرامبەر بەرگریی سەرسوڕهێنی سوپای ئێراندا تووشی داماوی هاتن. هەرچەند ئێرانییەکان کەلکیان تەنیا لەو کەرەسە و ئامرازانە وەردەگرت کە لە دەورانی شا مابوونەوە و بەشێکی گرنگیشیان چونکی باش نەپارێزرابوون، بێکەلک ببوون. بەوحاڵە، ئێرانییەکان بە کەلکوەرگرتن لەو کەلوپەلە، عێراقییەکانیان وەزاڵە هێنا.

سەرەتای ئەو ساڵە (١٩٨٠) لە هەڵبژاردنێکدا کە بۆ هەڵبژاردنی سەرکۆمار لە ئێران بەڕێوە چووبوو، ئەبولحەسەنی بەنیسەدر بەسەر حەریفی خۆی، دەریاسالار مەدەنیدا سەرکەوتبوو و بە سەرکۆماری ئەم وڵاتە هەڵبژێرابوو. بەڵام تەنانەت لە سەردەمی پەلاماری عێراق بۆ سەر ئێرانیشدا، هێشتا دەسەڵاتی ڕاستەقینە لە دەستی ئەنجومەنی بەرزی شۆڕشدا بوو. ئەبولحەسەنی بەنیسەدر، وەک فەرماندەی گشتیی هێزەکان، بۆخۆی هەموو ئەو فڕۆکەوانانەی هێزی هەوایی ئازاد کرد کە لە سەرەتای شۆڕشدا ڕێگایان دابوو، ئیسرائیلییەکان جێتە F-14کان بدزن و بۆیە گیرابوون. بەڵام پێی داگرت کە هەموویان سوێند بە قورئان بخۆن، خزمەتی وڵاتەکەیان بکەن. بەنیسەدر پێیگوتن، ئەم شەڕە پێوەندیی بە مەلاکانەوە نیە، بەڵکوو پێوەندیی بە مانونەمانی وڵاتەکەمان ئێرانەوە هەیە.

دەگەڵ بەرەنگارییەکی بەرچاو کە ئێرانییەکان لە بەرامبەر هێرشی عێراقدا کردیان، حکوومەتی ئیسرائیل و کۆمەڵگەی هەواڵگریی ئەم وڵاتە، بێئەندازە لە پەلاماری عێراق بۆ ئێران دەترسان. ئێستا قازانجی نیشتمانیی ئیسرائیل حوکمی دەکرد کە ئێمە لافاوی کەرەسەی شەڕ بەسەر ئێراندا بڕێژین، بەڵام لەوبارەیەوە دەبوو بە

هەڵسەنگاندنەوە ڕەفتار بکەین. بەشی زۆرتری کەرەسەی شەڕی ئێمە ئەمریکایی بوون و ئەگەر ئەو چەکوچۆڵەیە بێئازادبوونی بارمتەکان یان ڕەزامەندیی کارتەر چووبانە ئێران، لەوانە بوو کۆنگرەی ئەمریکا کە زۆربەی ئەندامەکانی ئەندامی حیزبی دیموکرات بوون، دژکردەوەیەکی توند نیشان بدا.

چەند ڕۆژ دوای هێرشی ٢٢ی سێپتامبری عێراق بۆسەر ئێران، کاشانی تەلەفونی بۆ من کرد و گوتی کە بە تازەیی چوارەمین دیداری نێوان ئێرانییەکان و ئەمریکایییەکان لە «بارسیلۆن» (بەرشلۆنە)ی ئیسپانیا پێکهاتوە. لەو دیدارەدا بڕیارێکی گرنگ درابوو: بەو جۆرە کە بڕیار درابوو دیدارێکی زۆر نهێنی لە نێوان «جۆرج بووش» و کەڕرووبیدا لە پاریس ئەنجام بدرێ. ئێرانییەکان دەیانەویست کاربەدەستێکی پایەبەرزی کۆمارخواز دڵنیایان بکا کە ئەگەر بارمتە ئەمریکایییەکان تا چوونی «ڕەیگان» بۆ کۆشکی سپی هەروا لە بەندی خۆیاندا ڕابگرن، ئەمریکا کەرەسەی پێویستی شەڕیان بۆ ئەوەی بتوانن لە بەرامبەر عێراقدا بەرگری لە خۆیان بکەن، دەداتێ و دراوە ڕاگیراوەکانیان لە بانکەکانی ئەمریکاش ئازاد دەکا.

کاشانی گوتی: «لەو دیدارەدا بڕیاریش دراوە کە نوێنەرانی ئیسرائیل لە دیداری پاریسدا بەشدار بن. هەرچەند بڕیاری کۆتایی لەبارەی ئەو دیدارەوە بە دەست «بووش» و کەڕرووبی دەبێ، ئێمە دەگەڵ ئەندامان و هاوکارانی بەشداری ئەو دیدارەش گفتوگۆ دەکەین».

بەو پێیە لەو دیدارەدا، جێگری سەرکۆماری حکوومەتی کۆمارخوازی دادێیش بەشدار دەبێ، بەڵام ڕێی تێنەدەچوو کەسانی سەر بە کارتەر بتوانن لە بوونی «بووش» لە دانیشتنی پاریسدا ئاگادار بن. ئەو خەبەرانەی کاشانی لەبارەی ئەو دیدارەوە دانی بە

مـن، هـەموو ڕاسـت بـوون و «ڕافـی ئـەیتان»یـش وردەکـاریی ئـەو خەبەرانەی لە دۆستە ئەمریکایییەکانی وەرگرتبوو.

کاشـانی لێـی زیـاد کـرد: «بـەڵام، ئێمـە هێشـتا بـۆ ئـەو کەرەسـە جەنگییانەی پێویستمانن، چاوەڕێی یارمەتییەکانی ئێوەین. ئـەمریکایی-یەکان بە منیان گوتوە، ئەگەر ئێمـە سـەبر بگرین، ئـەوان کۆمـەگمان دەکـەن. بـەڵام دیـارە ئـەم کـارە دەکـەوێتـە دوای هاتنەسـەرکاری کۆمارخوازەکان و ئازادیی بارمتە ئەمریکایییەکان».

دەوروبـەری ١٠ی سـێپتامبر مـن بـۆ ئاگـاداری لـە نامەیـەک کـە «ستێنسفیلد تێرنێر» سـەرۆکی CIA بۆ ژەنڕاڵ «سـاگی»ی ناردبوو، بانـگ کـرام. «تێرنێـر» لـەجیاتی ئـەوەی ئـەم نامەیـە بـۆ هاوتـا ئیسرائیلییەکەی خۆی، سەرۆکی «مۆسـاد» بنێرێ، ئەوی بۆ ژەنڕاڵ «سـاگی» سـەرۆکی ئیـدارەی پێوەندییـەکانی دەرەوەی ڕێکخـراوی هەواڵگریی سوپا ناردبوو. «تێرنێر» لەو نامەیەدا بۆچوونـەکانی خۆی لەبارەی بارودۆخی خۆرهەڵاتی ناڤینەوە شی کردبۆوە و لە هەمووی گرنگتر پێشبینیی کردبوو کە بێ لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کێ وەک سـەرکۆماری ئـەمریکا هەڵدەبژێردرێ، ئـەو چـاوەڕوانی ئەوەیـە کـە هـەروەک پێشـوو درێـژە بـە ڕێبـەری و سـەرۆکایەتیی CIA لـە سـاڵی ١٩٨١دا بدا.

بـەپێی ئـەوەی «سـاگی» گـوتی، «کەیسـی»یش تەلـەفونی بۆ بگـێن، سـاگی و «نـاچووم ئـەدموونی» Nachum Admoni سەرپەرسـتی «مۆسـاد» کردبـوو و پێوەندییـەکانی دەگـەڵ ئێرانییـەکانی بـۆ شـی کردبوونەوە و لێی زیاد کردبوو کە لە ئیسپانیا هێندێ دیداری دەگەڵ ئێرانییەکان هەبووە و بە زوویی لەبارەی کاروباری ئێستاوە دەگەڵیان دەگاتـە ڕێککـەوتن. ئـەو هـەروەها ڕوونـی کردبـۆوە کـە لـە نیـوەی ئۆکتـۆبری ١٩٨٠دا دیـدارێک دەبـێ کـە ئیسرائیلییەکانیشـی بـۆ بانـگ دەکرێن و ئیسرائیلییەکان وەک واسیتەی فرۆشتنی چەکی ئـەمریکایی

بە ئێرانییەکان کەلکیان لێوەردەگیرێ. دیارە ئێمە لە هەموو ئەمانە ئاگادار بووین و هیچکام لەوانە بۆ ئێمە بە خەبەر نەدەژمێردران.

کۆمەڵگەی هەواڵگریی ئیسرائیل لەبارەی هەڕەشەی عێراق لە ئێرانەوە، زۆر نیگەران بوو. ئەگەر عێراق بەسەر ئێراندا زاڵ بایە و سەددام حوسێن ئەو هەموو خاکە بەرینە و چاڵە نەوتەکانی دەست کەوتبان، ئیسرائیل دەگەڵ گیروگرفتێکی گەورە بەرەوڕوو دەبوو. ئێمە لە ڕێگایەک دەگەڕاین کە مەسەلەی پێویستییە جەنگییەکانی ئێران چارەسەر بکەین و بارمتە ئەمریکایییەکانیش پێش ژانویە ئازاد بکەین. ئێمە ئیسرائیلییەکان گەیشتبووینە ئەو فکرە کە ڕەنگە بتوانین دەگەڵ ئێرانییەکان بکەوینە سەودایەکی سەرەڕۆیانە. بەوجۆرە کە داوا لە ئێرانییەکان بکەین بارمتەکان ئازاد بکەن و تەحویلی ئەمریکایان بدەنەوە و ئەمریکا بخەنە بەرامبەر کارێکی ئەنجامدراو. بەوکارە هەم ئێرانییەکان بێ پێوەندی دەگەڵ کاربەدەستانی حکوومەتی کارتەر دەگەیشتنە ئامانجی خۆیان و هەم خەڵکانی سەر بە «ڕەیگان»یش ناچار بوون ئێستا کە بارمتەکان بێکێشە ئازاد بوون قبووڵی بکەن.

بەرنامەی ناوبراو بەتایبەتی لەو بارەیەوە کە «بگین» پێیخۆش نەبوو گرووپێکی ئیسرائیلی لە دیدارێکدا کە لە دژبەرانی کارتەر پێک-دێ، بەشدار بن، سەرنجڕاکێش دەهاتە بەر چاو. «بگین» سەرۆک-وەزیری ئیسرائیل زۆر پابەندی قانوون و ڕێوشوێنەکان بوو و پێی وابوو کە لە کاروباری جیهانیدا دەبێ ڕێز بۆ قانوون و ڕێوشوێنەکان دابنرێ.

بەهەر حاڵ بەرنامەکە کەوتە جێبەجێکردنەوە. لەپێشدا «بگین» لە نێوەڕاستی سێپتامبردا دۆستی دێرینی خومەینی «ڕووت بن دێڤید»ی وەک نوێنەری تایبەتیی خۆی بۆ دیتنی خومەینی ناردە تاران. مەئمووریەتی «ڕووت بن دێڤید» ئەوە بوو کە خومەینی ببینێ و

ڕەزامەندیی ئەو بۆ ئازادکردنی دەسبەجێی بارمتەکان لە بەرامبەر ناردنی کەرەسەی شەڕ بۆ ئێراندا بەدەست بێنێ. خومەینی مووافەقەتی دەگەڵ خەتە گشتییەکانی ئەم بەرنامەیەدا کرد و بڕیار درا، وردەکارییەکانی بەرنامەکە لە دیدارێکی دیکەدا بخرێنە بەر باس و گفتوگۆ. «ساگی» وردەکارییەکانی ئەو بەرنامەیەی دا بە من و پاشان دەستووری دا ئەمن داوا لە کاشانی بکەم دیدارێک لە نێوان گرووپێکی پایەبەرزی ئیسڕائیلی و ئێرانیدا ڕێکبخا کە توانای ئازادکردنی بارمتەکانی هەبێ.

ئەم دیدارە نیوەی دووەمی سێپتامبر لە ئامستڕدام پێکهات. ئەو ئیسڕائیلییانەی لەو دیدارەدا بەشدار بوون بریتی بوون لە: «دیڤید کیمچە»، سەرۆکی «تیڤێل»، «یووری سیمچۆنی» Uri Simchoni و کەسێکی دیکە لە ڕێکخراوی هەواڵگریی سوپا «شەمووئیل مۆریە» Shamuel Morieh و خۆم. بەشدارانی ئێرانییش بریتی بوون لە: کاشانی، ئەحمەدی خومەینی کوڕی ڕووحوڵڵا خومەینی دەگەڵ خوسرەوی فەخریە و ئەحمەدی ئۆمشی. چونکە ئەحمەدی خومەینی لەو دیدارەدا بەشدار بوو، بۆیە گرووپی ئێرانی بە پایەبەرز دەژمێردرا.

دیداری ناوبراو دوو ڕۆژ لە هۆتێل مێریاتی ئامستڕدام درێژەی کێشا. لە کۆتایی دیدارەکەدا ڕێک کەوتن کە: ئێرانییەکان کارێک بکەن کە بارمتەکان یەکەم حەوتووی ئۆکتۆبر ئازاد بکرێن. پاشان بنێردرێنە کەراچی لە پاکستان لە شوێنێک کە فڕۆکەیەکی هێزی هەوایی ئەمریکا، چاوەڕێیان دەبێ. ئیسڕائیل ٥٢میلیۆن دۆلار دەدا بە کاشانی و ئەو دەیدا بە ڕێبەرە توندڕەوەکانی حکوومەتی کۆماری ئیسلامی. پاش ئازادبوونی بارمتەکان ئیسڕائیل دەست دەکا بە ناردنی کەرەسەی سەربازی بۆ ئێران و ئێرانیش دراوەکەیان دەدا. جگە لەوەش، ئیسڕائیل بەڵێنی لە کۆمارخوازەکان وەردەگرێ کە ئەگەر

دەسـەڵاتی ئـەمریکایان گرتـە دەسـت، پووڵـە ڕاگیراوەکـانی ئێران لـە بانکەکانی ئەمریکا ئازاد بکەن.

هـەموو کـەس دەیتـوانی بۆچـوونی ئـەمریکاییـەکان لـەبارەی ئـەو بەرنامەیەوە تێبگـا. بـەڵام بەهـەرحاڵ سـەرۆکەکانی من لـە پێشنیاری ئەو بەرنامەیە خۆشحاڵ دەهاتنە بەرچاو. پاشان سەرۆکی من، ژەنراڵ «سـاگی»، «کەیسـی»ی لـە بابـەتی بەرنامەکـە ئاگـادار کـرد. وەڵامـی «کەیسی» سـارد بـوو. «کەیسـی» گـوتی بـاوەڕ ناکـا ئێرانییـەکان ئـەو بەرنامەیە جێبەجێ بکـەن. ئـەو پێشنیاری کـرد کـە باشـترە نوێنـەرێکی ئێران بـە نهێنـی سـەفەری ئـەمریکا بکـا و بەرنامەکـە پێشـان بـدا. بـەم جۆرە ئەمریکاییەکان هێشتا خەریکی ئەنجامدانی تاکتیکەکانی خۆیان بۆ کاتگوزەراندن و دواخستنی ئازادیی بارمتەکانیان بوون.

بۆ بەجێگەیاندنی پێشنیارەکەی «کەیسـی» مووافەقـەت کرابـوو کـە ئەگـەر تـاران ڕازی بـێ، ئیسـڕائیلییەکان دەگـەڵ نوێنـەرێکی ڕەسـمیی ئێران بچنـە ئـەمریکا. ئێرانییـەکان ئـەوەندەیان پێویسـتی بـە کەرەسـەی شـەڕ هەبوو کە مووافەقەتیان کرد نوێنەرێک بنێرنە ئەمریکا. ئەگـەرچی وەزارەتـی دەرەوە هێشـتا نەکـەوتبووە دەسـتی کۆمارخوازەکـان، بەوحاڵـە گوتیـان کارێـک دەکـەن کـە نوێنـەرە ئێرانییەکـە بتـوانێ لـە باڵیۆزخانەی ئەمریکا لە ئەڵمان ڤیزای چوون بۆ ئەمریکا وەربگرێ.

بـە ئێمـە گوترابـوو کـە نوێنـەرانی ئـەمریکا لـە دیداری واشـینگتۆندا بریتـی دەبـن لـە: «ڕابێـرت مـەک فـارلین»، «ڕیچـارد ئـالێن»، «جیمـز بـەیکر» James Baker، سـەرۆکی پێشـووی ململانـەی هـەڵبژاردنی «جـۆرج بـووش» و «لاڕێـنس سـیلبەرمەن» Lawrence Silberman، یـەکێک لـە دۆسـتانی نزیکـی «بـووش». هـەڵبژاردنی «مـەک فـارلین»، «بـەیکر» و «سـیلبەرمەن» بـە لەبـەرچاوبوونی پێوەندییـەکانیان بـۆ ئێمـە تێگەیشـتنی ئاسـان بـوو. بـەڵام بەشـداریی «ئـالێن» Allen لـەو دیدارەدا بۆ ئێمـە مەتـەڵۆکە بـوو، چونکە ئـەو سـەر بـە حکوومـەت و

خەتە پێوەندییەکانی کارتەر بوو. نهێنیی ئەو گیروگرفتە وەختێک بۆ ئێمە ئاشکرا بوو کە «مەک فارلین» بە «ئەیتان»ی گوت کە «ئالێن» بەو مەرجە دەگەڵ گرووپی «ڕەیگان» کەوتۆتە هاوکاری کە پاش ئەوەی «ڕەیگان» لە ئەمریکا دەسەڵاتی بەدەستەوە گرت، ئەو بکرێتە ڕاوێژکاری ئەمنیەتی نیشتمانیی ناوبراو.

ئەو چوار کەسە قەرار بوو ڕۆژی ٢ی ئۆکتۆبر دیداریکیان دەگەڵ نوێنەرێکی ئێران و ئەفسەرێکی هەواڵگریی ئیسرائیل -کە من دیاری کرابووم- هەبێ. لە فرانکفۆرت ئەمن چاوەڕێی هاتنی دوکتۆر ئەحمەدی ئۆمشی کە لەو کاتەدا بۆ من ئاشنا بوو، مامەوە. ئەو لە فرانکفۆرت لە باڵیۆزخانەی [کۆنسوولخانە-وەرگێڕ] ئەمریکا ڤیزای چوون بۆ ئەو وڵاتەی وەرگرت و ئێمە پێکەوە بە ڕێگای نیۆیۆرکدا چووینە واشینگتۆن. وردەکاریی ئەو دیدارە بە هۆی هووشەنگی لاوی، جوولەکەیەکی ئێرانی کە لە ئەمریکا دەژیا و کاری بۆ هەواڵگریی ئیسرائیل دەکرد، ڕێکخرابوو. «لاوی» سەوداگەرێکی ناسراوی کەرەسەی شەڕ بوو کە لە سەردەمی شادا ئێرانی بەجێ هێشتبوو و لە ئەمریکا نیشتەجێ ببوو. ئەو بەردەوام لە ئەمریکاوە سەفەری ئیسرائیلی دەکرد و لە ساڵەکانی دەیەی ١٩٧٠دا «مۆساد» ئەوی بۆ پێشخستنی بەرنامەکانی فرۆشتنی کەرەسەی شەڕ لەلای خۆی دامەزراندبوو. حکوومەتی ئیسرائیل بە هۆی ئەوەی «لاوی» دەستووری «مۆساد»ی بۆ خۆپاراستن لە موعامەلەی ناقانوونیی کەرەسەی شەڕ دەگەڵ برایانی هاشمی و خەڵکی دیکە لەبەر چاو نەگرتبوو، ساڵی ١٩٨٣ کۆتایی بە خزمەتی ئەو هێنا.

«جیمز بەیکر» لە دیداری ٢ی ئۆکتۆبردا کە لە هۆتێل «لیڤانت پلازا» L,Enfant Plaza لە واشینگتۆن بەڕێوە چوو، بەشدار نەبوو، بەڵام سێ کەسەکەی دیکە لەو کۆنفرانسەدا بەشدار بوون. کاتێک دوکتۆر ئۆمشی جارێکی دیکە، بەرنامەی ئیسرائیلییەکانی دەربارەی

ئـازادیی بارمتـەکان، فرۆشـتنی کەرەسـەی شـەڕ بـە ئێـران و ئـازادیی دراوە بلووکـەکراوەکانی ئێرانــەوە کـە پێشـتر ڕێککـەوتنیان لەســەر کرابـوو، بـاس دەکـرد و ئەنـدامانی بەشـدار بـە ئەدەبـەوە گوێیـان بـۆ قسەکانی گرتبوو، ئەمن هـیچم نـەگوت. ئـەو دیـدارە تـەنیا نیوسـەعاتی خایانـد. «ئۆمشـی» پێشـنیاری کـرد کـە چونکـە ئیسـڕائیلییەکان بـۆ ئـازادکردنی بارمتـەکان لەلایـەن ئـەمریکاوە کەوتوونـە وتـووێژ، پێـک-هـاتنی کۆنفرانسـی پـاریس لـەنێوان «بـووش» و «کـەڕووبی»دا کـە بەرنامەکەی پێشتر داڕێژراوە، ئیدی پێویست نیە.

دوای بیستنی قسەکانی دوکتۆر «ئۆمشی»، «مەک فارلین» پێکـەنی و لەحاڵێکدا بە ئارامی سەری دەجوولاند گوتی: «ئـەمن ڕاپۆرتی ئـەم بابەتە دەدەمەوە سەرۆکەکانم». ئەمن نەمتوانی تێبگـەم مەبەستی لەم قسەیە چی بوو و سەرۆکەکانی چکەسانێک بوون.

دوو ڕۆژ دواتر ئەمن گەڕامـەوە تـەل ئـەبیب و دەسـبەجێ بـۆ دیتنـی «ساگی» چوومە دەفتەرەکەی.

ئـەو گـوتی: «هیـوادارم دیـداری واشـینگتۆنت خـۆش لـێگـوزەرابێ، ئاری».

لـە قسـەکانیڕا دەسـبەجێ هەسـتم کـرد گیروگرفتێـک لـە کارەکـەدا دروسـت بـووە و بۆیـە گـوتم: «دەتـەوێ بڵێـی بەرنامەکـە شکسـتی هێناوە؟».

«چما هەر لە هەوەڵەوە وا نەبووە؟».

گوتم: «نا، چما ئێمە لەڕادەبـەدەر چـاوەڕوان بـووین کـە ئـەمریکایی-یەکان بەرنامەکەمان قبووڵ بکەن؟».

هەرچەنـد «ئۆمشـی» دیـداری پاریسـی بـە پێویسـت نـەزانیبوو، بەوحاڵە بڕیار درا کۆنفرانسەکە بگیرێ و ئێمە بەنیاز بووین تیمێکی ٦ کەسی بنێرینە پـاریس تـا لـەبارەی وردەکـاریی ئـازادیی بارمتەکانـەوە وتـووێژ بکـەن و «بـووش» و «کـەڕووبی» بـە موافەقـەتی خۆیـان

ڕەسمیەتی پێ بدەن. مەئموورییەتی من لەو کۆنفرانسەدا ئەوە بوو کە دۆستایەتیم دەگەڵ ئێرانییەکان پتەوتر بکەم و لیستێک لە ئادرەس، ژمارە تەلەفون و ژمارە تێلێکسی وان دەگەڵ ناوەندە گرنگەکانی هاتوچۆ و مانەوەیان لە ئورووپا ئامادە بکەم تا بەوهۆیەوە بتوانین پێوەندییان دەگەڵ بگرین و ئیسرائیل کەرەسە جەنگییەکانی پێویستی سوپای ئێران لە ڕێگای ئەوانەوە بەم وڵاتە بفرۆشێ.

کاتێک ئەمن تەلەفونم بۆ کاشانی کرد و پێمگوت کە ئەمریکایی-یەکان بەرنامەکەی ئیسرائیلیان تێپەڕاندوە و بۆیە نابێ چاوەڕوان بین دەسبەجێ کەرەسەی شەڕ تەحویلی ئێران بدرێ، ئەو زۆر ناڕەحەت بوو.

ئێران چەند مانگ پێشتر ئامادە بوو بارمتەکان ئازاد بکا و ئیسرائیلیش لە هەر باریکەوە خۆی بۆ موعامەلەی کەرەسەی شەڕ لەگەڵ ئێران ئامادە کردبوو. بەڵام هەموو پێشنیارەکانی ئازادکردنی بارمتەکان و هەروەها موعامەلەی چەکدارکردن یان وەدوا خرابوون یان بە نەدیتراو دانرابوون. هەرکەس ئاگای لەو کاروبارە هەبوو گومانێکی نەبوو کە کۆمارخوازان و نوێنەرانی سەربەوان لە CIAدا، هەوڵیان دەدا بۆخۆیان جڵەوی ئەو کارانە بەدەستەوە بگرن و بە ئازادکردنی بارمتەکان لە ڕۆژی چوونی «ڕەیگان» بۆ کۆشکی سپیدا شانازی و شکۆی ئەوکارە بکەنە ئی خۆیان.

کاشانی گوتی: «ئاری، ئەو خەبەرەی تۆ بۆمن زەبرێک بوو. ئێمە لەڕادەبەدەر پێویستیمان بە کەرەسەی شەڕ هەیە. ئەگەر ئێستا فرۆشتنی ئامراز و کەرەسەکانی دیکەی شەڕتان بۆ ناکرێ، هەرنەبێ بە پەلە هێندێک پارچەی یەدەکیی فڕۆکەی F-4مان پێبفرۆشن.»

ئەمن گوتم: «ئەوەندەی لە توانامدا بێ، هەوڵی خۆم دەدەم»و ئەمجار تەلەفونەکەم دانایەوە.

ئــەمن بابەتەکــەم دەگــەڵ ســـەرۆکەکانم هێنایــە گــۆڕێ و ئــەوان دەسـبەجێ بڕیاریـان دا ٦٠دانـە پارچـەی یـەدەکیی فڕۆکـەی F-4 لـە کۆگاکانی هێزی هەوایی ئیسـڕائیل بە ئێران بفرۆشـن. بۆ ئەنجامدانی ئـەو کـارە دەگـەڵ کاشـانی وامـان کـرد ئێرانییـەکان فڕۆکەیـەکی فـە ڕانسەیی بەکرێ بگرن و پارچـەکان ئـاخری ئۆکتۆبر لـە فڕۆکەخانـەی «بن گۆریۆن»ەوە بەو فڕۆکەیـە بنێردرێنـە پـاریس و دوایە بنێردرێنـە تـاران. ئـەمن تکـام لـە ئێرانییـەکان کـرد پووڵەکـەیان بنێرنـە حیسـابی بانکیی ئێمە لە ژنێڤ.

کۆنفڕانسـی پـاریس هـەر وەک پێشـتر بەرنامـەی بـۆ داڕژابـوو، بـە باشـی بـەڕێوە چـوو. شـەش کەسـی ئێمـە، پێنج پیـاو و ژنێـک کـە بـۆ چوونەپاریس دیاری کرابووین، بە تەواوی لە کارەکە ئاگادار کراین و ئەو ئەرکەمان بۆ شـی کرایـەوە کە دەبـوو لـەو کۆنفڕانسـەدا ئـەنجامی بدەین. «سـیمۆن گابـای» Simon Gabbay ئـامۆزای بـابم کـە سـەرۆکی ڕێکخراوی جوولەکەکانی پاریس بوو و لەمێژ ساڵ بوو بـە یـەکێک لـە ئەندامـە گرنگـە هەواڵگرییـەکانی ئیسـڕائیل دەژمێـردرا، دیـداری نێـوان گرووپە ئێرانی و ئیسڕائیلییەکانی ڕێک خست. ئامانجی بەشداریی ئـەو لـەم کـارەدا ئـەوە بـوو کـە پێویسـتیی پێوەنـدیی نێـوان ئیشـکەرانی باڵیۆزخانەکانی ئیسڕائیل و ئێران لەنێو بەرێ. «گابـای» لـە سـاڵەکانی دواتریشدا ئەم ئەرکەی بەجێگەیاند.

گرووپە ٦ کەسییەکەی ئێمە لە نیوەی ئۆکتۆبردا وەک نەناسـراو بـە فڕۆکەیـەکی «ئێـل عـال» لـە تـەل ئەبیبـەوە چووینـە فڕۆکەخانـەی «ئۆرلی»ی پاریس. ڕێوشوێنی ئەمنیەتی بۆ ئێمـە ڕێکخرابوو. کاتێک گەیشـتینە پـاریس، دوو کــەس لــە نوێنــەرانی «مۆســاد» کــە لــە باڵیۆزخانەی ئیسڕائیل لە پاریس کاریان دەکرد پێشوازییان لـێکردین. دوو کـەس لـە پایەبـەرزەکانی گرووپـی ئێمـە -«دیڤیـد کیمچـە» و «شـەمۆئیل مووریـە»یـان بـە ترومبێـل بـردە هۆتێـل «ریتـز». ئـەمن

ترومبێلێکم بەکرێ گرت و سێ ئەندامەکەی دیکەی گرووپەکەمانم کە بریتی بوون لە: «ئووری سیمچوونی»، «ڕافی ئەیتان» و ژنێک کە سەربە «مۆساد» بوو، بردنە هۆتێلی بورجی ئیفێل و هەر چوار کەسمان لەوێ ماینەوە. ئەرکی من ئەو ڕۆژە ئەوە بوو کە بەهۆی تەلەفونێکی متمانەپێکراو لە ماڵێکی ئەمن کە کەوتبووە شەقامی «فابوورگ مۆنت مارتە» rue Faubourg Montmarte دەگەڵ ئیسرائیل لە پێوەندیدا بم.

ڕۆژەکانی دواتر لە نێوان ئەو کاتانەدا کە بە تەلەفون دەگەڵ ئیسرائیل لە پێوەندیدا بووم، دەرفەتم دەست کەوت کە چاوم بە هێندێک لە ئەندامانی ئەمریکایی کۆنفرانس، وەک «ڕابێرت گەیتس» و «جۆرج کیوو» کە یەکێک لە کارمەندە لەمێژینەکانی CIA بوو، بکەوێ. «کیوو» ساڵی ١٩٧٧ بەڕەسمی لە CIA دەرکرا، بەڵام تا ساڵی ١٩٨٩ درێژەی بە ئەنجامدانی ئەرکی خۆی لەو ڕێکخراوەدا دا. کار و کارزانیی من و ئەو کەموزۆر وەک یەک بوو. ئەو کارناسی کاروباری ئێرانە و بە زمانی فارسییش بەباشی قسە دەکا، هەم باش دەخوێنێتەوە، هەم باش دەنووسێ. هێندێک جار ئەو وەک وەرگێڕ لە پلەیەکی نزمدا دەناسێندرا، بەڵام لە ڕاستیدا ئەو یەکێک لە ئەندامانی گرنگی CIA و ئەندامی یەکەیەک بوو کە لە ئیسرائیل ئێمە پێی دەڵێین «گرووپی ئێران». ئەو یەکەیە لە ئاکامی کۆنفرانسی پاریسدا پێکهات و لەژێر سەرپەرستیی «ڕابێرت گەیتس»دا بوو. چون «کیوو» لە کاروباری ئێراندا لێوەشاوە و کارامە بوو، لە فرۆشتنی چەکوچۆڵە بە ئێراندا ئەویش دەگەڵ ئیسرائیلییەکان دەستی بە هاوکاری کرد. «کیوو» زۆر لە «گەیتس» نزیک بوو و لە کۆمەڵەکانی واشینگتۆنیش زۆری ناوبانگ پەیدا کرد.

ڕۆژێکیان «گەیتس» و «کیوو» هاتنە ژووری یەکێک لە ئیسرائیلییەکان و ئێمە لەبارەی شەڕی ئێران و عێراقەوە کەوتینە

گفتوگۆ. بەوجۆرەی لە ئیسرائیل فێر کرابووین، ئەمن و دۆستەکانم هەوڵمان دا چەندی بکرێ کەمتر دەگەڵ ئەمریکاییەکان پێوەندی بگرین. بەڵام ئەمن دەگەڵ ئێرانییەکان -کاشانی، ئۆمشی و فەخریە- پێوەندیی زۆر نزیکم هەبوو و ناوی هاوکارەکانیانم لە باڵیۆزخانەکانیان و هەروەها لە لقەکانی بانکی میللی لە لەندەن و پاریس بەدەست هێنا. ئەو ئادرەسانە بۆ جێبەجێکردنی بەرنامەکانی داهاتوو و لەکاتی فرۆشتنی کەرەسەی شەڕ بەواندا پێویست بوون. ڕۆژی سێیەم، ئەمن کەموزۆر ئەرکەکانی خۆم لەو مەئموورییەتەدا تەواو کردبوون.

شەوی پێش دیدارە بنەڕەتییەکە حوججەتولئیسلام کەڕووبی کە تازە گەیشتبووە پاریس، چاوی بە دوو نوێنەری پایەبەرزی ئیسرائیلی کەوت. ئەو دووکەسە داوایان لە من کرد لەگەڵیان بچمە دیداری کەڕووبی کە لە هۆتێل «مۆنتاین» Montaigne ی نزیک هۆتێل هیلتۆن بوو. لە حاڵێکدا دوو پارێزەری کەڕووبی بە وردی چاوەدێرییان لێدەکرد، ئەمن بۆ یەکەمجار دەگەڵ ئەو پیاوە دەستڕۆیشتووەی ئەنجومەنی بەرزی شۆرش بەرەوڕوو بووم. ئەو وەک پیاوێکی زۆر زیرەک و مەزهەبی کاری کردە سەر میوانەکانی. ئەو بە هەردوو زمانی ئینگلیزی و فەڕانسەیی قسەی دەکرد و بە ئاشکرا گوتی کە باوەڕی بە شۆرشی ئیسلامیی وڵاتەکەی هەیە. کەڕووبی دوایە لێیزیاد کرد کە هاوکاریی نێوان ئێران و ئیسرائیل بە دژی عێراق یەک لە پێویستییەکانی ڕۆژە و نابێ وەک نیشانەی بەڕەسمیناسینی ئیسرائیل لەلایەن حکوومەتی ئیسلامییەوە سەیر بکرێ.

بەیانیی ڕۆژی دواتر، چەند سەعات پێش دەستپێکردنی ئەو کۆنفرانسە یەکجار نهێنییە کە قەرار بوو لە ساڵۆنی نهۆمی سەرەوەی هۆتێلەکە پێک بێ، ئەفسەرانی ئەمنیەتیی فەڕانسە سەرتاسەری

سالۆنی پێشوازیی هۆتێل «ریتز»یان پڕ کردبوو. ئەرکێکی دیکەش بە من سپێردرابوو کە بۆ ئەنجامدانی دەبوو بۆ دیداری ئێرانییەکان بچمە هۆتێل «ریتز». لەحاڵێکدا دۆستەکانم دەگەڵم دەهاتن و ئەمن باشم دەزانی کە لەو دیدارە گرنگەدا دەبێ خۆم لە ئەمریکایییەکان بەدوور بگرم، بە بەر چاوی تیژبینی کارمەندە ئەمنیەتییەکانی فەڕانسەدا تێپەڕیین و دەگەڵ دوو کارمەندی ئەمریکایی کە وا دەهاتە بەرچاو، فەرمانبەری کاروباری نهێنین، بەرەوڕوو بووین. ئەو دووانە، لە پێشدا چاویان لە ناوەکانی ئێمە لە پێرستەکەی خۆیاندا کرد و پاشان ڕێنوێنییان کردین بۆ لای ئاسانسۆرێک کە کەوتبووە تەنیشت سالۆنی پێشوازیی هۆتێل و بەهۆی کارمەندانی تایبەتەوە پارێزگاریی لێدەکرا.

کە لە ئاسانسۆرەکە چووینە دەر، خۆمان لە سالۆنێکی گەورەی هەمووانیدا دیتەوە کە لەسەر ئەو مێزەی لێی دانرابوو، خواردنەوەی بێئەلکول دانرابوو. کارمەندان بە وردبینی خواردن و خواردنەوەیەکیان ئامادە کردبوو کە دەگەڵ بیروباوەڕی هیچکەس ناسازگار نەبێ. ئەمریکایییەکان -«گەیتس»، «مەک فارلین»، «کیوو»،و «دۆناڵد گرێگ» کە لە ئەنجومەنی نیشتمانیی پرێزیدێنت کارتەر وەک ئەڵقەی پێوەندیی CIA کاری دەکرد، لەنێو ئەو کەسانەدا بوون کە خەریکی گفتوگۆ دەگەڵ ئێرانییەکان بوون. هێشتا نیشانەیەک لە «بووش» و «کەڕرووبی» دیار نەبوو.

ئەمن لە ئێرانییەکان نزیک بوومەوە تا ئەو ئەرکەی پێیان سپاردبووم، تەواو بکەم. ئەنجامدانی ئەو ئەرکە پێوەندیی بە دیاریکردنی ئەو خەتە هەوایییەوە هەبوو کە دەبوو ئەو پارچە یەدەکییانەی فڕۆکە F-4ەکان کە ئێرانییەکان لە ئیسرائیلیان کڕیبوون، لە ئیسرائیلەوە پێیدا بچنە ئێران. دە دەقیقە دواتر، کەڕرووبی بە کۆت و شەڵواری خۆرئاوایی و کراسی سپیی بێیەخە و بێکراواتەوە

دەگەڵ یەکێک لە هاوکارەکانی هات، سڵاوی لە ئامادەبووان کرد و یەکسەر چووە ژووری کۆنفرانس.

چەند دەقیقە دواتر «جۆرج بووش» لەحاڵێکدا «ویلیام کەیسی» بە قژە وەکدەزووەکانیەوە لە پێشیەوە دەرۆیشت لە ئاسانسۆر هاتە دەرێ. «جۆرج بووش» سڵاوێکی لە ئامادەبووان کرد و وەک کەرپرووبی بە پەلە چووە ژووری کۆنفرانس. مەودای نێوان ئاسانسۆر و ساڵۆنی کۆنفرانس و ئاسانیی تێپەڕین لە ئاسانسۆرەوە بۆ ساڵۆنی کۆنفرانس زۆر سەرنجڕاکێش بوو. دوا ڕوانینی من بۆ بووش لە دواوە و لەو ساتەدا بوو کە ئەو بە بەشێکی ساڵۆنی کۆنفرانسدا دەچووە پێش و ئیدی دەرگاکانی کۆنفرانس پێوە دران.

«بووش»، «کەیسی» و «کەرپروبی» و هاوڕێیەکەی چارەنووسی بارمتەکانیان لەو کۆنفرانسەدا ڕوون کردەوە. کڕینی کەرەسەی شەڕ لە ئیسرائیل، بە پەسندی ئەمریکاییە نارەسمییەکان (ئەو کەسانەی سەربە حکومەتی قانوونیی کارتەر نەبوون)، چەسپا. ماوەیەک دواتر ئەمن لە دەفتەری «ساگی» لە ئیسرائیل لە وردەکاریی ڕێککەوتننامەی نێوان «بووش» و کەرپرووبی ئاگادار بووم. بەندەکانی ڕێککەوتننامە هەر ئەو بنەڕەتانە بوون کە مانگی سێپتامبر لە ئامستردام لەلایەن ئیسرائیلییەکانەوە ئامادە کرابوون. بەو جۆرە کە بارمتە ئەمریکاییەکان بە دانی ٥٢ میلیۆن دۆلار لە لایەن ئەمریکاوە ئازاد دەکرێن، فرۆشتنی کەرەسەی شەڕ بە ئێران دەستەبەر دەکرێ. تەنیا جیاوازیی لە نێوان بەندەکانی ڕێککەوتننامەی پاریس و ئامستردامدا، کاتی ئازادکردنی بارمتەکان بوو. لەکاتێکدا لە دیداری ئامستردام قەرار وابوو بارمتەکان دەسبەجێ ئازاد بکرێن، لە کۆنفرانسی پاریس ڕێککەوتن کە بارمتەکان ٢٠ی ژانویەی ١٩٨١ کە «ڕەیگان» دەچێتە کۆشکی سپی ئازاد بکرێن.

ئەو کۆنفرانسە ئەوەندە نهێنی بوو کە دوو ڕۆژ دوای ئەوەی ئێمە پاریسمان بەجێ هێشت، هەموو پێشینەکانی بەشداریی ئەمریکایی-

یەکان و ئیسرائیلییەکان لەو کۆنفرانسەدا لە پاریس لەنێو چوون. لەبارەی ئێرانییەکانەوە ئاگادار نیم چۆن بوو.

ماوەیەکی کورت دوای ئەوەی ئێرانییەکان پارچە یەدەکییەکانی فڕۆکەی F-4یان وەرگرتن، کارتەر تەلەفونی بۆ «بگین» سەرۆک-وەزیری ئیسرائیل کرد و ڕقی خۆی پێڕشت. کەس نازانێ کارتەر چۆنی بەو بابەتە زانیبوو. بەڵام ئەمجارە «بگین» وەڵامی دایەوە کە عێراقییەکان خەریکن گەورەترین پاشەکەوتی نەوتی جیهان بەدەست دێنن و ئەم کارە بۆ مانی ئیسرائیل بە مەترسیدار دەژمێردرێ.

کاشانی بە وەرگرتنی پارچە یەدەکییەکانی فڕۆکە F-4ەکان زۆر خۆشحاڵ بوو. بەڵام لەوە کە فرۆشتنی کەرەسە جەنگییەکان بە وان تا هاتنەسەرکاری حکوومەتی «ریگان» - «بووش» وەدوا کەوتبوو، نارەحەت بوو. ئەو بە تووڕەیی و دڵئێشاوی گوتی: «ئەمریکایییەکان لە یەکەمین ساتەکانەوە کارەکەیان خەراپ کرد. بارمتەکانی وان دەیانتوانی لە نیوەی ساڵی ١٩٨٠دا ئازاد بکرێن و وڵاتەکەی ئێمەش ئێستا کەوتۆتە بەر هێرشی عێراقییەکان».

ڕۆژی ٤ی نۆڤامبری ساڵی ١٩٨٠، هەڵبژاردنی سەرکۆماری لە ئەمریکا بەڕێوە چوو. هەموو ئەوانەی لە کۆنفرانسە نهێنییەکانی پاریسدا بەشدار بوون، لە ئاکامی هەڵبژاردن و لەوە کە بارمتەکان چ-ماوەیەکی دیکە دەبێ لە زیندانەکەیاندا لە تاران ئازار بچێژن بە باشی ئاگادار بوون.

هەرچەند، لە قووڵایی تاریک و تنووکی عەمەلیاتی جاسووسیدا، عادەتەن تووشی کڕین و فرۆشتنی کەرەسەی شەڕ دەبین، بەوحاڵە قایدە و قانوونێکیش لەوبارەیەوە هەیە. بەڵام لە ساڵی ١٩٨٠دا ئێمە دیتمان کە ئەمریکایییەکان ئەو قایدە و قانوونەشیان پشت گوێ خست و لەو هەورازتر چوون.

ڕەفتاری ئەمریکا لەو بارەیەوە کە کۆمەگی سەربازی بە ئێران تا ژانویەی ١٩٨١ دوا بخرێ، زۆر لە کاربەدەستە پایەبەرزەکانی حکوومەتی ئیسرائیلی نیگەران کرد. ئەگەر قەرار بوو ئێران بتوانێ بەرامبەر بە دەستدرێژیی عێراق بەرگری لەخۆی بکا، ئەم کارە دەبوو دەسبەجێ ئەنجام بدرێ. ئامانجی سەددام حوسێن لە دنیای عەرەبدا مەزنیخوازی بوو و ئەمە گەورەترین مەترسیی بۆ بوون و مانی ئیسرائیل تێدا بوو. بۆیە، بە باوەڕی ئیسرائیل، دەبوو سەددام حوسێن پێشی پێ‌بگیرێ.

پاییزی سالی ١٩٨٠، «بگین» سەرۆکوەزیری ئیسرائیل دەستووری دا «یەهۆشوا ساگی» سەرۆکی هەواڵگریی هێزە دیفاعییە سەربازییەکانی ئیسرائیل و «ناچووم ئەدموونی» سەرپەرستی «مۆساد»، کۆمیتەیەکی هاوبەش لە هێزە دیفاعییەکان و ڕێکخراوی هەواڵگریی سەربازیی ئیسرائیل، بۆ پێوەندییەکانی ئێران و ئیسرائیل پێکبێنن. ئامانجی ئەو کۆمیتە هاوبەشە هاوهەنگاوکردنی هەوڵەکانی هەردوو ڕێکخراوی هەواڵگری بۆ ئامادەکردن و فرۆشتنی کەرەسەی شەڕ بە ئێران بە مەبەستی شەڕ دژی سەددام حوسێن بوو.

هۆکاری کۆمەگی ئیسرائیل بە خومەینی ڕوون بوو. ئەگەر ئێرانییەکان بەرامبەر بە عێراق شەڕیان کردبایە، سەربازانی وان لە جیاتی سەربازانی ئێمە دەکوژران. جگە لەوەش، شەڕ لە نێوان ئێران و عێراق، نەکهەر سەرنجی عەرەبەکانی لە ئیسرائیل وەردەگێڕا بەڵکوو دەبووە هۆی تەواوبوونی پووڵی ولاتانی عەرەبییش. لە ڕوانگەی حیزبی لیکوودەوە، پاش کۆنفرانسی «کەمپ دێڤید»، ئیسرائیل گرنگیی خۆی وەک سەرمایەیەکی ستراتیژیکی بۆ ئەمریکا لەدەست دابوو. وڵاتە نەرمڕۆکانی عەرەب وەک، میسر، عەرەبستانی سعوودی، و ئۆردۆن هێشتا دژی ئیسرائیل بوون، بەڵام دەگەڵ دەوڵەتی ئەمریکا لێکیان گرێدابوو و ئیسرائیل ڕۆژبەڕۆژ پتر لە

دنیـادا تـەریک دەمایـەوە. بۆیـە دەرکـەوتنی خومـەینی لـە ئێـران، بـۆ ئیسرائیل نیعمەتێک بوو کە بە درێژایی ساڵان کەمتر لەو ناوچەیەدا ڕووی دابـوو. خومــەینی کەسـێکی ڕادیکـاڵ، دژی ئـەمریکایی،و دژی عـەرەب بـوو. ئـەو دەتگوت بـۆ وەدیهێنـانی ئامانجـەکانی ئێمە هاتۆتـە سـەر کـار و ئێمـە لـەو بـاوەڕەدا بـووین کـە قـازانجی نیشـتمانیی ئێمـە لەوەدایە یارمەتیی بدەین.

پێـنج ئەنـدامی یەکـەمی کۆمیتـەی هاوبـەش کـە چـوار کەسـیان لـە کۆنفرانسـی مێژوویـی ئۆکتـۆبری ١٩٨٠دا لـە پـاریس بەشـدار ببـوون، هـەموویان کەسـانێک بـوون کـە لـە سیاسـەتی نێونەتـەوەیی، مێـژوو، بازرگانی، بانکداری، قانوون و کەرەسەی شەڕدا ئەزموونێکی زۆریـان هەبوو. ئەو پێنج کەسە بریتی بوون لە:

-«دیڤیـد کیمچــە» Devid Kimche، گــەورە ئەنــدامی ڕێکخــراوی هــەواڵگریی ئیســرائیل و ســەرۆکی «تیڤێـل». «کیمچــە» کەسـێکی دەرسخوێندوو بـوو و لـە بـواری زانسـتە کۆمەڵایەتییەکانـدا دوکتـۆرای وەرگرتبوو و زۆربەی خزمەتەکانی لە ڕێکخـراوی هەواڵگریـدا ئـەنجام دابوو.

-«شـەمووئێل مۆریــە» Shmuel Morieh، ڕاوێژکـــاری قـــانوونیی SHABAK، ڕێکخـــراوی ئەمنیـــەتی نێوخـــۆیی ئیســـرائیل. «مۆریــە» جوولەکەیەکی عێراقی بوو و کاروباری قـانوونی و قەرارومـەدارەکانی کۆمیتەی هاوبەشی بەڕێوە دەبرد.

-«یووری سیمچۆنی» Uri Simechoni، پلـەی سـەرتیپی هـەبوو و لـە دەورانـی جیـاوازدا، جێگـری سـتادی عەمـەلیاتیی هێـزە دیفاعییـەکانی ئیسـرائیل و پاشـکۆی سـەربازیی ئیسـرائیل لـە واشـینگتۆن بـوو. ئـەو هـەروەها سـەرۆکایەتیی تیپـی هـەڵبژاردەی پیـادە نیزامـی «گـۆلانی» Golaniی لە ئەستۆ بوو.

-«مۆشــێ هێبرۆنــی» Moshe Hebroni، ســەرگوردێکی لاو بــوو کــە ســەرۆکایەتیی ســتادی ڕێکخــراوی هــەواڵگریی ســوپای ئیســرائیلی لــە ئەستۆ بوو.

-«ڕافی ئەیتان» Rafi Eitan، ڕاوێژکاری دژی تیرۆریزمی ســەرۆک-وەزیــر بــوو. ئــەو پیــاوێکی ڕیوەڵــە بــوو، وەک کەروێشــک بەڕێــدا دەڕۆیشت و جلکی ڕەحــەتی هــەرزانبــایی دەبــەر دەکــرد. ئــەو تــەنیا مێشک و کارکوشتەی چالاکییە نهێنییەکانی کۆمیتە بوو.

هەموو ئەو کەسانە دوو بەهرەی گرنگیان هەبوون: یەکەم ئەوە کە، هــەموویان لــەباری مێشــکەوە زۆر زیــرەک و لێوەشــاوە بوون، دووەم ئــەوە کــە بــۆ گەیشــتن بــە ئامــانج چاویــان لــە هــیچ نەدەترســا. لــەوەش بگوزەرێ، هەموو ئەوانە دەستیان دەگەیشتە زانیارییەکانی ڕێکخــراوی هــەواڵگریی ئیســرائیل و بــۆ خــەرجی دراوی زۆریــش دەســەلاتیان پــێ-درابوو. دیارە بەوپێیە ئەوان دەسەلاتێکی سەرسوڕهێنیان هەبوو.

ڕۆژی ٢٨ی نۆڤــامبری ١٩٨٠، ئــەمنیش ڕەگــەڵ ئــەو کۆمیتــە هەڵبژاردەیــە کــەوتم. چونکــە لەوکاتــەدا ئــەمن ٣٩ســاڵە بــووم، بــە گەنجترین ئەندامی کۆمیتەکە دەژمێردرام، فارسیم باش قســە دەکــرد و لــەبارەی ئێرانــەوە ئــەزموونێکی کەســیی زۆرم هــەبوو. ئاشــکرایە کــە ئــەمن دەبــوو لــە پــلەی خــوارەوەی کۆمیتــەدا ئــەرک بــەجێ بێــنم و دەستپێشــخەرییەکانی کۆمیتــە بــەڕێوە بــەرم. لەحاڵێکــدا ئەندامــەکانی دیکەی کۆمیتە وەک مێشکی کۆمیتە کاریان دەکرد.

ئــەم کــارە بــۆمن زۆر هەژێنــەر بــوو. ئامــانجی سیاســیی کۆمیتــەی هاوبــەش دەگــەڵ شــێوەی بیرکردنــەوەی مــن بــە تــەواوی دەهاتــەوە، چونکە ئەمن لەو باوەڕەدا بووم کە دەستدرێژیی عێراق بۆ ســەر ئێران دەبێ بوەستێندرێ و لە شەڕ دژی ئەو وڵاتەدا یارمەتیی ئێران بدرێ. ئاشکرایە، لــە تــەواوی ئــەو هەشــت ســاڵەدا کــە شــەڕی ئێران و عێراق درێژەی هــەبوو و لــەودا ســەدان هــەزار کــەس لــە خــەڵک یــان گیانیــان

لەدەست دا یان بریندار بوون، ئەمن تەنانەت یەک جاریش نەچوومە بەرەی شەڕ تا لە نیزیکەوە ئاکامە سامناکەکانی ببینم.

دیسامبری سالّی ١٩٨٠، مەئمووریەتێکی گرنگم پێسپێردرا. ژەنراڵ «ساگی» سەرۆکی ئیدارەی پێوەندییەکانی دەرەوەی ڕێکخراوی هەواڵگریی سوپا، منی بانگ کردە دەفتەری خۆی. ئەمن وام هەست کرد کە دەیەوێ لەبارەی کارە نهێنییەکانی ئیسرائیل لە پێوەندی دەگەڵ ئێراندا ئەرکێکم پێ بسپێرێ. بەلاّم یەکەمین قسەکانی منیان سەرسام کرد. ئەو گوتی: «ئاری، ئەمن دەمەوێ ئەرکی ئێرەیی‌بزوێنی وەرگرتنی ٥٢ میلیۆن دۆلاّرت پێ‌بسپێرم».

پێش ئەوەی زار هەڵێنمەوە، ئەو لێی زیاد کرد: «ئەم مەئمووریەتە دیارە بەشێک لە ئەرکەکانی کۆمیتەی هاوبەش نیە - بەڵکوو بەشێک لە موعامەلەیەکە کە ئێمە لەبارەی ئازادیی بارمتە ئەمریکاییەکانەوە دەگەڵ ئەمریکا ڕێکمان خستوە. کورت و کرمانجی، پێش دەست- پێکردنی ڕێورەسمی بەدەستەوەگرتنی دەسەلاّت لەلایەن کۆمارخوازەکانەوە لە ڕۆژی ٢٠ی ژانویەدا، دەبێ بڕی ٥٢ میلیۆن دۆلاّر بدرێ بە ئێرانییەکان».

گوتم: «زۆرباشە، بەلاّم دراوەکە دەبێ لە چ‌بانکێک وەرگرم».

«ساگی» لە حاڵێکدا لە دەفتەری کاری خۆیدا پیاسەی دەکرد، کەمێک ڕاما و گوتی: «ڕاستت بوێ ئەم مەئمووریەتە کارێکی ئاسان نیە. ئەتۆ دەبێ بچیە گواتمالا. لەوێ سەرۆکی نوێنەرایەتیی سیاسیی عەرەبستانی سعوودی ٥٦ میلیۆن دۆلاّرت تەسلیم دەکا...».

«٥٢ میلیۆن دۆلاّر».

«نا، ٥٦ میلیۆن دۆلاّر. چوار میلیۆن دۆلاّر دەبێ بڕژێتە حیسابێکی دیکەوە».

فێر کرام کە ٤ میلیۆن دۆلاّرە زیادییەکە دەبێ بخەمە لقی ناوەندیی «بانکی نیشتمانیی ڤالی ئەریزۆنا» Valley National Bank of Arizona کە

کەوتۆتە Cambleback Road ی شاری «فینیکس» Phoenix. ئەو ژمارە حیسابە کە دەبوو چوار میلیۆن دۆلارەکەی تێبکرێ و بەناوی «ئارل بریان» بوو، دایە دەستم. پاشماوەی دراوەکە کە ٥٢ میلیۆن دۆلار بوو، دەبوو لە ئورووپا بدرێ بە کاشانی.

ئەم دەستوورە تووشی سەرسوڕمانی کردم. ئاخر بۆ گواتمالا؟ بۆ سعوودییەکان؟ بۆچی «ئارل بریان؟»؟

«ساگی» بە ساردی تەماشایەکی کردم و گوتی: «ئەمن نابێ بۆت شی بکەمەوە کە بۆ بەشی هەرە زۆری ئەم دراوە چتەرتیبێک دراوە. ئەتۆ بۆخۆت دەزانی کە ئێرانییەکان بە ڕوون و ڕاشکاوی گوتیان دەبێ ٥٢ میلیۆن دۆلار بدرێ بە ڕێبەرە ڕادیکاڵەکانیان، لەوێ بووی. ئایەتوڵلا خومەینی، کۆنترۆڵی هەموو شتێکی لەدەستدا نیە و ئەوان پێیان خۆش نیە لە ئێران کێشەیەکی سیاسی دروست بێ. ئەمریکایی-یەکان ناتوانن ئەم دراوە لە بوودجەی ئەمریکا بدەن. چونکە ئەو ئەمریکایییانە کە ئێمە سەروکارمان لەگەڵیان هەیە، هێشتا لەم وڵاتە دەسەڵاتیان بەدەستەوە نەگرتوە. بۆیە ئەوان داوایان لە دۆستە سعوودییەکانیان کردوە ئەم کارەیان بۆ جێبەجێ بکەن».

«داخوا ئەم دراوە هی عەرەبستانی سعوودییە؟»؟

«نا، هی CIAیە، بەڵام سعوودییەکان کاروبارە بانکییەکەیان ڕێک-خستوە».

وردەوردە بەتاڵایی مێشکم پڕ دەبۆوە. ئەمنیش، وەک زۆر کەسی دیکە، دەمزانی کە باندێک لە ئەفسەرانی هەواڵگریی ئیسرائیل کە لە ئەمریکای ناوەندی، خەریکی قاچاغچییەتیی مادده هۆشبەرەکان و کەرەسەی شەڕ بوون لەلایەن CIAوە پشتیوانییان لێدەکرێ.

لە ژەنراڵ «ساگی»م پرسی: «داخوا ئەم دراوە لە سوودی قاچاغی مادده هۆشبەرەکان لە ئەمریکای ناوەندی بەدەست هاتوە؟»؟

«زۆرم پرسیار لێدەکەی براله.».

«ساگی» تەنانەت دەگەڵ منیش بە پارێز و هەڵسەنگاندنەوە ڕەفتاری دەکرد. هەرچەند ئەو بۆچوونەکەی منی پشتڕاست نەکردەوە، بەڵام لە ئاکامی ئەو پێوەندییە درێژخایەنەدا کە دەگەڵ ڕێکخراوی هەواڵگریی ئیسرائیلدا هەمبوو دەمتوانی وای بۆ بچم کە ئەو دراوە لە قازانجی ماددە هۆشبەرەکان لە ئەمریکای ناوەندی کە لەلایەن هێندێ کەسی ئیسرائیلییەوە بۆ CIA ئەنجام دەدرێ بەدەست هاتوە و عەرەبستانی سعوودی، لەو نێوەدا، ڕۆڵی پەردەپۆش دەگێڕێ. دواتر ڕوون بۆوە کە بۆچوونەکەم لەوبارەیەوە بە تەواوی دروست بووە.

ئەمن بە هەستکردن بە دڵئێشانێکی خۆکرد و ناواقعی لەدڵی خۆمدا گوتم: «هاوار لە خۆم، ئەوان لە منیان دەوێ دراوێکی پیس کە لە قاچاغی کەرەسە هۆشبەرەکان بەدەست هاتوە، دەگەڵ خۆم بەرم». ئەگەر بەڕاستی سووکایەتی بە هەستی ئینسانیی من کرابوو، دەبوو دەسبەجێ دەست لە کار بکێشمەوە. بەڵام وام نەکرد. ئەمن نەفرەتم لەوەیە پێی لێنێم کە زۆر ئۆگری ئەم کارە بووم و پتر لەوە کە بتوانم وازی لێبێنم، بۆ من هەژێنەر بوو.

بە «ساگی»م گوت، گومرکی ئەمریکا ڕێگا دەدا ئەمن ئەو هەموو دراوە بێنمە وڵاتی ئەمریکا و پێشم چەقاند، دەبێ کەسێک ئەو دراوە لەمن وەرگرێ کە دەسەڵاتی تەواوی هەبێ. هەروەها پێم داگرت کە گومرک لەو بارەیەوە پسوولەی وەرگرتنم بداتێ، چونکە قەرار بوو، بەشێک لەو دراوە لە بانکێکی ئەمریکاییدا بە ئەمانەت دابنێم.

«ساگی» گوتی: «کەسێکی گرنگ لە فڕۆکەخانە چاوەڕێت دەبێ. ئێمە پێمان خۆشە وای ڕێکبخەین کە ڕابێرت گەیتس بۆخۆی بۆ وەرگرتنی تۆ بێتە فڕۆکەخانە». لە ڕوانگەی منەوە ئەم بابەتە گیروگرفتێکی تێدا نەبوو. ئەگەر قەرار بوو «ڕابێرت گەیتس» دەستەبەری گەیشتنی من بە ئەمریکا بە چەندین میلیۆن دۆلاری

ناقانوونییەوە بێ، بۆ من بێئەندازە جێی خۆشحاڵی بوو کە جارێکی دیکە چاوم پێی بکەوێ.

پاشان «ساگی» ئەرکێکی دیکەشی پێسپاردم: ئەمن دەبوو دوو چەکی بانکی لە ئورووپا بخەمە حیسابەوە. ئەم دوو چەکە هی سوودی ئێمە لە فرۆشتنی تەگەری فڕۆکە F-4ەکان و پارچە یەدەکییەکان بە ئێرانییەکان بوون. سوودی تەگەری فڕۆکە F-4ەکان بڕی ١٠٥ هەزار دۆلار و سوودی پارچە یەدەکییەکان ٨٥٠ هەزار دۆلار بوو. بۆیە، تەنانەت پێش ئەوەش کە کۆمیتەی هاوبەش دەست بە فرۆشتنی کەرەسەی شەڕ بە ئێران بکا، ئێمە ٩٥٥ هەزار دۆلارمان دەست کەوتبوو کە ئەمە هەوەڵین بەشی «سەرمایەی ڕەش»ی پێک-دێنا. کۆمیتەی هاوبەش بەناوی «دراوێ عەمەلیاتی» کەلکوەرگرتن لەو دراوەی دەست پێکرد. «ساگی» هەروەها فێری کردم کە بۆ ئەم حیسابە دەبێ سێ کەس هەقی ئیمزایان هەبێ، خۆم و دوو کەسی دیکە. ئەو لێی زیاد کرد کە کۆنترۆڵچیی «مۆساد»یش دەبێ ئاگای لەو دراوانە هەبێ کە دێنە ئەم حیسابەوە یان لێی دەردەچن. بانکێک کە بۆ هەردوو دراوەکە -هەم ئەو دراوەی دەبوو بدرێتە ئێرانییەکان و هەم ئەوەی دەبوو بخرێتە حیسابی «سەرمایەی ڕەش»ەوە- دانرابوو، بانکی «وۆرمز» Worms لە ژنێڤ بوو.

کۆتایی مانگی دیسامبر تەلەفونم بۆ سەید مەهدیی کاشانی کرد و گوتم، بڕی ٥٢ میلیۆن دۆلار ئامادەی تەحویلدانە. ئێرانییەکانیش کەلکیان لە بانکی «وۆرمز» وەردەگرت و کاشانی پێی‌گوتم کە کارەکانی بانک ڕێک دەخا، بەوجۆرە کە ئەو کلیلی ئەمانەتییەکانی خۆی لە لای بەڕێوەبەری بانکەکە دادەنێ و پێی دەڵێ کە ئەمن بە نیشاندانی پاسپۆرتەکەم بە بەڕێوەبەری بانک، بتوانم دەرگای سندووقەکە بکەمەوە و دراوەکە وەک ئەمانەت لەوێ دانێم. ئەمن بۆ ئەو مەبەستە ژمارەی پاسپۆرتەکەمم وە کاشانی دا.

سەرەتای ژانویە ئەمن لە ڕێگای «مەیامی»یەوە چوومە گواتمالا و لە هۆتێل «فیەستا» Fiesta جێگیر بووم، بەیانیی ڕۆژی دواتر تەلەفونم بۆ ژمارەی سەرۆکی نوێنەرایەتیی عەرەبستانی سعوودی لە ئەمریکای ناوەندی، کە پێشتر پێم درابوو، کرد. باڵیۆزی عەرەبستان لە ئەمریکای ناوەندی لە «کۆستاریکا» دادەنیشت، بەڵام بە سەردان هاتبووە گواتمالا.

گوتم: «پێموایە دەبێ چاوێکمان بە یەکتر بکەوێ».

ئەو گوتی: «بەڵێ، دەبێ پێش هەر دان و ستاندنێک لەو بارەیەوە یەکتر ببینین».

ئەو شەوە ئەمن بە ترومبێلێکی کرێ چوومە «ئانتیگ» Antigua کە پێتەختی کۆنی ئیسپانیایی گواتمالا بووە و ئێستا ناوەندی گوزەراندنی خەڵکی پووڵدارە. تیشکی درەوشاوە، ڕێستوورانەکان و ناوەندەکانی شەوبێداری کە لەنێو خانەقا و کلیساکانی ڕاهیباندا سەریان گەیاندبووە ئاسمان، شارەکەیان دەخستە بەرچاو. دیارە زۆر لەو خانەقا و کلیسایانە لە ئاکامی ئەو بوومەلەرزانەدا کە سالانێکی دوورودرێژ لەم شارەدا ڕوویان دابوو، بەسەختی ئازاریان دیبوو.

ئەمن ئادرەسی ڕێستوورانێکی ئیتالیاییم کە پێیان گوتبووم دەبێ بچمە وێ، دیتەوە و بە ئاسوودەیی لە پشت مێزێک دانیشتم. سەعاتی دیدارەکەمان ٧ی دوای نیوەڕۆ بوو، بەڵام ئەمن ١٥ دەقیقە پێشتر گەیبوومە ڕێستووران. ڕاست سەعات ٧، لە ڕێستوران جموجۆڵ و هەژانێک دروست بوو. هەروەک پێشخزمەتەکانی ڕێستووران بەرەو دەرگا ڕاپانکرد، مشتەرییەکانی ڕێستوورانیش کە خەریکی نانخواردن بوون چاویان بڕیە پەنجەرەکانی ڕێستووران. لیمۆزینێکی ڕەشیش لە شەقامی سەنگچنی پێش ڕێستوورانەکە ڕاپگرت. بۆ من زۆر ئاسان بوو کە ئەو بناسم، ئەم پیاوە، هەر ئەو کەسە بوو کە چاوەڕوانی بووم. پیاوێک بوو لە ساڵەکانی چلەمی تەمەنیدا. جلەکانی ڕازاوە

بوون و ڕیشێکی بزنانەی کورتی دانابوو. هەرکە گەیشتە ڕێستووران، ئەویش منی ناسی و هات بۆ لام. پاشان پێکەوە دەستمان بە خواردن کرد. ئەو شەڕابی دەخواردەوە و ماوەیەک لەبارەی شەڕی ئێران و عێراقەوە پێکەوە دواین. پاشان ئەو هاتە سەر ئەسڵی مەبەستەکە.

سبەینێ بەیانی هاوکارێکی سەرۆکی ئەمنیەت و هەواڵگریی عەرەبستانی سعوودی دێتە هۆتێلەکەی من و بڕی ٥٦ ملیۆن دۆلارم دەداتێ. چل ملیۆنی ئەم دراوە، چل چەکی یەک ملیۆن دۆلاریی بانکە کە دەبێ لە بانکی «وۆرمز» وەرگیرێ.

«ئەوی دیکەی نەغد دەبێ جەنابی بن مۆناشێ».

«بەڵام، ئەو ١٦ ملیۆن دۆلار دەبێ.».

گوتی: «نیگەران مەبە. هەرچەند چوار ملیۆنی سەد دۆلارییە، بەڵام ئەوی دیکەی هەزار دۆلاری دەبێ.».

گوتم: «وام دێتە بەرچاو کە بارستاییەکەی زۆر گەورە دەبێ. دیارە ئەمن پێویستیم بە جانتایەکی زۆر گەورە دەبێ».

ئەو قاقا پێکەنی و دڵنیای کردم کە دراوەکە بە جانتاوە دەدرێ بە من. ئەمنیش دەگەڵی پێکەنیم، بەڵام دەمزانی کە ١٦ ملیۆن دراوی نەغد بێزەحمەت نابێ. داوام لێکرد بەڵگەیەکی بانکیی ئەو دراوەم بدرێتێ کە بە نەغد دەگەڵ خۆمی دەبەم، تا بزانرێ کە بە شێوەی قانوونیم وەرگرتوە.

بەیانیی ڕۆژی دواتر سەری سەعاتی ٩ تەلەفونەکەم زەنگی لێدا. ئەوەی پشت خەتی تەلەفون کە لە سالۆنی پێشوازیی هۆتێلەوە قسەی دەکرد، خۆی وەک «فەیسەڵ قەوس» لە عەرەبستانی سعوودی ناساند.

گوتم: «بۆچی تەشریفت نایەتە سەرەوە؟» ئەمن بەرەو پەنجەرەی ژوورەکە ڕۆیشتم و لە گەورەترین شاری ئەمریکای ناوەندی و خانووە میچسوورە لەبەریەکچووەکان و باڵەخانەکان و ناوەندە

ئیداری و بازرگانییە چەند نهۆمەکانیەوە ڕامام. «فەیسەڵ قەوس» ناوێک بوو کە پێشتر بیستبووم.

ئەو کەموزۆر هاوتەمەنی من بوو و لە باری لەشییەوە بەخۆوە دەهاتە بەرچاو. لەحاڵێکدا جانتایەکی ڕەشی گەورەی «سامسۆنێت»ی بە زەحمەت هەڵدەگرت و کیفێکی چەرمیشی لە بنهەنگڵدا بوو، هاتە ژوورەکەم. پێش ئەوەی دەرگا پێوە درێتەوە، ئەمن لە یەکساتدا قەڵافەتی زەبەلاحی پارێزەرێکم (کە دەگەڵ ئەو بوو) لە ڕاڕەوی هۆتێلەکەدا دیت و تێیەوە ڕامام. دڵنیا بووم پێشتر ئەوم دیتوە و دەمناسی.

ئەویش زۆر بە وردی تەماشای منی دەکرد. لە منی پرسی: «ئێوە لە تاران گەورە بوون؟».

«بەڵێ».

دەستی لە شانم دا و گوتی: «بەڵێ،بەڵێ، ئێمە یەکتر دەناسین. ئێمە هاوپۆلی یەکتر بووین. ئەمن کوڕی سەرۆکی نوێنەرایەتیی عەرەبستانی سعوودی لە تاران بووم. ئێمە لە (قوتابخانەی کۆمەڵگەی ئەمریکایی) لە یەک پۆل دەمانخوێند.

هەموو بیرەوەرییەکانی پێشوو لەبەر چاوم زیندوو بوونەوە. ئەمن هێشتا کتێبی کۆنی ئەو ساڵەی قوتابخانەم کە جەدوەلی تێدا چاپ کرابوو، لە ماڵەکەی ئیسراییلم هەیە.

«قەوس» جانتایەکەی فڕێ دایە سەر تەختەکە و کلیلەکەی وێدام.

گوتی: «دەکرێ بێزەحمەت بیکەیەوە.»

ئەمن جانتاکەم هەڵگرت و دەرکەکەیم هەڵێنا. هەرگیز لە ژیانمدا ئەوەندەم پارە نەدیبوو. جانتا پڕ لە ئەسکیناسی ١٠٠ دۆلاری و ١٠٠٠ دۆلاری بوو کە تێکپەستێورابوون.

ئەو گوتی: «١٦ میلیۆن دۆلار.» پاشان پاکەتێکی سپیی گەورەی لە کیفەکەی بنهەنگڵی دەرهێنا و گوتی: «ئەمەش ٤٠ میلیۆن دۆلار

چەکی ١ میلیۆن دۆلاری.» ئەمن تێیەوە ڕامام. چەکەکان بەناوی ئەو بانکەوە کێشرابوون کە دەبوو لەوێ بیخەمە حیسابەوە. دیارە دراو هەمیشە بە سەفەرکردن لە ناسنامەی ئەسڵیی خۆی پاک دەکرێتەوە.

پرسیاری کرد: «بۆ نایانژمێری؟».

ئەمن چەکەکانم ژمارد، ڕاست چل چەکی یەک میلیۆن دۆلاری بوون نە کەم و نە زیاد. ئەوانەی سەروکاریان دەگەڵ ئەو جۆرە دراوانە هەیە، هیچوەخت هەڵە ناکەن.

دووبارە چاوم لە نێوئاخنی جانتایەکە کردەوە.

«قەوس» پرسی: «پێت خۆشە بیانژمێری؟» و پێش ئەوەی زار هەڵێنمەوە، ماشێنحیسابێکی لە کیفەکەی دەرهێنا و ئێمە دەوری سەعاتێک خەریکی ژماردنی ئەسکیناسەکان بووین. هەموو شتێک تەواو بوو. ئەمن ٤ میلیۆن دۆلارم لەو دراوە کە دەبوو بخرایە حیسابی «ئارل بریان»ەوە بە زۆری ئاخنیە چەند کیسەیەکی نایلۆنیی تایبەتی جلشۆر کە لە قەفەزەیەکی هۆتێلەکەدا دۆزیبوومنەوە، پاشان کیسە نایلۆنەکانم لەسەر دراوەکەی دیکە دانا و جانتایەکەم داخست. ئەمجار «قەوس» ئەو بەڵگانەی دامێ کە تایبەتی پووڵهەڵگرتن لە حیسابی بانکی «وۆرمز» بوون و گوتی: ئەم بەڵگانە نیشان دەدەن کە ئەتۆ کوتەکت لە سەری کەسێک نەداوە و پارەکەیت نەدزیوە».

«ئێوە ئەو دراوەتان لێرە چۆن کۆ کردۆتەوە؟».

ئەو زۆر بە جیددی وەڵامی دایەوە: «ئەمە کاری ئێمەیە».

ماوەیەک دواتر کە بەوەختی گواتمالا پێشنیوەڕۆ، بەڵام بەکاتی ئیسرائیل شەو بوو، تەلەفونم بۆ ئیدارەکەم لە ئیسرائیل کرد و ئاگادارم کردن کە سبەینێ بەیانی دەچمە ئەمریکا و ژمارە فڕینەکەی کۆمپانیای Eastern یشم دانێ و گوتیشم بەوجۆرەی مزگێنیم پێ-دراوە، هیوادارم لە فڕۆکەخانە «ڕابێرت گەیتس» ببینم.

پێیان گوتم: «نیگەران مەبە، هەموو کارەکان ڕێک خراون».

ئەمن هەروەها داوام کرد خەبەر بە بەرپرسی بانکەکەی «فینێکس» بدرێ کە ئەمن ٤ میلیۆن دۆلار دەدەمە لقی ئەو بانکە و ئەو دەبێ لەو لقە چاوەڕوانم بێ.

ئەو شەوە ئەمن خەوی ئارامم نەبوو. هێندێ وەخت لەخەو هەڵدەستام لەسەر تەختەکە دادەنیشتم و چاوم لەو جانتا و کیفە دەکرد کە چەکەکانی تێدا بوون و «قەوس» پێیدابووم.

فڕۆکەکە قەرار بوو سەعات ٨ی بەیانی بەرەو مەیامی بفڕێ. ئەمن سەعات ٥ی بەیانی جانتا و کیفەکە و جێلیباسێکم کە ماشێن- حیسابێکیشی تێدا بوو، لەسەر کورسیی دواوەی ئەو ترومبێلە کە بە کرێم گرتبوو دانا و لێمخوڕی بەرەو فڕۆکەخانە. پاشان ترومبێلەکەم دایەوە بە کۆمپانیایەکەی و باجی فڕۆکەخانەم دا و چوومە بەردەم کۆمپانیای فڕۆکەوانیی Eastern.

لێیان پرسیم: «جانتاتان پێیە؟».

«نا، ئەمن هەموو شتەکانم دەبەمە نێو فڕۆکە.».

کارمەندەکە کە ژنێکی ژاپۆنی بوو، چاوێکی لە جانتاکە کرد و گوتی: «ئێوە ناتوانن ئەو جانتایە دەگەڵ خۆتان بەرنە نێو فڕۆکە».

«ئەمن بە بلیتی دەرەجە ١ سەفەر دەکەم و هەقم هەیە دەگەڵ خۆمی بەرمە نێو فڕۆکە. بەشی دەرەجە ١ جێی بۆ جانتای وا هەیە».

«نا، ئەوە ناکرێ. دەبێ بیخەینە شوێنی باری موسافیرانەوە و ئێوە کە گەیشتنە جێ وەریدەگرنەوە».

ئەمن نەمدەتوانی لەوێ ببزووم. ئەو تەلەفونی بۆ سەرپەرستەکەی کرد. ئەو چاوێکی لە ڕوخسارم -کە پێداگرتن لەسەر ئامانجی تێدا دەهاتە بەرچاو- کرد، تەماشایەکی بەشی دەرەجە ١ی فڕۆکەکەی کرد و دیتی بەتاڵە و پاشان بە ژنەکەی گوت: «ئەمە هەقێکی موسافیرە،لێیگەڕێ جانتایەکەی بەرێتە نێو فڕۆکە».

ئـەو کاتـە فرۆکەخانـەی گواتمـالا دەزگـای ئـەلیکترۆنیی کـۆنترۆڵی موسـافیرانی نـەبوو، بـەڵام کە لـە بەشـی گـومرگی فرۆکەخانـە نیزیـک دەبوومەوە، هەمووان چاویان تێوە بڕیبووم. ئەمن نـەکـهـەر زێدەبارم نەبوو، بەڵکوو هەموو ئەوەی پێم بوو لە ڕادەی ئاساییش کـەمتر بـوو، بـەڵام چونکـە پێم دادەگـرت کـە شـتەکانم دەگـەڵ خـۆم بـەرم [بۆ نێو فرۆکە]، بۆیە گاردە نیشتمانییەکان لە وەزعی من کەوتبوونە گومـان و خۆیان ساز کردبوو لێکۆڵینەوەم دەگـەڵ بکـەن، بـەڵام ئـەمن پاسـپۆرتە سیاسییەکەمم پێ نیشان دان و ئەوان بە دیتنی جۆری پاسپۆرتەکەم کشانەوە. پاسپۆرتەکەم مۆر کرا و وەڕێ کەوتم بۆ ژووری.

کەمێک پێش هـەڵفڕینی فرۆکـە، نـاوی مـن و موسـافیرێکی دیکـە -کـە ئەویش بلیتی دەرەجە ١ی هەبوو- خوێندرایەوە. ئیشـکەرانی فرۆکەکـە لێیـان پرسـیم کـە بـۆچی جانتاکـەم لەگـەڵ خـۆم بردۆتـە نێـو فرۆکـە. وەڵامم دایەوە کە ئیزنم وەرگرتوە. ئـەوان بۆڵەیـەکیان کـرد و ڕێگایـان دا لەجێی خۆم دانیشم.

لـە حاڵێکـدا فرۆکەکـە بـە بـەرزایی ٣٢٠٠٠ پـێ بەسـەر دەریـای «کاراییب» (کاریبی)دا دەفڕی گرنگیی تایبـەتیی ئـەو مەئمووریەتـە کـە بە من سپێردرابوو، وەهۆش خۆی هێنام. چەند مانگ بـوو دنیـا چـاوی بڕیبـووە ئـەو هەوڵـە دیپلۆماتییانـەی بـۆ ئـازادیی ئـەو بارمتانـەی لـە نوێنەرایەتیی سیاسیی ئەمریکا لە تاران بە بارمتـە گیرابوون، دەدران. ئەوان چاوەڕێی دیتنی ئاکامی ئەو هەوڵانە بوون. هیچکەس ئاگای لـەو فرووفێڵانـە نـەبوو کـە لـە مادریـد و بارسـیلۆن و ئامسـتردام و پـاریس بـەکار برابـوون. بێگومـان بارمتـەکان خۆشـیان نـەیاندەزانی چـۆن بـۆ قازانجی سیاسی کەلکیان لێوەردەگیرێ. ئێستا کاتی ئـەوە هـاتبوو کـە بنبەستی نێوان ئێرانی و ئـەمریکایی‌یـەکان لـەو بارەیـەوە کۆتـایی بـێ. بۆیـە ئـەمن دەبـوو ئەوپـەڕی هـەوڵی خـۆمم دابایـە تـا دڵنیـا بـم کـە

نێوئـاخنی جانتاکـەم و ئـەو کیفـە چەرمـەی لەسـەر کۆشـم بـوو، بـە سڵامەتی بگەنە جێ.

کاتێک فڕۆکەکـە لەسـەر ئەیالـەت (ویلایـەت)ی فلۆریـدا دەسـتی بـە هاتنەخوار کرد، ئەمن کەوتمە بیری ئەو ڕووداوانە کە لە پێشدا بوون. داخوا بەڕاستی، «ڕابێرت گەیتس» لە فڕۆکەخانە چاوەڕێم دەکا؟ یان لـە فڕۆکەخانـە دەکەومـە بـەر پـەلاماری لەنـەکاوی کۆمـەڵێک لـە کارمەنـدانی گـومرگ و FBI. چونکـە ئەگـەر کەسـێک ئـەوانی لـە ناوونیشان و کارەکانی فەرمانبەرێکی هەواڵگری کە بارێکی گەورەی دراوی پێیە ئاگادار کردبێتـەوە، بێگومـان ئـەوان دەبێ لـە فڕۆکەخانـە چـاوەڕێی مـن بـن. کـێ دەتـوانێ بزانـێ، چبەرنامەگـەلێکی ئـاڵۆز و پێچەڵپووچ لەنێو ئەو پلانانـەدا شـارراوەتەوە! لـەم بەرنامەیـەدا سـەری زۆرکـەس بەبادا چووە و زۆر وەخت، خـەڵکی دیکە لـەم بەرنامانـەدا، ڕۆڵی دوولایەنەیان گێڕاوە. تەنانەت ئـەو پلەوپایەیـە کە لـە ڕێکخراوی هـەواڵگریی ئیسـڕائیلدا هـەمبوو، بـەس نـەبوو بـۆ ئـەوەی ئەمنیـەتی تـەواوی مـن دابـین بکـا، چونکـە هـەروەخت قـازانجی ئـەوانی دیکـە پێویستی کردبا، بە ئاسانی دەکرا منیش ببمە قوربانیی قازانجی وان.

کاتێک ڕوخساری ئاشنای «ڕابێرت گەیتس»م دی کە لـە زاری ئەو تونێلەی دەچووە فڕۆکەخانە ڕاوەستابوو، بـە جارێک نارەحەتییەکـەم دابـەزی. «گەیـتس» پیـاوێکی دیکەشـی لەگـەڵ بـوو، هـەردووکیان بە دیتنی من و بارەکەم بە ڕەزامەندییەوە پێکەنین.

«گەیتس» بـە گـەرمی دەسـتی گوشیم و گـوتی زۆر خۆشـحاڵە کـە دووبـارە دەمبینێتـەوە و هاوڕێیەکەشـی بـە نـاوی کارمەنـدی تایبـەتیی گومرگ بەمن ناساند.

کارمەندی ناوبراو جانتایەکەی لێوەرگرتم و گوتی: «ئـەمن بۆت هەڵدەگرم». بـەڵام لـە کێشـی جانتاکـە سـەری سـوڕ مـا. تـەرازووی «فییەستا» لە شاری گواتمالا کێشەکەی بە ١١٠ پۆند نیشان دابوو.

«گەیتس»یش جیلیباسەکەی لیوەرگرتم و بۆخۆشم کیفە چەرمەکەم هەڵگرت.

ئەمن لەپێشدا کارتی گومرکیی خۆمم پڕ کردبووە، بەڵام جێی نووسینی دراوەکەم بە بەتاڵی هێشتبۆوە. ئەمن کارتەکەم دایە کارمەندی گومرگ و ئەو گوتی کارەکە ڕێک دەخا. پاشان داوای لێ-کردم وەدوای کەوم بۆ شوێنی کۆنترۆڵی پاسپۆرت کە لە دەفتەرێکی تایبەتیی چکۆلە بوو. لەوێ لەحاڵێکدا «گەیتس»یش ئامادە بوو، لە منی پرسی چەندم دراو پێیە.

گوتم: «ئەمن پێویستیم بە بەڵگەیەکی گومروکی هەیە کە بتوانم ٥٦ میلیۆن دۆلاری دەگەڵ خۆم پێبەرم.» هەردووکیان پێکەنین.

لەسەر داوای من، دوو بەڵگەم درانێ. یەک بۆ ٥٢ میلیۆن دۆلار و ئەوی دیکە بۆ ٤ میلیۆن دۆلار. دیارە لە باری تیۆرییەوە ئەمن چونکە پاسپۆرتی سیاسیم هەبوو دەمتوانی بێ پاراستنی ئەو ڕۆتینیاتە، بچمە ئەمریکا، بەڵام نەمدەویست باری ئیحتیات لەدەست بدەم. ئەمن دەمەویست پارەکە لە مەرجەعە ڕەسمییەکانی ئەمریکادا ڕۆتینیاتی پێوست بگوزەرێنێ بۆئەوەی لە دواڕۆژدا کێشەیەکم بۆ دروست نەبێ.

ئەمن جیلیباسەکە و جانتایەکەمم هەڵگرتن بۆ ئەوەی بڕۆم. «گەیتس» پێشنیاری کرد جانتاکە ئەو هەڵیگرێ. ئەویش لە قورسایییەکەی سەری سوڕ ما. «گەیتس» جانتایەکەی خستە سەر تەگەرەکانی و لە تێرمینالی فڕۆکەخانەدا وەڕێ کەوت. بە ڕاستی دیمەنێکی جوان و سەرسوڕهێن بوو. ئەو کارمەندە پایەبەرزەی CIA[11] جانتایەکی بەنێو کۆمەڵە خەڵکێکی کاسبکار،بازرگان، گەشتیار و

---

[11]- لەو کاتەدا «گەیتس» بەڕەسمی ئەفسەری نیشتمانیی هەواڵگری بۆ یەکیەتیی کۆمارەکانی سۆڤیەت \ ئورووپای خۆرهەلات بوو و ئەو پۆستەی لە ئۆکتۆبری

خەڵکی خۆوڵاتیدا بە زۆر و بە پەلە بەدوای خۆیدا ڕادەکێشا کە ١٦ میلیۆن دۆلاری بەزەبر تیٔاخنرابوو. هیچکەس نەیدەتوانی بزانێ کە چەند پارە بەبەر چاویدا دەڕوا. کاتێک مێشکم بەرەودوا دەگێڕمەوە، ناتوانم بزانم ئەگەر لەنەکاو جانتاکە تەقیبایە و دۆلارەکان بە گۆڕێ وەرببان، «گەیتس» چدژکردەوەیەکی دەبوو.

ئەمن و «گەیتس» بە کۆمپانیای فڕۆکەوانیی Eastern بە بلیتی دەرەجە ١ چووینە «فینێکس». فڕۆکە تەنیا لە «جۆرجیا» گۆڕا. هەر ئەو گیروگرفتەی لە فڕۆکەخانەی گواتمالا بۆم ساز بوو، لە فڕۆکەخانەی مەیامییش دووپاتە بۆوە. سروشتییە کە گەیتس نەی-دەتوانی لەو بارەیەوە کۆمەگێکم بکا، چونکە کەسایەتییەکەی ئاشکرا دەبوو. سەرەنجام بۆخۆم توانیم کارمەندانی فڕۆکەوانی قانیع بکەم و جانتایەکە دەگەڵ خۆم بەرمە نێو فڕۆکە.

لە ڕێی چوونمان بۆ شاری «فینێکس»، «گەیتس» هیچ ئاماژەیەکی بە دراوەکە و تەنانەت بەوەش کە دۆلارەکان بە سلامەتی ڕێبازی خۆیان بریوە، نەکرد. وا دیار بوو خاترجەم بوو کە هیچ پێشهاتێکی چاوەڕواننەکراو ڕوو نادا. بەڵکوو لەبارەی ئەو بابەتە کە ئیسرائیل لە فرۆشتنی کەرەسەی شەڕ بە ئێراندا دەبێ چۆن کار بکا، گفتوگۆی لەگەڵ کردم. بێگومان هۆی ئەوەش کە دەگەڵم هاتە «فینێکس»، هەر ئەوە بوو.

ئەو گوتی: «ئەو کاتەی ئێرانییەکان پێویستییەکانی خۆیانت دەدەنە دەست، ئەتۆ دەبێ لێی ورد ببیەوە و بڕیار بدەی کە ئایا ئەو کەرەسانە دەبێ لەوەی هەتانە دابین بکرێن، یان لە ئەمریکا و یان لە وڵاتانی دیکە. ئەتۆ و کەسانی سەر بە تۆ دەبێ تەلەفون بۆ دەفتەری

---

١٩٨٠وە تا مارسی ١٩٨١ بە ئەستووە بوو. ساڵی ١٩٨١ ئەو کرا بە سەرۆکی ڕێکخراوی هەواڵگریی وەزارەتی بەرگری.

من بکەن و تەنیا دەگەڵ من یان هاوکارەکەم «کلێر جۆرج» Clair Georgeقسە بکەن.»

کاتێکی زۆری بۆ هاتنەسەرکاری «ڕەیگان» نەمابوو، بەڵام گەمارۆی ئابووریی ئێران هەر لەجێی خۆی بوو و پێشبینیش نەدەکرا بەو زووانە هەڵگیرێ. گەمارۆی ئابووریی ئێران کارێکی ڕەسمی و قانوونی بوو. بەڵام «گەیتس» باسی بابەتێکی دیکەی دەکرد.

«گەیتس» گوتی: «ئەگەر حکوومەتی ئەمریکا موافەقەت بکا کە پێویستییە جەنگییەکانی ئێران دەبێ بدرێن بەو وڵاتە، ئێمە دەچینە لای کۆمپانیاکانی بەرهەمهێنی ئەو چەکانە، دەیانکڕین و لە پێگەیەکی هەواییدا ڕایاندەگرین. دوایە ئەرکی ئیسرائیلە کە ئەو کەرەسە جەنگییانە لەوێڕا بەڕێ بکاتە ئێران و بۆ ئەو مەبەستەش ئیسرائیل دەبێ مۆڵەتی دوامەسرەفی ئەوان دەربکا.»

«گەیتس» بەم قسانە دەیەویست بڵێ کە ئیسرائیل لە ڕێکخستنی بەڵگەنامەکانی کڕین و فرۆشتنی چەکوچۆڵەکەدا دەبێ بەڵێن بدا، ئەو چەکوچۆڵەیەی لە ئەمریکای دەکڕێ، بە وڵاتێکی دیکە نەفرۆشێ. داخوازی «گەیتس» لەو بارەیەوە، تەنیا لەبەرچاوگرتنی ڕۆتینیاتی قانوونی بوو. هێنانی ناوی وڵاتێک کە دەبێ ئەو کەرەسەیە بەکار بێنێ، هیچ مانایەکی نەبوو، بەڵکوو ئامانجی ئەمریکا لە دەرکردنی مۆڵەتی دوابەکارهێنانی ئەو چەکانەی لە ئەمریکا کڕراون لەلایەن ئیسرائیلەوە، هەر ئەوە بوو کە ئەگەر مەسەلەکە ئاشکرا بوو، ئەمریکا حکوومەتی ئیسرائیل لەسەر فرۆشتنی کەرەسەی شەڕ بە ئێران سەرکۆنە بکا.

پاشان چۆنیەتیی دانی قیمەتی کەرەسەکان لەلایەن ئێرانەوە هاتە بەر باس. «گەیتس» لەو بارەیەوە گوتی ئێرانییەکان پارەی ئەو کەرەسە جەنگییانە دەدەنە ئیسرائیل و ئەم وڵاتەش بەنۆرەی خۆی

پارەی چەکەکان بۆ ئەمریکا دەخاتە حیسابە بانکییە دیاریکراوەکان لە ئورووپا.

هاوسەفەرەکەی من گوتی: «پێویست نیە پێ دابگرم کە ئەو بابەتە بە نهێنی بمێنێتەوە. دیارە ئەگەر زوو یان درەنگ دەنگوباسی ئەم مەسەلەیە لە جێیەک دەربکەوێ ئێمە حاشا لەوە دەکەین کە هیچ ئاگادارییەکمان لەسەری بووبێ.» چونکە «گەیتس» منی بە نوێنەری حکوومەتی ئیسڕائیل دەزانی، دڵنیا بوو کە هەر وشەیەک دەگەڵ منی باس بکا ئەمن دەیدەمەوە بە سەرۆکەکانم.

کاتێک گەیشتینە شاری «فینێکس»، «گەیتس» بۆ دانانی جانتای دۆلارەکان لەو ترومبێلەدا کە بەکرێم گرتبوو، کۆمەگی کردم. لێرەدا ئەرکی ناوبراو لە فێرکردنی شێوەی فرۆشتنی چەکوچۆڵە بە ئێران کۆتایی هاتبوو. وەختێک ماڵئاواییم لێخواست و بەرەو هۆتێل کەوتمە ڕێ، ئەو گوتی: «سەرکەوتوو بی، ئەمن خواحافزی Goodbyeت لێ-ناکەم، چونکە وای بۆ دەچم دووبارە یەکتر دەبینینەوە.».

ئەمن گوتم: «بەڕاستی، ئەو چوار میلیۆن دۆلارە زیادییە بۆ چیە؟».

«ئەوە بۆ خەرجی کاروبارەکەیە.» دوایە پێکەنی و دوور کەوتەوە.

کاتێک گەیشتمە هۆتێل تەلەفونم بۆ دۆستێکی ئیسڕائیلی کرد کە لە «فینێکس» دەژیا، لێمپرسی داخوا جێیەکی ئەمن هەیە کە بتوانم ئەو شەوە جانتاکەمی لێدابنێم. ئەو گوتی ماڵەکەی من بۆ ئەو مەبەستە لە خزمەتتدایە، و بۆ بردنی من هاتە هۆتێل. وەختێک گەیشتینە ماڵەکەی پێکەوە بە پاڵدان جانتاکەمان لەبن قەرەوێڵەکەی ڕاکرد. ئەو گوتی: «ئەرێ چجەهەننەمێکت لەو جانتایە هاویشتوە-خشتی سوور؟».

وەلامم دایەوە: «هێندێ شتی گرانبەهای خۆمم تێهاویشتوە.»

پاش ئەوەی دڵنیا بووم کە ئەندامانی بنەماڵەکەی لە ماڵێ دەمێننەوە، دەگەڵ وی وەدەر کەوتین. بەلام ئەو کیفەم دەگەڵ خۆم برد کە ٤٠ میلیۆن دۆلارەکەی تێدا بوو.

بەیانیی ڕۆژی دواتر، دۆستەکەم جانتایەکەی بۆ هێنامەوە هۆتێل. لەحاڵێکدا ئەو چاوەڕوانم بوو بە پەلە جانتایەکەم بردە ئاودەست، کردمەوە و ئەو ٤ میلیۆن دۆلارەم دەرهێنا کە لە گواتمالا لە کیسە نایلۆنی جلشۆرم هاویشتبوو، پاشان پووڵەکانم دەگەڵ ژێرکراسەکەم کردنە بەر و داوام لێکرد کە من و جانتاکەم بەرێتەوە ماڵەکەی خۆی. ئەو سەری لە کارەکانی من سوڕ مابوو، بەڵام دۆستایەتییەکەمان ئەوەندە گەرم بوو کە دەمزانی لەو بارەیەوە پرسیارێکم لێناکا.

پاشان، لە سەعاتەکانی دواتری ئەو ڕۆژەدا چوومە بانکی نیشتمانیی ڤالی Valley و ٤ میلیۆن دۆلارم دا بەو کاربەدەستە بانکییە کە قەرار بوو چاوەڕێم بێ،تا بیخاتە حیسابی «ئارل بریان». بۆ ئەوەی ئەو دراوە بخرێتە حیسابی «ئارل بریان»ەوە نیشاندانی بەڵگەیەکی گومرگ پێویست بوو، کە نیشان بدا ئەو دراوە خاوێنە.

کاربەدەستە بانکییەکە گوتی: «هەڵگرتنی ئەو هەموو دراوە و بردنی بۆ ئێروئەوێ، کارێکی ئاسان نیە.»

ئەمن لە وەڵامیدا شانم هەڵتەکاند و سوپاسم کرد و لە بانک چوومە دەرێ.

بەیانیی ڕۆژی دواتر جانتاکەم لە ماڵی دۆستەکەم وەرگرتەوە و خستمە سەر کورسیی پشتەوەی ئەو ترومبێلە کە بەکرێم گرتبوو. جانتاکە ئێستا ٤ میلیۆن دۆلار سووکتر ببوو. پاشان بەفڕۆکەی TWA چوومە نیۆیۆرک و لەوێرا چوومە لەندەن. لە لەندەن فڕۆکەکەم گۆڕا بە British Airways و لەوێرا چوومە ژنێڤ. لەم سەفەرەشمدا دەگەڵ گیروگرفتەکەی پێشوو بەرەوڕوو بووم، کاربەدەستانی هێڵی هەوایی دەیانەویست نەهێڵن جانتایەکە بەرمە نێو فڕۆکە، بەڵام سەرەنجام ڕازیم کردن کە ڕێگای ئەوکارەم پێبدەن. ئەوان تەنیا لەبەر دوو شت داخوازەکەمیان قبووڵ کرد یەک ئەوە کە بلیتی دەرەجە یەکم هەبوو و دوو ئەوە کە پاسپۆرتی دیپلۆماسیم پێبوو.

ئەمن لای نیوەڕۆی ڕۆژێکی ساردی ژانویە گەیشتمە ژنێف و بە تاکسی چوومە بانکی «وۆرمز». لە بەشی سندووقی ئەمانەتییەکاندا بەدوای بەڕێوەبەری ئەو بەشەدا گەڕام و کە دیتمەوە، گوتم کاشانی دەبێ کلیلێکی بۆ من دابێ بە تۆ و پاسپۆرتەکەمم پێشان دا. ئەو پاش دیتنی ژمارە پاسپۆرتەکەم، داوای لێکردم وەدوای کەوم بۆ نهۆمی خوارەوە. پاش تێپەڕین لە دەرگایەکی پۆلایین گەیشتینە سندووقێکی گەورەی ئەمانەتییەکان. ئەو لەپێشدا بە کلیلەی خۆی دەرگاکەی کردەوە و دوایە ئەمن کەلکم لەو کلیلە وەرگرت کە کاشانی بۆی دانابووم. کاتێک بەڕێوەبەری سندووقی ئەمانەتییەکان دوور کەوتەوە، دەرگای سندووقەکەم کردەوە و بەستە ئەسکیناسەکانم دەگەڵ ئەو پاکەتە کە ٤٠ میلیۆن دۆلار چەکی تێدا بوو، خستە نێوی. ئەوجار دەرگای سندووقەکەم داخستەوە و لەحاڵێکدا جانتای بەتاڵ و کیفە دەستییەکە و جێلیباسەکەم هەڵگرتبوون، لە بانک وەدەر کەوتم. لەو کاتەدا بەڕاستی زۆر سووکتر ببووم.

پاش چوونەدەر لە بانک، بە تاکسی چوومە هۆتێل هیلتۆنی ژنێف و تەلەفونم بۆ سەرۆکی ستاد ژەنراڵ «ساگی» لە ئیسرائیل کرد و گوتم هەموو شتێک تەحویل درا، بەڵام هێشتا ئەوحیسابە بانکییەم نەکردۆتەوە کە دەبێ قازانجی فرۆشتنی تەگەرە فڕۆکەکان و ئەو پارچە یەدەکییانەی فڕۆکەی تێبکرێ کە بە ئێرانییەکانمان فرۆشتوون. پێیان گوتم، دۆستێک کە کاربەدەستی «مۆساد»ە تەلەفونت بۆ دەکا.

کاتێک ئەو کاربەدەستەی «مۆساد» هاتە هۆتێل، قسەیەکی زۆری پێنەبوو. ئەو پاکەتێکی کە دوو چەکی بانکیی تێدا بوون، کە بە هەردووکیان ٩٥٥٠٠٠هەزار دۆلاریان تێدا بوو. ئەو هەروەها بەڵگەنامەی ئەو کۆمپانیایەی دامێ کە دەبوو حیسابەکە بەناوی ئەو بکرێتەوە. کەمێک دواتر ئەمن لە بانکی «وۆرمز» حیسابێکم بەناوی

ئەو کۆمپانیایە کردەوە. بەڕاستی بەو عەمەلیاتەی ئێمە کاروکاسبیی بانکی «وۆرمز» زۆری گەشە کردبوو.

کاشانی لە ژنێڤ بوو و ژمارە تەلەفونەکەی لە دەفتەری ژەنڕاڵ «ساگی» دانابوو کە ئەمن تەلەفونی بۆ بکەم. بۆیە تەلەفونەکەیم وەرگرت و پێمگوت: «پوولی خوێندکاران لە بانکە و پێموایە ئێمە بەمزووانە بۆ موعامەلەکە ئامادە دەبین. ئێوە پوولی خۆتان وەرگرن و ئەمریکاییەکان ئازاد بکەن و لافاوی کەرەسەی شەڕ بەرەو ئێوە وەڕێ دەکەوێ.».

پاش ئەوە کاشانی لە هۆتێل هاتە سەردانم و پێرستێکی تازەی لەو کەلوپەلانە کە ئێرانییەکان دەیانەویستن، دامێ. بەڵێنم پێدا کە هەرچی لە دەستم بێ، بۆیان دەکەم و بەرەو فڕۆکەخانە وەڕێ کەوتم. جانتا بەتاڵەکەشم لە هۆتێل بەجێهێشت. لەوانە بوو کارمەندانی هۆتێل بۆم بنێرنەوە و لەوانەش بوو نەینێرنەوە، هەر ئەوەندە دەزانم کە نەم-دەویست جارێکی دی بیبینمەوە.

ڕۆژی ٢٠ی ژانویەی ساڵی ١٩٨١، خەڵکی دنیا تەلەڤزیۆنەکانیان کردەوە تا ڕێوڕەسمی ڕۆتێنیاتی چوونی «ڕۆناڵد ڕەیگان» و «جۆرج بووش» سەرکۆمار و جێگری سەرکۆماری ئەمریکا بۆ کۆشکی سپی ببینن. ڕاست لەو ساتانەدا کە «ڕەیگان» لەکاتی بەڕێوەچوونی ڕۆتێنیاتی چوون بۆ کۆشکی سپی و بەدەستەوەگرتنی دەسەڵاتدا خەریکی سوێندخواردن بوو، هەواڵدەریی «ئاسۆشیەیتد پریس» هەواڵی ئازادبوونی بارمتە ئەمریکاییەکانی ڕاگەیاند. ئەمن یەکێک لەو کەم کەسانە بووم کە بە بیستنی هەواڵی ئازادیی بارمتە ئەمریکاییەکان نە سەریان سوڕ ما و نە تووشی هەژان بوون.

ئـەمن و ئـەو کۆمارخوازانـە کـە بـەڵێنی خۆیـان بـۆ ئـازادکردنی پووڵـەکانی ئێـران لـە بانکـەکانی ئـەمریکا بـەجێ نەگەیانـد، یەکـەمـین کەسـانێک بـووین کـە لـە ڕێگـای دۆسـتی لەمێژینـەم، سـەید مەهـدیی کاشانییەوە لە تووڕەیی تاران ئاگادار بووین.

کاشانی لە کۆتایی مـانگی ژانویـەی ١٩٨١دا، لـە ڤییەنـەوە زەنگـی بـۆ مـن لێـدا و سـکاڵای کـرد کـە: «ئـەمریکاییـەکان بڕێکـی زۆر لـە دراوەکانی ئێمەیان ئازاد کردوە، بەڵام هەروا لەسەر ١١ میلیۆن دۆلار پووڵی ئێمە لە «مانهاتان چەیس» Manhattan Chase دانیشتوون.».

گـوتم: «نـەختێک بیـری لـێبکـەوە. چـۆن دەکـرێ شـتێک کـە ئێـوە هەقێکتان بەسەریەوە نیە بە فێڵ لە دەستی ئێوە دەربێنن؟»).

پاش ئەم قسانە هەردووکمان کەوتینە پێکـەنین. ئـەمجار ئـەو گـوتی: «بەڵام، هیوادارم ئێوە ئیسرائیلییەکان بەڵێنەکەتان بەرنـە سـەرێ. ئێمـە پێویستیمان بە کەرەسەی شەڕ هەیە.»

«ئێمە بـەڵێنی کۆمـەگمان بـە ئێـوە داوە و پێشـی پابەنـد دەبـین. ئێمـە دەگـەڵ ئـەمریکـاییـەکان لـە ڕیزێکـدا دامـەنێ. لـەم بارەیـەوە پێشـتر لەلایەن بەرزترین پایەکانی حکوومەتی ئیسرائیلەوە بڕیار دراوە».

سـەرەتای مـانگی فێوریـەی سـاڵی ١٩٨١، ئـەمن بـۆ بەشـداری لـە کۆنفرانسـێکدا کـە قـەرار بـوو، بـۆ فرۆشـتنی چـەکوچۆڵـە لەلایـەن ئیسـرائیلەوە بـە ئێـران بـە بەشـداریی کاشـانی و ئۆمشـی لـە ڤییـەن بگیـرێ، بـە فڕۆکـە چوومـە ئـەو شـارە. پاش ئازادبوونی بارمتـەکان و دانـی پـارە بـە «خوێنـدکاران»[١٢] ئێرانییـەکان زۆر لەسـەر کڕینـی کەرەسەی شەڕ مکوڕ ببوون.

---

[١٢]-خوێنەرە بەڕێزەکان دەبێ سەرنج بدەنە وشـەی «خوێندکاران» کە نووسـەر لێرەدا بە گاڵتە بەکاری بردوە و بەتایبەتی خستوویەتە نێو گیومـە (دوو کـەوان)یش. بێشک مەبەستی لە وشەی «خوێندکاران» ئاماژە بە «مەلاکان»ە.

بەپێی ئەو ڕێنوێنییانە کە کۆمیتەی هاوبەش بۆ پێوەندییەکانی نێوان ئیسـرائیل و ئێـران دابوونیـە مـن، ئـەمن پێرسـتی ئـەو کەرەسـە جەنگییانـەم کـە دەمـانتوانی لـە عـەمبارەکانی ئیسـرائیل بـە ئێرانیـان بفرۆشـین، بـە شـێوەی خـوارەوە بـە دوو ئێرانییەکـە پێشـنیار کـرد: فڕۆکەی F_14 و پارچە یەدەکییـەکانی، ٣٠٠ هـەزار گوللـەی تـۆپی ١٢٢ میلیمیتری، خومپارەهاوێژ (هاوەن)ی ٥٢ میلیمیتری و مووشـەکی وا کـە سـەربازان بتـوانن لەسـەر شـانیان هـەڵیانگرن، ١٠٠ هـەزار کەلاشـینکۆفی AK-47 بـە تەقەمـەنی و پێویسـتییەکانەوە و مووشـەکی هەوا بە زەمین. ئێرانییەکان هەروەها داوای مووتۆڕ (مەکینـە)ی تـانکی «چیفتێن»ی بریتانیـاییـان دەکرد. ئـەو سـەودایە بـۆ ئێمـە باشـترین قازانجی تێدا بوو. چونکە مووتۆڕی تانکی «چیفتێن» هەریەکـەی بـایی بەینی ٣٠ تا ٤٠ هەزار دۆلار بوون، بەلام ئێمە هەریەکـەمان بـە نرخـی سەرسوڕهێنی ٤٥٠ هـەزار دۆلار بـەوان فرۆشـت و گوتمـان کـە دەبـێ یان بەو قیمەتانە لێمان بکڕن یان واز لە کڕینیان بێنن.

ئێرانییەکان هەروەها خوازیاری کڕینی فڕۆکـەی شـەڕکەر بـوون کە لەو کاتەدا ئێمە نەماندەتوانی پێیان بفرۆشین، بـەلام پێشـنیارمان پـێ- کردن کە دەتـوانین ١٠ فڕۆکـەی C-130یـان هەریەکـەی بـە ١٢ میلیـۆن دۆلار پـێبفرۆشـین. خەبـەر بـە مـن درا کـە ڕێکخـراوی فڕۆکـەوانیی نیشتمانیی ئەوان (ئێران ئێر)یش کە فڕۆکـەی [بۆیینگی] ٧٠٨ و ٧٠٧ هەبوو، زۆری پێویستی بـە پارچـەی یـەدەکی هەیـە. فڕۆکـە ٧٠٧ەکـانی ئێران بە هۆی گەمارۆی ئابووریی ئەمریکاوە کە مووتـۆڕی بازرگـانی و کەرەسـە یەدەکییەکانیشـی دەگرتـەوە، لـە کـار کـەوتبوون. گـەمارۆی ئابووریی ئەمریکا لەوکاتەدا هەر لەجێی خۆی بـوو، بـەلام ئێرانییـەکان بۆ برەوپێدانی هێڵی هەوایی خۆیان نەکهـەر لـە هـەوڵی کڕینـی پارچـە یەدەکییەکانی فڕۆکە کۆنەکانیاندا بوون، بەڵکوو هیـوادار بـوون بتـوانن ژمارەیەکیش فڕۆکەی بریتانیایی «تریستار» Tristar بکڕن.

ئەمن قیمەتی هەموو ئەو کەرەسە و ئامرازانەم کۆ کردەوە کە قەرار بوو بە ئێرانییەکانیان بفرۆشین، دەیکردە شتێک بەینی ٩٠٠ میلیۆن تا میلیاردێک و ١٠٠ میلیۆن دۆلار. قازانجی ئیسرائیل لەو موعامەلەیە ٥٠ لەسەد بوو، و بەوجۆرە بڕی «سەرمایەی ڕەش» بە خێرایی زیادی دەکرد.

ئێرانییەکان پاش دیتنی حیسابەکە نێوچاوانیان تێکنا. ئەوان دەیانزانی ئیسرائیل خەریکی ڕفاندنی پووڵی وانە، بەڵام جگە لە قبووڵی پێشنیارەکانی ئێمە چارەیەکیان نەبوو. ئەوان گوتیان، لەبارەی نرخی ئەم کەرەسە و ئامرازانەوە دەبێ دەگەڵ کاربەدەستانی ئێرانی لە تاران قسە بکەن. کاشانی گوتی: «ئەتۆش دەبێ بێیە تاران، چونکە بێگومان وەزارەتی بەرگری دەبێ لەبارەی وردەکاریی موعامەلەکەوە گفتوگۆت لەگەڵ بکا.».

یەکەمین سەفەری من بۆ تاران دوای شۆرش لە کۆتایی فێوریەی ١٩٨١دا بوو. هێندێک لە دۆستانم لەو سەفەرە هەستیان بە نیگەرانی دەکرد، چونکە لە ئێران هێندێ گرووپی توندڕۆ هەبوون کە بە چاوی سووکەوە تەماشای ئیسرائیلیان دەکرد. بەڵام بۆخۆم هیچ گیروگرفتێکم لە کردنی ئەو سەفەرەدا نەدەدی، چونکە بە منیان گوتبوو کە ئایەتوڵلا عەلیڕەزا هاشمی ئەندامی ئەنجومەنی شۆرش بۆتە زامنی ئەمنیەتی من لەو سەفەرەدا. بێجگە لەوەش قەرار بوو ئەمن بۆ ئەو سەفەرە کەسیەتیی خۆم بگۆڕم.

ئەمن لەحاڵێکدا دەستێک جلکی دووراوی بریتانیام دەبەر کردبوو و سەعاتێکی ڕۆلێکسی ئەمانەتیم دەدەست کردبوو، وەک بازرگانێکی کانادایی و بەناوی «ویلیام گریس» William Grase گەیشتمە فڕۆکەخانەی ڤییەن. خەڵک لە وڵاتانی جۆراوجۆرەوە کۆچ دەکەن بۆ کانادا و هیچ نیشانەیەک نەبوو کە کەسیەتیی ئەسڵیی من نیشان بدا یان ئیسرائیلیبوونی من دەربخا. ناوی من لەسەر هیچکام لە جلکەکانم نەنووسرابوو، کەلکم لە گۆرەوی و کەوشی ئیسرائیلی

وەرنــەدەگرت، و پاســپۆرت و کارتێکیشــم بــە نــاوی «ئــاری بــن مۆناشی» پێنەبوو. «مۆساد» پاسپۆرتێکی کانادایی بە ناوی «ویلیام گریس» بۆ من ئامادە کردبوو. ئەمن جانتاشم پێنەبوو.

بەوجۆرەی قەرارم دەگەڵ ئێرانییەکان دانابوو، لە تەل ئەبیبەوە بە فڕۆکەیەکی ئوتریشی چوومە ڤییەن و بەپێی بەرنامەی ئەو سەفەرە هەواییە، ڕاست لەو کاتەدا  کە ئەو فڕۆکەیە لە ڤییەنەوە دەڕۆیشت بۆ لەندەن، قەرار بوو فڕۆکەیەکی ئێران ئێریش لە ڤییەنەوە بەرەو تاران هەڵفڕێ. یەکێک لە کارمەندانی «مۆساد» کە پێشتر بۆ یارمەتیدانی من دیاری کرابوو، بەڵگەی تێپەڕین (بۆردینگ پاس)ی دامێ و چوومە بەشی چاوەڕوانی بۆ سواربوونی فڕۆکە. هۆی هەڵبژاردنی فڕۆکەخانەی ڤییەن بۆ سەفەری من ئەوە بوو کە لەو فڕۆکەخانەیە ئەو موسافیرانەی دێن یان دەڕۆن تێکەڵ دەبن و بۆیە دەرەتانی نەناسرانەوە پترە.

«ئۆمشی» لەوێ چاوەڕێم بوو، ئەمن بلیت و بۆردینگ پاسی پێشووم دەگەڵ پاسپۆرتەکەم دا بە دۆستە هاوکارەکەم (کارمەندەکەی مۆساد) و بۆردینگ پاسی فڕۆکەی «ئێران ئێر»م لە «ئۆمشی» وەرگرت. ئەو هەروەها هێندێک بەڵگەنامەی ئێرانیی دامێ کە پێوەندییان بە سەفەرەکەمەوە هەبوو و منیان بە «ویلیام گریس» دەناساند و تێپەڕبوونی ئاسانی من لە فڕۆکەخانەی تارانیان دەستەبەر دەکرد. ئێمە مەبەستمان لەو کارانە ئەوە بوو کە مەترسیی ئەوەش لە بەین بەرین کە یەکێک لە کارمەندە ڕەسمییەکانی ئێران ڕادیکاڵەکان تێبگەیەنێ کە ئیسرائیلییەک -با بە ناوێکی دروستکراویش بێ- هاتۆتە تاران. لەلایەکی دیکەشەوە چونکە «ئێران ئێر» دەزگایەکی دەوڵەتی بوو، بۆ «ئۆمشی» ئامادەکردنی بەڵگەی تێپەڕین بۆ سەفەری من کارێکی سادە و ئاسان بوو. بەوجۆرە، هەموو تێبینییەکی پێویست بۆ سەفەری من بەکار برابوو.

«ئۆمشی» لە سەفەری من بۆ تاران زۆر خۆشحاڵ دیار بوو. ئەو و ئەنجومەنی بەرزی شۆرش هەستیان دەکرد کە ئەگەر گیروگرفتێکی چووک کە لە ئارادا بوو، لەبەین بچێ، ئەوان بە زوویی چەکوچۆڵەی پێویستی خۆیانیان دەست دەکەوێ. ئەو لەبارەی ئەو گیروگرفتە چووکەوە کە ئاماژەی پێکرد ڕوونکردنەوەیەکی نەدا بە من.

هەروا کە فڕۆکەکە لە تاران نزیک دەبۆوە، هەموو خانمە موسافیرە ئێرانییەکان کە لەلای چەپی فڕۆکەی جێتی ٧٠٧ دانیشتبوون دەستیان کرد بە سڕینەوەی سووراوی لێوی خۆیان و چارشێوەکانیان بۆ بەخۆدادان ئامادە کرد. هێندێکیان لەحاڵێکدا گۆرەوییە ڕەشەکانی خۆیان بەدەستەوە گرتبوو، چوونە تەوالێت. وەختی ئەوە هاتبوو کە ئەو خانمانە بۆ ماوەیەک ماڵئاوایی لە فەسادی خۆرئاوا بکەن.

کاتێک گەیشتمە فڕۆکەخانە، دەرکەوت کە لەجێدا دروستکردنی بەڵگەی ئێرانی بۆ سەفەری من پێویست نەبووە. چونکە لەو جێیەی فڕۆکەکەی لێ ڕاوەستا، ترومبێلێکی وەزارەتی بەرگری چاوەڕێم بوو. بێئەوەی پێویست بێ لەلایەن پۆلیسی فڕۆکەخانە یان گومرگەوە کۆنترۆڵ بکرێم، ئەو ترومبێلە ڕاستەڕێ بردمیە هۆتێل هیلتۆن کە پێش گەیشتنم سویتێکم بۆ گیرابوو. سەری شەوێ گەیشتمە هۆتێل و نەمدەویست بە پیاسەکردن لە شەقامەکانی تاراندا مەترسی بۆخۆم دروست بکەم.

بەیانیی ڕۆژی دواتر لەگەڵ کاشانی و «ئۆمشی» چوومە ئیدارەی کڕینی کەلوپەلی سەربازی لە وەزارەتی بەرگری. هەشت پیاو لە ئیشکەرانی وەزارەتی بەرگری، لە دەوری مێزی کۆنفڕانس دانیشتبوون و دووکەڵێکی خەست هەوای ژوورەکەی پڕ کردبوو.

لەپێشدا ئەمن پێرستی ئەو کەلوپەلانەم باس کرد کە دەمانتوانی پێیان بفرۆشین.

یەکێک لەوان گوتی: «ئەو نرخەی بۆ کەلوپەلەکان دیاری کراوە، نرخێکی یەکجار گرانە». بێگومان ئەم بابەتە هەر ئەو «گیروگرفتە چووکەڵە» بوو کە «ئۆمشی» پێشتر ئاماژەی پێکردبوو.

ئەمن لە وەڵامدا بە ڕاوێژێکی ناڕازییانە گوتم: «بەڵام وەک هەمووتان ئاگادارن، ئێمە بەوکارە مەترسییەکی گەورە لە خۆمان دەگرین و لەوانەیە ئەم بابەتە مەترسییەکی زۆری بۆ ئیسرائیل بەدواوە بێ».

«بەڵام بەهەرحاڵ ئەو نرخەی پێشنیارتان کردوە زۆر گران و سەرسوڕهێنە».

هەرچۆنێک بوو، ئەوان ڕێک کەوتن کە پێشنیارەکانی ئیسرائیل بخەنە بەرچاوی ئەنجومەنی بەرزی شۆرش. ئەوان هەروەها لەبارەی ئامرازی گوازتنەوەی کەرەسەکان بۆ تارانەوە پرسیاریان لێکردم. وەڵامم دایەوە، باشترە لەپێشدا ئەوان گیروگرفتی نرخی کەرەسەکان چارەسەر بکەن و ڕەزامەندیی ئەنجومەنی بەرزی شۆرش لەو بارەیەوە بەدەست بێنن، تا دواتر لەبارەی ئامرازی گوازتنەوەی کەرەسەکانەوە گفتوگۆ بکەین. ئەوان داوایان لە من کرد دەوری دوو ڕۆژی دیکە لە تاران وەمێنم.

لە ڕێگای گەڕانەوە بۆ هۆتێلدا «ئۆمشی» پێیگوتم کە سەعات ٥ی پاش نیوەڕۆ دێتەوە لای من، تا نانی ئێوارێ پێکەوە بخۆین. بەڵام دەوروبەری سەعات ٣ی دوای نیوەڕۆ تەلەفونی بۆ کردم و گوتی مەسەلەیەکی زۆر گرنگ هاتۆتە پێش و فەرماندەری هێزی ئاسمانی دەیەوێ دەسبەجێ بتبینێ. سەعات ٣:٣٠ی پاش نیوەڕۆ، ئەمن لە ڕێستووورانی هۆتێل چاوم پێیان کەوت.

فەرماندەی هێزی ئاسمانی گوتی: «عێراقییەکان گیروگرفتێکی تایبەتییان بۆ ئێمە دروست کردوە. ئەوان لە دەوروبەری بەغدا ڕێئاکتۆرێکی ئەتۆمییان دامەزراندوە کە بۆتە هۆی نیگەرانیی ئێمە».

ئەمن باش لە بوونی ئەو ڕیئاکتۆرە ئەتۆمییە کە بە «تەمووز۱۷» ناو دەبرا، ئاگادار بووم. ساڵی ۱۹۷۹ کە پێوەندیی نێوان ئێران و ئیسرائیل، ڕاگیرابوو، ئەمن چەند مانگ لە بەشی گۆڕینەوەی نیشانە هەواڵگرییەکان کارم کردبوو. بەشێک لە ئەرکی من لەوکاتەدا ئەوە بوو کە زانیارییەکانی سەتەلایتی KH-11 کە لە ئاکامی ڕێککەوتنی «کەمپ دیڤید»دا لە ئەمریکاوە دەگەیشتن، چاو لێبکەم و هەڵیان-سەنگێنم و بیان‌نێرم بۆ بەشە پێوەندیدارەکان. ئەو ڕیئاکتۆرە، دەوڵەتی فەڕانسە دابووی بە عێراق تا ئەو وڵاتە کانزای پیتێندراوی لێ ساز بکا. بەڵام بەپێی ئەو زانیارییانەی ڕێکخراوی جاسووسیی ئیسرائیل دەستی کەوتبوون عێراقییەکان دەیانەویست ئەو ڕیئاکتۆرە بۆ مەبەستی سەربازی بەکار بەرن.

فەرماندەی هێزی ئاسمانی گوتی: «ئێمە دوو جار یەکیان لە مانگی سێپتامبردا و ئەوی دیکەشیان حەوتوویەک لەمەوبەر هەوڵمان داوە لێیبدەین، بەڵام لەوبارەیەوە سەرکەوتوو نەبووین.»

«چاوەڕوانیی ئێوە لەوبارەیەوە لە ئیسرائیل چیە؟».

«پێویستیمان بە زانیاری لەبارەی ئەو ڕیئاکتۆرەوە هەیە. ئێمە دەزانین کە ئێوە لەوبارەیەوە زانیارییەکی زۆرتان هەیە. ئێمە بە باشی ئاگامان لە هەوڵەکانی «مۆساد» لە فەڕانسە بۆ پێشگرتن بە دروستکردنی ئەو ڕیئاکتۆرە هەیە. ئێمە دەزانین کە ئێوەش بە قەدەر ئێمە لەبارەی ئەو ڕیئاکتۆرەوە نیگەرانن. بۆیە ئێمە پێویستیمان بەو زانیاریانە هەیە کە ئێوە لەو بارەیەوە هەتانە».

ئەمن دەستم کرد بە یادداشتهەڵگرتن لە قسەکانی. پاشان لەحاڵێکدا ئەو قەپاڵەی لە خواردنەکەی دەدا، گوتی: «ئێمە لەو باوەڕەداین کە لە دەوروبەری کۆتایی ئەمساڵدا، واتە مانگی نۆڤامبر یان دیسامبر ئەو ڕیئاکتۆرە دەست بەکار دەکا و پاش ئەوە ئەگەر بۆمبێک لەو ڕیئاکتۆرە بدرێ کارەساتێکی ئەتۆمی دروست دەبێ. بۆیە ئەو ڕیئاکتۆرە دەبێ پێش کۆتایی ئەمساڵ لەنێو ببرێ.

ئەو ناوی یەکێک لە ئیشکەرانی باڵیۆزخانەی ئێران لە پاریسی دامێ بۆ ئەوەی زانیارییەکان بۆ ئەو بنێرم. فەرماندەی هێزی ئاسمانی لێی زیاد کرد «لەبیرتان بێ کە هەر کۆمەگێکی لەوبارەیەوە بە ئێمەی بکەن، لەڕاستیدا کۆمەگێکە کە بە ئیسرائیل، خۆرهەلاتی نێوەڕاست و هەموو دنیاتان کردوە. ئەگەر عێراق ببێتە خاوەنی بۆمبای ئەتۆمی هەر دەبێ خوا ڕوحم بە هەموومان بکا».

دیارە پێویست نەبوو، ئەو نیگەرانیی خۆی لەبارەی ئەو ڕێئاکتۆرە ئەتۆمییەوە بۆ من باس بکا. ئێمە دەمانزانی سەددام حوسێن شێتی خۆبەزلزانی و بالادەستی لە خۆرهەلاتی نێوەڕاستە و پێشتر کەرەسەی کیمیایی کوشەندەی شەڕی عەمبار کردوە و بە بێسەبری لە هەولی دروستکردنی بۆمبای ئەتۆمیدایە.

بەیانیی ڕۆژی دواتر «ئۆمشی» و کاشانی بۆ قاولتیخواردن هاتنە لای من و پێیانگوتم کە دوانیوەڕۆی ئەو ڕۆژە دووبارە لەگەڵ فەرماندەی هێزی ئاسمانی یەکتر دەبینین. «ئۆمشی» پێشنیاری کرد کە لەو ماوەیەدا بە ترومبێل دەوروبەری تارانم پێشان بدا. ئەو سیترۆئینێکی ڕەنگخۆڵەمێشیی کۆنی هەبوو. شەقامەکانی تاران پڕ لە ژنی چارشێوبەسەر بوون کە زەمبیلەبەدەست بۆ کڕینی خواردەمەنی دەچوونە دەوروبەری شیمالی شمیران. ئێمە لەوێ ڕاوەستاین و کەوتینە خواردنی بەستەنی (دۆندرمە)یەکی خۆش کە لە منداڵییەوە تامەکەیم هەر لەبیر بوو. ئەمن بەستەنیی هەموو ولاتانی دنیام تاقی کردۆتەوە و گەیشتوومە ئەو باوەڕە کە بەستەنیی ئێران لەدنیادا بێ-هاوتایە.

هەروا کە بە ترومبێلەکەی «ئۆمشی» بەرەو شیمال دەچووین، ڕادیاتۆرەکەی هاتە کوڵ و ئیدی گەڕانی خوێنی لە دەمارەکانی «ئۆمشی»دا ڕاوەستاند. چونکە دەگەڵ کارمەندێکی هەواڵدەریی ئیسرائیل لە قەراغ جادە ترومبێلەکەی لەکار کەوتبوو و ئەگەر لافاوی ئەو حەشیمەتەی بەوێدا تێدەپەڕین، بە من و کەسیەتیی منیان زانیبا،

لەوانە بوو گیانم بکەوێتە مەترسییەوە و ئەویش خۆی بە بەرپرسی ئەمنیەتی من دەزانی. ئەو، هەم ترومبێلەکەی خۆش دەویست و نەی- دەویست لە قەراغ جادە بەجێی بێڵێ و هەمیش نیگەرانی وەزعی من بوو و حەزی نەدەکرد بەجێم بێڵێ. «ئۆمشی» بە نارەحەتییەکی شێتانەوە هاتوچۆی دەکرد و لۆرییەکانیش بەو دەنگە ناخۆشانەیانەوە بە پەناماندا تێدەپەڕین.

ئەو لە ١٥دەقیقەی دواییدا ئەم ڕستەیەی دەگوت و دەگوتەوە: «کۆتایی کاری ئێمە ئەوەیە کە ترومبێلێکی سوپای پاسداران بگاتە ئێرە و پرسیار لە کەسیەتیی ئێمە بکا، ئیدی کاری هەردووکمان خەراپ دەبێ».

ئاخرەکەی ئەمن قانیعم کرد کە پێکەوە بە پێیان بچینە دوکانێک کە تەلەفونی هەبێ. ئەو پێشنیارەکەمی پەسند کرد و پاش چوونی دوکانەکە تەلەفونی بۆ وەزارەتی بەرگری کرد. دوو سەعات دواتر، لەحاڵێکدا «ئۆمشی» لەترسان لەپێ کەوتبوو، ترومبێلێکی یەدەککێش (ساحبە، کرێن) گەیشتە وێ و ترومبێلەکەی «ئۆمشی»ی برد. دوایە ئێمەش بە تاکسی چووینەوە هۆتێل. ئەم ڕووداوە بە منی سەلماند کە کاربەدەستانی ئێران هەم بۆ ئەمنیەتی من بێئەندازە نیگەرانن و هەم بۆ ترومبێلەکانیان.

لەو دیدارەدا کە پاشنیوەڕۆ دەگەڵ فەرماندەی هێزی ئاسمانیم هەبوو، ئەو داوای کرد کە ئێمە وێنەی هەوایی و سەتەلایتیی خانووبەرە (بنا)ی ڕێئاکتۆری ئەتۆمی و خانووبەرەکانی دەوروبەریان بدەینێ. بەیانیی ڕۆژی دواتر پێیان گوتم کە چاوم بە ئایەتوڵڵا هاشمی و وەزیری تازەی بەرگری و حوججەتولئیسلام کەڕرووبی -پیاوێک کە چوار مانگ پێشتر دیدارێکی زۆر گرنگی دەگەڵ «جۆرج بووش» کردبوو- دەکەوێ.

ئەمن لە ژوورێکی چووکەڵەی پارلمان چاوم بەو سێ کاربەدەستە کەوت. هەموویان دەمبەپێکەنین بوون و ڕایانگەیاند کە ئەنجومەنی

بەرزی شۆرش بەو نرخە گران و سەرسوڕهێنە کە ئیسرائیل بۆ فرۆشتنی کەرەسە جەنگییەکان داوای کردوە، ڕازی بووە.

کەڕرووبی پرسی: «پێتان خۆشە پارەی کەرەسە جەنگییەکانتان چۆن بدرێتێ؟».

«بێزەحمەت ملیاردێک دۆلار بخەنە سەر حیسابی ئێمە لە ئوتریش».

وەزیری بەرگری گوتی: «هەروا بە ئاسانی! ئاخر ئێمە دەتوانین متمانە بە ئێوە بکەین؟».

«دیارە ئێوە دەتوانن متمانەمان پێبکەن، بەڵام لەبیرتان بێ کە پووڵەکە دەبێ نەغد بێ. چونکە ئیعتیبارنامە ژانەسەر دروست دەکا.».

«ئێمە پێمان باشترە نرخی کەرەسە جەنگییەکانتان وەختی وەرگرتن بە نەغد بدەینێ.».

ئەمن زەردەیەکم هاتێ و لەحاڵێکدا سەرم ڕادەوەشاند، ڕوونم کردەوە کە: «هەتا پوولی سەودایەکە نەغد وەرنەگرین، ناتوانین ئەوانتان تەحویل بدەین. ئێمە دەبێ کەرەسە جەنگییەکان لە بەرهەمهێنەکانیان بکڕین.».

وەزیری بەرگری پێکەنی و لەحاڵێکدا بە شێوەیەکی ساختە و بە سووکایەتییەوە دەستەکانیی ڕێک دەخشاندن گوتی: «ئێوەی ئیسرائیلی بۆ هەر شتێک، وەڵامێکی پێشترئامادەکراوتان هەیە». بەهەرحاڵ، ئەو بەڵێنی دا کە لە ماوەی چوار ڕۆژدا «ئۆمشی» تەلەفون بۆ ئیسرائیل بکا و ژمارە حیسابەکان و کۆدەکانی کەلک-لێوەرگرتنیان بدا بە من.

کەڕرووبی گوتی: «ئەتۆ بێگومان دەزانی کە ئێمە ناچارین نرخێکی وا قورس بدەین. بەڵام هیوادارم بۆ داخوازەکەی وەزیری بەرگری لەبارەی ڕێئاکتۆرەکەوە هەنگاوی پێویست هەڵێننەوە».

بەپێی گفتوگۆکان، بڕیار درابوو کە ئەو یەک ملیارد دۆلارەی قەرار بوو ئێرانییەکان بەرامبەر بە کەرەسە جەنگییەکان بیدەن، خەرجی

بیمە و مەترسییەکانی سەردەمی شەڕ و گوازتنەوەی کەلوپەلەکەش بگرێتەوە. بەڵام ئێستا مەسەلەی ڕێگای گوازتنەوەیان هاتە گۆڕێ. ئەمن پێشنیارم کرد کە باشترە ئیسرائیل چەند فڕۆکەی باربەری لە کۆمپانییەکی ئارژەنتینی بەکرێ بگرێ، تا بێنە تەل ئەبیب. دوایە ئەو فڕۆکانە کەرەسە جەنگییەکان لە تەل ئەبیب بار دەکەن و بەرەو تاران دەفڕن. کارەکەش بەوجۆرە دەبێ کە فڕۆکەوانانی ئەو فڕۆکانە وەختی دەرچوون لە ئیسرائیل، بە ئیشکەرانی بورجی چاوەدێریی تەل ئەبیب دەڵێن، دەچنە وڵاتی پرتوگال. بەڵام وەختێک دەگەنە قبرس، نەخشەی فڕینەکەیان دەگۆڕن و بە بورجی چاوەدێریی قبرس دەڵێن دەچنە تاران. ئەم بەرنامەیە دەبێ ئەوەندە بە نهێنی جێبەجێ بکرێ کە تەنانەت ئیشکەرانی بورجی چاوەدێریی ئیسرائیلیش نەزانن فڕۆکەکان چوونەتە کوێ.

پاش ئەنجامدانی گفتوگۆکان، هەروەک لەڕێگای ڤییەنەوە چووبوومە تاران، ئەمجارەش هەر بەو ڕێیەدا و بە هەمان شێوە چوومەوە ئیسرائیل. لە ساڵۆنی ترانزیتی فڕۆکەخانەی ئوتریش، یەکێک لە کارمەندانی «مۆساد» هاتە لام و پاسپۆرتەکەمی وەرگرتەوە. ئەمن ئەو پاسپۆرتەم بە کارمەندانی ئیدارەی کۆچ نیشان دا و دوایە چوومە تێرمینالی سەرەکی و لەوێڕا چوومە لای ئەو فڕۆکەیە کە پێی دەچوومەوە ئیسرائیل.

ئێرانییەکان نرخی کەلوپەلە جەنگییەکانیان دەکرێ بڵێین بێ - وەدرەنگکەوتن دا. ئەوان یەک میلیارد دۆلارەکەیان لە پێنج حیسابی جۆراوجۆر و هەریەکەی ۲۰۰ میلیۆن دۆلاردا ناردە بانکی «گیرۆزەنتراڵ» Girozentraleی ڤییەن.

ژەنراڵ «ساگی» سەرۆکی ڕێکخراوی هەواڵگریی سوپا بەو سەودایە زۆر خۆشحاڵ بوو و جێگری وەزارەتی بەرگریی ڕاسپارد کە ئەو کەرەسە جەنگییانە بۆ تەحویلدان ئامادە بکا. ئەوان بڕیاریان دا، هەموو ئەو ئامراز و کەلوپەلەی ئێران کڕیونی لە عەمباری یەکێک

لـه هێلانـه سـەربازییەکانی فڕۆکەخانـەی نێونەتـەوەیی خـڕ بکەنـەوە. کارمەنـدانی بەشـی گوازتنـەوە لـە ئیـدارەی پێوەندییـەکانی دەرەوەی هـەواڵگریی سـوپاش فڕۆکـەکانیان بەکرێ گـرتن و لـە «لۆیـد» Loydـای لەنـدەن بیمـەیان کـردن. لەڕاسـتیدا بـۆ کەلوپـەلی کشـتوکاڵ و «شـتی دیکـە» کـە لـە پرتوگالـەوە دەچـووە تـاران بیمەیـەکی یـەکجار زۆریـان دەدا. نرخـی بیمـەی ئـەوان سـەدی ۱۱۰ بـوو و تـەنیا ئـەو کاتەشـی دەگرتەوە کە فڕۆکە دیاریکراوەکان لە ئاسمانی قبرس دەردەکەوتن و لـەوێڕا لـە تـاران دەنیشـتنەوە. بـەوجۆرە هـەم نێوئاخنی فڕۆکـەکان و هەم ئەو شوێنەی لێی وەڕێ کەوتبوون، بە نهێنی دەمانەوە.

ئەو کاتەی قسـە لـە مەسـەلەی گوازتنـەوەی کەرەسـە جەنگییـەکان و تەحویلدانیان بە ئێران دەکرا، «سـاگی» ویسـتی داخوازی ئێرانییـەکان لەبارەی پێدانی وێنەی هەوایی ڕێئاکتۆرە ئەتۆمییـەکانیش بـەجێ بێنـێ. بـەو مەبەسـتە، «سـاگی» دەسـتووری دا فڕینێکـی هـەوایی بـۆ وێنەهـەڵگرتن لـە ڕێئـاکتۆری ئـەتۆمیی عێـڕاق ئـەنجام بـدرێ. ئەمـە کـارێکی زۆر مەترسـیدار بـوو و ئەگـەر ئاشـکرا بایـە ئیسـڕائیل بـە لایەنگری لە ئێران تۆمەتبار دەکرا.

٤ ڕۆژ دواتـر وێنـە هـەواییـەکان ئامـادە کـران. ئـەوان زۆر بـاش گیرابـوون و بـە ئاشـکرا شـوێنی ڕێئـاکتۆرە ئەتۆمییەکـە و خانووبەرەکـەییان نیشـان دەدا. چەنـد وێنـە لەوانـە بـۆ پاشـکۆی سەربازیی ئیسڕائیل لە پاریس بەڕێ کران کە بیاندا بـە ئێرانییـەکان. ئـەویش وێنـەکانی بـە «سـیموون گبـای»دا کـە بەرپرسـی پێوەنـدیی ئیسڕائیلی و ئێرانییەکانی پاریس بوو، دا بـە «ستەن» Sten کە نـاوی ڕەمزیـی ئێمـە بـۆ ڕێکخـراوی هـەواڵگریی سـوپای ئێـران بـوو. بـەڵام لێرەدا پرسـیارێک هاتـە پێش، ئـەویش ئـەوە کـە هەرچەنـد لـەنێوبردنی بناخـەی ڕێئاکتۆری ئـەتۆمیی عێڕاق بـە سـوودی ئیسـڕائیل بـوو، ئایـا بەڕاسـتی پێمـان خـۆش بـوو کـاری بۆمبـارانی ڕێئـاکتۆری ئـەتۆمیی عێڕاق بە ئێرانییەکان بسپێرین؟ ئەوان پێشتر دووجـار هـەوڵیان دابـوو

ئەوکارە بکەن و لەو ڕێیەدا ناکام ببوون. وەڵامی ئەم پرسیارە ڕاستەوخۆ لە دەفتەری سەرۆکوەزیرەوە درایەوە: «ئێمە بۆخۆمان ئەوکارە دەکەین».

بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە سەنعەتی فڕۆکەسازیی ئیسرائیل، دەستی کرد بە دروستکردنی ژمارەیەک بۆمبی برغوویی کە نووکێکی تیژیان هەبوو. ئەو نووکە تیژە دەیتوانی پێش تەقینەوە بە سانیەیەک بەشی دەرەوەی خانووبەرەکە هەڵدڕێ و بەوێدا بچێتە ژووری. سەنعەتی فڕۆکەسازی بۆمبێکی دیکەشی دروست کرد کە دەبوو بە ئامرازێکی فەرمانوەرگرەوە ببەسترێتەوە و ئامرازەکەش بنێرنە ژووری ڕیئاکتورەکە. ناردنی ئەو ئامرازە فەرمانوەرگرە بۆ نێو ڕیئاکتورەکە کە لە سەرەتادا بە نامومکین دەهاتە بەرچاو، خرایە ئەستۆی «مۆساد». بەڵام دەزانین کە پووڵ هەمیشە لە دنیادا گیروگرفتە چارەسەرنەکراوەکانی چارەسەر کردوە. بۆیە «مۆساد»یش بە پەنابردن بۆ پووڵ، ئەم گیروگرفتەی بە ئاسانی چارەسەر کرد، بەوجۆرە کە کارمەندە هەواڵگرییەکانی «مۆساد» پێوەندییان بە هێندێ کەسەوە گرت کە دەیانتوانی ئامرازە فەرمان-وەرگرەکە لەنێو ڕیئاکتوری ئەتۆمیی عێراقدا دابنێنەوە، لەوانەش ئەو تەکنیککارە فەڕانسەیی‌یانە کە لە بنیاتی ئەو ڕیئاکتورەدا خەریکی کار بوون. ئەوان ڕازی بوون کە ئەگەر پووڵێکی بەرچاویان بدرێتێ، کارەکە بکەن. دیارە بۆ ئیشکەرانی جێی متمانە، تێپەڕین لە پۆستە ئەمنیەتییەکان کارێکی دژوار نابێ.

بەڵام هێشتا ئەنجامدانی ئەم کارە خاڵێکی لاوازی هەبوو، کە پێش دەستپێکردنی دەبوو بۆ لەنێوبردنی ئەو خاڵە لاوازییەش کاری پێویست بکرێ. خاڵە لاوازییەکە ئەوە بوو کە ئەگەر فڕۆکە ئیسرائیلییەکان لە ئاسمان دەگەڵ فڕۆکە عێراقییەکان تووشی شەڕ بان یان بەنزینیان لێبڕابایە، دەبوو ئیجازەیان هەبێ لەسەر خاکی

ئێـران بنیشـنەوە. بـۆ وەدەسـتهێنـانی ئـەو مۆڵەتـە پێویسـت بـوو گفتوگۆیەکی پتر دەگەڵ ئێرانییەکان بکرێ.

بۆ بەڕێوەبردنی ئەم بەرنامەیە، بە یارمـەتیی «ئۆمشی»، کاشـانی و فەرماندەی هێزی ئاسمانی بڕیار درا نێوەڕاستی مانگی مارسی سـاڵی ١٩٨١ دیدارێک لە نێوان ئەبولحەسەنی بەنیسەدر، سـەرکۆماری ئێران کە هەر لەوکاتەدا فەرماندەی هێزە چەکدارەکانی ئـەم وڵاتـەش بـوو، و پرۆفیسـۆر «مۆشـێ ئـارێنز» Moshe Arens سـەرۆکی نوێنەرایـەتیی سیاسیی ئیسـڕائیل لـە ئەمریکا کە لـە نیزیکانی جێمتمانـەی «بگین» سەرۆکوەزیری ئیسڕائیل بوو، ئەنجام بدرێ.

ئـەم چاوپێکەوتنـە لـە باشـووری فەڕانسـە ئـەنجام درا. «ئارێنز» بـە فڕۆکەیەکی «پان ئێم» ڕاسـتەڕێ لـە فڕۆکەخانـەی کەنەدییـەوە چـووە «نیس» لـە باشـووری فەڕانسـە. بەنیسـەدریش بـە فڕۆکـەی تایبـەتیی خـۆی لـە تارانــەوە چـووە پـاریس و لـەوێوە گەیشـتە «نـیس» لـە باشووری فەڕانسە. ئەم دوو کەسە ماوەی ٦ سەعات لە هۆتێلەکانیان یـەکتریان دوانـد و ڕۆژی ٧ی ژوئـەنیان بـۆ هێـرش بۆسـەر بنیـاتی ڕێئـاکتۆری ئـەتۆمیی عێـڕاق دیـاری کـرد. ئـەو پێگەیـەش کـە بـۆ نیشـتنەوەی فڕۆکـە ئیسـڕائیلییەکان لــە خـاکی ئێـران دیـاری کـرا باشووری شاری تەورێز لە باکووری ئێران بوو.

فڕۆکـەوانێک کـە لــە لایـەن هێـزی ئاسـمانیی ئیسـڕائیلەوە بـۆ ڕێبەرایـەتیی تیمـی هێرشـەکە هـەڵبژێرا، سـەرهەنگ «یـۆرام ئـەیتان» Yoram Eitan، کوڕی سەرلەشکر «ڕافائیل ئـەیتان» سـەرۆکی سـتادی هێزەکانی بەرگریی ئیسڕائیل بوو (کە هیچ خزمایەتیی دەگـەڵ «ڕافـی ئەیتان» لە ڕێکخراوی هەواڵگریی سوپای ئیسڕائیل نـەبوو). ئیسڕائیل ڕێئـاکتۆرێکی سـاختەی لـە بیابـانی «نێگێـڤ» Negev سـاز کـرد تـا لەپێشدا بە بۆمبارانی ئەو، ڕاهێنـانی پێویست بۆ هێرشـە بنەڕەتییەکە بکـرێ. بـەیانیی ڕۆژی یەکشـەممە ٤ی مـانگی مـای، ئـەو فڕۆکەیـەی سـەرهەنگ «ئـەیتان»ی تێـدا بـوو، بـەربۆوە و ئـەو دەسـبەجێ مـرد.

خەبـەری ئـەو ڕووداوە درا بـە ژەنـڕاڵ «ئـەیتان». ئـەو کوڕەکـەی لەدەست دابوو.

فڕۆکەوانێکی دیکە کە وەک جێنشینی ئەو هەڵبژێرا، سەرهەنگ «یێر شامیر» Yair Shamir کوڕی پیاوێک بوو کە ماوەیەک دواتر بوو بە سەرۆکوەزیری ئیسرائیل، واتە ئیسحاق شامیر. سێ ڕۆژ پێش دەستپێکردنی هێرشەکە، ڕایەڵکەی «مۆساد» لە بەغداوە خەبەری دا کە ئامرازە فەرمانوەرگرەکە لە ڕێئاکتۆری ئەتۆمیدا دانراوە.

سـەعات ٥:٣٠ی پـاش نیـوەڕۆی ڕۆژی ٧ی ژوئـەنی ١٩٨١ شـەش جێتی F-15 کە بۆمبەکانیان هەڵگرتبوو دەگەڵ هەشت فڕۆکەی F-16 کـە دەگـەڵیان دەچـوون لـە فڕۆکەخانـەی «ڕامـات گـان» هەسـتان و بەرەو خۆرهەلات فڕین. ئەو فڕۆکانە شەش دانە بۆمبیان بە بنیاتی ڕێئاکتۆری ئـەتۆمیی عێراقدا دا. دوویـان نەتـەقین -بەلام ئەوە گرنگ نـەبوو- چونکـە تـەنیا یـەکێک لـە بۆمبـەکان نیشـانەکەی پێکابایـە بـەس بـوو. بنیـاتی ڕێئـاکتۆری ئـەتۆمیی عێـراق لەبـەین چـوو، فڕۆکـە ئیسرائیلییەکان هـیچ نیشـانەیەکیان لـە خۆیـان بـەجێ نەهێشـت و هـیچ لێکدانێک لە نێوان فڕۆکەکانی ئیسرائیل و عێراقدا لە ئاسمان ڕووی نـەدا و پێویسـتییەکیش بـۆ نیشـتنەوەی فڕۆکـە ئیسرائیلییەکان لـەسـەر خـاکی ئێران نەهاتـە پێش. لـە گەڕانـەوەیان بـۆ ئیسرائیلدا، فڕۆکەوانـە خۆشحاڵە ئیسرائیلییەکان لە ئاسمانی ئوردۆن دەگەڵ ئەو فڕۆکەیە کە قـەرار بـوو بـەنزینی لێوەربگرن یـەکیان گرتـەوە، بـەلام ئـەو کـارەش پێویسـت نـەبوو. عەمەلیاتەکـە لـە هـەموو بارێکـەوە بـە سـەرکەوتنی تەواوەوە کۆتایی هاتبوو.

ڕێکخـراوی هـەواڵگریی ئیسـرائیل پێشـنیاری بـە سـەرۆکوەزیـر و حکوومەتی ئیسرائیل کردبوو کە مەسـەلەی هێرشی ئیسرائیل بۆسـەر ڕێئاکتۆری ئەتۆمیی عێراق لـە ئاگاداریی گشـتی بشـاردرێتەوە. چونکـە ئاشـکرابوونی ئـەو بابەتـە سـەددام حوسـێنی ناچـار دەکـرد هـەوڵی تۆڵەئەسـتاندنەوە بـدا. بـەلام «مـەناخیم بگـین» کـە دەیەویسـت لـە هـەڵبژاردنی ٣٠ی ژوئەنـدا بەشـدار بێ، مەسـەلەکەی لـەقاو دا، چونکـە

پێیوابوو لەباری خۆشەویستیی نیشتمانییەوە ئەم کارە بە قازانجی خۆی دەبێ. ئاشکرایە کە لەنێوبردنی ڕیئاکتۆری ئەتۆمیی عێراق بۆ ئێرانییەکانیش زۆر شادیبەخش بوو. فەرماندەی هێزی ئاسمانیی ئێران لە ڕێگای پاریسەوە بە تەلەفون پێوەندیی بە «مەناخیم بگین»ەوە گرت و بۆ ئەو کارە سوپاسی کرد. ئەگەرچی بەنیسەدر، سەرکۆماری ئێرانیش بە لەنێوچوونی ڕیئاکتۆری ئەتۆمیی عێراق زۆر خۆشحاڵ بوو، بەڵام لەبەر تێبینیی دیپلۆماتی بە دەرکردنی بەیاننامەیەکی سووکەڵە دەستدرێژیی ئیسرائیل بۆ سەر دەسەڵاتی وڵاتێکی دیکەی مەحکووم کرد.

لەم کاتەدا گوازتنەوەی ئەو کەرەسە جەنگییانە کە ئێران کڕیبوونی لە فڕۆکەخانەی «بن گوریۆن»ەوە بۆ تاران کە سەرەتای مانگی مارسی ١٩٨١ دەستی پێکردبوو، بە باشی دەچووە پێش. دیارە، لە سەرەتای کارەکەدا، گوازتنەوەی گوللە گەورەکان بە فڕۆکە، گیروگرفتی دروست کردبوو، بۆیە ئێمە سەرەنجام بڕیارمان دا بە کەشتی لە بەندەری «ئەشدۆد» Ashdodی ئیسرائیلەوە بیانێرینە بەندەر عەبباس لە باشووری ئێران. کەرەسە و ئامرازە جەنگییەکانی دیکە بە فڕۆکە تەحویلی ئێران دران. لە نێوان مانگەکانی مارس و ئووتدا ٤٠ فڕۆکەی باربەری ئارژەنتینی لە تەل ئەبیب هەڵفڕین و کەرەسە جەنگییە کڕاوەکانی ئێرانیان گوازتەوە بۆ ئەو وڵاتە.

لە کۆتایی مانگی ژوئەندا، ڕێکخراوی هەواڵگری و ئەمنیەتی سۆڤیەت KGB لە ڕێگای نوێنەری خۆی لە ئیسرائیلەوە نامەیەکی ڕەسمیی بۆ سەرۆکی ستادی ڕێکخراوی هەواڵگریی سەربازیی سوپای ئیسرائیل نارد. ئەم نامەیە کە لەلایەن سەرۆکی پێوەندییەکانی دەرەوەی KGBوە ئیمزا کرابوو، داوای لە ئیسرائیل کردبوو کە لەبارەی ئەو فڕۆکانەوە کە لە ئیسرائیل هەڵفڕیون و لە نزیک سنووری سۆڤیەت و تورکیەوە چوونە تاران ڕوونکردنەوە بدا. سەرۆکی ستاد ژەنراڵ «ساگی» نامەکەی دا بە من و ئەمن دام بە کۆمیتەی هاوبەشی «مۆساد» و ئیدارەی پێوەندییەکانی دەرەوەی

ڕێکخراوی هەواڵگریی سوپای ئیسرائیل. ئەمن لەو باوەڕەدا بووم کە باش وایە ئیسرائیل لە وەڵامی نامەی سەرۆکی پێوەندییەکانی دەرەوەی KGBدا ڕوونکردنەوەی پێویست بدا. بەڵام لێرەدا خۆهەڵکێشانی ئیسرائیلییەکان گوڵی کرد و زۆربەی ئەوانەی دەبوو جوابی ئەو نامەیە بدەنەوە، بێ‌ئەوەی ڕاوێژ دەگەڵ دفتەری سەرۆک-وەزیر بکەن، وەڵامیان دایەوە کە حکوومەتی ئیسرائیل بە پێویست نازانێ سیاسەتە دەرەکی و ئەمنیەتییەکانی خۆی دەگەڵ خەڵکی دیکە بێنێتە گۆڕێ. جۆرێکی دیکە بڵێین بە سۆڤیەتییەکانیان گوت: «بڕۆن. بە ئێوە چی؟».

ئەم وەڵامە، بە پەلە و گەوجانە بوو. نامەکە سەرۆکی ئیدارەی پێوەندییەکانی دەرەوەی ڕێکخراوی هەواڵگریی سوپای ئیسرائیل ئیمزای کرد و حەوتووی یەکەمی ژووئیە، درا بە نوێنەری سۆڤیەت. ڕۆژی ١٨ی ژووئیە، وەڵامی سۆڤیەت هاتەوە. یەکێک لەو فڕۆکانەی کەرەسە جەنگییەکانی دەگوازتەوە بۆ ئێران، لەلایەن سۆڤیەتییەکانەوە بەردرایەوە و سێ کەس لە فڕۆکەوانە ئارژەنتینییەکان کوژران و پارچە یەدەکییەکانی فڕۆکەی F_4 لە سەرانسەری سنوورەکانی ئەرمەنستان و تورکیەدا بڵاو بوونەوە. بەوجۆرە سۆڤیەتییەکان لە نێوئاخنی فڕۆکەکان ئاگادار بوون.

سۆڤیەتییەکان بە خۆڕانانەوە بە دنیایان ڕاگەیاند کە فڕۆکە بەردراوەوەکە کەرەسەی جەنگیی ئەمریکایی بۆ ئێران گوازتۆتەوە. ئیسرائیلییەکان حاشایان لەوە کرد هیچ ئاگادارییەکیان لە بارەی ئەو فڕۆکەیەوە هەبێ. پاش ئەو ڕووداوە فڕۆکە باربەرییەکانی هەڵگری کەرەسەی شەڕ هەروا فڕین لە تەل ئەبیبەوە بۆ تارانیان درێژە پێ‌دا. بەڵام لەوە بەدوا پتر بە بەشی سنوورەکانی تورکیەدا دەفڕین. چونکە «ڕابێرت گەیتس» دڵنیای کردبوونەوە کە حکوومەتی تورکیە ناڕەزایەتی بەرامبەر بەو بابەتە نیشان نادا. لە نیوەی مانگی ئووتی ساڵی ١٩٨١دا، ئەم قۆناخە لە گوازتنەوەی کەرەسە جەنگییەکان بۆ ئێران بە فڕۆکە و کەشتی کۆتایی هات.

ئەگەرچی ئەمن پێوەندیی بەردەوامم دەگەڵ «فریدی» نەبوو و تەنیا جاروبار یەکترمان دەدیت، بەڵام نێوانمان هەروا گەرم و پڕ لە خۆشەویستی بوو. دەگەڵ هەموو ئەو ڕووداوە لەنەکاوانەی لە ئێران دەهاتنە پێش و منیان بەخۆوە خەریک دەکرد، هەمیشە ئەوم لەبیر بوو. ئەو کچێکی ببوو کە ناومان نابوو «هێڕووت» Herrut. یەکەمجار کە ئەمن کچەکەمم بینی لە هۆتێلی لیسبوون لە پرتوگال بوو، کە بە دیتنی لە خۆشییان گریام. بەڵام نەمدەزانی دوارۆژمان بەکوێ دەگا.

«فریدی» بەدرێژایی ساڵی ١٩٨٠، کچەکەمانی لە «ماناگوا» بە دایەنێک دەسپارد و هەروەخت دەرفەتێکمان بۆ ڕەخسابایە، ئەو دەهاتە پرتوگال و لەوێ یەکترمان دەبینی. بەرنامەی من زۆر چڕوپڕ بوو و «فریدی» پێی خۆش نەبوو بە منداڵەوە سەفەر بکا. بۆیە لە نێوەڕاستی ساڵی ١٩٨١دا هۆشداری دامێ کە لەوجۆرە ژیانە ماندوو بووە.

ئەو جارێکیان کە لە «لیسبۆن» پیاسەمان دەکرد، گوتی: «ئاری، ئەمن تۆم خۆش دەوێ و دەمەوێ لێت نزیکتر بم. بۆیە بڕیارم داوە کارەکەم وەلا نێم و بێمە لیسبۆن لێرە بژیم».

قسەکەی منی لەرزاند. بێگومان، ئەم وەزعە ژیانی بۆ هەردووکمان ئاسانتر دەکرد، سەفەرەکانی نێوان ئیسرائیل، ئوروپا، ئەمریکا و ئێران، نەیاندەتوانی من بەرنە نزیک «نیکاراگوا». بەڵام «لیسبۆن» کەوتبووە ناوەندی هەموو سەفەرەکانم. بە لەبەرچاوگرتنی ئەوە کە پرتوگال هێشتا پێوەندییە سیاسییەکانی دەگەڵ ئێران پاراستبوو، ئەمن دەمتوانی لەم وڵاتە ئێرانییەکان ببینم و «فریدی»یش لە پرتوگال زۆر هەستی بە ئاسوودەیی دەکرد، چونکە دۆستی زۆری لەم وڵاتە هەبوون. گوتم: «شتی چاکە، ئەگەر وابێ ئێمە دەرفەتمان دەبێ زۆرتر یەکتر ببینین.».

ئەو گوتی: «بەڕاستی جێی پێکەنینە». دوایە نێوچاوانی تێکنا و درێژەی پێدا: «مەسەلەکە لەوانە گرنگترە. ئاری، ئەمن دەمەوێ ئەتۆ

دەست لەم کارە بەردەی. ئەمە کارێکی ترسناکە و جگە لەوەش دەرفەتمان پێنادا بە ڕادەی پێویست یەکتر ببینین».

ئەمن دەمزانی وەلانانی کارەکەم لەتواناى مندا نیە. ئەم کارە بۆمن بەرهەمی ڕەزامەندیی ڕووحی و هەژان بوو. ئەمن حەزم لە کارکردن دەگەڵ هاوکارەکانم بوو و ئەو کارەم بۆ ئیسرائیل دەکرد و بۆیە لەخۆمدا هەستم بە گرنگی دەکرد. جگە لەوەش، ئەگەر چووبامە پرتوگال، دەمتوانی چکارێک بۆخۆم پەیدا بکەم!

دەگەڵ ئەوەی «فریدی» لە دژکردەوەی من لەوبارەیەوە ناڕەحەت و دڵسارد بوو، ئەو کارەکەی لە «ماناگوا» وەلا نا و بۆ مانەوە هاتە «لیسبۆن». «فریدی» دایەنی منداڵەکەشمانی لەگەڵ خۆی هێنابووە پرتوگال و لە «کۆمپانیی نیشتمانیی فڕۆکەوانیی پرتوگال» TAP وەک ئەفسەری پێوەندییە گشتییەکانی کۆمپانی دەستی بەکار کرد. «فریدی» پێی خۆش نەبوو ئەمن درێژە بە کارەکەم بدەم و بەردەوام پێی دادەگرت کە دەبێ کارەکەم وەلا بنێم. بەوحاڵەش ئەو منی بە سەرۆکی کۆمپانییەکە ناساند. دیداری من دەگەڵ سەرۆکی کۆمپانیی TAP بووە هۆی ئەوە کە ئیسرائیل بۆ گوازتنەوەی ئەو کەرەسە جەنگییانە کە ئێران کڕیبوونی فڕۆکە لە پرتوگال بەکرێ بگرێ. ئامانجی «فریدی» لە هاتن بۆ پرتوگال و مانەوە و کارکردن لەو وڵاتە، ئەوە بوو کە بەڵکوو بتوانێ من قانیع بکا ژیانێکی هاوبەش دەست پێبکەین، نەک ئەوە کە ئەمن جاروبار لەسەر ڕێگاکەم لابدەمە پرتوگال و چەند ڕۆژێکی دەگەڵ بەسەر بەرم.

مانگی مارسی ساڵی ۱۹۸۱، کۆمیتەی هاوبەش دەبوو بۆ فرۆشتنی نهێنیی ئەو کەرەسە جەنگییانەی لە ڕێککەوتننامەی پاریسدا قەولی بە ئێران دابوو کاردروستایی پێویست بکا. هێندێک کۆمپانیی بازرگانی بە ناوی جۆراوجۆر پێوەندییان دەگەڵ ئێرانییەکان و بەرهەمهێنەران و سەوداگەرانی کەرەسەی جەنگی گرت، پێرستی پێداویستییە جەنگییەکانی ئێرانیان بەدەست هێنا، کاری گوازتنەوەیانیان ڕێکخست

و به بیرمەندی و زیرەکیی تەواو چەندین میلیۆن دۆلار موعامەلەیان لەگەڵ یەکتر کرد.

فرۆشتنی کەرەسەی شەڕ بە ئێران لەسەر بناخەی ڕێککەوتنێکی نهێنی کە مانگی ئووتی ۱۹۸۰ لە نێوان «مەناخیم بگین» سەرۆک-وەزیری ئیسرائیل و «ویلیام کەیسی»دا کرابوو، ئەنجام دەدرا. وردەکاریی ئەو کەرەسە جەنگییانە کە ئیسرائیل دەبوو بە ئێرانیان بفرۆشێ، لە دیسامبری ساڵی ۱۹۸۰دا دیاری کرابوو و «دێڤید کیمچە» گەورە ئەندامی کۆمیتەی هاوبەش ڕاستەوخۆ دەگەڵ «ڕابێرت گەیتس» نوێنەری پایەبەرزی CIA خەریکی ڕاپەڕاندنی بوون. سەرەتای ساڵی ۱۹۸۱، «ڕابێرت گەیتس» موافەقەتی دەگەڵ فرۆشتنی کەرەسەی ئاسایی و ناپێشکەوتوو بە ئێران کردبوو و کۆمیتەی هاوبەش لە دیدارەکانی خۆیدا کە لە باکووری تەل ئەبیب بەڕێوە دەچوون، بە هاوکاریی CIA جێبەجێی کرد.

بەڵام «گەیتس» لە سەرەتای دەستپێکردنی ئەم بەرنامەیەدا دەگەڵ فرۆشتنی کەرەسەی شەڕ و پێداویستیی ئەلیکترۆنیی پێشکەوتووی ئەمریکایی بە ئێران موخالیف بوو. دۆستانی ئێمە لە تاران بۆ بەرگریی هێزە زەمینی و ئاسمانییەکانیان لەڕادە بەدەر پێویستییان بەو دەزگا ئەلیکترۆنییانە هەبوو، دیارە ئیسرائیلیش ئەوەندەی لە توانایدا بوو، حەزی دەکرد لە شەڕ بەدژی عێراقدا کۆمەگی ئێرانییەکان بکا. لەو کاتەدا، عێراقییەکان بە توندی لە بەرەکانی شەڕ لە باشووری ئێران گیریان کردبوو، نە دەیانتوانی بچنە پێش و نە پاشەکشەشیان بۆ دەکرا. کۆمیتەی هاوبەش هەستی کرد کە ئەگەر ئێران کەرەسەی پێشکەوتووی شەڕی هەبێ، باشتر دەتوانێ بەرامبەر بە عێراقییەکان شەڕ بکا، بەڵام دیارە دەبوو نرخی ئەو کەرەسانە بدا. بۆیە، کۆمیتەی هاوبەش دووکەس لە ئیشکەرانی خۆی -«ڕافی ئەیتان» و منی هەردوو بەناوی دروستکراو- ناردە نیۆیۆرک، تا بە شێوەی نهێنی کاری پێویست بۆ ئامادەکردنی ئامراز و کەرەسەی

جەنگیی پێشکەوتوو بۆ ئێران کە ئەمریکا فرۆشتنی ئەوان بەو وڵاتەی قەدەغە کردبوو، دەست پێ‌بکرێ.

جێگایەک کە بۆ ئەو کارانە هەڵبژێرابوو، کەوتبووە شەقامی «جان» لە بەشی «واڵ ستریت». ئێمە توانیمان تیمێکی پەنجا کەسی کە زۆربەیان وردە سەوداگەری ئامرازی شەڕ بوون و کەرەسە و ئامرازی ئەلیکترۆنییان لە کۆمپانییە ئەمریکایی‌یەکان دەکڕی، لەو جێگایە کۆ بکەینەوە و دەگەڵ وان ئەو کەرەسانە بۆ فرۆشتن بە ئێران ئامادە بکەین. بۆ کڕین و فرۆشتنی ئەو کەرەسانە پێویستیمان بە مۆڵەتی ڕەسمی هەبوو. بۆیە بڕیار درا، ئیسرائیل بەوناوە کە ئەم کەرەسانەی بۆ بەکارهێنانی خۆی دەوێن، مۆڵەتی پێویست بۆ سەوداگەرەکان دەربکا و بیکاتە مەرج کە ئەمانە دێنە ئیسرائیل و بە هیچ وڵاتێکی دیکە نافرۆشرێن. بەپێی قانوون و ڕێوشوێنەکانی ئەمریکا، دەرچوونی ئەو مۆڵەتنامەیە حەتمی بوو. ئێمە هێندێ فۆڕمی سپیمان لە مۆڵەتنامەی کڕین و فرۆشتنی ئەو کەلوپەلانە هەبوون و پاش دەرچوونی مۆڵەتنامەکان، هێندێ نوسخەمان بۆ وەزارەتی بەرگریی ئیسرائیل دەنارد تا لە پێشینەکانی وەزارەتی بەرگریدا ڕابگیرێن و ئەگەر لە دوارۆژدا کەسێک ویستی سەیریان بکا، دەرەتانی ئەوە هەبێ.

ئەو بەشە لە ئامرازەکان کە قەبارەیان زۆر نەبوو، عادەتەن حەوتانە بەهۆی بۆیینگی ٧٠٧ی ئیدارەی پێوەندییەکانی دەرەوە یان بە فڕۆکەی باربەریی ئیسرائیل لە نیۆیۆرکەوە دەگوازرانەوە بۆ تەل ئەبیب. پاشان فڕۆکە کرێگرتە ئارژەنتینییەکان لە تەل ئەبیبەوە دەیان-بردنە تاران. ئەگەر قەبارەی ئامراز و کەرەسە کڕراوەکان گەورە بایە، ئێمە فڕۆکەیەکمان لە TAP لە پرتوگال یان «گینز پێت» Guinness Peat لە ئیرلەند بە کرێ دەگرت و ئەوان کەرەسەکانیان دەبردنە تاران.

سەرپەرستیی هەموو ئەو کارانە لە ئەستۆی «ئەیتان» بوو و ئەمن بۆخۆم وەختێکی زۆرم بە سەفەری نێوان تەل ئەبیب و نیۆیۆرک دە گوزەرا و لەنێو ڕێگادا بۆ دیتنی ئێرانییەکان کە دەهاتنە پرتوگال و وەرگرتنی لیستی تازەی پێداویستییە جەنگییەکانیان لەم ولاتە لام دەدا.

خەرجی ئەو کاروبارە نهێنییە بۆ کڕین و فرۆشتنی ئامراز و کەرەسەی شەڕ بە ئێران، لە بوودجەی عەمەلیاتیی کۆمیتەی هاوبەش کە لە بوودجەی «مۆساد» و ئیدارەی پێوەندییەکانی دەرەوەی ڕێکخراوی هەواڵگریی سوپای ئیسرائیل، جیا بوو دابین دەکرا. ئەو قازانجە زۆرەی لە فرۆشتنی کەرەسەی شەڕ بە ئێران دەست دەکەوت، ڕۆژبەڕۆژ دارایی «سەرمایەی ڕەش»ی زیاد دەکرد، بەجۆرێک کە سەرەنجام ئەوەی لەو حیسابەدا هەبوو، کۆمیتەی هاوبەشی لەباری بوودجەوە سەربەخۆ کرد. ئەو کەرەسە جەنگییانەی بە ئێران دەفرۆشران، هەم لەو چەکوچۆڵەیە کە لە نیۆیۆرک دەکڕرا دابین دەبوون، هەم لەو چەکوچۆڵە ناپێشکەوتووانە کە ئەمریکایی-یەکان ناڕاستەوخۆ ڕەزامەندییان لەسەر فرۆشتنیان نیشان دابوو. چونکە زۆر کۆمپانی لە کڕین و فرۆشتنی ئەو ئامراز و کەرەسانەدا بەشدار بوون، ئێمە بە پێویستمان زانی بۆ پاراستنی «سەرمایەی ڕەش» یەکەیەکی ئابووریی دایک بە ناوێکی تایبەتی دامەزرێنین. کاتێک کۆمیتەی هاوبەش سەرگەرمی بڕیاردان لەسەر ناوی ئەم کۆمپانییە دایکە بوو، ناوی «ئۆرا» Oraم بە مێشکدا هات. «ئۆرا» لە زمانی عیبریدا بە مانای ڕووناکییە. بەڵام هۆی ئەوە کە ئەو ناوە بە مێشکی مندا هات، ئەوە بوو کە کچە جحێڵەیەک لە ئیدارەکەی من لە تەل ئەبیب کاری دەکرد کە ناوی «ئۆرا» بوو. پێوەندیی من دەگەڵ «ئۆرا» بە تەواوی ئاشقانە نەبوو، بەڵام لە دۆستایەتییەکی ئاساییش بەولاوەتر چووبوو. بە هەرحاڵ، ئەمن ناوی «ئۆرا»م پێشنیار کرد و بە قبووڵکرانی پێشنیارەکەم لەلایەن کۆمیتەی هاوبەشەوە، یەکەیەکی

گەورەی ئابووری پێکهات کە ناوی نرا «گرووپی ئۆرا» و لە ساڵەکانی دواتردا، چەند ملیارد دۆلار موعامەلەی کرد.

عەمەلیاتی شەقامی «جان» بە باشی دەچووە پێش و ئامراز و کەرەسەی ئەلیکترۆنی بە ناوی ئیسرائیل دەکڕران و بە ڕواڵەت بەرەو ئیسرائیل، بەڵام لەڕاستیدا بەرەو تاران بەڕێ دەکران. کەچی لەونێوەدا ژنێکی کارمەندی ئەم ڕێکخراوە کە خەڵکی سویس بوو، سەرنجی بۆ لای کارکردەکانی ئەو ڕێکخراوە ڕاکێشرا و بابەتەکەی بۆ «لێسلی م. گەڵب» Leslie M. Gelb کە کاری بۆ لقی واشینگتۆنی ڕۆژنامەی «نیۆیۆرک تایمز» New York Times دەکرد، ڕوون کردەوە. ئەو ژنە بۆ «گەڵب»ی ڕوون کردبۆوە کە ئەو کۆمپانییەی ئەو کاری بۆ دەکا بەڕواڵەت ناوی بێبناخەی هەنارده و هاورده (صادرات و واردات)ی لەسەر خۆی داناوە، لەپەستا ناوی دەگۆڕێ و وا دێتە بەرچاو کە بڕێکی یەکجار زۆر ئامرازی ئەلیکترۆنی بۆ ئیسرائیل دەنێرێ، بەڵام لەلایەکی دیکە خەڵکێکی زۆر لەو کۆمپانییە کار دەکەن کە هەمیشە بە زمانی فارسی قسە دەکەن. ئەم قسەیە بە تەواوی ڕاست بوو. -ئەمن و «هووشەنگی لاوی» کە دەگەڵ ئێمە کاری دەکرد،هەمیشە بە زمانی فارسی پێکەوە دەدواین.

ڕۆژی ٩ی مانگی مارسی ١٩٨٢، ڕۆژنامەی «نیۆیۆرک تایمز» لە ستوونی «لێکدانەوەی هەواڵەکان»دا کە «گەڵب» نووسیبووی، هەروا سادە نووسی: «ئیسرائیل بە نهێنی کەرەسەی شەڕی دروستکراوی ئەمریکا دەدا بە ئێران». ئێمە دەسبەجێ تێگەیشتین کە سەرچاوەی هەواڵەکەی «گەڵب» لە ئیدارەکەی خۆماندایە. «ڕافی ئەیتان» کە بە بێبەزەیی بەناوبانگ بوو، سەگەکانی بۆ سزادانی خەبەردەرەکە بەرەڵا کرد.

ئەو سەگانەی لەم بەسەرهاتەدا سوودیان لێوەرگیرا، تاقمێک لە کارمەندانی ئەفریقای باشوویی بوون کە ئەرکیان ئەوە بوو بۆ دڵنیابوون لەوە کە کەرەسە جەنگییەکان لە هەر وڵاتێکی دنیاوە، بە

سلامەتی و بێ گیرو گرفت بگەنە ئەم ولاتە، هەنگاوی پێویست هەڵێننەوە. ئەمانە کۆمەڵێک جاسووسی نزم و دڕندەپیشە بوون و چونکە ئیسرائیل و ئەفریقای باشوور پێکەوە دۆست بوون، کارمەندە هەواڵدەرییەکانی ئەم دوو ولاتە هێندێ جار داوای کۆمەگیان لە یەکتر دەکرد یان بە هاواری یەکترەوە دەهاتن. بەهەرحاڵ لە وەختێکدا کە ئەمن و «ئەیتان» لە ئەمریکا دەردەکەوتین، سەگەکان گازیان لە گۆشتی خەبەردەری بەدبەخت گرت.

هەتا ئەمڕۆش نەمتوانی بزانم چۆنیان ئەوکارە کرد، بەڵام ئەو ژنە سویسییە کە خەبەری کڕین و فرۆشتنی کەرەسە جەنگییەکانی ئاشکرا کردبوو، پێچرایەوە و لە فڕۆکەیەکی گوازتنەوەدا کە بە ئامراز و کەرەسەی شەڕ ئاخنرابوو، ناردرایە «پریتۆریا» Pretoria. «ئەیتان» باوەڕی وا بوو کە ئەو ژنە دەبێ بکوژرێ، بەڵام ئەندامانی دیکەی کۆمیتەی هاوبەش، یەک لەوان بۆخۆم دەنگی «نا»مان بەوکارە دا. پاش ئەوە ژنە ترسڕێنیشتووەکە لە ئەفریقای باشوور خرایە بەر فێرکاریی پێویست، ڕاستییە تاڵە مێژووییەکانی ژیانی لێ حاڵی کران و ناردرایەوە ئورووپا. دەگەڵ بێدەنگکردنی سەرچاوەی گرنگی خەبەری ڕۆژنامەی New York times، دەفتەری کۆمپانیی شەقامی «جان» داخرا و بۆیە دەلیلێک نەمابوو کە ڕۆژنامەکانی دیکە وەدوای خەبەرەکە بکەون و لەوە بەدوا هیچ باسێکی حکوومەتی ئەمریکا یان ئیسرائیل نەهاتە گۆڕێ. ئیسرائیلییەکان لە سەرەتای ساڵی ١٩٨١ڕا کە دەست بە فرۆشتنی کەرەسەی شەڕ بە ئێران کرا، هەمیشە نیگەرانی ڕووداوێکی وەک ئەوەکەی غەمەلیاتی شەقامی «جان» بوون. ئێمە باشمان دەزانی ئەگەر هەڵەیەک ڕوو بدا و بابەتەکە ئاشکرا بێ، ئەمریکا دەسبەجێ قامک لەسەر ئیسرائیل دادەنێ و سەرکۆنەی دنیا دێنێتە سەر ئیسرائیل. هەروەخت کاربەدەستانی ئەمریکا کاری ناقانوونییان کردوە و پێوە بوون، شێتانە بۆ بەرگری لە خۆیان کەوتوونە درۆکردن و تاوانەکەیان هاویشتۆتە ئەستۆی

خەڵکی دیکە. هیچمان ناتوانین مەسەلەی «واترِ گێت» لەبیر بکەین. دیارە بابەتی کڕین و فرۆشتنی چەک و تەقەمەنیی شەڕ لە ڕووداوی «واترِ گێت»یش گەورەتر بوو.

ئێمە بۆ شاردنەوەی کاری کڕین و فرۆشتنی کەرەسەی شەڕ، دوو تێبینیمان کردن. تێبینیی یەکەم پێوەندیی بە «ئاریەل شارۆن» Ariel Sharon، وەزیری بەرگریی ئیسرائیلەوە هەبوو، کە لە سەرەتای ساڵی ١٩٨١دا بۆ ئەو پۆستە هەڵبژێردرابوو. ئەو لە لایەنگرانی سەرسەختی فرۆشتنی کەرەسەی شەڕ بە ئێران بوو و بڕیاری دا بە پێوەندیی کەسی دەگەڵ کاربەدەستانی دەوڵەتی ئەمریکا ڕەزامەندیی ئەوان لەسەر کڕینی کەرەسەی شەڕ و فرۆشتنی بە ئێران بەدەست بێنێ. ئەو ئەمریکایی‌یانە کە «شارۆن» بەو مەبەستە پێوەندیی دەگەڵ گرتن، یەکیان «ڕابێرت گەیتس» یارمەتیدەری «ویلیام کەیسی» سەرۆکی CIA، و ئەوی دیکە «مەک فارلین» بوون. «مەک فارلین» لەو کاتەدا سەرۆکی ئەنجومەنی نیشتمانی بوو.

شارۆن بە یەکێک لە ئەفسەرە گرنگەکانی سوپای ئیسرائیل دەژمێردرا. بەڵام ساڵی ١٩٧٠ لەسەر ئەوەی وتووێژی دەگەڵ گۆڤاری Playboy کردبوو و ڕەخنەی لە «گولدا مایەر» سەرۆک-وەزیری ئیسرائیل گرتبوو، لە خزمەتی سوپا لایان دا. ئەو لە شەڕی ١٩٧٣دا، وەک ژەنراڵی زەخیرەی سوپا دووبارە لە مەیداندا دەرکەوتەوە و ئیسرائیلییەکانی لە شکست لە بەرەی میسردا نەجات دا. پاش ئەوە «شارۆن» ماوەی چەند ساڵ لە خزمەتی سوپادا مایەوە، تا ئەوەی حیزبی کرێکار، کاندیدابوونی ئەو بۆ سەرۆکایەتیی ستادی سوپای ڕەت کردەوە. چونکە ئەو کارە «شارۆن»ی دڵسارد و نارەحەت کرد، ئەو بە یەکجاری خزمەتی سوپای بەجێ هێشت، بەڵام بەرزەفڕییە سیاسییەکانی هەروەک خۆیان مانەوە. لە هەڵبژاردنی ساڵی ١٩٧٧دا ئەو وەک ڕێبەری حیزبێک کە بە «شلۆم زیۆن» بە مانای «ئاشتی بۆ zion» ناو دەبرا، خۆی بۆ نوێنەرایەتیی

«کنێست» Kenesset (ئەنجومەنی قانووندانانی ئیسرائیل) کاندید کرد. هەر کە حیزبەکەی دوو کورسیی لە «کنێست» بەدەست هێنان، ئەو دەگەڵ حیزبی لیکوود بووە هاوپەیمان و بە وەزیری کشتوکاڵ دیاری کرا. ساڵی ۱۹۸۱، ئەو پلەی چووە سەرێ و بوو بە وەزیری بەرگریی ئیسرائیل.

بەلام لە جەنگەی ساڵەکانی نێوان ۱۹۷۵ و ۱۹۷۷دا شارۆن هاونیشتمانێکی ئاسایی ئیسرائیل بوو و هەوڵی دەدا بە موعامەلەی کەرەسەی شەڕ دەگەڵ ئەمریکای ناوەندی دەستی بە پووڵ و پارەیەکی زۆر رابگا. بۆ گەیشتن بەو ئامانجە، کۆمەڵێک خەڵکی جۆراوجۆر لە ڕێکخراوەکەی ئەودا کاریان دەکرد کە یەکێک لەوان «مایک هەراری» Mike Harari کارمەندی بەرتووڕەییکەوتووی «مۆساد» بوو، کە چونکە لە «مەئمووریەتی پێشخزمەتی مەڕاکیشی»دا تووشی شکست ببوو و لە جیاتی «ئەحمەد سەلامە» کەسێکی بێگوناحی کوشتبوو، ناچار بوو ئیسرائیل بەجێ بێڵێ. «ئەحمەد سەلامە» یەکێک لەو فەلەستینییانە بوو کە دەستیان لە کوشتاری قارەمانانی وەرزشیی ئیسرائیل لە یارییەکانی ئولەمپیکی ساڵی ۱۹۷۲ لە مونیخدا هەبوو و بۆیە ئیسرائیل بڕیاری دابوو تێرۆری بکا. «هەراری» بێجگە لەوە یەکێک لە هاودەستانی نزیکی «مانوێل نۆریەگا» Manuel Noriega سەرۆکی هەواڵگریی سوپای پاناما بوو.

ڕایەڵکەکەی «شارۆن» دەیتوانی ئامراز و کەرەسەی سەربازی لە ئیسرائیلەوە بە ولاتانی جۆراوجۆری ئەمریکای ناوەندی، وەک «ئێل سالڤادۆر»، «گواتمالا»، «پاناما»، «کۆستاریکا» و تەنانەت مەکزیکۆ بفرۆشێ. ئاشکرایە کە ئەم کارە دەگەڵ سیاسەتی ڕەسمیی ئیسرائیل ڕێک نەدەهاتەوە و کابینەی ئیسرائیلیش دەگەڵی موخالیف بوو، بەلام «شارۆن» لەوە وەحشیتر بوو کە کەس بتوانێ رامی بکا. بۆیە ڕایەڵکەی تایبەتیی «شارۆن» ئەو کەرەسە جەنگییانەی دەیویستن لە

کارخانـــە ئیســـڕائیلییەکانی دەکـــڕین و مۆڵـــەتی فرۆشتنیانیشـــی لـــە حکوومـــەتی ئیسـڕائیل وەردەگـرت. «گەیـتس» لـەباری پیشـەییـیـەوە ئـــۆگریی بـــە کارەکـــانی ڕایەڵکـــەی «شـــاڕۆن» و دەســـتوپێوەندە هەواڵگرییـە بـێباکـەکانی لـە فرۆشـتنی کەرەسـەی شـەڕ بـە وڵاتـانی ئەمریکای ناوەندیدا پەیدا کردبوو. سـاڵی١٩٨١، ڕایەڵکەی عەمـەلیاتیی «شـاڕۆن» و «هـەراری» -وەک دەیـانگوت «هـەراری» پتر ببـوو بـە ڕایەڵکەیـەکی CIA، تـا ڕایەڵکەیـەکی عەمـەلیاتیی ئیسـڕائیلی- لـە ئاکامی کـڕین و فرۆشـتنی کەرەســەی جۆراوجـۆری جەنگیـدا حیسـابەکانی خۆیان لە بانکەکاندا پڕ دەکرد.

هـەر ئەوسـاڵە (١٩٨١)، «شـاڕۆن» و «هـەراری» دەسـتیان کـرد بـە ناردنی ئـامراز و کەرەسـەی شـەڕ بۆ سـوپایەکی نهێنی لـە ئـەمریکای ناوەندی کە پێی دەگوترا «کۆنتڕا» Contra. ئامـانجی «کۆنتڕا» ئـەوە بـوو کـە حکوومـەتی «سـەندی نیسـتا» کـە سـاڵی ١٩٧٩ دەسـەڵاتی «نیکاراگوا»ی بەدەسـتەوە گرتبوو، لەپێشـدا ناسـەقامگیر بکـا و دوایـە بیڕووخێنـێ. «کۆنتڕا» توانـای دارایـی نـەبوو -کـۆنگرەی ئـەمریکاش حـەزی نـەدەکرد یارمـەتیی مـاڵیی پـێبکـا- و بۆیـە ئـەو ڕێکخـراوە بۆ کڕینی کەرەسەی شەڕ بێئەندازە پێویستیی بە دراوی نەغد هەبوو.

«شـــاڕۆن» بـــە هـــەموو تواناکەیـــەوە نـــەیتوانی ســـەرۆکوەزیـــری ئیسـڕائیل یـان ڕێبـەرانی کۆمەڵگـەی هـەواڵگریی ئیسـڕائیل ناچـار بکـا خەرجی ئەو کەرەسە جەنگییانە کە سوپای «کۆنتڕا» پێویسـتی بـوون لە دارایی «سەرمایەی ڕەش» کە لـە ڕێـی فرۆشـتنی کەرەسـەی شـەڕ بە ئێرانـەوە بەدەسـت هـاتبوو، دابـین بکـا. بۆیـە، هێنـدێ لـە ئیشـکەرانی ڕایەڵکـەی «شـاڕۆن» بـە پشـتیوانیی «گەیـتس» و CIA بڕیاریـان دا بۆخۆیان هەوڵی دابینکردنی پووڵ بدەن. بۆ وەدیهێنـانی ئـەو ئامانجـە، بە قسـەی «هـەراری»، ڕایەڵکـەی «شـاڕۆن» دەسـتی کـرد بـە نـاردنی کۆکایین لە ئەمریکای باشوورەوە بۆ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لـە ڕێگـای ئـەمریکای ناوەندییـەوە. ڕۆڵـی گرینـگ لـەو بەرنامەیـەدا لـە

ئەستۆی «مانوێل نۆریەگا» بوو. «نۆریەگا» لە نیوەی دەیەی ساڵەکانی ١٩٧٠وە کە «جۆرج بووش» سەرۆکایەتیی CIAی لە ئەستۆ بوو، ئەوی دەناسی. سەدان تۆن کۆکایین گەیشتە ئەمریکا و «سەرمایەی ڕەش»ێکی دیکە کە زۆر خێرا بەهرەی لێوەردەگیرا، دروست بوو.

بە لەبەرچاوگرتنی پێوەندیی نزیکی «گەیتس» و «شارۆن» لەلایەک و پێوەندیی تایبەتی نێوان «ڕابێرت مەک فارلین» و «ڕافی ئەیتان» لەلایەکی دیکە، بە هەوڵی «شارۆن» ڕێککەوتنێکی درێژخایەن لەنێوان ئیسرائیل و ئەمریکادا پێکهات. پێکهاتنی ئەو ڕێککەوتننامە ستراتژیکییەی نێوان «شارۆن» و ئەمریکا بە ئاگاداریی هەمووان گەیشت، بەڵام نێوەرۆکی ڕێککەوتننامەکە بە نهێنی مایەوە و هەتا ئەمڕۆش وەڵامی ئەو کەسانە نەدراوەتەوە کە داوایان کردوە بەپێی قانوون و ڕێوشوێنەکانی «ئازادیی چاپەمەنی» نێوەرۆکی ئەو ڕێککەوتننامەیەیان بۆ ڕوون بکرێتەوە.

بەوحاڵە بەشێک لە ڕێککەوتننامەکە نیشانی دەدا کە هەموو ئەو کەرەسە جەنگییە ئەمریکاییيانەی بە ئیسرائیل فرۆشراون، ئەگەر تەکنۆلۆژییەکەیان بیست ساڵ یان کۆنتر بێ، بە نەزەر و بەمەسڵەحەتزانینی حکوومەتی ئیسرائیل دەتوانێ بە خەڵکی دیکە بفرۆشرێ. دەقی ڕێککەوتننامەکە ئەوەندە گشتی و کێشدار بوو کە دەکرا وا لێکبدرێتەوە کە ئیسرائیل هەقی هەیە، کەرەسەی جەنگیی نوێی ئەمریکاش بەو مەرجە تەکنۆلۆژییەکەی بیست ساڵ کۆن بێ، بفرۆشێتەوە.

ئەمە یەکەم فێڵ بوو کە بۆ پاراستنی خۆمان لە بەرامبەر تۆمەتەکانی ئەمریکا -ئەگەر درابانە پاڵمان- بەکارمان بردبوو. بەوپێیە، ئەگەر ڕۆژێک دەرکەوتایە کە ئیسرائیل سەرگەرمی فرۆشتنی کەرەسەی شەڕ بە ئێرانە و ئەمریکا حاشای لە ڕەزامەندیی پێشووی خۆی لەوبارەیەوە کردبایە،ئێمە دەسبەجێ پشتمان بە

ڕێککەوتننامەیەک دەبەست کە ئەمریکاییەکان لەو بارەیەوە ئیمزایان کردبوو... و بەتایبەتی ئەو ڕێگای دەربازبوونەمان ئاشکرا دەکرد کە لە دەقی ڕێککەوتننامەکەدا پێشبینی کرابوو.

دووەمین ڕێگا کە بۆ پاراستنی خۆمان هەڵمانبژاردبوو، لە ڕێگای ئەو دراوانەوە بوو کە لە داهاتی فرۆشتنی کەرەسە جەنگییەکانەوە دەهاتنە دەست. بەوجۆرە کە کاتێک قیمەتی کەرەسە جەنگییەکان بە نەغد یان ئیعتیبارنامە دەدرایە ئێمە، بە دەنگوهەراوە دەمانڕژاندە بانکە ئەمریکاییەکان.

عادەتەن حکوومەتی ئێران بەهۆی یەکێک لە کۆمپانییە ئێرانییەکان لە ئورووپا لە ڕێگای لقی بانکی نیشتمانیی ئێران لە لەندەن یان پاریسەوە ئیعتیبارنامەیەکی بەناوی کۆمپانییە ئیسرائیلییەکەی فرۆشیاری کەرەسەکان دەردەکرد، دوایە ئیعتیبارنامەکە لە بانکی نیشتمانیی «وێست مینیستێر» لە ئینگلستان پشتنووسی دەکرا و ئەمجار ئێمە داوامان دەکرد کە بدرێ بە بانکێکی ئەمریکایی. ئەو بانکە ئەمریکاییانەی بۆ ئەو مەبەستە هەڵمانبژاردبوون، بریتی بوون لە: بانکی تۆکیۆ، بانکی شیکاگۆ لە شیکاگۆ، بانکی کێمیکال Chemical لە نیۆیۆرک، بانکی «وان» One لە ئۆهایۆ و بانکی نیشتمانیی «ڤالی» Valley لە ئاریزوونا. ئەم بانکانە، بڕ و بایەخی ئیعتیبارنامەکانیان بە دۆلار بۆ وەزارەتی خەزێنەداریی ئەمریکا ڕوون دەکردەوە و دەیان‌پرسی ئایا وەزارەتی خەزێنەداری قبووڵی یان نا. بەپێی ڕێوشوێنەکانی وەزارەتی خەزێنەداریی ئەمریکا، هەر ئیعتیبارنامەیەک بایی پتر لە ١٠،٠٠٠ دۆلار بێ، دەبێ پەسندی ئەو وەزارەتە بەدەست بێنێ.

چونکە بەوجۆرە بەشێک لە ڕووتێنییە قانوونییەکانی فرۆشتنی کەرەسە جەنگییەکان، لەڕاستیدا لە ئەمریکا ئەنجام دەدران، CIA دەبوو دڵنیا بێ کە ئەو هەنگاوە لەلایەن وەزارەتی خەزێنەداریی ئەمریکاوە پەسند دەکرێ. کاتێک وەزارەتی خەزێنەداری

ئیعتبارنامەکانی پەسند دەکرد، ئەوان دووبارە دەگەڕێندرانەوە ئوروویا. بێجگە لە عەمەلیاتی شەقامی «جان» لە ساڵەکانی ۱۹۸۱ و ۱۹۸۲ادا هەموو ئەو کەرەسە جەنگییە ئەمریکاییانەی لە کۆتایی ساڵی ۱۹۸۱ەوە تا کۆتایی ساڵی ۱۹۸۷ بە ئێران دەفرۆشران کەموزۆر بەو رووتێنیاتەدا تێدەپەڕین.

هەروەک لە بەشەکانی پێشوودا باس کرا، ژووئیەی ساڵی ۱۹۸۸، فڕۆکەیەکی باربەریی ئارژەنتینی کە ئامراز و کەرەسەی شەڕی دەبردە تاران، لە سنووری نێوان یەکیەتیی سۆڤیەت و تورکیە لەلایەن سۆڤیەتییەکانەوە بەردرایەوە. ئەم رووداوە ئێمەی قانیع کرد کە دەبێ بۆ ئەو هەموو کەرەسە جەنگییەی ئێمە موعامەلەمان پێدەکرد، پەردەپۆشی پێویست دروست بکەین.

شێوەیەک کە بۆ ئەو کارە هەڵمانبژارد، ئەوە بوو کە ئیسرائیلییەکان پێوەندی بە هێندێک سەوداگەری تایبەتیی کەرەسەی شەڕ و شارەزایانی ئەو کارەوە بگرن و بۆ پەردەپۆشکردنی کارە کانی خۆیان کەلک لە کۆمپانییەکانی وان وەربگرن. بەمجۆرە، ئەو سەوداگەرانە لە چواردەوری دنیا چەکوچۆڵەیان دەکڕی و بەناوی ئێمەوە بە ئێرانیان دەفرۆشت. حکوومەتی ئێران نرخی کەرەسە جەنگییەکانی دەدا بە ئێمە و ئێمە پاش هەڵگرتنی سوودی خۆمان لەوەی وەرمانگرتبوو، ئیعتیبارمان بۆ موعامەلەچییەکان دەکردەوە.

یەکێک لە سەوداگەرانی کەرەسەی شەڕ کە ئێمە موعامەلەمان لەگەڵ دەکرد، بازرگانێکی ئەمریکایی بەناوی «جان هارتریچ» بوو کە لە باشووری فەرانسە دەژیا. «جان هارتریچ»یش وەک زۆر کەسی دیکە کە ئێمە بۆ ئەو کارە بەکارمان دەبردن،ڕابردوویەکی تاریک و پێچەڵپووچی هەبوو، بەڵام بۆ کارەکەی ئێمە عەیبی نەبوو. ئەو لە ئەیالەتی کانکیتێکت پێگەیشتبوو و بۆ درێژەدانی خوێندن چووبووە کۆلێژی پزیشکی. بەڵام دواتر دەرسەکەی بەجێ هێشتبوو و دەگەڵ هێزە دەریاییە تایبەتەکان کەوتبوو و هەتا پلەی گرووبانی چووبووە

سەری و لە شەڕی کورە (کۆریا)دا لە یەکەی خزمەتە پزیشکییەکان خزمەتی کردبوو. پاش تەواوبوونی خزمەتە سەربازییەکەی لە کۆمپانیی «ڕیڤلان» Revlon لە نیۆیۆرک وەک فرۆشیار دەستی بە کار کردبوو. لەوکاتەدا کە «جان هارتریج» کاری بۆ کۆمپانیی «ڕیڤلان» دەکرد، دەگەڵ فرۆشیارێکی کەلوپەلی جوانکاری بە ناوی «ڕیچارد برەنک» ئاشنا بووە و چەند ساڵ ئەم دووانە دۆستی یەکتر بوون، و ئێستا «ڕیچارد برەنک»یش هاتبووە نێو موعامەلەی کەرەسە جەنگییەکانەوە.

بەپێی قسەی خودی «هارتریج»، ئەو بە هیچ جۆر لە کارکردن بۆ کۆمپانیی «ڕیڤلان» ڕازی نەبووە و هەمیشە پێی خۆش بووە لە کاری ئەو کۆمپانییە بکشێتەوە. بەهەرحاڵ، پاش ئەوەی ناوبراو دەگەڵ کچێک کە خوێندنی لە زانکۆی «کۆرنێل» Cornell تەواو کردبوو، زەماوەندی کردبوو، دەگەڵ ژنەکەی بۆ ژیان چووبووە «ڤیرجین ئایلەندز» Virgin Islands و لەوێ دوکانێکی فرۆشتنی خواردنەوە ئەلکولییەکانی دانابوو و سەرگەرمی فرۆشتنی خواردنەوەی ئەلکولی بە ئورووپا و ئەمریکا و ئەمریکای باشوور بوو. کارەکەی لەو بەشەدا ئەوەندە گەشەی کردبوو کە ئەو سەرەنجام ببووە گەورەترین قەبەفرۆشی خواردنەوە ئەلکولییەکان لە دەریای کاراییب (کاریبی).

ڕۆژێک لە نیوەی دووەمی ساڵی ١٩٧٠دا، کاتێک ئەو سەری باشووری فەڕانسەی دەدا، ژنێکی جحێڵ بە ناوی «خاتو بلاڤ» کە نیوە فەڕانسەیی و نیوە پرتوگالی و خاوەنی ئەو هۆتێلە چکۆڵەیە بوو کە ئەوی لێیە دەبینێ و شێتانە ئاشقی دەبێ. کاتی گەڕانەوە بۆ «ویرجین ئایلەندز»، «هارتریج» پێشنیار بە هاوسەرەکەی دەکا کە کۆمپانییەکەیان بفرۆشن و بۆ مانەوە بچنە باشووری فەڕانسە. ئەم کارە سەر دەگرێ. «هارتریج» کۆمپانییەکەی بە ١١ میلیۆن دۆلار دەفرۆشێ و بەو سەرمایەیەوە دەچێتە شاری «نیس» و بڕیار دەدا

کارەکەی خۆی لەو شارە درێژە پێبدا و بۆ ئەو مەبەستە دەفتەری کاری خۆی لە «سەنت ترۆپز» لە هۆتێلی «خاتو بلاڤ» دەکاتەوە.

کاتێک «هارتریچ» سەرگەرمی دامەزراندنی دەفتەرە تازەکەی بووە، دەگەڵ بازرگانێکی گرنگی فەڕانسەیی کە ناوی «بێرنارد ڤێلیۆت» Bernart Velliod بووە و پێوەندیی بە ڕێکخراوی هەواڵگریی فەڕانسەوە هەبووە، ئاشنا بووە . هەرچەند «هارتریچ» ئەزموونێکی لە کاروباری کڕین و فرۆشتنی چەکی شەڕدا نەبووە، ئەو دووانە بڕیار دەدەن پێکەوە بکەونە بازرگانیی نەوت و کڕین و فرۆشتنی کەرەسەی شەڕ. بۆ ئەو مەبەستە «ڤێلیۆت» دوستەکەی «هارتریچ» بە سەوداگەرانی جۆراوجۆری نەوتی خاو و کەرەسەی شەڕ و ژمارەیەک لە کارمەندانی بوورس و بانکدارانی ئورووپا دەناسێنێ. ساڵی ١٩٧٤، «هارتریچ» هەڵەیەکی گەورە دەکا و ٧ میلیۆن دۆلار سەرمایە لە بەشەکانی کاکاودا دەخاتە کار. ئەو لەوکارەدا سەرمایەکەی لەدەست دەچێ و چونکە شوێنی ژیانی لە «سەنت تووبز» دانابوو، دەگەڵ هەموو چاوڕاوەکانی ناتوانێ لەباری داراییەوە خۆی خڕ بکاتەوە. ساڵی ١٩٨٠،ماڵەکەی لە بانکی «وۆرمز»ی ژێنێڤ بە بارمتە دادەنێ و ٣٠٠٠٠٠ دۆلار لە دۆستێکی لەمێژینەی بە قەرز وەردەگرێ.

ئەم بەسەرهاتە هاوکات بوو دەگەڵ ڕۆژگارێک کە هێشتا فرۆشتنی بەربڵاوی کەرەسەی شەڕ بە ئێران دەست پێنەکرابوو و ئێرانییەکان تووشی هەرکەس بایەن دەستی خۆیان بۆ کڕینی کەرەسەی جەنگی درێژ دەکرد. «هارتریچ» لە ڕێگای «ڤێلیۆت»ی دۆستیەوە لە پێویستیی ئێرانییەکان بە کڕینی چەک و تەقەمەنیی جەنگی ئاگادار بوو و دەگەڵ سەوداگەرێکی ئیسرائیلیی کەرەسەی شەڕ بە ناوی «ئیسحاق فرانک» Yitzhak Frank کە لە لەندەن کاری دەکرد و پێوەندیی بە ڕێکخراوی هەواڵگریی ئیسرائیلەوە هەبوو، پێوەندیی دامەزراند. «هارتریچ» لە «فرانک»ی پرسی کە ئایا ئەو دەتوانێ دەستی بگاتە فڕۆکەیF-4 بۆ فرۆشتن بە ئێران. «فرانک» ئێمەی لەو

بابەتە ئاگادار کرد و ئەمن پێوەندیم دەگەڵ «هارتریچ» گرت و گەیشتمە ئەو ئاکامە کە ئەو شیاوی ئەوەیە دەگەڵ گرووپەکەی ئێمە بکەوێ. ئەو دوو تایبەتمەندیی باشی هەبوون. یەکەم ئەوە کە لە کڕین و فرۆشتنی کەرەسەی شەڕدا زۆر جیددی نەبوو و ئەم کارەی وەک سەرگەرمی تەماشا دەکرد. دووەمیش ئەوە کە تینووی دراو بوو.

پاش ئەوەی ئەمن لە «نیس» چاوم بە «هارتریچ» کەوت، بڕیارم دا کە ئەو بۆ گرووپەکەی ئێمە کەسێکی گونجاوە و بۆیە هێنامە نێو کاروبارەکەوە. ئەو بۆ گرووپەکەمان وەک سەرپۆش کەلکی لێ-وەردەگیرا و هەروەخت ئێمە دەمانەویست زانیارییەکمان لە سەرچاوەیەکەوە دەست کەوێ یان هەواڵی درۆ و ناڕاست بڵاو بکەینەوە، کەلکمان لەو وەردەگرت. بەڵام، ئەو ڕاستەوخۆ دەستی لە کڕین و فرۆشتنی کەرەسە جەنگییەکاندا نەبوو. هەرکات دەمانەویست کەسێک بچێتە نێو موعامەلەیەک و تێکی بدا، یان دەنگوباسێک لە ئەمریکا بڵاو بکاتەوە، یان پێوەندییەک دەگەڵ ئەمسەرئەوسەری دنیا دروست بکا، کەلکمان لە«هارتریچ» وەردەگرت. ئێمە ناوێکی تازەمان لێنا و ناومان نا «جان دو لارۆک» John de Laroque و یەکێک لەو چەند کەسە کەمە بوو کە لە دەرەوە دامانمەزراندبوون و کەس نەیدەتوانی فریوی بدا.

ئێستا ئیدی بە بوونی «جان دو لارۆک» ئێمە بە باشی دەمانتوانی کارەکانی خۆمان بە تەواوی داپۆشین. بەوجۆرە کە ئێمە بە زرنگی و تەڕدەستی لە ڕێگای «جان دو لارۆک»ەوە سەوداگەرانی جۆراوجۆری کەرەسەی شەڕمان لە سەرانسەری دنیا و بەتایبەتی ئورووپا هان دەدا بۆ موعامەلەی کەرەسەی شەڕ گفتوگۆ دەگەڵ ئێرانییەکان بکەن، بەڵام ئەوان نەیاندەزانی کە، پێش ئەوەی قسەکانیان لەو بارەیەوە تەواو بن، موعامەلەکە لە بنەڕەتڕا تێک چۆتەوە. ئێمە بەو شێوەیە، لەڕاستیدا بازاڕێکی بەدرۆی موعامەلەی نێونەتەوەیی کەرەسەی شەڕمان دروست کردبوو کە نیشانی دەدا، هەموو

سەوداگەرانی کەرەسەی شەڕ و دەوڵەتانی جیهان بۆ فرۆشتنی ئامراز و کەلوپەلی شەڕ دەگەڵ ئێران کەوتوونە موعامەلەوە. بەم جۆرە، لە سالۆنی هۆتێلەکان،لە لێواری دەریاکان و ئوقیانووسەکان، لەسەر نیوتەختی پارکەکان،و لە ماڵە تایبەتییەکان لە هەموو جێیەک باس باسی فرۆشتنی کەرەسەی شەڕ لەلایەن سەوداگەرانی پارەپەرستی کەرەسەی جەنگی بە ئێرانییانی تینووی وەدەستهێنانی ئەو کەرەسانە بوو. بەمجۆرە، پێرستەکانی داخوازی کەرەسە جەنگییەکان بە قەبارەیەک کە ژمارەی هەرکام لە کەرەسەکان پتر لە ژمارەکانی تەلەفون بوو، بە تێلێکس بۆ سەرانسەری دنیا بەڕێکران. ئەو کەرەسە جەنگیانەی داوا کرابوون بریتی بوون لە: فرۆکە، مووشەک، تانک، بۆمب و ئامرازەکانی تۆپخانە. دیارە، وتوویژ بۆ ئەنجامدانی ئەو سەودایانە زۆر نەدەچووە پێش. چونکە هەر کە وا دەهاتە بەرچاو کە وتوویژ لەبارەی سەودایەکەوە لە کۆتایی نزیک بۆتەوە، دەسبەجێ «جان دو لارۆک»- «جان هارتریج»ی پێشوو دەهاتە مەیدان و سەودایەکەی تێکدەدا. بۆ ئەوەش کە ئۆگری و تامەزرۆیی سەوداگەر و موعامەلەچییەکان بۆ درێژەدانی کارەکان بپارێزرێ، ئیسرائیل خەرجی سەفەری وانی دەدایەوە، بەلام دیارە، هەوڵ دەدرا کە ئەو کەسانە بە هیچ جۆرێک لە کڕین و فرۆشتنی نێوان ئیسرائیل و ئێران ئاگادار نەبن.

پاش ئەوەی عەمەلیاتی شەقامی «جان» کەوتە مەترسییەوە و ئێمە بە پەلە ئەمریکامان بەجێهێشت، کۆمیتەی هاوبەش بڕیاری دا، ئێمە عەمەلیاتی خۆمان بگوازینەوە بۆ «مۆنتریاڵ»ی کانادا. بەلام، دوای چەند مانگ بۆمان دەرکەوت کە ئەم شارە ناوەندێکی گونجاو بۆ کارەکەی ئێمەی نیە و ئێمە ناتوانین لەوێ بەشێوەیەکی کاریگەر وەدوای ئامانجەکانمان کەوین و بۆیە دووبارە گوازتمانەوە بۆ لەندەن.

له لەندەن کارەکان بە باشی چوونە پێش. چونکە لەو کاتەدا ئەمریکا بڕیاری دابوو لە بارەی فرۆشتنی ئامراز و کەلوپەلی ئەلیکترۆنی بە ئێرانەوە هاوکاریمان بکا. ئێمە لە عەمەلیاتی خۆماندا سەرکەوتنێکی بەرچاومان بەدەست هێنابوو. بەمجۆرە، بوونی سەرپۆشێکی بەجیا بۆ عەمەلیاتەکەمان ئەو پێویستییەی نەما و کۆمیتەی هاوبەش دووبارە دەستی بەکارەکانی کردەوە.

ژیانی من لەنێوان ئیسرائیل، ئورووپا، و ئەمریکادا دابەش ببوو و دیارە هێندێ جار سەفەری هێندێ شوێنی دیکەی دنیاشم دەکرد. بۆیە وەختێکی زۆرم بۆ نەمابۆوە کە دەگەڵ «فرێدی» و «هێرووت»ی کچمان کە لە پرتوگاڵ دەژیان، بەسەر بەرم.

کاری من لەو کاتەدا پتر کڕینی چەک و ئامرازی شەڕ، هەڵسووڕاندنی ئەو دراوەی لە کڕین و فرۆشتنی واندا بەکار دەبرا و کۆنترۆڵی کارمەندەکانمان بوو. ئەندامەکانی دیکەی کۆمیتەی هاوبەش لە تەل ئەبیب، سەرپەرستی سیاسەتی گشتیی کاروبارەکە بوون کە لەڕاستیدا کارێکی پێچەڵپووچ بوو.

ئەو شێوەکارە کە کۆمیتەی هاوبەش بۆ سوودەکانی فرۆشتنی کەرەسەی شەڕی هەڵبژاردبوو، دەگەڵ شێوەکاری ئاسایی موعامەلاتی دەوڵەتی فەرقی هەبوو. بەومانایە کە ئەو سوودەی لە فرۆشتنی کەرەسەی شەڕ بەدەست دەهات نەدەچۆوە وەزارەتی دارایی کە لەژێر چاوەدێریی پارلەماندا بوو، بەڵکوو بوودجەی عەمەلیاتیی کۆمیتەی هاوبەش لە سوودی ئەو موعامەلانە دابین دەکرا کە لەژێر چاوەدێریی کۆنترۆڵچیی «مۆساد»دا بوو. سوودی ئەو موعامەلانە دەڕژایە حیسابی «سەرمایەی ڕەش»ەوە و ئەمەش بووە هۆی ئەوە کە دارایی «سەرمایەی ڕەش» بەزوویی بە چەشنێکی سەرسوڕهێن زیاد بکا.

خەرجکردنی دراو لە «سەرمایەی ڕەش» بە دوو ڕێگادا ئەنجام دەدرا. یەکیان بەهۆی داوای سەرۆکانی ڕێکخراوە هەواڵگرییەکان —

سەرۆکی «مۆساد» یان سەرۆکی ئیدارەی پێوەندییەکانی دەرەوەی ڕێکخراوی هەواڵگریی سوپا و ئەوی دیکە ڕاستەوخۆ لە دەفتەری سەۆکوەزیری بەهۆی داخوازیی سکرتێری یەکەمی کابینە «ئاریە نائۆر» Arieh Naor یان ڕاوێژکاری دژی تیرۆریزم «ڕافی ئەیتان». لەسەر داخوازی کاربەدەستانی پێوەندیدار، کۆنترۆڵچیی «مۆساد» فەرمانی خەرجکردنی دراو لە دارایی «سەرمایەی ڕەش»ی دەردەکرد.

بۆ ئەوەی دەرەتانی ڕەتکردنەوەی خەرجی پارە هەبێ، مافی ئیمزا درابوو بە بەرپرسانی ئەو کۆمپانییانە کە لە ئورووپا و شوێنەکانی دیکەی دنیا بۆ پەردەپۆشکردنی عەمەلیاتی بنەڕەتیی کڕین و فرۆشتنی کەرەسەی شەڕ پێکهاتبوون. ئەم کۆمپانییانە کە لەڕاستیدا کۆمپانیای سەرپۆش بوون، حیسابی تایبەتیی خۆیان هەبوون کە باری ڕواڵەتی و تیئۆریکییان هەبوو، و هەرکات پێویست بایە، بەرپرسانی ئەو کۆمپانییانە کە داتاشراو و سەرپۆش بوون، نکوولی (حاشا)یان لە دانی دراوەکە دەکرد.

منیان وەک یەکێک لەو سێ کەسە هەڵبژاردبوو کە مافی ئیمزای چەکە بانکییەکانیان هەبوو. شێوەکارەکە ئەوە بوو کە بۆ هەڵگرتنی دراو لە حیسابەکان و نەغدکردنەوەی چەکەکانی دەبوو دوو لەو سێ کەسە کە مافی ئیمزایان هەبوو، ئیمزای بکەن. ئەگەر خەڵکێکی زۆر مافی ئیمزایان هەبایە، بەشێوەی سروشتی لە بەڕێوەبردنی کارەکاندا ئاڵۆزی دروست دەبوو، و ئەگەر تەنیا یەک کەسیش مافی ئیمزای هەبایە و ئەو لەنەکاو تووشی نەخۆشییەکی سەخت بایە یان مردبایە، گیروگرفت دروست دەبوو. بەپێی ئەو ڕێوشوێنە کە کۆمیتەی هاوبەش هەڵیبژاردبوو، لەو کاتانەدا نەبێ کە کۆمیتەکە کۆبوونەوەی ڕەسمیی هەبوو، ئەو سێ کەسەی مافی ئیمزای چەکە بانکییەکانیان هەبوو، نەدەبوو پێکەوە لە جێیەک بن. هەرکام لە ئێمە ئەو سێ کەسەی مافی ئیمزامان هەبوو، وەکالەتمان دابوو بە ئەندامانی

کۆمیتەی هاوبەش کە ئەگەر مردین یان ڕووداوێکمان بۆ هاتە پێش، ئەوان بتوانن لەجیاتی ئێمە چەکەکان ئیمزا بکەن. بۆ هەڵگرتنی پووڵ، دەبوو یان دووکەس لە ئێمە لە بانک ئامادە بین، یان دووکەسمان وەکیلایەتی بدەینە کارمەندی بانک، یان یەکی دیکە لەو سێ کەسەی مافی ئیمزا بۆ هەڵگرتنی پووڵیان هەبوو.

بۆ خۆبواردن لەوەی هەموو هێلکە زێڕینەکان لە سەبەتەیەک هاوێین، یان جۆرێکی دیکە بڵێین بۆ پێشگیری لە هەر ڕووداوێکی نەخوازراو، ٢٠٠ ژمارەحیساب لە ٢٧ بانکی باوەڕپێکراوی سەرانسەری دنیا کرابوونەوە، بەڵام هەروەخت تەنیا یەک لە چواری ئەو حیسابانە چالاک بان، حیسابدارانی گرووپی ئێمە لە شارەکانی ڤییەن، سیدنی، لەندەن، نیۆیۆرک، و تەل ئەبیب دەیانتوانی ئەوەی لە حیسابە بانکییەکاندا هەبوو هەر چەندمانگ جارێک لە بانکێکەوە بگوازنەوە بانکێکی دیکە، بەڵام هەقی چەککێشان و هەڵگرتنی دراویان نەبوو. ئەم شێوەکارە بۆیە داهێنرابوو کە دڵنیا بین دراوەکان لە ڕێگای نابەجێدا ناخرێنە کار و لەو حیسابانەدا ڕادەگیرێن کە هیچ-کەسی دیکە لە بوونیان ئاگادار نابێ. بەو میتۆدە، هەروەها ئەو حیسابدارانە کە جاربەجار دەگۆڕان نەیاندەتوانی، دەست لەو دراوانە وەربدەن. کارکردن بەو شێوەیە دەبووە هۆی ئەوەش کە هەرکەس ئاگای لە بوونی ئەو پووڵانە هەبوو، بە ئاسانی نەتوانێ ئاگای تەواوی لە هاتنوچوونیان هەبێ.

ساڵی ١٩٨٣ «سەرمایەی ڕەش» وەک مەکینەیەکی خاوێن، ڕۆن-لێدراو و خزمەتکراو بە سەرکەوتنەوە درێژەی بە کاری خۆی دەدا. هەرساڵەی جارێک ئەو ٢٠٠ ژمارە حیسابەی لە بانکە ئورووپایی-یەکاندا بۆ کاروباری گرووپەکەی ئێمە تەرخان کرابوون، دەگۆڕان و ناوی کۆمپانییەکانیش دەگۆڕا. تەنیا ناوی کۆمپانیی دایک «گرووپی ئۆرا» هەمیشە لەجێی خۆی بوو.

چالاکییەکانی «گرووپی ئۆرا» لەژێر ئاڵای قانوونێکی نەنووسراودا بەڕێوە دەچوون. بەو مانایە کە ئیسرائیل هیچکاتێک هەقی نەبوو، ڕاستەوخۆ پێوەندی بە بەرهەمهێنەکانی کەرەسەی شەڕ یان سەنعەتە جەنگییەکانەوە بگرێ. هەروەخت پێویست بایە کەرەسە جەنگییە ئەمریکایی‌یەکان لە ئەمریکا واتە لە بەرهەمهێنە ئەمریکایی‌یەکان یان لە عەمبارەکانی سوپای ئەمریکا بکڕین، ئێمە پێوەندیمان بەو کەسانەوە دەگرت کە پێوەندییان بە CIAوە هەبوو. ئەوانە، کەرەسە پێویستەکانیان بۆ ئێمە دەکڕی و بۆیان لە عەمبارەکان دادەنان. عەمبارەکان عادەتەن لە «مارانا» بوون کە پێگەیەکی هەوایی لە نیزیک «تووسان» Tucsonی «ئاریزوونا» بوو.

یەکەمین وەجبەی کەرەسەی شەڕ کە لە ئەمریکامان کڕی و لە عەمباری «مارانا» تەحویلمان درا، لە ئۆکتۆبری ساڵی ١٩٨١دا بوو. هەروەخت کەرەسە جەنگییە ئەمریکایی‌یەکانمان لە عەمبارەکانی ناتۆ لە ئورووپا دەکڕی، ئەوانمان لە شاری «لی‌یەژ» لە بێلژیک، وەردەگرت. ئیسرائیل بە فڕۆکەی بارهەڵگری کرێگرتە، کەرەسە جەنگییە کڕاوەکانی وەردەگرت و دەیبردنە تەل ئەبیب. پاشان ئەو فڕۆکانەی کەرەسە جەنگییەکانیان پێ‌بوو، لە تەل ئەبیبەوە یەکسەر دەفڕین بۆ تاران. هێندێ جار لەوانە بوو ئەو فڕۆکانە لە ڕێگای تاراندا تەنانەت بچنە وڵاتێکی سێیەمیش. بۆ وێنە، ساڵی ١٩٨٣ بەو ئەزموونە کە لە بەردرانەوەی یەکێک لە فڕۆکە کرێگرتە ئارژەنتینییەکان لە لایەن سۆڤیەتەوە وەرمانگرتبوو، ئەو فڕۆکانەی بە کەرەسە جەنگییەکانەوە بەرەو تاران دەفڕین، لەسەر ئیزنی ڕێکخراوی هەواڵگریی ئەمنیەتیی ئوستڕالیا -کە دیارە ئاگادار بوو بارەکەیان چیە- لەپێشدا لە ئوستڕالیا دەنیشتنەوە.

وڵاتەکانی دیکە کە بۆ پەردەپۆشکردنی عەمەلیاتەکەی ئێمە کەلکیان لێ وەردەگیرا بریتی بوون لە: گواتمالا، پێروو، کینیا، پاراگوا،و ئەفریقای باشوور. ئەگەر وڵاتی پاراگوا کەلکی لێ‌وەرگیرابایە،

فڕۆکەکان دەچوونە ئەفریقای باشوور -ئەمە هەر ئەو ڕێبازەیە کە عادەتەن CIA وەختی گوازتنەوەی کەرەسەی شەڕ بۆ ئەفریقای باشوور کەلکی لێوەردەگرت- بۆیە، کاتێک ئەو فڕۆکانەی پڕ لە کەرەسەی جەنگیی ئێمە بوون، لە «ئاسانسیۆن» Asuncion (پێتەختی پاراگوا) دەنیشتنەوە، کاربەدەستانی دەوڵەتیی پاراگوا پێیان وابوو ئەو فڕۆکانە بارەکانیان دەبەنە ئەفریقای باشوور، لەحاڵێکدا دوامەقسەدی وان، ئێران بوو.

بەشکردنی داهاتی موعامەلەی ئەو کەرەسە جەنگییانە بەسترابۆوە بە شوێنی بەرهەمهێنان و خەرجی گوازتنەوەیان. هەموو ئەوانەی دەستیان لەو موعامەلانەدا هەبوو، بەشێکی زۆریان دەست دەکەوت. ئەمریکایییەکان سوودیان لە فرۆشتنی چەکەکانیان پێدەگەیشت، ئێمە لە ڕێگای فرۆشتنەوەیان بە ئێرانەوە سودمان وەردەگرت و ئێرانییەکانیش بە ئامانجی خۆیان کە کڕینی کەرەسەی شەڕ بوو دەگەیشتن. بەڵام دیارە ئەو نرخەی ئەوان کەرەسە جەنگییەکانیان پێ-دەکڕی خەیاڵی بوو.

لە سەرەتای کاردا، ئیسرائیل بۆخۆی مۆڵەتی دوابەکارهێنانی بۆ ئەو کەرەسە جەنگییانە دەردەکرد و بە CIAی نیشان دەدا. بەڵام دوای نیوەڕاستی ساڵی ١٩٨٢ ئەو شێوەکارکردنە ڕاگیرا. بەوحاڵە، کاتێک چەکوچۆڵەیەکمان لە وڵاتە ئوروپاییەکان دەکڕی، هەرچەند ئەو وڵاتانە دەیانزانی، چەکوچۆڵەکە سەرەنجام دەچێتە ئێران و بەهۆی ئەو وڵاتەوە بەکار دەبرێ، بەڵام بۆ پەردەپۆشکردن لە پارلمانی وڵاتەکانیان، بێ دەرکردنی مۆڵەتنامەی دوا بەکاربردن لە وڵاتی ئیسرائیلەوە، کەرەسە جەنگییەکانیان ئازاد نەدەکرد. ئەو وڵاتانەی لەو عەمەلیاتەدا بەشدار بوون بریتی بوون لە: ئوتریش، بێلژیک و سوئێد. سەرۆکوەزیری سوئێد «ئولۆف پالمە» Olof Palme، دواتر دژی ئەو کارە وێستا و سوئێد لە پێرستی وڵاتانی ناوبراو چووە دەرێ.

وڵاتـی بریتانیـاش لـەو عەمەلیاتـەدا بەشـدار بـوو، بـەڵام ڕەفتـاری حکوومەتی «مارگارێت تاچەر» کەمێک فەرقی دەگەڵ وڵاتەکانی دیکە هەبوو. بەو مانایە کە حکوومەتی بریتانیا، چەندین ساڵ بێ ئاگاداریی خەڵکی ئەو وڵاتە کەرەسەی سەربازیی بۆ ئەفریقای باشوور دەنارد. ڕابردووی ڕێکخراوی «مۆساد» پڕە لـە فایلی وا کـە نیشـان دەدەن، کەشتیگەلێک کە لە لیبریا تۆمار کراون لـە بەندەری «سـووتێمپتۆن» Southemptonەوە تـــۆپ و کەلوپـــەلی ئـــەلیکترۆنییان بـــۆ فڕۆکـــە شەڕکەرەکانی ئەفریقای باشوور بار کردوە و بردوویاننە ئەو وڵاتە. سەرۆکوەزیـری بریتانیا ڕێگای دابوو بۆ ئەو کەرەسـە جەنگییانـەی دەگوازرانەوە ئێرانیش سـەرەتا لـەو شێوەکارە کەڵک وەربگیرێ. ئـەو کەرەسـە جەنگییانـەی دەنێردرانـە ئێـران بریتـی بـوون لـە: پارچـەی یـەدەکیی تـانکی «چیفتـێن» و پاشـان کەلوپـەلی ڕاداری مـارکوونی و ئـەلیکترۆنی بـۆ ئـەو فڕۆکـە F-4ە ئـەمریکایی‌یانـە کـە ئێرانییـەکان هەیانبوون.

بـەو زەمینەسـازییانەی لـە سـەرەوە بـاس کـران کـە کـاری کڕین و فرۆشـتنی چـەکوچۆڵـەی جۆراوجـۆری زۆر ئاسـان کردبـوو، و بـەو زانیارییە ڕێونکەر و ناڕاستانە کە ئێمـە لـە وڵاتـانی ئورووپـایی لـەنێو سـەوداگەرانی کـەرەسـەی شـەڕ و ئەوانـەدا کـە دەیانەویسـت بێنـە نێو ئەو چالاکییانەوە، بڵاومان دەکردنـەوە، ئێمـە هـەروەها پێویسـتیمان بـە ڕایەڵکەیەکی کارمەندانی جێی متمانە لە سەرانسەری دنیادا هـەبوو کـە دروسـتی و بێوەزەندیی کـارکردی ڕایەڵکەکـەمان دابـین بکـەن. ئـەمن بۆخۆم کەسێکم دیبۆوە کە بۆ ئەو ئامانجە زۆر بەسوود بوو، ئـەویش هەر ئەو کەسـەیە کە ناومان نابوو «جان دو لارۆک» و پێشـتر باسـم کرد. لە ڕایەڵکەکەی ئێمە کەسێکی دیکەش هـەبوو کە بۆ ئـەم ئامانجـە بەسـوود بـوو، ئـەویش «نیکـۆلاس دێڤـیس» Nicholas Davis سەرنووسـەری ڕۆژنامـەی «دەیلی میرۆر» Daily Mirror بـوو کـە لـە لەندەن چاپ و بڵاو دەکرایەوە.

ڕێکخـراوی «مۆسـاد» لـە سـاڵەکانی دەیـەی ١٩٧٠دا «دیڤـیس»ی لـــەلای خـــۆی دامەزرانـــدبوو. ئـــەم پیـــاوە لەلایـــەن «ئـــانتۆنی پیرسۆنAnthony Pearsonەوە بە ڕێکخـراوی «مۆسـاد» ناسـێندرابوو. «ئـانتۆنی پیرسـۆن» لـە ڕابـردوودا ئەفسـەری ڕێکخـراوی تایبـەتی ئاسمانیی بریتانیا (SAS) بوو کە پاش کشانەوە لە ڕێکخـراوی SAS کۆمپانیی «خزمەتە هەواڵگرییە ستراتیژییەکان»ی دامەزراندبوو. ئەو کۆمپانییـە لـە 55Sutherland) SWI London Street) بـوو و خزمـەت و زانیاریی جاسووسیی بە ئیسرائیل و وڵاتانی دیکە دەفرۆشت.

قـاو بـوو کـە «پیرسـۆن» لـە «لافاییـت» لـە ئەیالـەتی «ئەریزوونا» کرێگرتـەی دەگـرت و دەیناردنـە شـوێنە دوور و لاپـەڕەکانی دنیـا. لـە سـەرەتای سـاڵەکانی دەیـەی ١٩٧٠دا، بـەکرێگیراوەکانی «پیرسـۆن» لەشەڕ دژی «شۆڕشگێڕانی ڕووحپەرستی مەسیحی»دا کۆمەگیان بە هێزە موسـوڵمانە دەوڵەتییـەکانی باشـووری سـوودان دەکـرد. مـانگی نۆڤامبـەری سـاڵی ١٩٨١، هێنـدێک لـە بـەکرێگیراوانی «پیرسـۆن» دەسـتیان دایـە کودەتایـەکی بـێئاکـام لـە «سیشـێل» Sychellesی ماداگاسکار و هەرچەند توانیان، فرۆکەخانەی ئەوشـارە بگـرن، بـەڵام چونکـە چـەکی کەلاشـینکۆفی AK-47یـان لـە کیفـە گلفـەکانی خۆیانـدا شـاردبۆوە لەلایـەن حکوومـەتی ناوچـەوە دەسـتگیر کـران. بـەپێی ئـەو پێشـینانەی لـە «مۆسـاد» هـەن، «پیرسـۆن» بـۆ هـەر پیاوکوژییـەک ٥٠٠٠٠ دۆلاری وەردەگرت. دیارە، ئەو بڕە پووڵە دەگەڵ پیاوکوژەکە کە لە «ئەریزوونا» بەکرێ دەگیرا، بەش دەکرا.

وەختێـک ئـەمن چـاوم بـە «نیکـۆلا دیڤـیس» کـەوت ئـەو دەگـەڵ گرووپەکـەی «پیرسـۆن» کـاری دەکـرد. بـەڵام لـە ئاژاوەگێڕییـەکانی دەرەوەیانـدا بەشـدار نـەبوو. ئـەو کاتێـک بـۆ کـاری ڕۆژنامەنووسـی دەچووە وڵاتـانی دەرەوە، وێنـە و ڕاپـۆرتی لـە گـەلانی عـەرەب ئامـادە دەکـرد و دەیـدان بـە «مۆسـاد». ئـەو کاتـە «دیڤـیس» دەگـەڵ هونەرمەندێکی بەڕەگەز ئوستڕالیایی بە ناوی «ژانێت فیلدینگ» Janet

Feilding کـە ئەسـتێرەی سـێریالی تەلـەڤیزیۆنیی Dr. Who بـوو، زەماوەندی کردبوو. «دیڤیس» هـەم خـەرجی ڕاگرتنی منداڵەکـەی و هـەم نەفەقـەی هاوسـەرەکەی پێشـووی دەدا و هـەمیش ناچـار بـوو بڕێکی بـەرچاو بۆ دانەوەی قـەرزەکانی خـەرج بکـا. قـەرزەکانی هـی چاپخانەیـەک بـوون کـە لـە سـاڵانی دەیـەی ۱۹۷۰دا دایمەزراندبوو، و چونکـە لـەوکارەدا نـابووت ببـوو، قـەرزێکی زۆری کـەوتبووە سـەر. ڕێکخراوی هـەواڵگریی ئیسرائیل لـە وەزعـی شـپرزەی مـاڵی و تینووە تیـی «دیڤـیس» بـۆ پـارە ئاگـادار بـوو. بۆیـە پێشـنیاری بـە مـن کـرد پێوەنـدیی دەگـەڵ بگـرم و بیهێنمـە نێـو ڕایەڵکـەی کـڕین و فرۆشـتنی کەرەسەی شەڕ.

ئەمن یەکەمجار نیوەی یەکـەمی سـاڵی ۱۹۸۳ لـە سـاڵۆنی هۆتێل «چەرچیل» لە لەندەن چاوم بە «دیڤیس» کەوت. «پیرسـۆن» یـەکێک لـە هاودەسـتەکانیی دەگـەڵ خـۆی هێنـابوو. «دیڤـیس» هەرکـە چـاوی پێمکەوت مێشکمی خوێندەوە و ئەمە بە توندی سەرسامی کردم. ئەو پیاوێکی بەهۆش و دنیادیدە و لەبەردڵان بوو. ئەو پووڵی بە یەکێک لـە پێویستییە گرنگەکانی ژیان دەزانی و لە «ڕابێرت مەکسـوێل» Robert Maxwell کـە ئـەودەم هێشـتا نـەببووە خـاوەنی Daily Mirror، بـەڵام پێوەندیی بە ڕێکخراوی هەواڵگریی ئیسرائیلەوە هەبوو، نیزیک بوو.

لـەنێو قسـەکان و لـە سـاتەوەختێکی گونجـاودا پـێمگـوت: «ئێمـە حەز دەکەین ئەتۆ بە شێوەی تەواووەخت کارمان دەگەڵ بکەی.»

ئـەو گـوتی: «ئێـوە دەتانـەوێ ئـەمن کارەکـەم لـە Mirror بـەجێ بێڵم؟» ڕاوێژی زاری نیشانی دەدا کە ئەمـە دواکار بوو کە ئـەو حـەز دەکا بیکا.

گوتم: «نا، دیارە کـە نـا.» پێویسـت نـەبوو بۆی ڕوون بکەمـەوە کە کارەکەی وی دەتوانێ وەک سەرپۆشێکی تەواو بـۆ کارەکـانی ئێمـە بەکار ببرێ.

ئەو گوتی: «پاشان، دەزانی کە بەڕێز «مەکسوێل» خەریکە ڕۆژنامەی Mirror دەکڕێ.»

گوتم: «بەڵێ ئاگاداری ئەو بابەتەم.» لە ڕاستیدا هەموو ئیشکەرانی کۆمەڵگەی هەواڵگریی ئیسرائیل ئاگایان لەو بابەتە هەبوو و ئێمە هیوادار بووین کە «مەکسوێل» لەوکارەدا سەرکەوتوو بێ.

«دێڤیس» حەزی دەکرد دەگەڵ ڕایەڵکەکەی ئێمە کەوێ، بەڵام نەیدەتوانی لەو بارەیەوە بڕیاری یەکجاری بدا. وێنەگرتن بۆ «مۆساد» شتێک بوو و تێوەگلانی موعامەلەی ڕادەیەکی یەکجار زۆر ئامراز و کەرەسەی شەڕ شتێکی دیکە بوو. بەهەرحاڵ، ئۆگرییەکەی بۆ هاتنی نێو ئەوکارە بە ڕادەیەک بوو کە بۆ نانی نیوەڕۆ بانگهێشتنی کردمە ماڵەکەی خۆی و ئەمن دەگەڵ هاوسەرە باریکەڵە و جوانەکەی ئاشنا بووم. وا دیار بوو ئەو بایەخێکی زۆری بە بیروڕای «ژانێت»ی هاوسەری دەدا و پێی خۆش نەبوو لێی ناڕازی بێ یان لە دەستی دەرچێ. دیارە دەبێ ئاماژە بەو خاڵەش بکەم کە ئەم خەسڵەتە بۆ ئێمە بەسوود بوو. چونکە ئەگەر کرێگرتەیەک خاڵێکی لاوازی وای هەبێ، بەلێوان نەرم دەبێ و ئەم خەسڵەتە لە ڕوانگەی ئێمەوە کە دەمانەویست وەک بەکرێگیراو دایمەزرێنین، بە ئەرێنی دەهاتە بەرچاو.

ئەمن ئەوم بە سەفەرێکی خۆڕایی ناردە ئیسرائیل- چونکە دەفتەری وتەبێژی سەربازیی ئیسرائیل بەرنامەیەکی هەبوو کە لە ڕۆژنامەنووسانی سەرانسەری دنیا داوا دەکرا بەخۆڕایی سەفەری تەل ئەبیب بکەن. کاتێک ئەو لە تەل ئەبیب بوو، ئەمن بۆ سەردانی چوومە هۆتێلێک کە لە لێواری دەریا پێیدرابوو. لەوێ گەیشتینە ڕێککەوتنێک. بەوجۆرە کە ئەو دەبوو پێوەندییە نارەسمییەکانی خۆی، لەوانە پێوەندی دەگەڵ «پیرسۆن» و «رادی» بپچڕێ و لەوحاڵەدا ئێمە دەمانکردە دەڵالی موعامەلەی کەرەسەی جەنگی لە دەفتەری لەندەن، بەڵام جۆرێکی دیکە بڵێین ئەو دەبووە دەڵالی پێوەندیی ئێمە

لە لەندەن بۆ موعامەلەی کەرەسەی شەڕ لەگەڵ ئێرانییەکان و هەموو ئەو کەسانە کە موعامەلەی چەکوچۆڵەیان لەگەڵ ڕایەڵکەکەی ئێمە دەکرد. ئادرەسی ماڵەکەی لە وەرەقە ئیدارییەکانی ئێمەدا چاپ دەکرا و لە ڕۆژدا تەلەفونەکەی بە ژمارەی ٨٢٢٣٥٣٠ کە تەنیا بۆخۆی وەک سەرنووسەری دەرەکیی Daily Mirror هەقی هەبوو کەلکی لێوەرگرێ، بۆ پێوەندییەکانی نێوان ئێران و ئیسرائیل بەکار دەبرا. لەوانەیە «ئیدارەیەکی دەرەکی» هیچوەخت نەتوانێ تاریفێکی باشتر لەو ئەرکەی هەبێ کە بۆ «دیڤیس» لەبەر چاو گیرابوو.

پاش ئەوەی ئێمە بەڕەسمی «دیڤیس»مان لە ڕایەڵکەکەی خۆمان دامەزراند و ئەو ڕازی بوو کە وەک کارمەندی پێوەندی لەگەڵ من کار بکا، نیگەرانیی ناوبراو لەباری وەزعی ماڵییەوە کۆتایی هات. ئەو لە ساڵەکەنی دواتردا، بەڕەسمی پتر لە میلیۆنونیوێک دۆلار مووچەی لە ئیسرائیل وەرگرت و دیارە ئەم دراوە لە «سەرمایەی ڕەش» دە درا بەو. جگە لەوە، ئەو هێندێ داهاتی دیکەشی هەبوون. بۆ وێنە، کاتێک ڕێککەوتنێکی موعامەلە دەگەڵ هێندێ سەوداگەری تایبەتی دەبەسترا کە ئەو کاری لەگەڵ دەکردن، لەو ڕێگایەشەوە پارەیەکی دەست دەکەوت. داهاتەکانی دەڕژانە ئەو حیسابانە کە لە بانکەکانی «گراند کەیمەن» Grand Caymanی بێلژیک و لووکزامبوورگ کردبوونیەوە.

ئەو ئازاد بوو بە دراوەکانی خۆی هەرچی دەیەویست بیکا و ئەوە پێوەندیی بە ئێمەوە نەبوو. بەڵام ئاگادار بووین کە «ژانێت فیلدینگ» هاوسەری دووەمی، ئەوی تەڵاق دا و داوای ٥٠ هەزار دۆلاری لێکرد و «دیڤیس» هەموو ئەو دراوەی پێدا. بەو دراوانە کە لە ئێمەی وەگرتن توانی هەموو قەرزەکانی بە بانکەکان بداتەوە، بەڵام دراوەکانی بە شێوەیەکی تایبەتی خەرج دەکردن. ئەو بە پێشنیاری ئێمە ئەو ترومبێلە فۆردسکۆرتە ڕەنگزیوینەی کە ڕۆژنامەی Daily Mirror پێی دابوو، بۆخۆی ڕاگرت، بەڵام خانووبەرەیەکی ٤ نهۆمی لە

ژمــاره ۱ی شـــەقامی «ترافالگـــار» Trafalgar، لـــە بەشـــی Castle Elephantی لەندەن کڕی. ئێمە ئەو خانووبەرەیەمان کردبووە دەفتەری کاری خۆمان کە ژمارەی تەلەفونەکەی ۲۳۱۰۱۱۵ بوو.

پـاش ماوەیـەکی کـورت، «دیڤـیس» هەنـدێک سـەفەری ئـەمریکا، ئورووپا و ئێرانی بۆ کردین. ئەو ئەرکی خۆی باش بەجێدەگەیاند. ئێمـە هێندێ وەخت ڕۆژێ ۲ یان ۳جار بە تەلەفونی سەرنووسەری دەرەکیی ڕۆژنامەی Daily Mirror پێوەندیمان دەگەڵ دەگرت. زۆربەی ئەو تەلەفونانەمان لە تەلەفونی گشتییەوە بە حیسابی Daily Mirror لێ-دەدان. بـەمجـۆرە سـەدان تەلـەفون بـە ناوەنـدی تەلـەفونی ڕۆژنامـەی Daily Mirror دا تێدەپەڕی. کاتێک «دیڤیس» تەلەفونەکەی هەڵدەگرت، دەیگوت: «نیک دیڤیس».

ئێمە تەنیا ئەو کاتە تەلەفونمان لە «دیڤیس» دەکرد کە پێویست بوو لـە دەفتـەری لەنـدەنمان کـەلک وەرگـرین. کاتێـک ئێرانییـەکان داوای کڕینی کەرەسـەی شـەڕیان لێدەکردین، ئێمـە لێکمـان دەدایەوە داخـوا لەو وڵاتانـەی لـە پێرسـتی ئێمـەدا هـەبوون، کامـەیان بـۆ دابینکردنـی چەکە داواکراوەکانی ئێران گونجاوترە و چەکەسێک لـەو وڵاتـە باشـتر لەوانی دیکە دەتوانێ بۆ کڕین و فرۆشتنی چەکەکان لەلایـەن ئێمـەوە بکەوێتە گفتوگۆ. بۆ نموونە، ئەگەر «دیڤیس»مـان بـۆ موعامەلەکە هـە لبژاردبـا، ئـەو تەلـەفونی بـۆ سـەوداگەران و دابـینکـەرانی چەکـە داواکراوەکـان لـە وڵاتـانی دەرەوە دەکـرد و خـۆی وەک نوێنـەری لقـی لەنـدەنی «گرووپـی ئیسـڕائیلیی ئـۆرا» دەناسـاند. پاشـان ئـەو دەگـەڵ کەسانی پێوەندیدار لە پشوویەکی کۆتایی حەوتوودا قەراری دادەنا و بـە فرۆکـە دەچـووە ئـەو وڵاتـە و لـەبارەی موعامەلـەی چەکـەکان و شـێوەی دانـی قیمەتـەکانیان کاردروسـتایی پێویسـتی دەکـرد. ئـەو سـەوداگەر و بەرهەمهێنەرانـەی کەرەسـە جەنگییـەکان کـە «دیڤـیس» موعامەلەی دەگەڵ دەکردن، ئەگەر بۆیان گونجابا زۆرجار تەلـەفونیان بۆ ئیسڕائیل دەکرد، تا دڵنیا بن کە «دیڤیس» بەڕاستی نوێنـەری وانـە.

لەوحاڵەدا SIBAT یان «لقی فرۆشتنی دەرەکیی وەزارەتی بەرگریی ئیسرائیل» وەڵامی دەدانەوە و هەر پرسیاریکیش لەبارەی «دیڤیس» یان ئیشکەرە گرنگەکانی دیکەی ڕایەڵکەکەمانەوە هەیانبا، پێوەندییان دەگەڵ من دەگرت.

فرۆشتنی کەرەسەی شەڕ و پەردەپۆشکردنی هەموو ئەو عەمەلیاتانەی بەجۆرێک پێوەندییان بە کڕین و فرۆشتنی ئەوانەوە هەبوو، بەشێوەیەکی یەکجار سەرکەوتوو دەچووە پێش. ئێمە لە ڕێکخستنی کڕین و فرۆشتنەکان، پەردەپۆشکردنیان و تەحویلدانی کەرەسە جەنگییەکاندا کارامەیی و وەستایی‌یەکی زۆرمان بەدەست هێنابوو. لە ساڵی ۱۹۸۱ڕا هەتا ساڵی ۱۹۸۷، هەمیشە بە درێژایی ساڵ، ئێمە سەرگەرمی کڕین و فرۆشتنی کەرەسەی جۆراوجۆری شەڕ بووین، کە ڕوونکردنەوەی یەکبەیەکی وان لەتواناندا نیە. بۆ نموونە، موعامەلەی مووشەکی TOW لە ساڵی ۱۹۸۳دا، یەکێک لە سەرکەوتووترین موعامەلەکانی ئەو ساڵانەمان بوو.

ئێرانییەکان حەزیان دەکرد، ژمارەیەک مووشەکی TOW کە جۆرێک مووشەکی دژەتانکی ئەلیکترۆنیی ڕێنوێنیوەرگرە، لە ئێمە بکڕن. سوپای ئێران، تێگەیشتبوو کە تەنیا ڕێگای پێشگرتن بە هاتنی شەپۆلی تانکەکانی شووروەوی بەهۆی عێراقییەکانەوە بۆ سنوورەکانیان، کەلکوەرگرتن لەو مووشەکانەیە (TOW). ئیسرائیل ٤٠٠٠ مووشەکی TOWی لە عەمبارەکانیدا هەبوون کە خەریک بوو دەڕزین. ئەو مووشەکانە، لەڕاستیدا دوو ساڵی دیکە، واتە ساڵی ۱۹۸۵، کاریگەریی خۆیان لەدەست دەدا.

کۆتایی ساڵی ۱۹۸۳، ئەمن هەر بەشێوەی سەفەری پێشووم و هەر بەو بەڵگەی هاتوچوویە کە بۆ سەفەری ئێران کەلکم لێوەرگرتبوو، و لە بەشەکانی پێشووی ئەم کتێبەدا بەدرێژی باسم کردوون، چوومە ئێران و چاوم بە حوجەتولئیسلام عەلیئەکبەری هاشمیی ڕەفسەنجانی سەرۆکی پارلمانی ئێران کەوت. لەو دیدارەدا ئێمە

ماوەیەک لەبارەی سیاسەتی ناوچەی خۆرهەڵاتی نێوەڕاستەوە باس و گفتوگۆمان کرد. پاشان ڕەفسەنجانی هاتە نێو باسە بنەڕەتییەکە و بێ‌پەردە بەمنی گوت: «ئێمە خەریکە دەکەوینە وەزعێکی زۆر خەراپەوە. وا دێتە بەرچاو کە هێزە عێراقییەکان خەریکن پێشمان دەکەون. ئێمە دەبێ چەکی وامان هەبێ کە بتوانین تانکەکانی ئەوانی پێ ڕاگرین، ئێوە خۆتان دەزانن ئەمن دەمەوێ بڵێم چی. ئێمە پێویستیمان بە مووشەکی TOW هەیە».

بەدوای ئەو گفتوگۆیانەدا، ئەمن دواتر دەگەڵ دۆستی لەمێژینەم، سەید مەهدی هاشمی لەسەر موعامەلەیەک لەبارەی مووشەکە دژەتانکەکانی TOW ڕێک کەوتین، بەو جۆرە کە ٤٠٠٠ مووشەکی TOW بە کەشتییەک کە لە لیبریا تۆمار دەکرا، ڕاستەڕێ لە ئیسرائیلەوە بچێتە بەندەر عەبباس و دەوڵەتی ئێران بۆ هەر مووشەکێک ١٢٠٠٠ دۆلار بدا. کاشانی گوتی، بۆ هەرکام لە مووشەکەکان ٨٠٠ دۆلار زیاد بکە بەجۆرێک کە ئێران بۆ هەر مووشەکێک ١٢٨٠٠ دۆلار بدا، بەڵام ئێوە ئەو ٨٠٠ دۆلارە زیادییانە بەجیا بڕژێننە حیسابێکی بانکی لە ئورووپا. کاشانی پێی داگرت کە ئەمە دراوێکی تایبەتە کە ئەوان بۆ شۆڕش ڕایدەگرن. بۆخۆی مانای ئەم قسەیەی دەزانی. جا مانایەکەی هەرچی بوو نازانم.

کۆمیتەی هاوبەش بڕیاری دا کە پێش ئەوەی دەست بە فرۆشتنی مووشەکەکان بکرێ، دەبێ دوو کاری دیکە بکرێن: یەکەم ئێمە بۆ گومڕاکردنی خەڵکی دیکە هێندێک هەواڵ و زانیاریی ناڕاست لەبارەی موعامەلەکەوە بڵاو بکەینەوە و ئەوی دیکە ئەگەرچی ئێمە بە قسە ڕەزامەندیی ئەمریکایی‌یەکانمان بۆ ئەنجامدانی ئەو موعامەلەیە بەدەست هێنابوو، بەڵام دووبارە دەبوو ڕەزامەندیی ئاشکرا و ڕاشکاوانەی ئەوان لەسەر موعامەلەکە وەربگرین.

لەبارەی بەدەستهێنانی ڕەزامەندیی ئاشکرای ئەمریکایی‌یەکانەوە، یەکێک لە ئەندامانی کۆمیتەی هاوبەش بە تەلەفون پێوەندیی بە

«گەیتس»ەوە گـرت و قسـەکانی لـەبارەی ڕەزامەنـدیی ئـەمریکاوە لەسـەر شـریت تۆمـار کـران. بـۆ بڵاوکردنـەوەی هـەواڵ و زانیـاریی ناڕاستیش، ئێمە ئەم بەرنامەیەمان جێبەجێ کرد:

ئێمە وامانکرد فڕۆکەیەکی دووماتۆڕەی «سێسنا» Sessna کە لە فەڕانسـە تۆمـار دەکرا، بچێتـە فڕۆکەخانـەی «بن گۆریۆن» لـە تـەل ئـەبیب و بێئـەوەی خـۆی بناسـێنێ یـان داوای مۆڵـەتی نیشـتنەوە لـە فڕۆکەخانە بکا، هـەوڵ بدا بنیشێ و بـەم کارە دۆخێکی نائاسـایی لـە فڕۆکەخانـە دروسـت بکـا. بەشـێوەی سروشـتی کارمەنـدانی بـورجی چاوەدێری بە دیتنی دۆخی نائاسایی ئەو فڕۆکەیە، هـەنگاوی پێویسـت دەهاوێژن و بەدوای ئەوەدا دوو فڕۆکەی جێتی شەڕکەری ئیسڕائیلی، هەردوو لای فڕۆکە نەناسـراوەکە دەگرن و دەیخەنـە گـەمارۆوە. ئەمـە دەبێتـە هـۆی ئـەوە کـە سەرنشـینانی فڕۆکـە نەناسـراوەکە خۆیـان بناسـێنن – یـەکێک لـەوان سـەید مەهـدی کاشـانی و ئـەوی دیکـەیان کەسـێکی فەڕانسـەیی بـەناوی «جین پـاوڵ ئیڤێـز» Jean Paul yves دەبێ. پاشان ڕێگای نیشـتنەوە بـە فڕۆکـە نەناسـراوەکە دەدرێ، بـەڵام پاش نیشـتنەوەی فڕۆکەکە دەسبەجێ سەرنشـینەکانی دەگیرێن و بۆ ڕوونبوونـەوەی هـۆی فڕینەکـە دەکەونـە بـەر لێپرسـینەوە. ئـەم نـە خشـەیە لـە ڕۆژێکـی پشـووی کۆتـایی حـەوتوودا جێبـەجێ دەکـرێ و بۆیە بە تەلەفون دەستوور بە من -کە لـەماڵی خـۆمم – دەدرێ بچمـە فڕۆکەخانە و بپرسم کە ئامانجی فڕینی ئەو دوو سەرنشینە چبووە. ئەمن دەچمە یەکێک لە دەفتـەرەکانی فڕۆکەخانـە کـە موسـافیرە بانـگ-نەکراوەکانیان لەوێ خستۆتە ژێر چاوەدێری، و دەبینم کاشـانی لـەوێ دانیشتوە و پاسپۆرتە فیلیپینییەکەی لەبەر دەم کراوەتەوە. ئەمن هەوڵ دەدەم ئەو زەردەخەنەیە کە کاتی دیتنی کاشـانی بەشـێوەی سروشـتی لەسـەر لێوانم دەردەکەوێ، لەخۆمدا بکووژێنمەوە.

بەرنامەی ناوبراو کە پێشـتر ڕێکخرابوو و ئامـانجی ئـەوە بـوو کـە ئەو دوو کەسە سـەرنجی هەمووان بۆلای خۆیـان ڕابکێشـن، بـە باشـی

بەڕێوە چوو. پاشان ڕێگایان درا بێنە وڵات، بەڵام کاتی چوون بۆ هۆتێل دوو کارمەندی ئەمنیەتی ئەوانیان خستە ژێر چاوەدێری. لەنێو شار بە خێرایی بوو بە دەنگۆ کە دوو کەسی سەوداگەری کەرەسەی جەنگی بە ٧٠ میلیۆن دۆلارەوە بە مەبەستی کڕینی کەرەسەی شەڕ لە ئیسرائیل و فرۆشتنەوەی بە ئێران هاتوونە تەل ئەبیب. دیارە ئەمن دەمزانی ئەو خەبەرە دەگەڵ چکەسانێک باس بکەم کە خێرا لە هەموو جێیەک بڵاو بێتەوە.

هەنگاوی دواتر لە جێبەجێکردنی ئەم بەرنامەیەدا ئەوە بوو کە ئەمن دەگەڵ سەوداگەرێکی کەرەسەی شەڕی ئیسرائیلی، بە ناوی «ئاریە جاکۆبسۆن» Arieh Jakobson کە سەرهەنگ دووەمی پێشووی سوپای ئیسرائیل بو و بەهۆی سەرگوردێکی پێشووی سوپا بەناوی «ئیسرائیل گوڵدسمیت» Israel Goldsmith بەمن ناسێندرابوو، پێوەندیم گرت و پێیم گوت ئیسرائیل دەیەوێ بە موعامەلەیەکی نهێنی ٤٠٠٠ مووشەکی TOW بە ئێران بفرۆشێ و هەزکەس بتوانێ ئەم موعامەلەیە ڕێکبخا، پارەیەکی زۆری دەست دەکەوێ.

«جاکۆبسۆن» بۆ ئەمکارە زۆری حەز و ئامادەیی تێدا بوو. ئەو پێیگوتم کە سەوداگەرێکی دیکەی کەرەسەی شەڕ بەناوی سەرتیپ «ئابراهام بار دێڤید»یش دێنێتە نێو ئەو موعامەلەیە و بۆ ئەوکارە یارمەتیی لێوەردەگرێ. ئەم دووکەسە بە تەمای وەدەستهێنانی پارەیەکی زۆری مفتە، گفتوگۆیەکی نهێنییان دەگەڵ SIBAT (لقی فرۆشی دەرەکیی وەزارەتی بەرگری) دەست پێکرد. ئەم خەبەرە لە هەموو جێیەک بڵاو بۆوە و بە زوویی نیوەی وڵاتانی جیهان ئاگادار بوون کە دوو سەوداگەری کەرەسەی شەڕ چوونە ئیسرائیل تا لەسەر کڕینی مووشەکی TOW وتووێژ بکەن.

ئاخرەکەی کاشانی و «ئیڤێز» بە دەستی بەتاڵ گەڕانەوە و بە دنیا نیشان درا کە ئیسرائیل هیچ دەستی لە فرۆشتنی مووشەکی TOW بە ئێراندا نیە، بەڵام دیسان ئەو خەبەرە لە زەینی خەڵکدا مایەوە کە «بار

دێڤید» و «جاکۆبسۆن» گفتوگۆکانیان دەگەڵ ئێرانییەکان بۆ ئەوەی مووشەکی TOWیان پێ بفرۆشن درێژە پێدەدەن. بەجۆرێکی دیکە بڵێین، بۆ هەمووان دەردەکەوێ کە لەباری ڕەسمییەوە، ئیسرائیل هیچ نەخشێکی لە موعامەلەی کەرەسەی شەڕدا نیە و دەستی ئیسرائیل لەو گفتوگۆیانە پاکە.

هیچکەس و تەنانەت «بار دێڤید» و «جاکۆبسۆن»یش نەیاندەزانی کە هەموو ئەو سیناریۆیە یارییەکی دروستکراو بووە بۆ داپۆشینی موعامەلە ئەسڵییەکە، چونکە ئەوکاتەی کاشانی و ئەفسەرانی پێشووی سوپای ئیسرائیل، وەک شێتان بۆ ئەنجامدانی ئەو موعامەلەیە باس و وتوویژیان بوو و تێلێکسێکی زۆر لە گۆشەوکەناری دنیادا بۆ ئەنجامدانی موعامەلەی چەک دەگەڵ ئێران دەهاتن و دەچوون، مووشەکە TOWەکان بە بێدەنگی گوازرابوونەوە بۆ ئێران. ئەو شێوەکارە سەرپۆشێکی یەکجار وەستایانە بوو کە تەنانەت خەڵکی ئیسرائیلیشی فریو دا و ئەمن دەمزانی ئەوانەی لەو یارییەدا کڵاویان چۆتە سەر، کاتێک بۆ یەکەمجار ڕاستیی مەسەلەکەیان بۆ دەردەکەوێ و تێدەگەن چۆنیان چاو بەستراوە، یەکجار ناڕەحەت دەبن. بەڵام لەلایەکی دیکە هەرکەس بە شێوەی ڕەسمی یان ناڕەسمی بەجۆرێک سەروکاری دەگەڵ کڕین و فرۆشتنی کەرەسەی شەڕ هەیە، دەبێ جاروبار چاوەڕوانیی چاوبەستی واشی هەبێ.

لە یەکەمین وەجبەی ئەو مووشەکانە کە بە ئێرانمان فرۆشتن، ئێمە لەسەر یەک ٥٥٢٠٠٠٠ دۆلارمان دەست کەوت. بۆئەوەی ئەو برە زۆرە لەچاو نەدا، لەسەر ئەوە ڕێککەوتین کە ئێمە لە لقە جۆراوجۆرەکانی «بانکی یەکگرتووی ئیرلەند» Allied Irish Bank چەند حیسابێک بکەینەوە و پارەی موعامەلەکە بخەینە ئەو حیسابانەوە.

بەپێی ڕێککەوتنێکی نێوان ئێمە و کاشانی و «ئۆمشی»، قەرار بوو هەتا مووشەکە TOWەکان نەگەنە دەستی ئێران ئێمە لە پارەکەیان کە پێشتر لەلایەن ئێرانەوە درابوو، کەلک وەرنەگرین. لەڕاستیدا

کۆمیتەکـەمان بـۆ هـەر مووشـەکێک ٣٠٠٠ دۆلاری دابـە وەزارەتـی بـەرگری کـە هـەمووی گەیشـتە ١٢٠٠٠٠٠٠ دۆلار. بـڕی ٣٢٠٠٠٠٠ دۆلاریشمان لە حیسابێک کرد کە کاشـانی بـۆ ٨٠٠ دۆلارەکەی خۆی دیـاریی کردبـوو. ٨٠٠٠٠٠ دۆلاریـش خـەرجی بیمـە و گوازتنـەوەی مووشـەکەکان کرا و ئـەوی دیکـەی، واتـە ٣٩٢٠٠٠٠٠ دۆلار سـوودی پاککردەی ئێمە بوو کە خرایە سەر دارایی «سەرمایەی ڕەش».

ئەوەندەی پێوەندیی بە وڵاتانی دیکەی دنیـاوە هـەبوو، هـەموو کـەس دەیزانی کە دەستی ئیسـڕائیلی و ئـەمریکایی‌یەکان لـەو ئالوودەبوونـە پاکە، بەڵام ڕاستییەکی ئاشکرا ئەوە بـوو کـە ئێرانییـەکان لـە بـەرەکانی شـەڕدا عێراقییـەکانیان خسـتە ژێـر پـەلامار. کاتێـک ئێرانییـەکان ٤٠٠٠ مووشـەکی هـەوەڵیان لـە بـەرەکانی شـەڕدا خـەرج کـرد، ئێمـە ٤٠٠٠ مووشـەکی دیکـەمان لـە جبەخانـەی هێزەکـانی نـاتۆ لـە ئورووپـا پـێ-فرۆشتن و پاش خەرجکردنی وەجبەی دووەم، بۆ سێیەمین‌جـار ٤٠٠٠ مووشـەکی دیکـەمان لـە ئـەمریکا کـڕی، کـە لـەڕێگای گواتمـالا و ئوستڕالیاوە گوازرانەوە بۆ ئێران. بـەم‌جۆرە تـا سـاڵی ١٩٨٧، لەسـەر یەک ١٢٠٠٠ مووشەکی TOWمان بە ئێرانییەکان فرۆشـت. ئێمـە پێمـان وایە ئەو مووشەکانە سەرەنجام ڕوخساری شەڕەکەیان گۆڕی.

ئێـران بەڕادەیـەک سوپاسـی کۆمەگـەکانی ئیسـڕائیلی کـرد کـە بـە کۆمیتـەی گـوت: «هـەرچی لـە ئێمـەتان دەوێ، تـەنیا پێمـان بڵێن، ئێمـە بەوپەڕی پێخۆشبوونەوە بۆ بەجێگەیاندنی هـەوڵ دەدەیـن». لەڕاسـتیدا ئێرانییەکان دەیانتوانی خزمەتێک بە ئێمە و ئەمریکایی‌یەکان بکـەن کـە زۆرمـان حـەز پێدەکرد. ئـەو تانکانـەی شـوورەوی کـە عێراقییـەکان لـە شـەڕی ئێرانـدا بـەکاریان دێنـان بریتـی بـوون لـە تـانکی T-72 بـەڵام سـۆڤیەتییەکان ژمارەیـەک تـانکی پێشـکەوتووی T-80شـیان بـە عێراقییـەکان فرۆشـتبوو. سـۆڤیەتییەکان حـەزیان دەکـرد عێراقییـەکان ئـەو تانکە پێشکەوتووانە لـە بـەرەی شـەڕدا بـۆ وان تـاقی بکەنـەوە و ئەمەش ئەو شتە بوو کە ئێمە خوازیاری بووین.

سالّی ١٩٨٥، ئێرانییەکان سێ تانکی T-80یان لە عێراقییەکان بە دەسکەوت گرت کە دوویان بە گوللە کون ببوون و سێیەمەکەیان تەنیا زنجیرەکەی زیانی پێگەیشتبوو. ئێمە بە ئێرانییەکانمان گوت کە حەز دەکەین تانکی سێیەممان بدەنێ. ئەوان زۆر بە خۆشحالّی، داخوازەکەمانیان قبووڵ کرد و تانکەکەیان لە بەندەرعەبباسەوە ناردە ئیسرائیل. ئێمە ئەو زانیارییانەی لە تانکی T-80 بەدەستمان هێنا، لە کۆنفرانسە تەکنیکییە هاوبەشەکانی ئیدارەی پێوەندییەکانی دەرەوەی رێکخراوی هەواڵگریی سوپای ئیسرائیل و رێکخراوی هەواڵگریی وەزارەتی بەرگریی ئەمریکادا دامانن بە ئەمریکاییەکان، بەڵام هەرگیز پێمان نەگوتن کە ئێمە تانکێکی T-80مان لەدەستدایە، بەڵکوو بە ئەمریکاییەکانمان گوت ئەو زانیارییانەمان لە دوو جوولەکەی کۆچبەری شوورەوی وەرگرتوە کە لەو ولاتە لە کارخانەی تانک-سازیی T-80دا ئەندازیار بوون و کۆچیان کردوە بۆ ئیسرائیل.

لەحاڵێکدا دارایی «سەرمایەی رەش» بێ ماتڵی و بەقایمی لە زیادبووندا بوو، خەرجی جۆراوجۆری نائاسایی سوودی دەستکەوتوو لە کڕین و فرۆشتنی کەرەسە جەنگییەکانی کەم دەکردەوە. راستە ئێمە ئامراز و کەرەسە جەنگییەکانمان ٥٠ تا ٤٠٠لەسەدی نرخی کارخانەی بەرهەمهێن گرانتر بە ئێرانییەکان دەفرۆشت، بەڵام خەرجی ئامادەکردن و تەحویلدانیشیان لەڕادەبەدەر زۆر بوو. ئێمە دەبوو پوول بدەینە راپەڵکەیەکی گەورەی سەوداگەرانی کەرەسەی جەنگی، خەرجی ئەو کارانەمان دابین دەکرد کە بۆ پەردەپۆشکردنی عەمەلیاتەکەمان پێویست بوون، بەرتیلمان دەدایە سیاسەتمەدارانی دەوڵەتی، بۆ خەرجی ململانەی هەڵبژاردنی سیاسەتمەدارانی جۆراوجۆر لە سەرانسەری دنیادا هێندێ پووڵمان حەواڵە دەکرد و زۆر پووڵی دیکەی لەو بابەتانەمان خەرج دەکرد. هێندێ جار ئەو پوولانەی بەوجۆرە خەرجمان دەکردن تەنانەت لە نرخی کەرەسە جەنگییەکانیش پتر بوون.

ئێمە تەنانەت لە دارایی «سەرمایەی ڕەش»یش ناڕاستەوخۆ هێندێ پووڵمان دەدا بە سیاسەتمەدارانی ئەمریکایی بۆ وێنە ئەو دێموکڕاتانە کە لە پانێلی ئێران -کۆنتڕادا بوون. یەک لەو هۆیانەی وایانکرد کەس لە ڕاستیی داستانی پڕشوورەیی ئێران- کۆنتڕا ئاگادار نەبێ، هەر ئەو پووڵانە بوون کە ئێمە دامان بەو دێموکڕاتانەی لە پانێلی ئێران- کۆنتڕادا بوون. تەنانەت، دەگەڵ ئەوەی ئیسرائیل وردەکاریی بەشێک لە چالاکییەکانی «ئۆلیڤێر نۆرس»ی لەقاو دا، بەوحاڵە، زۆر لەو دێموکڕاتانەی ئاگایان لەو هەموو کەرەسە جەنگییە هەبوو کە لە ئیسرائیلەوە دەچووە ئێران، لەو بارەیەوە بێدەنگ بوون. چونکە تەل ئەبیب نەیدەوەیست موعامەلەی چەکوچۆڵە دەگەڵ ئێرانی لێ ئاشکرا بێ، لە ڕێگای جۆراوجۆر و زۆرجار پێچەڵپووچەوە، پووڵێکی دەدایە «کۆمیتەی کاروباری گشتیی ئیسرائیل- ئەمریکا». ئەمن نازانم چ-کەسێک لەو کۆمیتەیە لە سەرچاوەی دانی ئەو پووڵانە ئاگادار بوو، بەڵام گومانم نیە، کەسێک لەو بەسەرهاتە ئاگادار بووە.

هەر بەوشێوەیە، لە وڵاتی بریتانیا، کۆمیتەکەمان لە ڕێگای «بزووتنەوەی چاکسازیی یەهوودییەکان»ەوە پووڵی دەدا بە «حیزبی پارێزکارانی بریتانیا». بەهۆی دۆستایەتییەک کە لەنێوان بریتانیا و «مۆساد»دا هەبوو، ساڵی ١٩٨٢ ناوەندی عەمەلیاتی ئورووپایی «مۆساد» لە پاریسەوە گوازرایەوە لەندەن و لە خانووبەرەیەکدا لە شەقامی «بەیز واتێر» Bays Water جێگیر بوو.

نموونەیەکی دیکە بۆ نیشاندانی ئەو پێوەندییە تایبەتە کە ئیسرائیل دەگەڵ بریتانیای هەبوو، مەسەلەی شەڕی «فاکلەندز»ە. کاتێک شەڕی «فاکلەندز» دەستی پێکرد، ئیسرائیل هەرچەند قەراردادی فرۆشتنی فڕۆکەی «کفیر» Kfirی لەگەڵ ئارژەنتین بەستبوو، ناردنی ئەو فڕۆکانە بۆ ئارژەنتینی ڕاگرت. دەوڵەتی بریتانیاش بەرامبەر بەو خزمەتەی ئیسرائیل، هەموو ئەو زیانانەی ئەم وڵاتە بەهۆی نەفرۆشتنی فڕۆکەکان بە ئارژەنتین تووشی هاتبوون، بەڕەسمی بەڵام

بە نهێنی بۆ ئیسرائیل قەرەبوو کردنەوە. دیارە هەموو کارمەندە هەواڵگرییەکان ئاگادار بوون کە ئیسرائیل لە ڕێگای ئەو پووڵانەوە کە دەیدان بە «بزووتنەوەی چاکسازیی یەهوودییەکان»، سیاسەتمەدارانی بریتانیای خۆشحاڵ و ڕازی ڕادەگرت. بەوحاڵە، ساڵی ١٩٨٨ کە «مارگارێت تاچەر» سەرۆکوەزیری بریتانیا، پشتیوانیی لە فرۆشتنی کەلوپەلی سەربازی بۆ چەکە پێشکەوتووەکانی عێراق کرد، پێوەندیی دۆستانەی بریتانیا و ئیسرائیل بەرەو ساردی ڕۆیشت.

بێجگە لەو دراوە کە کۆمیتەی هاوبەش دەیدا بە ئەمریکا و بریتانیا، هێندێ پووڵیشی لە سەرانسەری دنیا، تەنانەت لە شوێنێکی دووردەستی وەک ئوستراڵیا خەرج دەکرد و ئەوانەی بەرەسمی ئەو پووڵانەیان وەردەگرت، بەشێوەی سروشتی دەمی خۆیان دادەخست. وڵاتی ئوستراڵیا زۆرجار لە ڕێگای کۆمیتەی هاوبەشەوە بۆ ڕاگرتنی فڕۆکەکان و نوێکردنەوەیان و هەروەها ڕاگرتنی «سەرمایەی ڕەش» کەلکی لێوەردەگیرا. ساڵی ١٩٨٢ بۆ یەکەمجار ئەمن بۆ کردنەوەی دەفتەرێکی حیسابداری بۆ حیسابکردنەوە لە چوار بانکی گرنگدا چوومە ئوستراڵیا. لەکۆتایی کاردا هەموو ئەو پووڵانەی خستماننە حیسابەکانی خۆمان لە بانکەکانی ئوستراڵیادا گەیشتە ٨٢ میلیۆن دۆلاری ئەمریکایی.

سەرەتای ساڵی ١٩٨٦، ١٢ فڕۆکەی C-١٣٠ کە لە ڤیەتنامەمان کڕیبوون، بۆ چاککردنەوە و نوێسازی نێردرانە ئوستراڵیای خۆرئاوا. ساڵی ١٩٨٧، کاتێک دادپرسیی ئێران- کۆنترا لە کۆنگرەی ئەمریکادا لەبەر دەست بوو، بەشێک لەو کەرەسە جەنگییانە کە قەرار بوو بنێردرێنە ئێران بەشێوەی کاتی ڕاگیران. دەوری ٦٠ بەستە گوللەی تۆپخانە کە لە کۆریای باکووریمان کڕیبوون، لە بەندەری «فریمانتڵ» Fremantle پارێزران، ٤٠٠٠ مووشەکی TOW کە لە ئەمریکاوە نێردرابوونە گواتمالا، گوازرانەوە بۆ ئوستراڵیای خۆرئاوا و

دەوروبـەری دوو مانـگ لـە پێگـەی دەریـایی دوڕگـەی «سـتڕلینگ» Stirling ڕاگیـران. مووشـەکەکانی کرمـی هاوریشـمیش کـە لـە چـین بـۆ ئێران کڕرابوون دەوری دوو مانگ لە دوڕگەی «ستڕلینگ» ڕاگیران.

فێوریەی ۱۹۸۷ دیارییەکی نەغدی لەلایەن هاوکاری ئەمریکایی ئێمە لە CIA درایە حیزبی کرێکاری ئوسـتڕالیای خۆرئاوا، بۆ سوپاسـکردن لــەوەی حکوومـــەتی ئوســتڕالیا ڕێگــای دابــوو لــە خــاکی وان بــۆ گوازتنەوەی چەک بۆ ئێران کەلک وەرگیرێ. «ئارل بریان» Earl Brian بـە نوێنەرایـەتیی «هـادرۆن» Hadron لـە کارمەنـدانی پێشـووی CIA چەکێکی بە بڕی ٦ میلیۆن دۆلاری ئەمریکایی دا بە «ڕیچارد بابایان» پەیمانکاری CIA. «ڕیچارد بابایان» بەسەفەر چووە «پێرت» Perth و لـە مـاڵی «یووسف گۆڵد بوورک» Yosef Gol Burke کە بازرگـانێکی بەڕەگــەز ئیســـڕائیلیی ئوســـتڕالیایی بــوو، مایــەوە. «یووسـف گۆڵـد بوورک» دەگەڵ ڕێکخراوی هەواڵگریی ئیسڕائیل و حیزبی کرێکار بـە ڕێبـەریی «بریـان بـوورک Brian Burke کە ئـەودەم سـەرۆکوەزیـری ئوسـتڕالیا بـوو، پێوەندیی هـەبوو. «بابایـان» چەکەکـەی دا بـە «گۆڵـد برووک» و ئەویش تەحویلی «ئالان باند» Alan Bondی دا. ئـەم پووڵـە بـەهۆی یـەکێک لـە کۆمپانییـەکانی «ڕابێرت مەکسوێل» لـە ئوسـتڕالیا درا بـە «کۆمپـانیی چاپەمـەنیی پێرگـاموون» لـە مۆسـکۆ. «بابایـان» دواتـر وردەکـاریی ئـەم عەمەلیاتـەی لـە سـوێندنامەیەکدا پشـتڕاسـت کردەوە.

دەگەڵ ئەو هەموو خەرجە زۆرە کە ڕایەڵکەکەمان ناچار بوو بیاندا، فرۆشـتنی کەرەسـەی شـەڕ بـە ئێـران بـۆ ئێمـە زۆر بەسـوود بـوو، بەڕادەیەک کە دارایی «سەرمایەی ڕەش» گەیشـتە ۱ میلیـارد دۆلار و لــە بــەرزترین ڕەقەمــدا تەنانــەت گەیشــتە ۱۸ میلیــارد دۆلاریــش. ڕایەڵکەکەی ئێمە بەوجۆرە ببوو بە کۆمپانییەکی پڕسـوودی بازرگـانی. دراوێکـی یـەکجار زۆر لـە موعامەلـەکانی ئێمـەدا دەهـات و دەچـوو، بــەجۆرێک کــە چۆنیــەتیی کــاری ئێمــە بۆیــە دەبــوو کۆمپانییــەکی

سەرکەوتووی چەکدارکردن کە سەروکاری دەگەڵ کڕین و فرۆشتنی کەرەسەی ئاسایی شەڕ هەبوو، ئێرەیی پێبەری. ڕێبەرانی حیزبی لیکوود کە ئەودەم حکوومەتی ئیسرائیلیان بەدەستەوە بوو، بڕیاریان دا «سەرمایەی ڕەش» بۆ سێ ئامانج خەرج بکەن.

ئامانجی یەکەم ئەوە بوو کە بە «سەرمایەی ڕەش» یارمەتیی گرووپی «ئیسحاق شامیر» لە حیزبی لیکووددا بدەن. بۆ ئەو مەبەستە، لەنێوان ساڵەکانی ١٩٨٤ و ١٩٨٩دا هەرنەبێ ١٦٠ میلیۆن دۆلار لەژێر چاوەدێریی «ئەهوود ئۆلمەرت» Ehud Olmert جێگری سەرۆکوەزیردا کە زۆر لە «ئیسحاق شامیر» نیزیک بوو، درا بە گرووپی «ئیسحاق شامیر». پاشماوەی پارەکە کە دەوروبەری ٩٠ میلیۆن دۆلار بوو، بۆ حیزبی لیکوود خۆی و بەتایبەتی ململانەی هەڵبژاردنی ساڵانی ١٩٨٤ و ١٩٨٨ تەرخان کرا.

ئامانجی دووەم ئەوە بوو کە بەهرەوەرگرتن لە «سەرمایەی ڕەش»، عەمەلیاتی «ڕەش»ی کۆمەڵگەی هەواڵگریی ئیسرائیل لە سەرانسەری جیهاندا پەرە پێبدرێ. ئەم ئامانجە، بەهێزکردنی بنیاتی ماڵیی «تێرۆریستە فەلەستینییەکان»یشی دەگرتەوە کە بەناوی شۆرشی فەلەستین تاوانیان ئەنجام دەدا، بەڵام بێئەوەی بزانن کاریان بۆ بەرنامەکانی مەکینەی پڕوپاگەندەی ئیسرائیل دەکرد.

سێیەمین و دوامین ئامانجی «سەرمایەی ڕەش» کۆمەک بە پڕۆژەی خانوودروستکردن لە کەناری خۆرئاوای چۆمی ئۆردۆن و باریکەی غەززە بۆ کۆچبەرانی جوولەکە بوو کە دەهاتنە سەر خاکی فەلەستینییەکان. چونکە زۆر لە ئەندامانی کۆنگرەی ئەمریکا جێبەجێکردنی پڕۆژەی خانوودروستکردن لە باریکەی غەززەیان بە کۆسپی سەر ڕێگای وتووێژەکانی ئاشتی لە ناوچەی خۆرهەڵاتی نێوەڕاست دەزانی. بۆیە دژی ئەوە بوون ئەو پووڵە زۆرەی ئەمریکا دەیدا بە ئیسرائیل، بۆ خانوودروستکردن لە لێواری خۆرئاوای چۆمی ئۆردۆن و باریکەی غەززە خەرج بکرێ. ئاشکرایە کە حیزبی

کرێکاریش کە نیوەی حکوومەتی هاوپەیمانیی ئیسرائیلی بەدەستەوە بوو و لایەنگری پێشکەوتنی وتووێژەکان و بەشداری لەواندا بوو، دژی بەرنامەی خانوودروستکردن بۆ کۆچبەرە جوولەکەکان دەوێستا.

بەهەرحاڵ، حیزبی لیکوود چارەی ئەو گیروگرفتەی لە کەلک-وەرگرتن لە دارایی «سەرمایەی ڕەش»دا بەدی کرد. دەیان میلیۆن دۆلار بۆ دروستکردنی خانووبەرەی تازە و کڕینی زەویی عەرەبەکان خەرج کرا. ئەگەرچی حکوومەتی ئیسرائیل خاکێکی زۆری عەرەبەکانی زەوت کرد و خاکێکی زۆرتریشی بەو ناوە کە حکوومەتی ئیسرائیل بۆ کاروباری گشتی پێویستیی پێیانە لە عەرەبەکان ئەستاند، بەوحاڵە زۆر لەو عەرەبانەی PLO لێی قەدەغە کردبوون زەوییەکانیان لە لێوارەی خۆرئاوای چۆمی ئۆردۆن بە جوولەکەکان بفرۆشن، بە قیمەتی یەکجار گران زەوییەکانیان بە جوولەکەکان فرۆشت. ڕاستە ئەوانە ئەگەر کارەکەیان لێ ئاشکرا بایە، گیانیان دەکەوتە مەترسییەوە، بەڵام لەبەر ئەو قیمەتە یەکجار گرانە کە جوولەکەکان دەیاندانێ زەوییەکانیان پێ فرۆشتن.

عەرەبەکان پێیان وابوو زەوییەکانیان بە کۆمپانییە کەلیمییەکان دەفرۆشن، بەڵام لەڕاستیدا ئەوە کۆمیتەی هاوبەش بوو کە بە کەلک-وەرگرتن لە «سەرمایەی ڕەش» زەویی عەرەبەکانی بە هۆی هێندێ کۆمپانیی بەڕواڵەت کەلیمییەوە دەکڕین. زۆر لە عەرەبەکانی دانیشتووی لێواری خۆرئاوا بە فرۆشتنی زەوییەکانیان دەوڵەمەند بوون و بەو دراوەی لە فرۆشتنی زەوییەکان دەستیان کەوت کۆچیان کردە وڵاتانی دیکە. بەڵام لە ڕوانگەی حیزبی لیکوودەوە پارەیەک کە بۆ کڕینی زەویی عەرەبەکان خەرج دەکرا، لە ڕێگای چاک و شیاودا سەرف دەکرا. چونکە دانی ئەو پارەیە بە عەرەبەکان ئەوانی هان دەدا کۆچ بکەنە وڵاتانی دەرەوە و زەوییەکانیان بدەنە ئەو جوولەکانە کە

جێگای وانیان دەگرتەوە. ئەو خانووانەش کە لەسەر ئەو زەوییانە دروست کران بە کەلکوەرگرتن لە«سەرمایەی ڕەش» دروست کران.

هەروەخت پێویست بایە، پووڵێکی زۆر بدرێ بە لێواری خۆرئاوا، کەلک لە کۆمەک و هاوکاریی خاخام «مەناخیم شنیرسۆن» Menachem Schneerson ڕێبەری ڕووحانی و مەعنەویی ڕێکخراوی لیباڤیچەر کە ناوەندی عەمەلیاتەکەی لە نیۆیۆرک بوو، وەردەگیرا. «مەناخیم شنیرسۆن» لەوبارەیەوە هاوکاریی پێویستی دەکرد و ڕێکخراوەکانی بڕێکی زۆر پارەیان دەنارده «درێکسێل بوورنهام» Wilxel Burnham. دیارە دەبێ بزانین کۆمپانیی «درێکسێل» ئێستا بۆتە ناوەندێکی سەوداگەریی نابووت کە لەودا «مایکل میلکەن» دەلاڵی کلاوبازی بەش (سهام)ە بێئیعتیبارەکان، بڕێکی یەکجار زۆر پووڵی دەست کەوت. هێندێ وەخت، بە میلیارد دۆلار لەو پووڵەی ئێرانییەکان بۆ ئەو کەرەسە جەنگییانەی قەرار بوو دەستیان کەوێ دەیاندا، دەگەڵ ئەو سوودانەی لە موعامەلەکانی پێشتر هاتبوونە دەست و بە ڕێگای بانکە ئەمریکاییەکاندا درابوونە کۆمپانییە سەرپۆشەکانی ئێمە، دەکەوتنە دەست کۆمپانیی «درێکسێل». ئەم کۆمپانییە پووڵە ئامادەپێکراوەکانیان لەلایەن کۆمپانیا سەرپۆشەکانی ئێمەوە بە نرخی جۆراوجۆر لەلای خۆی ڕادەگرتن. ئەم پووڵە بێ-ئەندازانە، ئیعتیباری کۆمپانیی «درێکسێل»یان بردە سەر و بەشی کۆمپانییەکە لە سوودی ئەو پووڵانە کۆمەگی بەو کرد تا ڕادەیەکی زۆر بەش (سهام)ی بێئیعتیباری نەفرۆشراوی کۆمپانییەکانی دیکە بکڕێ.

هەروەخت پارەیەکی زۆر لەبەردەست بوو، هەموو کارەکان بەباشی دەچوونە پێش، بەلام ساڵی ١٩٨٧، کۆمیتەی هاوبەش و «شنیرسۆن» ڕێی خۆیان لەیەکتر جودا کردەوە. یەک لە هۆیەکانی ئەم کارە ئەوە بوو کە لەوکاتەدا وەفاداریی «شنیرسۆن» بۆ حیزبی لیکوود کەوتبووە بەر گومان و هۆی دووەمیش دامەزرانی حیزبی

ئۆرتۆدۆکسی «شاس» بوو کە دەگەڵ ڕێبەری ڕووحانیی جوولەکەکان نالێک بوو. حیزبی «شاس» لەلایەن خاخامێکی جوولەکەی عێراقی بە ناوی «ئوڤادیا یووسف»ەوە کۆنترۆڵ دەکرا. حیزبی لیکوود هەمیشە زۆری بایەخ بە پشتیوانیی یووسف لە خۆی دەدا. چونکە یووسف لە کۆمەڵگە یەهوودییەکانی خۆرهەلاتی نێوەڕاستدا زۆری پەیڕەو هەبوون. هەتا ساڵی ١٩٨٧، بەشێک لەو سوودانەی بەهۆی «درێکسێل»ەوە دەست «سەرمایەی ڕەش» دەکەوتن، بۆ کۆمەگی ماڵی بە فێرگەی «لووباڤیچێر یەشڤۆت» Lubavicher yeshevot خەرج دەکران، بەڵام لەم کاتەوە ئەو شێوەیە ڕاگیرا و پووڵەکان لەجیاتی «لووباڤیچێر یەشڤۆت» دەدرانە «شاس یەشووت».

هەر لەو دەورانەدا، کۆمیتەی هاوبەش لەوە ترسا کە نەوەکا نێوانی ئیسرائیل و ئەمریکا تێکبچێ و لە ئاکامدا ئەمریکا دارایییەکانی «سەرمایەی ڕەش» کە لە «درێکسێل» ڕادەگیران ، زەوت بکا. لەبەر ئەوە، کۆمیتەی هاوبەش بڕیاری دا دارایییەکانی لە کۆنترۆڵی «درێکسێل» و ڕێکخراوەکانی سەربە «لووباڤیچێر» بێنێتە دەر. ئەم بابەتە بووە هۆی زیادبوونی گرفتارییەکانی «میلکن» و سەرەنجام سەری کێشایە لەبەریەکهەڵتەکانی «درێکسێل».

لەمانگی مارسی ١٩٨١ڕا تاکۆتایی ساڵی ١٩٨٧، حکوومەتی ئێران پتر لە ٨٢ میلیارد دۆلاری -کە پارەیەکی باوەڕپێنەکراوە- بۆ ئامراز و کەرەسەی جەنگی دایە ئەمریکا، ئیسرائیل، وڵاتانی ئورووپایی، ئەمریکای باشوور (بەتایبەتی بریزیل و ئارژەنتین) و ئەفریقای باشوور. ئەو کەرەسە جەنگییانەی ئێرانییەکان بەوپەڕی سوپاسەوە لە بەرامبەر پتر لە ٨٢ میلیارد دۆلاردا وەریان گرتن، بریتی بوون لە: تانکی کۆن، فڕۆکە (میراژە کۆنە فەڕانسەییەکان لە ئارژەنتین)، مووشەکی TOW، ئامرازی ئەلیکترۆنی، سیستمی ڕادار، چەکی وردە، تۆپخانە، مووشەکی هەوا بە زەوی HAWK، مووشەکی کرمی

هاوریشمی چینی، مووشەکی سکاد Scud دروستکراوی کۆریای باشوور، گوللە «کاتیووشا» کە ئیسرائیل لە لوبنان دەستی کەوتبوون، تۆپ، سەدان هەزار چەکی دیکە کە یان ڕاستەوخۆ لە کارخانەکانی بەرهەمهێنیان دەکڕران یان پاشماوەی شەڕەکانی پێشتر بوون. دەلاڵەکانی ئەو کڕین و فرۆشتنانە، پارەیەکی بێئەندازیان دەست کەوت.

سوپای ئێران کە دەوروبەری ۸۰۰۰۰۰ سەربازی هەبوو، لەنەکاو بەرەوڕووی سوپای بەهێزی عێراق ببۆوە. سوپای عێراق هەرچەند پێشتر بە کەرەسەی شەڕی پێشکەوتووی سۆڤیەت و فەرانسە تەیار ببوو، بەوحاڵە خەریکی زیادکردنی زەخیرەی کەرەسە جەنگییەکانی خۆی بوو، و بۆیە ناچار بوو خۆی بەهێز بکا. عێراق بۆ بەدەستهێنانی چەکی پێشکەوتوو وەک فڕۆکەی شەڕکەری «مێگ»، فڕۆکەی شەڕکەری سۆڤیەتی و «میراژ»ی ۲۰۰۰ی فەرانسەیی تەنیاساتێک هەدای نەدا. عێراقیش وەک ئێران پوولێکی بێئەژماری خەرجی کڕینی کەرەسەی شەڕ کرد. لەحاڵێکدا عێراقییەکان و ئێرانییەکان بۆ لەنێوبردنی یەکتر، لە هەموو دەرفەتێک بۆ چەککڕین کەلکیان وەردەگرت، ولاتانی خۆرئاوا و سۆڤیەت لەخۆشییان دەستەکانیان ڕێکدەخشاندن.

بەوجۆرەی کەسێکی شارەزا باسی کردبوو، ئەگەر لە کامپیۆتەرێکیان پرسیبا کە: ۱-چبکرێ باشە بۆئەوەی عەرەب دەست لە ئیسرائیل هەلگرن و لەکۆلی بنەوە، ۲-پارەی عەرەبەکان لەدەستیان دەربهێنرێ، ۳-ئێرانییەکان بهێنرێنە ژێر کۆنترۆل و پوولەکانیان لێ زەوت بکرێ، ٤-بەردەوامیی ڕۆیشتنی نەوت مسۆگەر بکرێ، ٥-دنیا هان بدرێ چەکە کۆن و نوێیەکان بەرهەم بێنێ، ٦-سۆڤیەتەکان بە خۆشحالی ڕابگیرێن و۷-کۆمەلێکی زۆر سەوداگەر و قۆنتەراتچیی کەرەسەی جەنگی دەولەمەند بکرێن، وەلامی کامپیۆتەر بۆ هەموو ئەو پرسیارانە، شتێکی باشتر لە شەڕی ئێران و عێراق نەدەبوو.

ساڵی ١٩٨٣ لە ئیسرائیل ڕووداوێکی لەنەکاوی سیاسی ڕووی دا کە ژیانی زۆرکەس لە خەڵکی دنیا دەگۆڕێ. ئەم ئاڵوگۆڕە وەختێک ڕووی دا کە «مەناخیم بگین»، سەرۆکوەزیری ئیسرائیل خۆی لە تۆقەکردن دەگەڵ «هێلمووت کۆل» Helmut Kohl، ڕاوێژکاری ئەڵمان پاراست. سێ ڕۆژ پێش هاتنی «کۆل» بۆ ئیسرائیل «بگین» دەستی لە کار کێشایەوە. ئەو نەیدەویست لە میللەتێک نیزیک بێتەوە کە دەستی لە کوشتاری ئەوهەموو جوولەکەیە لەشەڕدا هەبووە.

بەڵام هۆی دەستلەکارکێشانەوەی «بگین» تەنیا سەردانی کۆل لە ئیسرائیل نەبوو، «بگین» پێیوابوو بۆخۆی بۆتە مایەی دڵساردی و ناهومێدیی خەڵکی ئیسرائیل لە شەڕی لوبنان. ئەو باوەڕی وا بوو کە «ئاریەل شارۆن» Ariel Sharon وەزیری پێشووی بەرگریی ئیسرائیل، ئەوی لەو شەڕەدا ڕووحچڵکن و ناکام کردوە. ڕەفتاری شارۆن لە هێرشی پێبەپێ بۆ سەر لوبنان، کابینەی ئیسرائیلی خستۆتە قووڵایی تێوەگلان لەم شەڕەوە و بۆتە مایەی دروستبوونی قەیرانێکی نیشتمانی لە ئیسرائیل و زیانێکی گەورەی بە پێوەندییە گشتییەکانی ئیسرائیل گەیاندوە.

دوایە لە ڕۆژانی ١٦ و ١٧ی سێپتامبری ساڵی ١٩٨٢دا، کوشتاری بەکۆمەڵی ئۆردووگاکانی «سەبرا» و «شەتیلا» لە ئۆردووگاکانی پەنابەرە فەلەستینییەکان لە بەیرووت ڕووی دابوو. بە پێچەوانەی ئەو داواکارییە قانوونییە، قاوە کە شارۆن لە نیۆیۆرک بەدژی ئەوانەی تۆمەتی کوشتاری بەکۆمەڵی فەلەستینییەکانیان لەو دەدا، لە دادگا هێنایە گۆڕێ، ئێستا ڕوون بۆتەوە کە ئەو لەپێشەوە دەیزانی چ-پێشهاتێک خەریکە ڕوو دەدا. ئەو باشی دەزانی ئەگەر ڕێگا بە میلیشیا مەسیحییەکانی لوبنان -فالانژەکان- بدرێ بچنە نێو ئۆردووگاکانی فەلەستینییەکان چڕووداوێک دێتە پێش. «پێر جەمایل» بابی «بەشیر جەمایل» ڕێبەری هێزە مەسیحییەکان و سەرۆککۆماری هەڵبژێراوی

لوبنان کە چەند ڕۆژ پێشتر لە ڕووداوێکی بۆمبدانانەوەدا کوژرابوو، نامەیەکی بۆ دۆستە نزیکەکەی «شارۆن» ناردبوو. «جەمایل» کە بزووتنەوەی فالانژیستیی لوبنانی لەسەر بناخەی ژەنراڵیزمی «فرانسیس فرانکۆ» دامەزراندبوو، لە نامەی خۆی بۆ «شارۆن»دا نووسیبووی کە ئەو تۆڵەی خوێنی کوڕەکەی دەستێنێ و زۆر لە فەلەستینییەکان لەو مەسەلەیەدا لەنێو دەچن. نامەی «پێر جەمایل» شەوێک بەهۆی پەیکی سیاسیی بزووتنەوەی فالانژیستی گەیشتە فرۆکەخانەی «بن گۆریۆن» و لەوێڕا ناردرایە دەفتەرەکەیان لە ئۆرشەلیم. ئەم نامەیە بە پەیکێکی تایبەتیدا تەحویلی ئیدارەی پێوەندییەکانی دەرەوەی ڕێکخراوی هەواڵگریی سوپای ئیسرائیل درا. ئەفسەر نیگابانی ئەو یەکەیە، نامەکەی کردەوە و چەند نوسخەی لەبەر هەڵگرتەوە. پاشان تەلەفونی بۆ دەفتەری ژەنراڵ «ساگی» کرد و خەبەری مەسەلەکەی دا بە «هیبرۆنی» کە ئەو شەوە ئەفسەری نیگابان بوو. ئەوجار ئەسڵی نامەکەی بە لوولەیەکی تایبەتیدا کە بە هۆی هەواوە کار دەکا، بۆ «هیبرۆنی» نارد. «هیبرۆنی» خوێندیەوە و تەلەفونی بۆ ماڵی «ساگی» کرد و ئاگاداری کرد. «هیبرۆنی»یش چەند کۆپیی لە نامەکە هەڵگرت و ئەسڵی نامەکەی بۆ ژەنراڵ «شارۆن» بەڕێکرد کە بۆیان لەسەر مێزەکەی دانا.

شەوی دوای ئەوەی نامەکە گەیشتە ئیسرائیل، ئەمن دەگەڵ دۆستێک کە ئەویش وەک من لە نێوەرۆکی نامەکە ئاگادار بوو، لە شەقامێکی تەل ئەبیب پیاسەمان دەکرد، لەوکاتەدا ئەمن بۆ بەڕێکردنی بڕێکی زۆرتر کەرەسەی شەڕ بۆ ئێران دەچوومە لەندەن و ئیرلەند.

دۆستەکەم گوتی: «ئەم پیاوە باسی کوشتاری بەکۆمەڵ دەکا. بەڵام ئەوکارە سەر ناگرێ. پێت وانیە ئێمە دەبێ پێش بە ڕووداوێکی ئەوتۆ بگرین؟»

بە بیستنی قسەکانی ئەو دۆستەم ڕوخساری «شارۆن»م بە مێشکدا هات. ئەمن دەمزانی ئەو چبوونەوەرێکی دڕندەخوویە. گوتم: «نا، پێم وانیە.»

سێ ڕۆژ دواتر سەربازانی ئیسرائیلی هێزە فالانژیستەکانیان ئازاد کرد بچنە «سەبرا» و «شەتیلا». ئەوکاتەی خەبەری ڕاتڵەکێنی ئەو ڕووداوە لە سالی تازەی یەهوودییەکاندا، لە سەرانسەری دنیا بلاو بۆوە، ئەمن لە لەندەن بووم. ڕۆژی دواتر وێنەکانی ئەو ڕووداوەم لەسەر شاشەی تەلەڤیزیۆنی ژووری هۆتێلەکەم لە «بلفاست» چاو پێکەوت. دیتنی ئەو وێنانە منی خستە حاڵەتی ڕشانەوە. بەبێشک دەکرا پێشی ئەو کوشتارە بەکۆمەڵە بگیرێ.

کۆمیسیۆنیک کە بە سەرۆکایەتیی قازیی دادگای بەرز، «ئیسحاق کاهان» Eitzhak Kahan بۆ پێڕاگەیشتنی ئەو ڕووداوە پێکهات، نەزەری دا کە هەرچەند حکوومەتی ئیسرائیل دەستێکی لەوکارەدا نەبووە، بەلام پێشتر ئاگادار بووە کە لەوانەیە ڕووداوێکی وا سامناک ڕوو بدا. بەوحاڵە حکوومەتی ئیسرائیل هیچ کارێکی بۆ پێشپێگرتنی نەکردوە. لە هەمووی خەراپتر، سوپای ئیسرائیل دەوروبەری ئەو ئۆردووگایانەی وەک ناوچەیەکی عەمەلیاتی سەربازی داخستوە و پێشی بە هەلاتنی فەلەستینییەکان گرتوە. ئەگەرچی ڕاپۆرتی تەواوی کۆمیسیۆنەکە بە نهێنی ماوەتەوە، زۆر لە ئێمە کە لە ئیدارەی پێوەندییەکانی دەرەوەی ڕێکخراوی هەواڵگریی سوپا کارمان دەکرد، ئەوەمان دیت و ئیشکەرانی ئەو ڕێکخراوە لەو باوەڕەدان کە «شارۆن» نامەی پڕهەڕەشەی «پێر جەمایل»ی دیتوە.

لە ئاکامی ڕاپۆرتی کۆمیسیۆنەکەدا، سێ مانگ دوای کوشتاری بەکۆمەڵی ئۆردووگاکانی «سەبرا» و «شەتیلا» سەرۆکی من سەرلشکر «ساگی»یان لەسەر کار لابرد، شارۆن ناچار کرا لە وەزارەتی بەرگری بکشێتەوە و «مۆشێ ئارێنز» Moshe Arens

سەرۆکی نوێنەرایەتیی سیاسیی ئیسرائیل لە ئەمریکا، لە جێی وی کرا بە وەزیری بەرگری. خاڵی زۆر سەرنجڕاکێش ئەوەیە کە پاش لەسەرکارلابردنی ژەنراڵ «ساگی»، سەرۆکی ستادی وی «مۆشێ هیبرۆنی» ماوەی سێ مانگ، لەجیاتی وی سەرۆکایەتیی ئیدارەی پێوەندییەکانی دەرەوەی ڕێکخراوی هەواڵگریی سوپای بەئەستۆوە گرت. ماوەی ئەو سێ مانگە بەس بوو بۆ ئەوەی ئەو بتوانێ هەموو ئەو بەڵگە و نیشانانەی لەوانە بوو ئەو و سەرۆکەکەی بکەنە شەریکی ڕووداوی خەفەتباری «سەبرا» و «شەتیلا»، لە بەین بەرێ.

ساڵی ١٩٨٣، کە سەرۆکوەزیری تازەی حیزبی لیکوود «ئیسحاق شامیر» دەسەڵاتی بەدەستەوە گرت، دەسبەجێ ڕێکخراوی حکوومەتیی ئیسرائیل و بەتایبەتی دەزگای هەواڵگریی ئەم وڵاتەی کە بۆخۆی چەندین ساڵ ئەندامی بوو، پاکسازی کرد، لەو ئاڵوگۆڕە ڕێکخراوەییەدا چەند کەس لە ئیشکەرانی کۆمیتەی هاوبەش یەک لەوان «دێڤید کیمچە» گەورەئەندامی ئەم ڕێکخراوە ناچار بوون دەست لەکار بکێشنەوە. ئەم ئاڵوگۆڕە بووە هۆی ئەوە کە «ڕافی ئەیتان» ئیدارەی کۆمیتەی هاوبەش بەدەستەوە بگرێ.

«ئەیتان» و «شامیر» چەندین ساڵ لەیەک نزیک بوون. هەردووکیان لە ئیشکەرانی کۆنەکار، بەئەزموون و سەرسەختی «مۆساد» بوون کە سەرەتای دەیەی ١٩٧٠ کاتێک دیتیان لە حیزبی کرێکاردا ناتوانن کارێکی گرنگ بەدەست بێنن، هەردووکیان لێی کشانەوە. وەختێک سەرەنجام حیزبی لیکوود هاتە سەر کار، «بگین» بڕیاری دا «ئەیتان» کە خاوەنی ئەزموونێکی بەرچاو بوو، وەک ڕاوێژکاری دژی تێرۆریزمی خۆی هەڵبژێرێ تا بەهۆی «ئەیتان»ەوە ئیعتیبار و بایەخێکی تازە بەم کارە بێتوانایە بدا.

«ئەیتان» پیاوێکی بەشەرەف بوو کە وەک هاوتەمەنەکانی، دنیای بە ڕەش و سپی دەدی، نەک خۆڵەمێشی. ئەو خۆی بە توندی بۆ

ڕاگرتنی ئیسرائیل و خەباتی بێئەمان دژی تێرۆریستان و بێدەنگ-کردنیان تەرخان کردبوو و لەو ڕێگایەدا ئەرکی خۆی بێبەزەییانە بەجێ دەگەیاند. لەحاڵێکدا ئەو بەچاوی سووک دەیڕوانیە PLO و بالاترین ئامانجی لەنێوبردنیان بوو، هەر لەوحاڵەدا وەک «شامیر» موخالیفی ڕێککەوتننامەی «کەمپ دیڤید» بوو، چونکە پێی وابوو گیروگرفتی فەلەستینییەکان لەو ڕێککەوتننامەیەدا بێچارەسەر ماوەتەوە. «ئەیتان» کەسێکی ئەهلی کار بوو و باوەڕی وابوو کە هەتا چارەسەرێک بۆ گیروگرفتی فەلەستینییەکان نەدۆزرێتەوە، ئاشتیی ڕاستەقینە لە خۆرهەلاتی نێوەڕاستدا نایەتە دی.

کاتێک «شامیر» پاڵی بە کورسیی سەرۆکوەزیرییەوە دا و «ئەیتان» سەرۆکایەتیی کۆمیتەی هاوبەشی وەئەستۆ گرت، نەکهەر لە هەوڵەکانی ئێمە بۆ چەکدارکردنی ئێران دژی عێراقدا ئاڵوگۆڕێک دروست نەبوو، بەڵکوو ئێمە لە ئەنجامدانی ئەو ئامانجەدا چالاکتریش بووین. «ئەیتان» دەگەڵ ئەوەی ڕێبەرایەتیی کۆمیتەی هاوبەشی دەکرد، بڕیاری بێگەڕانەوەی خۆی خستە سەر لەنێوبردنی تێرۆریزم.

بەرنامەیەکی جێگای ئۆگری و سەرنجی «ئەیتان» بۆ خەبات دژی تێرۆریزم کە لەڕاستیدا وەک کاڵەیەکی دزێو و ناپەسند دەکەوتە بەرچاو، دروستکردنی بەرنامەیەکی کامپیۆتەری یان «برا گەورە»ی بەرنامەیەکی کامپیۆتەری بەناوی «پرۆمیس» Promis بوو. ئەمن بەهۆی «ئەیتان»ەوە تووشی ئەو بەرنامەیە بووم. ئەم بەرنامەیە لەجێدا بەشێک لە ئەرکەکانی کۆمیتەی هاوبەش نەبوو، بەلام زۆر لەو کەسانەی لە فرۆشتنی چەکوچۆڵە بە ئێراندا چالاک بوون، تووشی بەرنامەی «پرۆمیس»یش بوون. گرنگترین کەسی ئەوانە، «ڕابێرت ماکسوێل» Robert Maxwel ڕۆژنامەنووسی بریتانیایی بوو کە لەو ڕێگایەوە سامانێکی زۆری وەسەر یەک نا. بە کەلکوەرگرتن لە

بەشێکی کۆمپانییەکانی «ماکسوێل»، ئیسرائیلییەکان توانیان نهێنییەکانی چەندین ڕایەڵکەی هەواڵگری لە سەرانسەری دنیادا وەک بریتانیا، کانادا، ئوستڕالیا و وڵاتانی دیکە بەدەست بێنن و لە ئاکامدا هەزاران کەسی بێتاوان بەناوی دژایەتیی تیرۆریزم بگرن، ئەشکەنجە بکەن و بیانکوژن.

داستانی ترسێنەری «پڕۆمیس» لە دەیەی ۱۹٦۰ەوە لە وڵاتی ئەمریکا دەست پێدەکا. لەوکاتەدا «ویلیام هامیلتۆن» William Hamilton، کارناسی پۆست و تەلگرافی ئەمریکایی کە لە شەڕی ڤیتنامدا توانیبووی، هێندێ پۆست بۆ هەواڵوەرگرتن لە هێزە کۆمۆنیستەکان دامەزرێنێ، کرا بە مەئمووری لێکۆڵینەوە و پەرەپێدانی یەکێک لە یەکەکانی ڕێکخراوی ئەمنیەتی نیشتمانیی ئەمریکا. «هامیلتۆن» کە بە ئاسانی و بە ڕەوانی بە زمانی ڤیتنامی قسەی دەکرد، فەرهەنگێکی زمانی ڤیتنامی- ئینگلیزیی کامپیوتەریی بۆ ڕێکخراوی ئەمنیەتی نیشتمانیی ئەمریکا ئامادە کرد. کاتێک «هامیلتۆن» لە ڕێکخراوی نیشتمانیی ئەمریکادا خەریکی کار بوو، هەروەها دەستی بە بەرنامەیەکی بێئەندازە پێشکەوتووی کامپیوتەری کرد. ئەم بەرنامەیە دەیتوانی دەگەڵ ئەو زانیارییانەی لە کامپیوتەرەکانی دیکەدا دانراون، پێوەندی بگرێ و قسە بکا. لە سەرەتای ساڵەکانی دەیەی ۱۹۷۰دا لێکۆڵینەوە کامپیوتەرییەکانی «هامیلتۆن» لەو بارەیەوە بە تەواوی پێش کەوتن و لە ئاکامی ئەو سەرکەوتنەدا کە لەو بارەیەوە بەدەستی هێنا، بۆی دەرکەوت کە لە ڕاستیدا دەستی بە دینامیتێکی نەدیتراو ڕاگەیشتوە.

بەرنامەیەک کە «هامیلتۆن» دایهێنابوو، دەیتوانی شوێنی کردەوە و جموجۆڵی کەسانێکی زۆر لە خەڵکی سەرانسەری دنیا هەڵبگرێ. لەوە بەدوا بۆ کەسانێک کە هەنگاویان بەپێچەوانەی ویستی دەوڵەتەکانیان هەڵدێنایەوە یان ئەو هاونیشتمانانەی دەخرانە ژێر چاوەدێری، زۆر

دژوار بوو کە خۆیان لە چاوی تیژبینی بەرنامەی کامپیوتەریی «برا گەورە» بشارنەوە و ئازادانە درێژە بە کار و جموجۆڵی خۆیان بدەن.

کاتێک «هامیلتۆن» بۆی دەرکەوت ئەو بەرنامەیەی خوڵقاندوویەتی، کاریگەرییەکی وا سەرسوڕهێنی هەیە لە ڕێکخراوی ئەمنیەتی نیشتمانیی ئەمریکا کشایەوە و ڕێکخراوێکی ناقازانجخواز (غیر انتفاعی)ی بەناوی «ئینسلاو» Inslaw کە بۆ پەرەپێدانی بەرنامە کامپیوتەرییەکان بە ئامانجی مافپەروەری و قانوونی دامەزرابوو، بەدەستەوە گرت. بەرنامەی «ئینسلاو» دەیتوانی لە کاری دادگا جۆراوجۆرەکان بکۆڵێتەوە و بە لەبەریەکڕاگرتنی کارەکانیان دەرکەوتە (مخرج)ێکی هاوبەش بدۆزێتەوە. بۆ نموونە، ئەگەر تاوانبارێک کە لەژێر بەدواداگەڕانی قانوونیدا بوو، گوازتبایەوە ئەیالەت (ولایت)ێکی دیکە و پێش گیرانی ناسنامەیەکی تازەی بۆخۆی دانابایە، بەرنامەی کامپیوتەری لایەنە جۆراوجۆرەکانی ژیان و نیشانەکانی کردەوە گوناحکارانەکانیی دەخستە بەر لێکۆڵینەوە و ئەوانی لەبەر یەک ڕادەگرت و دەبووە هۆی ناسرانەوە و گیرانی.

«هامیلتۆن» زانست و کارزانییەکەی بۆ پەرەپێدانی بەرنامەی «ئینسلاو» تەرخان کرد و کاتێک سەرۆکەکانی لە ڕێکخراوی ئەمنیەتی نیشتمانیی ئەمریکادا ئەو بابەتەیان بۆ دەرکەوت، زۆر ناڕەحەت بوون. ئەوان پێیان وا بوو کارمەندی ڕێکخراوەکەیان هەقی نیە زانست و ئەزموونێک کە لە ڕێکخراوەکەی واندا فێری بووە، بەرێتە جێی دیکە.

ساڵی ١٩٨١، بەرنامەی «هامیلتۆن» گەیشتبووە لووتکەی سەرکەوتن. لەڕاستیدا ئەو توانیبووی دێوەزمەیەکی نەدیتراو بخوڵقێنێ. «هامیلتۆن»، «ئینسلاو»ی لە ڕێکخراوێکی ناقازانجخوازەوە کردە ڕێکخراوێکی قازانجخواز و بەرنامە داهێنراوەکەی خۆی تۆمار کرد.

به باوەڕ بەوەی بایەخی «ئینسلاو» بۆ ڕێکخراوە قەزاییەکان کە ئەرکی جێبەجێکردنی قانوونیان لە ئەستۆ بوو، لە تاریف نەدەهات، «هامیلتۆن» ساڵی ١٩٨١، «پڕۆمیس»ی بۆ کەلکوەرگرتنی وەزارەتی دادی ئەمریکا بەکرێ دایە ئەم ڕێکخراوە. هەرچەندی بەرنامەکەی لە ڕێکخراوی وەزارەتی داد پتری کەلک لێوەردەگیرا، سوودی «ئینسلاو»یش زیاتر دەبوو. پاشان، وەزارەتی دادی ئەمریکا، بەرنامەی «هامیلتۆن»ی بۆ لێکۆڵینەوە نارده ڕێکخراوی ئەمنیەتی نیشتمانیی ئەمریکا، بەڵام، بە گفتوگۆیەک کە لەوکاتەدا «هامیلتۆن» دەگەڵ «ئێدوین میس» Edwin Messe داواکاری گشتیی ئەوکاتی ئەمریکای کرد و بە تەرتیباتێک کە لەوبارەیەوە دای، بەرنامەکەی لە ڕێکخراوی ئەمنیەتی نیشتمانی وەرگرتەوە. بەمجۆرە، وەزارەتی داد وازی لە بەکرێگرتنی بەرنامەی «ئینسلاو» هێنا و بەزوویی دەرکەوت کە ئەوان «پڕۆمیس»ی خۆیان وەکار خستوە. لە ڕێکخراوی ئەمنیەتی نیشتمانییشدا[١٣]، هەر ئەو کارە کرا.

---

[١٣]-هامیلتۆن و هاوسەرەکەی «نانسی» وەزارەتی دادی ئەمریکایان بەناوی ئەوە کە بەرنامەی پێشکەوتووی «پڕۆمیس»ی لە «ئینسلاو» دزیوە و داویەتی بە ڕێکخراوی ئەمنیەتی نیشتمانیی ئەمریکا، خستە ژێر لێپرسینەوەی قانوونی. وەزارەتی داد ئیددیعای کرد کە بەرنامەیەکی لە «ئینسلاو» وەرگرتوە، بەڵام بێ-ئەوەی کەلکی لێوەربگرێ وێی داوەتەوە، ڕێکخراوی ئەمنیەتی نیشتمانیی ئەمریکاش گوتی بۆخۆی توانیویەتی بەرنامەکەی پەرە پێبدا و داویەتی بە ڕێکخراوە هەواڵگرییەکانی دیکەش، بەڵام نەیداوە بە وەزارەتی داد. چونکە تەنەخیی وەزارەتی دادی ئەمریکا لە پێراگەیشتنی ئەو دۆسیەیەدا «ئینسلاو»ی تووشی نابووتی کردوە. هامیلتۆن و هاوسەرەکەی، مەسەلەکەیان بردە دادگای نابووتی، تا لەو ڕێگایەوە بتوانن ئەو زیانانەی لێیان کەوتوە قەرەبوو بکەنەوە. دادگای سەرەتایی، ئیددیعای ئەوانی بەدژی وەزارەتی داد قبوول کرد، بەڵام دادگای هەورازتر ڕەئیی دا کە دادگای نابووتی سەلاحیەتی ڕاگەیشتن بەوجۆرە کێشانەی نیە و داوای لە «هامیلتۆن» و هاوسەرەکەی کرد دووبارە بابەتەکە بەرنە دادگای

حکوومەتی ئەمریکا نەخشەی تایبەتیی خۆی بۆ «پڕۆمیس» هەبوو. هێندێک لە کارمەندانی ڕەسمیی ئەمریکایی، کەوتنە بیری ئەوە کە لەوانەیە ئیسرائیلییەکان بتوانن ئەو بەرنامەیە بە ڕێکخراوە ئەمنیەتییەکانی سەرانسەری دنیا بفرۆشن و بۆیە ساڵی ١٩٨٢ «ئارل بریان» لەو بابەتەوە دەگەڵ «ڕافی ئەیتان» کەوتە گفتوگۆ. «ئەیتان» دوای لێوردبوونەوەی بەرنامەکە گەیشتە باوەڕێکی زۆر سەرنج-ڕاکێش.

ئەو منی بانگ کردە دەفتەرەکەی خۆی و گوتی: «ئێمە نەک هەر دەتوانین بە کەلکوەرگرتن لەم بەرنامەیە شوێنپێی هەموو تیرۆریستەکان هەڵگرین و لەنێویان بەرین، بەڵکوو دەتوانین لە زانیارییەکانی دوژمنانیشمان ئاگادار بین.»

ئەمن تاوێک تێیەوە ڕامام و پاشان لەنەکاو لە مەبەستەکەی حاڵی بووم. -حەرامزادە، ڕاستی دەکرد. بۆ گەیشتن بەو ئامانجە هەرئەوەندە بەس بوو کە ئەوکاتەی بەرنامەی کامپیوتەری بە دوژمنەکانمان دەفرۆشین، دەزگایەکی تەکنیکی بەناوی «مۆدێم» بخەینە نێو سیستمی کامپیوتەرەکەوە. لەدوای ئەوە دەمانتوانی دەستمان بگاتە ئەو زانیارییانە کە دەخرانە ئەو کامپیوتەرەوە.

شێوەی کارەکە بەمجۆرە بوو: ڕێکخراوی جاسووسیی وڵاتێک «پڕۆمیس»ێک دەکڕێ و لە ڕێکخراوی ناوەندیی کامپیوتەری خۆیدا دایدەمەزرێنێ. پاشان ئامێری «مۆدێم»[١٤] کە لە کامپیوتەرەکەدا وەکار

---

ناوچەیی و بەدوایدا بچن. لە لایەن کۆنگرەی ئەمریکاشەوە لێپرسینەوە لەو بابەتە بە شێنەیی دەچێتە پێش.

[١٤]-«مۆدێم» Modem ئامێرێکی ئەلیکترۆنییە کە یان لە سیستمێکی کۆنترۆڵدا دادەنرێ، یان بەجیا، بەڵام لە پێوەندی دەگەڵ سیستمەکەدا دادەنرێ. ئەم ئامێرە دواتر دەتوانێ دەرەتانی ڕاگوازتنی زانیاری بەهۆی تەلەفون یان هێڵە پێوەندییەکانی دیکەوە لە کامپیوتەرێکەوە بۆ کامپیوتەرێکی دیکە پێکبێنێ. (مترجم فارسی).

خراوه، ڕایەڵکەی جاسووسیی ئەو وڵاتە بە کامپیوتەرەکانی خزمەتی کۆمپانییەکانی تەلەفون، ئاو، کارەبا، گاز و خزمەتە گشتییەکانی دیکە و هەروەها کۆمپانییە ئیعتیبارییەکانەوە گرێ دەدا. پاش ئەو کارە «پرۆمیس» بۆ وەدەستهێنانی زانیاریی تایبەتی دەکەوێتە گەڕان. بۆ نموونە،ئەگەر کەسێک لەنەکاو پتر لە ئەندازەی ئاسایی، کارەبا یان ئاو خەرج بکا، یان پتر لە ڕادەی ئاسایی کەلک لە تەلەفونەکەی وەرگرێ، گومان دەکرێ کە میوان یان کەسانێکی تازە هاتوونەتە شوێنی دانیشتنی. لەوحاڵەدا «پرۆمیس» دەست دەکا بە گەڕان بەدوای ڕابردووی دۆستان و هەڤاڵانیدا و بەپێچەوانەش، ئەگەر دەرکەوێ کەسێک کەمتر لە ڕادەی ئاسایی ئاو و کارەبا بەکار دێنێ، ئەم ئاڵوگۆڕە بەپێی ئەو پێشینەیەی لە «پرۆمیس»دا ڕاگیراوە، نیشانەی ئەوەیە کە ئەو کەسە لە شوێنی دانیشتنی کەسێک دەژی کە بەکاربردنی ئاو و کارەبای زیاد بووە و لەژێر جاسووسی و چاوەدێریدایە. ئێستا ئەگەر ئەوکەسە لە ڕابردووشدا پێشینەی کاروباری دژی ئەمنیەتیی بووبێ، ئەمە بەس دەبێ بۆئەوەی کار و کردەوەی بخرێتە ژێر چاوەدێری. «پرۆمیس» دەتوانێ بەدوای ڕابردووی کەسەکەدا بگەڕێ و وردەکاریی کاروباری ڕابردووی ساغ بکاتەوە. ئەم بەرنامەیە بە ڕادەیەک پێشکەوتوویە کە تەنانەت ئەگەر کەسێک بە ناوێکی ساختەش، دەستی دابێتە کردەوەی دژی ئەمنیەتی، «پرۆمیس» کەسیەتە ئەسڵییەکەی دەدۆزێتەوە.

ئەو زانیارییەی بەوجۆرە لە ڕێگای «پرۆمیس»ەوە دەست دەکەوێ، بۆ ئیسرائیلیش جێی سەرنج دەبێ. لێرەدایە کە نەخشی «دەرگای نهێنی» Trapdoor دەکەوێتە کار. کارمەندێکی ئیسرائیلی بە کەلکوەرگرتن لە «پرۆمیس» دەتوانێ پێوەندی بە ناوەندی کامپیوتەری ڕێکخراوێکی هەواڵگریی دەرەوەوە بگرێ و بە وەکارخستنی «مۆدێم» وشەکانی بابەتێک تایپ بکا و زانیاریی

پەیوەندیدار بەو بابەتەوە بەدەست بێنێ. پاشان دەتوانێ، زانیاریی پێویست لەبارەی کەسێکەوە کە مەبەستیەتی، بپرسێ. بەدوای ئەوەدا دەستبەجێ زانیاریی پێویست لەسەر شاشەی کامپیۆتەرەکەی دەردەکەوێ.

ئەمن لەبارەی «دەرگای نهێنی» قسەم دەگەڵ کارناسانی کامپیۆتەر کرد و ئەوان پێیان‌گوتم کە مومکین نیە کەسێک بتوانێ «دەرگای نهێنی»یەک کە لە کامپیۆتەرەکەیدا دانراوە بدۆزێتەوە. کەوایە هیچ گەلێک ناتوانێ بوونی «پرۆمیس» لە کامپیۆتەرەکەیدا بدۆزێتەوە. بەتایبەتی ئەگەر بەرنامەکە بەدەستی کارناسانی تایبەتەوە لە کامپیۆتەرەکەدا خرابێتە کار.

«ڕافی ئەیتان» حەزی نەدەکرد، خەڵکی دیکە پێ‌بزانن کە «دەرگای نهێنی» لە ئیسرائیل داهێنراوە و بەرهەم هاتوە. لەوحاڵەدا لە دنیادا دەبووە قاو کە ئیسرائیلییەکان ئامرازی جاسووسییان لە نەرمئامێری کامپیۆتەرەکاندا وەکار خستوە و داویانەتە خەڵکی دیکە. لەلایەکی دیکەوە، ئەو نەیدەویست «دەرگای نهێنی» بەهۆی ڕێکخراوی ئەمنیەتی نیشتمانیی ئەمریکاوە بەرهەم بهێنرێ، چونکە حیرسی نیشتمانی (غرور ملی)ی ناوبراو شتی وای قبووڵ نەدەکرد. چونکە ئەو پێی وابوو «دەرگای نهێنی» داهێنانی ئیسرائیل بووە و ئەم بەرنامەیە بە ناوی ئەویشەوە دەمێنێتەوە، بەوحاڵە، هەوڵی دەدا بەرنامەکە بەنهێنی بمێنێتەوە. «ئەیتان» پێی وابوو باشترین ڕێگا ئەوەیە کە شوێنەوارە پەرجوو (مۆجیزە)کانی ئەم بەرنامەیە لە دەرەوەی وڵات دەرکەون.

ئەمن باشم دەزانی، ئەم کارە چۆن دەبێ جێبەجێ بکرێ. «یەهوودا بن حەنان» Yehuda Ben Hanan لە شاری «کاتسوۆرت» Chatsworthی کالیفۆرنیا کۆمپانییەکی پچووکی کامپیۆتەری هەبوو کە پێی دەگوت: «کۆمپانیی ئەندازیارانی ڕاوێژکار و نەرمئامێر». ئەمن

دەگەڵ ئەو پیاوە گەورە ببووم، بەڵام پێمخۆش نەبوو تێبگا کە ئەمن دەمەوێ بیهێنمە نێو ئەم کارەوە. بەڵکوو دەمەویست بزانم ئەو تا چ-رادەیەک لەو بابەتەدا نهێنیپارێزە.

بەدوای ئەم بیرۆکەیەدا، چوومە کالیفۆرنیا و وام نیشان دا کە مەبەستم تەنیا سەردانی ئەو بووە. لەکاتی دیدارەکەدا پێکەوە دادەنیشتین و باسی سەردەمی منداڵیمان دەکرد. ئەو هاوسەرەکەی کە ژنێکی جوولەکەی برێزیلی بوو، بە من ناساند. پاش گفتوگۆ دەگەڵ «یەهوودا» گەیشتمە ئەو بیرۆکەیە کە ئەو بۆ ئامانجەکەی ئێمە پیاوێکی زۆر گونجاوە. ئەو مرۆڤێکی سادە بوو و نەیدەتوانی لە ئامانجەکەمان وەشک کەوێ. پێنج ڕۆژ دوای ئەوەی بەجێم هێشت، پیاوێکی ئیسرائیلی پێوەندیی پێوە گرت و ئەوی بۆ بەڕێوەبردنی بەرنامەکە لە دەرەوەی ئیسرائیل دامەزراند. وردەکارییەکانی ئەوکارە لە «یەهوودا» شاردرانەوە و تەنیا داوای لێکرا بە وەرگرتنی ٥٠٠٠ دۆلار ئەو گەلاڵەیە جێبەجێ بکا.

وەختێک «دەرگای نهێنی» لە کامپیۆتەردا دانرا، «ڕافی ئەیتان» وڵاتی ئۆردۆنی بۆ تاقیکردنەوەی ئاکامی بەرنامەکە هەڵبژارد و «ئارل بریان» بۆ بەجێگەیاندنی ئەم ئامانجە، لە ڕێگای کۆمپانیی خۆی «هادرۆن» Hdronەوە، هێندێ کامپیۆتەری بە مەلیک حوسێن فرۆشتن. لەمێژساڵ بوو فەلەستینییەکان مایەی ئازار و نیگەرانیی مەلیک حوسێن بوون و لەبەر ئەوە «ئارل بریان» پێیگوت کە بە کەلکوەرگرتن لەو بەرنامەیە،حکوومەتی ئۆردۆن دەتوانێ فەلەستینییە خەباتگێڕەکان بناسێت و لەنێویان بەرێ. بۆ بەجێگەیاندنی ئەم مەبەستە، گرووپێک لە کارناسانی کۆمپانیی «هادرۆن» چوونە عەممان و نەرمئامێری «پرۆمیس»یان دایە ڕێکخراوی هەواڵگریی سوپای ئۆردۆن. کارناسانی کۆمپانیی «هادرۆن» لە درێژەی ئەوکارەدا «پرۆمیس»یان بە چەند کامپیۆتەری جۆراوجۆرەوە گرێ

دا کە لە ساڵەکانی دەیەی ١٩٧٠دا ئۆردۆن لە IBMای کڕیبوون. ئەم کامپیۆتەرانە هەروەها بە کۆمپانییەکانی ئاو، تەلەفون و هەموو کامپیۆتەرەکانی کاروباری قازانجگشتیی ئۆردۆنەوە بەسترانەوە.

گرووپی «هادرۆن» هەنگاوێکیش لە بەرنامەی «پرۆمیس» هەورازتر چوون. بەوجۆرە کە ئەوان بەرنامەی «پرۆمیس»یان خستە کامپیۆتەرێکی چووکەڵەوە کە بە سیمی تەلەفونێک لە ئاپارتمانێکی (شقە) عەممانەوە گرێ درابوو. ئاپارتمانەکە شوێنی ژیانی بازرگانێک بوو کە پێوەندیی نیزیکی دەگەڵ «مۆساد» هەبوو. بەو کارە، کابرای ناوبراو دەیتوانی بە گرتنی ژمارە تەلەفونەکانی خزمەتە گشتییەکان (ئاو، کارەبا، گاز و هی دیکە)، و هەروەها ڕێکخراوی سوپای ئۆردۆن و بە وەکارخستنی «پرۆمیس»، هەر زانیارییەک بیویستایە، بە دەستی بێنێ. ئەم کەسە هەر بەو ڕێگایەدا دەیتوانی نهێنییەکانی سوپای ئۆردۆن بگرێتە دەست. بازرگانی ناوبراو بە هۆ و بەبیانووی سروشتی کارەکەی کە هەنارده و هاوردە (صادرات و واردات) بوو، بەردەوام سەفەری ڤییەنی دەکرد. ئەو زۆرتر لە (هێڵی فرۆکەوانیی مەلیکە عەلیای ئۆردۆن) کە لە عەممانەوە دەچووە نیۆیۆرک، کەلکی وەردەگرت و لەسەر ڕێگای خۆی بۆ نیۆیۆرک لە ڤییەن ڕادەوەستا و دیسکەکانی کامپیۆتەری کە پڕ لە زانیاریی جاسووسی بوون، دەدان بە کارمەندی «مۆساد».

بەم جۆرە ئیسرائیلییەکان و ئەمریکایییەکان بۆیان دەرکەوت کە سیستمەکەیان کردەیی و بەکەلکە. ئەم دوو وڵاتە، هەروەها تێگەیشتن کە وڵاتی ئۆردۆنیش بۆ هەواڵوەرگرتن لە بزووتنەوەی فەلەستینییەکان سیستمی تایبەت بە خۆی هەیە. بەڵام سیستمی جاسووسیی ئۆردۆن بەدژی فەلەستینییەکان بۆ ئەمریکایی و ئیسرائیلییەکان پێکەنینبزوێن بوو. چونکە، کارمەندانی هەواڵگریی ئیسرائیل بە کەلکوەرگرتن لە بەرنامەکانی خۆیان، هەموو ئەو

زانیارییانەیان وەردەگرت کە ئۆردۆنییەکان لەسەر فەلەستینییەکانیان بەدەست دێنان. ئێمەش هەموو ئەو زانیارییانەمان لەدەستدا بوون.

ئەمریکاییەکان دوایە بڕیاریان دا، ئەم بەرنامە بەنرخە بە حکوومەت و ڕایەڵکە هەواڵگرییەکانی سەرانسەری دنیا بفرۆشن. بەڵام لەپێشدا دەبوو جۆرێکی تایبەتیی «پرۆمیس» و «دەرگای نهێنی» بۆخۆیان بەرهەم بێنن. ئەمریکاییەکان نوسخەیەک لە بەرنامەکەی خۆیان دایە «واکنهات» Waekenhut کە ناوەندەکەی لە فلۆریدا بوو و کاری بۆ ڕێکخراوی هەواڵگریی ئەمریکا دەکرد. کۆمپانیی «واکنهات» لقێکیشی لە «کازابۆن» Cazabon، لە باشووری کالیفۆرنیا هەبوو. لقی «کازابۆن» لە ناوچەیەک بوو کە شوێنی ژیانی خەڵکی خۆجێیی ئەمریکا بوو. کۆمپانیی «واکنهات» لەو ناوچەیە ئامراز و دەزگای تەکنیکیی تایبەتی، وەک ئامرازی جۆراوجۆری ئەلیکترۆنی، دەزگای ئەلیکترۆنیی خەبات دژی تێرۆریستەکان و شتی لەو بابەتە و هەروەها دەرمانی گومانسازی[15] بەرهەم دێنا. کۆمپانیی «واکنهات» بۆیە ناوچەی «کازابۆن»ی بۆ ئەو جۆرە کارانە هەڵبژاردبوو، چونکە ئەوێ لەژێر مەڵبەندی دادوەریی ئەیالەتێکدا نەبوو و کاربەدەستانی فیدڕاڵ، دەیانتوانی چاو لە عەمەلیاتەکەی بنووقێنن.

ئەمریکا لەو ناوچەیە توانی، بەپێی زانیاریگەلێک کە لە ئیسرائیلی بەدەست هێنابوون «دەرگای نهێنی»ی تایبەت بەخۆی بۆ بەرنامەی «پرۆمیس» بەرهەم بێنێ.

---

[15]-دەرمانە گومانسازەکان جۆرە دەرمانێکن کە هەستی درۆیین و ناواقعی بۆ مرۆڤ دروست دەکەن. ئەم دەرمانانە کار دەکەنە سەر دەزگای هەستکردنی مرۆڤ و تێکی دەدەن. بەناوبانگترینی ئەو دەرمانانە بریتین لە: LSD, PCP,Psiloccybin, Mescaline (مترجم فارسی).

لــەنێوان ڕێکخــراوی ئەمنیــەتی نیشــتمانیی ئــەمریکا و CIAدا ململانەیەکی توند بۆ کەلکوەرگرتن لە «پرۆمیس» هەبوو و بۆیە پێیان خۆش نەبوو ڕێکخراوی ئەمنیەتی نیشتمانیی ئەمریکا ئاگای لەو بەرنامەیــە هــەبێ. لەبــەر ئــەوە کارمەنــدانی CIA بەرنامــەی «پرۆمیس»یان نەدایەوە ئەو ڕێکخراوە. چونکە ئەگەر «پرۆمیس»یان دابایە ڕێکخـراوی ئەمنیـەتی نیشـتمانی، ئـەم ڕێکخـراوە «دەرگـای نهێنی»یەکی تایبەتیی بۆخۆی دروست دەکرد کە بکرێ لە بەرنامەی «پـرۆمیس»دا بـەکار ببـرێ. تـەنیا ئـەو گرووپـە گچکەیـەی CIA کـە لەلایـەن «ڕابێـرت گەیـتس»ەوە -کـە ئۆکتـۆبری سـاڵی ١٩٩١ بـە سـەرۆکایەتیی CIA هـەڵبژێردرابوو-ڕێبـەری دەکـرا، لـە نهێنییـەکانی بەرنامـەی «پـرۆمیس» ئاگـادار بـوون. بـەم جـۆرە تـەنیا گرووپێکـی چووکەڵە لە ئیسرائیل و گرووپێکی چووکەڵە لە ئەمریکا ئاگایان لە «دەرگای نهێنی» هەبوو.

هەنگاوی دواتر بۆ هەر دوو وڵاتی ئەمریکا و ئیسرائیل ئەوە بوو کــە کۆمپانییــەکی بــێلایــەن بدۆزنــەوە کــە بتــوانێ بەرنامــەی «پـرۆمیس»یـان بـۆ بفرۆشـێ. ئـەم دوو وڵاتـە پێکـەوە ڕێـک کـەوتن، کەسێک کە سەرۆکایەتیی ئەو کۆمپانییە دەگرێتە ئەستۆ، دەبێ لەباری پاراستنی نهێنییە هەواڵگرییەکانەوە جێی متمانە بێ و دەگەڵ وڵاتانی خۆرئـاوا و خۆرهــەڵات هــەردووکیان پێوەنـدیی هــەبێ و لــەباری بازرگانییـەوە خۆشـناو بـێ. کەسـێک کـە بـەباوەڕی وان دەیتـوانی خـاوەنی ئـەو خەسـڵەتانە بـێ، «ڕابێـرت ماکسـوێڵ» Robert Makwell بوو.

«ڕابێرت ماکسوێڵ» کە ئێستا تەرمەکەی لە پیرۆزترین شوێنەکانی بەخاکسپاردنی مردووە کەلیمییەکان، لە Mount of Olves کە بەسەر دیوارەکانی شاری ئوورشەلیمدا دەڕوانێ، حاواوەتەوە، لە سەرەتای سـاڵەکانی دەیــەی ١٩٦٠دا پێوەنــدیی دەگــەڵ ئیســرائیل بەســت.

«ماکسـویڵ» لەوکاتـەدا چاوی بـە «ئیسـحاق شـامیر» کـەوت کـە لـە عەمـەلیاتی «مۆسـاد» لـە ئوروووپادا بەشـدار بـوو. ئـەرکی «ئیسـحاق شـامیر» ئەوە بـوو کـە زانیـاری لـە هـەموو ئـەو ڕێکخراوانـە بەدەسـت بێنـێ کـە لـە ئورووپـا کاریـان بـۆ «مۆسـاد» دەکـرد. دیـداری نێـوان «ماکســـویڵ» و «شــامیر» بـــەهۆی «ماپـــام» Mapam (حیزبـــی یەکگرتووی کرێکارانی ئیسرائیل)ەوە ڕێک خرابوو کە بەشـێک بـوو لـە ڕاپەڕینی کرێکاران و پێوەندییەکی نیزیکی دەگەڵ یارانی دەستەچەپیی «ماکسویڵ» لە حیزبی کرێکاری ئینگلستان هەبوو.

«ماکسـوویڵ» و «شـامیر» بە هـۆی «مـایر یائـاری» Meir Yaari، ئەنـدامی کیبـووتز و یەکێـک لە ڕێبەرانـی ئیـدئۆلۆگی «ماپـام»ەوە لە یەکتـر نزیـک بـوونەوە. گرنگتـرین ئامـانجی «یائـاری» لە لێکنزیـک-کـردنەوەی «ماکسـوویڵ» و «شـامیر» ئەوە بـوو کە پێوەنـدی دەگەڵ سۆڤیەتییەکان دامەزرێنێ. بۆیە بڕیاری دا «ماکسوویڵ» لە «شـامیر» نزیـک بکـاتەوە، چـونکە «ماکسـوویڵ» لە سـەرەتای دووەم شـەڕی جیهـانییەوە پێوەنـدییەکی بەربـڵاوی دەگەڵ ڕێکخـراوی هەواڵگـری شـووورەوی هەبـوو. دیـارە، لەبەر ئەوەی «شـامیر» بە یەکێـک لە تێرۆریستەکانی «گرووپی ستێرن» دەژمێردرا، وا دەهاتە بەر چاو کە نزیکبـوونەوەی لە «ماکسـوویڵ» لەتوانـادا نەبـێ. بەڵام «مۆسـاد» لە هەمـوو دەرفەتێـک بـۆ دامەزرانـدنی جۆرێـک پێوەنـدی دەگەڵ KGB کەلکـی وەردەگـرت و تەل ئەبیـب لەو بـاوەڕەدا بـوو کە چـونکە «ماکسـویڵ» بـە هەسـتی شـانازی و بـە وەفادارییـەوە لـە سـوپای بریتانیـادا خزمـەتی کـردوە، پێوەنـدیی دۆسـتانەی خـۆی لەگـەڵ «دۆستەکانی» لە وڵاتانی بلووکی خۆرهەڵات دەپارێزێ.

«ماکسـویڵ» کـە سـاڵی ١٩٦٤ لەلایـەن حیزبـی کرێکـارەوە بـە نوێنەرایەتیی ئەنجومەنی قانووندانانی بریتانیا هەڵبژێرابوو و«شامیر»

هـەردووکیان ڕقێکی سروشـتییان لـە ئـەمریکایی‌یـەکان هـەبوو. بۆیـە دەیانتوانی پێکەوە دوو دۆستی گیانی بەگیانی بن.

«ڕافی ئەیتان» بە باشی ئاگای لە پێوەندیی لەمێژینەی «ماکسوێڵ» دەگـەڵ «شـامیر» و ئیسـڕائیل» هـەبوو و بۆیـە پێشـنیاری کـرد کـە غوولی سیاسیی بریتانیا، واتە «ماکسوێڵ» بـۆ فرۆشـتنی «پرۆمیس» دیاری بکرێ. بۆ تێوەگلاندنی «ماکسـوێڵ» لـە فرۆشـتنی «پرۆمیس»، یەکەمجار سالّی ١٩٦٤ سەناتۆر «جان تاوەر» John Aower کە یەکێک لە دۆستە دێرینەکانی «ماکسوێڵ» بوو، پێوەندیی دەگـەڵ گـرت. دەبـێ لەبیرمان بێ کە «جان تاوەر» لە یارانی نزیکی «جۆرج بووش» بـوو کە لەو کاتەدا جێگری سەرکۆماری ئەمریکا بـوو و چەنـد سـاڵ پێشـتر «جـان تـاوەر» کۆمـەگی پێکردبـوو کـە بتـوانێ بچێتـە کـۆنگرە. «جـان تاوەر» کە هەمیشە ئۆگری کاروباری سەربازی و هەواڵگری بـوو، لـە سەردەمی سەناتۆریدا، سەرۆکایەتیی خزمەتە سـوپایی‌یـەکانی سـەنای بەئەسـتۆوە بـوو. بـەگوێرەی قسـەکانی «ماکسـوێڵ»، سـاڵی ١٩٧٦ کـە «جـۆرج بـووش» سـەرۆکایەتیی CIAی لەئەسـتۆ بـوو، «تـاوەر» پێوەنـدیی دەگـەڵ «ماکسـوێڵ» گـرت و دەیەویسـت ئـەو بـە شـێوەی نهێنی و لەسەر بناخەی پێوەندیی کەس لەگەڵ کەس «جۆرج بووش» دەگەڵ کارمەندانی هەواڵگریی سۆڤیەتی پێکەوە گرێ بدا. پاش ئـەوەی «ماکسوێڵ» ملی بەوکارە دا، ئەو و «تاوەر» بۆ هەموو تەمەن بوونە دۆسـتی یـەکتر. لـە سـاڵەکانی دواتـردا کـە دۆسـتایەتیی «تـاوەر» و «ماکسوێڵ» قووڵتر بۆوە، «تاوەر» بە سەرۆکی کۆمپانیی چاپەمەنیی «ماکمیلان» لە ئەمریکا کە هی «ماکسوێڵ» بوو هەڵبژێرا.

«تاوەر» وەک نوێنەری ئەو گرووپە لە کارمەندانی CIA کە لەلایـەن «گەیـتس»ەوە ڕێبـەری دەکـران، دەگـەڵ «ماکسـوێڵ» بـۆ فرۆشـتنی «پرۆمیس» لـە ڕێگـەی کۆمپانییەکانی خۆیـەوە پێوەنـدیی گـرت. بـەڵام لەڕاسـتیدا «ڕافـی ئـەیتان» لـە دیدارێکـدا کـە سـاڵی ١٩٨٤ لـە پـاریس

لەگەڵ «ماکسویڵ»ی هەبوو، ئەو کارەی ڕێکخست. ئەمن نازانم «ماکسویڵ» لە «دەرگای نهێنی» و ئەوە کە ئەمریکا و ئیسرائیل بەهۆی ئەوەوە دەیانتوانی زانیاریی پێویست لە کامپیۆتەری هەموو ئەو ڕێکخراوانە کە کەلکیان لەو بەرنامەیە وەردەگرت، بەدەست بێنن، ئاگادار بوو یان نا. بەڵام «ماکسویڵ» بەتەواوی دەیزانی «پرۆمیس» چۆن بەکار دەبرێ و ڕێکخراوە هەواڵگرییەکان چۆن دەیانتوانی بەهۆی ئەوەوە خەڵکانی گومانلێکراو بخەنە ژێر چاوەدێری.

«ماکسویڵ» ڕایگەیاند کە بە تەواوی ئامادەیە بۆ فرۆشتنی «پرۆمیس» کار بۆ ئەمریکایی و ئیسرائیلییەکان بکا. دەبێ بزانین کە فێرگە زمانییەکانی وی بەناوی «بێرلیتز» Berlitz لە سەرانسەری دنیادا بڵاو ببوونەوە و خەریکی کار بوون. بۆیە هەر ئەوەندە بەس بوو کە ئەو، یان هێندێک کۆمپانیی تازە کە سەر بە فێرگەکانی «بێرلیتز» بن دامەزرێنێ، یان بەناوی فێرگەکانەوە هێندێ کۆمپانیی کامپیۆتەر بکڕێ. ئەم کارە دەبووە هۆی ئەوە کە خۆی لە چالاکییە جاسووسییەکانی بەرنامەی ناوبراو بەدوور بگرێ.

بەڵام لەمێژ بوو کۆمپانییەکی کامپیۆتەر لە ئیسرائیل هەبوو کە دەتگوت بۆ ئەم مەبەستە دروست کراوە و «ماکسویڵ» بەئاسانی دەیتوانی، ئەو کۆمپانییە بۆ وەرێخستنی کاری ئەم بەرنامەیە بەدەست بێنێ. ئەم کۆمپانییە بە «دەگەم» Degem ناو دەبرا و هی ئیسرائیل بوو و لە «گواتمالا» و «ترانسکی» Transkey لە ئەفریقای باشووریش هێندێ لقی هەبوون. وەزعی لقی «ترانسکی» بەتایبەتی زۆر سەرنجڕاکێش بوو.

«مەناخیم بگین»، سەرۆکوەزیری ئیسرائیل لە ساڵانی نێوان(١٩٧٧ و ١٩٨٣) دا دۆستێکی لەمێژینەی هەبوو بە ناوی «یاکۆف مێریدۆر» Yeacov Meridor کە بەهۆی «ترانسکی»یەوە موعامەلەیەکی زۆری دەگەڵ ئەفریقای باشوور دەکرد. «مێریدۆر» وەزیری ڕاوێژکاری

کابینەی «بگین» بوو و هەرچی پێویستیی ئەفریقای باشوور هەبوو کە ئەم وڵاتە بەهۆی گەمارۆی ئابوورییەوە نەیدەتوانی لە دەرەوەڕا بیهێنێ، «مێریدۆر» لە ڕێگای «ترانسکی»یەوە دەیدا بە ئەفریقای باشوور و لەم ڕێگایەوە سامانێکی گەورەی وەسەر یەک نابوو. هەموو ئەو شتوومەکانە بەهۆی «مێریدۆر»ەوە یان کەسێکی دیکە لە کۆمپانییەکانی وی دەدرانە ئەفریقای باشوور. یەک لەو کۆمپانییانە «دەگەم» بوو کە لەژێر کۆنترۆڵی ڕێکخراوی هەواڵگریی سوپای ئیسرائیلدا بوو و خزمەتە کامپیۆتەرییەکانی دەدان بە ئەفریقای باشوور و گواتمالا.

«مێریدۆر»ی بەستەزمان بانگهێشتنی «ماکسوێل»ی قبووڵ کرد و دەرگای کۆمپانییەکەی بۆ کردەوە. بەڵام دەگەڵ شکستێکی گەورە بەرەوڕوو بوو و ئیعتیبار و ئابڕووی خۆشی لەدەست دا. بەوجۆرە کە «مێریدۆر» دەگەڵ کەسێکی خەڵکی تەکزاس بەناوی «جۆ پیپڵێس» Joe Peeples و کەسێکی دیکە کە لە ڕۆمانی هەڵاتبوو و ئیددیعای دەکرد کە پرۆفیسۆری بەشی وزەیە، پرۆژەیەکیان داهێنا و پێیان وابوو بە کەلکوەرگرتن لەو پرۆژەیە، دەتوانن وزە لە هەتاو وەرگرن و بیکەنە جێنشینی ئەلیکتریسیتە (کارەبا). هەرچەند ئەو پرۆژەیە لەباری تیئۆرییەوە بە کردەنی دەهاتە بەرچاو، بەڵام پرۆژەی «مێریدۆر» زۆر لەو سنوورە دوور بوو. هەرچۆنی بێ «مێریدۆر»و هاوکارەکانی توانیان پرۆژەکەیان بە بڕی ٢ میلیۆن دۆلار بە برایانی «هانت» Hont کە لە دەوڵەمەندانی ئەیالەتی تەکزاس بوون، بفرۆشن. «مێریدۆر» گوتی، بە کڕینی ئەم پرۆژەیە، ئەوان هەقیشیان هەیە، لە ئەمریکا بیفرۆشنەوە. لەم نێوەدا، «مێریدۆر» بڕیاری دا قەرزێکی گەورەش لە وەزارەتی خەزێنەداریی ئیسرائیل وەربگرێ. بەڵام لەو نەخشەیەدا تووشی هەڵەیەکی گەورە بوو. هەڵەکەی ئەوە بوو کە لەڕێگەی تەلەڤیزیۆنەوە بە خەڵکی ئیسرائیلی ڕاگەیاند کە ئەو خەریکی

وەرگرتنی وزە لە هەتاوە، بەجۆرێک کە بە جێبەجێکردنی ئەو پرۆژەیە ئیسرائیل لە دواڕۆژدا ئیدی پێویستیی بە بەکاربردنی نەوت و خەڵووز بۆ بەرهەمهێنانی کارەبا نابێ. شتێک کە ئەو بۆ جێبەجێکردنی پرۆژەکە پێویستیەتی تەنیا هێندێ یارمەتیی ماڵییە.

بەو قسانە «مێریدۆر» چاوەڕوان بوو لافاوی پووڵی بەسەردا بڕژێ، بەڵام ڕۆژی دواتر، یەک لە زانایانی بنیاتی «وەیزمەن» Weizman لە تەلەڤیزیۆن ڕایگەیاند کە پرۆژەی «مێریدۆر» بەرنامەیەکی فریودان و کڵاولەسەرنانە. لەئاکامدا پرۆژەی «مێریدۆر» ڕاوەستا. چونکە «جۆ پیپلێس» نەیدەتوانی ئەو ٢ میلیۆن دۆلارەی وەریگرتبوو، بداتەوە بە برایانی Hunt، بە تۆمەتی کڵاولەسەرنان کەوتە زیندان. هاوکارەکەی «پیپلێس» کە خەڵکی ڕوومانی بوو، چونکی هیچی لەو ٢ میلیۆن دۆلارە وەرنەگرتبوو، نەکەوتە بەر لێپرسینەوەی قانوونی. «مێریدۆر» کارەکەی خۆی وەک وەزیری ڕاوێژکاری کابینە لەدەست دا، ئیعتیبار و ئابڕووشی بەبادا چوو و عەمەلیاتی وی لە «ترانسکی»یش ڕاوەستا. لەو بگرەوبەردەیەدا، «ماکسوێڵ» کە باش دەیزانی دەیەوێ چبکا و چی بکڕێ، ڕووی دراوەکانی کردە کۆمپانیی «دەگەم».

پاش کارکردی سەرکەوتووانەی «پرۆمیس» بەدژی ئۆردۆنییەکان و ڕەزامەندیی «ماکسوێڵ» لەسەر کڕینی کۆمپانیی «دەگەم»، بەرنامەی «پرۆمیس» بە شێوەیەکی ترسناک لە هێندێ وڵات خرایە کار. نموونەی زەق لەوبارەیەوە وڵاتی گواتمالایە. «پێساچ بن ئۆر» Pesach ben- Or، نوێنەری «ئیگڵ» Eagle کە کۆمپانییەکی چەک-فرۆشیی سەر بە ئیسرائیل بوو، بەهۆی کامپیۆتەرەوە کۆمەگی بە ڕێژیمی سەربازیی گواتمالا دەکرد تا بەسەر شۆڕشگێڕە چەپەکاندا سەر کەوێ. بەڵام، ئەو کۆمەگە بۆ سەرکەوتنی ڕێژیمی گواتمالا نەگەیشتبووە هیچ کوێ.

سالّی ١٩٨٤، ڕێکخراوی هەواڵگریی ئیسرائیل دەگەڵ پیاوێک کە خۆی بە ژەنراڵ «ئۆسکار مێجیا ڤیکتۆرز» Oscar Mejia Viktores سەرۆکی خەڵکی گواتمالا ناو دەبرد، چووە نێو قەرارومەدارێک. ژەنراڵ «ڤیکتورز» ڕازی بوو کە بۆ ڕاگرتنی ئەو کەرەسە جەنگییانە ی بەنهێنی لە ئەمریکاوە دەگوازرێنەوە ئێران، لە گواتمالا کە کەوتۆتە سەر ڕێگای ئەوکارە، عەمبارێک دروست بکرێ. هەروەها ئەو فڕۆکانەی لە لەهیستانەوە کەرەسەی شەڕیان بۆ حکوومەتی «سەندی نیستا» لە نیکاراگوا دەگوازتەوە، هەقیان هەبێ بە ئاسمانی گواتمالادا بفڕن و تەنانەت ئەگەر پێویست بوو لە خاکی گواتمالا بشنیشنەوە. ئیسرائیلییەکان لەوکاتەدا، بە ئاماژەی ڕەزامەندانەی ئەمریکایییەکان، لە لەهیستانەوە کەرەسەی شەڕیان لە ڕێگای لەهیستانەوە بە حکوومەتی «سەندی نیستا» دەفرۆشت تا ئەو حکوومەتە بتوانێ ئەوان لە شەڕی کۆنتراکاندا بەکار بەرێ. دیارە هێندێ گرووپی دیکەش لە ئیسرائیل و ئەمریکا- وەک گرووپی «ئۆلیڤێر نۆرت»- هەبوون کە کەرەسەی شەڕیان تەحویلی کۆنتراکان دەدا.

نرخێک کە ئیسرائیل دەبوو لە بەرامبەر ئەو پەیمانەدا بیدا، ئەوە بوو کە ڕێگا بدا کۆمپانیی «ئیگڵ» کە بەهۆی «پێساچ بن ئۆر» و هاوکارەکەی «میک هەراری»Mike Harariیەوە بەڕێوە دەبرا و «ژەنراڵ ئاریەل شارۆن» چاوەدێریی بەسەردا دەکرد، فرۆشتنی کەرەسەی شەڕ بە حکوومەتی گواتمالا درێژە پێبدا. بێجگە لەوە بڕیار درا ئیسرائیل بەرنامەیەکی کامپیۆتەریی زۆر پێشکەوتوو لە گواتمالا دامەزرێنێ تا حکوومەتی گواتمالا بە کەلکلێوەرگرتنی بتوانێ شۆرشی دژبەرانی خۆی دامرکێنێ. «ناچووم ئەدموونی» سەرۆکی «مۆساد» لە ئیسرائیل ئامۆژگاریی «شارۆن»ی کرد کە دەست لە کاری بەرنامەی کامپیۆتەری وەرنەدا. لە بەرامبەردا ڕێکخراوی

هەوالگریی ئیسرائیلیش کۆسپێک بۆ فرۆشتنی نارەسمیی چەکوچۆڵە لەلایەن کۆمپانیی «ئیگڵ»ەوە بە سوپای گواتمالا دروست ناکا. بەم سەودایە، لەڕاستیدا هەرکەسە پشتێ ئەوی دیکەی دەخوراند.

بۆ دامەزراندنی «پرۆمیس» لە گواتمالا، حکوومەتی ئیسرائیل، ئەڵمانییەکی ٦٠ ساڵەی وڵاتجێهێشتووی بەناوی «مانفرێد هارمەن» Manfred Harmann کە کۆمپانییەکی فرۆشتنی پارچە یەدەکییەکانی ترومبێل بەناوی «سەدرا» Sedraی لە شاری گواتمالا هەبوو، بەخزمەت گرت. وا ڕێک کەوتن کە «هارمەن» نوێنەرایەتیی کۆمپانیی ئیسرائیلیی «ئۆرا» لە گواتمالا کە خەریکی کڕین و فرۆشتنی کەرەسەی شەڕە، بەئەستۆوە بگرێ و شەریکەکەی «باڵدوور کلین» Baldur K. Kleineیش نوێنەرایەتیی کۆمپانیی «مەیتلەند» Maitland لە فلۆریدا کە هەموو چالاکییەکانی ئێمە لە ئەمریکای ناوەندیی ڕێک دەخست، بگرێتە ئەستۆ. کەمێک دوای ئەوەی «ماکسوێڵ» کۆمپانیی «دەگەم»ی بەدەستەوە گرت، «ڕافی ئەیتان» داوای لە «ئارل بریان» کرد، لە «مەیتلەند» چاوی بە «کلین» بکەوێ و «پرۆمیس» و «دۆر تەڵە»ی بداتێ.

پاش ئەوەی «کلین» بەرنامەکەی تەحویلی «هارمەن» دا، ئەمنیش جۆری ئیسرائیلیی بەرنامەکەم دا بە «هارمەن». ئێستا ئەگەر ئەمریکایییەکان دەیانتوانی بە کەلکوەرگرتن لە بەرنامەی «پرۆمیس»ی خۆیان زانیاریی نهێنی لەبارەی گواتمالاوە بەدەست بێنن، ئێمەش دەمانتوانی ئەو کارە بکەین. لەلایەکی دیکەوە، چونکە لە ڕێگای گواتمالاوە چەکوچۆڵەمان دەگوازتەوە، قازانجمان لەوەدا بوو کە بەردەوام وریای بارودۆخی ئەو وڵاتە بین. بەڵام بەزوویی بۆمان دەرکەوت کە گواتمالا دەزگاکانی کامپیۆتەر و کارمەندانی کارامە بۆ کەلکوەرگرتن لە بەرنامەی ناوبراوی نین. چونکە، بۆ بەهرەوەرگرتن لە بەرنامەی «پرۆمیس» دەبێ هەموو عەمەلیاتی کۆمپانییەکانی ئاو و

کارەبا کامپیوتەریان هەبێ. جگە لەوە، پێرستی ناوی کەسەکانیش دەبێ دەسکاری بکرێ و سەرژمێرییەکی تازەی حەشیمەت بەڕێوە بچێ. لەوحاڵەدا بە بوونی ئەو زانیارییانە و دانانی ناوی کەسانی گومانلێکراو لە کامپیوتەری ناوەندیدا، ئەمریکا و ئیسرائیل دەیانتوانی دەستیان بگاتە سیستمی ناوەندی و دەستیان بە هەموو ئەو زانیارییانە ڕابگا کە حکوومەتی گواتمالا لەدەستیدا بوون.

بۆ ئەنجامدانی ئەو بەرنامەیە، ئیسرائیل بڕیاری دا کەلک لە ئیشکەرانی کۆمپانی «هانی وێل» وەربگرێ کە حکوومەتی ئیسرائیل بەڕەسمیی ناسیبوو و بەشێک لە دارایی کۆمپانیی کامپیوتەرەکانی «مێدان» Medan بوو. هەموو ئەو تەکنیسیەنانەی کاریان بۆ کۆمپانیی «مێدان» دەکرد، لە کەسانی زەخیرەی سوپا و لە کارناسانی کامپیوتەر بوون. ئەو گرووپە لە کارناسەکان کە لە پلەی بەرزتردا بوون، ئاگایان لە بەرنامەی «پرۆمیس» هەبوو، بەڵام هیچیان لەبارەی «دۆر تەڵە»وە نەدەزانی. ئەو کارناسانە دەستیان کرد بە لێکۆڵینەوەی بابەتەکە و ئیمکانی بەهرەوەرگرتن لە بەرنامەی «پرۆمیس»، و ڕاپۆرتیان دا کە کامپیوتەرەکانیان بۆ ئامانجی دیاریکراو بەکەلک نایەن. کاتێک ئەو بۆچوونە لەلایەن کۆمپانیی «مێدان»ەوە ڕاگەیەندرا، ئێمە وامانکرد کە ئەوان وەک دەلالی ئامرازەکانی IBM لە گواتمالا کار بکەن.

هەر لەوساڵەدا (١٩٨٤) «ئێل جەفە» El Jefe بڕیاری دا، هەموو چالاکییە کۆمەڵایەتی و نیشتمانییەکانی گواتمالا بە کامپیوتەر تەیار بکا، تەلەڤیزیۆنەکان، ڕادیۆکان و ڕۆژنامەکان، ستایشی ئەو هەنگاوەیان کرد و گوتیان کامپیوتەر دەبێتە هۆی ئەوەی بێکاری لە وڵاتدا بنەبڕ بێ و هەرکەس کارێکی هەبێ و خەڵک ئیدی لە چاخە تاریکەکاندا نەژین. هێندێک وێنە لە هەموو جێیەک بڵاو کرانەوە کە نیشانیان دەدا ڕیزێک لە ژنانی گەنج لەپشت کامپیوتەر دانیشتوون و

خەریکی کارن. ئەو پڕوپاگەندەیە زۆر کاریگەر بوو. سەربازانی سوپا کە زۆریان بەحاڵ دەیانتوانی بخوێننەوە و بنووسن، فێری شێوەی کەلکوەرگرتن لە تەختە کلیل (Keyboard) کران. کۆمپانیی «دەگەم» کە بەستراوەبە «ماکسوێڵ» بوو، بەهۆی کۆمپانیی «سەدرا» کە هی «هارمەن» بوو، جێی خۆی لە ئیدارە دەوڵەتییەکان، ئیزگەکانی شومەن دو فێر (شەمەننەفەر)، فرۆکەخانەکان، و تەنانەت شوێنە چەپەک و دووردەستەکانیش کردەوە.

ئەم هەنگاوە ئازایانەیە لە باری هەواڵگرییەوە سەرکەوتوو بوو. مەیدانی جموجۆڵ لە دژبەرانی دەوڵەت بەرتەنگ کرایەوە و چووکترین کاروکردەوەیان کەوتە بەر چاوی تیژبینی «براگەورە». تەنانەت ئەگەر دژبەرانی دەوڵەت بە ناو و تایبەتمەندیی ناڕاستەوە، وەک بەژن، ڕەنگی موو،و تەمەن سەفەریان کردبایە ناوونیشانەکەیان دەدرایە شوێنەکانی کامپیۆتەر لە قەراخ جادەکان و «پرۆمیس» لە خەزێنەی زانیاری (data base) خۆی دەستی بە گەڕان دەکرد و کەسیەتییە ڕاستەقینەکەیانی دیاری دەکرد. بەمجۆرە «پرۆمیس» دەیتوانی بە فەرماندەری یەکەیەکی سەربازی بڵێ کە کەسێکی دژبەری دەوڵەت کە سێ ڕۆژ لەوە پێش لە باکوور بووە، پێشان بە قەتار و دوایە بە ئۆوتووبووس سەفەری کردوە، شەوێ لە ماڵی دۆستێکی خۆی بووە و ئێستا بە ناوێکی ناواقعی لە فلانە شەقام دەگەڕێ. ئەم شێوەکارە ترسناکە سیستمی «پرۆمیس»ە. لە کۆتایی ساڵی ١٩٨٥دا، بەڕاستی تەواوی خەڵکانی دژبەری دەوڵەت - ژمارەیەکی نادیار لە خەڵکی بێگوناح کە کەسیەتییان نەناسرابوو، بەهۆی هێزە دەوڵەتییەکانەوە گەمارۆ دران و گیران. لە وڵاتێکی وادا کە دەسەڵاتداران توانای قبوولکردنی ئەو جۆرە کەسانەیان نیە، ٢٠٠٠٠ کەس لە دژبەرانی دەوڵەت یان کوژران یان بێسەروشوێن بوون.

بزانین ئەو عەمەلیاتە لەباری ماڵییەوە چۆن پشتیوانی دەکرا؟ساڵی ١٩٨٥ خاکی گواتمالا وەک ڕێگای تێپەڕینی کەرەسە هۆشبەرەکان لە ئەمریکای باشوورەوە بۆ ئەمریکای باکووری کەلکی لێوەرگیرا. «مێجیا» Mejia، سەرۆکی ولاتی گواتمالا، لەڕاستیدا پێش «نۆریەگا» دە قاچاغی کەرەسەی هۆشبەرەوە گلابوو. بڕێکی زۆر لەو کەرەسانە گوازرایەوە ئەمریکا و بەشێک لە داهاتەکەی بۆ وەکارخستنی عەمەلیاتی «پڕۆمیس» گەڕێندرایەوە گواتمالا. دیارە ئەوکارە بەبێ ئاماژەی ڕەزامەندیی CIA نەدەگونجا.

لە «ترانسکی»، کۆمپانیی «دەگەم» کۆمەگێکی زۆری بە ڕێژیمی سپیپێستی ئەفریقای باشوور کرد. «پڕۆمیس» لەم ولاتە بە بەهرەوەرگرتن لە «دۆر تەڵە» کەلکی لێوەرگیرا، چونکە ئیسرائیلییەکان لەم ولاتە حەزیان دەکرد هێندێ کەس بناسن. «پڕۆمیس» لەو ولاتە لەڕاستیدا وەک مەکینەی پیاوکوشتن لە دژی شۆڕشگێرانی ڕەشپێست، یەک لەوان «کۆنگرەی نیشتمانیی ئەفریقا» کەلکی لێوەرگیرا. لە سەرەتای ساڵی ١٩٨٦ەوە، نیزیکەی ١٢٠٠٠ کەس لە دژبەرانی دەوڵەت لە شەڕی ڕەشپێستان بەدژی ڕەش-پێستاندا گیران، بێسەروشوێن چوون، یان زەمینگیر بوون. عەمەلیاتی ترسناکی تاقمەکانی مەرگی «گاتشا بووتلیزی» Gatsha Buthiesi و کوشتاری دزێو و بێبەزەییانەی ڕەشپێستان لە بوارە هەواڵگرییەکاندا ئەم قسەیەی لێ دروست بوو کە: «ڕەشە، ڕەشەی بکوژە».

ئەم کارە زۆر بە سانایی ئەنجام دەدرا: دوای ئەوەی «ماکسوێل» کۆمپانیی «دەگەم»ی کڕی، «پڕۆمیس» لە «ترانسکی» بەهرەی لێ-وەرگیرا. دژبەرەکان دۆزرانەوە، پێرستەکانی مەرگ ئامادە کران و درانە دەست گرووپی «بووتلیزی». پاشان ئەو گرووپە دەستی کرد بە لەنێوبردنیان.

جارێکیان «پرۆمیس» ناوی کەسانێکی دۆزیەوە کە کرێکارانی کان (معدن)ێکیان بە بەرنامەیەکی پێشتر ئامادەکراو بۆ مانگرتن هان دەدا و نەکهەر مانگرتنەکە سەری نەگرت، بەڵکوو هاندەرانی مانگرتنیش هەموو بێسەروشوێن بوون. ئەمە ڕەفتارێک بوو کە ڕایەڵکەی ئەمنیەتیی ئەفریقای باشوور زۆری چێژ لێوەردەگرت. کامپیۆتەرەکەیان بە ناوەندی کامپیۆتەری سوپا لە «پریتۆریا»وە گرێ درابوو و هەرچەند ئەوان کەلکیان لە جۆری ئیسرائیلیی «پرۆمیس» وەردەگرت، بەوحاڵە، ئەو زانیارییانەی ئەوان بە کامپیۆتەری خۆیان دەستیان دەکەوت، بە هۆیەکی سادە دەچووە باڵیۆزخانەی ئەمریکا. هۆیەکە ئەوە بوو کە باڵیۆزخانەی ئەمریکا دەگەڵ ناوەندی سوپای «پریتۆریا» دیواری هاوبەشیان هەبوو.

ڕیاکاری لەوە زیاتر نەدەبوو کە «ڕابێرت ماکسوێڵ» بەڕەسمی دژی هەرچەشنە پێوەندییەک دەگەڵ ئەفریقای باشوور ڕەگەزپەرست بوو و ڕۆژنامەی Daily Miror ی وی کە ساڵی١٩٨٤ بە ١١٣ میلیۆن پۆندی کڕیبوو، پەیڕەویی لە تیئۆریی «یەک کەس، یەک دەنگ، بێ گوێدانە ڕەگەز» دەکرد. بەو حاڵە، لەژێر پەردەی کۆمپانیی «دەگەم»دا کۆمەگێکی بە حکوومەتی ئەفریقای باشوور دەکرد کە ئەم وڵاتە پێشتر کۆمەگی وای لە هیچکەس وەرنەگرتبوو. ئەگەر «ماکسوێڵ» داخوازی ئیسرائیلی بۆ دامەزراندنی ئەو سیستمە کامپیۆتەرییە لە ئەفریقای باشوور ڕەت کردبایەوە، بێگومان، ئیسرائیل بۆ ئەو مەبەستە کەلکی لە کۆمپانییەکی دیکە وەردەگرت. بەڵام لەوحاڵەدا هەرنەبێ، ویژدانی«ماکسوێڵ» لە گوناح و تێوەگلان پاک دەبۆوە.

«پرۆمیس» لە سەرانسەری دنیادا دەفرۆشرا. کۆمپانیی «هادرۆن»ی ئارل بریان و کۆمپانیی «دەگەم»ی ماکسوێڵ بە ڕێگای کێبەرکێیەکی دۆستانەدا، دنیایان بۆ ئامانجە جاسووسییەکانی خۆیان

سیمکێشی کرد. ئەمریکاییەکان بەهۆی کۆمپانیی «هادرۆن» بەرنامەی «پرۆمیس»یان بە هێندێ وڵات لەوانە بریتانیا، ئوستڕالیا، کۆریای باشوور، عێراق و کانادا فرۆشت. لەو بوارەدا ئەمریکایی-یەکان توانیان بەهۆی «دۆر تەڵە»ی بەرنامەی «پرۆمیس»ەوە نهێنییەکانی زۆر ڕێکخراوی هەواڵدەری لەم وڵاتانەدا بخوێننەوە. جگەلەوەش، CIA بە فرۆشتنی نەرمئامێری «پرۆمیس» بڕێکی زۆری پارە دەست کەوت. تا ساڵی ١٩٨٩ داهاتی CIA لە فرۆشتنی «پرۆمیس» هەرنەبێ گەیشتە ٤٠ میلیۆن دۆلار.

ئیسرائیلییەکان هەروەها بەهۆی کۆمپانیی «دەگەم»ەوە، «پرۆمیس»یان بە وڵاتانی بلووکی خۆرهەڵات و وڵاتانی دیکە لەوانە، برێزیل، شیلی، کۆلۆمبیا و نیکاراگوا فرۆشت. جۆرێک لە بەرنامەی کورتکراوەی «پرۆمیس»، بە «دۆر تەڵە»شەوە لە ساڵی١٩٨٥دا بەهۆی کۆمپانیی «دەگەم»ەوە بە کۆمپانیی ئیعتیباریی سویس فرۆشرا. حیزبی لیکوود کە ڕایەڵکەی هەواڵگریی ئیسرائیلی لە کۆنترۆڵدایە، زۆری پێخۆش بوو بزانێ، کام کەس لە ئیسرائیلییەکان لە کۆمپانیی ناوبراو حیسابی بانکیی کردۆتەوە. دوای ئەوەی دەرکەوت چکەسانێک لەو بنیاتەدا پووڵیان کۆ کردۆتەوە، حیزبی لیکوود پێوەندیی دەگەڵ گرتن و داوای لێکردن یان هێندێ پارە بدەن بە لیکوود یان ناوەکەیان دەخرێتە بەر چاوی هەمووان.

«ماکسوێڵ» لە کۆتایی ساڵەکانی دەیەی ١٩٨٠دا «پرۆمیس»ی تەنانەت بە یەکیەتیی سۆڤیەتیش فرۆشت. هەرچەند فرۆشتنی کامپیۆتەری پێشکەوتوو بە بلووکی خۆرهەڵات قەدەغە کرابوو، بەوحاڵە لە ساڵانی ١٩٨٦ و ١٩٨٧دا، ڕێگا بە کۆمپانیییەکی کامپیۆتەر بەناوی Trans-Capital Corportaion لە «نۆرواک» Norwalk لە ئەیالەتی کانکتیکت، درا، کامپیۆتەری پێشکەوتووی IBM بە شووڕەوی بفرۆشێ. بە دەرچوونی ئەم ڕێپێدانە، کۆمپانیی «دەگەم» ڕێی

یەکیەتیی کۆمارەکانی سۆڤیەتی بۆ کرایەوە. لە ڕاستیدا هەڵوەشانی قەدەغەی فرۆشتنی کامپیۆتەرە پێشکەوتووەکان بە سۆڤیەت بەهۆی «ڕابێرت گەیتس»ەوە ئەنجام درا. کاتێک سۆڤیەتەکان ئۆگرییان بە کڕینی «پرۆمیس» نیشان دا، کارناسانی کۆمپانیی «دەگەم» ئەویان بە «دۆر تەڵە»وە لە کامپیۆتەرەکانی IBMدا خستە کار. سەرەتای ساڵی ۱۹۹۱، پێش ئەو کودەتایەی بەدژی «میخاییل گۆرباچۆف» بەرپا کرا، ڕێکخراوی هەواڵگریی سوپای سۆڤیەت GRU، هێشتا بەهرەی لە «پرۆمیس»وەردەگرت. بەهەرحاڵ، «ماکسوێڵ» لە وەکارخستنی «دۆر تەڵە» لەو کامپیۆتەرانەدا کە ناردرانە شووڕەوی ئاگادار بووبێ یان نا، ئەو بە ناردنی کامپیۆتەرە ئەمریکایییەکان بۆ شووڕەوی، ئەمریکایییەکانی ڕاستەوخۆ لە نهێنییەکانی ڕێکخراوی هەواڵگریی سوپای سۆڤیەت ئاگادار کرد.

ئەمن لەو باوەڕەدام، کە یەکێک لە هۆیەکانی گیرانی من لە ساڵی ۱۹۸۹دا بەتۆمەتی هەڵبەستراوی فرۆشتنی کەرەسەی شەڕ، ئەوە بوو کە لەلایەن حکوومەتی ئیسرائیلەوە هەڕەشەم کردبوو کە ئەگەر ئەمریکا درێژە بە ناردنی کەرەسەی شیمیایی شەڕ بۆ سەددام حوسێن، سەرکۆماری عێراق بدا، بەرنامەی «پرۆمیس» و ئەوکارانە کە ئەمریکایییەکان لە دنیادا پێی دەکەن، بۆ هەموو خەڵکی دنیا لەقاو دەدەم.

«لی ڕایتر» Leigh Ratire کە دەگەڵ «دیکشتین» Dickstein و «شاپیرۆ» Shapiro لە واشینگتۆن خەریکی کاری پارێزەری (وکالت) بوو و لەلایەن کۆمپانیی «ئینسلاو» و «هامیلتۆن» و هاوسەرەکەیەوە بۆ بەرگری لەوان وەک پارێزەر دیاری کرابوو، کاتێک لە مەسەلەی «پرۆمیس» ئاگادار بوو، تووشی ڕووداوێکی سەرسوڕهێن بوو. بەوجۆرە کە گەورە شەریکەکانی لەنەکاو بانگیان کرد و ئامۆژگارییان کرد کە لە بەرگری لەو بابەتە و بەشداریی

قـانوونيى خـۆى بكشـێتەوە و لـە بەرامبـەردا، بـۆ مـاوەى پێنج سـاڵ، سـاڵانە ١٢٠٠٠٠ دۆلارى دەدەنـێ، بەومەرجـە لـەو ماوەيـەدا كـارى پـارێزەرى نـەكا. «ريتـز» هەميشـە لـەوە كـە هاوكارەكـانى، لەنـەكاو ئەويان لە ڕێكخراوێک دەركرد كە مـاوەى دە سـاڵ كـارى بۆ كردبوو، سەرى سوڕ مابوو و دەيزانى كە هۆى ئەو كارە دۆسيەى «ئينسلاو» بووە، بەڵام نێوەرۆكى ڕاستەقينەى مەسەلەكەى بۆ ڕوون نەبوو. پاش ئـەوەى «ريتـز» لـەو ڕێكخـراوە قانوونييـە دەركـرا، لـە پێشـينەيەكى دێرينـەى خـۆى لـە ڕێكخـراوى قـانوونيى جێـى باسـدا، يادداشـتێكى ديتـەوە كە هـى حەوتوويـەک پێش دەركرانـى بـوو و لـەو يادداشـتەدا، يەكێک لە جێگرانى داواكارى گشتيى ئـەمريكا ئامۆژگاريى يـەكێک لـە هاوكارەكـانى وى كردبـوو كـە «ريتـز» لـە ڕێكخراوەكـەى خۆيـان دەربكـەن. ئەمـە تـەنيا زانيـارى بـوو كـە«ريتـز» دەربـارەى دەركرانـى خۆى لەو ڕێكخراوە دەستى كەوتبوو.

«ريتز» ئاگاى لەو شتە نەبوو كە ئەمن دەيزانم. چەند حەوتوو پێش دەركرانى «ريتز» ئەمن چاوم بە بروسكەيەک كەوت كە لە ئەمريكاوە بـۆ كۆميتـەى هاوبـەش هـاتبوو. لـەو بروسـكەيەدا داوا كرابـوو بـڕى ٦٠٠٠٠٠ دۆلار لــــە «ســــەرمايەى ڕەش»ى ئيســــڕائيل و CIA بگوازرێتەوە بۆ كۆمپانيى «هادرۆن» كە سـەربە «ئـارل بريـان» بـوو. ئەو بروسكەيە نيشانى دەدا كە ئەو پووڵـە دەبـێ بـەهۆى «بريـان»ەوە بگوازرێتـەوە بـۆ ڕێكخـراوى قـانوونيى «ليۆنـارد گارمێنـت» Leonard Garment، «دى كشـتين» و «شـپيرۆ» و بـۆ دەركردنـى پـارێزەرێكى دۆسيەى «ئينسلاو» بە ناوى «لى ريتز» كەلكى لێوەرگيرێ. وا ديتـە بـەرچاو كـە هـۆى دەركردنـى «ريتـز» ئـەوە بـووە كـە ئـەو لـە ئەندازە بەدەر دڵسۆزى «ئينسلاو» بووە.

لـه حاڵێکـدا فرۆشـتنی «پـرۆمیس» لـه دەیـەی ١٩٨٠دا بـەهۆی کۆمیتەی هاوبەشەوە درێژەی هەبوو، ئەرکی گرنگی ئەو کۆمیتەیەش کە بریتی بوو لە فرۆشتنی کەرەسـەی شـەڕ بـە ئێران، لـە پەرەگرتندا بوو. کاری ئێمـە ئـەوە بـوو کـە عەمـەلیاتی دنیا بۆ کڕین و فرۆشـتنی کەرەسەی جەنگی و سـەرەنجام فرۆشـتنی بـە ئێران، بۆ دابینکردنـی پێداویسـتییە جەنگییـەکانی ئـەم وڵاتـە هاوهـەنگاو بکـەین و ئەمـەش کـارێکی ئاسـان نـەبوو. کاتێـک سـاڵی ١٩٨٣ «ئیسـحاق شـامیر» بـە سەرۆکوەزیری ئیسرائیل هەڵبژێردرا، ئێمـە توانیمـان عەمەلیاتەکـەمان بگەیەنینـە بـازاڕێکی تـازە و پێشـبینینـەکراو، بـەڵام هاوکـار، کـە بریتـی بـوو لـە بلـووکی خۆرهـەڵات، پەرە پـێبـدەین. زۆر سـەیر بـوو کـە «ڕابێرت ماکسوێل»یش ڕۆڵێکی گرنگی لەو عەمەلیاتەدا یاری کرد.

بۆ ئەوەی باشتر بتوانین ئـەو بابەتـە تـێبگـەین، پێویسـتە «ئیسـحاق شامیر» باشتر بناسین.

بە پێچەوانەی «مەناخیم بگین» و ڕێبـەرانی دیکـەی حیزبی کرێکـار کە پێشـتر حکوومـەتی ئیسـرائیلیان لەدەسـتدا بـووە، «شـامیر» ڕقێکـی زۆری لە ئەمریکا و هـەرچی سـەر بـەو وڵاتـە بـێ، هەیـە. پێش ئـەوەی ساڵی ١٩٨١ ئەو بکرێتە وەزیری دەرەوەی ئیسـرائیل، تـەنیا یـەک جـار و ئەویش تەنیا بۆ ماوەی سێ ڕۆژ سەردانی ئەمریکای کردبوو. هۆی قینی توندی «شـامیر» لـە ئـەمریکا ئەوەیە کە پێیوایە ئـەم وڵاتـە تـا ڕادەیەکی زۆر بەرپرسی کوشتاری بەکۆمەڵی جوولەکەکان بەدەسـتی نازییـەکان لـە شـەڕی دووەمـی جیهانیدایـە. چونکـە «شـامیر» لـەو بڕوایەدایـە کـە ئەگـەر ئـەمریکا چـاوی لـە قازانجـەکانی بریتانیـا لـە خۆرهـەڵاتی نێوەڕاسـت پۆشـیبایە و دەگـەڵ هیتلـەر لـەبارەی ئـەو ناوچەیـەوە گەیشـتبایە ڕێککەوتنێک، ڕێگـا بـە جوولـەکەکانی ئورووپـا دەدرا لە ئۆردووگاکانی خۆیانەوە کۆچ بکەن بۆ فەلەستین و هیتلـەر

بێ لەنێوبردنی جوولەکەکان دەیتوانی کێشەی «مووسایی‌گەری» چارەسەر بکا.

هەرچەند «شامیر» بە سیاسەتمەدارێکی دەستەڕاستی و لایەنگری سەرمایەداری ناسراوە، بەڵام بەپێچەوانەی ئەو ناوبانگە، ئەو یەکەمین کەس بوو کە هەوڵی دا هێڵێکی پێوەندی لەنێوان ئیسرائیل و بلووکی خۆرهەڵاتدا دروست بکا. «شامیر» یەکەم هەنگاوی ئەم سیاسەتە ڕادیکاڵەی لە سەرەتای ساڵەکانی دەیەی ۱۹۸۰دا کاتێک ئەو وەزیری کاروباری دەرەوەی ئیسرائیل بوو و لە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان چاوی بە هاوتا بولگارییەکەی کەوت، هەڵێنایەوە. نێوبژیوانی نێوان «شامیر» و هاوتا بولگارییەکەی، «ڕابێرت ماکسوێل» بوو. وەزیری دەرەوەی بولگاریا زوو بۆی دەرکەوت کە هاوسەری «شامیر» خەڵکی سۆفیایە و حەز دەکا جارێکی دیکە سەر لەو وڵاتە بدا. بۆ سەفەری هاوسەری «شامیر» بۆ سۆفیا ڤیزایەک ئامادە کرا و کاتێک ئەو گەڕایەوە ئیسرائیل، گوێی مێردەکەی پڕ کرد لەو میهرەبانییە کە خانەخوێیەکانی دەگەڵیان نواندبوو. ساڵی ۱۹۸۳ کە «شامیر» چووە سەر کورسیی سەرۆکوەزیریی ئیسرائیل بڕیاری دا کە دەرگای بلووکی خۆرهەڵات بە ڕووی ئیسرائیلدا بکاتەوە و کۆتایی بە بەسترانەوەی تەواوی ئیسرائیل بە ئەمریکا بێنێ. دیارە دواتر دەرکەوت کە ئازادکردنی ئیسرائیل لە بەستراوەیی بە ئەمریکا، کارێکی نامومکینە.

بەهەر حاڵ، کاتێک «شامیر» کۆنترۆڵی ئیسرائیلی بەدەستەوە گرت، حیزبی لیکوود بە تەواوی بوو بە لایەنگری پێوەندی دەگەڵ بلووکی خۆرهەڵات، لەحاڵێکدا حیزبی سۆسیالیستی کرێکار بەتەواوی موخالیفی ئەو باوەڕە بوو. بە نیوەکرانەوەی دەروازەی پێوەندیی نێوان ئیسرائیل و بلووکی خۆرهەڵات، ئیسرائیل هەوڵی دا لەو

دەرفەتانە کە بۆ موعامەلەی تازەی کەرەسەی جەنگی دەگەڵ بلووکی خۆرهەڵات هەبوون، بەهرە وەرگریّ.

ساڵی ١٩٨٤، «ڤیکتۆر چریکۆف»، سەرۆکی KGB نەزەری لەبارەی دامەزراندنی پێوەندی لە نێوان ئیسرائیل و بلووکی خۆرهەڵاتدا ئەرێنی بوو و ئۆگریی خۆی بە جموجۆڵێکی تازە کە لە دامەزراندنی پێوەندی لە نێوان ئیسرائیل و بلووکی خۆرهەڵاتدا خەریکی گەشەکردن بوو، دەربڕی. قازانجی سۆڤیەتەکان لەوەدا بوو کە تەندووری شەڕی نێوان ئێران و عێراق گەرم ڕاگرن، عێراقییەکان بە چەکوچۆڵەی شەڕ تەیار بکەن و پارەی عەرەبەکان بۆلای خۆیان ڕاکێشن. بەڵام، بۆ ڕاگرتنی حاڵەتی شەڕ لەنێوان ئێران و عێراقدا، چریکۆف تێگەیشت کە شووڕەوی دەبیّ چەک بدا بە ئێرانییەکانیش. ئەو باوەڕی وابوو کە سیاسەتی پێشووی شووڕەوی لە دووری لە ئیسرائیل، یەکلایەنە بووە و بە دامەزراندنی پێوەندی دەگەڵ ئیسرائیل دەتوانریّ زۆر دەرفەت بەدەست بێن.

هەرچەند سۆڤیەتەکان بە شێوەی نەریتی پشتی عەرەبەکانیان دەگرت، بەڵام لەو کاتەدا بڕیاریان دابوو خۆیان تووشی هێندیّ سیاسەتی خەیاڵی بکەن. سۆڤیەتەکان پێیان وابوو کەس ناتوانیّ بزانیّ کە ئەوان کەرەسەی شەڕ بە ئێران دەفرۆشن، چونکە لەلایەک ئەوان پێشتر کەرەسە جەنگییەکانیان بەرەو عێراق وەڕێ خستبوون و لەلای دیکە، وەک ئەمریکایییەکان لەو باوەڕەدا بوون کە بۆ فرۆشتنی چەک بە ئێران دەبیّ کەلک لە وڵاتێکی سێیەم وەربگرن و بۆ ئەم ئامانجە لەهیستان دەیتوانی وڵاتێکی دڵخواز بیّ. چونکە ئەمکارە هەم کۆمەگی بە ئابووریی شڕ و شەپرێوی لەهیستان دەکرد و هەمیش سۆڤیەتەکان پێیان خۆش بوو، لە خۆرهەڵاتی نێوەڕاست پارسەنگی سیاسەت بە نزیکبوونەوە لە ئیسرائیل بپارێزن. چونکە پێیان وابوو هەمیشە لە خۆرهەڵاتی نێوەڕاست مەترسییەک لەسەر چاڵە

نەوتەکانی عەرەبستانی سعوودی هەیە. بۆیە «ڤیکتۆر چریکۆف» ڕازی بوو کە وەزیری بازرگانیی لەهیستان بۆ فرۆشتنی کەرەسەی جەنگی بە ئێران دەگەڵ ئیسرائیل بکەوێتە گفتوگۆ.

هەر لەو سەروبەندەدا بوو کە ئەمن دەگەڵ هاونیشتمانێکی ئوتریشی بەناوی دوکتۆر «دیتێر ڕابووس» Dieter Rabus کە زاوای سەرۆکی کارخانەی بەرهەمهێنانی ماتۆڕی تانکی T_72 بوو یەکترمان دیت. «ڕابووس» ئاشنای «ڕابێرت ماکسوێڵ» بوو و ئەم دووانە بۆ دامەزراندنی پێوەندیی سیاسی لە نێوان ئیسرائیل و لەهیستاندا کاردروستایی پێویستیان کرد. «ماکسوێڵ» تەنانەت گفتوگۆی دەگەڵ ژەنراڵ «وۆیچەک یارووزلسکی» Wojciech Jaruzelski وەزیری بەرگریی لەهیستانیش کرد و سەرەتای ساڵی ١٩٨٤، «نیکۆلا دیڤیس»یش لەسەر داوای ئێمە بە فڕۆکە چووە لەهیستان.

«نیکۆلا دیڤیس» دەگەڵ نوێنەری Cenzin کە ئیدارەی ناردنەدەرەوەی کەرەسەی جەنگی لە وەزارەتی بازرگانیی دەرەوەی لەهیستانە، لە فڕۆکەخانە دیدارێکی درێژی پێکهێنا. لەم دیدارەدا کە سێ سەعاتی خایاند، «دیڤیس» چاوپێکەوتنی من و لەهیستانییەکانی ڕێکخست.

ساڵی ١٩٨٤، ئەمن بۆ یەکەمجار بە ڕێگای ڤییەندا بە فڕۆکە چوومە لەهیستان. کاتێک گەیشتمە لەهیستان، سەرگوردێک کە سەربە ڕێکخراوی هەواڵگریی لەهیستان UB بوو، لەبەر پلیکانی فڕۆکەکە چاوی بە من کەوت. ئەمن ڤیزای لەهیستانم نەبوو و دەسبەجێ گوتم کە پێم خۆش نیە، مۆری لەهیستان لە پاسپۆرتەکەم بدرێ. ئێمە بەهیچجۆر حەزمان نەدەکرد، کارمەندی وڵاتێکی دیکە مۆری لەهیستان لەسەر پاسپۆرتی من ببینێ و پەی بە دامەزرانی پێوەندی لە نێوان ئیسرائیل و لەهیستاندا بەرێ. بەپێچەوانەی وڵاتانی دیکە،

ئــەمن نەپشــكنرام و هــەروەها نەيانبردمــە شــوێنی تایبــەتیی لێوردبوونــەوە و کـۆنترۆڵی پاســپۆرت. بـەڵکوو کـارتێکی ئیـدارەی کۆچیان دامێ و مۆریان کرد و بە پاسپۆرتەکەمیانەوە چەسپاند.

لەهیسـتان لـەو کاتـەدا تـاریکترین ڕۆژەکـانی خـۆی تێپـەڕ دەکـرد. بزووتنـەوەی «هاوپێوەنـدی» Solidarity بەشـێوەی کـاتی سـەرکوت کرابوو و فرۆکەخانە پڕ لە سەرباز بوو.

لیمۆزینی مـن لـە بەرامبـەر هۆتێلی ئینتەرکۆنتینانتـاڵ کـە هـەموان پێیان وابوو باشترین هۆتێلە، ڕاوەستا. کاتێک ڕۆتێنیـاتی ناونووسـینم تەواو بوو و کلیلی ژوورەکەمم وەرگرت، دیتم سەرگورد بە هەژانـەوە وا دیارە چاوەڕێی ڕووداوێکە. پێشتر ئەمن فێر کرابووم کـە هەرکـەس لــەو ســەفەرەدا یارمــەتیم دەدا دەبــێ بەخشش‌ــی بــدەمێ. بــەڵام ســەرگوردێک کـە فەرمانبـەری ڕێکخـراوی هـەواڵگریی UBیـە دەبـێ چەندی بەخشش بدرێتێ؟

هـەرچۆنێک بێ ئەسکیناسێکی ۲۰ دۆلاریـم لـە مسـتی نـا. ئـەم کـارە کـەموزۆر ئـەوی خسـتە حاڵـەتی گەشـکەوە. دەتگـوت دەیـەوێ خـاکی بـەرپێم مـاچ بکـا. لەحاڵێکدا بریسکەی شـادی بـە سـەروڕوویەوە دیـار بوو، منی بەجێ هێشت.

بـە دیتنـی کـردەوە و ڕەفتـاری کارمەنـدانی هـەواڵگریی لەهیسـتان گەیشتمە ئەو باوەڕە کە جاسووسە لەهیستانییەکان لـە کاری خۆیاندا لێزانی و کارامەیی پێویستیان نیە. ئەوان لە دیوارێکی ژوورەکـەی مـن لـە هۆتێل کـە لـە پـەنا قەرەوێڵەکـەم بـوو، دووربینێکی جاسووسـییان دانـابوو، بـەجۆرێک کـە لـە کونێکی چووکەڵـەی دیوارەکـەوە بـە باشـی دەمتـوانی لێنـزی دووربینـە جاسووسـییەکە ببینـم. دیـارە بـوونی ئـەو لێنزە زۆری مـن ناڕەحـەت نـەکرد، بـەڵام لێنـزی دوربینێـک کـە ڕووی کرابـووە شـوێنی دانیشـتنی ئاودەسـت، شـتێک نـەبوو بتـوانم لێـی

بگوزەرێم. بۆیە ئەو کونەم کە لێنزی دووربینەکەی تێدا دانرابوو، بە کوتەکاغەزێک داپۆشی.

خانەخوێی من ئەو شەوە ژەنراڵێک بوو کە سەرۆکایەتیی بەرهەمهێنانە سەربازییەکانی وەزارەتی بەرگریی بەئەستۆوە بوو. ئێمە چووینە یەکێک لەو چەند ڕێستوورانە کە تایبەتی میوانە بێگانەکان بوون. قەرار بوو خواردنی ڕێستوورانەکە بەشێوەی فەڕانسەیی ئامادە کرابێ. بەڵام ئەوەندە لە ڕۆندا سوور کرابۆوە کە خواردنی ئاسان نەبوو. وا دیار بوو هەستی چەشتنی ژەنراڵ دەگەڵ هی من فەرقی هەبوو. ئەو «سلیڤۆڤیچ» Slivovitchێکی بە گەروویدا ڕۆهێشتە خوار و دوایە نیزیک بە دە دەقیقە سەرخۆش بوو.

پاش تەواوبوونی نانخواردنەکە، حیسابەکەیان بۆ هێناین کە دەوری ٤ دۆلار بوو. ئەمن خەریک بووم حیسابەکە بدەم کە ژەنراڵ لەنەکاو دەستی بە نیشانەی نارەزایی لە حیسابەکە، هەڵێنا.

لەپێشدا گوتی: «نا،نا.» و دوایە لێی پرسیم: «یەکدۆلارییەکت پێیە؟»

ئەمن یەکدۆلارییەکم دایە، ئەو بە دەرگایەکی لاوەکیدا چووە دەرێ و پاش چەند سائێک هاتەوە و گوتی، یەکدۆلارییەکەی داوە بە بەڕێوەبەری ڕێستوورانەکە و لە ئاکامدا ئەو لیستی حیسابەکەی دڕاندوە. ژەنراڵ لێی زیاد کرد کە مووچەی بەڕێوەبەری ڕێستوورانەکە لە مانگدا تەنیا ١٠ دۆلارە.

سیستمی پەروەردە و فێرکردنی لەهیستان و خزمەتە پزیشکییەکانی باش بوو، بەڵام عەیبەکەی ئەوە بوو کە ئەم وڵاتە کۆمەڵگەیەکی هەژاریلێدراو بوو و هەرکەس لە باری ئەخلاقی و ماددییەوە دەیەویست گوێی ئەوی دیکە ببڕێ. بۆ خەڵکی بێگانە لەهیستان بەڕاستی بەهەشت بوو. ئەگەر داوا لە ژنێک بکەی ئادرەسێکت نیشان بدا، ئەو پێتەوە دەچەسپێ و ئیدی دەستبەردارت نابێ. دیارە بەو

لێنـزە دووربینانـەوە کـە لـە ژووری هۆتێلەکـەمم دیـتن، ئـەمن پـەلم نەبزاوت، چونکە نەمدەویست خۆم بخەمە مەترسییەوە.

ڕۆژێکیـان لـە وەختێکدا دەگـەڵ کارمەنـدە ڕەسـمییەکانی وەزارەتـی بەرگری لە گفتوگۆدا بووم، زۆرم ئیشتیای میوە کرد. خانەخوێیەکانم گوتیان تەنیا جێیەک کە دەتوانم میوەی لێ پەیدا بکەم بازاڕی ڕەشـە. ژەنراڵ پێشنیاری کرد، بمبا بۆ وێ. هەرچەنـد سـەردانی مـن لـە وڵاتـی لەهیستان لە لایەن کاربەدەستانی ڕەسمییەوە پەسند کرابوو، بەوحاڵـە پێم وایە لە هەموو جێیەک کارمەندە ئەمنیەتییەکان بەدوامـەوە بوون. بازاڕی ڕەش، جێیەک بوو کە لەهیستانییە موحتاجەکان دارایی‌یەکانی خۆیان بۆ فرۆشتن دەبردە وێ. خانەخوێیەکەم پێی گوتم، ئەو کالایانـە کـە بـەتازەیی لێـرە بـۆ فرۆشـتن دادەنـرێن، وەک کـڵاوی بەقیمـەتی چـەرمی و دەزگـای تەلـەڤیزیۆن، هـەموو لـە کارخانـەکان دزراون. لـەم بـازاڕە خاویـارێکیش کـە ئـەو لەهیسـتانییانەی لـە شـوورەوی کاریـان کردبـوو، دزیبوویـان، بـۆ فرۆشـتن دانرابـوو. لـە بگرەوبـەردەی ئـەم بازاڕە شێواوەدا، لەپڕ چاوم بە ژنێک کەوت کە دەیەویست دووجین (دەرزەن)ێک پرتـەقاڵ بفرۆشـێ کە مێردەکەی لـە ئیسـپانیاوە بـەقاچاغ هێنـابووی. ژنەکـە بـە کۆمـەگی ژەنـراڵ لێـی‌پرسـیم داخـوا دەمـەوێ نیوپرتـەقاڵ یـان پرتـەقاڵێکی سـاغ بکـڕم. گـوتم، حـەز دەکـەم هـەموو پرتەقاڵـەکانی بـە پێـنج دۆلار لەسـەریەک لـێ‌بکـڕم. بـەبێ‌شـک پرتەقاڵفرۆشەکە بە دیتنی ئەو کارە بۆ هەموو تەمەنی منی بە دۆستی خۆی قبووڵ کردبوو.

ئەگەر کەسێک شارەزا بێ و بتوانێ دراوی بیانی(ئەرز) بـە کەسێکی کارکوشتە بفرۆشـێ، بەوکارە دەتوانێ بە شـەوێک پارەیەکی یـەکجار زۆر پەیدا بکا. کێشەی کار بۆ ئێمەی گەڕیدە ئەوەیە کە نـاتوانن کـەلک لـە بـازاڕی ڕەش وەربگـرن. کاتێک کەسـێک بـە سـەردان دەچێتـە ئـەو وڵاتـە دەبـێ ڕابگـەیـەنێ چەنـدی دۆلار پێیـە و کـاتێکیش دەڕوا دەبـێ

ڕابگەیەنێ چەندی پێماوە. ئەگەر کەسێک کاتی چوونەدەر لەو وڵاتە ڕابگەیەنێ کە کەمێک دۆلاری بە نرخی ڕەسمی بە پارەی ئەو وڵاتە گۆڕیوەتەوە، کارمەندە دەوڵەتییەکان وا دەزانن کە ئەو کەسە لە بازاڕی ڕەش «زلۆوتی»ی کڕیوە و کێشەی بۆ دروست دەبێ. نرخی ڕەسمیی دۆلار ٢٠٠ زلۆوتی و نرخی نارەسمیی لە بازاڕی ڕەش دەوری ١١٠٠ زلۆوتییە. ژەنراڵ وەک ڕیزپەڕ (استثنا) کارتێکی بۆ من ساز کرد کە بە هۆی ئەوەوە دەمتوانی هەرچییەک بکڕم نرخەکەی بە زلۆوتی بدەم. ئەو هەروەها موعامەلەیەکی تایبەتییشی بۆ من ڕێک-خست. بەوجۆرە کە هەر دۆلارێکی بە ١٠٠٠ زلۆوتی لە من دەکڕی و پاشان لە بازاڕی ڕەش بە ١١٠٠ زلۆوتی دەیفرۆشتەوە و سوودەکەی بۆخۆی هەڵدەگرت. ئەو کارتە تەنیا دەدرا بە کەسانێکی تایبەتی. بە پێچەوانەی بێگانەکانی دیکە ئەمن دەمتوانی بەو کارتە نرخی بلیتەکانی فڕۆکە و خەرجی هۆتێل بە زلۆوتی بدەم. بە لەبەرچاوگرتنی ئەوە کە بلیتەکانی فڕۆکە بە کۆمەگی ماڵیی دەوڵەت بەڕێوە دەچوون، ئەمن بلیتی هەرجۆرە فڕۆکەیەکم ویستبا دەمتوانی بیکڕم. بۆ نموونە، ئەمن دەمتوانی بلیتێکی هێڵی هەوایی ئوتریش لە وارشۆ بۆ ڤییەن، لەوێوە بۆ نیۆیۆرک و گەڕانەوە لە نیۆیۆرکەوە بۆ ڤییەن و وارشۆ بکڕم و بۆ هەمووی ئەمانە تەنیا ٢٥٠ دۆلار بدەم. چونکە ئەو نرخەش بە زلۆوتی دەدرا، و زلۆتییش لە بازاڕی ڕەش هەرزان بوو، نرخی بلیتێکی دووسەرەی وارشۆ، ڤییەن، نیۆیۆرک و گەڕانەوە کەمتر لە ٥٠ دۆلار تەواو دەبوو.

لە یەکەم سەفەردا، ئەمن توانیم پێوەندییەکی گەرم دەگەڵ کۆمەڵێک لە کارمەندە دەوڵەتییەکانی لەهیستان دامەزرێنم. لەو سەفەرەدا پێم-گوتن کە ئێمە دەمانەوێ ژمارەیەک گوللە (کاتیووشا)ی دروستکراوی شووڕەوی لەوان بکڕین. سەفەری دواتری من بۆ لەهیستان، کەوتە دیسامبری ١٩٨٤ و زستانی زۆر ساردی وێ. لەحاڵێکدا بەفرێکی

قورس زەوی و ئاسمانی لێک دابوون، خانەخوێیەکانم میواندارییەکی زۆر گەرمیان لێکردم و گوتیان بەنیازن ئەو کارخانەیە کە کەلاشینکۆفی AK-47 دروست دەکا وەک یەکەمهەنگاوی موعامەلە، بە من نیشان بدەن. ئێمە حەزمان دەکرد کاتیووشا بکڕین، بەڵام بێگومان ئێرانییەکان دەیانتوانی لە چەکی کەلاشینکۆفیش کەلک وەرگرن. ئێرانییەکان بە کڕینی هەر شتێک دەنگی تەقەی لیهاتبایە ڕازی و خۆشحاڵ دەبوون.

کارخانەی کەلاشینکۆفسازی لە شاری «ڕادۆم» Radom دەوری ٨٠ کیلۆمیتر دوور لە وارشۆ هەڵکەوتبوو. ئەمن پێم وابوو ئەو سەفەرە دەوری سەعاتونیوێک دەخایەنێ. وەختێک ئەو باوەڕەم دەربڕی، ژەنراڵ و پارێزەر و شۆفێری مارسدسەکە کەوتنە پێکەنین. ئەمن زوو هۆی پێکەنینەکەیانم بۆ دەرکەوت. یەکەم ئەوە کە گازۆئیلی ترومبێلەکە لە هەوای ژێر سفردا بەستبووی و ئەوان دەبوو چراگازێکی چووکەڵە لەژێر ماتۆڕەکە دانێن هەتا دیزڵە بەستووەکە خاو بێتەوە، پاشان ئێمە دەبوو بە خێراییەکی زۆرکەم بەسەر ئەو جادە پڕبەفرەدا بڕۆین و دیارە لە ڕێگادا تووشی زۆر پۆستی لێپرسینی پۆلیسیش دەبووین.

ئەمن پرسیم: «داخوا لە ڕێگایە دوکان یان ڕێستوورانێک هەیە کە بتوانم پاکەتە جگەرەیەک بکڕم؟»

دووبارە لە قاقای پێکەنینیان دا. ژەنراڵ گوتی: «ئەتۆ پێتوایە لە کوێی، لە ئەمریکای؟»

سەفەر بۆ کارخانەی ناوبراو چوار سەعاتی کێشا. «ڕادۆم» شوێنی وێککەوتنەوەی هێڵەکانی ڕێگای ئاسن بوو و شەپۆلە دووکەڵ لە دووکەڵکێشەکانی کارخانەوە دەچوونە ئاسمان. هەرچی دەتدی، تەنانەت بەفری ئەو شارەش ڕەنگی خۆڵەمێشی گرتبوو. پیاوێکی زۆر قەڵەو و بەخۆوە کە خۆی وەک بەڕێوەبەری کارخانە بەمن ناساند،

بەپیلمـەوە هـات. پاشـان بـۆم دەرکـەوت کـە ئـەو پیـاوە سـەرۆکی کۆمیتەی حیزبی کۆمۆنیست لەو ناوچەیەشە. ئەو زمانی ئینگلیزیی نەدەزانی و بە زمانی ئینگلیزی هەر ئەوەندەی دەزانی بڵێ: «بەخێر بێی، بەخێر بێی، بەخێر بێی...»

ئەمن سێ شووشە ویسکیی Johny Walkerم پێبوون پێشکەشم کردن، پاشان ئەو ڕێنوێنیی کردم بۆ ژوورێکی گەورە. وەرگێڕەکە ڕوونی کردەوە کە ئەو ژوورە «ژووری دیارییەکان»ە. ژوورەکە پڕ بوو لە قەوەزە کە هەموویان پڕ بوون لە ویسکی.

ئەو گوتی: «ئەمانە دیاریی دۆستەکانمانن، بەڵام هیچیان هی ڕووسیا نین. ڕووسەکان شتێکی وا دەگەڵ خۆیان نایەنن کە بۆ ڕاگرتن بشێ».

چەسپێکی لە لایەکی شووشە ویسکییەکانی من دا کە لێی نووسرابوو «ئیسرائیل». بەستەکانی دیکە چەسپێکیان لێدرابوو کە بە زمانی لەهیستانی لێیان نووسرابوو، ئەڵمان، فەڕانسە، لیبیا، و سووریا. ئەو نووسراوانە زۆر شتیان بە بنیادەم دەگوت. لەوانڕا بنیادەم دەیتوانی تێبگا چکەسانێک موعامەلەی دەگەڵ دەکەن.

ئەویش چوار شووشە سلیۆڤیچی دەگەڵ خۆی هێنابوون کە لێیان نووسرابوو -براندیی بەهێزی هەڵووجە- و ئێمەی ڕێنوێنی کرد بۆ ژووری نانخواردن. شۆفێر و پارێزەری ژەنڕاڵ لە هۆڵەکە مانەوە. لە ژووری نانخواردن مێزێکیان ڕازاندبۆوە کە پڕ بوو لە گۆشت و خواردنی دەریایی و دەیتوانی دە بنەماڵەی لەهیستانی بۆ ماوەی حەوتوویەک بژیەنێ. ئەمن لەپەنای بەڕێوەبەری بەرهەم کە بە زمانی ئینگلیزی دەدوا دانیشتم، بەڕێوەبەر و ژەنڕاڵ لە ڕووبەڕووی من دانیشتبوون.

لە ماوەی ۱۵ دەقیقەدا، ژەنڕاڵ و هاوڕێ حیزبییەکەی، دوو شووشەیان بە گەروویاندا کرد. لەوکاتەدا ئەمن دەگەڵ بەڕێوەبەری

بەرهەم کە پیاوێکی ماقووڵ دیار بوو و بە ڕەوانی بە زمانی ئینگلیزی دەدوا، خەریکی قسەکردن بووم. ئەو لەبارەی باروودۆخی کارخانەکەوە ڕوونکردنەوەی دەدامێ. بەو جۆرە کە زۆر لە دانیشتووانی «ڕادۆم» لەو کارخانەیە خەریکی کار بوون. ئەو ڕووی کردە ژنێکی هاوکاری کە لە دەوری مێزەکە هەڵدەسووڕا و ئەرکی ئەوە بوو وریا بێ کە هەموو پێویستییەکانی ئێمە لەسەر مێزی نانخواردن ئامادە بن، و داوای لێکرد دەزگایەکی نووسین (تایپ) بێنێ. چەند دەقیقە دواتر، تایپێکی زەردی کاڵ لەبەر دەمی من دانرا.

لەپێشدا پێم وا بوو، ئەوان دەیانەوێ تایپێکی کۆنە بەمن نیشان بدەن. بۆیە پرسیارم کرد: «ئێوە مۆدێلی تازەی ئەم دەزگایەش بەرهەم دێنن؟»

بەڕێوەبەری بەرهەم بە خۆڕانانەوە گوتی: «ئەمە تازەترین ماشێنە کە لەم کارخانەیەدا بەرهەم دێ و هەر ئێستا لە خەتی بەرهەم هاتۆتە دەر. ئەم دەزگایانە لە سەرانسەری لەهیستان لایەنگریان زۆرە».

کاتێک پرسیارم لە ماشێنی کامپیۆتەریی نووسین کرد، ئەو گوتی ئەو ماشێنانە باش نین، چونکە جێی متمانە نین. ماشێنەکانی نووسینی دروستکراوی لەهیستان باشترین جۆری ماشێنی نووسینن و هەموو کەس ئەوانە دەکڕێ. ئەو لێی زیاد کرد کە هیچکەس حەز لە مۆدێلەکانی دیکەی ماشێنی نووسین ناکا و ئەمن زوو تێگەیشتم بۆ، چونکە ئەمە تەنیا مۆدێل بوو کە لە لەهیستان بەرهەم دەهات.

بەڕێوەبەری بەرهەم لەحاڵێکدا تایپەکەی بە نێو قاپەکانی نانخواردندا بۆلای من پاڵ پێوە دەنا، گوتی: «فەرموو، ئەمە دیاریی ئێمە بۆ ئێوەیە» پێویست نەبوو بپرسم داخوا ئەو مەکینەی دروومانانە کە ئەو کارخانەیە دروستی کردوون، کارەبایین یان نا. چونکە پێداڵەکانیانم لەبەر چاو بوون.

ئێمە ئاخرەکەی لەسەر موعامەلەی کەلاشینکۆف کەوتینە گفتوگۆ. ئەمن نموونەیەکیانم لە نیزیکەوە دیت و هەرلەوێ، ١٠٠٠٠٠ کەلاشینکۆفمان موعامەلە کرد. ئەمن قیمەتی هەر دانەیەکم لە ٩٥ دۆلارەوە هێنایە خوار بۆ ٨١ دۆلارونیو. بەڕاستی موعامەلەیەکی زۆر هەرزان بوو -هەرکام لەوان کەلوپەلی خاوێنکردنەوە و دوو خەشابی بەتاڵیان دەگەڵ بوو. ئەوانە هەرزانترین کەلاشینکۆف بوون کە تا ئێستا کڕیبوومانن.

ئێستا کارخانەکە دەبوو ڕەزامەندیی «سێنزین» Cenzin یان ئیدارەی هەناردەکردنی کەرەسەی شەڕ بۆ ئەو سەودایە بەدەست بێنێ. بەڵام، من دڵنیا کرام کە هەتا کڕیار هەبێ و پارەی کالایەکە بدرێ و کارمەندە پێوەندیدارەکان بتوانن بەشی خۆیان لە پارەی کالاکان هەڵبگرن، نرخی کالاکان بایەخی نابێ.

دەوری سەعات سێی پاش نیوەڕۆ، لەحاڵێکدا کاری سەودایەکە تەواو ببوو و پیاوە قەڵەوەکە و ژەنراڵ بەپێوە هاواریان دەکرد -بژی ئیسڕائیل- و چەند جار بەمنیان گوتبوو کە ئێستا ئیسڕائیل و لەهیستان بوونە خزمی خوێنی، بڕیارم دا ئەوێ بەجێ بێڵم. لەهیستانییەکان لەکۆنەوە هەستی دژی یەهوودییان هەبوو، بەڵام وا دەهاتە بەرچاو کە لەوکاتەدا هەستی دژی یەهوودی لەبیر کرابوو. بەهەرحاڵ، ژەنراڵ دەستووری بە ئیدارەی ئاگرکووژاندنەوەی شوێنەکە دا، دوا قتووی دژەسەهۆڵی خۆی بنێرێتە کارخانە تا «لەبەر خاتری میوانە بەڕێزەکەمان» شۆفێری مارسدسەکە بیکاتە ترۆمبێلەکەی و ئێمە لەو هەموو نارەحەتییەی گەڕانەوە بۆ وارشۆ ڕزگار بین.

ئەمن پرسیارم کرد: ئەگەر ئاگرکەوتنەوە ڕوو بدا، چدەبێ؟»

بەڕێوەبەری بەرهەم گوتی: «ئەگەر ئاگر بکەوێتەوە، دانیشتووانی شوێنی ئاگرکەوتنەوە لەبەر ئەوەی ئیدارەی ئاگرکووژاندنەوە

دژەسـەهۆڵی نـەبووە، و وردەکـاریی پێویسـتیان بـۆ پێشـگرتن بـە ئاگرکەوتنەوەکە بەکار نەبردوە، دەکەونە زیندان.»

پـاش ئـەوەی دژەسـەهۆڵ لـە ترومبێلەکـە کرا، لەحاڵێکدا کـراوات (بۆینباغ)ێـک بـە مـارکی «پیشەسـازیی ڕادۆم» لـە ملـم و ئـاڵبۆمێکی وێنەی «پیشەسازیی ڕادۆم» لەبن قۆڵم و ماشێنێکی زەردی نووسین لەسـەر ئـەژنۆم بـوو، بـەرەو وارشـۆ وەڕێ کـەوتین. وا دیـارە ئـەمن شانسـم نیـە بـە ترومبێلـی خـەڵکی دیکـە سـەفەر بکـەم. پـاش ئـەوەی دەوری ٣٠میل ڕۆیشتین، ترومبێل خـەراپ بوو. ڕەنگـە هـۆی خـەراپ-بوونی ترومبێلە مارسدسەکە ئەوە بووبێ کە فێری دژەسەهۆڵ نەبوو. هەرچۆنی بێ، و هۆی تێکچوونی ترومبێلەکە هەرچییەک بوو، ئێمـە لـە سـەر جادەیـەکی بەبەفرداپۆشـراو ماتڵ ماینـەوە. بـەڵام، وا دیـار بـوو مەسەلەکە بۆ ژەنڕاڵ کە ئەویش لەبەفردا گیری کردبوو، گرنگ نەبوو.

ئەو بـە مەسـتی، پێشـی بـە یەکـەمین ترومبێل کـە بەوێـدا تێدەپـەڕی گرت و بە نیشاندانی کارتی پێناسی خۆی بە شۆفێری سەرسـوڕماوی گـوت پێویسـتییەکی سـەربازی هاتۆتـە پـێش و فـەرمانی پێکـرد کـە بمانباتـەوە وارشـۆ. ئـەمن و ژەنـڕاڵ بـەو ترومبێلـە بـەرەو وارشـۆ کەوتینـە ڕێ. بـەڵام شـۆفێری مارسدسـەکە و پارێزەرەکـەی ژەنڕاڵ و تایپە زەردەکە بە مارسدسە لەکارکەوتووەکەوە مانەوە.

ئەمن سەرم بردە بن گوێی پارێزەرە خۆشحاڵەکەی ژەنڕاڵ و گوتم: «ئـەویش بۆخـۆت». گومـانی تێدا نـەبوو کـە بـە زوویـی بـۆ فرۆشـتن دەیبردە بازاڕی ڕەش.

ئـەمن ٢٠ دۆلار بەخشـشـم دا بـەو شـۆفێرە کـە ئێمـەی دەبـردەوە وارشۆ و چونکە لـە گەڕانـەوەی لـە وارشـۆدا لەوانـە بـوو پۆلیس لێی بپرسێ کە بۆچی بە ترومبێلێک کە ژمارەی «ڕادۆم»ی لەسەرە چۆتـە وارشۆ، ژەنڕاڵیش پسوولەیەکی دایـە کـە کـاتی گەڕانـەوە بـۆ «ڕادۆم»

بــه بنكــەكانی پۆلیســی نیشــان بـدا و بــەوجۆرە پـۆلیس كێشــەی بـۆ دروست نەكا.

له لەهیستان به پاره هەموو كارێک دەكرێ، تەنانەت دەتوانی خانمی بەرپرسی تەلەفونی هۆتێلیش به پاره بكرِی. لـه هۆتێلەكەی مـن تـەنیا هێڵێكی نێونەتەوەیی هەبوو، و ئەمن ٥ دۆلارم دا به خـانمی بەرپرسـی تەلەفونی هۆتێل تا هەموو شەوەكەی ئـەو هێڵـه بداتـه ژوورەكـەی مـن. بێجگـه لـەوەش پێمگـوت ئەگـەر خەتەكـه لـه ژوورەكـەی مـن نـەپچرێ، بەیانیی ڕۆژی دواتریش ٥ دۆلاری دیكـەی دەدەمـێ. ئـەو خانمـه پێش نانی بەیانی هاته ژوورەكەی من و بەڵێنی دا كه هەموو شـەوێک هێڵـی نێونەتەوەیی بدا بەمن و پاشان لەسەر تەختەكەم ڕاكشا. ئـەو دەیزانـی كه كارمەنده ئەمنیەتییەكان دووربینیـان لـه ژوورەكـەی منـدا خسـتۆته كار، كەچی وا دیار بوو مەسەلەكەی بۆ گرنگ نیـه. بـەلام دیـاره ئـەمن هــەم لــه مەســەلەی دووربینــه جاسووســییەكه ئاگــادار بــووم و هــەم نەمدەتوانی گوێی پێنەدەم. ئەمن سوپاسی ئەو خزمەتەم كرد كه پێی كردبووم، ٥ دۆلاری دیكەم دایه و ڕێنوێنیم كرد كه بچێته دەرێ.

دواتـر، كارمەنـدی ئەمنیـەتیی هۆتێـل پێوەنـدیی پێـوه گـرتم و گـوتی: «ئاگات لەوه هەیه كه تەلەفونەكانی هۆتێل كۆنترۆڵ دەكرێن؟»

گوتم: «بەڵێ دەزانم.»

«ده دۆلارم بدەیه، شریتەكانی تەلەفونت دەدەمێ.»

«ئـەمن دەزانـم لـه قسـەكانمدا چـیم گوتـوه. هـا، ئـەوه ده دۆلار و شریتەكانیشم ناوێن.»

كاتێــک گەڕامـــەوه ئیســـڕائیل، كۆمیتـــەی هاوبـــەش بڕیـــاری دا سـەرپۆشـێكی دیكـه بـۆ موعامەلـەی ئێمـه دەگـەڵ لەهیسـتان پێكبێنـێ. هــیچكــام لــه ئەنــدامانی كۆمیتــەی هاوبــەش گومانیــان نــەبوو كــه دیــدارەكانی مــن لــه وارشــۆ لەلایــەن ڕێكخــراوی جۆراوجــۆری جاسووسییەوه خراونه ژێر چاوەدێری. بۆ لابردنی ئەو كێشەیه، ئـەمن

بە هاوکاریی لەهیستانییەکان قوربانییەکم بۆ ئەو کارە دۆزییەوە. ئەو کەسە بەستەزمان و فریوخۆرە، «ئاریە جاکۆبسۆن» Arieh Jacobson بوو. پێوەندیم لەگەڵ گرت و پێمگوت، ئیسرائیل دەیەوێ هێندێک گوللە «کاتیووشا» لە لەهیستان بکڕێ و بە ئێرانیان بفرۆشێتەوە. ئەم کەسە بەدبەختە کە پێی وابوو پووڵێکی زۆر لەو موعامەلەیە وەسەریەک دەنێ، بۆ ئەنجامدانی ئەو سەودایە زۆرجار لەنێوان لەهیستان و ڤییەندا هات و چوو و دەگەڵ کۆمەڵێک لەهیستانی و ئێرانی بۆ ئەم مەبەستە کەوتە گفتوگۆ. «جان دولارۆک»یش یەکی دیکە لە سەوداگەرانی کەرەسەی شەڕی هێنایە نێو ئەو هەولانە و ئەویش وەک «ئاریە جاکۆبسۆن» بە ئومێدی دەستکەوتنی پووڵێکی زۆر، وەک قوربانییەکی دیکە بۆ پەردەپۆشکردنی موعامەلەکە هەڵخەڵتێندرا. لەحاڵێکدا ئەوانە بەهومێدی وەدەستهێنانی پارەی باهاورده، لە هەوڵی ئەنجامدانی موعامەلەدا بوون، ئێمە موعامەلە ڕاستییەکەمان تەواو کرد.

ئێمە درێژەمان بە کڕینی کەلاشینکۆف دەدا، بەلام ئێرانییەکان زۆر پێیان لەسەر کڕینی گوللەکاتیووشا دادەگرت. هەرچەند گوللەکاتیووشایەکان زۆر کوشەندە نین، بەلام دەنگ و هاڕەیەکی سامناکیان هەیە کە شوێنەوارێکی وێرانکەری دەروونی دروست دەکەن، دەزگاکانی هاویشتنی گوللەکاتیووشا دەکرێ لە پشتەوەی لۆری دابنرێن و هەر دەقیقە ٤٠ گوللە بخرێتە دەزگاکەوە و هەمووشیان لە یەکساتدا بتەقێندرێن. ئێمە وای بۆ دەچووین کە ئێرانییەکان دەوری ١٧٠٠ کاتیووشاهاوێژیان هەیە و عێراقییەکان پتر لە ٢٠٠٠ دانەیان هەبوو. بۆیە بازاڕی گوللەکاتیووشا زۆر گەرم و پێویستییەکەیان لەبڕاننەهاتوو بوو.

لەحاڵێکدا گوللەکاتیووشاکانی ئیسرائیل خەریک بوو تەواو بن، ئێمە دەمانزانی لەهیستانییەکان گوللەکاتیووشای دەسکری شووڕەوییان بۆ

فرۆشتن هەن. بەڵام ژمارەکەیان تەنیا ٥٠٠٠٠ دانە بوو. سەرەنجام ئێمە گوللەکانمان هەریەکەی بە ٨٠٠ دۆلار لە لەهیستانییەکان کڕی و هەریەکەی بە ١١٠٠ دۆلار بە ئێرانییەکانمان فرۆشتەوە. دیارە ئەونرخە، خەرجی گوازتنەوە لە لەهیستانڕا بۆ یۆگۆسلاڤییشی تێدا بوو.

ئەو داهێنانەی ئێمە لەو موعامەلانەدا بەکارمان دێنا، بووە هۆی ئەوە کە «ڕابووس»ی ئۆتریشی،ناوی «مەکینەی دۆلار» لە گوللەکاتیووشا بنێ. ئەم وشەیە هاتە نێو ڕێکخراوی هەواڵگریی ئیسرائیل و بە زۆری کەلکی لێوەردەگیرا. دەبێ پێی لێنێم کە لەکاتێکدا ئەمن بۆ یەکەمجار ئەم وشەیەم بیست، کەمێک سەرم سوڕ ما. ئەمن بە ئامانجێکی سیاسی کەوتبوومە نێو موعامەلەی کەرەسەی شەڕ و ئەویش پێشگرتن بە دەستدرێژیی عێراق بوو. بەڵام دوای چەند ساڵ، ئێستا بۆم دەردەکەوت کە بەڕاستی ئامانجەکەم لە ڕێبازی خۆی ترازاوە و چالاکییەکانمان لەو بارەیەوە، بۆتە مەکینەیەکی دۆلار.

لەحاڵێکدا فرۆشتنی کەرەسەی شەڕ بە ئێران بەباشی دەچووە پێش، بارودۆخی سیاسیی ئیسرائیل تووشی بێسەرەوبەرەیی بوو. هەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٨٤ تەواو ببوون و چونکە هیچکام لە دوو حیزبی گرنگی لیکوود و کرێکار نەیانتوانیبوو زۆرایەتیی ئەنجومەنی قانوونداناں بەدەست بێنن، هیچیان نەیاندەتوانی حکوومەت دامەزرێنن. بۆیە هەرکام لەو دوو حیزبە هەوڵیان دەدا بەفرتوفێڵ، پشتیوانیی حیزبە مەزهەبیەکان لە لایەک و حیزبە چەپەکان لە لایەکی دیکە بۆلای خۆیان ڕاکێشن. بەڵام ڕێبەرانی دوو حیزبی گەورە، «ئیسحاق شامیر» ڕێبەری حیزبی لیکوود و «شیمۆن پریز» ڕێبەری حیزبی کرێکار بەزوویی تێگەیشتن کە گرووپە بچووکە سیاسییەکان بەدوای قازانجی خۆیاندا دەگەڕێن و هیچکامیان وەفاداریی پێویستیان

نیە. بۆیە شامیر و پرێز چاویان پێک کەوت و ڕێککەوتن کە پێکەوە حکوومەتێکی هاوپەیمانی پێکبێنن.

خاڵە گرنگەکانی ڕێککەوتنی شامیر و پرێز ئەوە بوون کە پۆستە گرنگەکانی کابینە لەنێویاندا دابەش بکرێن، بەوجۆرە کە بۆ ٤ ساڵی دواتر وەزارەتی بەرگری بدرێتە حیزبی کرێکار و وەزارەتی دارایی و نیشتەجێ بدرێتە حیزبی لیکوود. بەڵام پۆستی سەرۆکوەزیری و وەزارەتی دەرەوە لە نێوان شامیر و پرێزدا دابەش بکرێ، بەومانایە کە دوو ساڵ یەکیان سەرۆکوەزیری و ئەوی دیکەیان وەزارەتی کاروباری دەرەوەی بەدەستەوە بێ و دوو ساڵی دواتر ئەو پۆستانە دەگەڵ یەکتر بگۆڕنەوە. «پرێز» تا ساڵی ١٩٨٦ سەرۆکوەزیریی لە ئەستۆ دەبێ و «شامیر» لەو دوو ساڵەدا جێگری سەرۆکوەزیر و وەزیری کاروباری دەرەوە دەبێ. پاشان ئەو دووە پۆستەکانیان دەگۆڕنەوە و بۆ دوو ساڵی دوایی «شامیر» سەرۆکوەزیر و «پرێز» جێگری سەرۆکوەزیر و وەزیری کاروباری دەرەوە دەبێ.

گەورەترین هەڵە کە حیزبی کرێکار کردی، ئەوە بوو کە وای دەزانی ئەگەر وەزارەتی کاروباری دارایی بداتە حیزبی لیکوود، خزمەتێکی گەورەی بەخۆی کردوە و بە قازانجی تەواو دەبێ. لەوکاتەدا ئاوسان گاڵەی دەکرد و حیزبی کرێکار زۆر خۆشحاڵ بوو کە ئەم دوو کارە بداتە حیزبی لیکوود و خۆی لە دۆخی ئابووریی ئیسرائیل بەدوور بگرێ.

حکوومەتی هاوپەیمانیی ئیسرائیل کە خۆی بە «حکوومەتی یەکیەتیی نیشتمانی» ناو دەبرد، حیزبەکانی دیکەشی هێنانە نێو حکوومەت. دیارە، ئەو حیزبانە نەخشێکی وایان لە حکوومەتدا نەبوو، بەڵام دوو حیزبی توندڕۆی «شاس» و «مافدال» کە زیاتر لایەنگری حیزبی لیکوود بوون تا حیزبی کرێکار، چوونە نێو کابینە. بۆیە

دەکرێ بڵێین لەو حکوومەتە هاوپەیمانییەدا حیزبی لیکوود دەسەڵاتی لە حیزبی کرێکار پتر بوو.

لەو حکوومەتە هاوپەیمانییەدا، هۆیەکی گرنگی دیکەش هەبوو کە نابێ لەبەر چاو ون بێ. دەگەڵ ئەوەی وەزارەتی بەرگری بەدەست «ئیسحاق رابین»ەوە بوو، ڕێکخراوی هەواڵگریی ئیسرائیل کە لەلایەن سەرچاوەی جۆراوجۆرەوە پشتیوانیی لێدەکرا بە دەست حیزبی لیکوودەوە بوو، بۆیە لە حکوومەتی حیزبی کرێکاردا بە خەنیم (ڕکابەر)ێکی گرنگی رابین دەژمێردرا. پاش ئەوەی بگین لە ساڵی ١٩٧٧دا بوو بە سەرۆکوەزیر، هەموو کاربەدەستە گرنگەکانی ڕێکخراوی هەواڵگریی ئیسرائیل گۆڕان و وەفادارانی حیزبی لیکوود پۆستی گرنگی هەواڵگرییان بەدەست هێنا. کەوایە چونکە حیزبی لیکوود بەشێک لە حکوومەتی هاوپەیمانی بوو، هیچ دەرەتانێک بۆ گۆڕینی لایەنگرانی حیزبی لیکوود لە ڕێکخراوی هەواڵگریی ئیسرائیلدا نەبوو. ئەم بابەتە، پرێز ڕێبەری حیزبی کرێکاری خستبووە دۆخێکی زۆر دژوارەوە. هەرچەندی ئەو بە وەدەستهێنانی پۆستی سەرۆک-وەزیری بۆ ماوەی دوو ساڵ بە بەرزەفڕییەکەی خۆی گەیشتبوو، بەڵام ڕێکخراوی هەواڵگریی ئیسرائیل کە بەڕواڵەت بەدەست حکوومەتەکەی ئەوەوە بوو، بەرامبەر بەو هەستی بە وەفاداری نەدەکرد.

حکوومەتی هاوپەیمانیی ئیسرائیل لە بارێکی دیکەشەوە سەیر دەهاتە بەر چاو. بەو مانایە کە لەباری سیاسەتی دەرەوە و وتووێژی ئاشتی دەگەڵ عەرەبەکانەوە دوو حیزبی لیکوود و کرێکار، ئەوەندە ناکۆکیی بۆچوونیان هەبوو کە هەردووکیان تووشی بنبەستی فکری ببوون. وا دیار بوو ئەوان پێکەوە ڕێک کەوتبوون کە لەمبارەیەوە ڕێکنەکەون.

ڕادەی متمانەی دوو حیزبی لیکوود و کرێکار بە یەکتریش یەکجار کەم بوو. کۆمیتەی هاوبەش هێشتا لەژێر کۆنترۆڵی کەسانێکدا بوو کە حیزبی لیکوود دایمەزراندبوون. کاتێک حیزبی کرێکار بە ڕێبەرایەتیی «شیمۆن پریز»، دەسەلاتی بەدەستەوە گرت، ئێمە زراومان لەوە چوو کە ئەمریکاییەکان یان دەفتەری «پریز» هەوڵ بدەن ئەو بانکانە بدۆزنەوە کە «سەرمایەی ڕەش»یان لێ دانرابوو. بۆ چارەسەری ئەو گیروگرفتە، سەرۆکی هەواڵگریی سوپا «ئیهوود باراک» Ehud Barak کۆمیتەی ڕاسپارد کە داوای کۆمەگ لە دوو پیاوی زۆر دەستڕۆیشتوو - «ڕابێرت ماکسوێڵ» و «ڤیکتۆر چبریکۆف» سەرۆکی KGB بکا.

بۆ ئەو مەبەستە، وا ڕێکخرا کە بەهاری ساڵی ١٩٨٥، ئەمن لە لەندەن ئەو دوو کەسە ببینم. دیداری من دەگەڵ «ماکسوێڵ» لە دەفتەری خۆی لە ڕۆژنامەی Daily Miror ئەنجام درا. لەوکاتەدا، ماوەی ساڵێک بوو «ماکسوێڵ» لە کڕین و فرۆشتنی کەرەسەی شەڕدا هاوکاریی ئێمەی دەکرد. ئەو مووافەقەتی کرد کە توانا جۆراوجۆرە کارییەکانی ببنە ئامرازی گەیاندنی پووڵ بە ئێمە و ناڕاستەوخۆ بە سەرنووسەری ڕۆژنامەکەشی گوتبوو کە هەنگاوی شیاو بۆ جێبەجێبوونی کڕین و فرۆشتنەکانی ئێمە،بهاوێژێ. بەلام «ماکسوێڵ» بۆخۆی هیچوەخت نەهاتە نێو وردەکاریی کڕین و فرۆشتنی کەرەسەی شەڕەوە. ئەرکی وی لەوبارەیەوە پتر ئەوە بوو کە لەنێوان ئێمە و بلووکی خۆرهەلاتدا بۆ کڕین و فرۆشتنی چەک-وچۆڵە پێوەندی ڕێکبخا. بەلام، بۆ ڕێبەری KGB هاتنی نهێنی بۆ دەفتەری ڕۆژنامەنووسێکی بریتانیایی کارێکی ئاسان نەبوو. لەوکاتەدا، پریزیدێنت «گۆرباچۆف» دەگەڵ «مارگارێت تاچێر»، سەرۆکوەزیری بریتانیا پێوەندییەکی زۆر دۆستانەی هەبوو و بۆیە بوونی «چبریکۆف» لە لەندەن بە نائاسایی نەدەهاتە بەرچاو.

دیدارەکەمان بۆ سەعات ٨ونیوی بەیانی، واتە لانی کەم سەعاتێک پێش هاتنی ئیشکەران و نووسەرانی ڕۆژنامەکە دانرابوو. ترومبێلی «چبریکۆف» گەیشتە نهۆمی یەکەمی خانووبەرەکە کە لەڕاستیدا شوێنی ڕاگرتنی ترومبێلەکان بوو. بۆخۆی ڕاستەوخۆ بە ئاسانسۆر چووە ئەو نهۆمە کە دەفتەری «ماکسوێل»ی لێبوو. ئەگەر هاتنی «چبریکۆف» بۆ دەفتەری «ماکسوێل» بخرایە ژێر چاوەدێری یان ئاشکرا بایە، «ماکسوێل» وەلامی جێی قبوولی بۆ دیداری «چبریکۆف» ئامادە بوو. ئەو دەسبەجێ چاوپێکەوتن دەگەڵ «چبریکۆف»ی پشتڕاست دەکردەوە و دەیگوت کە ئەو لایەنگری ئەو بزووتنەوە فکرییە نوێیەیە کە لە شوورەوی هاتوتە پێش. چونکە بزووتنەوەی فکریی دامەزراندنی ڕێژیمێکی سۆسیالدێموکڕات لە شوورەوی بەتەواوی دەگەڵ سیاسەتی حیزبی کرێکاری بریتانیا ڕێک دێتەوە.

لە دیداری نێوان من و «ماکسوێل» و «چبریکۆف»دا کەسێکی دیکەش هەبوو، ئەویش «ناچووم ئادمۆنی» Nachum Admoni، سەرۆکی «مۆساد» بوو. بەڕاستی، ئامانجی ئەم دیدارە ئەوە بوو کە داوا لە «ماکسوێل» و «چبریکۆف» بکەم کۆمەگمان بکەن تا بڕێکی زۆر لە «سەرمایەی ڕەش» بنێرینە بانکەکانی ئەو ولاتانە کە هێشتا پێیان دەگوترا «[پشتی] پەردەی ئاسنین». ئێمە دەمانزانی ئەگەر دارایی «سەرمایەی ڕەش» لە بانکەکانی ولاتانی بلووکی خۆرهەلات، شوورەوی و هەنگاریا (مەجارستان) بشارینەوە. پوولەکە لەو ولاتانەدا ئەمن دەبێ و هەر وەخت پێویست بێ دەتوانین کەلکی لێوەرگرین. ئێمە پێویستیمان بە«ماکسوێل» هەبوو، چونکە ئەو پێوەندیی دەگەڵ ولاتانی کۆمۆنیستی هەبوو و بە ئاسانی دەیتوانی پێداویستییەکانی ئەنجامدانی بەرنامەکەمان ئامادە بکا. «چبریکۆف»یش پیاوێکی دەستڕۆیشتوو بوو و ئەمن گومانم نەبوو

که سۆڤیەتەکان کەلکی خەراپیان لەو دراوە وەرنەدەگرت. لەڕاستیدا کەلکوەرگرتن لە «چبریکۆف» لەو مەسەلەیەدا، وەک وەرگرتنی بەڵێن لە حکوومەتێکی ڕەسمی بۆ ئەنجامدانی کارێکی گرنگ بوو.

«ماکسوێڵ» بەهۆی فێرگەکانی زمانەوە کە لە وڵاتانی بلووکی خۆرهەڵات بەناوی جۆراوجۆری حکوومەتی خەریکی فێرکردنی زمان بوون دەیتوانی جێگۆڕکە بە پووڵەکانی ئێمە بکا. چبریکۆف زۆر خۆشحاڵ بوو ئەو پووڵانە وەربگرێ و سەرپەرستییەکەیان وەئەستۆ بگرێ. چونکە ئەو پووڵانە بە دۆلار بوون و بوونی پووڵی بەهێزی دۆلار لە بانک بەقازانجی بانکەکە دەبوو و تاوەختێک کە ئیسرائیل بڕیاری وەرگرتنەوەی نەدابوو، لە بانکدا دەمایەوە. مووافەقەت کرابوو کە بڕی ٤٥٠ میلیۆن دۆلار لە بانکی «کرێدیت سویس»ەوە بگوازرێتەوە بانکی بووداپێست لە هەنگاریا. لە لەندەن بنکەیەک کە کارەکەی، جێگۆڕکەی پارە بوو، لەلایەن ئیسرائیلەوە جێگۆڕکەی بە پووڵەکان دەکرد. جگە لەوە کە بۆ گوازتنەوەی پووڵەکان کەلک لە فێرگەکانی «بێرلیتز» وەردەگیرا، ئیسرائیل کەلکی لە کۆمپانییەک بەناوی «ترانس وۆرڵد» Trans Worldیش وەردەگرت. ئەم کۆمپانییە بۆ ڕەوانەکردنی پارە بۆ وڵاتانی بلووکی خۆرهەڵات «پڕۆمیس»ی پێدەفرۆشتن.

ئەسڵێکی دیکە کە لەسەری ڕێک کەوتبووین ئەوە بوو کە بانکی بووداپێست ٤٥٠ میلیۆن دۆلارەکە لەنێو بانکەکانی دیکەی بلووکی خۆرهەڵاتدا بەش بکا. ئێمە بۆ ئەوەی لە ئەمنیەتی پووڵەکان دڵنیا بین، داوامان لە حکوومەتی شووڕەوی کرد کە ئەمنیەتیان دەستەبەر بکا. چونکە، لەوحاڵەدا ئەگەر ڕووداوێکی نەخوازراو لەبارەی پووڵەکانەوە ڕووی دابایە، حکوومەتی شووڕەوی بە دۆلار دەیدایەوە، نەک بە ڕۆبڵ.

«ماکسوێڵ» بەهرەی پێویستی لەو عەمەلیاتە وەردەگرت. ئەو لە ئاکامی هاوکاری لەگەڵ ئێمەدا ٨ میلیۆن دۆلاری یەکجێ وەردەگرت. جگەلەوەش، هەروەخت یەکێک لە کۆمپانییەکانی، دراوێکی لە جێیەکەوە دەگوازتەوە جێیەک، ئەو ٢ لەسەدی هەموو پووڵەکەی وەردەگرت. «ماکسوێڵ» لەو ڕێگایەوە بە میلیۆن دۆلاری لە تەنکەی گیرفانی خست.

دیداری ئێمە لە دەفتەری «ماکسوێڵ» سەعاتێکی خایاند، ئەم دیدارە زۆر گرنگ بوو، چونکە فەسڵێکی تازەی لە پێوەندییەکانی ئێمە دەگەڵ شووڕەوی و وڵاتانی سەربە شووڕەویدا دەکردەوە. پێش ئەوەی ئێمە لێک جیا بینەوە، «چبریکۆف» کە جگە لەوەی ڕێبەری KGB بوو، ئەندامی پۆلیتبۆرۆی [حیزبی کۆمۆنیستی] شووڕەوییش بوو، نامەیەکی دا بە «ئادموونی» کە بیدا بە جێگری سەرۆکوەزیری ئەوکات کە «ئیسحاق شامیر» بوو. ئەمن ئاگام لە نێوەرۆکی ئەو نامەیە نیە.

لە مانگەکانی دواتردا، پێوەندیی «چبریکۆف» دەگەڵ ئیسرائیل بە چەشنێکی چاوەڕواننەکراو نیزیکتر و گەرمتر بوو. کۆتایی ساڵی ١٩٨٥، ئیسرائیلییەکان فڕۆکەیەکی میگی ٢٩ی تەواویان کە پارچەکانی لەبەریەک دەرهاتبوون و لە سندووقی داریندا بەستەبەندی کرابوون و لە بەندەری «گدانسک»ی لەهیستان بوون، دزی. ئەو فڕۆکەیە قەرار بوو بە فڕۆکەیەکی بارهەڵگری شووڕەوی کە لەهیستانییەکان کەرەسە جەنگییە فرۆشراوەکانیان پێ دەگوازتەوە ئێران، ببرێتە سووریا. بەڵام ئیسرائیلییەکان بەرتیلێکی بەرچاویان دا بە ژەنراڵێکی لەهیستانی -کە دەستی لە کاری فرۆشتنی کەرەسەی شەڕ بە ئێراندا هەبوو- و بە یارمەتیی ئەو ژەنراڵە، فڕۆکە بارهەڵگرەکەی شووڕەوی لەجیاتی ئەوەی میگە ٢٩ بەستەبەندیکراوەکە بەرێتە سووریا، بردیە

ئیسرائیل. بەمجۆرە، ئیسرائیل دەستی بە نهێنییەکانی پێشکەوتووترین و تازەترین فڕۆکەی شەرکەری شوورەوی ڕاگەیشت.

یەکێک لە ژێردەستانی ژەنرالە لەهیستانییەکە، بە بابەتەکەی زانی و ڕاپۆرتی دایە شوورەوی. «میخاییل گۆرباچۆف» بە بیستنی ئەو خەبەرە زۆر قەلس بوو و لە فێوریەی ساڵی ١٩٨٦دا، «چبریکۆف»ی نارده ئیسرائیل.

سەرۆکی KGB چاوی بە «ئیسحاق شامیر» کەوت کە ئەودەم جێگری سەرۆکوەزیر و وەزیری کاروباری دەرەوەی ئیسرائیل بوو،و لە ئاکامی وتووێژی ئەم دووانەدا بڕیار درا فڕۆکەکە بنێردرێتەوە شوورەوی، پێوەندییەکانی ئیسرائیل، لەهیستان و شوورەوی لەم هەلومەرجەدا بەردەوام بن و هیچ هەواڵێک لەو بارەیەوە بڵاو نەکرێتەوە. هەروەها بە نێوبژیوانیی سەرۆکی «مۆساد» ڕێککەوتن کرا کە حکوومەتی ئەمریکا بەرامبەر بە وەرگرتنی وێنەکانی وردەکاریی مێگی ٢٩ی سۆڤیەت پەنابەریی سیاسی بداتە ژەنراڵە لەهیستانییەکە.

لەم دیدارەدا بوو کە پێوەندییەکی زۆر گەرم لەنێوان «چبریکۆف» و «شامیر»دا دروست بوو. «چبریکۆف» لە کاتی مانەوەی لە ئیسرائیلدا تەنیا یەکجار چاوی بە «شیمۆن پرێز» سەرۆکوەزیری ئەم وڵاتە کەوت و ئەمەشی هەر بۆ ڕەچاوکردنی ئەدەب ئەنجام دا. «چبریکۆف» حەزێکی بۆ گفتوگۆ دەگەڵ حیزبی کرێکار نەبوو، چونکە پێی وابوو ئەوان لەژێر کۆنترۆڵی ئەمریکادان.

سەرۆکی KGB لە کاتی مانەوەی لە ئیسرائیلدا گەیشتە ئەو بڕوایە کە لەنێوان شوورەوی و حیزبی لیکووددا هێندێک هاوفکریی هاوبەش هەن، بەتایبەتی وەختێک «چبریکۆف» هەستی بەهێزی دژی ئەمریکایی لە «شامیر»دا بەدی کرد، لەسەر هاوپێوەندی دەگەڵ حیزبی لیکوود پتر ساغ بۆوە.

لـە ئاکـامی دیدارێکـدا کـە «چبریکـۆف» دەگـەڵ «ماکسـوێل» لـە دەفتـەری ئـەودا هـەیبوو، هـەروەها بـە هـۆی دۆسـتایەتییەکی تـازە کـە لەنێوان شامیر و سەرۆکی KGBدا دروست بوو، لەنێوان ئیسرائیل و بلـووکی کۆمۆنیسـت، لەهیسـتان،کۆریای بـاکووری، ڤێتنـام و وڵاتـە کۆمۆنیستییەکانی دیکەدا پێوەندییەکی گەرم دامـەزرا و کـاری کڕین و فرۆشـتن و گوازتنـەوەی کەرەسـەی شـەڕ زۆر ئاسـانتر بـوو. ئێرانییـەکان هەرکـە کەرەسـە جەنگییـەکانیان وەردەگـرت دەسـبەجێ قیمەتـە زۆرەکـەیان دەدا. ئیسـرائیل بـۆ درێژەدانـی ئـەم کـارە ڕووی کردە خۆرهەڵات و کۆمپانییەکانی «ماکسوێل»ی کردە ئامرازی کڕین و فرۆشتنی کەرەسەی جەنگی.

تـەرتیبی کارەکـە بـەو جـۆرە بـوو کـە بـانکی نیشـتمانیی ئێـران، ئیعتبارنامەیەکی بۆ یەکێک لە کۆمپانییە چەکسازییەکانی ئیسرائیل کە هـەموویان لـەژێر چـاوەدێریی کۆمپـانیی دایـک «ئـۆرا»دا بـوون، دەردەکرد. پاشـان ئێمـە داوامـان لـە بەشـی گوازتنـەوە دەرەکییـەکانی بـانکی نیشـتمانیی وێستمینسـتەر لـە لەنـدەن دەکرد ببێتـە دەسـتەبەری ئەو ئیعتیبارنامەیە. ئەودەم ئێمە ئیعتیبارنامەکەمان لە بانکێکی وڵاتـانی ئورووپـایی دادەنـا. کاتێـک ڕۆژی وەرگرتنـی ئیعتیبارنامەکـە دەهـات، بڕی ئیعتیبارنامەکەمان دەکردە دراوی نەغد و دەماننارده بانکەکانی بلـووکی خۆرهـەڵات. ئاشـکرایە، وەختێـک بـۆ گوازتنـەوەی پووڵـە نەغدەکان کەلکمان لە کۆمپانییەکانی «ماکسـوێل» وەردەگـرت، ئـەم-کـارە خێراتـر جێبـەجێ دەبـوو. ئەگـەر، ئیسـرائیل لەلایـەن ئـەمریکایی-یەکانـەوە چـەکوچۆڵـەی بـە ئێـران بفرۆشـتایە قیمەتەکـەیان دەڕژایـە حیسابی CIA لە بانکی نێونەتەوەیی لۆکزامبوورگ. وەختێک شامیر بۆ ئامانجـەکانی حیزبـی لیکوود پێویسـتیی بـە پـارەی زیـاتر دەبـوو، بـۆ وەرگرتنـی پـووڵ لـە بانـک و گوازتنـەوەی بـۆ ئیسـرائیل بـەهرە لـە کۆمپانییـەکانی «ماکسـوێل» وەردەگیـرا. ئـەم پووڵانـە پێشـان دەڕژانـە

حیسابە بانکییەکانی لۆکزابوورگ و ژێنێڤ و دواتر دەدرانە حیزبی لیکوود.

بەو ڕێوشوێنە تازەیە کە بۆ ئیدارەی کاروباری ماڵی دانرابوو و لەحاڵێکدا پێوەندییەکانی ئیسرائیل و لەهیستان پتەوتر ببوون، ئێمە بۆ کڕینی کەرەسەی جەنگی داخوازێکمان لە کۆمپانیی «جیۆ میلی تەک» Geo Mili Techەوە پێگەیشت. ئەو کۆمپانییە کە سەربە CIA بوو، لە واشینگتۆن بوو و بەهۆی ژەنراڵ «جان سینگلاب» John Singlaub و دۆستەکەی «باربارا ستادلی» Barbara Studley یەوە بەڕێوە دەبرا. کۆمپانیی «جیۆ میلی تەک» لقێکیشی لە شەقامی «وایزمەن» لە تەل ئەبیب هەبوو کە «ڕان هێلێر» Ron Heler بەسەری ڕادەگەیشت. «ڕان هێلێر» خۆی وەک سەرهەنگی فڕۆکەوانی پێشووی فڕۆکە شەڕکەرەکانی هێزی هەوایی ئیسرائیل دەناساند، لەحاڵێکدا ئەو فڕۆکەوانی هەلیکۆپتەر بوو.

کۆمیتەی هاوبەش بە تەلەفون لە «ڕابێرت گەیتس»ی پرسی داخوا کڕین و فرۆشتنی کەرەسەی شەڕ دەگەڵ «جیۆ میلی تەک» ڕێگاپێدراوە یان نا. «گەیتس» وەڵامی دایەوە کە ئەو بە موعامەلە دەگەڵ ئەو کۆمپانییە خۆشحاڵ دەبێ. کۆمپانیی «جیۆ میلی تەک» بەنیاز بوو کەرەسەی شەڕی دروستکراوی وڵاتانی بلووکی خۆرهەڵات بۆ کۆنتراکان بکڕێ کە دژی «سەندی نیستا» لە نیکاراگوا لەشەڕدا بوون.

ئێمە بابەتەکەمان دەگەڵ لەهیستانییەکان هێنایە گۆڕێ، بەڵام کاتێک تێگەیشتن کە چەکەکانیان بۆ گرووپێکی چریکیی دەستەڕاستییە، لە فرۆشتنەکەیان دوودڵ بوون. کەچی نەزەریان گۆڕی و پێیانگوتین، هەرچییان لە عەمباردا هەبێ پێمان دەفرۆشن. لەهیستانییەکان بۆ فرۆشتنی کەرەسە جەنگییەکان بە ئێمە تەنیا یەک مەرجیان دانا. مەرجەکەش ئەوە بوو کە لە بەرامبەر فرۆشتنی کەرەسەی جەنگیی

پێویست بۆ کۆنتراکان بە ئێمە، دوو ماتۆڕی ژەنراڵ ئێلیکتریک لەوانە کە لە تانکە ئەمریکایییەکاندا بەکار دەبرێن لە ئێمە وەربگرن. ئەو ماتۆڕانە شوورەوی پێویستی بوون و لەهیستانییەکان دەیانەویست ئەو ماتۆڕانە بدەنە شوورەوی. ئەمن نەمدەزانی ئەمریکا لەبارەی ئەم داخوازەوە هەڵوێستی چدەبێ، بەوحاڵە داوای لەهیستانییەکانمان دەگەڵ «ڕان هێلێر» باس کرد. وەڵامی ئەمریکا لەوبارەیەوە زۆری نەخایاند. ئەمریکا زوو جوابی دایەوە کە مووافیقە.

ڕۆژی ١٥ی مانگی مەی (ئەیار)ی ١٩٨٥، «نیکۆلا دیڤیس» پێرستی ئەو کەرەسە جەنگییانەی کۆنتڕاکان پێویستیان بوون، بەمجۆرە ڕاگەیاند:

٥٠٠٠ چەکی ئوتوماتیکی AK-٤٧-M-٧٠ بە قیمەتی ١٠٥٠٠٠٠ دۆلار، ٥٠٠٠٠ خەشابی یەدەکی بەقیمەتی ٤٥٠٠٠٠ دۆلار، ٥ میلیۆن فیشەکی ٧\٦٢ میلیمیتری بە قیمەتی ٥٥٠٠٠٠ دۆلار، ٢٠٠ خومپارەی ٦٠ میلیمیتری (لە جۆری کوماندۆیی) بە قیمەتی٣١٠٠٠٠ دۆلار، ٥٠٠٠ خۆمپارەی ٦٠ میلیمیتری بە قیمەتی ١٨٥٠٠٠ دۆلار، ١٠٠ خومپارەی ٨١ میلیمیتری بە قیمەتی ٢٥٠٠٠٠ دۆلار، ٢٠٠٠ گوللەخومپارەی ٨١ میلیمیتری بە قیمەتی ١٠٤٠٠٠ دۆلار، ١٠٠٠ مینی دژەکەس بە قیمەتی ٦٨٠٠٠ دۆلار. هەموو ئەو پارەیە کە کۆمپانیی «جی یوومیلی تەک» بەو کەرەسە جەنگییانەی دا ٣٢٤٢٠٠٠ دۆلار[١٦] بوو کە سوودێکی زۆری بۆ ئێمە تێدا بوو. (بۆ وێنە ئێمە چەکی AK-46مان یەکی بە ٨١\٥٠ دۆلار کڕی و بە ٢٢٥ دۆلار فرۆشتمانەوە).

لەهیستانییەکان پێیان خۆش نەبوو، کەس بزانێ کە ئەوان ئەو کەرەسە جەنگییانەیان فرۆشتوە. بۆیە گوتیان کە یان چەکەکان بێ مارک دروست دەکەن، یان مارکی یۆگۆسلاڤیمان بۆ لێدەدەن. دواتر

---

[١٦]ـئەو ژمارانەم کۆ کردەوە، کردیە ٢٩٦٧٠٠٠. وادیارە یان هەموو چەکەکان نەنووسراون یان کۆکردنەوەکە دروست نەبووە. (وەرگێڕ)

لە ڕێگای سەرچاوەکانی خۆمانەوە زانیمان کە لە حاڵێکدا کۆمپانیی «جی یوومیلی تەک» تەنیا ٣٢٤٢٠٠٠ دۆلاری دابوو بە ئێمە، لە دەفتەرەکانی خۆیدا ٥٠٠٠٠٠٠ دۆلاری نووسیوە و ئەوەندەشی لە کڕیارەکان وەرگرتوە. دیار نیە ئەو زیادییەیان چ لێکردوە!

لەو ساڵەدا (١٩٨٥) ئێمە ژمارەیەکی زۆر مووشەک و نارنجۆکی RPG-7 و فیشەکی AK-47 و مووشەکی دژەئاسمانیی SAM-7 و خومپارەی ٦٠ میلیمیتری و ٨١ میلیمیتری و ئامێر و پێداویستییەکانی هێزی دەریاییمان بۆ ئێرانییەکان لە لەهیستانییەکان کڕی. ئێرانییەکان هەروا پێیان لەسەر کڕینی مووشەکی کاتیووشا دادەگرت، بەلام لەهیستانییەکان و یۆگۆسلاڤییەکان تەنیا ٥٠٠٠٠ دانەیان هەبوو. ئێرانییەکان گوتیان کە کۆریای باکووری مووشەکی کاتیووشای هەیە و بەڵکوو ئیسرائیل بتوانێ لەم ولاتە بیانکڕێ. ئیسرائیل هیچ پێوەندییەکی دەگەڵ کۆریای باکووری نەبوو. بەلام ئەمن بە پەیڕەوی لەو فەلسەفەیە کە لەم دنیایەدا بۆ هەر کێشەیەک ڕێگاچارەیەک هەیە، دەستبەکار بووم.

لە دیدارێکدا کە نێوەڕاستی ساڵی ١٩٨٥ دەگەڵ هاوکارە لەهیستانییەکانم هەبوو، گوتم: «ئێوە هێندێ کەرەسەی شەڕمان بۆ لە کۆریای باکووری بکڕن و ئێمە پارەکەیتان دەدەینێ.».

«سێنزین» Cenzin (ئیدارەی هەناردەکردنی کەرەسەی شەڕ لە وەزارەتی دەرەوەی لەهیستان) تەلەفونی بۆ پاشکۆی سەربازیی کۆریای باکووری کرد و تکای لێکرد چاوی بە من بکەوێ. ئەو داخوازەکەی قبووڵ نەکرد و گوتی: ڕێگای پێنەدراوە چاوی بە ئیسرائیلییەکان بکەوێ. سەرەنجام ئەو هاتە باڵەخانەی «سێنزین»، بەلام پێی داگرت کە بەرەوڕووی من نەبێتەوە، بەڵکوو لە ژوورێکی دیکە دانیشێ و لەهیستانییەکان بە هاتوچووی نێوان ژوورەکانی من و ئەو پەیامەکانی من بۆ ئەو بەرن. ئەو پێی دادەگرت کە پێی خۆش

نیه من ببینێ. ئاخرەکەی سەبری من تەواو بوو. لەجێی خۆم هەستام و لەحاڵێکدا لە ڕەفتاری پڕ لە سووکایەتیی ئەو قەڵس بووم بە لەهیستانییەکانم گوت، دەمەوێ بچمەوە هۆتێلەکەم.

لە منیان پرسی: «ئەدی ئەو پیاوە کۆریایی‌یە چیی لێدێ؟»

وەڵامم دایەوە: «چاوی دەرێ. تکا دەکەم پێی‌بڵێن، ئەمن چیم گوت. هەروەها پێی بڵێن، ئەمن لەسەر میلیاردێک دۆلار دانیشتووم کە لە بوودجەی ساڵانەی کۆریای باکووری پترە.»

دوو سەعات دواتر لەهیستانییەکان هاتنە هۆتێلەکەی من بۆئەوەی بمبەنە «سێنزین». ئەوان گوتیان، پاشکۆی سەربازیی کۆریای باکووری تێلێکسی ناردۆتە «پیوونگ یانگ» و ڕێگای پێدراوە، بەرەوڕوو دەگەڵت دابنیشێ. ئەمن پێم داگرت کە تەنیا لە ژووری هۆتێلەکەم حازرم بی‌بینم.

پاشکۆی سەربازیی ناوبراو کە خاوەنی جەستەیەکی وردیلە و قەلافەتێکی جیددی بوو و لە ساڵەکانی دەیەی چلی تەمەنیدا بوو و بە هەردوو زمانی کۆریایی و لەهیستانی قسەی دەکرد، دەگەڵ وەرگێڕێکی لەهیستانی – ئینگلیزی هاتە هۆتێل. سەرەتا بە وشەگەلی جوان و ڕەفتارێکی سیاسەتمەدارانە گوتی: «ئێمە جگە لەوە کە جوولەکە مافی فەلەستینییەکانیان پێشێل کردوە، ناکۆکییەکمان لەگەڵیان نیە. ئەمریکایی‌یەکانیشمان خۆش ناوێن. ئەو تاوانانەی ئەمریکایی‌یەکان لە وڵاتی مندا کردوویانە جێی باوەڕ نین. دایک و بابی من هەردووکیان بە بۆمبای ئەمریکایی‌یەکان کوژراون.»

کاتێک ئەو پاشکۆ سەربازییە منداڵێک بووە، ئەو و زۆر منداڵی دیکە کە دایک‌وبابی خۆیان لەدەست داون، هێنراونە لەهیستان و لە کاتی شەڕی کۆریادا لە هەتیوخانەیەک ڕاگیراون. ئەو بەشی پتری تەمەنی منداڵیی لەو هەتیوخانەیەدا بەسەر بردوە. هەر لەوکاتەدا کە ئەو باسی بیرەوەرییەکانی منداڵیی دەکرد، ئێمە لەبارەی مووشەکە

کاتیووشاکانەوە کەوتینە وتوویژ. ئەو گوتی کۆریای باکوور دەتوانێ ٢٠٠٠٠٠ مووشەکتان بداتێ. بەڵام بە دڵنیایی پێی داگرت کە تەنیا وەزیری بەرگریی وڵاتەکەی دەسەڵاتی هەیە موعامەلەیەکی وا ئەنجام بدا. لێشی زیاد کرد کە ناکرێ ئەمن بە تەلەفون قسەی دەگەڵ بکەم، بەڵکوو هەرچەشنە پێوەندییەک دەبێ بە تێلێکس بگیرێ. ئەمن پێم چەقاند کە دیداریکم دەگەڵ وەزیری بەرگری هەبێ.

پاشکۆ سەربازییەکە پێکەنی و گوتی: «نە ئەو دەتوانێ بێتە لەهیستان و نە ئێمە دەتوانین ڕێگا بدەین ئیسرائیلییەک سەردانی کۆریای باکووری بکا. کاری وا هیچ وەخت ڕووی نەداوە.»

«زۆر باشە، ئەگەر ئێوە حەزتان لە موعامەلەیە، دەبێ ئەمن و ئەو یەکتر ببینین.»

«بە پاسپۆرتە ئیسرائیلییەکەت ئەو کارە سەر ناگرێ.»

لەهیستانییەکان پێشنیاریان کرد پاسپۆرتێکی لەهیستانی بۆ من دەربێنن تا بتوانم پێی بچمە کۆریای باکوور. ئەمن ئەو پێشنیارەم ڕەت کردەوە. بۆ سەفەری کۆریای باکووری، ئەمن دەبوو بەسەر خاکی شووڕەویدا بفڕم و ئەگەر لە ڕێگا گیروگرفتێک هاتبایە پێش، ئەمن دەمەویست وڵاتەکەم بتوانێ پشتیوانیم لێبکا. پاش ئەوەی چەند تێلێکسیان نارده کۆریای باکووری، بەمنیان گوت کە لەوانەیە وەزیری بەرگریی کۆریای باکووری دواتر بتوانێ بێتە لەهیستان و لەم وڵاتە من ببینێ. ئەمن گوتم، وەختەکە درەنگ دەبێ و بە پاشکۆ سەربازییەکەم گوت: «ئێمە دۆستایەتییەکەمان دەپارێزین، بەڵام پێم وانیە بتوانین موعامەلەیەک پێکەوە بکەین.»

ئێمە هەموو کەرەسە جەنگییەکانی لەهیستانییەکانمان کڕیبوو و ئیدی ئەوان شتێکیان نەبوو پێمانبفرۆشن و ئەمن خەریکی خۆسازکردن بۆ گەڕانەوە بووم کە سەعات ١٠ی دوانیوەڕۆ، بەرپرسی پێوەندیی نێوان من و «سێنزین» هاتە هۆتێل و گوتی:

«ئاری، خەبەرێکی خۆشم بۆ هێناوی. ئەتۆ دەتوانی بچیە کۆریای باکووری.»

پێی‌گوتم کە کۆریای باکووری ڤیزای بۆ من دەرکردوە. لەهیستانییەکان پێشتر لەبارەی سەفەری منەوە پێوەندییان دەگەڵ سۆڤیەتەکان گرتبوو و نوێنەرایەتیی شوورەوی لە وارشۆ ڤیزایەکی یەکمانگەی بۆ دەرکردبووم کە بەهۆی شوورەوییەوە سەفەری «پیۆنگ یانگ» بکەم. ئەمن و دۆستەکەم لە «سێنزین» دەبوو بەیانیی ئەو شەوە وارشۆ بەرەو «پیۆنگ یانگ» بەجێ بێڵین. بەرنامەی سەفەرەکە بەوجۆرە بوو کە ئێمە سەرەتا لە وارشۆڕا دەچووینە مۆسکۆ و لەوێوە دەچووینە «خاباڕۆفسک» Chabarovsk لە خۆرهەڵاتی شوورەوی و لەوێشەوە بە فڕۆکەیەک کە حەوتووی جارێک دەچووە «پیۆنگ یانگ»، دەگەیشتینە ئەو شارە.»

سەرۆکەکانم ڕێگایان نەدابوو، ئەمن بچمە کۆریای باکووری، بەڵام هەستم کرد بابەتەکە ئەوەندە گرنگە کە دەبێ بۆخۆم لەو بارەیەوە بڕیار بدەم. تەلەفونم بۆ کارمەندێکی «مۆساد» لە ڤییەن کرد و داوام لێکرد، خەبەری سەفەری من بۆ «پیۆنگ یانگ» بدا بە کۆمیتەی هاوبەش.

ئێمە بە کۆمپانیی هەوایی لەهیستان «لات» Lot لە وارشۆوە چووینە مۆسکۆ. فڕۆکەی «ئێرفلووت» کە قەرار بوو بچێتە «چاباڕۆفسک»، دوو سەعات وەدرەنگ کەوت و پاشان بێبەرنامەی پێشتر لە شوێنێک لە نێوەڕاستی شوورەوی ڕاوەستا. سەرەنجام کاتێک گەیشتینە فڕۆکەخانەی زۆر چووکەڵەی «چاباڕۆفسک»، فڕۆکەکەی «پیۆنگ یانگ» پێشتر فڕیبوو. بۆیە ئێمە تووشی چەند کێشە بووین.

یەکەم ئەوە، کە دۆستە لەهیستانییەکەم لەنەکاو زۆر ترسا.

ئەو گوتی: «تا ئێستا پێی هیچ ئیسرائیلییەک نەگەیشتوتە ئەم بەشەی دنیا. خەڵکێک کە لەم ناوچەیە دەژین، نەخوێندەوار و

وەحشین. ئەگەر پێبزانن کە ئیسرائیلییەک سەفەری ئێرەی کردوە، ئێمە دەبێ چبکەین؟ لەوانەیە ئەوان لە کاتی خەودا بمانکوژن.»

لەکاتێکدا دە فرۆکەخانەی چۆڵوهۆڵ و ئەو سەربازانەوە ڕامابووم کە خەریکی کارەکانیان بوون، گوتم: «نیگەران مەبە، بەهەرحاڵ پێم - وانیە ئەمشەو جێیەک بۆ خەوتن پەیدا بکەین.» ئەگەرچی وەرزەکە هاوین بوو، بەوحاڵە بایەکی ساردی دەهات.

کێشەی دووەم ئەوە بوو، کە ئەمن تەنیا دۆلاری ئەمریکا و زلۆتیی لەهیستانم پێبوو و دۆستە لەهیستانییەکەم تەنیا زلۆتیی هەبوو، چووینە باڵەخانەی فرۆکەخانە کە وشک و بەتاڵ بوو. هێندێ پیاوی ڕەنگمەغوولیی سوور کە لەوێ بوون جۆرێک تێمانەوە ڕامابوون، دەتگوت لە ئەستێرەیەکی دیکەوە هاتووینە سەر زەوی.

ئەمن پرسیم: «لێرە تەلەفون هەیە؟»

کە دیارە لەوێ تەلەفونێک نەبوو. بەهەرحاڵ، بە کۆمەگی یەکێک لە ئیشکەرانی فرۆکەخانە دەزگایەکی تێلێکسمان پەیدا کرد و بەزەحمەت توانیمان پەیامێک بەرێ بکەین بۆ لەهیستان.

دوای دەوری ٢سەعات، وەڵامەکەمان هاتەوە. یەکێک لە ئیشکەرانی ئیدارەی هەناردەی وەزارەتی بازرگانی پەیامەکەمانی وەرگرت و دەسبەجێ پێوەندیی دەگەڵ کاربەدەستانی کۆریای باکووری گرت. کاربەدەستانی کۆریای باکووری پەیامێکیان بۆ کاربەدەستانی وارشۆ نارد و داوایان لە لەهیستانییەکان کرد ئێمە ئاگادار بکەن کە سبەینێ فرۆکەیەک لە «پیۆنگ یانگ»ەوە دەنێردرێتە شووڕەوی تا بمانباتە کۆریای باکووری. بەوجۆرە ئاسۆیەکەمان کەمێک بۆ ڕوونتر بۆوە.

ئێمە هەروەها ئاگادار بووین کە لەنێو شار هۆتێلێک بۆ گەڕیدە (تووریست)ە بێگانەکان هەیە. ئەمن دەمەویست پاکەتێک سیگاری مارلبۆرۆ بکڕم. کارمەندێکی فرۆکەخانە بردمیە ناوەندی شار کە هێندێ خانووبەرەی بێتۆنی (کۆنکرێتی)ی ناشیرینی بە شێوەیەکی

نارێک لە گۆشەوکەنارەکان دەهاتنە بەر چاو و ئەمن توانیم سیگارەکە بکڕم.

کاتێک گەیشتینە هۆتێل، سەد دۆلارییەکم دا بە خانمێک کە بەرپرسی ناونووسیی موسافیرەکان بوو. ئەو سەد دۆلارییەکەی وەرگرت و ڕایوەشاند، بەڵام بە دیتنی زلووتی تێکچوو. دوایە ئەمن قەڵەمێکی پارکەری خۆمم وێ دا و هەولم دا تێیبگەیەنم کە قەڵەمەکەم بە دیاری داوەتێ. ئەو ئاشقی بوو و هەر بەو قەڵەمە ناومانی نووسی و یەکی ژوورێکی تاکەکەسیی داینێ کە خواردنیشی دەگەڵ بوو.

پاشان دۆستە لەهیستانییەکەم هاتە ژوورەکەی من و ئێمە لەبارەی چۆنیەتیی ڕابواردنی کاتەکانی دواتر خەریکی قسە بووین کە لەنەکاو کەسێک چەند جار لە دەرگای دا. دەرگام کردەوە. کەسێکی بەخۆوە کە خەڵکی مۆسکۆ بوو و بە تەواوی بە زمانی ئینگلیزی قسەی دەکرد، هاتە ژوورێ. ئەو تۆقەی دەگەڵ کردین و خۆی بە ناوی سەرۆکی ئەمنیەتی ناوچە و یان جۆرێکی دیکە بڵێین سەرۆکی ئەمنیەتی KGB ناساند. ئەو دەیەویست بزانێ ئیسرائیلییەک چۆن توانیویەتی بێتە شوێنێکی وا چەپەک و چۆنی ڤیزای کۆریای باکووری وەرگرتوە.

پاش ئەوەی گوێی لە وەڵامەکانی ئێمە ڕاگرت، ئێمەی بۆ دیتنی شار ڕێنوێنی کرد. دیارە شار بێجگە لە کەسانێک کە خەریکی ڤۆدکاخواردنەوە بوون، شتێکی بۆ دیتن نەبوو. بەیانیی ڕۆژی دواتر سەری سەعات فڕۆکەیەکی سەربازیی کۆریای باکووری هات کە ئێمە بەرێتە «پیۆنگ یانگ». ئەو کاتەی سواری فڕۆکە بووم، هیچ دڵتەنگ نەبووم لەوەی شاری «چاباڕۆفسک» بەجێ دێڵم.»

فڕینەکەمان دوو سەعاتی کێشا. کاتێک گەیشتینە فڕۆکەخانەی «پیۆنگ یانگ»، دیتمان وەزیری بەرگری هاتۆتە پێشوازمان. ئەو بە خۆشحاڵی پیرۆزبایی گەیشتن بەو شارە یەکجار مۆدێرنەی لێکردین.

دوای دیتنی بارودۆخی شاری «چاباڕۆفسک» ئێمە زۆر خۆشحاڵ بووین کە خۆمان لە شاری «پیۆنگ یانگ» ببینین.

ئەمن ٢٠٠٠٠٠ گوللەکاتیووشام لە وەزیری بەرگری کڕی. بڕیار درا، ئیسرائیل نرخەکەیان بە دۆلاری ئەمریکا بخاتە حیسابی یەکێک لە بانکەکانی ئوتریش. لە کاتی موعامەلەکەدا وا دانرا، ئەوان پاش درانی پووڵەکە، ڕاستەڕێ گوللەکان لە «پیۆنگ یانگ»ەوە بگوازنەوە ئێران. هەر گولله کاتیووشایەک بە شەشسەد دۆلار موعامەلە کرا و ١٥ دۆلاریشی بۆ گوازتنەوە بۆ بەندەرعەبباس خرایە سەر. ژەنراڵ گوتی، ئەوان دەتوانن گوللەی زیاتریشمان پێبفرۆشن، بەڵام پێویستیی بە چەند مانگ وەخت هەیە.

ئەمن تکام لە وەزیری بەرگری کرد، وا بکا ئەمن بتوانم بۆ کڕینی کەرەسەی جەنگیی زیاتر بچمە ڤێتنام. پاش سێ ڕۆژ ڤیزایەکی ڤێتنامم بۆ دەرچوو. بە ژەنراڵم گوت، لەپێشدا دەچمەوە ئیسرائیل و دەوروبەری ٦حەوتوو دواتر سەفەری ڤێتنام دەکەم.

مانگێک دواتر گەڕامەوە لەهیستان و ڤیزایەکم بۆ چوونی شووڕەوی وەرگرت و لە مۆسکۆوە فڕیم بۆ هانۆی. پێرستی ئەو کەرەسانەی دەمەویست لە ڤێتنامیان بکڕم، بێجگە لە گوللەکاتیوشا، چەند دانە فڕۆکەی بارهەڵگری هێرکوول C-130یشی تێدا بوون. ئەم فڕۆکانە تاڵانێک بوون کە پاش کۆتایی شەڕ سوپای ڤیەتنامی باشوور لە مەیدانی شەڕ بەجێی هێشتبوون. ئەمن ماوەی ٢حەوتوو لە شاری «هۆشی مین» مامەوە و ٤٠٠٠٠٠ گوللەکاتیووشا و چەند دانە -SAM 7م کڕین و بڕیار درا پارەکەیان بدرێتە باڵیۆزخانەی ڤێتنام لە وارشۆ.

ڤێتنامییەکان، منیان بۆ دیتنی فڕۆکە C-130یەکان بردە فڕۆکەخانەیەکی سەربازی لە دەرەوەی شاری «هۆشی مین». ئەو فڕۆکە زەبەللاحانە کە پاشماوەی شەڕێک بوون کە ئەو هەموو مەرگ و وێرانییەی لێکەوتبۆوە، بێدەنگ و غەمناک لە فڕۆکەخانە ڕاوەستابوون. ئەمن بە جیددی گوتم ٨٥ دانە لەو فڕۆکانە دەکڕم،

بەڵام بۆ هەڵبژاردنی باشەکانیان شارەزایی تەکنیکیم نەبوو. بۆ ئەو مەبەستە، مانگی دیسامبر، نیوەی کارناسانی هێزی ئاسمانی و پیشەسازیی فڕۆکەسازیی ئیسرائیل بە فڕۆکە چوونە وارشۆ و لەوێوە دەگەڵ نوێنەرێکی لەهیستانی چوونە ڤێتنام. ئەوان ماوەی مانگێک لە شاری «هۆشی مین» مانەوە و پاش سەیرکردن و هەڵبژاردنی فڕۆکەکان ڕێوشوێنی بەڕێکردنی وانیان دانا.

پاشان باڵەکان و ماتۆڕەکان و هێندێ پارچەی دیکەیان لێکرانەوە و بۆ چاککردنەوە ناردرانە وڵاتی جۆراوجۆر. بۆ دڵنیابوون لە نهێنی-مانەوەی ناوی ئەو شوێنە کە فڕۆکەکانی لێکراون،ئیشکەرانی کەشتییە لیبریایی‌یەکان کە فڕۆکەکانیان بار دەکردن، لە نێوەڕاستی ئوقیانووس گۆڕران، بۆئەوەی کەس نەزانێ ئەوانە لە کام وڵاتەوە هێنراون. ١٢دانە لەو فڕۆکانە بۆ چاککردنەوە درانە «کۆمپانیی پیشەسازیی باکووری خۆرئاوا» لە کانادا. ئەم کارە بە عەمەلیاتێکی بەرین ئەنجام درا و لە کۆتاییدا درانە دەستی ئێران. ڤێتنامییەکان هەریەک لەو فڕۆکانەیان بە ٢٠٠٠٠٠ دۆلار بە ئێمە فرۆشت. ئێمە هەریەکەی ٢ میلیۆن دۆلارمان لە چاککردنەوەیان دا و یەکی بە ١٢ میلیۆن دۆلار بە ئێرانییەکانمان فرۆشتەوە.

هەرچەند ئەو فڕۆکانە لەجێدا هی ئەمریکایی‌یەکان بوون بەڵام تاقەسەنتێکیش نەدرا بەوان. بەپێی کۆنڤانسیۆنی ژنێڤ، هەر جۆرە کەرەسە و ئامرازێکی شەڕ کە وڵاتێک لەشەڕدا بەدەستی دێنێ، هی خۆیەتی. کەوایە ڤێتنامییەکان دەیانتوانی ئەو فڕۆکانە بە هەرکەس بیانەوێ بفرۆشن. ئەمریکایی‌یەکان نەیاندەتوانی باوەڕ بکەن کە ئیسرائیلییەکان زراوی ئەوەیان هەبێ بچنە ڤێتنام و لەوێ فڕۆکە ئەمریکایی‌یەکان بکڕن و بەو قیمەتە سەرسوڕهێنە بە ئێرانییەکانیان بفرۆشنەوە.

لە سەردەمی شەڕدا جاری وایە سەر دەکەوی و هێندێ جاریش دەدۆڕێی. هێندێ جار دوای کۆتایی ڕووداوەکەش درێژە بە دۆڕانی خۆت دەدەی.

کاتێک لە ساڵی ١٩٨٥دا، ئەمن سەفەری لەهیستان و شووڕەویم دەکرد، ڕووداوێکی سەرنجڕاکێش لە بەشێکی دیکەی دنیا بەڕێوە بوو. بەوجۆرە کە ئیسرائیل و نیکاراگوا بە نهێنی لەبارەی نوێکردنەوەی پێوەندییە سیاسییەکانەوە پێکەوە خەریکی وتوویژ بوون. ئەم وتوویژە نهێنییانە دەگەڵ حکوومەتی «سەندی نیستا» لەڕاستیدا سێ ساڵ پێشتر دەستیان پێکرابوو.

ساڵی ١٩٨٢، حکوومەتی نیکاراگوا بە شێوەی سەرەتایی دەگەڵ ئیسرائیل ڕێککەوتبوو کە پێوەندییەکانی دەگەڵ PLO بپچڕێنێ و ئیسرائیلییەکانیش لە بەرامبەردا نەخشی نێوبژیوان لەنێوان «سەندی نیستا» و دێموکراتەکانی کۆنگرەی ئەمریکادا یاری بکەن. بەڵام ئەم بەرنامەیە هیچوەخت کردەیی نەکرا. «ئاریەل شارۆن» کە ئەودەم وەزیری بەرگریی ئیسرائیل بوو، هاوکاریی دەگەڵ تاقمێکی بازرگان-پیشە دەکرد کە لە ئەمریکای ناوەندی خەریکی گەیاندنی کەرەسەی شەڕ بە کۆنتراکان بۆ ڕووخاندنی حکوومەتی «سەندی نیستا» بوون.

کەمێک پێش ڕاگەیاندنی تازەبوونەوەی پێوەندیی نێوان ئیسرائیل و «سەندی نیستا»کان، «شارۆن» بڕیاری دا، بە ناوی پشوودان چەند ڕۆژێک لە سنووری نێوان نیکاراگوا و هیندووراس و نیزیک ئۆردووگاکانی کۆنتراکان بەسەر بەرێ. ئەم کارەی «شارۆن» بۆ من جێی باوەر نەبوو و بێگومان زیانی بە دامەزراندنی پێوەندیی سیاسیی نێوان نیکاراگوا و ئیسرائیل و گۆڕینەوەی باڵیۆز لەنێویاندا گەیاند. «سەندی نیستا»کان پێیان نەزانی کە ئەگەرچی «شارۆن» یەک لە وەزیرانی کابینەی ئیسرائیل بوو، بەڵام پێوەندییەکانی دەگەڵ کۆنتراکان تایبەتی بوون و پەیوەندییان بە حکوومەتی ئیسرائیلەوە نەبوو. لەمبارەیەوە پرسیار ئەوەیە کە داخوا «شارۆن» ئەم

سەفەرەی بە پێشنیاری CIA کردوە کە قاچاغچییەکانی کەرەسەی هۆشبەری بۆ ڕووخاندنی حکوومەتی نیکاراگوا هان دەدا، یان پاڵنەرێکی دیکە بۆ ئەو سەفەرە لەکاردا بووە.

ئێستا، پاش سێ ساڵ و لە ئاکامی ئەو موعامەلەیەدا کە ئێمە لەبارەی کەرەسەی شەڕەوە لە وارشۆ کردمان، لەهیستانییەکان کە پێوەندییان لەگەڵ «سەندی نیستا»کان هەبوو و ڕاوێژکارە تەکنیکییەکانیان کە لە ماناگوا خەریکی کاری خۆیان بوون، پێشنیارێکی سەرنجڕاکێشیان هێنایە گۆڕێ. پێشنیارەکە ئەوە بوو کە ئیسرائیل بێ ئاگاداریی ئەمریکا، کەرەسەی شەڕ بۆ «سەندی نیستا»کانیش بنێرێ و بەم هۆیەوە ململانەی نێوان کۆنتراکان و «سەندی نیستا»کان ئارامتر بکا.

«سەندی نیستا»کان پێویستییان بە هێزی هەوایی هەبوو، بەڵام بۆ ئەوە دراوێکیان بەدەستەوە نەبوو. بۆ چارەسەری ئەم کێشەیە، ئیسرائیل دەگەڵ باوەڕی لەهیستانییەکان زۆر موافیق بوو، بۆیە پێشنیاری کرد کە هەرچەند پێوەندیی ڕەسمیی دیپلۆماتی لەنێوان ماناگوا و ئیسرائیل ساردە، بە نێوبژیوانیی لەهیستانییەکان، چەند فڕۆکەیەکی میگی ٢٣ی شووڕەوی لە ئەنگۆلا بکڕرێن و بدرێن بە نیکاراگوا. شووڕەوی نەیدەتوانی فڕۆکە بە نیکاراگوا بفرۆشێ، چونکە ئەمریکاییەکان هەڕەشەیان کردبوو کە ئەگەر شووڕەوی کەرەسەی شەڕ بە نیکاراگوا بفرۆشێ، دەستدرێژی دەکەنە سەر نیکاراگوا.

بەڵام ئێستا لەهیستان نەخشەی کێشابوو کە سواری ملی ئەمریکا بێ. بەرنامەکە ئەوە بوو کە ئێمە بە بڕی ٢٨ میلیۆن دۆلار لە «سەرمایەی ڕەش»، ٨ دانە فڕۆکەی میگی G_23 کە ئەنگۆلا هەیەتی، بۆ «سەندی نیستا»کان بکڕین و لەهیستانییەکان ئەوان لە خاکی خۆیاندا ڕابگرن. بەڵام، هەرچەند لەهیستانییەکان بۆخۆیان ئەم بەرنامەیەیان داهێنابوو، لەنەکاو نەزەری خۆیان لەبارەی ئەو نەخشەیەوە گۆڕی. هۆیەکەشی ئەوە بوو کە لەهیستانییەکان بیریان

کردبۆوە کە وێدەچێ ئیسرائیلییەکان ئەو کارە بە ئامانجێکی تایبەتی ئەنجام بدەن. بەو مانایە کە مێگەکانی شوورەوی وەختێک بگەنە نیکاراگوا کە هەستی شەڕ بەدژی «سەندی نیستا» لە واشینگتۆن بەهێزە، ئێمە بەو کارە بیانوو دەدەینە دەست ئەمریکایی‌یەکان کە هێرش بکەنە سەر نیکاراگوا.

یەکێک لە لەهیستانییەکان کە پێوەندیی بە منەوە هەبوو گوتی: «ئێمە پێمان وایە، ئیسرائیلییەکان وەرگێڕکە و نۆکەری ئەمریکایی-یەکانن.» هەرچەند ئەم بەرنامەیە بەوجۆرە ئەنجام نەدرا، بەڵام بەخۆشییەوە زیانی بە پێوەندییەکانی ئێمە و لەهیستانییەکانیش نەگەیاند.

دیسامبری ساڵی ١٩٨٥، ئەمن لە یەکێک لە سەفەرەکانی خۆم بۆ لەهیستان بووم. پێش ئەوە، چەند ڕۆژێکم دەگەڵ «فریدی» و «هێرووت» بەسەر بردبوو و ئێستا ئەوان بۆ سەردانی بنەماڵەکەیان چووبوونە نیکاراگوا. لەسەر تەختەکەم لە هۆتێلێکی وارشۆ کە زۆر سارد بوو، ڕاکشابووم و هەوڵم دەدا بخەوم، کە تەلەفونی ژوورەکەم زەنگی لێدا. لە تاریکاییدا تەلەفونەکەم دۆزیەوە و هەڵمگرت. دواقسەکانی تەلەفونکەر کە سارد و ناهومێدیبزوێن بوون، منیان ڕەق هەڵێنا.

«ئەوان مردن. ئاری... فریدی و هێرووت مردن»

ئەمن لە ژیانمدا ئەزموونی زۆر فێر بووم. ئەمن فێر بووم لە ڕووداوە شوومەکان، پێشهاتی بەختیاری‌ساز بۆخۆم دروست بکەم. بەڵام لەتوانامدا نیە ڕوونی کەمەوە بە بیستنی ئەو هەواڵە چ هەستێکم بۆ دروست بوو... بە بیستنی ئەو هەواڵە، لەوساتەی نیوەشەودا، لەڕاستیدا شتێکیش لەمندا مرد.

لە تاریکاییدا دانیشتم و ئارەق لە لەشم هەڵچۆڕا. ئەمن تەنانەت لەوحاڵەشدا دەمزانی ئەو پێشهاتە بە ڕێکەوت نەبووە.

پێیانگوتم، ئەو بۆ سەردانی یەکێک لە دۆستانی کە ژنێکی پزیشک بووە و لە دەرمانخانەیەکی تازەسازکراوی دێهاتی نیکاراگوا کاری کردوە، لە سەفەردا بووە کە لەنەکاو لۆرییەکی دزراو بەرەوڕووی هاتوە و لە ترومبێلەکەی ئەوی داوە. شۆفێری لۆرییە دزراوەکە، بە ترومبێلێکی دیکە ڕایکردوە و ون بووە.

لە نیکاراگوا، سەرەخۆشی بۆ فرێدی دانرا، بەڵام ئەمن نەچوومە وێ. خەمۆکیی دەروونی و هەست بە گوناح لەپێیان خستبووم. ئەمن وەختی پێویستم بۆ ژیان لەگەڵ هیچکامێکیان دانەنابوو.

تەنانەت ئەمڕۆش بیرکردنەوە لە «فرێدی» و «هێرووت» بۆ من بەژانە. ئەو کاتەی خەبەری مەرگی وان حەبەساندمی، بۆ لەبیرکردنی کۆستێکی وا، بێجگە لە خەریکبوون بەکارەوە ڕێگایەکم بەر چاو نەدەکەوت.

چونکە ئەمن چووکترین ئەندامی کۆمیتەی هاوبەش بووم، ئەرکی هەوڵدان بۆ پەیداکردنی فڕۆکە و کەرەسەیەکی شەڕ کە ئیسرائیل بتوانێ بیانکڕێ و بە تارانیان بفرۆشێتەوە، خرابووە ئەستۆی من. ئیشکەرانی دیکەی کۆمیتە کارەکانی خۆیان بە تەلەفون و تێلێکس جێبەجێ دەکرد. هاوینی پێش مردنی «فرێدی» و «هێرووت» لە مانگی ئووتی ساڵی ١٩٨٥دا ئێمە خەبەرمان زانی کە «مەنگیستو هایله ماریام» Mengistu Haile Mariam ڕێبەری وڵاتی ئەتیووپی، چەند دانە جێتی ڕزیوی ئەمریکایی F-4 و F-5ی هەن کە لەبەر کۆنی لە کەلکی کارکردن کەوتوون. هەرچەند ساڵی ١٩٧٨ بەهۆی ئەوەی مەنگیستو ڕووی کردبووە سۆڤیەتەکان، پێوەندیی ڕەسمیی ئیسرائیل و ئەتیووپی پچرابوو، ئیسرائیل هێشتا پێوەندیی دەگەڵ ئادیس ئەبابا هەبوو.

بە کۆمەگی لەهیستانییەکان، ئەمن ئاگادار کرام کە کارێک کراوە بۆخۆم دەگەڵ «مەنگیستو» دانیشم. ئەمن دەگەڵ کارناسێکی هێزی

هەوایی ئیسرائیل چوومە ئادیس ئەبابا و ئێمە بانگهێشتن کراین کە پێش دیتنی ڕێبەری ئەتیووپی، سەری فڕۆکەکان بدەین.

ئێمەیان بردە فڕۆکەخانەیەک لە دەرەوەی پێتەخت کە لەبەر گەرما هەڵمی لێ‌هەڵدەستا. لەو فڕۆکەخانەیە ١٢ دانە فڕۆکەی F-4ی لەکارکەوتوو هەبوون. بەدەنەکەیان ژەنگی هێنابوو، ماتۆڕەکانیان لەکار کەوتبوون و تەگەرەکانیان دڕابوون.

بە دۆستەکەمم گوت: «ئەمن هیچ حەز ناکەم بچمە ژووری یەکێک لەوانە».

ئەو شەقێکی لە یەکێک لە تەگەرەکانی فڕۆکەیەک هەڵدا و لەناکامدا توێخی ژەنگ‌هەڵێناوی ئاسنی تەگەرەکە هەڵوەری. ئەو گوتی: «خەراپ نیە چاوێکیان لێ‌بکەین. هاوکارەکانمان لە چاککردنەوەی فڕۆکەدا زۆر کارامەن.»

«مەنگیستو» کە بە هۆی سوپاوە، دەسەڵاتی ئەتیووپیی بەدەستەوە گرتبوو، بە گەرمی بەخێراتنی کردین. ئەو پیاوێکی کزەڵە و جوانچاک بوو کە لە ساڵەکانی دەیەی چلەمی تەمەنیدا بوو. ئەو وەک کەسێکی دەرس‌خوێندوو کە شەرافەتمەندانە باوەڕی بە شۆڕشە مارکسیستییەکەی خۆی هەبوو، کاری کردە سەر من. ئەو پێی لەوە نا کە وڵاتەکەی کۆمەڵگەیەکی هەژاری‌لێدراوە، بەڵام کاتێک شۆڕش بکەوێتە سەر گەڕ، هەموو شتێک چاک دەبێ.»

ئێمە دەسبەجێ دەستمان بە گفتوگۆ بۆ کڕینی فڕۆکەکان کرد.

ئەو گوتی: «ئێوە بەخێر بێن بۆ کڕینی فڕۆکەکان. قیمەتی هەرکامێکیان ٢٥٠٠٠٠ دۆلارە.

لێی زیاد کرد کە نرخەکەیان لە پێشدا دەبێ لە بانکێکی سویس بخرێتە حیسابێکەوە.

پێمگوت، لەوبارەیەوە بیر دەکەینەوە و ئاکامەکەی بەو دەڵێین. کاتێک ئێمە خەریک بووین بەجێی بێڵین، گوتی، ١٩ فڕۆکەی F-5یش بۆ فرۆشتن ئامادەن. ئەمن و دۆستەکەم دووبارە بۆ دیتنیان چووینەوە فڕۆکەخانەکە. ئەمجار دۆستەکەم سەری ڕاوەشاند.

ئەو گوتی: «ناتوانین هیچ ئومێدێکمان بەمانە هەبێ، بەڵام فڕۆکە F-4ەکان بە هەوڵ و تێکۆشانێکی زۆر چاک دەکرێنەوە.»

پاش گەڕانەوە بۆ تەل ئەبیب، پێوەندیم بە ئێرانییەکانەوە گرت. ئەوان گوتیان بە مەرجێک فڕۆکەکان دەکڕن کە ئیسرائیل چاکیان بکاتەوە. لەلایەکی دیکەوە، حکوومەتی ئیسرائیلیش بێئەوەی ئێرانییەکان قەولی کڕینیان بدەن، ئامادە نەبوو نۆژەنیان بکاتەوە. ئەم بابەتە بووە هۆی ئەوەی ئێمە لە موعامەلەی فڕۆکەکاندا تووشی بن-بەست بین... هەتا لەهیستانییەکان ڕێگایەکی چارەسەریان بۆ دۆزیەوە. بەو مانایە کە لەهیستانییەکان کەسێک پەیدا دەکەن کە وەبەرهێنان (سرمایەگذاری) لەسەر فڕۆکەکان بکا. بۆ ئەو کارە ئەمن گەڕامەوە لەهیستان و لەهیستانییەکان منیان بە «هانس کاپ» Hans Copp کە بازرگانێکی سویسی و مێردی وەزیری دادی سویس بوو، ناساند.

وەختی شێو ئەمن لە «هانس کاپ»م پرسی: «ئەم کارە بۆ تۆ کێشە نیە؟ چونکە بەپێی قانوونەکانی سویس، لەبەر ئەوەی ئێوە وڵاتێکی بێلایەنن، نابێ وەبەرهێنان لەسەر کەرەسەی شەڕ بکەن.»

ئەو پێکەنی و گوتی: «نیگەران مەبە دۆستەکەم، وەبەرهێنان لەسەر ئەم کارە بەهۆی ئەو کۆمپانییانەوە دەکرێ کە یاری بە بەڵگەکان دەکەن.»

هەر ئەو کاتەی لە وارشۆ بووم، تەلەفونم بۆ یەکێک لەو ئێرانییانە کرد کە پێوەندیم لەگەڵیان هەبوو (دوکتۆر ئۆمشی) و بەڵێنم لێ-وەرگرت کە ئەگەر فڕۆکە F-4ەکانی ئەتیووپی بەباشی نۆژەن بکرێنەوە، ئێرانییەکان بیانکڕن. دوایە لەهیستانییەکان، دیدارێکی سێ-قۆڵییان لە نێوان من و «مەنگیستو» و «کاپ»دا ڕێکخست. ئەوجار ئێمە بە فڕۆکە چووینە ئادیس ئەبابا و لە ئاکامی وتوویژ دەگەڵ «مەنگیستو»دا نرخی فڕۆکەکانمان هەتا ١٥٠٠٠٠ دۆلار هێنایە خوارێ.

ئەو دووبارە لەبارەی هیواکانی بە شۆڕشەوە دەستی بە قسە کرد.

پێیم گوت: «بەڵام ئێستا ئاسۆ زۆر ڕوون و جێی ئومێد نیە.»
ئەو شانی هەڵتەکاند و گوتی: «بۆ هەر شۆرشێک دەبێ نرخێک بدرێ.»
«مەنگیستو» ژمارەحیسابێکی نهێنیی لە بانکێکی سویس، دا بە من و ئەمن گەڕامەوە تەل ئەبیب. لە تەل ئەبیب، وا ڕێکخرا کە تیمێک بچێتە ئەتیووپی و فرۆکەکان لە ڕێگای بەندەری «ئەسمەرە» Asmaraوە بۆ نۆژەنکردنەوە بگوازێتەوە ئیسرائیل. گوازتنەوەی فڕۆکەکان کارێکی ئاسان نەبوو، بەڵام بەو جۆرەی دۆستەکەم پێشتر گوتبووی، کارمەندەکانی ئێمە کەسانی زۆر کارامە بوون.
نرخی ١٢ فڕۆکەی F-4 کردیە ١٨٠٠٠٠٠ دۆلار و ئێمە زۆرمان حەز دەکرد بە پارەی کەسێکی نێوبژیوان بیانکڕین. چونکە هەرچەند فڕۆکەکان ٢٠ ساڵ کۆن بوون، بەوحاڵە ئەگەر ئەمریکاییەکان پێیان زانیبایە لێمان دەڕەنجان. بۆیە کەلکوەرگرتن لە کەسێکی بێگانە بۆ ئەنجامدانی ئەوکارە باشترین چارەسەر بوو.
ئێمە بەرنامەی کارەکەمان وا ڕێکخست کە «هانس کاپ» بەڵگەیەکی دروستکراوی ١٨ میلیۆن دۆلاری بە ناوی یەکێک لە کۆمپانییە فەرانسەییەکانی دەلاڵی فڕۆکە بەناوی SFAIR دەربکا کە لە هەردوو فڕۆکەخانەی پاریس و مارسەی دەفتەری کاری هەیە. ناوی ئەو کەسەی بەڵگەکەی بە ناو دەرکرا «دانیال ج کۆهێن» Daniel j Cohen بەڕێوەبەری تەکنیکیی SFAIR لە مارسەی بوو. (جێی سەرنجە کە «گەیتس»یش زۆربەی کاتەکان ناوی دروستکراوی Dan Cohenی بەکار دێنا). ئێمە داوامان لە کۆهێن کرد پووڵەکە بڕژێنێتە حیسابێکی تایبەتیی بانکی «وۆرمز»ی ژێنێڤەوە. لە سەنەد و بەڵگەنامەکانرا وا دەهاتە بەرچاو کە کۆمپانیی SEAIR موعامەلەکەی کردوە. لەڕاستیدا، پارەکە بە نهێنی دەڕژایە حیسابی «مەنگیستو» لە General Trust Company کە دەفتەرەکانی لە ئادرەسی Baden Strass 21 لە زووریخ بوون.

پێش ئەوەی پووڵەکە بخرێتە حیسابی بانکی لە نێوان ئیسرائیل و «کاپ» مووافەقەت کرا کە بۆ هەر فڕۆکەیەک ٢٥٠٠٠٠ دۆلاری بدرێتێ -بەو مانایە کە ئەو لە هەر فڕۆکەیەک ١٠٠٠٠٠ دۆلار قازانجی دەست دەکەوت. بەڵام دەبێ بزانین کە ئەگەر ئەو نەبایە ئەم سەودایە سەری نەدەگرت، بەتایبەتی کە دەبوو فڕۆکەکان بەهۆی ئەوەوە بنێردرێنە ئێران.

بۆ هەموو کەس ڕوون بوو کە ساڵێکی دەخایاند تا فڕۆکەکان ئامادەی وەڕێکەوتن بۆ ئێران بن. بێجگە لە باری دارایی زۆرکاری دیکەش بۆ ئەنجامدانی ئەو موعامەلەیە پێویست بوون.

هەرکە پووڵەکە ڕژایە حیسابی General Trust Companyیەوە، ئیسرائیلیش بە هاوهەنگاویی باڵیۆزخانەی ئەتیووپی لە ئیتالیا، تیمێکی لۆژیستیکیی نارده ئادیس ئەبابا. لەوکاتەدا کە فڕۆکە F-4ەکان دەگوازرانەوە بەندەری ئەسمەرە، ئێمە دەگەڵ ئێرانییەکان قەرارمان دانا کە فڕۆکەکان دوای نۆژەنکردنەوە و دانانی ماتۆڕی تازە لەواندا، هەرکامەی بە میلیۆنێک دۆلار بەوان بفرۆشرێ.

لەوکاتەدا کە کارەکە دەچووە پێش، بۆ نهێنیڕاگرتنی موعامەلەی ئەسڵی کەلک لە سەرپۆشێکی زۆر سەرنجڕاکێشی دیکە وەرگیرا. بەوجۆرە کە «جان دو لارۆک» پێوەندیی دەگەڵ «ریچارد برێنێک» Richard Brenneke کە سەوداگەرێکی کەرەسەی شەڕ بوو گرت و پێشنیاری پێکرد کە ئەگەر ئەو قبووڵ بکا، لە شاری «پوورتلەند»ی ئەیالەتی «ئۆرگن»ی ئەمریکاوە بچێتە ئورووپا و لێکۆڵینەوەی پێویست لەسەر چۆنیەتیی دانی نرخی ١٩ فڕۆکەی F-5 لە ئەتیووپی بکا. ئەو تەواوی خەرجی سەفەرەکانی بۆ بەئەستۆوە گرت. کارمەندانی هەواڵگریی ولاتانی جۆراوجۆر زۆر بەوردی هەموو ئەو کاروبارەیان لەژێر چاوەدێریدا بوو، بێخەبەر لەوەی موعامەلەی ڕاستەقینە لەمێژە تەواو بووە. خۆشتر ئەوە بوو کە «برێنێک» بە خۆهەڵکێشانەوە بە هەواڵنووسێکی گۆڤاری سویسیی Sonntags

Blickی کە لە ئەمریکا کاری دەکرد، گوت کە ئەو لەلایەن «هانس کاپ»ەوە خەریکی کڕینی فڕۆکەکانی ئەتیووپییە.

گۆڤاری Sonntags Blick بە ترش‌وخوێیەکی تایبەتەوە داستانی کڕین و فرۆشتنی فڕۆکەکانی بڵاو کردەوە، بەڵام «کاپ» دەسبەجێ گۆڤارەکەی خستە ژێر لێپرسینەوەی قانوونی، چونکە ڕاستییەکە ئەوە بوو کە ئەو نە هیچ موعامەلەیەکی دەگەڵ «برێنێک» کردبوو، نە بەنیاز بوو کارێکی وا بکا. بەڕاستی موعامەلەکە پێشتر تەواو ببوو. «کاپ» بەهۆی جێگە و پێگەی هاوسەرەکەیەوە کە وەزیری دادی سویس بوو، بۆ ڕواڵەت سکاڵاکەی درێژە دا.

جگە لەوانەی لەو سەودایەدا فریو دران و بوونە قوربانیی قازانجی خەڵکی دیکە، هەموو کەسەکانی دیکە ئەرکەکانیان بە باشی ئەنجام دا. ئێران چەند فڕۆکەی تازەی دەست کەوتن، «کاپ» بەو سوودەی لە سەودایەکە دەستی کەوت گیرفانی پر کرد، لەهیستانییەکان هەقدەستی نێوبژیوانیی خۆیان وەرگرت، «مەنگیستو» حیسابە بانکییەکەی بە دراو ئاخنی و «سەرمایەی ڕەش»ی ئیسرائیلییەکانیش زۆر چووە سەر. کۆمیتەی هاوبەشی ئێران – ئیسرائیل، بۆ نۆژەنکردنەوەی هەر فڕۆکەیەک یەک میلیۆن دۆلاری دا بە پیشەسازیی فڕۆکەسازیی ئیسرائیل و لەسەریەک، بە لەبەرچاوگرتنی هەموو خەرجەکان هەر فڕۆکەی بە ١١٥ میلیۆن دۆلار تەواو بوو. بەڵام، ئێمە هەریەک لە فڕۆکەکانمان بە ٤ میلیۆن دۆلار بە ئێرانییەکان فرۆشت. ئێمە سوودەکانی خۆمان لەو سەودایەمان لە سەرانسەری دنیادا خستە بانکی جۆراوجۆرەوە.

لەو سەودایەشدا تەنانەت یەک سەنت نەدرایە ئەمریکایییەکان. ئەو جێتانە هەرکامیان ٢٠ ساڵ کۆن بوون و بەپێی ڕێککەوتننامەیەک کە ئەمریکا دەگەڵ ئیسرائیلی ئیمزا کردبوو، لە هەموو بارێکەوە ئێمە هەقمان هەبوو بیانکڕین و دوایە بیانفرۆشینەوە.

عەمـەلیاتی هاوبـەش بەوپـەڕی سـەرکەوتنەوە دەچـووە پێش، بـەڵام بێسەرەوبەرەیی‌یەک کە بە هۆی هاوپەیمانیی سەیروسەمەرەی دوو حیزبی کرێکار و لیکوودەوە لـە حکوومـەتی ئیسرائیلدا پێک‌هات، بۆ ئێمە و هـەروەها بۆ هـەموو دنیا ئاکام و شـوێنەواری سـەرسـوڕهێنی بـەدوادا هـات. سـاڵی ١٩٨٥، کاتێـک «شـیمۆن پرێـز» ڕێبـەری حیزبـی کرێکـار حکوومــەتی لــە ئیســرائیل بەدەســتەوە گــرت، بناخــەی ئابڕووچوونێکی گەورەی سیاسی، واتە «ئێران کۆنترا» داڕژا.

لەکاتێکدا هەموو چاکسازیخوازەکان چاوەڕێ بوون «پرێـز» هەرکە بوو بە سەرۆکوەزیر، دەست بکا بە چاکسازیی نێوخۆیی و دەگەڵ عەرەبـەکان دەسـت بـە وتـووێژی ئاشـتی بکـا، یـەکێک لـە گرنگتـرین کارەکانی لە سەرەتای حکوومەتەکەیدا کە کەمتر کەوتە بەر سـەرنج، ئـەوە بـوو کـە هەواڵنووسـێکی تەلـەڤیزیۆنیی بـەناوی «ئـەمیرام نیـر» Amiram Nirی کردە ڕاوێژکاری خۆی بۆ دژایەتیی تێرۆریزم.

«نیـر» لەجێدا ئەفسـەرێکی جوانچـاک، بـەڵام زبـر و سـەختگیری سـوپا بـوو کـە لـە یەکەیـەکی تـانکی سـوپادا خزمـەتی دەکرد. ئـەو لـە ڕاهێنــانێکی فێرکاریــدا، چــاوێکی لەدەســت دابــوو و بــە پێچەوانــەی «مۆشـێ دایـان» کـە چـاوە کوێرەکـەی بـە پەڕۆیـەک دادەپۆشـی، نیـر چــاوێکی شووشــەیی کردبــووە جــێ‌نشـینی چــاوە کوێرەکــەی. پــاش ئـەوەی «نیـر» لـە خزمـەتی سـوپا کشـایەوە، وەک ڕاپـۆرتـنـووس و کارناسی کاروباری بەرگری چووە تەلەڤیزیۆن. ئەو دەگەڵ یـەکێک لـە دەوڵەمەندترین ژنانی ئیسرائیل بەناوی «جوودی مووسـی» کـە کچـێ خاوەنی گەورەترین ڕۆژنامەی زنجیرەیی ئیسرائیل بە ناوی «یەدیۆت ئاهارۆنات» Yediot Aharonot بوو، زەماوەندی کرد. وا دەهاتە بـەرچاو کە ئەو هەوڵ دەدا نیشان بدا کە پێویستیی بـە سـامانی ژنەکەی نیـە. ئەو جێی سەرنجی خەڵک بوو و ئەوەندە لەبەر دڵان بوو کە وەختێک لەسـەر شـاشـەی تەلەڤیزیۆن دەردەکەوت، خەڵک ئاشقی هـەر وشـەیەک دەبوون، کە لە زاری دەهاتە دەر.

هەروا کە هەڵبژاردنی ساڵی ١٩٨١ نیزیک دەبۆوە، «نیر» بە تەواوی باوەڕی وا بوو کە حیزبی کرێکار، حیزبی لیکوود دەبەزێنێ. لەسەر بناخەی ئەو بۆچوونە ئەو لە کارە تەلەڤیزیۆنییەکەی کشایەوە و وەک ڕاوێژکاری پێوەندییەکانی «شیمۆن پرێز» دەستی بە خزمەت کرد. بۆیە کاتێک حیزبی کرێکار لە هەڵبژاردندا دۆڕا، «نیر» بێکار مایەوە. ئەو بێگومان حەزی نەدەکرد کار بۆ ڕۆژنامەی هاوسەرەکەی بکا و ئەوی ڕاست بێ بنەماڵەی خێزانەکەشی پێیان خۆش نەبوو، ئەو لە ڕۆژنامەکەیان کار بکا. چونکە «شیمۆن پرێز» خۆی بە قەرزداری «نیر» دەزانی، ئەوی کردە سەرۆکی ستادی حیزبی کرێکار و بەوجۆرە، «نیر» بوو بە وەرگێڕکەی «پرێز». دیارە بە بەراورد دەگەڵ ئەو کارە گرنگانەی لەپێشیدا بوون، ئەم کارە بۆ ئەو جێی دڵخۆشی نەبوو، بەڵام هەرچۆنی بێ لە بێکاری چاکتر بوو.

ساڵی ١٩٨٤، کاتێک «پرێز» بەپێی ڕێککەوتنی پێشتر بۆ ماوەی دوو ساڵ بوو بە سەرۆکی حکوومەتی هاوپەیمانیی ئیسرائیل، «نیر»ی کردە ڕاوێژکاری دژی تێرۆریستیی خۆی. وەختێک «نیر» لە پۆستی ڕاوێژکاری دژی تێرۆریستیی سەرۆکوەزیری ئیسرائیلدا دەستبەکار بوو، «ڕافی ئەیتان» کە پێشتر ئەو پۆستەی بەدەستەوە بوو و لەو ڕێگایەوە توانیبووی، لە سەردەمی سەرۆکوەزیریی بگیندا، ڕایەڵکەیەکی بەربڵاوی جاسووسی لە ئەمریکا دروست بکا، ئەم ئامانجەی بەهۆی کاری تازەیەوە کە سەرۆکایەتیی «لاکام» Lakam یان بەشی زانستیی هەواڵگریی ئیسرائیل بوو، درێژە پێدا. کاتێک لە ساڵی ١٩٨٤دا، «نیر»یش بوو بە ڕاوێژکاری دژی تێرۆریستیی سەرۆکوەزیری ئیسرائیل، ناچار بوو کارەکەی لە سەرەتاوە دەست پێبکا، چونکە «ئەیتان» حازر نەبوو لەوبارەیەوە هیچ هاوکارییەکی بکا. بەڵام «نیر» توانی، هێندێ بەڵگە لەبارەی ئەو ڕایەڵکەیەوە کە «ئەیتان» لە ئەمریکا دروستی کردبوو و هەروەها لەبارەی فرۆشتنی

کەرەسەی شەڕ بە ئێران لە ڕێگای کۆمیتەی هاوبەشەوە بەدەست بێنێ کە ئەمە کاری ئەوی ئاسانتر دەکرد.

«پریز» و «نیر» دەگەڵ دۆخێکی دژوار بەرەوڕوو بوون. چونکە لە لایەک ڕێکخراوی هەواڵگریی ئیسرائیل کە بەدەست حیزبی لیکوودەوە بوو، حازر نەبوو هاوکارییان بکا و لەلای دیکە، حیزبی کرێکار هیچ دەسەلاتێکی لە کاروباری ماڵیی ئیسرائیلدا نەبوو، لەبەر ئەوەی، وەزارەتی کاروباری ماڵی لە سەردەمی سەرۆکوەزیریی «پریز»دا کەوتبووە دەستی حیزبی لیکوود. «لاکام»یش کە ڕۆژگارێک «سەرمایەی ڕەش»ەکەی لە خزمەتی جێبەجێکردنی بەرنامەکانی حیزبی کرێکاردا بەکار دەبرا، ئێستا کەوتبووە دەستی «ئەیتان». کۆمەڵگەی کەلیمییەکانی دەرەوەی ئیسرائیلیش، هیچ کۆمەگێکیان بە حیزبی کرێکار نەدەکرد. ئەگەر پووڵێکیش لە کەسێک وەرگیرابایە، دەبوو بە هی ئیسرائیل نەک حیزبی کرێکار.

ساڵی ١٩٨٥، کە نیزیکەی دوو ساڵ لە سەرۆکوەزیرییەکەی «شیمۆن پریز» مابوو، ئەو بۆ چارەسەری گیروگرفتی ماڵیی خۆی بیرۆکەیەکی بۆ هات. بەو جۆرە کە بڕیاری دا، فرۆشتنی کەرەسەی جەنگی بە ئێران لە دەستی کۆمیتەی هاوبەش و کۆمەڵەی هەواڵگریی ئیسرائیل (ڕێکخراوی هەواڵگریی سوپا و مۆساد) دەربێنێ و ئیدارەکەی بداتە کەسانی نیزیک لە خۆی.

بەلام «پریز» بە زوویی تێگەیشت کە کۆمەڵەی هەواڵگریی ئیسرائیل و ئیسحاق شامیر، جێگری سەرۆکوەزیر بەهیچ جۆر بە بەرنامەیەکی وا ڕازی نابن و بۆیە بڕیاری دا، کاناڵێکی تازە بۆ فرۆشتنی کەرەسەی شەڕ بە ئێران ساز بکا و لەوبارەیەوە دەگەڵ عەمەلیاتی کۆمیتەی هاوبەش بکەوێتە ململانە. «پریز» بیری کردەوە کە هەرچەند ڕێکخراوی هەواڵگریی ئیسرائیل پێوەندیی دەگەڵ کەسێکی بەهێزی وەک «ڕابێرت گەیتس» هەیە، بەوحاڵە بە دروستکردنی کاناڵێکی تازە بۆ ئەو کارە، عەمەلیاتی فرۆشتنی

کەرەسەی شەڕ بە ئێران لە دەستی ڕێکخراوی هەواڵگریی ئیسڕائیل دێنێتە دەر و بێجگە لەوە پووڵێکی زۆریش دەڕێژێتە گیرفانی کەسانی نزیک لەخۆی. کەسێک کە «پرێز» بۆ سەرپەرستیی ئەو عەمەلیاتە هەڵیبژارد، «نیر» بوو.

«نیر» توانای ئەنجامدانی ئەو ئەرکەی نەبوو. ئەو نە ئەزموونی کاری هەواڵگریی هەبوو، نە سەری لە کاروباری بازرگانی دەردەچوو. بۆیە چونکە ئەوکارە بەدەر لە توانای ئەو بوو، کەوتە هەوڵی ڕاکێشانی یارمەتیی خەڵکی دیکە. یەکێک لەو کەسانە کە ئەو بۆ ئەومەبەستە هەڵیبژاردن، بازرگانێکی ئەمریکایی – ئیسڕائیلی بوو بەناوی «ئاڵ شویمەر» Al Schwimmer کە پێشتر لە کارخانەی فڕۆکەسازیی ئیسڕائیلدا کاری دەکرد و ئاشنایەتیی لەگەڵ کۆمەڵە کەسێک هەبوو کە شارەزای کڕین و فرۆشتنی کەرەسەی شەڕ لە جیهاندا بوون. لەوکاتەوە کە حیزبی کرێکار لە ساڵەکانی دەیەی ١٩٦٠دا لە لووتکەی دەسەڵاتدا بوو، «پرێز» ئەوی لە ئەمریکاوە هێنابۆوە ئیسڕائیل.

یەکی دیکە لەو کەسانەی «نیر» بۆ ئەو مەبەستە پێوەندیی پێوە گرتن، «یەعقووب نیمڕوودی» یەکێک لە دەوڵەمەندترین پیاوانی ئیسڕائیل بوو. ئەو ئیسڕائیلییەکی بەڕەگەز عێراقی و پاشکۆی سەربازیی پێشووی ئیسڕائیل لە ئێران بوو، کە لە سەرەتای ساڵەکانی دەیەی ١٩٦٠دا، یەکەم هەنگاوی بۆ فرۆشتنی کەرەسەی شەڕ بە ئێران هەڵێنابۆوە. ساڵی ١٩٦٧ پاش کۆتایی شەڕی خۆرهەڵاتی نێوەڕاست، ئەو گەڕایەوە تەل ئەبیب و داوای لە ستادی هێزەکانی بەرگریی ئیسڕائیل کرد بیکەنە فەرماندار (قایمقام)ی لێواری خۆرئاوا کە تازە لەلایەن ئیسڕائیلەوە داگیر کرابوو. ئەو ئیدیعای دەکرد کە چونکە جوولەکەیەکی خۆرهەڵاتی نێوەڕاستە باش لە عەرەبان تێدەگا و دەیەویست وەک پردێک بۆ ئاشتیی نێوان ئیسڕائیل و فەلەستینییەکان ئەرک وەئەستۆ بگرێ. کاتێک ستادی هێزەکانی

بەرگریی ئیسرائیل پێی‌گوت کە ئەو کارەی ناداتێ، ئەو گوتی ئەگەر ئەو پۆستەم نەدەنێ، لە سوپا دەکشێمەوە و دەبم بە میلیۆنێر.

هەموو ئەو کەسانەی گوێیان لەو قسەیەی «نیمرۆودی» بوو، پێکەنین و گوتیان: «برۆ ببە میلیۆنێر.»

ئەو، هەموو ئەو کەسانەی تووشی سەرسوڕمان کرد. چونکە، هەر کە دەستلەکارکێشانەوەکەی لە خزمەتی سوپا پەسند کرا، گەڕایەوە تاران و بە هۆی پێوەندییەکی دۆستانەوە کە دەگەڵ شای هەبوو، ڕەزامەندیی ئێرانییەکانی وەرگرت کە هەموو ئەو کەرەسە جەنگییانەی لە ئیسرائیلەوە دێنە ئێران ئەو بیانکڕێ و هەقی دەلالی وەربگرێ. ئەو لە ئێران دەستی بە هێندێ موعامەلەی دیکەش کرد و ئێستا سامانەکەی بە دەوری ٢ ملیارد دۆلار دەقەبلێندرێ. پاش ئەوەی ساڵی ١٩٧٩ لە ئێران شۆرش کرا، «نیمرۆودی» پووڵێکی یەکجار زۆری هەبوو، بەلام کارێکی گونجاو و جێی ڕەزامەندیی نەبوو. دەبێ بگوترێ، لەجێدا دیار نەبوو «نیمرۆودی» سەربە کام حیزبی ئیسرائیلە. چونکە لەحاڵێکدا تاڕادەیەک خۆی سەربە حیزبی کرێکار دەزانی، لەمێژساڵ بوو دەگەڵ هەردوو حیزبی کرێکار و لیکوود هاوکاریی دەکرد. ئەو بەتایبەتی ئۆگرییەکی زۆری بە «ئاریەل شارۆن» هەبوو، چونکە کاتێک ئەو بە گەنجی لە هێزەکانی بەرگریی ئیسرائیلدا خەریکی خزمەت بوو، لەژێر فەرماندەریی «ئاریەل شارۆن»دا ئەرکی خۆی بەجێ دێنا.

«ئامیرام نیر»، «ئەششووەیمیر» و «یەعقووب نیمرۆودی» واتە سێ کەسی گرنگ کە سەرەتای ساڵی ١٩٨٥ بڕیاریان دا کاناڵێکی دیکە لە ململانە دەگەڵ «ئۆرا»دا بۆ فرۆشتنی کەرەسەی شەڕ بە ئێران دروست بکەن، هەموو پێیان وابوو کە دەبێ بۆ ئەو کارە پشتیوانیی ئەمریکا بەدەست بێنن. «نیر» کە لە پێوەندیی تایبەتی «ڕابێرت مەک فارلین» دەگەڵ «ئەیتان» ئاگادار ببوو، بڕیاری دا کە دەبێ کارەکە لە پێوەندی‌گرتن بە «مەک فارلین»ەوە دەست پێ بکا.

بـه هـەرحاڵ،«مـەک فـارلین» ڕاوێژکـاری ئەمنیـەتیی سـەرکۆماری ئەمریکا بوو.

«نیـر» و هاوڕێیـەکانی، بەباشـی ئاگـادار بـوون کـە کۆمەڵگـەی هـەواڵگریی ئیسـرائیل لـە هـەموو سـەرچاوەکانی بلـووکی خۆرهـەڵات، ئـەمریکا و زۆربـەی وڵاتـانی دنیـا بـۆ کڕینـی کەرەسـەی شـەڕ و فرۆشتنەوەی بە ئێران کەلکی وەرگرتبوو. تەنانـەت «ئیسـحاق ڕابین» کە ئەوکاتە وەزیری بەرگری بوو، بەنیاز نـەبوو کۆسـپێک بخاتـە سـەر ڕێگای ئێمـە بۆ فرۆشتنی کەرەسـەی شـەڕ بـە ئێران، چونکـە حـەزی نەدەکرد کۆمەگی «پریز» بکا.

بە هەرحاڵ، «نیر» بـە فڕۆکـە چـووە واشـینگتۆن و لـە ڕێسـتوورانی هۆتێل شـیڕاتۆنی واشـینگتۆن چـاوی بـە «مـەک فـارلین» کـەوت. لـەو دیدارەدا «نیر» بە «مەک فـارلین»ی گـوت کـە یـان دەبـێ ئـەمریکایی-یەکان بۆ فرۆشتنی کەرەسەی شەڕ بە ئێران تەنیا دەگەڵ گرووپەکەی وان هاوکاری بکەن یان... «مەک فارلین» پەیامەکەی وەرگرت. مانـای قسـەکانی «نیـر» ئـەوە بـوو کـە ئەگـەر «مـەک فـارلین» دەگـەڵ وان هاوکاری نەکا، ئەوان مەسەلەکە لەقاو دەدەن.

لەبەر ئەوەی «مەک فارلین» ڕێگایەکی بۆ دەرچوون لـەو تێوەگلانـە نـەبوو، کـارێکی کـرد کـە «نیـر» دەگـەڵ دووکـەس لـە ئێشـکەرانی ئەنجومـەنی ئەمنیـەتی نیشـتمانی یـەکتر ببیـنن. ئـەو دوو کەسـە بریتـی بوون لە «ئۆلیڤێر نۆرت» Oliver North و «جان پۆیندەکستـەر» John Poindexter.

سەرهەنگی هێزی هـەوایی «ئۆلیڤێر نـۆرت» و جێگری ئەنجومـەنی ئەمنیـەتی نیشـتمانی، دەریـا سـالار «جـان پۆیندەکسـتەر» دەگـەڵ سـەرۆکەکەیان «مـەک فـارلین» هـاوڕا بـوون کـە کردنـەوەی کانـاڵێکی دووەم بۆ فرۆشـتنی کەرەسـەی شـەڕ بـە ئێران فکرێکـی زۆر بـاش و بنیاتنـەرە. ئـەوان هـەروەها گوتیـان کـە ئەگـەر دەسـت بـەو عەمەلیاتـە

بکەن، کۆمیتەی هاوبەشی ئیسرائیل کە تائێستا ئەو کارەی کردوە، لەنێو دەبەن.

لە هەوەڵ گفتوگۆدا کە «مەک فارلین» و«نۆرت» پاش دیتنی «نیر» لە ساڵی ١٩٨٥دا ئەنجامیان دا گەیشتنە ئەو باوەڕە کە بۆ ئەنجامدانی ئەو عەمەلیاتە نابێ ڕاستەوخۆ بچنە لای پرێزیدێنت ڕەیگان، چونکە بە باوەڕی وان ئەو نەیدەتوانی مەسەلەکە باش تێبگا. لەجیاتی ئەوە، ئەوان چوونە لای سەرۆکی CIA، واتە «ویلیام کەیسی» William Kasey.

لە ساڵی ١٩٨٥ەوە کە «کەیسی» تووشی نۆرە (جەڵتە)ی دڵ ببوو، جۆرج بووش، جێگری سەرکۆمار بوو و «ڕابێرت گەیتس» چاوەدێریی CIAی دەکرد. ساڵی ١٩٨٠، ئەوکاتەی لە ململانەی هەڵبژاردنی سەرکۆماریی ئەمریکادا، «ڕۆناڵد ڕەیگان» «جۆرج بووش»ی کردبووە جێنشینی خۆی، ئەو دووانە ڕێک کەوتبوون کە پاش ئەوەی چوونە کۆشکی سپی «جۆرج بووش» چاوەدێریی چالاکییەکانی ڕێکخراوی هەواڵگریی ئەمریکا کە پێوەندیی بە کاروباری سیاسییەوە هەیە، بخاتە ژێر چاوەدێری. سروشتییە کە ئەم بابەتە بۆ «کەیسی» خۆش نەبوو. بۆیە ئەو زۆری حەز دەکرد کاناڵێکی دووەم بۆ فرۆشتنی کەلوپەلی جەنگی بە ئێران بکرێتەوە.

بۆیە، «نیر»، «نۆرت» و « پۆیندەکستەر» توانیان «کەیسی» بۆ لای خۆیان ڕاکێشن، بەڵام داخوا وەڵامی «جۆرج بووش» بۆ ئەم بابەتە چی دەبێ؟ «جۆرج بووش» دەبێ بیری لەوە کردبێتەوە کە ڕایەڵکەی هەواڵگریی CIA- ئیسرائیل لێوەشاوەیی خۆی بۆ کاری فرۆشتنی کەرەسەی شەڕ بە ئێران نیشان داوە و بێجگە لەوە، پارەشی بۆ بوودجەی CIA پەیدا کردوە و بۆیە ئەگەر کاناڵێکی دیکە لە بەرامبەریدا سەر هەڵبدا، کارەکان تووشی گیروگرفت دەکا. کەچی، «نیر» کە سێ جار چاوی بە «جۆرج بووش» کەوتبوو، دواتر بە ئێمەی گوت کە بووش لەبارەی خۆرهەڵاتی نێوەڕاستەوە سیاسەتێکی

بەرینتری لە مێشکدایە. بەوجۆرە کە ئەو بڕیاری داوە بە گوێ-خەواندن لە عەمەلیاتی کانالی دووەم، سەرنجی «شیمۆن پرێز» سەرۆکوەزیری ئیسرائیل ڕابکێشێ. چونکە «جۆرج بووش» تێ-گەیشتبوو کە ئەگەر قەرار بێ ئەمریکاییەکان بەرنامەی ئاشتیی خۆیان بەسەر ئیسرائیلدا بسەپێنن، دەبێ پێوەندییەکی دۆستانەی دەگەڵ «شیمۆن پرێز» و حیزبی کرێکار هەبێ.

بەرنامەی ئەمریکا بۆ ئاشتیی خۆرهەلاتی نێوەڕاست ئەوە بوو کە کۆنفرانسێک لە ئیسرائیل، ئۆردۆن، عێراق، میسر و فەلەستینییەکان - دیارە نە PLO کە ئیسرائیل بە ڕەسمیی نەناسیبوو- پێکبێ و ئەمریکا سەرۆکایەتیی ئەو کۆنفرانسەی بەئەستۆوە بێ. عەرەبەکان پێیان لەسەر کۆنفرانسێکی نێونەتەوەیی دادەگرت کە سۆڤیەتیش دەستی تێیدا هەبێ. بەلام ئەم بەرنامەیە کە جۆرێک چارەسەری بۆ مەسەلەی فەلەستینییەکانی لێواری خۆرئاوا پێک دێنا جێی ڕەزامەندیی شامیر و حیزبی لیکوود نەبوو.

«شامیر» ڕقی لە بەرنامەی ئەمریکا بۆ وەرگرتنەوەی بەشێک لە خاکی ئیسرائیل هەبوو و بە هیچ جۆر قبووڵی نەبوو، لە لێواری خۆرئاوا و کەرتی غەززە دەوڵەتێکی ئازادی فەلەستینی دروست ببێ. ئەو وڵاتی ئۆردۆنی بە سەرزەمینی فەلەستینییەکان دەزانی و لەو باوەڕەدا بوو، مەلیک حوسێن کە دۆستی نزیکی «پرێز» و هاوپەیمانی ئەمریکا بوو، بێجگە لە خۆی و کۆمەڵێک عەرەبی بیابان-نشین نوێنەری هیچکەس نیە، چونکە بەشی پتری حەشیمەتی ئۆردۆن لە فەلەستینییەکان پێک دەهات.

«شامیر» متمانەی بە سەددام حوسێن نەبوو و بە هیچجۆر حەزی نەدەکرد، ئەو لە کۆنفرانسی ئاشتیدا بەشدار بێ. «شامیر» پێی وابوو سەددام حوسێن لە فکری ڕێبەرایەتیی هەموو عەرەبەکاندایە و بوونی بۆ ئیسرائیل مەترسیدارە.

ئاشکرایە کە باوەڕی شامیر لە بارەی سەددام حوسێنەوە بێ‌هۆ نەبوو. حکوومەتی ڕەیگان، لە ساڵی ١٩٨١ەوە لەو باوەڕەدا بوو کە پاش ڕووخانی ڕێژیمی شا، سەددام حوسێن دەبێ بۆشایی نفووزەکەی لە خۆرهەڵاتی نێوەڕاست پڕ بکاتەوە. ئەمریکایی‌یەکان بە چاوی ڕێبەرێکی گەورە کە دەتوانێ قازانجی ئەمریکا و چاڵە نەوتەکانی خۆرهەڵاتی نێوەڕاست بپارێزێ، دەیانڕوانیە سەددام حوسێن. هەرچەند ئەو، دۆستایەتییەکی نزیکی دەگەڵ شووڕەوی پێک هێنابوو، بەڵام ئەمریکایی‌یەکان پێیان وابوو ئەو ئاخرەکەی لە شووڕەوی دوور دەکەوێتەوە.

بۆ ئەوەی ئەمریکا عێراق لە خۆی نزیک بکاتەوە، وەزارەتی دەرەوەی ئەو وڵاتە ساڵی ١٩٨٢ عێراقی لە لیستی «وڵاتانی تێرۆریست» -هەر مانایەک لەم زاراوەیە بدرێتەوە- هێنایە دەر. ساڵێک دواتر قەدەغەی فرۆشتنی چەک بە عێراقیش هەڵگیرا. ئەم بایکۆتە ساڵی ١٩٧٠ کە [دەوڵەتێ] عێراق وڵاتەکەی دابووە دەست پەنابەرە فەلەستینییەکان، خرایە سەر عێراق. تەنانەت پرێزیدێنت ڕەیگان فەرمانێکی نهێنیی دەرکرد کە کۆسپی سەر ڕێگای ناردنی چەک بۆ عێراق هەڵگیرێ. کۆمەڵێک لە پایەبەرزانی حیزبی کۆمارخوازی ئەمریکا بە سەردان چوونە عێراق و ساڵی ١٩٨٤ پێوەندیی دیپلۆماتیی نێوان ئەمریکا و عێراق کە لە کاتی شەڕی ١٩٦٧ی عەرەب و ئیسرائیلدا بچڕابوو، دووبارە دامەزرایەوە. دوای گۆڕینەوەی نوێنەری سیاسی لە نێوان ئەمریکا و عێراقدا، هێندێ لە سەوداگەرانی ئەمریکا بە فڕۆکە چوونە عێراق تا وا بکەن عەرەبستانی سعوودی ناردنی پووڵ بۆ عێراق درێژە پێبدا. ئەمریکایی‌یەکان هەروەها لەو باوەڕەدا بوون کە تا ئەو ڕۆژەی سەددام حوسێن بە تەواوی نەکەوتۆتە بەر دەستی ئەوان، دەبێ شەڕی ئێران و عێراق بەردەوام بێ.

حکوومەتی ئەمریکا بۆ ئەوەی وتوویژی ئاشتیی نێوان عەرەب و ئیسرائیل بە باشی بچێتە پێش، سەرەتای ساڵی ١٩٨٥ بەو نفووزە کە بەناردنی کەرەسەی شەڕ بۆ عێراق لەم وڵاتە بەدەستی هێنابوو، وای کرد سەددام حوسێن بە ئاشکرا ڕابگەیەنێ کە حازرە بۆ ئاشتی دەگەڵ ئیسرائیل بچێتە گەڵ وتوویژەکانی «کەمپ دێڤید». سەددام حوسێن گوتی بە مەرجێک ئەوکارە دەکا کە ئیسرائیل ناردنی کەرەسەی جەنگی بۆ ئێران ڕابگرێ و ڕەزامەندی لەسەر دامەزرانی دەوڵەتێکی فەلەستینی نیشان بدا.

«پریز» بە تەواوی مووافیقی ئەو جۆرە بیرکردنەوەیە بوو و بۆ پێکهێنانی کۆنفرانسی ئاشتی هەوڵی دا. بەڵام، «شامیر» بە سەرسەختی دژی ئەم بۆچوونە بوو و چونکە بەکردەوەش نیوەی حکوومەتی ئیسرائیلی بەدەستەوە بوو، توانی، پێشکەوتنی وتوویژەکانی ئاشتی ڕابگرێ.

ئەمریکا بڕیاری دا بۆ ئامادەکردنی ئیسرائیل بۆ پێشخستنی وتوویژەکانی ئاشتی، عێراق بکاتە دەسەڵاتێکی گەورە تا بتوانێ بوونی ئیسرائیل لە ناوچەدا بخاتە مەترسییەوە. ئەمریکا دوو هۆکاری بۆ ئەم بڕیارە هەبوون. یەکیان ئەوە کە لەباری سەربازییەوە عێراق ئەوەندە بەتوانا بکا کە ئەم وڵاتە بتوانێ مەترسیی ئێرانییەکان لابدا و سەددام حوسێن، ڕێبەری ناوەندڕۆی عەرەبی ئۆگری خۆرئاوا لە دەسەڵاتدا بهێڵێتەوە. هۆکاری دیکە ئەوە بوو کە بەرامبەر بە ئیسرائیل دەسەڵاتێکی دیکە لە خۆرهەڵاتی نێوەڕاست دروست بکا تا ئیسرائیل ئامادە بێ دەگەڵ عەرەبەکان لەسەر مێزی وتوویژی ئاشتی دابنیشێ. بەڵام لەڕاستیدا، تەنیا ڕێگای ئەمریکا بۆئەوەی بەرنامەکەی جێبەجێ بکا ئەوە بوو کە تەکنۆلۆژیی مووشەک و چەکی شیمیایی (کیمیاوی) بۆ سەددام حوسێن بنێرێ و بە ئاماژە پێی بڵێ کە تەکنۆلۆژیی ئەتۆمییشی دەداتێ.

ئەمریکا، ساڵی ١٩٨٥ جێبەجێکردنی ئەم بەرنامەیەی دەست پێکرد، بەڵام زۆری هەوڵ دا ئەم کارە بە نهێنی ئەنجام بدرێ. چونکە ئیسرائیل دۆستی زۆری لە کۆنگرەی ئەمریکادا هەبوون و کۆمەڵگەی یەهوودیی ئەمریکا بە هیچ جۆرێک دەگەڵ بەڕێوەچوونی ئەم بەرنامەیە نەبوو.

بە پێچەوانەی نیوەکەی دیکەی حکوومەتی ئیسرائیل کە هەوڵی دەدا، بەرنامەکەی ئەمریکا بۆ ئاشتی ئیفلیج بکا، «شیمۆن پرێز» هەوڵی دەدا بەرنامەی ئەمریکا بۆ ئاشتی بچێتە پێش. بۆیە، لەحاڵێکدا «شیمۆن پرێز» بە ئاشکرا باسی ئاشتیی دەکرد، بەڵام بۆخۆی پەیڕەویی لە بەرنامەی دوولایەنەی ئەمریکا دەکرد و هەوڵی دەدا بە ناردنی کەرەسەی شەڕ بۆ هەر دوو وڵاتی ئێران و عێراق ئەوان بەدژی یەکتر هان بدا. ئەو دۆست و هاوکاری نیزیکی خۆی «برووس راپۆیۆرت» Bruce Rappoyortی کە سەوداگەرێکی ئیسرائیلی بوو کە لە ژێنێڤ کاری دەکرد، هان دا کە کەلوپەلی سەربازی وەک چەکی M-16 و گوللەی ١٢٢ میلی میتری لە ئیسرائیل بکڕێ و بیاننێرێ بۆ عێراق.

«راپۆیۆرت» موعامەلەیەکی سەرسوڕهێنی دیکەشی دەگەڵ عێراق کرد. بەو جۆرە کە عێراقییەکان دەیانەویست لوولەیەکی نەوت لە چاڵاوەکانی نەوتی خۆیان لە باکووری عێراقەوە بکێشن بۆ بەندەری عەقەبە لە ئۆردۆن. هۆی ئەوە کە عێراقییەکان دەیانەویست ئەوکارە بکەن ئەوە بوو کە ئێرانییەکان لە کەنداوی فارس ڕێگای وانیان بەستبوو. دیارە عێراقییەکان دەیانتوانی ئەو لوولە نەوتییە بە سنووری سووریاشدا ڕابکێشن. بەڵام حافز ئەسەد، سەرکۆماری سووریا بە هۆی ناکۆکییە مێژووییەکانی دەگەڵ سەددام حوسێن دوژمنی خوێنخۆری ئەو بوو و لەوەش بگوزەرێ بەسەرسوڕمانەوە، سووریا دۆست و هاوپەیمانی ئێران بوو کە لەوبارەیەوە، ئەوی دەکردە هاویاری حیزبی لیکوود. تورکیاش دەگەڵ هەر دوو وڵاتی

ئێران و عێراق، سنووری هاوبەشی هەبوو و دەیەویست لە شەڕی نێوان ئەو دوو وڵاتەدا بێلایەن بمێنێتەوە و بۆیە حازر نەبوو لەوبارەیەوە یارمەتیی عێراق بدا.

بە لەبەرچاوگرتنی ئەو بارودۆخە، تەنیا ڕێگا بۆ ئەوەی عێراق دەستی وەدەریا ڕابگا، بەندەری عەقەبە لە ئۆردۆن بوو. بەڵام، بۆ ئەو بەرنامەیەش گیروگرفتێکی گەورە هەبوو. عەقەبە تەنیا ٢ مایل لە بەندەری ئیلات لە ئیسرائیل دوورە و ئەگەر قەرار بایە، خەتی لوولەیەک لە عێراقەوە بۆ عەقەبە ڕاکێشرێ، هەرنەبێ بەشێکی دەبوو بە پەنا سنووری ئیسرائیلدا بڕوا و ئیسرائیلییەکان دەگەڵ ئەوە مووافیق نەبوون، چونکە نەیاندەویست ئابووریی عێراق گەشە بکا.

بەڵام، سەددام حوسێن کارێکی زیرەکانەی کرد. بەو مانایە کە دروستکردنی لوولەکەی بە کۆمپانیی سعوودیی «بێکتێل» Becktel کە لقێکی کۆمپانیی گەورەی « بێکتێل»ی ئەمریکا بوو، سپارد. دیارە سەددام حوسێن، بەڕێکەوت و بێ بیرکردنەوە کۆمپانیی « بێکتێل»ی بۆ ئەوکارە هەڵنەبژاردبوو. «جۆرج شۆڵتز» وەزیری دەرەوەی ئەمریکا و «کاسپار واینبێرگێر» وەزیری بەرگریی ئەو وڵاتە، هەردووکیان لە بەڕێوەبەرانی پێشووی کۆمپانیی « بێکتێل» بوون.

«ئاروین میس» داواکاری گشتیی ئەمریکاش وەکیلی کۆمپانیی « بێکتێل» و دۆستی زۆر نیزیکی شازادە بەندەر، باڵیۆزی عەرەبستانی سعوودی لە ئەمریکا بوو، و [دەگەڵ] بنەماڵەی «جۆرج بووش» لەوانە براکەی -«پرێسکات بووش» Prescot Bush کە پاشان لە کاتی نارەزایەتییەکانی پێوەندیدار بە ڕووداوی «مەیدانی تیانانمەن» Tiananmenدا کەرەسەی شەڕی بە چین دەفرۆشت- لە خۆرهەڵاتی نێوەڕاست پێوەندیی نەوتییان هەبوو.

«کۆمپانیی سعوودیی « بێکتێل» پێوەندیی دەگەڵ «میس» داواکاری گشتیی ئەمریکا کە ئەویش دۆستی گیانیگیانیی «برۆس ڕاپۆیۆرت» بوو، دامەزراند. کەس نازانێ پێوەندیی نێوان «کۆمپانیی

سعوودیی بێکتێل» و «میس» چۆن دامەزرا، بەڵام کارمەندانی هەواڵگریی ئیسرائیل پێیان وایە ئەم پێوەندییە بە هۆی «عەدنان کەشووقی»کە هەمەکارەی هەموو شتێک بوو، دامەزراوە. کۆمپانیی سعوودیی « بێکتێل» بۆ ئەنجامدانی ئەو بەرنامەیە دوو کۆسپی لە پێش بوون. یەکەم ئەوە کە چونکە ئەو لوولەیە زۆر لە ئیسرائیل نزیک بوو، نەیدەتوانی بیمەی دەورانی شەڕ بۆ دروستکردنەکەی بەدەست بێنێ و دووەمیش ئەوە کە کۆمپانییەکە پێی وابوو ناتوانێ ڕەزامەندیی ئیسرائیل کە لەو کاتەدا ببوو بە دوو لەتی (کرێکار و لیکوود) بۆ ئەنجامدانی ئەو بەرنامەیە دەستەبەر بکا.

لە نێوەڕاستی ساڵی ١٩٨٥دا، «میس» دۆستەکەی خۆی «ڕاپۆیۆرت»ی بانگ کرد و پێیگوت، ئەگەر «شیمۆن پرێز» حازر بێ نامەیەک بنووسێ کە ئیسرائیل بەڵێن دەدا، نە لوولە نەوتییەکەی عێراق بۆمباران بکا، نە کێشەیەک بۆ دروستکردنی لوولەکە و ڕۆیشتنی نەوت بە ولوولەیەدا سازێ بکا، ئەو ٤٠ میلیۆن دۆلار دەدا بە «پرێز». ئەم دراوە دەخرێتە حیسابی کۆمپانیی «ئینتەر ماری تایم» Inter Maritimeای «ڕاپۆیۆرت» لە سویس. ئەم نامەیە بۆ کۆمپانیی بیمەی Overseas Private Corporation لە ئەمریکا پێویست بوو تا ئەو کۆمپانییە بتوانێ بە نرخێکی دیاریکراو دروستکردنی ئەو لوولەیە لە بەرامبەر مەترسییەکانی شەڕدا بیمە بکا.

کاتێک «پرێز» ئاگاداری ئەو بابەتە بوو، لە کۆبوونەوەیەکی پرکێشەی کابینە لە ساڵی ١٩٨٥دا، «شامیر»ی بە خائین ناو برد و هەڕەشەی کرد کە لە حکوومەتی هاوپەیمانی دەکشێتەوە. لەئاکامدا بەرنامەی دروستکردنی لوولەکە ڕاوەستا. ماوەیەک دواتر، «ڕافی ئەیتان» بە مەسەلەکەی زانی و خەبەرەکەی گەیاندە ڕۆژنامە ئیسرائیلییەکان. ڕۆژنامە ئەمریکاییەکانیش، پاش ماوەیەک پێیان زانی و بابەتەکەیان بڵاو کردەوە.

ئەگەر زەمینەی بارودۆخی ئەودەم لەبەر چاو بگرین، بە ئاسانی تێدەگەین کە بۆچی «جۆرج بووش» ڕازی بوو کە کاناڵێکی دووەم بۆ فرۆشتنی کەرەسەی شەڕ بە ئێران بەهۆی گرووپی «نیر-نۆرت»ەوە بکەوێتە کار. چونکە، هەرجۆرە ئومێدێک بە پێشکەوتنی وتووێژەکانی ئاشتی، لە دەستی «پرێز»دا بوو و لەبەر ئەوەش کە «پرێز»یش ڕێبەرایەتیی کاناڵی دووەمی لە ئەستۆ بوو، «جۆرج بووش» بە تەواوی دەگەڵ جێبەجێکردنی ئەو بەرنامەیەدا بوو.

عەمەلیاتی تازەی کڕین و فرۆشتنی کەلوپەلی جەنگی، ساڵی ١٩٨٥، لە مەیدانێکی پڕجموجۆڵدا بە شێوەی خوارەوە دەستی پێکرد:

١-عەمەلیاتی کۆمیتەی هاوبەش بە بەشداریی CIA بۆ ناردنی کەرەسەی شەڕ بۆ ئێران. ئەم عەمەلیاتە بەهۆی «ڕابێرت گەیتس»ەوە سەرپەرستی دەکرا و حیزبی لیکوود پشتیوانیی لێدەکرد،

٢-فرۆشتنی کەلوپەلی ناقانوونیی شەڕ بەهۆی گەیتس- شاڕۆن بە کۆنتڕاکان،

٣-فرۆشتنی کەلوپەلی ئاسایی و ناپێشکەوتووی شەڕ بەهۆی وڵاتانی فەڕانسە و شوورەوییەوە بە عێراق،

٤-ناردنی سیستمی کەرەسەی ئەتۆمی و شیمیایی «پێشکەوتوو»ی شەڕ بەهۆی ئەڵمانی خۆرئاوا، ئەفریقای باشوور و شیلی بۆ عێراق کە هەموو ئەو عەمەلیاتە بە پشتیوانیی ئەمریکا ئەنجام درا.

سەرەنجامیش، دروستکردنی کاناڵی دووەمی فرۆشتنی کەرەسەی شەڕ بە ئێران و کۆنتڕاکان بەهۆی گرووپی ئەمیرام نیر- ئۆلیڤێر نۆرت.

کاتێک «نیر» و ئەندامانی گرووپەکەی کاناڵی دووەمیان بۆ فرۆشتنی کەرەسەی شەڕ وەڕێ خست، تووشی کەسێکی ئێرانی، بە ناوی «مەنووچێهری قوربانیفەڕ» بوون کە خەریکی سەوداگەری بوو و کاری بۆ CIAش دەکرد و پێوەندیی نیزیکیشی دەگەڵ میرحوسێنی مووسەوی سەرۆکوەزیری ئێران هەبوو. گرووپی

«نـۆڕت» لـەو ڕۆژگـارەدا پێوەنـدیی پێویسـتیان دەگـەڵ ئەنـدامانی پایەبەرزی ئەنجومەنی بەرزی شۆڕش و ئەنجومەنی بەرزی بـەرگریی ئێران نـەبوو تـا بتـوانن کەرەسـەی شـەڕیان پێبفرۆشـن، «نۆڕت» و «نیـر» کـە خـەریک بـوون چەنـدی بکـرێ پتـر کۆمـەگی کەسـانی پایەبـەرزی دەوڵـەتان بـۆ ئەنجامـدانی بەرنامـەی کـڕین و فرۆشـتنی کەرەسـەی شـەڕ بـۆ لای خۆیـان ڕاکێشـن، «میکائیـل لێدین»یـان بیـر کەوتـەوە، «لێـدین» جوولەکـە بـوو و بـە شـێوەی نیوەوەخـت وەک ڕاوێژکـار، کـاری بـۆ ئەنجومـەنی ئەمنیـەتـی نیشـتمانی دەکـرد و وا بـەناوبانگ بـوو کـە هـەم بۆ سـەرۆکەکانی لـە ئەنجومـەنی ئەمنیـەتی نیشـتمانیدا و هـەم بـۆ ئەوانـەی سـەربە «پرێـز» بـوون هەسـت بـە ئەمەگناسی دەکا.

دوای ئـەوەی «نۆڕت» و «نیـر» پشـتیوانیی ژمارەیـەک لـە خـەڵکی ناوداریـان بەدەسـت هێنـا، هـەوڵیان دا کانـاڵی یەکـەم بسـڕنەوە و ئیعتیبـاری حیزبـی لیکـوود لـە ئـەمریکا لـەنێو بـەرن. بـەپێی قسـەکانی «نیر» بۆ جێبەجێکردنی ئەو مەبەستە، ئەوان بڕیاریـان دا وردەکاریی ئەو ڕایەڵکەیە کە «ڕافی ئەیتان» بۆ جاسووسـی لـە ئـەمریکا دروسـتی کردبوو، بدەن بە کارمەندانی FBI. گرووپی «نۆرت» زۆر وریـا بـوون کـە لـە جێبـەجێکردنی ئـەو ئامانجـەدا، نـاوی کەسـانی پایەبـەرزی ئەمریکایی کە چالاکیی جاسووسییان بۆ ئیسـڕائیل هەبوو،نەیەتـە نێو ناوانـەوە. بۆیـە، ئـەوان نـاوی تـوێژەرێکی پایـەنزمی ناسـەربازی کـە یەکێک لـە جاسووسـە مووچەخۆرەکانی تـەل ئەبیب بوو و کـاری بـۆ هێزی دەریایی ئەمریکا دەکرد، بە ناوی «جاناتـان پۆلارد» Jonathan Pollard و هاوسـەرەکەی «ئـان هێندرسـۆن پۆلارد» Ann Henderson Polard کـە دەگـەڵ مێردەکـەی کـاری دەکـرد و ئەفسـەرێکی هێـزی هەوایی ئیسڕائیل بە ناوی سەرهەنگ «ئاڤیەم سێلا» Aviem Sella یـان کە کارناسی بەرنامە ئەتۆمییەکان بوو، دایە کارمەندانی FBI.

هـۆی ئـەوە کـە گرووپـی «نیـر» و «نـۆرت» نەیاندەویسـت نـاوی کەسـانی پایەبـەرزی ئـەمریکایی بێننـە نێـو چـالاکیی جاسووسـی بـە سـوودی ئیسـرائیل، ئـەوە بـوو کـە یـەکێک لـەو کەسـانەی دەگـەڵ «پۆلارد» کاریان دەکرد، «مەک فارلین» بوو کە ڕۆڵێکی زۆر گرنگی لە گرووپی کانـاڵی دووەم «نۆرت»دا بەڕێوە دەبرد. بەپێی قسـەکانی «ئـەیتان»، «مـەک فـارلین» کـۆدی ڕاپۆرتـە هەواڵگرییـەکانی بـە کامپیۆتـەر دەدا بـەو. بـەوجۆرە «ئـەیتان» هـەروا کـە لـە تـەل ئـەبیب دانیشتبوو، داوای دەکرد کۆدەکانی هەواڵگری لەو مەسەلانەدا کە ئەو پێویسـتیی هـەواڵگریی پێیـان هـەبوو، بـدەن بـەو. بۆ ئەنجامـدانی ئـەم کـارە، نوێنـەری «لاکـام» لـە واشـینگتۆن کـە ژنێـک بـوو بـەناوی «ئیـریس» Iris، داخوازەکـانی «ئـەیتان»ی دەدایـە «مـەک فـارلین». ئەمجار «مەک فارلین» کۆدەکانی دەدان بەو. «ئیریس»یش کۆدەکانی دەدا بـە «پـۆلارد» کـە کـاری بـۆ هێـزی دەریـایی ئـەمریکا دەکـرد. «پۆلارد» زانیارییـەکانی لـە کامپیۆتـەر وەردەگـرت و شـەوانە ئـەوانی لەسـەر کاغـەزی تایپکراوی کامپیۆتـەری، دەبـردەوە ماڵەکـەی خـۆی وێنـەی لـێ هەڵدەگرتن و دەیدا بـە «ئیریس» و بـەیانیی ڕۆژی دواتر پـەڕە ئەسـڵییەکانی لـەجێی خـۆیـان دادەنانـەوە. هـۆی ئـەو هـەموو بێنەوبەرە زۆرە ئەوە بوو کە پێوەندیی ڕاستەوخۆ لە نێوان «مـەک فارلین» و «پۆلارد»دا ڕوو نـەدا و هـەر بۆیـە دەکرێ بڵێین بێگومـان «پۆلارد» نەیـدەزانی کـە «مـەک فـارلین» نێوبژیـوانی ئـەو عەمەلیاتـە جاسووسییە بووە.

بـەوجۆرە، ئیسـرائیل زیـاتر لـە یـەک میلیـۆن پـەڕی زانیـاری لەسـەر چالاکییە سەتەلایتییەکانی ئەمریکا، فڕۆکە ئەمریکایییەکان، فڕۆکەکانی شـووڕەوی، ئـەو پارچـە یەدەکییانـەی لـە کاتەلۆگـە نهێنییەکانـدا ڕیـز کرابـوون (و کۆمیتـەی هاوبـەش پێـی خـۆش بـوو بیـانزانێ) و هـەر شتێکی دیکە کە لە کۆمەڵگەی هـەواڵگریی ئـەمریکادا هـەبوو، وەرگـرت. یـەکێک لـە مەرجـەکانی ڕێککـەوتنی نێـوان کۆمیتـەی هاوبـەش و

شـووره‌وی بـۆ فرۆشـتنی كه‌ره‌سـه‌ی شـه‌ڕ لـه‌ ولاتـانی بلـووكی خۆرهه‌لاتـه‌وه‌ بـه‌ ئێـران ئـه‌وه‌ بـوو كـه‌ ئێمـه‌ هێنـدێک لـه‌ به‌ڵگـه‌ هه‌واڵگرییه‌كانی «پۆلارد» بده‌ینه‌ KGB، بـه‌لام باسێک لـه‌ سـه‌رچاوه‌ی به‌ڵگه‌كان نه‌یه‌نینه‌ گۆڕێ. «شامیر» بۆخۆی له‌سـه‌ر ئـه‌وه‌ موافه‌قـه‌تی كردبوو.[١٧]

كاتێک حیزبی لیكوود و كۆمه‌ڵگه‌ی هه‌واڵگریی ئیسـرائیل پێیـان زانـی كـه‌ گرووپـی كانـاڵی دووه‌م بوونـه‌ هـۆی ئاشـكرابوونی داسـتانی «پۆلارد» و ده‌داوكه‌وتنی، زۆر تووڕه‌ بوون و هاتنه‌ سـه‌ر ئـه‌و ڕایـه‌ كه‌ گرووپی تازه‌ی سه‌وداگه‌ری كه‌ره‌سـه‌ی شـه‌ڕ پێش گووران له‌نێو به‌رن.

وه‌ختێک قه‌رار بێ، به‌ بلاوبوونه‌وه‌ی هه‌واڵێک زیان به‌ كه‌سایه‌تی و بایه‌خـه‌كانی كه‌سێک بگه‌یـه‌نن، ئـه‌م كـاره‌ كـه‌متر بـه‌ ته‌لـه‌فونكردن بۆ كارمه‌ندێكی ڕه‌سمیی ده‌وڵه‌تی جێبه‌جێ ده‌بێ. بـه‌لام لـه‌م حاڵه‌تـه‌ تایبه‌ تییه‌دا، وه‌ختێک سه‌رله‌شكر «یه‌هوود باراک»، سـه‌رۆكی هـه‌واڵگریی سوپا ده‌گه‌ڵ هاوپیشه‌كانی له‌ ئه‌مریكا به‌ ته‌له‌فون قسه‌ی ده‌كرد، تـه‌نیا ئامـاژه‌ی كـرد كـه‌ «مـه‌ک فـارلین» كـار بـۆ «ڕافـی ئـه‌یتان» ده‌كـا. هـه‌روه‌ک چـاوه‌ڕێ ده‌كـرا، ئـه‌و خه‌بـه‌ره‌ بـه‌گوێی ژه‌نـراڵ «ویلیـام ئـۆدۆم» William Odom سـه‌رۆكی ڕێكخـراوی ئه‌منیـه‌تی نیشـتمانی

---

[١٧]-ئه‌مریكایی‌یه‌كان و خه‌ڵكی دیكه‌ دوایه‌ ئیددیعایان كرد كه‌ گۆیا ئـه‌من هێندێک له‌و به‌ڵگانه‌م كه‌ «پۆلارد» دزیبوونی، داوه‌ته‌ شووره‌وی، بـه‌لام ڕاستییه‌كه‌ ئه‌وه‌یه‌ كه‌ «ئیسـحاق شـامیر» بۆخـۆی ڕاسته‌وخۆ ده‌سـتووری دابوو، هێندێک لـه‌و به‌ڵگه‌ هه‌واڵگرییانه‌ كه‌ سالانی ١٩٨٤ و ١٩٨٥ له‌ ئه‌مریكا ده‌ست كه‌وتبوون، كۆ كرێنـه‌وه‌ و بـۆ باشـكردنی پێوه‌نـدیی نێـوان ئیسـرائیل و ولاتـانی بلـووكی خۆرهـه‌لات بدرێنـه‌ شـووره‌وی. لـه‌ دوا مانگـه‌كانی سـاڵی ١٩٨٧دا «شـابتای كالمـانۆڤیچ» Shabtai Kalmanovitch بـه‌ تۆمـه‌تی جاسووسـی له‌لایـه‌ن ئیسـرائیله‌وه‌ گیـرا و ئه‌مـه‌ سـه‌ره‌نجام، ئـه‌مریكایی‌یـه‌كانی ڕازی كـرد. «شـابتای كالمـانۆڤیچ» كاسـبكارێكی جووله‌كه‌ی شووره‌وی بوو كه‌ به‌ گه‌نجی له‌ «ڕیگا»وه‌ كۆچی كردبوو بۆ ئیسـرائیل. دادگایه‌كی ئیسرائیل ئه‌وی به‌ تۆمه‌تی جاسووسی به‌ زیندان مه‌حكووم كرد.

گەیشتەوە و ئەو بڕیاری دا بچێتە بنج و بناوانی مەسەلەکە. بۆیە، ئەو پێوەندیی دەگەڵ «ویلما هاڵ» Willma Hall سکرتێری «مەک فارلین» سەرۆکی ئەنجومەنی ئەمنیەتی نیشتمانی کە بە ڕێکەوت دایکی «فان هاڵ» Fawn Hall، سکرتێری «ئۆلیڤێر نۆڕت» بوو، گرت.

بە کۆمەگی «ویلما» یەکێک لە گفتوگۆیەکانی نێوان «مەک فارلین» و «ڕافی ئەیتان» تۆمار کرا و کۆتایی ساڵی ١٩٨٥، بۆ ژەنراڵ «ئۆدۆم» دەرکەوت کە «مەک فارلین» جاسووسێکی ئیسرائیلییە کە وەک مشکەکوێرەی بن زەوی کار بۆ «ڕافی ئەیتان» دەکا. بەپێی قسەکانی «نیر» و «ئەیتان»، ژەنراڵ «ئۆدۆم» باسەکەی ڕاستەوخۆ بە ئاگاداریی «جۆرج بووش» جێگری سەرکۆماری ئەمریکا گەیاند. «بووش» باشی دەزانی کە لەقاودانی بابەتەکە، لەسەر ئەوە کە یەکێک لە کاربەدەستە گرنگەکانی کۆشکی سپی جاسووسی ئیسرائیل بووە، زۆر بە زیانی حکوومەتی کۆمارخوازان تەواو دەبێ. بۆیە «مەک فارلین» ناچار بوو دەست لەکار بکێشێتەوە و بابەتەکە بە نهێنی مایەوە.

ئەم ئابڕووچوونە، کاری نەکردە سەر هاوکارییەکانی «مەک فارلین» دەگەڵ عەمەلیاتی «نیر- نۆڕت» و «مەک فارلین» لە ماڵەکەیەوە درێژەی بە هاوکاری دەگەڵ «نیر- نۆڕت» دا. بەڵام ڕێکخراوی هەواڵگریی ئیسرائیل بە وەرگرتنی کۆمەگێکی کەم لە وەزیری بەرگریی نیشتمانیی ئێران، سەرهەنگ موحەممەدی جەلالی، بڕیاری دا بە هەرجۆر بێ، کاناڵی دووەم لەنێو بەرێ. لە ساڵەکانی ١٩٨٥ و ١٩٨٦دا لە ئەنجومەنی بەرزی فەرماندەریی ئێران، دەستە و تاقمی جۆراوجۆری سیاسی پێگەیشتبوون کە بنچینەکەی قازانج و ناکۆکیی تاکەکەسیی ئەندامانی ئەنجومەن دەگەڵ یەکتر بوو. وەزیری بەرگریی ئێران سەرهەنگ موحەممەدی جەلالی و سەرۆکی ئەنجومەنی شووڕای ئیسلامی، عەلیئەکبەری هاشمیی ڕەفسەنجانی کاریان دەگەڵ کۆمیتەی هاوبەش دەکرد و موحسینی ڕەفیقدووست،

سـەرۆکی ڕێکخـراوی سـوپای پاسـداران و میرحوسـێنی مووسـەوی، سەرۆکوەزیر هەوڵیان دەدا دەگەڵ کاناڵی دووەم بکەونە موعامەلەی کەرەسـەی شـەڕەوە. ئاشـکرایە کـە هـەردوو گـرووپ دەیانەویسـت دەگەڵ هەر وڵاتێک کە چەکیان پێبفرۆشێ، بۆ شەڕ دژی سەددام حوسێن کە خومەینیی بە «ڕافزیی خۆرئاوایی» ناو بردبوو، موعامەلە بکەن.

کۆتـایی سـاڵی ١٩٨٥، کۆمیتـەی هاوبـەش پێوەنـدیی دەگـەڵ ڕەفسـەنجانی کـە لـە ئەسڵدا بەرپرسـی کڕینـی کەرەسـەی شـەڕ بـۆ سوپای ئێران بوو، گرت و ڕەفسەنجانی گوتی، ئەوان نابێ نیگەران بن، چونکە ئێران ئەگەر متمانەی بە کەسێک پەیدا کرد، پێی وەفادار دەمێنێ.

ڕەفسەنجانی بە ئێمەی گوت: «بۆ بەدبەختی، مووسەوی، سەرۆک-وەزیر کە لە کاناڵی دووەم نیزیک بۆتەوە لە گرووپی سیاسیی من نیە. ئەمن هەوڵ دەدەم بابەتەکە بە داهێنەریی خۆم چارەسەر بکەم، بەڵام بە هەرحاڵ دڵنیاتان دەکەم کە ئێران موعامەلەیەک دەگەڵ کاناڵی دووەم ناکا.»

لە یەکەم مانگەکانی ساڵی ١٩٨٦دا، کۆمیتەی هاوبەش ئاگادار بوو کە گفتوگۆیەکی بەردرێژ بۆ سەفەری گرووپی «نۆڕت» بۆ تاران ئەنجام دراوە. داوا لەمن کرا کە پێوەندی دەگەڵ ڕەفسەنجانی بگرم و چۆنیەتیی بابەتەکە تێبگەم.

ڕەفسەنجانی گوتی: «نیگەران مەبن، ئەمن مشووریان دەخۆم.»

ئـاوریلی سـاڵی ١٩٨٦، عەمـەلیاتی«نیـر- نـۆڕت» نـەیتوانی بـۆ ئەنجامدانی موعامەلەی کەرەسەی شەڕ بگاتە هیچکوێ. ئەم بابەتە «نۆڕت»ی زۆر تووڕە کرد و ئەو بڕیاری دا بە هەموو توانایەوە هێرش بۆ سەر گرووپی ڕکابەر دەست پێبکا.

بەپێی ئەو زانیارییەی دەسـت ئێمـە کـەوت «نۆڕت» بڕیـاری دا هەموو ئەو کەسانە کە هاوکاریی گرووپی ئیسرائیلی بۆ فرۆشتنی

کەرەسەی شەڕ بە ئێرانیان کردوە، تێکبشکێنێ. «نۆرت» لەو بارەیەوە دوو ئامانجی هەبوون. یەک ئەوە کە دەیەویست تۆڵە لە ئەندامانی کانالی دووەم [18]بکاتەوە و ئەوی دیکەش ئەوە بوو کە دەیەویست بە نیشاندانی ئەوە کە حکوومەتی ئەمریکا دژی کڕین و فرۆشتنی کەرەسەی شەڕە و هەرکەس بەشداری ئەوکارە بووبێ، دەیگرێ و دەیخاتە زیندان، ڕێز و ئیعتیبار بۆخۆی پەیدا بکا. لەوکاتەدا لێرولەوێ ببووە دەنگۆ کە ئەمریکا کەرەسەی شەڕ بە ئێران دەفرۆشێ و«نۆرت» باوەڕی وابوو، کە گرتنی ئەو کەسانەی موعامەلەی چەکوچۆڵە دەکەن، سەرنجی خەڵک لەسەر ئەو بابەتە بە لاڕێدا دەبا و لەونێوەدا ڕێز و ئیعتیباریش بۆ «نۆرت» پەیدا دەکا.

«نۆرت» بۆ گەیشتن بە ئامانجەکەی، بڕیاری دا، کارمەندانی خزمەتە گومرکییەکانی ئەمریکا کە لە ڕێی «ناوەندی بازرگانیی جیهانی»یەوە ئەرکیان بەجێ دێنا، هان بدا کە هێندێ هەنگاوی توند بە دژی ئیسرائیل هەڵێننەوە. ئەو کەسانەی بۆ ئەنجامدانی ئەو هەنگاوانە هەڵبژێران، گرووپێک لە کارمەندانی گومرکی بوون کە پێیان دەگوتن King and Romeo. لە تەنیشت هەنگاوەکانی ئەو گرووپە، داواکاری گشتیی ئەمریکا بۆ بەشی باشووریی نیۆیۆرک، «ڕادۆڵف گیلیانی» Radolph Giulianiیش بۆ بەدواداچوونی ئەو کەسانە کە لەو پێوەندییەدا دەگیران ئامادە ببوو.

یەکی دیکە لەو کەسانە کە بۆ دژایەتیی ئیسرائیل هێنرانە نێو گرووپی کارمەندانی گومرکی، سیرووسی هاشمی، یەک لەو سێ برایە بوو کە ساڵی ١٩٨٠ پریزیدێنت کارتەر پێی وابوو ئەوان لە ئێران ئەوەندە نفووزیان هەیە کە بتوانن بارمتە ئەمریکایییەکان ئازاد بکەن. پاش ئەوەی ساڵی ١٩٨١، «ڕەیگان» پاڵی بە کورسیی سەرکۆماریی

---

[18]-کانالی یەکەم ڕاستتر دێتە بەر چاو، چونکە کانالی دووەم هی خۆیەتی. (وەرگێڕ)

ئـەمریکاوە دا و بارمتـەکان ئـازاد بـوون، کارمەنـدە گومرکییـەکانی ئەمریکا دەستیان کرد بە لێپرسینەوەی برایانی هاشمی. سەرەنجام ساڵی ١٩٨٤ بە پشتبەستن بە قانوونی کۆنترۆڵی کەلوپەلی شەڕ، بەتۆمـەتی فرۆشـتنی ناقـانوونیی کەرەسـەی شـەڕ، بڕیـاری دادگـایی-کردنیـان بـۆ دەرچـوو. سیڕووس و جەمشـیدی بـرای لـە بڕیارەکـە ئاگادار بوون و پێش ئەوەی بگیرێن لە ئەمریکا چوونـە دەر. بەڵام بـرا چووکەکەیان ڕەزا هاشمی، گیرا. بەجۆرێک دەتوانین بڵێین لەڕاستیدا ڕەزا بە بارمتە گیرا. برا گـەورەکانی، «ئـەلیۆت ڕیچاردسـۆن» Elliod Richardsonیان وەک پارێزەری خۆیان هەڵبژارد و دەگەڵ کارمەندانی ڕەسـمیی ئـەمریکا کەوتنـە دانوسـتاندن. دەبـێ بـزانین کـە «ئـەلیۆت ڕیچاردسۆن» داواکاری گشتیی حکوومەتی «ڕیچـارد نیکسـۆن» بـوو کـە لەبـەر ئـەوەی حـازر نـەبوو «ئارچیبالْـد کـاکس» Archibald Cox دادیـاری سـەربەخۆی ڕووداوی «واتـر گێـت» لەسـەرکار لابەرێ، بۆخۆی لە کارەکەی دەرکرا.

«ڕیچاردسۆن» کە پارێزەرێکی بەویژدانە، پاش ئەوەی ئاگـادار بـوو کــە برایــانی هاشــمی ڕێککەوتننامەیــەکیان دەگــەڵ کارمەنــدە ئــە منیەتییەکانی ئـەمریکا ئیمـزا کردوە بۆ ئـەوەی لە ئوروروپا و ئـەمریکا جاسووسـی لەسـەر ئێرانییـانی دەرەوەی وڵات بکـەن، خـۆی لـە دۆسییەکەی وان کێشایەوە. چونکـە، ئـەو پێـی خـۆش نـەبوو، خـۆی تووشـی دۆسـیەیەک بکـا کـە ڕێککەوتننامـەی کارمەنـدانی گـومرکیی ئەمریکا، بەشێکی پێکدێنێ.

لەحاڵێکدا سیڕووس بـە ئیمـزای ئـەو ڕێککەوتننامەیـە، خـۆی دەگـەڵ کارمەنـدە گومرکییـەکانی ئـەمریکا تـووش کردبـوو و «نـۆڕت»یـش خـەریکی تۆڵەسـتاندنەوە لـە کارمەنـدانی هـەواڵگریی ئیسـرائیل بـوو، ئەنـدامانی King and Romeo پێوەنـدییان بـە هاشـمییەوە گـرت و پرۆژەیەکی ناقانوونییان داهێنا. لەو پرۆژەیەدا هاشمی هەم نێچیر بوو هـەم تەڵـە. هاشـمی ڕازی بـوو کـە تـەلەفونەکـەی بـە دانـانی دەزگـای

دەنگ‌تۆمارکردن بکەوێتە ژێر کۆنترۆڵی کارمەندە گومرکییەکان و لەشیشی بۆ تۆمارکردنی دەنگی خەڵکی دیکە سیمکێشی بکرێ. پاشان، کارمەندانی گومرکیی ئەمریکا داوایان لە بانکی شیمیایی نیۆیۆرک کرد کە بە درۆ پشتڕاست بکاتەوە کە سیڕووسی هاشمی یەک میلیارد دۆلاری خۆی لەو بانکە هەیە.

نەخشەکە وا دارێژرابوو کە سیڕووسی هاشمی چەندی بکرێ پتر پێوەندی بەو کارمەندانەی هەواڵگریی ئیسرائیلەوە بگرێ کە خەریکی فرۆشتنی کەرەسەی شەڕ بە ئێران بوون و پێیان بڵێ کە حکوومەتی کۆماری ئیسلامی یەک میلیۆن دۆلاری داوە بەو و ئەویش دەیەوێ لە هەرکەس کە بتوانێ کەلوپەلی جەنگی بفرۆشێ، چەک بۆ ئێران بکڕێ. سیڕووسی هاشمی فێر کرابوو کە کاتی گفتوگۆ دەگەڵ «قوربانی»یەکانی خۆی بە شێوە و مەرجی ئەرێنی لەبارەی کڕین و فرۆشتنی کەرەسەی شەڕ، بدوێ. بە شێوەی سروشتی، هەر کەس لەوبارەیەوە قسەی دەگەڵ سیڕووسی هاشمی کردبایە، دەنگی لەسەر شریتە تەلەفونییەکان و ئەو شریتانە کە لە لەشی ویدا دانرابوون تۆمار دەکرا و کاربەدەستانی ئەمریکایی دەستبەجێ دەیانگرت. دواتر ئەمن بۆم دەرکەوت کە ئەمن و هەموو ئەندامانی کۆمیتەی هاوبەشیش بەشێک لە ئامانجە گرنگەکانی سیڕووسی هاشمی بۆ تەڵەنانەوەکە بووین.

ڕێکخراوی هەواڵگریی ئیسرائیل بەهۆی کەسانێکەوە کە «ڕافی ئەیتان» پێوەندیی دەگەڵیان هەبوو، لە داستانی سیڕووسی هاشمی ئاگادار بوو. سەرۆکی هەواڵگریی سوپای ئیسرائیل، «یەهوود باڕاک» بڕیاری دا یەکێک لە ناوشیارترین ژەنراڵەکانی پێشووی سوپای ئیسرائیل بکاتە نێچیری داوی ئەمریکایی‌یەکان. ئەم کەسە سەرتیپ «ئاڤراهام بار ئام» Avraham Bar Am بوو. ئەم ژەنراڵە بەستەزمانە کە لە هەموو ئەو بێنەوبەرەیە بێخەبەر بوو، پێوەندیی دەگەڵ هاشمی گرت و پێی وابوو، دوو سەوداگەری خەڵکی ئوورشەلیم، بە ناوی

«ئـایزەنبەرگ» Eisenberg کـە بـاب و کـوڕ بـوون و پـارێزەرێکی بریتانیـایی بـە نـاوی «سـامۆئیل ئیڤـانس» Samuel M Evansیش کـە کاری بۆ «عەدنان کاشووقی» سەوداگەری کەرەسەی شـەڕ کردبوو، دەگـەڵ ژەنـڕاڵ «بـار ئـام» هاوکـار بـوون. بەرێکـەوت «کاشـووقی» دۆسـتی «پرێـز» سـەرۆکوەزیـری ئیسـرائیل بـوو و خـۆی تووشـی عەمـەلیاتی «نیـر- نـۆرت» کردبـوو. «ئێڤـانس» پـێش دەسـتکردن بـە عەمـەلیاتی تەڵەنانـەوەی سیڕووسـی هاشـمی لەسـەر پـووڵ دەگـەڵ «کاشووقی» تووشی ناکۆکی ببوو و ئێستا ببووە پارێزەری ژەنڕاڵ «بار ئام» و «ئیزەنبێرگ» لە موعامەلەیەکدا کە دەیانەویست لەبارەی کەرەسەی شەڕەوە بیکەن.

«جان دو لارۆک»یش لـە لیسـتی تەڵەنانـەوەی سیڕووسـی هاشـمیدا بوو، بەڵام ئەو پێشتر بە مەسـەلەکەی زانی و ئەرکەکەشـی ئـەوە بـوو کە بە تەلەفون قسە دەگەڵ هاشمی بکا و پتر لـە بارودۆخەکە ئاگادار بێ.

ئاشکرایە کە کەسانێکی دیکەش لە پێرستی هاشمیدا هـەبوون، بـەڵام ئـەوان نەخشـێکی گرنگیـان لـە فرۆشـتنی کەرەسـەی شـەڕ بـە ئێرانـدا نەبوو، بەڵکوو ئەوان چەند هەلپەرسـتێکی سـاویلکە بـوون کـە حـەزیان دەکـرد دەگــەڵ ئێــران بکەونــە موعامەلــە. پێرســتی تەڵەنانــەوەی سیڕووسی هاشمی بەڕاستی زۆر بەرین و بەربڵاو ئامادە کرابوو.

زۆر لەو کەسانەی هاشمی چاوی پێیان کەوت و قسـەکانیان لەسـەر شـریت تۆمـار کـران، کارمەنـدانی Romeo شـریتی چاویشـیان لـێ هـەڵگرتبوون و بـەپێی ئەو شریتانە ئـەوانیان گرت. زۆر کەسـیش کـە بەشێک لە ئامانجەکانی سیڕووسی هاشمی نەبوون پێوەندییان دەگـەڵ بـانکی شیمیایی گرت و بانک پێیگوتن کـە یـەک میلیـارد دۆلار پـارە بـەناوی وی لـە بانک هەیـە. کاتێک ئەوانـە لەسـەر قسـەی کارمەندانی بانک لە دارایی بـانکیی سیڕووسـی هاشـمی دڵنیـا بـوون، پێیـانگوت کـە ئـەوان بۆ موعامەلـە ئامـادەن. ئـەویش وەڵامـی هـەموویانی دایـەوە کـە

دەبێ مانگی ئاوریل بۆ موعامەلەی بایی یەک ملیارد دۆلار کەرەسەی شەڕ بۆ ئێران لە نیۆیۆرک چاویان بەو بکەوێ. ئەو هەروەها داوای لێکردن کە وەختی موعامەلەکە هەرکامیان دەبێ پەرۆانەیەکی ساختەیان بەناوی ئەو وڵاتە هەبێ کە دواجار بەهرە لەو کەرەسانە وەردەگرێ.

زۆر لە قوربانییەکانی ئەو تەڵەنانەوەیەی سیڕووسی هاشمی هاتنە نیۆیۆرک و گیران، بەڵام بەشێکیان حەزیان نەدەکرد موعامەلەکە لە نیۆیۆرک ئەنجام بدەن و سەرەنجام وا دانرا لە «بەرمۆدا» بۆ ئەنجامدانی موعامەلەکە چاویان بە سیڕووسی هاشمی بکەوێ. ئەو توانی ژەنراڵ «بار ئام» و «ئایزەنبەرگ» و کوڕەکەی و کۆمەڵێکی دیکە لە «بەرمۆدا» دەداو بخا.

سیڕووسی هاشمی، چەندین جاری قسە لەگەڵ «جان دو لارۆک» کرد و سەرەنجام ئەو و خاوەنکارەکەی بانگهێشتن کرد کە لە «بەرمۆدا» چاویان بەو و کەسەکانی دیکە بکەوێ. ئێمە دەمانزانی کە بەرنامەی هاشمی تەڵەنانەوەیە، بەڵام ئەمن و «ڕافی ئەیتان» بڕیارمان دا بۆ ڕووبەڕووبوونەوە دەگەڵ سیڕووسی هاشمی بچینە «بەرمۆدا». دیارە «ڕافی ئەیتان» بەهۆی داستانی جاسووسیی «پۆلارد»ەوە بە ناوێکی ساختە سەفەری دەکرد. ئێمە چووینە مەیامی و ئەمن بە وشیاریی خۆم بەدڵمدا هات کە لە فڕۆکەخانەوە تەلەفون بۆ «جان دو لارۆک» لە ماڵەکەی خۆی لە باشووری فەڕانسە بکەم.

ئەو گوتی: «ئاری، سوپاس بۆ خوا کە تەلەفونت بۆ کردم. ئەمن بۆ هەر کوێیەک بە ئەقڵمدا هات، تەلەفونم کرد بۆ ئەوەی قسەت لەگەڵ بکەم. هەوڵ بدە نەچیە «بەرمۆدا»، چونکە دەگیرێی.»

لەحاڵێکدا «ڕافی ئەیتان» سوپاسی خەبەردانەکەی «جان دو لارۆک»ی دەکرد، گەڕایەوە ئیسرائیل، بەڵام ئەمن چوومە «جامایکا»، سێ ڕۆژ لەوێ مامەوە و دوایە چوومە «پێڕوو» تا سەرێکی ئەو کەلوپەلە جەنگییە بدەم کە لە ئەمریکاوە گوازرابۆوە «پێڕوو».

گرووپێک کە چوونە «بەرمۆدا»، بەتۆمەتی ئەوەی سەوداگەری کەرەسەی شەڕن و حکوومەتیان لە ئامانجی ڕاستەقینەی سەفەرەکەیان ئاگادار نەکردوە، دەسبەجێ گیران. دیارە کاربەدەستانی حکوومەتی بەرمۆدا تاوانێکی تایبەتییان نەدایە پاڵیان و تەنیا بڕیاریان دا لەو وڵاتە دەریان بکەن، نەک ئەوە کە بۆ دادگاییکردن بیاندەنە وڵاتێکی دیکە.

ئاشکرایە کە دەرکردنی ئەو گرووپە لە بەرمۆدا دەبوو بەهۆی بڕیاری دادگایەکی لێوەشاوەوە بێ و بۆ ئەو مەبەستە کاتێکیش بۆ دادگاییکردنیان دیاری بکرێ. بەپێچەوانەی قانوونەکانی بەرمۆدا، بە پەلە ئەوانیان بە فڕۆکەیەک ناردە نیۆیۆرک. هەرکە گەیشتنە فڕۆکەخانەی کەنەدی لە نیۆیۆرک، هەموو ئەوانە لەلایەن کارمەندانی گومرکەوە گیران و بەتۆمەتی فرۆشتنی ناقانوونیی کەرەسەی شەڕ بە ئێران ناردرانە بەندیخانەی ناوەندیی شاری نیۆیۆرک. ڕۆژی ٢٢ی ئاوریلی ١٩٨٦ کە ئەو کەسانە گیران، «گیلیانی»، داواکاری گشتیی بەشی باشووریی نیۆیۆرک و «ویلیام ڤۆن ڕاب» William Von Raab، سەرۆکی گومرک لە وتوویژێکی هاوبەشی تەلەڤیزیۆنیدا بەشدار بوون و بە دنیایان ڕاگەیاند کە کارمەندانی خزمەتە گومرکییەکان بە هاوکاریی کاربەدەستانی حکوومەتیی بەشی باشووریی نیۆیۆرک، توانیویانە گرووپێکی گەورە لە تێرۆریستان -«سەوداگەرانی مەرگ»- کە خەریکی فرۆشتنی یەک میلیارد دۆلار کەرەسەی شەڕ بە ئێران بوون، دەستگیر بکەن. لە حاڵێکدا، بەڕاستی ئەوە کەسانی وەک «گیلیانی»، «ڤۆن ڕاب» و «ئۆلیڤێر نۆرت» و هاوکارەکانیان بوون کە ئەو تاوانەیان کردبوو و دەیانەویست کەسانێک بدەنە دادگا کە بۆخۆیان تەڵەیان بۆ ناونەوە.

پاش ئەوەی ئەرکەکەمم لە «پێڕوو» ئەنجام دا، گەڕامەوە ئیسرائیل و دەسبەجێ لەبارەی ئەو گرووپەوە کە کەوتبوونە تەڵەوە کەوتینە

باسکردن. ئێمە نیازمان وابوو ژەنراڵ «بار ئام» لە زیندان بێنینە دەر و کاناڵی «نیر- نۆرت» لەنێو بەرین.

مانگی دواتر گرووپی «نۆرت» کە لەمێژ بوو دەیانەویست سەفەری تاران بکەن، ئاخرەکەی ئەو سەفەرەیان کرد. «نۆرت»، «مەک فارلین»، «نیر» و ئەوانی دیکە ڕۆژی ٢٥ی مانگی مای ١٩٨٦ لە تەل ئەبیبەوە بە فڕۆکە چوونە تاران. بەپێی قسەی ڕەفسەنجانی، ئەوان خۆیان کردبووە تەکنیسیەنی ئیرلەندی و بە دەبەرکردنی جلکی یەکسەر و بە ئینجیلێک و پاکەتێک شیرنییەوە گەیشتنە تاران. ئەوان بە جێتێکی ٩٧ی ئەمریکایی و فڕۆکەیەکی باربەرییەوە کە لە فەرانسە تۆمار کرابوو و مووشەکی TOWی دروستکراوی ئەمریکا و پارچەی یەدەکیی مووشەکی Hawkی تێدابوو، گیران و پاش ڕۆژێک مانەوە لەو وڵاتە بێئەوەی بتوانن وتوویژێک بکەن، لە تاران دەریانکردن. بەڵام دیارە ئەو کەلوپەلەی پێیان بوو لێیان وەرگرتن. بە قسەی ڕەفسەنجانی کە سەرهەنگ جەلالی وەزیری بەرگرییش پشتڕاستی کردەوە، ئەوان حیسابی تەکنیسیەنە ئیرلەندییەکانیان بەتەواوی یەکلا کردەوە.[19]

دواتر هێندێ ڕووداوی دیکەش هاتنە پێش کە بەتەواوی ئومێدەکانی «نیر- نۆرت»یان بەبادا دا. یەکەم ئەوە، کە چونکە «پرێز»ی

[19]-لە لێکۆڵینەوەکانی دواتردا کە لە ئەمریکا لەو نەفەرانە کرا، نوێنەرانی کۆنگرەی ئەمریکا لەبارەی ئەو سەفەرەوە، قسەی جۆراوجۆریان کردن. زۆربەیان گوتیان مانەوەی ئەو نەفەرانە لە تاران ٢ یان ٣ ڕۆژی خایاندوە. هێندێکیان گوتوویانە کە دیداری ئەو گرووپە دەگەڵ کاربەدەستانی ئێران لە هۆتێل بووە، نەک لە فڕۆکەخانە. بەڵام هەموویان لەو باوەڕەدا بوون کە حوججەتولئیسلام ڕەفسەنجانی بە هیچجۆر هاوکاریی ئەو گرووپەی نەکردوە و ڕووی خۆشی پێ نیشان نەداون. هیچکام لەو ڕاپۆرتانە ئاماژەیان بە مووشەکی TOW نەکردوە. هێندێک لەوانە گوتوویانە، فڕۆکە باربەرییەکە هی هێڵی هەوایی S. Lucia Airways بووە، نەک فەرانسە. پێشینەکانی ڕێکخراوی هەوالگریی سوپای ئیسرائیل، قسەکانی منیان پشتڕاست کردۆتەوە.

سەرۆکوەزیر ڕاستەوخۆ دەستووری دابوو ١٦ دانە مووشەکی Hawkی زەوی بە حەوای ئەمریکایی بهێنرێنە تاران، «نیر-نۆرت» سەرکەوتنی خۆیان لە فرۆشتنی کەلوپەلی جەنگی بە ئێراندا بە مسۆگەر دەزانی. بەڵام، چونکە سەرۆکوەزیری ئیسرائیل ڕاستەوخۆ دەستووری دابوو ئەو مووشەکانە تەحویلی ئێران بدرێن، ڕێکخراوی هەواڵگری و وەزارەتی بەرگریی ئیسرائیل نەیاندەتوانی حاشا لە بابەتەکە بکەن. دیارە هێندێ بەرنامەی دیکەی لەوجۆرەش بەڕێوە بوون.

خاڵی جێی سەرنج لەو سەودایەدا ئەوەیە کە سەرۆکوەزیری ئێران داوای کڕینی مووشەکی پێشکەوتووی Hawkی کردبوو، بەڵام ئەو کەسانەی سەودایەکەیان لەدەستدا بوو، مووشەکی Hawk 1یان بۆ ئێرانییەکان نارد. ئەفسەرێکی هێزی هەوایی ئیسرائیل کە بەرپرسی ڕاگوازتنی مووشەکەکان بوو، ئەوانی لە بەستەیەکی گەورەی بەرچەسپی پلاستیکیدا نارده بەندەر غەبباس لە باشووری ئێران.

کاتێک ئەو سندووقانەی مووشەکەکانیان تێدابوو کرانەوە، لە دەفتەری سەرۆکوەزیری ئێران هەڵلایەک دروست بوو. چونکە نەک-هەر ئەو مووشەکانە کۆن بوون، بەڵکوو هەرکامێکیشیان بەرچەسپێکی ئەستێرەی داودی لێدرابوو. ئەو ئێرانییانەی کاریان لەگەڵ گرووپی «نیر- نۆرت» دەکرد، مووشەکەکانیان وەرنەگرت و دوایەش تێگەیشتن کە ئەو پووڵەش کە بۆ کڕینی چەکوچۆڵە داویانە، تێدا چووە. چونکە ئەو بڕەپووڵەی لە ئیعتیبارنامەکەیدا هەبوو، پێشتر وەرگیرابوو.

لە حاڵێکدا ئەم ڕووداوە، ئێرانی بە تەواوی لە کاناڵی دووەم دوور خستەوە، «نۆرت»یش لە پەیداکردنی چەک بۆ کۆنتڕاکاندا تووشی هێندێک کێشە هات. بەوجۆرە کە «ئەمیرام نیر» دیدارێکی لەنێوان «نۆرت» و «ڕابین» وەزیری بەرگریی ئیسرائیلدا ڕێکخست، بۆئەوەی «نۆرت» لەبارەی کۆمەگی چەکداریی ئیسرائیل بە

کۆنتراکانەوە دەگەڵ «ڕابین» قسە بکا. بەڵام «ڕابین» بەڕاشکاوی بە «نۆڕت»ی گوت کە ئەو لەو بارەیەوە بەهیچ جۆر دەگەڵ «پریز»ی سەرۆکوەزیر هاوڕا نیە و کاتێک «نۆڕت» لە دەفتەری «ڕابین» ناوی کۆنتراکانی بەدەمدا هات، کارمەندانی «ڕابین» بە سووکایەتییەوە ئەویان لە دەفتەری «ڕابین» وەدەر نا.

سەیر ئەوەیە هەموو هەنگاوەکانی «نۆڕت» بۆ وەکارخستنی کاناڵی دووەم تووشی شکست بوون. بۆ نموونە، سوڵتانی «بڕوونی» Brunei کە بە دەوڵەمەندترین پیاوی دنیا بەناوبانگە، قەرار بوو ١٠ میلیۆن دۆلار کۆمەگی ماڵی بدا بە گرووپی «نۆڕت». حەواڵەی ئەو پووڵە بە تەلگڕام درایە «بڕووس ڕاپۆیۆرت» کە دۆستی «پریز» و بانکداری «نۆڕت» بوو. یەکێک لە ئەندامانی گرووپی «نیر» کارمەندی هەواڵگریی ئێمە بوو و ئێمەی لە بابەتەکە ئاگادار کرد. کاتێک ئێمە لە داستانەکە ئاگادار بووین، خەبەرەکەمان بڵاو کردەوە، بەڵام «نۆڕت» حاشای لێکرد و گوتی، ئەمە هەڵەیەکی بانکی بووە کە پارە نێردراوەتە حیسابێکی دیکە. ئاشکرایە کە ئەمە درۆیەکی ڕووت بوو و ئەمڕۆ بۆ هەمووان ڕوون بۆتەوە کە سوڵتانی «بڕوونی» لەباری ماڵییەوە پشتیوانیی لە «نۆڕت» کردوە.

ململانەی گرووپی «نیر- نۆڕت» و کۆمیتەی هاوبەش، شەڕێکی تەواو بوو. یەکەمجار «نۆڕت» بۆ پووچەڵکردنەوەی عەمەلیاتی کۆمیتەی هاوبەش هەنگاوی نابوو، بەڵام هیچی بۆ نەکرابوو. هەردوو گرووپ تۆڵەیان لە یەکتر ئەستاندبوو و ئێستا وەفادارانی حیزبی لیکوود کە کەوتبوونە بەر هێرشی «نۆڕت» هاتبوونە سەر ئەو ڕایە کە ئاوری شەڕەکە خۆشتر بکەن.

کۆمیتەی هاوبەش بڕیاری دا کە عەمەلیاتی «نۆڕت» لە ئەمریکا لەقاو بدا. دیارە ئێمە بەنیاز نەبووین باسی ئەو ئابڕووچوونە بکەین کە عەمەلیاتی «نۆڕت» لە ئەمریکا سازی کردبوو. مەبەستی ئێمە تەنیا ئەوە بوو کە وا بکەین گیراوەکان ئازاد بکرێن و «نۆڕت» لەنێو

بەرین. دیارە ئەوانە کە گیرابوون و سەربە کۆمەڵگەی هەواڵگریی ئیسرائیلیش نەبوون، لە ئاکامی چالاکییەکانی ئێمە لەو بوارەدا بەهرەمەند دەبوون.

یەکەم هەنگاوی من بۆ گەیشتن بەو ئامانجە، ئەوە بوو کە بابەتەکەم دەگەڵ هەواڵنووسی خۆرهەڵاتی نێوەڕاستی گۆڤاری تایمز، ڕاجیی سەمغئابادی هێنایە گۆڕێ. ئەم پیاوە لەجێدا ئێرانی بوو و لە ساڵانی دەیەی ١٩٧٠دا لە ڕۆژنامەی «کیهان بین المللی» کە ڕۆژانە بە زمانی ئینگلیزی لە تاران بڵاو دەبۆوە، دامەزرابوو. لەحاڵێکدا سەمغئابادی لەو ڕۆژنامەیەدا کاری دەکرد، هەرلەو حاڵەدا ئەندامی حیزبی نهێنیی توودەی سەربە شووڕەوییش بوو. ئەو لە کارکردن بۆ ڕۆژنامەی «کیهان بین المللی» زۆر ناڕازی بوو، چونکە هەموو چاپەمەنییەکانی تاران بە توندی لەلایەن پۆلیسی نهێنیی شا «ساواک»ەوە کۆنترۆڵ دەکران. سەمغئابادی لە کۆتایی ساڵەکانی دەیەی ١٩٧٠دا بەهۆی «بڕووس ڤان ڤوورست» Bruce Van Voorstەوە کە ئەندامی CIA بوو و لە ئادیس ئەبابا و تاران کاری بۆ ئەو ڕێکخراوە دەکرد، وەک هەواڵنووسی گۆڤاری Time دامەزرا.

ماوەیەکی کەم دوای دامەزرانی سەمغئابادی، شۆڕشی ئێران بەرپا بوو و مەلاکان ئەویان بە تۆمەتی جاسووسی بۆ CIA و ئەندامەتیی حیزبی توودە گرت. ئەگەر نێوەرۆکی CIA و حیزبی توودە پێکەوە بەراورد بکەین، کارکردن بۆ ئەم دوو ڕێکخراوە لە یەک کاتدا سەرسوڕهێن و نائاسایی دێتە بەرچاو. چەند ڕۆژ دوای گیرانی، سەمغئابادی بەهۆی پێوەندییەک کە دەگەڵ هێندێک لە مەلاکانی هەبوو، لە زیندان ئازاد کرا و دەسبەجێ لە ئێران چووە دەر و چووە نیۆیۆرک. لەم شارە، گۆڤاری تایمز پەنابەریی سیاسی و کارتی مانەوەی هەمیشەیی بۆ وەرگرت و بۆیە، سەمغئابادی دەیتوانی بەشێوەی قانوونی لە ئەمریکا کار بکا. ئەو دواتر بوو بە هاونیشتمانی

ئـــەمریکا و گۆڤـــاری تـــایمز کـــە لـــە کارەکـــەی ڕازی بـــوو، کردیـــە هەواڵنووسی خۆرهەڵاتی نێوەڕاست.

ئەمن سـاڵی ١٩٨٥ بـەهۆی ژنێکـەوە کـە لـە سـەردەمی قوتابخانـەوە دەمناسی و سەمغئابادییش پێوەندیی سێکسیی دەگەڵی هەبوو، دەگەڵ سەمغئابـادی ئاشـنا بووم. سـەمغئابـادی زۆر جوانچاک و میهرەبـان بوو. لەحاڵێکدا ژنی هێنابوو و دوو منداڵیشی هەبوون، ئاشقی «ڕۆزی نیمـڕۆدی» Rosie Nimrodi (یـەکێک لـە خزمـانی دووری «یـەعقووب نیمڕۆدی» بوو. «ڕۆزی نیمڕۆدی» جوولەکەیەکی عێراقی بـوو و لـە نیۆیۆرک کاری بۆ «ئەنجومـەنی ئـابووریی چاکترینـەکان» دەکـرد کـە ڕێکخراوێکـی لێکۆڵینـەوە بـوو. سـەمغئابـادی بـۆ خـاتری «ڕۆزی» دەستی لە ژنەکەی هەڵگرت، بەڵام قەت نەیتوانی «ڕۆزی» بێنێ.

مانگی مای (ئەیار)ی ساڵی ١٩٨٦ ئەمن چەند جار چاوم بە ڕاجی سەمغئابادی کەوت و وردەکاریی داستانی «ئۆلیڤێر نۆرت»م بۆ شـی کـردەوە. ئـەو بـە بیسـتنی داسـتانەکە تووشـی سەرسـوڕمان بـوو. بەڕاستی، عەمەلیاتی ئەوانە بۆیە دەبوو نـاو بنرێ جاسووسیی سـاڵ یان جاسووسیی یەک دەیە. ئەو کەوتە ژێر کاریگەریی ئەو بەڵگانە کە لەبارەی عەمەلیاتی «نۆرت - نیر»ەوە نیشانم دان و گوتی دەلیلەکان بەهێزتر لـەوەن کە کاربەدەسـتانی گۆڤـاری «تـایمز» بـۆ بڵاوکردنـەوە پێویستیانە. هەر لەو ڕۆژانەدا «ڕۆزی»یش منی بە ڕۆژنامەنووسـێکی دیکە بەناوی «تیمۆتی فێلپز» Timothy Phelps ناساند کە هەواڵنووسـی ڕۆژنامەی Newsday لە خۆرهـەڵاتی نێوەڕاسـت و شـوێنی کـارەکەشـی لە قاهیرە بوو. ئەو چەندین جار لە ئاپارتمانێک لە ئۆرشەلیم چاوی بە من کەوت و وردەکاریی داستانی «ئۆلیڤێر نۆرت»م بۆ شـی کردەوە. «ڕۆزی نیمڕۆدی»یش بـەپێی ئـەو زانیارییانـەی ئـەمن پێمدان، هێندێ یادداشتی نووسـین و دانـی بـە ڕۆژنامەنووسـەکانی دیکـە یـەک لـەوان هەواڵدەری ڕۆژنامەی نیۆیـۆرک تـایمز بـەناوی «سـتیفان ئـەنگلبێرگ» Stephen Engelberg کە وای نیشان دابوو حەز دەکا شت بزانێ. بـەڵام،

لــه دەفتــەری «یــەهوود بــاراک» ســـەرۆکی هـــەوالگریی ســـوپای ئیســـرائیلەوە خەبـــەریان بـــەمن دا کـــە خـــۆم لـــە نیزیکبوونـــەوە لـــە «ئـــەنگلبێرگ» بپـــارێزم و ئـــەمنیش فەرمانەکـــەیانم جێبـــەجێ کـــرد. ئێستاش ئەمن نازانم بۆچی باراک بڕیاری دا کە ئەو خەبەرە نەدرێتە ڕۆژنامەی نیۆیۆرک تایمز.

ئاشکرایە کە ئەمن بە دەستووری کۆمیتەی هاوبەش هەوڵم دەدا خەبەری عەمەلیاتی «نیر- نۆرت» بڵاو بێتەوە. ئێمە هیوادار بووین، پاش تەقینەوەی ئەو هەواڵە لە نیۆیۆرک، «گیلیانی» خەڵکەکەمان ئازاد بکا. بە هەرحاڵ، ڕۆژێک سەمغئابادی تەلەفونی بۆ کردم و خەبەرێکی ناخۆشی دامێ. ئەو گوتی: «ئاری، بەداخەوە ئاگادارت دەکەم کە گۆڤاری تایمز خەبەرەکە بڵاو ناکاتەوە. سەرنووسەری گۆڤار، «هێنری گرانواڵد» Henry Granwald بۆخۆی خەبەرەکەی ڤیتۆ کردوە.» پاشان ئەو پێکەنی و گوتی: «دیارە، ئەتۆ دەبێ هۆی ئەم کارە بزانی، هۆیەکە ئەوەیە کە خەڵک دەڵێن لە ئەمریکا ڕۆژنامە و گۆڤارەکان ئازادن و کۆنترۆڵیان لەسەر نیە.»

ڕۆژنامەی Newsdayیش خەبەرەکەی بڵاو نەکردەوە.

بۆ ئازادکردنی ئەو کەسانەی لە ڕووداوی تەڵەنانەوەی سیڕووسی هاشمیدا زیندانی کرابوون، ئێمە بڕیارمان دا خودی هاشمی کە دوای سەرکەوتنی عەمەلیاتی تەڵەنانەوە لە نێوان مەنهاتان (نیۆیۆرک) و لەندەندا هاتوچۆی دەکرد، بکەینە ئامانج.

بۆ ئەو مەبەستە ئەمن بە فڕۆکە چوومە لەندەن و تەلەفونم بۆ ئاپارتمانی هاشمی کرد کە «جان دو لارۆک» ژمارە تەلەفونەکەی دابوومێ. ئەو ڕازی بوو کە لە کافە Lindyای شەقامی «ڕیجێنت» Regent بمبینێ. ئەمن بۆخۆم ئەو کافەیەم بۆ دیتنی هاشمی هەڵبژاردبوو، چونکە لە شوێنی قەرەباڵغ ناکرێ قسەی خەڵکی دیکە تۆمار بکەی.

ئێمە سەرەتا داوای قاوەمان کرد و دوایە ئەمن دەستم بە گفتوگۆیەکە کرد، گوتم، ئەمن نامەوێ دەست لە کار و بۆچوونی تۆ

وەربدەم، بەڵام چونکە ژیانی هێندێ کەس لەبەرێک هەڵوەشاوە، بڕیارم دا ئەمڕۆ چاوم بە تۆ بکەوێ و چەند ساتێک لەبارەی کاری تۆوە وتووێژت لەگەڵ بکەم.

گوتم: «بەڕێز هاشمی، ئەگەر ئەتۆ لە دادگایەکی ئەمریکایی بە دژی ئەوانە شایەتی بدەی، ڕۆژنامەکانی ئیسرائیل و دنیا بەتوندی مشوورت دەخۆن و ئەودەم دەبینی چیت بەسەر دێ. هەر نەبێ ئەتۆ وەک کەسێک کە کاری دزێو و نائەخلاقی دەکا، ناوبانگ دەردەکەی.»

ئەو گوتی: «ئەتۆ لەوە کەمتری کە هەڕەشە لەمن بکەی.» بەڵام بەچاوی خۆم دیتم کە بە قسەکانی من کەوتۆتە بەر هەڕەشە.

دوایە ئەمن زەبرێکی دیکەشم داوەشاندێ: «ئەگەر ئەتۆ بەدژی ئەوانە شایەتی بدەی، پاش ئەوە ئارەزوو دەکەی قەت نەهاتبایتە سەر ئەم دنیایە. پێت وانەبێ دۆستە ئەمریکایی‌یەکانت وەختێک بۆخۆیان لەنێو چوون، دەتوانن پشتیوانیت لێبکەن.»

پاش ئەوەی ئەو زەبرەم لێدا، ئەمجار بە نەرمی و زمانی خۆش درێژەم پێدا: «بەڵام، ئەگەر ئەتۆ بەدژی ئەوانە شایەتی نەدەی و لە ئاپارتمانەکەی خۆت لە لەندەن بمێنیەوە حکوومەتی ئیسرائیل لەباری ماڵییەوە ڕازیت دەکا.»

سیڕووسی هاشمی بە نیگەرانی و پەرێشانی، کافەکەی بەجێ هێشت و بەرەو ئاپارتمانەکەی کەوتە ڕێ. ئەو نەیدەزانی کە لەوساوە دەکەوێتە ژێر چاوەدێری و تەلەفونەکانی بەهۆی کارمەندانی «مۆساد»ەوە تۆمار دەکرێن.

سەفەری من بۆ لەندەن بێئاکام نەبوو. سیڕووسی هاشمی، تەلەفونی بۆ دەفتەری داواکاری گشتیی بەشی باشووریی نیۆیۆرک کرد و پێی گوتن، بێ لەبەرچاوگرتنی هەرکارێک کە لەوانەیە لەدژی من کردبێتیان ئەمن، بڕیارم داوە لە دادگا بەدژی ئەو گیراوانە شایەتی نەدەم.

چەند ڕۆژ دواتر، بەوپەڕی سەرسوڕمانەوە، سیڕووسی هاشمی بە شێوەیەکی گوماناوی لە ئاپارتمانەکەی لەندەنی گیانی لەدەست دا.

بەڵام، لەبەر ئەوەی ئەو لەژێر چاوەدێریی ڕێکخراوی هەواڵگریی ئیسرائیلدا بوو، ئێمە دەمانزانی دوا کەس کە لە ئاپارتمانەکەی سیرووسی هاشمی چۆتە دەر «جۆ کینگ» Joe King، یەکێک لە ئەفسەرانی گومرکی ئەمریکا بووە کە لە «ناوەندی ستراتیژیی ناوەندی بازرگانیی جیهانی» لە مەنهاتانی نیۆیۆرک کاری کردوە. هۆی مەرگی هاشمی، تووشبوون بە جۆرە نەخۆشییەکی سەختی خوێن ڕاگەیەندرا.

پاش مردنی سیرووسی هاشمی، تەرمەکەی بە ئامادەیی یەکێک لە ئیشکەرانی ڕەسمیی گومرکی ئەمریکا قەڵاشترایەوە. بەپێی ڕاپۆرتی کارمەندانی هەواڵگریی ئیسرائیل، تەنیا شتی نائاسایی کە لەکاتی قەڵاشتنەوەی تەرمەکەیدا بەر چاو کەوت بوونی چەند کونەدەرزی لەسەر جومگەی ئانیشکی بووە.

هەروەها لقی «مۆساد» لە لەندەن، هێندێ شریتی لە وتووێژی تەلەفونیی سیرووسی هاشمی دەگەڵ کاربەدەستانی حکوومەتیی بەشی باشووریی نیۆیۆرک، یەک لەوان جێگری داواکاری گشتیی ئەو بەشە بەناوی «ڕابێرت هامێل» Robert Hamel لەدەستدا بوون. ئەو وتووێژانەی لەسەر ئەو شریتانە تۆمار کرابوون، نیشانیان دەدا کە سیرووسی هاشمی دەگەڵ ئاغاکانی هێندێ وتووێژی پڕناکۆکیی هەبوون. ئێمە بەو ئاکامە گەیشتین کە یەکێک بڕیاری داوە، وا باشترە سیرووسی هاشمی ببێتە قوربانیی مەرگێکی گوماناوی تا ئەوەی بکەوێتە نێو ئابڕووچوونێکی گشتی و ڕابگەیەنێ کە ئامادە نیە لە دادگا شایەتی بدا.

دیارە نەخۆشیی Leukemia هیچ وەخت لەنەکاو دروست نابێ، بەڵکوو لە ماوەی ساڵانێکی دوورودرێژدا بەرۆکی نەخۆش دەگرێ. لەلایەکی دیکەوە، سیرووسی هاشمی چەند ڕۆژ پێش مردنی بە تەواوی لەشساغ بووە و تەنانەت لە لەندەن لەوپەڕی سلامەتیدا، یاریی تێنیسی کردوە.

کۆتایی مانگی ژووئیەی ١٩٨٦، لە دەفتەری سەرۆکی «مۆساد»، «ناچووم ئەدموونی» چالاکییەکی توند لە ئارادا بوو و زۆر لە ئیشکەرانی دەوڵەتی بانگ دەکرانە دەفتەرەکەی وی. ئەمنیش یەک لەو کەسانە بووم کە بە هۆی سەرۆکی ستادی ڕێبەری «مۆساد»ەوە بانگ کرام و دیارە هۆیەکەیم دەزانی. قەرار بوو «جۆرج بووش» جێگری سەرکۆماری ئەمریکا سەردانی ئیسرائیل بکا و بانگکردنی من بۆ دەفتەری «مۆساد» پێوەندیی بەو بابەتەوە هەبوو.

«ناچووم ئەدموونی» سەرۆکی ڕێکخراوی «مۆساد» پیاوێکی زۆر وشیار و زمانخۆش بوو کە بۆ کاری حیسابداری لێوەشاوەتر لە سەرۆکی دەزگایەکی بەرینی پیاوکوژی بوو. لەباری سیاسییەوە ئەو سەر بە هیچکام لە دوو حیزبی دەوڵەتیی لیکوود و کرێکار نەبوو.

ئەو یەکەمین سەرۆکی ڕێکخراوی «مۆساد» بوو کە لە ڕێکخراوی بۆرۆکراسی (ئیداری)ی ئیسرائیلەوە گەیشتبووە ئەو پۆستە نەک لە سوپاوە. هۆی ئەوە کە ئەو کارەی پێسپێردرابوو، ئەوە بوو کە یەکێک لە ژەنراڵەکانی سوپا بە ناوی «یەکووتیەل ئادەم» Yekutiel Adam کە کاندیدای سەرۆکایەتیی ڕێکخراوی «مۆساد» بوو بە هۆی ژێردەستەکانیەوە تیرۆر کرا.

پاش ئەوەی ساڵی ١٩٨١، «مەناخیم بگین» سەرۆکوەزیری ئیسرائیل، ژەنراڵ «ئادەم»ی بۆ سەرۆکایەتیی «مۆساد» هەڵبژارد، ئەو کاتێک لە بەنزینخانەیەکی «لۆس ئەنجلێس» کیفە دەستییەکەی لێ بەجێ ما، ژمارەیەک سەنەد و بەڵگەی زۆر نهێنی کە لە کیفەکەیدا بوون، ون بوون. بە خۆشییەوە کیفەکەییان دایەوە پۆلیسی لۆس ئەنجلێس، بەڵام لە نێوخۆی ئیسرائیل، ئەم بابەتە دەنگ و هەرایەکی زۆری وەڕێ خست. ئیشکەرانی «مۆساد» زۆریان هەوڵ دا بە کەلکوەرگرتن لەو بابەتە کاندیدایی ژەنراڵ «ئادەم» بۆ ڕێبەریی «مۆساد» ڕابگرن. بەڵام ئاکامێکیان لەو هەوڵانەیان وەرنەگرت.

کاتێک ژەنراڵ «ئادەم» لە سەفەری ئەمریکا گەڕایەوە ئیسرائیل، بۆ دیتنی لوبنان سەفەری ئەو ناوچەیەی کرد. لە لوبنان ئەویان بردە خانووبەرەیەکی چۆڵ کە بەسەر باشووری لوبنانیدا دەڕوانی تا لەوێوە بتوانێ بە باشی ناوچەکە ببینێ. لەکاتێکدا ئەو لە هەیوانی خانووەکەوە بە دووربین خەریکی دیتنی باشووری لوبنان بوو، تۆپخانەی ئیسرائیل هێرشی کردە سەر خانووبەرەکە و ژەنراڵ «ئادەم» و چەندین کەس لە ئەفسەرانی ئیسرائیلی کە لەگەڵی بوون، دەسبەجێ کوژران. هێندێکەس پێیان وابوو تۆپخانەی ئیسرائیل بە هەڵە خانووبەرەکەی تۆپباران کردوە، بەڵام «ڕافی ئەیتان» لەو باوەڕەدا بوو کە ئەو کارە بە ئەنقەست و بۆ کوشتنی ژەنراڵ «ئادەم» بووە. کۆنە ئیشکەرەکانی «مۆساد» لە ژەنراڵ «ئادەم» دەترسان، چونکە ئەو بە ئیشکەرانی دەفتەری سەرۆکوەزیری گوتبوو کە پاش بەدەستەوەگرتنی ڕێکخراوی «مۆساد» ڕایەڵکەی هەواڵگریی ئیسرائیل بەچاکی بژار دەکا.

وەختێک ژەنراڵ «ئادەم» لە مەیدان چووە دەر، «بگین» یەکێک لە ئیشکەرە پیشەیی و ئیدارییەکانی «مۆساد» واتە «ناچووم ئەدموونی»ی کردە سەرۆکی ئەم ڕێکخراوە. «ئەدموونی» وردەوردە هێز و دەسەڵاتەکانی «مۆساد»ی دایە ڕێکخراوی هەواڵگریی سوپا. «بگین»، چونکە ساڵی ۱۹۷۳ «مۆساد» نەیتوانیبوو لە هێرشی هێزەکانی میسر و سووریە بۆسەر ئیسرائیل ئاگادار بێ، پێی ناخۆش نەبوو ئەوکارە بکرێ و بۆیە «ئەدموونی»ی بۆ سەرۆکایەتیی «مۆساد» بە مۆرەیەکی گونجاو زانی. «ئەدموونی» دەسەڵات و هێزی چەند جار لە سەرۆکی من کە ڕێبەریی هەواڵگریی سوپای لە ئەستۆ بوو، کەمتر بوو. بەڵام لەبارەی فرۆشتنی کەرەسەی شەڕ بە ئێرانەوە بەرپرسانی «مۆساد» و هەواڵگریی سوپای ئیسرائیل دەسەڵاتی وەک یەکیان هەبوو.

دوای ئەوەی من بانگ کرامە ڕێکخراوی «مۆساد» و ڕووبەڕووی «ئـەدموونی» دانیشـتم، جیـددیبـوونی وی بۆچوونەکـەی منـی پشتڕاسـت کـردەوە. بانـگکردنـی مـن بـۆ دەفتەرەکـەی بـەهۆی هـاتنی «جۆرج بووش» بۆ ئیسرائیل بوو.

«ئەدموونی» پێیگوتم: «ئاری، بابەتێک کە دەمـەوێ دەگـەڵتی بـاس بکـەم، دەبـێ ئەوپـەڕی نهێنـی وەمێنـێ. بـەکورتی، جـۆرج بـووش حـەز دەکا لە عەمەلیاتی ڕایەڵکەی هـەواڵگریی ئیسرائیل لـەبارەی فرۆشتنی کەرەسـەی شـەڕ بـە ئێرانـەوە ئاگـادار بـێ و بۆیـە داوای لـەمن کـردوە چاوی بە کەسێک بکەوێ کە لەنێو ئەم کارەدا بووبێ.»

پێمگوت: «کەوابێ ئەو دەیەوێ چاوی بە من بکەوێ.»

«ئەدموونی» درێژەی دایە: «شـامیر» جێگری سـەرۆکوەزیـران لـە کاتی سەردانی «بووش» لە وڵاتەکەماندا، داوای لێکردوە، عەمـەلیاتی کانـاڵی دووەم لـەبارەی فرۆشـتنی کەرەسـەی شـەڕ بـە ئێرانـەوە ڕاوەستێندرێ. ئەتۆ و خـەڵکی دیکە لـەو عەمەلیاتـەدا هـەبوون و دەبـێ بـێدەنـگوهـەرا درێـژەی پـێبـدەن. بـەڕێز «شـامیر»، حـەز ناکـا دەسـتەیەکی دیکـە، ئـەم عەمەلیاتـە بگرنـە بـەر و ببنـە مایـەی ئاشکرابوونی هەموو عەمەلیاتەکە و شامیر ئەم بابەتەی دەگەڵ بـەڕێز بووشیش باس کردوە.

«هەروەها لە بەڕێز بووش داوا کراوە کە کۆتـایی بـە ڕەوتـی بـەناو، دەسـتپێشـخەریی ئاشـتی بێنـێ و نیگـەرانیی ئێمـە لـە پێوەنـدیی نێـوان ئەمریکا و عێراقیش بە ئاگاداریی ئەو گەیشتوە. ئێمە نیگەرانیی توندی خۆمان لە فرۆشتنی کەرەسەی شیمیایی شەڕ لەلایەن وڵاتی شـیلی بـە عێراقیش پێشتر بە ئاگاداریی ڕابێرت گەیتس گەیاندوە. ئێسـتا جـەنابی بـووش، دەیـەوێ لـە هـەموو ئـەو بەسـەرهاتانە ئاگـادار بـێ. چونکـە عەمەلیاتی فرۆشتنی کەرەسەی شەڕ بە ئێران بەشێک لە کاری تۆیـە و ئەتۆ دەتوانی لەوبارەیەوە وەڵامی هەموو پرسیارێک بدەیەوە، بۆیـە

پـێم‌خۆشـه، ئـه‌تۆ ورده‌كـاریی زانیـاریی پێویسـت لـه‌باره‌ی فرۆشـتنی كه‌ره‌سه‌ی شه‌ڕ به‌ ئێرانه‌وه‌ تا ئه‌م له‌حزه‌یه‌ بده‌ی به‌ بووش.»

ئـه‌من گـوتم: «ئه‌گـه‌ر بـووش پێـی خـۆش بـێ گـوێ بـۆ ئـه‌و شـتانه‌ ڕاگـرێ كـه‌ ئـه‌من لـه‌باره‌ی گرووپـی سـه‌ره‌كیی فرۆشـتنی كه‌ره‌سـه‌ی شـه‌ڕ بـه‌ ئێرانـه‌وه‌ بۆی ڕوون ده‌كه‌مـه‌وه‌، ده‌بێ ورده‌كاریی گرووپی (نیر-نۆرت)یشی بۆ ڕوون بكرێته‌وه‌.»

«ئـــه‌دمـوونی» ســـه‌ری ڕاوه‌شـــاند و گـــوتی: «بـــه‌ڕێـــز نیـــریش ڕوونكردنـه‌وه‌ی پێویست ده‌دا بـه‌ بـووش. هـه‌روه‌ك گوتم، ئـه‌و حـه‌ز ده‌كا له‌ ورده‌كاریی مه‌سه‌له‌كه‌ ئاگادار بێ.»

ئـه‌من ده‌مزانـی هـه‌رچی بـه‌ بووشـی بڵێم له‌وانه‌یه‌ نه‌چێتـه‌ گوێیـه‌وه‌، ئیسحاق شامیر كه‌ به‌پێی ڕێككه‌وتنی حكوومـه‌تی هاوپـه‌یمانی، قـه‌رار بـوو پۆسـتی سـه‌رۆكوه‌زیـری لـه‌ «پریز» وه‌ربگرێ، لـه‌ پێشـه‌وه‌ بـه‌ جێگـری سـه‌ركۆماری ئـه‌مریكای گوتبـوو كـه‌ حیزبـی لیكوود ده‌سـت-پێشـخه‌ریی ئاشـتیی ئـه‌مریكا قبـووڵ ناكـا و بۆخـۆی به‌رنامه‌یـه‌ك بـۆ ئاشتی داده‌هێنێ و ڕێكی ده‌خا.

له‌گه‌ڵ گوێگرتن له‌ ڕوونكردنـه‌وه‌كانی «ئـه‌دمـوونی»، بـۆم ده‌ركـه‌وت كـه‌ «ئیسـحاق شـامیر» لـه‌ پێشـه‌وه‌ هێنـدێ شـتی فێـری سـه‌رۆكی «مۆسـاد» كـردوه‌. وتـووێژی مـن له‌گـه‌ڵ «ئـه‌دمـوونی» سـێ سـه‌عاتی خایاند، له‌ كۆتاییدا وه‌بیرمـان هاتـه‌وه‌ كـه‌ هـه‌وڵێكی بێ‌ئاكامـمان دا بـۆ ئه‌وه‌ی عه‌مه‌لیاتی «نیر-نۆرت» ئاشكرا بكه‌ین و تا ئێستا نـه‌مانتوانیوه‌ عه‌مه‌لیاته‌كه‌یان له‌ ڕۆژنامه‌كاندا بڵاو بكه‌ینـه‌وه‌. «ئـه‌دمـوونی» پێكـه‌نی و گـوتی: «ئاخره‌كـه‌ی ڕۆژێـك دێ كـه‌ بـووش له‌سـه‌ر ئـه‌و كارانـه‌ كـه‌ ئێمه‌ ده‌یانكه‌ین، من به‌ گونان هه‌ڵواسێ».

جۆرج بووش له‌كاتی سـه‌ردانی ئیسرائیلدا، له‌ هۆتێل «كینگ دێڤید» مایـه‌وه‌. چونكـه‌ ئـه‌و هۆتێلـه‌ كـه‌وتبووه‌ ناوه‌نـدی شـاری له‌مێژینـه‌ی ئۆرشـه‌لیم، زۆر گیروگرفتـی ئه‌منیـه‌تیی لـه‌ پـێش بـوون. به‌تایبـه‌تی حاواندنـه‌وه‌ی ئـه‌و لیمۆزینانـه‌ كـه‌ هـه‌موو ڕۆژێ لـه‌ كـاتی هـاتن و

ڕۆیشــتنی جێگــری ســەرکۆماری ئــەمریکادا، دەوروبــەری ئــەویان دەگرت، کارێکی زۆر دژوار بوو. هەر بۆیـە، بۆ ئەو کۆبوونەوەیە کە قەرار بوو، وردەکاریی فرۆشتنی کەرەسەی شەڕ بە ئێران بۆ جۆرج بووش ڕوون بکرێتەوە، ئێمە هۆتێل هیلتۆنمان هـەڵبژارد کە کەوتبووە قەراخ شار لە نزیک شارێگای ژمارە ١ی تەل ئەبیب.

«دیڤید کیمچە»، بەڕێوەبەری گشتیی وەزارەتی دەرەوەی ئیسرائیل کە پێشتر سەرۆکی «تیڤێل» ڕێکخراوی «مۆساد»، واتـە بەشێک بـوو کـە ئـەرکی بـەڕێوەبردنی کاروبـاری پێوەنـدیی دەرەوەی ڕێکخـراوی هـەواڵگریی هێزەکـانی بـەرگریی ئیسنرائیلی ئـەنجام دەدا و ئەندامـەتیی ئەسـڵیی کۆمیتـەی هاوبەشـی ئیسـرائیل- ئێرانیشـی، لـە ئـەسـتۆ بـوو، پێشتر بەهۆی «ئەدمونی»یەوە ئاگادار ببوو کە قـەرارە ئـەمن جۆرج بووشی لە ڕەوتی فرۆشتنی کەرەسـەی شـەڕ بـە ئێران ئاگـادار بکـەم. بۆیـە ئـەو و ئیسـکۆرتەکەی بـووش لـە هۆتێل چاوەڕێی چوونی مـن بـوون. کاتێـک ئـەمن گەیشـتمە هۆتێـل، «کیمچـە» بردمیـە یـەکێک لـە نهۆمـەکانی سـەرەوەی هۆتێل، لـە سـویتێک کـە بـۆ کـۆنفڕانس ئامـادە کرابوو.

ئێمە سڵاومان لە کارمەندە ئەمنیەتییەکان کرد و چووینە ژوورەکە. جۆرج بووش، لە پشت مێزێکی ڕاستی گۆشـەکە دانیشتبوو، گوێی بۆ ڕوونکردنـەوەی کەسـانی دیکـە لـەبارەی بابەتـەکانی دیکـەوە گرتبـوو. جـۆرج بـووش داوای لـە مـن کـرد لـە پشـت مێـزی ڕاسـتی گۆشـەکە دانیشم. «دیڤید کیمچە»ش لەوێ مایەوە. خێرانووسـێکی ئیسـرائیلییش لە «مۆساد»ەوە لەوێ ئامادە بوو. جۆرج بووشیش دوو کەسـی دیکـە و خێرانووسێکی دەگەڵ بوون.

جـۆرج بـووش زانیبیـەتی یـان نـەیزانیبێ، ئیسـرائیلییەکان بڕیاریـان دابوو بەنهێنی فیلم لە کۆنفڕانسەکە هەڵبگرن.

پـێش ئـەوەی ئـەمن دەسـت بـە قسـەکانم بکـەم. «کیمچـە» ڕوونـی کـردەوە کـە ئـەمن «پیـاوێکی ئاگـادار لـەبارەی ئێرانــەوە» بـووم و

وردەکاریی چالاکییە هاوبەشەکانی ڕێکخراوی هەواڵگریی ئیسرائیل و گرووپی «ڕابێرت گەیتس» بۆ بووش شی دەکەمەوە.

ئەمن وردەکاریی چالاکییەکانی کۆمیتەی هاوبەش بۆ فرۆشتنی کەرەسەی شەڕ بە ئێرانم لە ١٩٨١ەوە بۆ جێگری سەرکۆماری ئەمریکا، بووش ڕوون کردەوە و ئەویش بە بێدەنگیی تەواو گوێی لە قسەکانم دەگرت. لەنێو قسەکانی خۆمدا پێمگوت کە ئێمە لە ناوچە جۆراوجۆرەکانی دنیا، بۆ نموونە ئەمریکا و ئیسرائیل، کەرەسەی شەڕمان بۆ ئێران دابین کردوە و لەبارەی شەڕی نێوان ئێران و عێراق و ئەوە کە کام لەم دوو وڵاتە بەسەر ئەوی دیکەدا زاڵ دەبێ، بە درێژی شیم کردەوە. هەروەها ئەو ئاڵوگۆڕەم بۆ بووش شی کردەوە کە لە نێوخۆی ئێران هاتبووە پێش.

وەختێک ئەمن قسەم دەکرد لەبارەی زۆر لەو بابەتانەوە کە ئەمن بۆ بووشم ڕوون دەکردنەوە و پێشتر دەگەڵیان ئاشنا بوو و دەیەویست لە زمانی ئیسرائیلییەکانەوە بیانبیسێ هیچی نەگوت، بەڵام بەرەبەرە نۆرەی ئەوە هات کە بابەتێک شی بکەمەوە کە «ئەدموونی» فێری کردبووم. بۆیە لێم زیاد کرد: «جەنابی جێگری سەرکۆمار، وڵاتی ئەمریکا ژەنراڵێکی ئیسرائیلیی بە تۆمەتی فرۆشتنی کەرەسەی شەڕ لە زیندانێکی خۆیدا ڕاگرتوە و ئێمە پێمان وایە دەبێ خۆی و هاوکارەکانی ئازاد بکرێن.»

بووش چاوەکانیی بەرەو سەرەوە جووڵاند و تاوێک تێمەوە ڕاما. ئەمن لەو بڕوایەدا بووم کە ئەو لە گیرانی ژەنراڵ «بارام» لە عەمەلیاتی تەڵەنانەوەی «بەرمۆدا»دا ئاگادار بووە. هەرچۆنی بێ، ئەو لەو بابەتە ئاگادار بوو یان نەبوو، بەرامبەر بە قسەکانی من، دژکردەوەیەکی نیشان نەدا.

ئەمن لەسەری ڕۆیشتم: «مەسەلەی عێراقیش لەو داستانەدا جێی بایەخە. CIA کەرەسەی شەڕ بۆ عێراق دەنێرێ و ئیسرائیل لەو بابەتە نیگەرانە.»

بووش لە حاڵێکدا وا دیار بوو نەختێک نارەحەت بووبێ، کەمێک لەشی خۆی جووڵاند، بەڵام دیسان درێژەی بە بێدەنگییەکەی دا و هیچی نەگوت. دیارە بووش لە کەسێک کە قەرار بوو عەمەلیاتی فرۆشتنی کەرەسەی شەڕ بە ئێرانی بۆ ڕوون بکاتەوە، چاوەڕوانی ئەوە نەبوو باسی بابەتگەلێک بکا کە لەڕاستیدا داخوازگەلێکی دەمامکدار بوون.

ئەمن درێژەم دایە: «سەرەنجام ئەوە کە، کۆمەڵگەی هەواڵگریی ئیسرائیل پێی خۆش نیە سەددام حوسێن لە وتووێژەکانی ئاشتیدا نفووز بەکار بەرێ، یان لە کەنارەی خۆرئاوا و کەرتی غەززە دەوڵەتێکی فەلەستینی دابمەزرێ.»

وا دیار بوو بەرەبەرە حەوسەلەی بووش بەسەر دەچێ. ئەمن هەستم کرد کە وەختی قسەکردنم کۆتایی هاتوە. ئەگەر لە سنووری ئەو قسانە تێپەڕیبام، ئەو دەستووری پێدەدام، کۆبوونەوەکە بەجێ بێڵم و ئەمەش مانای ئەوە بوو کە لەو سنوورەی بۆم دانرابوو، ئەولاتر چووم. ئەمن فێر کرابووم لە نێو قسەکانمدا ئەو بابەتانە باوێژم و دوایە بکشێمەوە.

لێرەدا کاغەزەکانم خستنەوە نێو کیفەکەم و هەستام. بووشیش هەستا. ڕاست دوو سەعاتم قسە کردبوو. لە تەواوی ئەو ماوەیەدا ئەو بەوپەڕی ئەدەبەوە گوێی بۆ قسەکانم ڕاگرتبوو. وەختێک کۆبوونەوەکەم جێهێشت، ئەو سوپاسی ڕوونکردنەوەکانمی کرد، بەڵام دەمدی کە لە قسەکانم خۆشحاڵ نەبوو.

دوایە ئەمن ڕاستەڕێ چوومە دەفتەری «ئەدموونی» لە تەل ئەبیب.

ئەو پرسی: «کۆبوونەوەکە چۆن تێپەڕی؟»

دیمەنی ڕووگرژی و دەنگی قورسی «جۆرج بووش» لە مێشکمدا بریسکەی دا.

گوتم: «خەنجەرت لێدابایە خوێنی لێنەدەهات.»

پاش مردنی «فریدی» و «هێرووت» ژیانی تایبەتیی من لەبەریەک چووبوو. تەنیایی و پەرێشانی پاڵی پێوە نابووم ڕوو بکەمە «ئۆرا بن شالۆم» Ora Ben Shalom. ئەمن لە ساڵی ١٩٧٩وە کە لە ئیدارەی پێوەندییەکانی دەرەوە کارم دەکرد، ئەو ژنەم ناسیبوو. دیارە ناوی «گرووپی ئۆرا» کە لەسەر کۆمپانییەکەی ئێمە دانرا، لەناوی ئەوڕا هاتبوو. چونکە وەختێک ئەندامانی کۆمیتەی هاوبەش دەیانەویست ناوێک بۆ کۆمیتەکەیان هەڵبژێرن کە «سەرمایەی ڕەش»یش سەر بەو بێ، ئەمن ناوی «گرووپی ئۆرا»م پێشنیار کرد، چونکە ناوی ئەو ژنەم لە مێشکدا بوو.

«ئۆرا» ژنێکی زۆر جوان، ڕەنگئەسمەر و باڵابەرز بوو و لە ئەمریکا لەدایک ببوو. دایکی جوولەکەیەکی کانادایی و بابی جوولەکەیەکی ئوتریشی بوو کە لە «ئەنتاریۆ» وەک ڕێبەری مووزیک لە کەنیسەیەک کاری دەکرد. دایک و بابی «ئۆرا» لەو کەنیسەیە یەکتریان ناسیبوو و زەماوەندیان کردبوو. دایکی «ئۆرا» دواتر توانیبووی، کارێک لە ڕێکخراوی خێرانووسیی شیکاگۆ کە سەربە حکوومەتی ئیسرائیل بوو، پەیدا بکا و «ئۆرا»ش هەر لەو شارە لەدایک ببوو. بەڵام بابی «ئۆرا» نەیتوانیبوو، کارێک بۆخۆی پەیدا بکا. بنەماڵەی «ئۆرا» دواتر چوونە تەکزاس و بابی «ئۆرا» لەو ویلایەتە توانی ماوەیەکی کورت لە کەنیسەیەک وەک ڕێبەری مووزیک کار بکا. بەڵام، دوایە کاتێک «ئۆرا» ١٢ساڵە بوو بڕیاریان دا کۆچ بکەن بۆ ئیسرائیل. لە ئیسرائیل ئەوان ناوی بنەماڵەیان لە «فریدمەن» Friedmanەوە گۆڕی بە «بن شالۆم».

هەموو ئەندامانی بنەماڵەی «ئۆرا» زۆر مەزهەبی و لەباری سیاسییەوە بێئەندازە دەستەڕاستی بوون. خوشکی گەورەتری «ئۆرا» چووە نێو سوپا و مێردی کرد و «ئۆرا»ش پاش تەواوکردنی قوتابخانەی ناوەندی چووە نێو سوپا. ئەو بە زمانەکانی ئینگلیزی، ئیسپانیۆلی و عیبری بە ڕەوانی قسەی دەکرد و بۆیە بە پلەی

سوتوان یەکەم (ملازم اول) چووە ئیدارەی پێوەندییەکانی دەرەوەی ڕێکخراوی هەواڵگریی سوپای ئیسرائیل. لێرەدا کاتێک ئەو ١٩ساڵە بوو، ئێمە یەکترمان ناسی.

ئەمن و «ئۆرا» پێوەندییەکی دۆستانەی تایبەتیمان پێکەوە هەبوو و تەنانەت، یەکدووجاریش لە دەرەوەی ئیدارە یەکترمان دیتبوو، بەڵام لەوکاتەدا ئەمن دەگەڵ «فرێدی» ئاشنا بووم و بۆیە پێوەندیی من و «ئۆرا» نەگەیشتە هیچکوێ، «ئۆرا» ساڵی ١٩٨٠ لە ئیدارەی پێوەندییەکانی دەرەوەی ڕێکخراوی هەواڵگریی سوپا کشایەوە و چووە خزمەتی «مۆساد». ڕێکخراوی «مۆساد» سەرەنجام کارێکی باشی لە پێوەندییە گشتییەکانی هیلتۆنی نێونەتەوەیی لە ئۆرشەلیم بەو سپارد. بەڵام ئەو هەمیشە وەک ئەندامێکی چالاکی «مۆساد» مایەوە، بەو مانایە کە «مۆساد» لە هەر وەختێکدا لەوانە بوو بانگی بکا بۆ ئەنجامدانی عەمەلیاتێکی تایبەتی.

هەرچەند ئەمن و ئۆرا لەمێژساڵ بوو پێوەندیمان پێکەوە هەبوو، بەڵام لەڕاستیدا تەنیا پاش مەرگی «فرێدی» ئەو باوەشی بۆ کردمەوە. کۆتایی ساڵی ١٩٨٦ ئەو لە چەند سەفەردا کە بۆ کڕینی کەرەسەی شەڕ دەچوومە ئورووپا، دەگەڵم هات و پاش ئەوە بە زوویی ئێمە لە ئۆرشەلیم لە یەک ماڵدا پێکەوە ژیاین.

تەنانەت دوای مەرگی سیرووسی هاشمییش، داستانی «ئۆلیڤێر نۆرت» لە گۆڤاری Timeدا چاپ و بڵاو نەبۆوە،و زیندانییانی عەمەلیاتی تەڵەنانەوەی «بەرمۆدا» بێجگە لە «Sam Evans» کە پارێزەر بوو، لە زیندانی ناوەندیی نیۆیۆرک مانەوە.

لە یەکێک لەو سەفەرانەدا کە بۆ فرۆشتنی زۆرتری کەرەسەی شەڕ بۆ ئێرانم کرد، مەسەلەی هەوڵەکانمان بۆ بەگرتدانی «نیر-نۆرت» و بڵاوکردنەوەی خەبەری عەمەلیاتەکەیان لە ڕۆژنامەکانمدا دەگەڵ حوججەتولئیسلام ڕەفسەنجانی باس کرد. ئەو وەڵامی دامەوە: «ئێمە لەوبارەیەوە، ئەوپەڕی کۆمەگتان پێدەکەین. ئێوە، سەرەتا هەوڵی

خۆتان بۆ ئەو کارە بخەنە گەڕ، ئەگەر سەر نەکەوتن، ئێمە یارمەتیتان دەدەین»

بەڵام، دەگەڵ ئەو پێوەندییانەش کە لەگەڵ ڕاجی سەمغئابادی گرتمن، هیچ باسێک لەو بارەیەوە لە گۆڤاری Timeدا دەرنەکەوت. سەرەنجام دوای تەلەفونێکی ڕاستەوخۆ دەگەڵ ڕەفسەنجانی لە ئێران، ئەو گوتی: «ئێمە ئەو کارەتان بۆ دەکەین.»

ڕۆژی سێیەمی نۆڤامبری ١٩٨٦ ڕۆژنامەیەکی چووکەڵەی لوبنانی بە ناوی «الشریعە» وتارێکی دەربارەی عەمەلیاتی نهێنیی «ئۆلیڤێر نۆڕت» بۆ فرۆشتنی کەرەسەی شەڕ بە ئێران بڵاو کردەوە. پاش بڵاوبوونەوەی بابەتەکە ژەنراڵ «بارام» و سەوداگەرانی کەرەسەی ئیسرائیلیی شەڕ بە دەستەبەر (کەفیل، زامن) لە زیندانی ناوەندیی نیۆیۆرک ئازاد بوون.

«لیۆنارد سەند» Leonard Sand، دادپرسی فیدراڵی ئەمریکایی کە بەرپرسی ڕاگەیشتن بە دۆسیەی زیندانییانی عەمەلیاتی تەڵەنانەوەی «بەرمۆدا» بوو، ڕایگەیاند: «ئەمن هیچکەس بە تۆمەتی عەمەلیاتێک کە حکوومەتی ئەمریکا ئەنجامی دابێ، لە زینداندا ڕاناگرم.» دوای ئەوەش تەواوی ئەو کەسانەی بەهۆی ئەو بەسەرهاتەوە گیرابوون لە تۆمەت ڕزگاریان بوو.

داستانی «ئۆلیڤێر نۆڕت» لە ئەمریکا لەسەر زەوییەکی زۆر بەپیت پێگەیشت. ڕۆژی ٥ی نۆڤامبری ١٩٨٦، فڕۆکەیەک کە کەرەسەی شەڕی بۆ کۆنتراکان دەگوازتەوە، کەوتە بەر گوللەی سەربازانی نیکاراگوا و بەربۆوە و فڕۆکەوانەکەی، بەناوی «یووجین هاسنفووس» Eugene Hasnfus بە زیندوویی گیرا. ئەو بەڵگانەی لە کەلاکی فڕۆکەکەدا دۆزرانەوە، نیشانیان دەدا کە CIA لە عەمەلیاتی فڕۆکەکەدا بەشدار بووە. پاش وتارێک کە ڕۆژنامەی لوبنانیی «الشریعە» لەبارەی عەمەلیاتی «ئۆلیڤێر نۆڕت»ەوە بڵاوی کردەوە، ڕۆژنامە و گۆڤارە ئەمریکایییەکان ئیدی نەیاندەتوانی خۆ لە

ڕوونکردنـــەوەی داســـتانەکە ببـــوێرن. لـــە ئاکـــامی بڵاوبوونـــەوە و تەقینـــەوەی هەواڵەکـــەدا، پریزیـــدێنت «ڕەیگـــان» کـــە دەیزانـــی یـــان نەیـدەزانی لـە ئەنجومـەنی ئەمنیـەتی نیشـتمانیی کۆشـکی سـپیدا چ-دەگوزەرێ، دەستووری دا کۆمیسیۆنێک پێکبهێنرێ کە لە داستانەکە بکۆڵێتـەوە و ڕاپۆرت بداتـەوە. کەسێک کـە پریزیـدێنت «ڕەیگـان» بـۆ سـەرۆکایەتیی ئـەو کۆمیسـیۆنەی هـەڵبژارد، سـەناتۆر «جـان تـاوەر» john Tower بوو. سەرنجڕاکێش ئەوە بوو کە «مەک فارلین» کە ساڵی ١٩٨٠ ڕۆڵێکی گرنگی لە وتووێژ بۆ ئازادیی بارمتـە ئـەمریکاییـەکان بەرامبـەر بـە دانـی کەرەسـەی شـەڕ بـە ئێرانـدا یـاری کردبـوو، لـە هاوکارانی نزیکی «جـان تـاوەر» بـوو. خـەڵکی ئـەمریکا ئاگایـان لـەوە نـەبوو. «جـان تـاوەر» کە ببووە سـەرۆکی کۆمیسـیۆنی لێکۆڵینـەوەی بابـەتی فرۆشـتنی کەرەسـەی شـەڕ بـە ئێـران، زۆر بـاش ئاگـاداری بابەتەکە بوو.

کۆمیسیۆنی لێکۆڵینەوە، تەنیا ڕووداوەکانی ساڵانی ١٩٨٤ و ١٩٨٦ی دایە بەر سەرنج و لێکۆڵینەوەکانی «تاوەر» جگە لـە پەردەپۆشکردنی عەمـــەلیاتی ســـەوداگەرانی کەرەســـەی شـــەڕ بەرهـــەمێکیان نـــەبوو. «تاوەر» ڕایگەیاند کە هێندێک لەو کەسانەی لە ئەنجومەنی ئەمنیـەتی نیشـتمانیدا کاریـان کردوە و پێیـان خـۆش بـووە بارمتـەکان لـە لوبنـان ئازاد بکرێن، هەوڵیان داوە، کەرەسـەی شـەڕ بـە ئێران بفرۆشـن و بـۆ جێبـــەجێکردنی ئـــەو ئامانجـــە، ٩٧ مووشـــەکی TOW و ژمارەیـــەک مووشـــەکی HAWKیـــان بـــەو وڵاتـــە فرۆشـــت و کـــارێکی دیکـــە نـــەکرا. ئاشکرایە کە «تاوەر» بـەچاکی ئاگاداری عەمـەلیاتی فرۆشتنی چەک-وچۆڵە بـە ئێران بووە، بـەڵام کۆمیسیۆنی «تـاوەر» هـیچ ئامـاژەیـەکی پـێنـەکرد، جـۆرج بـووش، دواتـر بـەهـۆی خزمـەتێک کـە «تـاوەر» لـە پەردەپۆشـکردنی بابەتەکـەدا ئـەنجامی دابـوو، ئـەوی کـردە کاندیـدای وەزارەتی بەرگری، بەڵام کۆنگرەی ئـەمریکا کاندیـدابوونی ئـەوی ڕەت کردەوە.

سروشتییه كه دیموكراتەكان لە كارەكانی كۆمیسیۆنی «تاوەر» ناڕازی بوون و پێیان لەسەر ئەوە دادەگرت كە كۆنگرە بۆخۆی لە بابەتەكە بكۆڵێتەوە. فێوریەی ساڵی١٩٨٧، كاتێك «تاوەر» لە عەمەلیاتێكی چووكەڵەی فرۆشتنی كەلوپەلی شەڕ بە ئێرانی دەكۆڵیەوە، كۆمیتەی هاوبەشی ئیسرائیل -ئێران بە هاوكاریی «ڕابێرت گەیتس» گەورەترین سەودای فرۆشتنی كەرەسەی شەڕ بە ئێرانی ئەنجام دا. لەڕاستیدا لێكۆڵینەوە ڕەسمییەكان لەو بابەتە، گەورەترین سەرپۆشیان بۆ ئێمە دروست كرد، بەجۆرێك كە ئێمە دەگەڵ هەموو كارامەیی و كارزانیی خۆمان لەو جۆرە كاروبارەدا، نەماندەتوانی خەونیش بە نیعمەتێكی واوە ببینین.

لەبن گوێی خەڵكی ئەمریكا، ٤٠٠٠ دانە مووشەكی TOW لە پێگەی «مارانا»ی ویلایەتی ئاریزووناوە گوازرایەوە گواتمالا و لەوێوە برایە ئوستڕالیا و بەشێوەی كاتی لە یەكێك لە ناوچەكانی خۆرئاوای ئەو وڵاتەدا عەمبار كرا. بەڵام كارەكە بەوەندە كۆتایی نەهات. وەختێك كۆنگرەی ئەمریكا و هەموو دنیا سەرگەرمی گوێگرتن لە لێكۆڵینەوەی قانوونی لە مەسەلەی فرۆشتنی كەرەسەی شەڕ بە ئێران بوون، بێجگە لە مووشەكە TOWەكان ژمارەیەك ڕادار و كەلوپەلی ئەلەكترۆنیكی و مووشەكی HAWKی زەوی بە حەوای ئەمریكایی و ئەو كەلوپەلانەی خوارەوەش نێردرانە ئێران و كۆنگرە و خەڵكی ئەمریكاش لێیان بێخەبەر مان.

-لە ئیسرائیلەوە: ١٢٨ تانكی ئەمریكایی، ٢٠٠٠٠٠ ڕاكێتی كاتیووشای ساختی ئیسرائیل كە دەیانگوت لە لوبنان لە هێزەكان PLO بەتاڵان گیراون، گوللەی تۆپی ١٠٥ میلیمیتری، ڕاكێتی ٦١ میلیمیتری، ڕاكێتی ٥١ میلیمیتری، مووشەكی حەوا بە حەوا، چەكی ورد، دەیان میلیۆن تەقەمەنی (فیشەك و گوللە تۆپ و شتی لەو بابەتە).

-لە چین: مووشەکی دەریا بە دەریای کرمی ئاوریشم، زریپۆش، ئەو ترومبێلانە کە لە وشکی و لەنێو ئاودا کار دەکەن. هۆی ئەوە کە چین کۆمەگی ئێرانی دەکرد ئەوە بوو، کە عێراقییەکان لە تانکە سووکەکانی چین ڕازی نەبوون - لە پەکین قاو بوو کە سەددام حوسێن لە موعامەلەدا پیاوێکی متمانەپێکراو نیە.

-لە کۆریای باکوور و ڤێتنام: گوللەتۆپ، ڕاکێتی ڕێنوێنیوەرگر.

-لە سوێد: لوولەی تۆپخانەی ١٠٥ میلیمیتری.

-لە بێلژیک: مووشەکی حەوا بە حەوا.

ئیسڕائیل لە دروستکردنی بەدەڵی چەکوچۆڵی وڵاتانی دیکەدا زۆر وەستایە. بۆیە ئەم وڵاتە چەکوچۆڵەی وڵاتانی دیکەی لە کارخانەکانی تەل ئەبیبدا دروست دەکرد و ئیددیعای دەکرد کە لە هێزەکانی PLOی بە تاڵان گرتوون. دەڵاڵی موعامەلەی مووشەکەکانی کرمی ئاوریشمی دەریا بە دەریای چینی سەوداگەرێکی ئیسڕائیلی بە ناوی «ساموونیل ئایزەنبەرگ» Sammuel Eiseberg بوو کە هیچ خزمایەتیی دەگەڵ ئەو «ئایزەنبەرگ»ە نیە کە لە عەمەلیاتی تەڵەنانەوەی بەرمۆدادا گیرا.

ئایزەنبەرگ یەکێک لە دەوڵەمەندترین پیاوانی دنیایە و ئێستا بۆخۆی خەریکی کڕین و فرۆشتنی کەرەسەی شەڕە و دەفتەرەکەی لە 4, Weizmen Street, Tel Aviv، هەر لەو بەشەی شەقامێکە کە کۆمپانیی «جی یوو میلی تەک»ی لێیە. هۆی ئەوە کە «ئایزەنبەرگ» دەیتوانی چەکوچۆڵەی چینی بفرۆشێ، ئەوە بوو کە ئەو لە ساڵەکانی دەیەی پەنجادا ژنێکی هێنابوو کە خەڵکی کۆریای باشوور بوو و پێوەندیگەلێکی دەگەڵ «مائووتسە تۆنگ» و «چوێن لای» هەبوو. بەهۆی پێوەندییەکی بەهێز کە «ئایزەنبەرگ» دەگەڵ کاربەدەستانی چینی هەبوو، تەواوی ئەو ئیسڕائیلییانەی دەیانویست کڕین و فرۆشتنیان دەگەڵ چین هەبێ، دەبوو کارەکەیان لە ڕێگەی ئەوەوە ئەنجام بدەن. کاتێک یەکێک لە ئەندامانی کۆمیتەی هاوبەش داوای لە

«ئایزەنبەرگ» کرد کە ببێتە دەلالی کڕینی چەکوچۆڵەی چینی، ئەو دەسبەجێ ڕەزامەندیی دەربڕی و تەنانەت ڕێکی خست کە چەک-وچۆڵەکە لە ولاتێکی سێیەم کە ئوستڕالیا بوو، ڕابگیرێ. لێرەشدا، لە حاڵێکدا هێندێک لە کاربەدەستانی ئوستڕالیای خۆرئاوا و ئیشکەرانی ڕێکخراوی هەواڵگری ئاگایان لەو عەمەلیاتە هەبوو، خەڵکی ئاسایی ئوستڕالیا لە چەندوچۆنی ئەو کەینوبەینە بێخەبەر بوون.

ڕۆژانی سێیەم و چوارەمی ژوونیەی ١٩٨٧، ئەمن بەشداری دوو دیداری یەکجار نهێنی دەگەڵ وەزیری بەرگریی ئێران سەرهەنگ موحەممەدی جەلالی و «ڕابێرت گەیتس» بووم. سەرهەنگ جەلالی لەپێشدا چووبووە گواتمالا تا دانی دراوێک کە دەبوو بیدا بە «مەجیا» Mejia ڕێک بخا. چونکە زۆربەی ئەو ئامرازانەی لە ویلایەتی ئاریزووناى ئەمریکا بە فڕۆکە دەچوونە دەر، لەوێ دەپارێزران.

دوایە سەرهەنگ جەلالی بە فڕۆکە چووە کانزاس و ڕۆیشتە هۆتێل «ئەمریکانا» کە «گەیتس» بەوپەڕی پارێزەوە لێی دابەزیبوو. ئەمن و «ئۆرا»ش چووینە هۆتێل «ویستا کۆنتینانتاڵ» کە بەرانبەری هۆتێل «ئەمریکانا» بوو. شەوی ٣ی ژوونیە، ئەمن چوومە ساڵۆنی هۆتێلەکەی خۆم و چاوم بە «گەیتس» و جەلالی کەوت. هەمیشە ژووری هۆتێلەکان دەزگای دەنگتۆمارکردنیان تێدا دادەنرێ. بەلام وتوویژ لە ساڵۆنی هۆتێلەکان، بەو مەرجە کەس وتوویژکەرەکان نەناسێ، بۆ گفتوگۆی تایبەتی ئەمن و بێمەترسییە.

سەرهەنگ جەلالی گوتی « دەگەڵ شوورەیی ئێران- کۆنتراش، ئەمن حەز دەکەم دڵنیا بم کە فرۆشتنی کەرەسەی شەڕ بە ولاتەکەم درێژەی دەبێ.»

ئەمن گوتم: «ئەوەندەی پێوەندیی بە ئیسرائیلەوە هەیە، درێژەی ئەم بەرنامەیە تووشی گیروگرفتێک نابێ.»

ئەوجار هەردووکمان سەیری «گەیتس»مان کرد. ئەویش زەردەیەکی هاتێ و گوتی: «ئەمنیش کێشەیەک لەم کارەدا نابینم.»

ئێمە لەبارەی گوازتنەوەی چەکوچۆڵەکە و عەمەلیاتێک کە «ئۆولیڤێر نۆرت»ی خستبووە زەحمەتەوە گفتوگۆمان کرد و بڕیار درا، بەیانیی ڕۆژی دواتر دیدارێکی دیکەمان هەبێ.

ئەم جارە، لە سالۆنی هۆتێلی «ئەمریکانا» دیدارم لەگەڵیان کرد. جارێکی دیکە، لەو ڕۆژەدا کە ڕێکەوتی ڕۆژی ئازادیی ئەمریکا بوو، سەرهەنگ جەلالی گوتی پێمخۆشە بەڵێنم بدرێتێ کە فرۆشتنی چەک بە ئێران درێژەی دەبێ و ئەو بەڵێنەی پێدرا.

سەرهەنگ جەلالی گوتی: «بەڵام بەڕێز گەیتس، ئەمن دەبێ لێت بپرسم، بۆچی ئەمریکا پشتیوانی لە دانی چەکی شیمیایی بە عێراق دەکا. ئێمە دەزانین کە سەددام حوسێن ئەو چەکانە لە شیلی بەدەست دێنێ. بۆچی ئێوە هەم کۆمەگی ئێمە دەکەن هەم هی عێراقییەکان؟»

«گەیتس» بابەتەکەی نە پشتڕاست کردەوە و نە حاشای لێکرد و لە کاتی ماڵئاواییدا هیچ بەڵێنێکی لەو بارەیەوە نەدا.

پاش دیداری «گەیتس» و جەلالی، ئەمن و «ئۆرا» لە شاری کانزاسەوە بە فڕۆکە چووینە «فینیکس». لەوێ ترومبێلێکمان بەکرێ گرت و بۆ تێپەڕکردنی دە ڕۆژ پشوو پێی چووینە کالیفۆرنیا. ئەو ماوەیە بۆ «ئۆرا» زۆر وەک پشوو نەدەچوو، چونکە ئەمن هەمیشە بە تەلەڤیزیۆنەوە چەسپابووم و تەماشای ئەو دیمەنە سەیرانەی تەلەڤیزیۆنم دەکرد کە لەبارەی لێکۆڵینەوەی ئێران – کۆنتراوە لە تەلەڤیزیۆن بڵاو دەکرانەوە و بۆ «ئۆرا» دژوار بوو من لە تەماشای تەلەڤیزیۆن دوور بخاتەوە. لە ئەمریکا هەرکەس بە تەلەڤیزیۆنی خۆیەوە چەسپابوو و تەماشای دیمەنەکانی لێکۆڵینەوەی ئێران-کۆنترای دەکرد، بەڵام بۆ من زۆر سەرنجڕاکێش بوو کە ببینم ئەو کاربەدەستانە چۆن یەک لەدوای یەک درۆی شاخدار دەکەن یان لەجێدا وا نیشان دەدەن کە ئاگایان لەو ڕووداوە نەبووە.

ئەم بابەتە هەموو ئەمریکای بەخۆیەوە خەریک کردبوو و وا دەهاتە بەر چاو کە بابەتەکە نە لەبیر دەچێتەوە و نە بە ئاکامێک دەگا. چەند

ساڵ دواتر، لە ساڵی ١٩٩١دا، ئەمن لەبارەی ڕووداوەکانی ئێران-کۆنتراوە لە ساڵی ١٩٨٧دا قسەم دەگەڵ «ئۆلیڤێر سپێنسێر» Oliver Spencer کرد کە لە لێکۆڵینەوەکاندا وەک سەرۆکی هەیئەتی ڕاوێژکارانی کۆنگرە هەڵبژێرابوو.

لێمپرسی: «ئەتۆ نەتدەزانی کە ئەوان درۆ دەکەن؟»

وەڵامی دایەوە: «بۆچی، ئێمە دەمانزانی ئەوان هەوڵ دەدەن، ڕاستییەکە بشارنەوە، بەڵام لەوکاتەدا نوێنەرانی دیموکڕاتی کۆنگرە و سەنا زۆر لاواز بوون و هەروەها بۆ پاراستنی قازانجی نیشتمانییش ئێمە نەماندەویست ئابڕووچوونێک کە دەبێتە مایەی ڕووخانی سەرکۆمار، لەقاو بدەین. ئێمە نەماندەویست وشەی (تۆمەت) بۆ سەرکۆمار بێتە ئاراوە.»

«درۆکردن دەگەڵ خەڵک بە قازانجی نیشتمانە؟»

«نا، بەڵام دیموکڕاتەکان، توانای پێویستیان بۆ بەجێگەیاندنی ئەو ئەرکانەی خرابوونە سەر شانیان، نەبوو. هەمووانیان دەیانزانی کە شایەتەکان یان درۆیان دەکرد، یان تەنیا بەشێکی ڕاستییەکەیان دەردەخست. هەموو کەس دەیزانی کە ڕاستییەکە دەشاردرێتەوە، بەڵام تەنیا ژمارەیەکی کەم لە ئەسڵی ڕاستییەکە ئاگادار بوون. ویلیام کەیسی، نەخۆش و لە سەرەمەرگدا بوو. دەستمان بە گەیتس و بووش ڕانەدەگەیشت. ئەگەر ویستبامان بیانکێشینە بەر لێکۆڵینەوە، دەبوو تەواوەتی ڕێکخراوی حکوومەت بێنینە پێش مێزی دادپرسی، ئاشکراشە کە ئێمە ئامادەیی ئەو کارەمان نەبوو، و دێموکڕاتەکان لە ڕێبەرییەکی بەتوانا بێبەش بوون. تەنیا کار کە ئێمە دوای ئەوە توانیمان بیکەین، ئەوە بوو کە پاش مردنی کەیسی، کاندیدابوونی «گەیتس» بۆ سەرۆکایەتیی CIAمان تووشی شکست کرد.»

بە باوەڕی من هۆی ئەوە کە مەک فارلین کاتێک لە نەخۆشخانە کەوتبوو بە خواردنی حەبی زیاد لە پێویست هەوڵی دا خۆ بکوژێ، ئەوە بوو کە زۆر دەترسا نەخشی جاسووسییەکەی بۆ ئیسرائیل

دەربکەوێ. بەڵام هیچکەس نەیتوانی هۆی هەوڵدانی «مەک فارلین» کە لە شوورەیی‌یەکی نیشتمانی بەولاوەتر دەچوو، تێبگا. بە هەرحاڵ، بەرهەمی لێکۆڵینەوەکانی کۆنگرە ئەوە بوو کە «لارێنس واڵش» Lawrence Walsh دادپرسێکی بێلایەن کە بۆ بەدواداچوونی داستانی ئێران- کۆنترا هەڵبژێردرابوو، بڕیاری دا «نۆرت»، «مەک فارلین» و « پۆیندەکستەر» بکێشێتە بەر لێپرسینەوەی قانوونی. ئەمانە مەحکوومی درۆکردن دەگەڵ کۆنگرە بوون، بەڵام هیچ کامێکیان نەکەوتنە زیندان. دواتر حوکمی «نۆرت» هەڵوەشایەوە و بۆیە بۆ ئێستا، ڕاستییەکە نێژرا. ئەمریکا ژیانی خۆی لەبن «درۆیەکی گەورە»دا درێژە پێدا.

ئووتی ١٩٨٧، مانگێک پاش ئەوەی ئەمن و «ئۆرا» لە سەفەری ئەمریکا گەڕاینەوە ئۆرشەلیم، ڕۆژێک گوێم لەو پەیامانە دەگرت کە لەماوەی سەفەرەکەماندا لەسەر دەزگای پەیامگرەکە تۆمار کرابوون. لەو ساتەدا «ئۆرا» لەماڵ نەبوو. ئەمن لەنێو پەیامەکاندا گوێم لە دەنگی سەرۆکی CIA لە تەل ئەبیب بوو کە لە «ئۆرا»ی دەپرسی، بۆچی وتووێژەکەی لەکاتی خۆیدا نەکردوە. ئەمن لە بیستنی دەنگی ئەو کابرایە و پەیامەکەی سەرم سوڕ ما.

هەرچەند ئیسرائیل و ئەمریکا دوو وڵاتی هاوپەیمان بوون، بەڵام جاسووسیی ئەوان لە دژی یەکتر شتێکی نائاسایی نەبوو. بەتایبەتی لە کاتێکی وادا کە بۆ هەردووکمان ناسک بوو. داخوا «ئۆرا» چ-بەرنامەیەکی لەبن سەردا بوو؟

ئەمن لەوبارەیەوە هیچم بە «ئۆرا» نەگوت، بەڵام بڕیارم دا ئەسڵی بابەتەکە بدۆزمەوە. بۆیە ئەوم خستە ژێر چاوەدێری و دەرکەوت کە ئەو هێندێ دیدار و چاوپێکەوتنی دەگەڵ کەسانێکی جۆراوجۆر کە سەربە لقی CIA لە تەل ئەبیب بوون، هەیە.

SHABAK، ڕێکخراوی ئەمنیەتی نیشتمانیی ئیسرائیل دەستووری بە «ئۆرا» دا، بۆ لێپرسینەوە بچێتە ئاپارتمان (شقە)یەک لە تەل ئەبیب.

لەوێ پێی لێنا کە هێندێ پێوەندیی دۆستانەی دەگەڵ ئەمریکایی‌یەکان هەبووە. ئەوان لەبارەی من و چۆنیەتیی ئاگاداریی من لەبارەی ئێران-کۆنتراوە، پێوەندیی من بەو بابەتەوە و ئەوە کە چکەسێک مەسەلەی ئێران- کۆنترای داوەتە ڕۆژنامەکان، گفتوگۆیان لەگەڵ کرد، بەڵام، ئەو ڕوونی کردەوە کە لەو بابەتەوە پووڵێکی لە ئەمریکایی-یەکان وەرنەگرتوە.

دواتر کاتێک ئەمن دەگەڵ «ئۆرا» بەرەوڕوو بووم، هەموو ئەو بابەتانەی بۆمن دووپاتە کردەوە و پێی داگرت کە لەبارەی منەوە شتێکی زۆری بە ئەمریکایی‌یەکان نەگوتوە. ئەم بابەتە تووشی سەرسوڕمانی کردم. نەمدەزانی بابەتەکە چۆن پاساو بدەم. بەڵام، بۆم ساغ بۆوە کە ئیدی ناتوانم متمانە بە «ئۆرا» و ئەمریکایی‌یەکان بکەم. داخوا ئەوان چبەرنامەیەکیان لەبن سەردا بوو؟ کاتێک بابەتەکە لە کۆمیتەی هاوبەش باس کرا، ئێمە گەیشتینە ئەو ئاکامە کە تاقە ڕێگا بۆ نفووزی ئەمریکایی‌یەکان لە کۆمیتەدا، ئەوە بووە کە لە کەسێکی وەک «ئۆرا» بەهرە وەربگرن. چونکە «ئۆرا» لە کەسێکی کاریگەر لە مەسەلەکەدا، نزیک بوو و هەربۆیە، ئەمریکایی‌یەکان دەیانەویست بەهۆی ئەوەوە نەخشی ئێمە لە مەسەلەی ئێران- کۆنترادا بدۆزنەوە و هەروەها ئاگاداری لەسەر نەخشەی ئێمە لەو بارەیەوە بەدەست بێنن.

وەختێک پێوەندیی «ئۆرا» دەگەڵ ئەمریکایی‌یەکان ئاشکرا بوو، هەموو پێوەندییەکانی دەگەڵ «مۆساد» بچڕان. لەوەش زیاتر، SHABAK دەیەویست هەموو خەتاکە دەستۆی «ئۆرا» پەستێوێ. ئیسرائیل دەرفەتێکی بۆ ڕەخسابوو تا بە خەڵکی ئیسرائیل نیشان بدا، ئەمریکایی‌یەکان چۆن دژی ئیسرائیل جاسووسی دەکەن و ئەو بابەتەش بخاتە ژێر بەدواداچوونی قانوونی. ئاشکرایە کە ئیسرائیلییەکان بۆ ئەو کارە بەڵگەی ڕەوا و بەجێیان هەبوو. «ئۆرا» پێوەندیی دەگەڵ کارمەندە هەواڵگرییەکانی وڵاتێکی دیکە گرتبوو و

هەرچەند ئەمریکا هاوپێوەندییەکی ڕەسمیی دەگەڵ ئیسرائیل هەبوو، بەڵام بەهەر حاڵ نهێنییە هەواڵگرییەکان دەبوو بە نهێنی بمێننەوە.

دەگەڵ ئەوەی کاری «ئۆرا» کاربەدەستانی هەواڵگریی ئیسرائیلی تووڕە کردبوو، ئەمن نەمدەویست ئەو تووشی خەفەت و خەمۆکی بێ. ڕاستە ئیدی نەمدەتوانی متمانەی پێبکەم، بەڵام هێشتا خۆشم دەویست و نەمدەویست لەباری دەروونییەوە زیانی پێبگا. جگە لەوەش، ئەو زۆر شتی لەبارەی نهێنییە هەواڵگرییەکانی ئیسرائیلەوە دەزانی.

سەرەنجام ئەمن ڕێگەچارەیەکم بۆ ئەو کارە دۆزیەوە. بەو پێیە کە بە سەرۆکەکانم گوت کە ئەمن بۆخۆم لەمەودوا، چاوەدێری پێوەندیم دەگەڵ «ئۆرا» دەبم و ئەو ئیدی مەترسییەکی بۆ ئەمنیەتی ئیسرائیل نابێ. بۆ سەلماندنی باوەڕەکەشم، بە سەرۆکەکانم گوت کە ئەو دووگیانە و ئێمە بەنیازین پێکەوە زەماوەند بکەین. چەند حەوتوو دواتر، ئێمە توانیمان نیشان بدەین کە بەڕاستی دووگیانە.

«ئۆرا» ئاواتی بوو دەگەڵ من زەماوەند بکا و ئێستا کە دووگیان ببوو، پێم وابوو وەختی ئەوە هاتوە کە خۆم بخەمە ژێر ئەو بەرپرسیارییە. لەوحاڵەدا، بێگومان ئەو دەگەڵ حکوومەت تووشی کێشە نەدەبوو. ئێمە ڕۆژی ١٣ی مارسمان بۆ زەماوەندەکەمان دیاری کرد.

لە حاڵێکدا بەرنامەکەی من «ئۆرا»ی لەو کێشەیەی تووشی ببوو، ڕزگار کرد، بەڵام بۆخۆم هەتا ملان لە پەرێشانیدا نوقم بووم. حیزبی کرێکار کە لە حکوومەتی هاوپەیمانیی ئیسرائیلدا، دەسەڵاتی بەدەستەوە بوو، بڕیاری دا زەبرێک لەو کەسانە بدا کە هۆکاری سەرەکیی فرۆشتنی کەرەسەی شەڕ بە ئێران بوون. لە سێپتامبری ساڵی ١٩٨٧دا ئەمن و سێ کەسی دیکە لە ئەندامانی کۆمیتەی هاوبەشی ڕێکخراوی هەواڵگریی هێزە بەرگریکارەکانی ئیسرائیل و

«مۆساد» بووینە ئامانجی بەرنامەکەی حیزبی کرێکار و پێمان ڕاگەیەندرا کە: «ئێوە ئیدی کاریکتان لە کۆمیتەی هاوبەشدا نیە.»

ئێمە چاوەڕوانی ڕووداوێکی وا بووین. زۆر نیشانە هەبوون کە حیزبی کرێکار لە سەری ئێمە دەگەڕێ. هەر ئەوکاتە کە ئەمن چووبوومە قووڵایی فرۆشتنی کەرەسەی شەڕ بە ئێرانەوە، بۆم دەرکەوت بەو گوشارەی دەخرێتە سەر «شامیر» ئەمن یەک لەو کەسانەم کە پێش خەڵکی دیکە لە کار دوور دەخرێنەوە.

«ناچووم ئەدموونی» سەرۆکی «مۆساد» و من بڕیارمان دابوو، پێش ئەوەی ببینە قوربانیی ڕووداوەکان، هێندێ لە «سەرمایەی ڕەش» بۆخۆمان پاشقول بدەین. ئێمە بە باشترین شێوەی گونجاو خزمەتمان بە حکوومەتی خۆمان کردبوو و دەوڵەتی ئیسرائیلمان لە دەورانی سێ سەرۆکوەزیردا بەهێز کردبوو، بەڵام هەر لەو حاڵەدا باوەڕمان وا بوو کە دەبێ بەرامبەر بە ڕووداوەکانی دواڕۆژ دەستەبەرمان هەبێ. ئێمە نەماندەزانی کاتێک ئەمریکا و ئیسرائیل حاشا لەو کارە دەکەن کە ئێمە چەندین ساڵ ئەنجاممان داوە، دواڕۆژی کاری ئێمە چدەبێ. ئاشکرایە کە ئەو کارە هەمیشە مەترسیی گیران و تەنانەت مەرگیشی بۆ ئێمە تێدا بوو و چارەنووسی ژەنڕاڵ «بارام» و «ئایزەنبەرگ» و «سیرووسی هاشمی»مان هەمیشە لە مێشکدا بوو و نەماندەتوانی بەرامبەر بەوەی بەسەر ئەو کەسانە هاتبوو بێموبالات بین. «سەرمایەی ڕەش» بە شێوەی ناڕەوا و بە پێچەوانەی هەموو بەڵێننامە نێونەتەوەیی‌یەکان وەسەر یەک نرابوو و هەروەخت بابەتەکەی لە دادگایەکی ئەمریکاییدا هاتبایە گۆڕێ، نە ئیسرائیلییەکان و نە ئەمریکایی‌یەکان، هیچیان خۆیان لێ بە ساحەب نەدەکرد. بۆیە ئێمە ڕێک کەوتین بڕێک لەو دراوە بۆ دواڕۆژی خۆمان هەڵبگرین و باسوخواسێک کە لەوانە بوو لێی دروست بێ، بە دواڕۆژ بسپێرین. هەربۆیە ئێمە بڕێکی زۆر لەو دراوەمان گوازتەوە بۆ ئەمریکای باشوور.

ئەمن نازانم «شامیر» لەبارەی کاری ئێمەوە چۆنی بیر کردۆتەوە. بەڵام ئەو دەبێ تێگەیشتبێ کە بە پێچەوانەی ئەوەی بۆ من ڕووی دا، ئەمن وردەکاریی پێوەندیدار بە کارەکەمم، هەر نەبێ لەو کاتەدا لەقاو نەدەدا.

ئێستا ئیدی باری بەرپرسایەتییەکی قورس لەسەر شانی من هەڵگیرابوو. ئەمن بە فڕۆکە چوومە لەندەن تا چەند ڕۆژێک لەوێ بەخۆشی ڕابوێرم. هەستم بە ئازادی و بارسووکی دەکرد- تەنانەت لەوەش زیاتر. هەست بە لەدایکبوونێکی نوێ، شادمانی، سەرمەستی و بەهێزی. هەر خوا دەیزانی دوارۆژ چڕووداوگەلێکی پێبوو. بیرم کردەوە باشترین کار ئەوەیە دەگەڵ شەپۆلی ڕووداوەکان بچمە پێش. ئەمە شێوەکارێک بوو کە هەر لەسەرەتای دەستبەکاربوونەوە گرتبوومە پێش و پەیڕەویم لێکردبوو.

کاتێک لەنەکاو منیان لە کۆمیتەی هاوبەش وەلا نا، پووڵێکی زۆرم هەبوو، بەڵام بێکار بووم و ئەمنیش مرۆڤێکم کە بە بێکاری نائارام دەبم. نەخشەی من ئەوە بوو کە بچمە ئەمریکا و لەوێ کارێک پەیدا بکەم. پاشان دەگەڵ «ئۆرا» و ئەو منداڵەمان کە بەڕێوە بوو، لەوێ نیشتەجێ بین و ژیانێکی تازە دەست پێبکەم.

لە دوامانگەکانی ساڵی١٩٨٧دا چەند جار چوومە ئەمریکا و ئینگلستان بۆ ئەوەی ڕێگایەک بۆ ژیانی داهاتووم بدۆزمەوە. بەڵام لە نۆڤامبری ئەو ساڵەدا، کاتێک لە سەفەرێکی خۆم گەڕامەوە ئیسرائیل، لەوپەڕی نائومێدیدا پۆستێکی زۆر بەرز -یانی ڕاوێژکاری تایبەتی هەواڵگریی دەفتەری سەرۆکوەزیری ئیسرائیلم پێ پێشنیار کرا. ئاشکرایە کە لەبەر چەند هۆیەک ئەو کارە بە من پێشنیار کرابوو. یەکەم ئەوە کە بە لەقاودانی داستانی ئێران- کۆنترا، ئەمن زەبرێکی گەورەم لە «شیمۆن پرێز» خەنیمی لەمێژینەی «شامیر» دابوو و جۆرێکی دیکەی بڵێین، خزمەتێکی گەورەم بەو کردبوو. دووەمیش ئەوە کە ئەمن هێشتا یەکێک لە پاسەوانانی «سەرمایەی ڕەش» بووم و «شامیر» دەیەویست دەستی بگاتە ئەو دراوە.

ئەمن لە وەڵامی نوێنەری «شامیر» «ئاڤی پازنەر»دا کە ڕاوێژکاری نارەسمیی نیشتمانیی ئەو بوو، گوتم زۆر بەدڵەوە ئەو کارە قبووڵ دەکەم، بەڵام حەز ناکەم تووشی مەئمووریەتی وا بم کە زیان بە بەرنامەی زەماوەندم دەگەڵ «ئۆرا» بگەیەنێ. ئەوان، پێیان خۆش بوو ئەمن چەندی بکرێ زووتر لەو پۆستەدا دەستبەکار بم و کەمێک دوای ئەوەی چوومە نێوکارەکە، منیان بۆ دیدار لەگەڵ «شامیر» بانگهێشتن کرد. «شامیر» پێیگوتم کە دوو کەس لە زانا ئیسرائیلییەکان من لە مەسەلەکە ئاگادار دەکەن، دوایە دەبێ بۆ ئاگاداربوون لە زەمینەی کارەکە چەند دۆسیەی زۆر نهێنی بخوێنمەوە. ئەودەم دەبێ بچمە مەئمووریەتێکی نهێنی کە بۆ بەرنامەی ئەتۆمیی ئیسرائیل یەکجار پێویستە.

لەو وەختەدا ئەمن هیچ شتێکم لەسەر بەرنامەی ئەتۆمیی ئیسرائیل نەدەزانی. تەنیا ئەزموونی من لەو بارەیەوە مەسەلەی «ڤانوونوو» Vanunu لە ساڵی ١٩٨٦دا بوو.

«مۆردەخای ڤانوونوو» Mordecai Vanunu شۆفێرێکی پێشووی تاکسی بوو کە سەر بە کۆمەڵەکەسێکی کلیسایی بوو کە لە King,s Crossی شاری سیدنی لە ناوچەی چرای سووری ئەم شارە بوو. هەمیشە ئیددیعای دەکرد کە کارناسێکی تەکنیکی ئەتۆمیی ئیسرائیلە و لە پێگەیەکی ئەتۆمیی ئیسرائیل لە نیزیک «دیمۆنا» Dimona کاری کردوە.

کاتێک کارمەندانی هەواڵگریی ئیسرائیل لە ئیددیعای «ڤانوونوو» ئاگادار بوون، کەوتنە لێکۆڵینەوەی رابردووی ئەو و دەرکەوت کە ئیددیعایەکەی راستە. «ڤانوونوو» لە مەراکیش (مەغریب) لە بنەماڵەیەکی جوولەکەی دەستەڕاستیدا لەدایک ببوو، بنەماڵەکەی لە ساڵەکانی دەیەی ١٩٦٠دا کۆچیان کردبووە ئیسرائیل و ئەو پێش ئەوەی بچێتە سەربازی، لە «بیرشەبا» Beersheba پەروەردە کرابوو. لە سەردەمی سەربازیدا «ڤانوونوو» گوازرابۆوە پێگەی «دیمۆنا» و لەوێ لەبارەی چەکی ئەتۆمییەوە دەورەی دیتبوو، دوای تەواوبوونی خزمەتی سەربازی «ڤانوونوو» لە زانستگەی «نەگەڤ» Negev لە «بیرشەبا» دەرسی فەلسەفەی خوێندبوو و هاوپێوەندیی فکریی دەگەڵ فەلەستینییەکان پەیدا کردبوو. ئەو لە جوولەکەکانی ئەفریقای باکوور کە کۆچیان کردبووە ئیسرائیل، نیزیک ببۆوە و بەوانی گوتبوو کە ئەو لەوە تۆقیوە کە ئیسرائیل ئەو هەموو توانا ئەتۆمییەی هەیە. لەڕاستیدا ئەو بەهۆی کارەکەیەوە بەچاکی پەی بە توانای ئەتۆمیی ئیسرائیل بردبوو.

«ڤانوونوو» وردەوردە لە ژیان لە ئیسرائیل ماندوو بوو، ئاپارتمانەکەی لە «بیرشەبا» فرۆشت، کار و زانستگەکەی بەجێ هێشت و بە کۆڵەپشتییەکەوە چووە وڵاتانی تایلەند و نیپال و لەوێ

بوو بە بوودایی. هەرچەند ئەو لە فرۆشتنی ئاپارتمانەکەی برێکی زۆر پووڵی نەغدی لە کۆڵەپشتییەکەیدا هەبوو، بەوحاڵە لەو وڵاتانە، بە خۆڕایی لە پەرستگەی بوودایی‌یەکان دەژیا. بێجگە لە دراوی نەغد، ئەو هێندێ شتی گرانقیمەتی دیکەی لە کۆڵەپشتییەکەیدا هەبوون کە قیمەتەکەیان لە دراوە نەغدەکەی زیاتر بوو. ئەو شتانە بریتی بوون لەو وێنە و فیلمانە کە لە دامودەزگا ئەتۆمییەکانی ئیسرائیلی گرتبوون و دەگەڵ خۆی لە ئیسرائیلی بردبوونە دەر.

کاتێک کارمەندە هەواڵگرییەکانی ئیسرائیل لە وەزعی «ڤانوونوو»یان کۆڵیەوە بۆیان دەرکەوت کە ئەو وەختەی لە نیپال بووە پێوەندیی دەگەڵ کاربەدەستانی نوێنەرایەتیی سۆڤیەت لە کاتماندۆ گرتوە و بەناوی سۆسیالیزم و کۆمۆنیزم و ئاشتیی جیهانی وێنەکانی دامودەزگای ئەتۆمیی ئیسرائیلی داونێ. لەڕاستیدا ئەو نوسخە ئەسڵییەکانی ئەو وێنانەی لە پەرستگەی کاتماندۆ بەجێ هێشت و بە نوسخەی دووەمی وانەوە لە کاتماندۆوە چووە مۆسکۆ. لە مۆسکۆ «ڤانوونوو» پێوەندیی دەگەڵ کارمەندانی KGB گرت و وێنەکانی دانێ. پێش ئەوەی ئەو لە کاتماندۆوە بفڕێ بۆ مۆسکۆ، کاربەدەستانی نوێنەرایەتیی سیاسیی سۆڤیەت لە کاتماندۆ هێندێ بەڵێنی بێ‌بنەمایان پێ دابوون، بەڵام تەنیا شت کە ئەو توانی لە مۆسکۆ لە سۆڤیەتەکانی بەدەست بێنێ، بلیتێکی خۆڕایی فڕۆکە بۆ گەڕانەوەی کاتماندۆ بوو.

پاش ئەوەی«ڤانوونوو» سەفەری مۆسکۆی کرد و پێوەندیی دەگەڵ سۆڤیەتەکان گرت، متمانەی پێیان نەما و لەحاڵێکدا خەمۆک و پەرێشان ببوو،و بیری دەکردەوە کە لەو مەسەلەیەدا بە تەڵەوە بووە، کۆڵەپشتییەکەی هەڵگرت و بە مەبەستی ئوستڕالیا کە ئەو کاتەی لە ئیسرائیل بوو، ڤیزاکەی وەرگرتبوو، چووە ئەو وڵاتە. ئەو ئەوەندە لە ئوستڕالیا مایەوە تا ڤیزایەکەی کۆتایی هات و لەحاڵێکدا ئیدی پووڵەکەشی خەریک بوو تەواو بێ، بڕیاری دا بە شێوەی ناقانوونی

لە ئوسـتورالیا وەمێنـێ. ئـەو جێیەکی بۆ ژیـان لـە King,s Cross پەیـدا کرد و لەوێ دەگەڵ کەسانی سەربە کلیسا ئاشنا بوو.

«ڤـانوونوو» لـەو کلیسـایە دەسـتی کـرد بـە وتـاردان لـەبارەی زیانـەکانی هێـزی ئـەتۆمی و کۆمـەڵێک لـە خـەڵکی کلیسـا بـە ویسـت و ئۆگریی خۆیان بوونە کڕیاری قسەکانی. ئەو تەنانـەت هێنـدێک وێنـەی زۆر نهێنیـی دامودەزگـای ئـەتۆمیی ئیسـڕائیلیشـی لـەنێو گوێگرەکانیـدا بـڵاو کردنـەوە. لەبـەر ئـەوەی کەسـانی سـەربە کلیسـایەکە بـە گـەرمی قسـە و بۆچوونـەکانی ئـەویان قبـووڵ کـرد، ئـەو ئـایینی خـۆی لـە بـوودایییـەوە گـۆڕی بـۆ عیسـایی و کارێکیشـی وەک شـۆفیری نیوەوەخت پەیدا کرد.

لـەنێو ئـەو کەسـانەدا کـە هـاتوچۆی کلیسـایەکەیان دەکرد، کەسـێکی کۆلۆمبیایی هەبوو، بەناوی «ئۆسـکار گـۆرێڕۆ» Oscar Guerrero. ئـەم کەسە ڕۆژنامەنووسێکی ئازاد بوو کە لە ژیانی خۆیدا تووشـی هێنـدێ کێشە هاتبوو و بۆیە ڕووی کردبووە کاری ڕەنگکردنی مـاڵان و لـە کۆبوونەوەکانی کلیسادا بەشـدار دەبـوو. کاتێـک «گـۆرێڕۆ» چـاوی بـە وێنــەکان کــەوت، بــە «ڤــانوونوو»ی گــوت، دوو لــەو وێنانــە بــۆ بڵاوکردنەوە دەبن و پووڵێکیشت لە بەرامبەریاندا دەست دەکەوێ.

«گـۆرێڕۆ» سـەرەتا پێوەنـدیی بـە ڕۆژنامـەی Sydney Morningەوە گـرت، کـەچی کاربەدەسـتانی ڕۆژنامەکـە بـە کەسـێکی گومـانلێکراوی تێگەیشتن و وێنەکانیان لێوەرنەگرت. بـەڵام، پێوەنـدیی «گـۆرێڕۆ» بـە ڕۆژنامەکـەوە بـووە هـۆی ئـەوە کـە باسـەکە بگاتـەوە سرویسـە هەواڵگرییەکانی نێوخۆ، ڕێکخراوی هەواڵگری و ئەمنیەتی ئوسـتڕالیا و دواتـر سرویسـە دەرەکییـەکانی ڕێکخـراوی هـەواڵگری و ئەمنیـەتی ئوستڕالیا و ئەوانیش ڕاپۆرتی بابەتەکەیان دایـە ئیسـڕائیل. بـەمجۆرە، تەل ئەبیب تێگەیشت تووشی کێشەیەک بووە کە ڕێگاچارەیـەکی سـادە و ئاسانی بۆ نادۆزرێتەوە.

«گۆریڕۆ» بێخەبەر لەوەی ڕۆژنامەی The Ageی شاری ملبۆڕنیش بەشێک لە گرووپی Sydny Morning Heraldە، چووە دەفتەری ئەو ڕۆژنامەیە، بەڵام ئەوانیش قبووڵیان نەکرد وێنەکان بڵاو بکەنەوە. دوای ئەوە «گۆریڕۆ» بڕیاری دا پێوەندی بە ڕۆژنامەکانی لەندەنەوە بکا. بۆ ئەو مەبەستە هەرچی هەیبوو دەگەڵ کەمێک قەرز خستیە سەر یەک و بلیتێکی لەندەنی پێکڕی. بۆ نەگبەتی، یەکێک لەو ڕۆژنامانە کە «گۆریڕۆ» بۆ بڵاوکردنەوەی وێنەکان چووە سەردانیان، ڕۆژنامەی Daily Miror بوو کە هاوکاری من «نیکۆلا دیڤیس» سەرنووسەری دەرەوەی ئەو ڕۆژنامەیە و ئەندامی ئەمەگداری ڕێکخراوی هەواڵگریی ئیسرائیل بوو.

«دیڤیس» بە بیانووی ئەوە کە وێنەکان دەبێ لەلایەن کەسێکی پسپۆڕەوە لێکۆڵینەوەیان لەسەر بکرێ، «گۆریڕۆ»ی دەسخەڕۆ کرد. پاشان ئەو تەلەفونی بۆ من کرد کە لە ئیسرائیل بووم و ئەمنیش بابەتەکەم دەگەڵ سەرۆکەکانم باس کرد. سەرۆکوەزیر «پرێز» لە مەسەلەکە ئاگادار کرا و ئەویش دەستووری دا، کە بەهەر نرخێک بووە دەبێ عەمەلیاتی «ڤانوونوو» ڕابگیرێ و خائین بهێنرێتەوە ئیسرائیل. هەرچەند کاربەدەستەکانی ڕێکخراوی هەواڵگریی ئیسرائیل گوتیان بابەتەکە هێندە گرنگ نیە و ئەو باسە سەرەنجام لەبیر دەچێتەوە، بەڵام «پرێز» لەو داستانە زۆر تووڕە بوو و گوتی ئەو دەبێ بهێنرێتەوە ئیسرائیل و دەرسی پێویستی پێبدرێ.

هەر ئەو ڕۆژە ئێوارەکەی، ئەمن فڕیم بۆ لەندەن. ڕۆژی دواتر، لەحاڵێکدا خۆم وەک ڕۆژنامەنووسێک ناساند کە کارناسی کاروباری ئەتۆمی و سەربازییە چاوم بە «گۆریڕۆ» و «دیڤیس» کەوت. ئەمن پێم داگرت کە پێش ئەوەی ڕۆژنامەکە بڕیار لەسەر کڕین یان نەکڕینی وێنەکان بدا، چەند دانەیەکیان بدرێنە دەست ئێمە. «گۆریڕۆ» سێ دانە لە وێنەکانی دان بە من و گوتی: «باشیان سەرنج بدە، ئەگەر بەکارت هاتن هەموویانت دەدەمێ.»

هەر ئەو شەوە وێنەکان نێردرانە ئیسرائیل. کاربەدەستانی ئیسرائیل وەلامیان دایەوە، کە وێنەکان ڕاستین و ئەمن دەبێ هەوڵ بدەم «ڤانوونوو» و دۆستەکەی وەک کەسانێکی باوەڕپێنەکراو بناسێنم. لەو جەرگەیەدا «ڕابێرت ماکسوێڵ» خاوەن ئیمتیازی ڕۆژنامەی Daily Mirror فەرمانی بە «نیکۆلا دیڤیس» کرد وتارێک بۆ ڕۆژنامە ئامادە بکا و تێیدا باس بکا کە ئەو داستانە درۆ و فێلە و ئاماژە بەوەش بکا کە ڕۆژنامەی Daily Mirror لە بابەتەکە و کەسایەتیی فرۆشیارانی وێنەکانی کۆڵیوەتەوە و گەیوەتە ئەو ئاکامە کە ئەسڵی بابەتەکە درۆیەکی هەڵبەستراوە. پاشان بابەتی وتارەکە بە ئاماژە بەوەی «ڤانوونوو» بابایەکی ماڵبەکوڵە، قایمتر بکا و دەگەڵ وێنەکان لە ڕۆژنامەدا بلاو بکرێتەوە.

لەو سەروبەندەدا ئێمە بۆمان دەرکەوت کە «گۆرێڕۆ» سەفەرێکی دیکەی لەندەنی کردوە و لە بارەی وێنەکانەوە موعامەلەیەکی دەگەڵ ڕۆژنامەی Sunday Times تەواو کردوە. بەو جۆرە کە قەرار دراوە ئەو ڕۆژنامەیە «ڤانوونوو»ی بەرێتە لەندەن، لەوێ گفتوگۆیەکی تەواوی لەبارەی مەسەلەکەوە دەگەڵ بکا و وردەکاریی داستانەکە بلاو بکاتەوە. هەروەها قەرار بووە دوای بلاوبوونەوەی بابەتەکە «ڤانوونوو» بڕی ۲۵۰۰۰۰ پۆند وەک پێشەکی لەبارەی کتێبێکەوە کە ناو دەنرێ توانای ئەتۆمیی ئیسرائیل وەربگرێ و دەگەڵ یەکێک لە کارمەندانی ڕۆژنامەکە دەست بکەن بە نووسینی ئەو کتێبە.

«گۆرێڕۆ»ش لەسەر ئەوە ڕێک کەوتبوو کە لەسەدا ۱۰ی ئەو پارەیەی دەدرێ بە «ڤانوونوو»، وەربگرێ. هۆی ئەوە کە پاش بەستنی ڕێککەوتنەکە دەگەڵ ڕۆژنامەی Sunday Times «گۆرێڕۆ» چووبووە لای ڕۆژنامەی Mirror Daily، ئەوە بوو کە پێی وابوو ڕۆژنامەی Sunday Times ئەوی لە بەڵێننامەکە دەرهاویشتوە.

«ڤانوونوو» فڕی بۆ لەندەن و لە هۆتێلی جۆراوجۆر جێی بۆ گیرا. لەو قۆناخەی بەسەرهاتەکەدا ئێمە تێگەیشتین کە هەرچەند

ڕۆژنامەی Sunday Times بەو زووانە ناتوانێ بابەتەکە بڵاو بکاتەوە، بەوحاڵە ڕاگرتنی ئەم ڕووداوە کارێکی ئاسان نابێ. ئەمن پێوەندیم دەگەڵ سەرۆکەکانم گرت و سەرۆکوەزیر «پریز» بۆخۆی بڕیاری دا تەواوی دەسەلاتی «مۆساد» بەگژ «ڤانوونوو»دا بکا.

سەرۆکی لقی «مۆساد» لە لەندەن پێوەندیی دەگەڵ ڕێکخراوی هەواڵگریی MI-5ی بریتانیا گرت و ئاگاداری کردن کە ئیسرائیل لە خاکی بریتانیا تووشی کێشەیەکی ئەمنیەتی بووە. ڕێکخراوی هەواڵگریی بریتانیا دوای ئاگاداربوون لە مەسەلەکە ڕازی بوو کۆمەگیان بکا بۆ ئەوەی «مانوونوو» بخەنە ژێر چاوەدێری. بەلام وشیاری کردنەوە کە، کارێکی وا نەکەن ببێتە هۆی دروستبوونی ڕووداوێکی سیاسی یان دیپلۆماتی لە خاکی بریتانیادا. پاشان ئیشکەرانی ڕۆژنامەی Sunday Times کەوتنە ژێر چاوەدێری، بەلام سێبەری هیچ کامێکیان لە دەوروبەری ئەو هۆتێلە نەدەبینرا کە «ڤانوونوو»ی لێبوو.

سەرەنجام،«نیکۆلا دیڤیس» تەلەفونی بۆ دۆستێکی ڕۆژنامەنووسی کرد کە سەرنووسەری ڕۆژنامەی Sunday Times بوو، و ناوی ئەو هۆتێلەی لێپرسی کە «ڤانوونوو»ی لێبوو. دوایە «دیڤیس» ناوی هۆتێلی «ڤانوونوو»ی بەمن گوت و ئەمنیش دام بە سەرۆکەکانم لە ئیسرائیل. ئێستا کە ئادرەسی هۆتێلی «ڤانوونوو» زانرابوو، «مۆساد» نەخشەیەکی بۆ «ڤانوونوو» ڕێکخست. بەلام دیارە ئەو کارە بێ ئاگاداریی سەرۆکی «مۆساد»، «ناچووم ئەدموونی» جێبەجێ دەکرا. هەمووکەس چۆنیەتیی دزینی «ڤانوونوو»ی بیستوە، بەلام گرنگترین بەشی عەمەلیاتی دزینەکەی کە هەتا ئێستا ئاشکرا نەکراوە، پێوەندیی بە ژنێکی جوان و ئەفسوونکارەوە هەیە کە ئەوی بە داوەوە کرد و بەرەو چارەنووسی نارد.

بەو جۆرە بوو کە شەوێک «ڤانوونوو»، لەکاتێکدا لە دەوروبەری مەیدانی Leicesterی لەندەن دەگەڕا، تووشی «سیندی هانین بنتۆڤ»

Cindy Hanin Bentov کە ژنێکی جوان و دڵڕفێن بوو، هات. دوای ئەوەی کەمێک پێکەوە دوان، «سیندی» پێشنیاری پێکرد بۆ کەمێک خواردنەوە بچنە مەیخانەیەک. پاش ئەوە «سیندی» دووسێ جار لە نێوان ئەو کاتانەدا کە «ڤانوونوو» وتوویژی دەگەڵ ڕۆژنامەی Sunday Times دەکرد، چاوی پێی کەوت و لە یەکێک لەو دیدارانەدا پێی‌گوت کە ئەو لە شاری ڕۆم ئاپارتمانێکی هەیە و بانگهێشتنی کرد کە لە سەفەرێکی ڕۆمدا دەگەڵی بچێ. ئاشکرایە کە «ڤانوونوو» نەیدەتوانی بیریش لە ڕەتکردنەوەی ئەو پێشنیارە بکاتەوە.

«ڤانوونوو» بە ئیشکەرانی ڕۆژنامەی Sunday Timesی گوت کە بەنیازە بۆ پشووی کۆتایی حەوتوو و یەک دوو ڕۆژ دواتر بچێتە دەرەوە. کاتێک گەیشتە ئەو ئاپارتمانە، سێ کارمەندی «مۆساد» چاوەڕێی بوون و دەرزییەکی بێهۆشییان لێدا، پاشان جەستەکەیان خستە سندووقێکی گەورەی دارینەوە، بردیانە کەشتییەکی ئیسرائیلی و لەنێو بارە دیپلۆماتییەکانی کەشتیدا دایان نا. دیارە بارە دیپلۆماتییەکانیش، لە پشکنینی کاربەدەستانی دەوڵەتی پارێزراون.

وەختێک کەشتی بەرەو ئیسرائیل کەوتە ڕێ، «ڤانوونوو»یان لە سندووقەکە هێنایە دەر، کەلەپچەیان کرد و لە کابینێکی کەشتییەکەدا زیندانییان کرد. هەرکە کەشتی گەیشتە بەندەری «ئەشداد» Ashdadی ئیسرائیل، سەرهەنگێکی پۆلیس، حوکمی گرتنەکەی بەهۆی ئەمنیەتییەوە پێ نیشان دا. ئاشکرایە کە کارمەندانی «مۆساد» دەیانتوانی لە لەندەن «ڤانوونوو» بدزن و بە جێتێکی ٧٠٧ی هێزی هەوایی لە فڕۆکەخانەی «ستانستێد» Stanstedی بریتانیاوە ببەنە تەل ئەبیب، بەڵام لەبەر ئەوەی ئیشکەرانی ڕێکخراوی هەواڵگریی MI-5 داوایان لە «مۆساد» کردبوو لە خاکی بریتانیا نەیدزن، چونکە «ماگارێت تاچەر» ناڕەحەت دەبێ، کارمەندانی «مۆساد» بەرنامەکەیان لە ڕۆم جێبەجێ کرد.

کاتێک پشووی کۆتایی حەوتوو تێپەڕی و لە لەندەن خەبەرێک لە «ڤانوونوو» و «سیندی» نەبوو، ڕۆژنامەی Sunday Times ڕۆژی ١٥ی ئۆکتۆبری ١٩٨٦، بڕیاری دا ئەو شتانەی لە «ڤانوونوو»ی بیستبوون، دەگەڵ هێندێ وێنەی پێوەندیدار چاپ و بڵاو بکاتەوە. دیارە رۆژنامەی Sunday Mirror وتارێکی لەبارەی درۆبوونیەوە بڵاو کردبۆوە، بەڵام کاریگەرییەکی وای نەبوو.

ئەو بابەتانەی لەبارەی قسەکانی «ڤانوونوو»وە لە ڕۆژنامەی Sunday Timesدا چاپ کران، هەڵلایەکیان لە دنیادا نایەوە. کاتێک لە ئیسرائیل ئەویان بردە دادگا، دەنگی هەڵلایەکە بەرزتریش بوو. هەموو کەس دەیپرسی، ئەو چۆن هاتۆتەوە ئیسرائیل. ڕۆژێکیان کە ئەویان بە ترومبێلی پۆلیس دەبردە دادگا، بە قامکداگرتن ژمارە فڕینەکەی لە لەندەنەوە بۆ ڕۆم لەسەر شووشە نووسی و بەوکارە نیشانەیەکی لەوەی بەسەری هاتبوو بە دنیا نیشان دا.

کۆمەڵێک لە ئیشکەرانی ڕێکخراوی هەواڵگریی ئیسرائیل پێوەندییان دەگەڵ «شامیر» کە ئەودەم لە حکوومەتی هاوپەیمانیی ئیسرائیلدا، جێگری سەرۆکوەزیر بوو، گرت و پێیان گوت لەوانەیە «شیمۆن پرێز» بیهەوێ لە مەسەلەی «ڤانوونوو» بۆ لەقاودانی عەمەلیاتی «ئێران- ئیسرائیل- ماکسوێڵ» کەلک وەرگرێ. «شامیر» پێی خۆش بوو «ڤانوونوو» بکوژرێ، بەڵام وەخت بۆ ئەو کارە درەنگ ببوو.

«ڤانوونوو» لە پشت دەرگای داخراوەوە، بە تۆمەتی جاسووسی و خەیانەت، بە ١٨ ساڵ زیندان مەحکووم کرا. ڕۆژنامەی Sunday Times بە دزرانی «ڤانوونوو» خۆشحاڵ بوو، چونکە بێئەوەی پێنسێک بدا، داستانەکەی چاپ و بڵاو کردەوە. ئەمن وردەکاریی ئەو داستانەم لە «سیندی» کە پێشتر کارم دەگەڵ کردبوو، بیست.

وەک لەپێشدا باسم کرد، قەرار بوو دوو زانای ئەتۆمیی ئیسرائیل من لە وەزعی ئەتۆمیی ئیسرائیل ئاگادار بکەن. پاشان ئەو دۆسییانەش کە لەبارەی توانای ئەتۆمیی ئیسرائیلەوە لە دەفتەری

سـەرۆکوەزیـر هـەن بـە وردی بخوێنمـەوە و ئـەمجار بنێردرێمـە مەئموورییەتێکی نهێنی لەو بارەیەوە. بەڵام، ئاگاداربوون لە دۆسیەی «ڤانوونوو» ئامادەیی مـن بـۆ ئـەو مەئموورییەتـەی کـەم کـردەوە. بەهەرحاڵ، دوو زانای ئەتۆمیی ئیسرائیل هێندێ زانیارییان لەبارەی مێژووی ئـەتۆمیی ئیسـرائیل و وەزعـی ئێسـتایەوە دامـێ. پوختـەی ئەوەی لە قسەکانی وان لەبارەی بەرنامەی ئەتۆمییەوە دەستم کەوت، بەم جۆرەیە: هۆی ئەوە کە ئەمن بە لێکدانەوەی زۆرەوە ئەم بابەتە شـی دەکەمـەوە ئەوەیـە کـە هەسـت دەکـەم دنیـا دەبـێ فکرێـک بـۆ کەرەسـەی شـەڕی ئـەتۆمی کـە مەترسـییەکەی هەڕەشـە لـە بـوونی مرۆڤایەتی دەکا، بکاتەوە.

بـاوکی بەرنامـەی ئـەتۆمیی ئیسـرائیل لـە نیـوەی ساڵەکانی دەیـەی ۱۹۵۰دا «شـیمۆن پریـز»ی لاو بـوو کـە بەڕێوەبەرایـەتیی گشـتیی وەزارەتـی بـەرگریی لـەژێر سـەرپەرستیی سـەرۆکوەزیـر و وەزیـری بەرگریی ئیسرائیل «دیڤید بن گۆریۆن»دا بەئەستۆوە بوو. «پریز» لـەو بـاوەڕەدا بـوو کـە ئەگـەر قـەرار بـێ ئیسرائیل لـە دنیـادا زینـدوو بمێنێ، دەبێ چەکێکی هەبێ کە پێش بە نابوودکردنی لەلایەن وڵاتـانی عەرەبییـەوە بگـرێ و ئـەو چەکـەش چـەکی ئـەتۆمی بـوو. بـەو بۆچوونـەوە، «پریز» ساڵی ۱۹٥٦ بـۆ دیدارێک دەگەڵ سـەرکۆماری ئەو کاتی فەرانسە، پریزیدێنت ژەنراڵ دووگۆل بە فڕۆکە چووە ئەو وڵاتـە. ئـەرکی «پریز» لـەو سـەفەرەدا، بەدەسـتهێنـانی ڕێئـاکتۆرێکی ئەتۆمی بۆ ئیسرائیل بوو.

ژەنراڵ دووگۆل کە لـە جەنگەی دووەم شـەڕی جیهانیدا ماوەیەکی دەگەڵ «دیڤید بن گۆریۆن» لە دەرەوەی وڵاتی خۆی بەسـەر بردبـوو و لەگەڵی دۆست بوو، دەسبەجێ دەستووری دا ڕێئاکتۆرێکی ئەتۆمی

به ئیسرائیل بفرۆشرێ و تەکنۆلۆژیی گۆڕینی ڕێئاکتۆرەکە بە بۆمبی ئەتۆمییشی[20] بخرێتە بەر دەست.

یەکەمین ڕێئاکتۆری ئەتۆمیی ئیسرائیل لە لێواری مێدیتڕانە لە «ناهال سۆرەک» Nahal Sorek لە ناوچەی «یاڤن» Yavne دامەزرا. ئەو ڕێئاکتۆرە بۆ توێژینەوە بە ئۆرانیۆمی پیتێندراو کە لە فەڕانسەوە هێنرابوو، خرایە کار. ئامانجی ئیسرائیل ئەوە بوو بزانێ داخوا دەکرێ، ئەم وڵاتە بە تواناکانی بەر دەستی و بە هاوکاریی زانایانی جوولەکە کە لە ئەمریکاوە هێنرابوونە ئیسرائیل، پرۆژەیەکی ئەتۆمی وەڕێ بخا.

پاش ئەوەی یەکەمین توێژینەوەکان ئاکامی باشیان لێ وەرگیرا، «یزرائیل گلیلی» کە وەزیری ڕاوێژکار و پیاوێکی دەسەڵاتخوازی دەستەچەپی بوو و ڕێبەرایەتیی سرویسە هەواڵگری و ئەمنیەتییەکانی دەکرد، بڕیاری دا بە ڕاکێشانی سەرنجی «بن گوریۆن» سەرپەرستیی بەرنامەی ئەتۆمیی ئیسرائیل لە ڕادەی کابینەدا وەئەستۆ بگرێ. دوای تێپەڕینی ٦ یان ٨ مانگ لە دامەزراندنی سەرکەوتووانەی یەکەمین ڕێئاکتۆری ئەتۆمی لە «یاڤن»، گلیلی گوشاری بۆ حکوومەت هێنا کە ڕێئاکتۆرێکی دیکە لە بیابانی «نەگەڤ» نیزیک «دیموونا» لە ٤٠ مایلیی باکووری خۆرهەڵاتی «بی یەرشبا» دامەزرێنێ.

دوای سەرکەوتنی بەرچاوی بەرنامەی ئەتۆمیی بێئەندازە نهێنیی «دیموونا»، لە کۆبوونەوەیەکی حیزبی «ماپای» Mapai دا، «گلیلی» کە لەجێدا پیاوێکی لەسەرەخۆ بوو، بە شانازییەوە سنگی ڕەپێش خست و ڕایگەیاند: «سێیەمین پەرستگەش ئێستا بنیات نراوە.»

---

[20]- بە سەرسوڕمانەوە دیتمان لە نێوبەندی ساڵەکانی دەیەی ١٩٧٠دا، فەڕانسە ڕێئاکتۆری ئەتۆمیی بەعێراقیش کە دوژمنی ئیسرائیل بوو، فرۆشت.

ئەم بابەتە ئەندامانی دیکەی کابینەی کە نەیاندەزانی، «گلیلی» باسی چی دەکا، تووشی سەرسوڕمان کرد. «گلیلی» درێژەی دایە و گوتی، ئیسرائیل وەک ڕێبەری مانایی دنیا بە زیندوویی دەمێنێتەوە و لەمەودوا هیچکام لە دراوسێکانی ناوێرن هێرش بکەنە سەر ئەم وڵاتە.»

هەرچەند فەڕانسەیی‌یەکان ئیسرائیلییەکانیان فێری دروستکردنی بۆمبی ئەتۆمی نەکردبوو، بەڵام دەیانزانی کە ئیسرائیل بۆخۆی دەتوانێ بەرنامە ئەتۆمییەکەی سەر بخا و وێدەچێ لەوبارەیەوە پێشکەوتنی گرنگی تەکنۆلۆژی بەدەست بێنێ. بۆیە، بڕیار درابوو کە لەو حاڵەدا، تەل ئەبیب، پاریس لە بەهرەوەرگرتن لە پێشکەوتنەکانی بێبەش نەکا.

لە ساڵانی دەیەی ١٩٦٠دا، ئیسرائیل توانی، بۆمبێکی ئەتۆمیی سادە وەک ئەو بۆمبە دروست بکا کە ئەمریکایی‌یەکان لە شەڕی دووەمی جیهانیدا لە «ناکازاکی» بەکاریان هێنا. ئەم بۆمبە ساڵی ١٩٦٣ بۆ یەکەم جار لە عەمەلیاتی هاوبەشی فەڕانسە- ئیسرائیلدا لە پاسیفیک نیزیکی «کالیدۆنیا» Calidonia تاقی کرایەوە. ئەم بۆمبە لە فڕۆکەیەکی هێزی هەوایی فەڕانسەوە هاوێژرا و ئەمریکایی و بریتانیایی‌یەکانیش پێیان وابوو تاقیکردنەوەیەکی ئەتۆمیی فەڕانسە بووە.

پاش هاویشتنی سەرکەوتووانەی بۆمبی ناوبراو، ڕێبەرانی حیزبی «ماپای» ئەوەندە خۆشحاڵ بوون کە «پینچاس سەپیر» Pinchas Sapir، وەزیری کاروباری دارایی لە کۆبوونەوەیەکی ساڵانەدا ڕایگەیاند کە ئێستا توانای سەربازیی ئیسرائیل بەقەد توانای فەڕانسەیە.

هاوکارییەکانی ئیسرائیل و فەڕانسە و کۆمەگی ماڵیی فەڕانسە بە ئیسرائیل هەتا شەڕی ١٩٦٧ درێژەی هەبوو. لەو ساڵەدا، فەڕانسە ئیسرائیلی بە هەڵایساندنی شەڕ تۆمەتبار کرد. دیارە ئیسرائیل بە چاوێکی دیکە دەیڕوانیە دەستپێکردنی شەڕ. ئیسرائیل پێی وابوو

پریزیدێنت ناسر، سەرکۆماری میسر، بە داخستنی گەرووی «تیران» و ڕێگای ئاویی بەندەری ئیلات لە ئیسرائیل شەڕی دەست پێکردوە و ئەو کارەشی لەبەر بارودۆخی سیاسیی نێوخۆ و بۆ بەدەستهێنانی قەدروقودب لە دنیای عەرەبدا ئەنجام داوە.

حکوومەتی ئیسرائیل لە سەردەمی سەرۆکوەزیریی «لیڤی ئێشکۆل» Levi Eshkolدا، لە هاوپەیمانییەکی بەربڵاو پێکهاتبوو کە تەنانەت حیزبی دەستەڕاستیی «بگین»یشی کە ئەودەم بە «حیزبی گاهال» ناو دەبرا، تێدا بوو. «مۆشێ دایان» قارەمانی شەڕی سوئێز لە ساڵی ١٩٥٦دا، کرا بە وەزیری بەرگری. لەڕاستیدا، تەواوی قارەمانانی شەڕ، ناوەندەکانی دەسەڵاتیان بە دەستەوە بوو و چونکە ساڵی ١٩٦٧، وەستانێکی سەختی ئابووری بەرۆکی ئیسرائیلی گرتبوو، ئەوان بۆ چارەسەری گیروگرفتە ئابوورییەکانی وڵات بەدوای شەڕدا دەگەڕان. هەنگاوەکانی ناسر، ئەو بیانووەیان دایە دەست وان کە پێویستیان بوو و ئەوان عەرەبەکانیان بە توندی کوتا.

ئەگەرچی شەڕی ١٩٦٧ لەباری سەرکەوتنەوە بۆ ئیسرائیل زۆر پرشکۆ بوو و ئیسرائیل لەو شەڕەدا بیابانی سینا، بەرزاییەکانی گۆلان و لێواری خۆرئاوای گرت کە پێوانەی هەموویان سێ هێندەی خاکی ئەسڵیی ئیسرائیل بوو، بەڵام لەباری سیاسییەوە ئەم شەڕە بۆ ئیسرائیل گران تەواو بوو. چونکە دووگۆل پێی وابوو ئیسرائیل لەجیاتی ئەوەی گیروگرفتە سیاسییەکانی بە ڕێگای ئاشتیخوازانەدا چارەسەر بکا، شەڕی هەڵگیرساندوە، بۆیە دەستووری دا کە هاوکارییە سەربازییەکانی نێوان فەڕانسە و ئیسرائیل و ناردنی کەرەسەی سەربازی بۆ ئەم وڵاتە ڕابگیرێ. ئاشکرایە کە، دووگۆل لەو بەرنامەیەدا، چاوی تەماحی دە نەوتی عەرەبەکانەوە بڕیبوو. بەهەرحاڵ، ئاکامی دروستبوونی ناکۆکی لە نێوان ئەو دوو وڵاتەدا ئەوە بوو کە هاوکارییە ئەتۆمییەکانی نێوانیان بە تەواوی ڕاوەستان.

فەڕانسە تەنیا وڵات نەبوو کە لە ئاکامی شەڕی ١٩٦٧دا پێوەندیی خۆی لەگەڵ ئیسرائیل پچڕی، هەموو وڵاتانی بلووکی خۆرهەڵاتیش جگە لە ڕوومانی پێوەندییە سیاسییەکانی خۆیان دەگەڵ ئیسرائیل پچڕاند. ئەم وڵاتانە پێشتر ئیسرائیلیان وەک ناوەندی کیبووتز و کۆمەڵێکی نیوە سۆسیالیستی دەدیت، نە وەک وڵاتێکی دەستدرێژیکەر. ئیسرائیل هەروەها بە ئیمزانەکردنی ڕێککەوتننامەی قەدەغەی تاقیکردنەوە ئەتۆمییەکانیش قەدروقودبی نێونەتەوەیی خۆی عەیبدار کرد. ئەم وڵاتە هەتا ئەمڕۆش نەچۆتە پاڵ ئەو ڕێککەوتننامەیە.

بەمجۆرە، ئیسرائیل کەوتبووە دۆخێکی دژوارەوە. فەڕانسە و وڵاتانی بلووکی خۆرهەڵات، خۆیان لە ئیسرائیل کێشابۆوە و ئاسۆی پێوەندیی سەربازیی نێوان ئیسرائیل و ئەمریکاش بە دوو هۆ بەرەو تاریکی دەچوو. یەکەمهۆ ئەوە بوو، کە ساڵی ١٩٥٧، «مۆساد» لە پیلانی بۆمبدانانەوە لە باڵیۆزخانەی ئەمریکا لە قاهیرەدا بەشدار ببوو، بەو مەبەستە تۆمەتەکە بخاتە ئەستۆی ڕادیکاڵە میسرییەکان بۆ ئەوەی پێوەندیی نێوان میسر و ئەمریکا بپچڕێ. بەڵام، کارمەندە هەواڵگرییەکانی ئیسرائیل لەو ڕووداوەدا ئاشکرا بوون و ئەمەش بووە مایەی تێکچوونی پێوەندیی نێوان ئیسرائیل و ئەمریکا. هۆی دووەم ئەوە بوو، کە ساڵی ١٩٦٧ کەشتیی ئازادیی .U.S.S کە کەشتییەکی خەبەروەرگرتن بوو و لە لێوارەکانی میسر لەسەر ئاو دەگەڕا، لەلایەن جێتە میراژەکانی ئیسرائیلەوە بۆمباران کرا و لەو ڕووداوەدا ٣٤ کەس لە ئیشکەرانی کەشتییە ئەمریکاییەکە کوژران و ئەم بەسەرهاتە کەلێنی نێوان ئەمریکا و ئیسرائیلی فرەوانتر کرد.

لەم هەلومەرجە دژوارەدا، ئیسرائیل بەدوای دۆستانی تازەدا دەگەڕا تا بتوانێ توانا ئەتۆمییەکانی پەرە پێبدا. ئەفریقای باشوور، وڵاتێک بوو کە چاوەڕوانی پێوەندییەکی وا لەگەڵ ئیسرائیل بوو.

دەرگاکانی ئەو پێوەندییە لە نێوان ئەفریقای باشوور و ئیسرائیلدا پێشتر بە هۆی «شیمۆن پرێز»ەوە کە ئیسرائیلی بردبووە کلووبی

ئەتۆمیی دنیاوە، کرابوونەوە. ساڵی ١٩٥٩، ئەفریقای باشوور دەستی کردبوو بە فرۆشتنی ئەو ئوورانیۆمە بە ئیسرائیل، کە لە ئەفریقای باشوور خۆرئاوا (نامیبیای ئێستا) دەهاتە دەست و بۆیە لە نێوان ئەم دوو وڵاتەدا هاوکاریی سەربازی دروست ببوو.

یەکەمین خاڵی پێوەندیی نێوان ئەفریقای باشوور و ئیسرائیل ساڵی ١٩٥٩ بە فڕینەکانی کۆمپانیی «ئێل عال» بۆ ئەفریقای باشوور و فڕینەکانی هێڵی هەوایی ئەفریقای باشوور بۆ ئیسرائیل دەستی پێ-کرابوو. سەرەتا سندووقەکانی ئوورانیۆم لە ئەفریقای باشوورەوە لەنێو ئامرازە کشتوکاڵییەکاندا دەچوونە ئیسرائیل. بەڵام دواتر هەموو کڕین و فرۆشتنە ئەتۆمییەکان دەگەڵ ئەفریقای باشوور بەناوی مەکینە کە هێندێکیشیان بۆ ڕاکێشانی لوولە (بۆری)ی ئاو لە دەریای جەلیلەوە بۆ باشوور کەلکیان لێوەردەگیرا، ئەنجام دەدران. ڕێکخراوی ئاوی ئیسرائیل کە ڕێکخراوێکی دەوڵەتی بوو بەناوی «تاهال»، سەرپۆشێکی گونجاو بوو بۆ عەمبارکردنی ئوورانیۆم. چونکە، ئەو ڕێکخراوە، ژمارەیەک عەمباری ژێرزەمینیی کە ئیددیعای دەکرد بۆ ڕێکخراوی ئاو پێویستنی، دروست کردبوون و چەندین تۆن ئوورانیۆمیان تێدا عەمبار و پاشەکەوت دەکرا. ڕێئاکتۆری ئەتۆمییش کە پێشتر باسم کردوە و لە بیابانی «نەگەڤ» دامەزرابوو، یەکێک لەو شتانە بوو. بەڵام بێجگە لەوە زۆر عەمباری دیکەش بۆ پاراستنی مووشەکەکان بەناوی دامودەزگای ڕێکخراوی «تاهال» لە باکوور دروست کرابوون.

دیارە ئەفریقای باشوور لە بەرامبەر فرۆشتنی ئوورانیۆم بە ئیسرائیلدا چاوەڕوانی پاداش بوو. پاداشەکە ئەوە بوو کە ساڵی ١٩٥٩، «شیمۆن پرێز» وەک یەکەم کاربەدەستی ڕەسمیی ئیسرائیل سەفەری ئەفریقای باشوور کرد و بەڵێنی بە کاربەدەستانی ئەو وڵاتە دا کە هێندێک لەو کەرەسە جەنگییانەی لەلایەن ڕێکخراوی

پیشەسازیی ئیسرائیلەوە دروست دەکرێن بە وڵاتی ئەفریقای باشوور دەفرۆشرێن و تەکنۆلۆژیی تازەش دەخرێتە بەر دەستی ئەو وڵاتە.

ئیسرائیل، یەکەم بۆمبی ئەتۆمیی خۆی کە بۆمبێکی نەپاڵێوراو و خاوەنی ڕژاندنی ڕادیۆئەکتیوێکی سووک بوو، ساڵی ١٩٦٨ لە زەریا (ئۆقیانووس)ی هیند فڕێ دا. هاویشتنی ئەو بۆمبە بۆ ئەوە بوو کە میکانیزمی تەقینەوەی بۆمبەکە تاقی بکرێتەوە. هەر لەوساڵەدا، وڵاتانی ئەفریقای باشوور و ئیسرائیل ڕێککەوتننامەیەکی هاوکاریی ئەتۆمییان پێکەوە ئیمزا کرد. خاڵە گرنگەکانی ئەو ڕێککەوتننامەیە ئەوە بوون کە ئیسرائیل زانا ئەتۆمییەکانی ئەفریقای باشوور فێری زانستی بۆمبی ئەتۆمی و چۆنیەتیی بەرهەمهێنانی دەکا و ئەفریقای باشووریش کۆمەگی ماڵی دەداتە بەرنامەی ئەتۆمیی ئیسرائیل و ڕێگا بۆ تاقیکردنەوەی بۆمبەکانیان لە ئوقیانووسی هیند خۆش دەکا. هەرچەند لەو وەختەدا ئیسرائیل ناوچەی سینای بەدەستەوە بوو، بەلام تاقیکردنەوەی بۆمبە چووکەکانیش لە بن زەوی زۆر گران تەواو دەبوو.

ساڵی ١٩٦٨ کاتێک کۆمەگە ماڵییەکانی ئەفریقای باشوری بە بەرنامەی ئەتۆمیی ئیسرائیل دەستیان پێکرد، کۆنگرەی ئەمریکا ئیسرائیلی خستە ژێر گوشار کە ئەو وڵاتە لە وردەکاریی بەرنامە ئەتۆمییەکەی ئاگادار بکا و داوای کرد سەر لە دامودەزگا ئەتۆمییەکانی ئیسرائیل بدا. حکوومەتی ئیسرائیل و وەزیری بەرگرییەکەی، کە ئەوکاتە «مۆشێ دایان» بوو، تەسلیمی گوشاری ئەمریکا بوون و مووافەقەتیان کرد کە دامودەزگای ئەتۆمیی «دیمۆنا» بۆ لێکۆڵینەوە بخەنە بەر دەستی ئەمریکاییەکان. دیارە ئیسرائیل هەروەک ڕابردوو پێی داگرت کە بەرنامە ئەتۆمییەکانی بۆ ئامانجی ئاشتیخوازانەی وەک بەرهەمهێنانی ئەلیکتریسیتە دامەزراون. فەڕانسە لەوکاتەدا بێدەنگ ما. چونکە لە سەرەتادا فەڕانسە،

ڕێئاکتۆری ئەتۆمیی دابوو بە ئیسرائیل و نەیدەویست خۆی بەوە تۆمەتبار بکا.

پێش گەیشتنی لێکۆڵەرانی ئەمریکا بە دامەزراوە ئەتۆمییەکانی ئیسرائیل، ئیسرائیلییەکان ژوورێکی کۆنترۆڵ و نەخشە و ئامرازی ساختەی هەڵسەنگاندنیان لە نێو خانووبەرەی ڕێئاکتۆرە ئەتۆمییەکە دروست کرد. کاتێک ئەمریکاییەکان، دامودەزگاکەیان تاقی کردەوە یان ئیسرائیلییەکان فریویان دان یان بۆخۆیان بەدڵخواز ویستیان لەوبارەیەوە فریو بخۆن. چونکە لێکۆڵەرەکان کە گەڕانەوە ڕاپۆرتیان دا کە ئیسرائیل زانست یان تەکنۆلۆژیی بەرهەمهێنانی بۆمبی ئەتۆمیی نیە و ڕاپۆرتی کارمەندانی CIA لەبارەی هاوکارییە ئەتۆمییەکانی ئیسرائیل و ئەفریقای باشوورەوە ڕاست نەبوون.

تاقیکردنەوەی بۆمبە ئەتۆمییەکانی ئیسرائیل بە کۆمەگی زانا فەڕانسەییەکان کە پێش دەرچوونی فەرمانی دووگۆل بە قەدەغەی کۆمەگی زیاتری ئەتۆمیی فەڕانسە بە ئیسرائیل، لە دامودەزگا ئەتۆمییەکانی ئەو وڵاتە خەریکی کار بوون، درێژەی کێشا و بەرەبەرە تەنانەت خەڵکی ئاسایی ئیسرائیلیش کە مووچەی زۆرزۆریان وەردەگرت، لە هەر بارێکەوە ئامادەیی و کارامەیی ئەنجامدانی ئەو جۆرە کاروبارانەیان پەیدا کردبوو.

لە نێوان ساڵەکانی ١٩٦٨ و ١٩٧٣دا، سێزدە بۆمبی ئەتۆمی لە ئیسرائیل دروست کران، کە توانای ئەتۆمیی هەرکامێکیان سێ هێندەی ئەو بۆمبانە بوو کە ئەمریکا ناکازاکی و هیرۆشیمای پێ وێران کردن. دەگەڵ بوونی گیروگرفتی زۆریش، هێندێ لە تاقیکردنەوە ئەتۆمییەکانی ئیسرائیل لە تونێلە ژێرزەوییەکانی بیابانی سینا و ئەوانی دیکە لە ئوقیانووسی هیند ئەنجام دران، و وەڵامی ئەو پرسیارە کە داخوا ئیسرائیل توانای ئەتۆمیی خۆی بەکار دەبا یان نا، لە جەنگەی شەڕی ١٩٧٣ دەگەڵ میسر و سووریادا بە ڕوونی درایەوە. بەو جۆرە کە وەختێک هێزەکانی سووریا لە بەرزاییەکانی

گۆلان دەستیان بە پێشڕەوی کرد و ترسی ئەوە هەبوو کە ئەوان لە «تیبەریاس» Tiberias نیزیک ببنەوە، مۆشێ دایان دەستووری دا ١٣ بۆمبی ئەتۆمیی ئیسرائیل ئامادە بکرێن و ٢٤ فڕۆکەی بۆمبهاوێژی B-52ش ئامادەی کار بن. ئەمریکا ئەو بۆمبهاوێژە کۆنانەی بە ئیسرائیل فرۆشتبوون و نەیدەزانی، کە ئیسرائیل بۆ چ مەسرەفێک پێویستیی بەو فڕۆکانە هەیە. (ڕاستییەکەی ئەوە بوو کە ئیسرائیل هێشتا سیستمی مووشەکهاوێژی خۆی تەواو نەکردبوو و فڕۆکە B-52ەکانی بۆ هاویشتنی بۆمبە ئەتۆمییەکانی کڕی.) پاش ئامادەبوونی بۆمبە ئەتۆمییەکانی ئیسرائیل و ئامادەکردنیان بۆ هاویشتن، ئیسرائیل ئەو مەترسییەی بە سۆڤیەتەکان و ئەمریکاییەکان ڕاگەیاند کە ئەگەر عەرەبەکان نەوەستێن، کار تەواو دەبێ.

لە وەڵامی ئەوکارەی ئیسرائیلییەکاندا، وڵاتی سۆڤیەت، تەل ئەبیب و حەیفا و بیەرشبا و بەندەری «ئوشدوود»، (بەڵام نە ئوورشەلیم)ی کردنە نیشانەی مووشەکە ئەتۆمییەکانی خۆی. پریزیدێنت ڕیچارد نیکسۆنیش کە هۆشدارەکەی ئیسرائیلی وەرگرتبوو فەرمانی ئامادەبوونی بە هەموو دنیا ڕاگەیاند و دەستووری دا هێزەکانی ئەمریکا ئامادەی شەڕ بن. بەڵام دوای حەوتوویەک ئیسرائیل توانی پێشڕەویی هێزەکانی سووریا ڕابگرێ و ئەمە مەترسیی بەکاربردنی بۆمبە ئەتۆمییەکانی ئیسرائیلی لەنێو برد.

هەتا شەڕی ساڵی ١٩٧٣، ئیسرائیل پێوەندیی باشی دەگەڵ گەلانی ئەفریقای ڕەش هەبوو. ئەو گەلانە ئیسرائیلیان وەک خەنیمێکی لاواز دەدی کە بۆ ئەوەی بمێنێ ناچار بووە بەرامبەر بە عەرەبان ڕاوەستێ و لەوبارەیەوە گەلانی ئەفریقای ڕەش خۆیان وەک ئیسرائیل دادەنا، چونکە ئەوانیش ناچار ببوون بۆ پاراستنی خۆیان لە بەرامبەر مسوڵمانانی باکووری ئەفریقادا ڕاوەستن. بەڵام شەڕی ساڵی ١٩٧٣ کۆتایی بە پێوەندیی ئیسرائیل و گەلانی ئەفریقای ڕەش هێنا. گەلە ڕەشەکان ئیددیعایان کرد کە ئیسرائیل بە پەڕینەوە لە کەناڵی سوئێز

که بە سنووری نێوان ئاسیا و ئەفریقا دادەنرا، لەڕاستیدا دەستدرێژیی کردۆتە سەر ئەفریقا. بۆیە زۆربەی وڵاتانی ئەفریقای ڕەش،بەرەبەرە، بەڵام بە بیرێکی بڕیاردەرانەوە پێوەندییەکانیان دەگەڵ ئیسرائیل پچڕاند. سەرهەنگ موعەممەر قەززافی، سەرکۆماری لیبیاش بەڵێنی پێدان کە ئەگەر پێوەندییەکانیان دەگەڵ ئیسرائیل بپسێنن، پاداشی ماڵییان دەداتێ. بەڵام لیبیا هیچوەخت ئەو بەڵێنەی بەجێ نەهێنا.

دوای پچڕانی پێوەندییەکانی ئیسرائیل و گەلانی ئەفریقای ڕەش، وڵاتی ئەفریقای باشوور هەنگاوی بەرامبەری نا و لە حاڵێکدا تا ئەودەم پێوەندییەکەی دەگەڵ ئیسرائیل لە ڕادەی کۆنسوولیدا بوو، بە هێواشی پێشنیاری بە ئیسرائیل کرد کە پێوەندییە سیاسییەکانیان بگەیەننە ڕادەی گۆڕینەوەی باڵیۆز. لە ماوەی چەند مانگدا ساڵی ١٩٧٤، ئەو بەرنامەیە بەهۆی حیزبی کرێکاری «ئیسحاق ڕابین»ەوە جێبەجێ کرا.

پاش ئەوە پێوەندییەکانی ئیسرائیل – ئەفریقای باشوور بەخێرایی پەرەیان گرت. زانایانی ئەتۆمیی ئیسرائیل، کۆمەگیان بە ئەفریقای باشوور کرد کە ئەوانیش بۆمبی ئەتۆمی بۆخۆیان دروست بکەن. بە سەرسوڕمانەوە دیتمان، هێندێک لە زانا فەڕانسەیی‌یەکان کە لە سالانی دەیەی ١٩٦٠دا لە ئیسرائیل خەریکی کار بوون و پاش فەرمانی ژەنراڵ دووگۆل بە قەدەغەکردنی هاوکارییە سەربازییەکانی ئیسرائیل و فەڕانسە ئیسرائیلیان بەجێ‌هێشت، لە ئەفریقای باشوور چاویان بە دۆستە ئیسرائیلییەکانی پێشوویان کەوت و پێکەوە لە شاری «کیپ تاون» دەستیان کرد بە بەرهەمهێنانی بۆمبی ئەتۆمی بۆ ئەفریقای باشوور.

پێشکەوتنی تاقیکردنەوەی بۆمبە ئەتۆمییەکان لە ئیسرائیل ئەوەندە درەوشاوە بوو کە ساڵی ١٩٧٦ جۆرە مووشەکهاوێژێکی دروست کرد کە دەیتوانی شووڕەوی بکاتە ئامانج. ساڵێک دواتر، کە ئیسحاق ڕابین، کارەکانی سەرۆکوەزیریی دانە دەست «مەناخیم بگین»، یەک

لە یەکەمین فەرمانەکانی بگین ئەوە بوو کە ژمارەیەک لە شارەکانی شووروەوی، وەک ئێرەوان لە ئەرمەنستان و باکۆ لە ئازەربایجانی شووروەوی بکاتە ئامانج.

«بگین» کە تا رادەیەک خۆی تووشی تیئۆریی مافی مرۆڤ کردبوو، لە درێژەدانی پێوەندی دەگەڵ ئەفریقای باشوور کە بە وڵاتێکی رەگەزپەرستی دەناسی، رازی نەبوو. بۆیە خۆی لەسەر دووڕیانێک دەدیتەوە. چونکە لە لایەک، هەستی دەکرد کە ئیسرائیل بۆ پەرەپێدانی بەرنامە ئەتۆمییەکانی پارە و کارامەیی خۆی هەیە و لە لایەکی دیکە، بۆی دەرکەوت کە ئیسرائیل بۆ بەرنامە ئەتۆمییەکانی خۆی، پێویستیی بە ئوورانیۆمی ئەفریقای باشوور هەیە. لێکۆڵەرانی سەربازی و وەزارەتی بەرگرییش گوشاریان خستە سەری کە پێوەندییەکانی ئیسرائیل و ئەفریقای باشوور درێژەیان هەبێ.

«بگین» کە پێی خۆش نەبوو، بۆخۆی تێکەڵی پێوەندییەکانی ئیسرائیل و ئەفریقای باشوور بێ، ساڵی ١٩٧٨ یەکەمین وەزیری بەرگریی خۆی، «ئیزەر وایزمەن» Ezer Weizmanی ناردە پریتۆریا بۆ دیتنی سەرۆکوەزیری ئەو وڵاتە «P. و. بۆتا» P. W. Botha کە هەرلەوکاتەدا وەزارەتی بەرگرییشی بەئەستۆوە بوو. بگین بەو مەبەستە وەزیری بەرگرییەکەی ناردبووە ئەفریقای باشوور، کە لە گەرمیی پێوەندییەکانی دوو وڵات کەم بکاتەوە. کەچی «بۆتا» پێی داگرت کە لەنێو ئەو دوو وڵاتەدا رێککەوتنێک ئیمزا بکرێ کە ئەگەر شەرێک رووی دا، ئەوان وەک هاوپەیمان بچنە هاوکاریی یەکتر و بە پێچەوانەی چاوەروانیی «بگین» وەزیری بەرگریی ئیسرائیل «وایزمەن»یش مووافەقەتی لەسەر پێشنیارەکەی «بۆتا» کرد.

کاتێک «وایزمەن» گەرایەوە ئیسرائیل و راپۆرتی سەفەرەکەی دایە «بگین»، ئەو کە هیچوەخت نەیتوانیبوو، «وایزمەن» بە تەواوی کۆنترۆڵ بکا، ملی بۆ کارەکەی راکێشا. جێبەجێکردنی ئەو رێککەتننامەیە بۆ هاوکاریی نێوان دوو وڵات ماوەی دوو ساڵی

خاياند. دەقی ئیسرائیلیی ڕێککەوتننامەکە بەهۆی «شیمۆن لاڤی» Shimon Lavee سەرۆکی لقی کۆمەگە تایبەتەکانی ئیدارەی پێوەندییەکانی دەرەوەی هێزەکانی بەرگریی ئیسرائیل/ ڕێکخراوی هەواڵگریی سەربازییەوە ئامادە کرا. بەپێی بەندەکانی ئەو ڕێککەوتننامەیە، هەرکات یەکێک لە دوو وڵاتی ئیسرائیل و ئەفریقای باشوور دەگەڵ وڵاتێکی دیکە بکەوێتە شەڕ یان تووشی عەمەلیاتی سەربازی بێ و پێویستیی بە کەرەسەی شەڕ هەبێ، وڵاتەکەی دیکە لە زەخیرەی چەکەکانی خۆی کۆمەگی دەکا. یەکی دیکە لە بەندەکانی ڕێککەوتننامەکە ئەوە بوو کە هەموو ساڵێ کۆنفرانسێک لە جێگرانی سەرۆکی ستادی هەرکام لەو وڵاتانە و هەرجارەی لە یەکێک لەو دوو وڵاتە پێکدێ.

لەنێوان ساڵەکانی ۱۹۷۸ و ۱۹۷۹دا، ئیسرائیلییەکان ژمارەیەک تۆپی ۱۷۵ میلیمیترییان بە وڵاتی ئەفریقای باشوور فرۆشت کە دەیانتوانی ئامرازی چووکەڵەی ئەتۆمی هەڵبگرن. ئەو کڕین و فرۆشتنەی لە نێو دوو وڵاتەکەدا ئەنجام دران بایەخێکی هەورازتر لە پووڵیان هەبوو. نەکهەر وڵاتی ئەفریقای باشوور موافەقەتی کرد کۆمەگ بە بەرنامەی ئەتۆمیی ئیسرائیل بکا، بەڵکوو ڕێگاشی پێدا، بەبێ چاوەدێریی ئەفریقای باشوور، بەرنامە ئەتۆمییەکانی لە ئوقیانووسی هیند تاقی بکاتەوە. ساڵی ۱۹۷۹، ئیسرائیل ڕیزە تاقیکردنەوەیەکی ئەتۆمیی کرد کە یەکێکیان بەهۆی سەتەلایتەوە ئاشکرا بوو، چونکە تەقینەوەکەی لە کاتێکدا بوو کە هەوای ئەو ناوچەیە ساو و بێهەور بوو، بۆیە سەتەلایتەکە شۆقە زۆرەکەی تۆمار کرد. وڵاتی ئەفریقای باشوور حاشای لەوە کرد ئاگای لەو تاقیکردنەوەیە بووبێ و ئیسرائیلیش هەتا ئێستا شتێکی لە بارەی ئەو تاقیکردنەوەیەوە نەگوتوە. بەوحاڵە، بابەتێک کە «سەیمۆر هێرش» Seymor Hersh لە کتێبەکەیدا بە ناوی The Samson Option لەبارەی ئەو تاقیکردنەوە ئەتۆمییەوە نووسی و ڕوونی کردەوە کە ئەو شۆقەی لە ئوقیانووسی

ئارام بینرا، ئاکامی تاقیکردنەوەی ئەتۆمیی ئیسرائیل بووە، لە لایەن ئەم وڵاتەوە بەدرۆ خرایەوە. ساڵی ١٩٧٩ ئیسرائیل کەموزۆر خاوەنی ٢٠٠ بۆمبی زۆر پێشکەوتوو و تۆپی ئەتۆمی - گوللەی تۆپی ١٧٥ میلیمیتری بوو. ئەم وڵاتە هەروەها خاوەنی هێندێ سیستمی مووشەکهاویشتن بوو کە زۆر پێشکەوتوو نەبوون، بەوحاڵەش دەیانتوانی بگەنە بەغدا و شوورەوی.

ساڵی ١٩٨٠، «مۆردخای تی سیپۆری» Mordchai T Sippori، فەرمانی تاقیکردنەوەی بۆمبی هیدرۆژینیی ئیسرائیلی دەرکرد. ساڵی ١٩٨١ ئیسرائیل خاوەنی چەند بۆمبی هیدرۆژینی بوو کە لە ئۆقیانووسی هیند تاقی کرابوونەوە. لەو ساڵەدا، ئیسرائیل لە عەمباری چەکەکانی خۆیدا خاوەنی پتر لە ٣٠٠ بۆمبی ئەتۆمی بوو کە خانووەکەیان لەلایەن «تاهال» ڕێکخراوی ئاوی ئیسرائیلەوە دروست کرابوو. ئەم وڵاتە هەروەها ٥٠ بۆمبی هیدرۆژینیی هەبوون. بۆمب-هاوێژە B-52ەکانیشی زیادیان کردبوو.

کاتێک «ئاریەل شارۆن» وەزیری بەرگریی ئیسرائیل بوو، جۆرێک بۆمبی ئەتۆمیی تاکتیکییش دروست کرا کە تیشکە ئەتۆمییەکەیان کز بوو و بۆ مەیدانەکانی شەڕ دروست کرابوون. بەڵام ئەو کانزا و کەرەسە شیمیایی‌یە کە ئەفریقای باشوور بۆ بەرهەمهێنانی چەکی ئەتۆمی دەیدا بە ئیسرائیل، تەنیا بەشی تاقیکردنەوەکان بوو. ئەفریقای باشوور بە ئیسرائیلی گوتبوو، ئەگەر ئەوان کەرەسەی پتریان پێویستە، دەبێ بەڵێن بدەن لە بەرامبەر واندا بۆمب بە ئەفریقای باشوور بفرۆشن.

لەنێوان ساڵەکانی ١٩٨٥ و ١٩٨٨دا، پێوەندییەکانی ئیسرائیل و ئە-فریقای باشوور ڕوویان لە کزی کرد و گرنگترین هۆشی ئەوە بوو کە ئەفریقای باشوور دەستی کردبوو بە فرۆشتنی کەرەسەی ناپێشکەوتووی شەڕ بە عێراق. ساڵی ١٩٨٨ ئیسرائیل هۆشداری بە ئەفریقای باشوور دا کە شەڕی ئێران و عێراق کۆتایی هاتوە و بۆیە

پێویست نیە کۆمەگ بە عێراق بکەن. بەڵام وڵاتی ئەفریقای باشوور گوێی نەدایە هۆشدارەکەی ئیسرائیل و ئەم بابەتە بووە هۆی ئەوە کە پێوەندییە سەربازییەکانی ئیسرائیل و ئەفریقای باشوور بە تەواوی بپچڕێن.

ئاکامی دەسبەجێی ئەم ڕووداوە ئەوە بوو کە ئیسرائیل ئیدی جێیەکی نەبوو کە کەرەسەی مەعدەنی و شیمیایی پێویستی بۆ بەرهەمهێنانی بۆمبە تاکتیکییەکان لێ بکڕێ. دوایە دەرکەوت کە سێ ماددەی گرنگ و کەمی مەعدەنی - «ئووڕانیۆم»، «تینانیۆم» و «مولیبد نۆم»- و دوو ماددەی نایابتری شیمیایی – ئاوی قورس (Deuterium Oxode) و «تیری تییۆم» [21] لە پێڕوو دەست دەکەون. بۆیە یەکەمین مەئموورییەتی من بۆ دەفتەری سەرۆکوەزیری ئەوە بوو بە سەفەر بچمە پێڕوو و کڕینی ئەو کەرەسانە ڕێک بخەم.

---

[21] - ئاوی قورس و «تیری تییۆم» عادەتەن لە تاقیگەکاندا ئامادە دەکرێن، بەڵام بە منیان گوت کە ئەو کەرەسانە لە سروشت و لەو ناوچانەش کە سنەگلی ڕادیۆ ئەکتیڤیان هەبێ دەست دەکەون. نۆروێژیش یەکێک لەو وڵاتانەیە کە ئەو کەرەسانەیان هەن.

زەماوەنـــدی مــن و «ئــۆرا» رۆژی ١٣ی مارســـی ١٩٨٨ بـــەپێی بەرنامەیـەک کـە پێشـتر دانرابـوو، بـەڕێوە چـوو. ئەمـە، بـووە هـۆی ئـارامیی «ئـۆرا» و دوای ئـەوەی مـاوەی دە ڕوژ مـانگی هـەنگوینی خۆمـان لـە ناوچـەی شـینی ئاسـمانی (نیلـی آبـی) گوزەرانـد، ئـەمن ئامـادەی یەکـەمین مەئموورپـەت بـووم کـە سـەرۆکوەزیـر پێـی سـپاردبووم. دیـارە ئـەو سـەفەرە بیٚمەترسییش نـەبوو، کەرەسـەی مەعـدەنیی پێویسـت بـۆ بەرهـەمهێنانی بۆمبـە ناوکییـەکان تـەنیا لـە ناوچەیـەکی پێرووو دەسـت دەکـەوت کـە لـەژێر دەسـەلاتی گرووپێکی تێرۆریستیی بەناوبانگی قاچاغچیی ماددە سڕکەرەکاندا بوو کە پێیان دەگوتن گرووپی «جادەی درەوشاوە» Shining Path.

بڕیـار بـوو ئـەمن وەک پرۆفیسـۆر «ئـاری بـن – مۆناشـیٚ» بچمـە پێرووو و داوای دەرسگوتنـەوە لـە زانسـتگەی «سـان کریسـتۆباڵ دو هوامانگـا» San Cristoball de Huamanga لـە شـاری ئایـاکووچۆ Ayacucho بکەم. هەر بۆیە بەڵگە و بڕوانامەی پێویست بۆ ئـەو کـارەم پێشـتر ناردبووە ئەو زانستگەیە. ئێستاش کە لە نیۆیۆرکەوە بەرەو پێرووو دەفڕیم، بیرم لـەوە دەکردەوە کـە داخـوا لـە وڵاتـی پێرووو چ-چارەنووسێک چاوەڕێمـە. چەندین سـاڵ پێشـتر «ئابیمائێل گووزمـەن رەینۆسـۆ» Abimael Guzman Reynoso دامەزرێنەری گرووپی «ڕێگای درەوشـــاوە» لــەو زانســـتگەیە دەرســـی دەگوتـــەوە. ئەگـــەرچی «گووزمـەن» لـە سـاڵی ١٩٧٠وە خـۆی شـاردبۆوە و گرووپەکـەی بـە شـێوەی ژێرزەمینـی کاریـان دەکـرد، بـەڵام بەشـی پتـری مامۆسـتایانی زانسـتگەی «سـان کریسـتۆباڵ» لـە ئەنـدامانی گرووپـی «ڕێگـای درەوشاوە» بوون و زۆربەی مامۆستایانێک کە ئەندامی بزووتنـەوەی «ڕێگـای درەوشـاوە» نـەبوون، پێوەنـدییان بـە حیزبـی کۆمۆنیسـتەوە هەبوو.

گووزمەن ڕێبەرێکی ئەفسانەیی بوو و پەیڕەوەکانی پاش مارکس و ستالین، ئەویان بە شمشێری چوارەمی مارکسیزم دەزانی.[22] ساڵی ١٩٨٠ ئەو بە دژی حکوومەتی سەرمایەداریی لیما، خەباتی چەکدارانەی ڕاگەیاند و لەوە بەدواوە گرووپی «ڕێگای درەوشاوە» ببووە هێزێکی بەتوانا. لە ئاکامی ئەوەدا، لە هەموو ناوچەی «ئایاکووچۆ» لە لایەن پریزیدێنت «ئالەن گارسیا»وە حکوومەتی سەربازی ڕاگەیەندرابوو.

ئەمن لە لیماوە بە فڕۆکە بەرەو «ئایاکووچۆ» کەوتمە ڕێ. فڕۆکە-کە پڕ بوو لە ژنانێک کە جلوبەرگی گوشادی خۆجێیی‌یان دەبەردابوو و جووچکەی زیندوویان بەدەستەوە بوون، هەروەها پیاوانی بەساڵداچوو کە هەریەکەی بەستەیەکی بە بەنبەستراویان پێ‌بوو. کەسێک کە لە تەنیشتمەوە دانیشتبوو، پیاوێک بوو لە تەمەنی چل ساڵیدا و وا دەهاتە بەرچاو کە پیاوێکی گەورەیە. ئەو پیاوە کە یەکی بەخۆوە بوو، بە زمانی ئینگلیزی لێی‌پرسیم، ئەمن کێم و بۆچی دەچمە «ئایاکووچۆ» کە ناوچەیەکی سەربازییە و بە ڕووی بێگاناندا داخراوە.

ئەو پێی دادەگرت بزانێ داخوا زانستگە دەرس‌گوتنەوەی منی قبووڵ کردوە و ئەمن مۆڵەتم لە حکوومەتی سەربازی وەرگرتوە یان نا. ئاشکرا بوو کە هێشتا وەڵامی داخوازی دەرس‌گوتنەوەم وەرنەگرتبۆوە و بۆ بەشی دووەمیش پێمگوت دەمەوێ دەگەڵ فەرماندەری عەمەلیاتی سەربازی، سەرهەنگ «ڕافائیل کۆردۆڤا» Rafael Cordova قسە بکەم و مۆڵەتی مانەوە لە ناوچەکە وەربگرم.

هاوسەفەرەکەم گوتی: «چەند سەیرە، چونکە ئەمن خۆم سەرهەنگ کۆردۆڤام.»

---

[22]-شمشێری سێیەمی مارکسیزم دیار نیە، ڕەنگە مەبەست ئەنگلز بێ. (وەرگێڕ)

ئەمن دڵنیا نەبووم کە ئەو سەرهەنگ کوردۆڤایە یان نا، بەڵام پێمگوت، ئەمن ئیسرائیلیم و بەنیازم لە زانستگە دەرس بڵێمەوە و نووسینێکیش لەبارەی گرووپی «ڕێگای درەوشاوە»وە ئامادە بکەم.

لەوکاتەدا کە فڕۆکەکە خەریکی نیشتن بوو، ئەمن باوەڕم هێنابوو کە ئەوکەسەی بەنیاز بووم ببینم، لە تەنیشتم دانیشتوە و ئەم بابەتەش ڕێکەوت نەبوو. ئەو ڕازی بوو، کە پاش گەیشتنمان بە «ئایاکووچۆ» پتر لەو بارەیەوە قسە بکەین. کاتێک فڕۆکەکە لە فڕۆکەخانەیەکی چووکەڵەی ناوچەیەکی بانووی کێوپارە نیشت، دەسبەجێ سەربازان گەمارۆیان دا. جگە لە فڕۆکەخانە و شاری «ئایاکووچۆ» هەموو ناوچەکە بەدەست گرووپی «ڕێگای درەوشاوە»وە بوو. حکوومەتی وێ زۆر وریا بوو کە نەکا ئەو بزووتنەوە شۆرشگێڕە دەستی بە فڕۆکەی دەوڵەتی ڕابگا.

پۆلیسی نهێنی بە وردی کارتی ناسنامەی هەمووانی کۆنترۆڵ دەکرد، بەڵام سەرهەنگ «کوردۆڤا» پێی گوتن کە تەنیا سەیرێکی پاسپۆرتەکەی من بکەن و دوایە ڕێگام بدەن بچمە نێو شار. ئەو دەیەویست پترم قسە لەگەڵ بکا.

ئەمن بە تاکسی چوومە هۆتێل «تووریستا» -کە یادگاری ئەو ڕۆژانە بوو کە خەڵکێکی زۆر بۆ دیتنی ئەو ناوچەیە سەفەری وێیان دەکرد- و بڕیار درا سەرهەنگ دواتر بێتە سەردانم. ئەمن دەمزانی هەروەخت لە ژوورەکەم کە تاڕادەیەک خۆش بوو، تەلەفون بکەم، قسەکانم لەسەر شریت تۆمار دەکرێن. بۆیە تەلەفونم بۆ «ئۆرا» کرد و تکام لێکرد کە تەلەفون بۆ «دوکتۆر»ەکانم بکا و پێیان بڵێ گەیشتوومە «ئایاکووچۆ.»

پاشان چوومە زانستگە و داوام کرد چاوم بە سەرۆکی زانستگە بکەوێ. سکرتێرەکەی چووە ژوورێک و کە هاتەوە داوای لێکردم ٢٠ دەقیقە چاوەڕێ بم. ئەو دەگەڵ من کەوتە قسەکردن و لەپێشەوە گوتی ئەمن نوێنەری ڕێکخراوی نێونەتەوەیی لێخۆشبوونم و پاشان

لەپڕ بابەتەکەی گۆڕی و باسی ئەو کەسانەی کرد کە ساڵ و زەمانی سەردانی «ئایاکووچۆ»یان کردوە.

ئەو گوتی: «زۆر لەوانەی بۆ سەردان دێن کارمەندانی هەواڵگرین و دەیانەوێ بزانن، ڕێکخراوی ڕێگای درەوشاوە چدەکا، بەڵام لەو بارەیەوە سەرکەوتنێکی زۆر بەدەست نایەنن.»

«هیچکەس هیچیان پێنالێ».

«نا، واش نیە. ئەوان گیانی خۆیان لەو ڕێیەدا لەدەست دەدەن و دەکوژرێن.»

سەرۆکی زانستگە بە گەرمی بەخێراتنی کردم و ئەمن بە نیشاندانەوەی دووبارەی پێشینە زانستییەکانم، گوتم، حەز دەکەم لە زانستگە دەرس بڵێمەوە و لەبارەی گرووپی «ڕێگای درەوشاوە»شەوە نووسینێک ئامادە بکەم. ئەو گوتی، ئەو کارە کێشەیەکی نیە، جگە لەوە کە دەبێ مۆڵەتی مانەوە لە ڕێکخراوی سەربازی وەربگری.

ئەو گوتی: «پێمخۆشە بە ڕاشکاوی قسەت لەگەڵ بکەم، ئێمە ئەوانەمان خۆش ناوێ، بەڵام ئەوان دەبێ بوون و مانەوەی تۆ لەم ناوچەیە پەسند بکەن، ئەگینا، لێرە دەرت دەکەن و ئێمەش کێشەمان بۆ دروست دەبێ.»

لێمپرسی،کە بۆچی وا زوو منی قبووڵ کردوە.

سەرۆکی زانستگە شانی هەڵتەکاند و گوتی: «ئێمە ڕابردووەکەت پەسند دەکەین. ئەگەر بتوانی باش دەرس بڵێیەوە، دەتوانی لەم ناوچەیە وەمێنی و ئەگەر نا، دەبێ زانستگە بەجێ بێڵی. ئەگەر کارمەندێکی هەواڵگریی CIA، ئیسرائیل یان هەر دۆزەخدەرەیەکی دیکە بی پێوەندیی بە ئێمەوە نیە.»

زانستگە حوکمی دامەزرانی بۆ دەرکردم و بڕیار درا، ئەمن لە بەیانیی ڕۆژی دواترەوە دەست بکەم بە دەرسگوتنەوە. دیارە گفتوگۆیەکانی من ئەو ڕۆژە تەواو نەببوون. دوانیوەڕۆی ئەو ڕۆژە

سەرهەنگ «کۆردۆڤا» هاتە هۆتێل و ڕاست قامکی لەسەر بابەتەکە دانا. چونکە گوتی: «ئەگەر ئەتۆ کارمەندێکی هەواڵگریی و دەتەوێ بۆ وەدەستهێنانی زانیاری، بخزێیە نێو گرووپی ڕێگای درەوشاوە، خۆت زەحمەت مەدە. چونکە سوپای پێڕوو بۆخۆی کارمەندی هەواڵگریی زۆرن و ئێمە پێویستیمان بە یارمەتیی تۆ بە هەر ڕێکخراوێکەوە بەسترابی، نیە.»

ئەمن بۆم دەرکەوت ئەو قسانەی لەوە دوا دەیانکەم، لەوانەیە سەرم تێدا بەرن. دەمزانی کە ئەو لەبن چاکەتەکەی چەکی پێیە و دواتریش تێگەیشتم کە ئەو بە ئاسانی دەسەڵاتی ئەوەی هەبووە، چەکەکەی بەکار بەرێ. بەڵام، لە ئیسرائیل فێر کرابووم، چبڵێم.

«سەرهەنگ کۆردۆڤا، تکایە لێمببوورە، بەڵام ئەمن نیازم هەیە شتێکت پێبڵێم. ئەتۆ بتەوێ یان نەتەوێ ئەمن لێرە دەمێنمەوە.»

پێکەنی و گوتی: «کەوایە باشترە بۆم ڕوون بکەیەوە چۆن دەتوانی بەبێ ویستی ئێمە لێرە وەمێنی.»

«ڕێگام بدە مەسەلەی سێ مووشەکە Stingerەکەت وەبیر بێنمەوە.»

نێوچاوانی تێکنا و گوتی، ئەتۆ ئێستا دەبێ بزانی دۆخەکە گۆڕاوە.

گوتم: «ئێمە ئاگادارین کە ئەتۆ بۆخۆت سێ مووشەکی Stingerت لە فرۆکەیەکی هێڵی هەوایی شوورەوی (ئێر فلووت) لە لیما وەرگرتوون و بە بزووتنەوەی ڕێگای درەوشاوەت فرۆشتوون. زۆر کەس لە ئیسرائیل ئاگایان لەو مەسەلەیە هەیە و ئەمن دەمەوێ لێرە ڕاوەستم.»

ئەو بە ڕقەوە سەیرێکی کردم و گوتی: «کەوایە ئەتۆ دەتەوێ باجم لێوەرگری.»

«نا، سەرهەنگ ئەمن دەمەوێ بڵێم ئێمە زانیاریمان لەسەر تۆ زۆرە و باشتر ئەوەیە هەوڵ بدەی ئەمن لەم ناوچەیە ساغ و سلامەت بمێنمەوە. ئامانجی من تەنیا دەرسگوتنەوە لە زانستگەیە و بەڵێن

دەدەم هیچ کارێکی ڕووخێنەرانە دژی حکوومەت یان سوپای پێڕوو ئەنجام نادرێ.»

«ئەتۆ زۆر بەگیرێ. پاشان چۆنت زانیاری لەسەر مووشەکی Stinger بەدەست هێناوە؟»

دیارە ئەمن چۆنیەتیی بابەتەکەم بەو نەگوت، بەڵام ئێمە ئەو زانیارییەمان لە گفتوگۆیەکی دۆستانەی نێوان سکرتێری دووەمی باڵیۆزخانەی ئیسرائیل لە لیما و پاشکۆی بازرگانیی سۆڤیەت بەدەست هێنابوو.

پاش ئەم وتووێژە، بۆم دەرکەوت کە سەرهەنگ بڕیاری داوە، مۆڵەتی مانەوەم بداتێ. ئەو تەلەفونەکەی هەڵگرت و داوای لە تەلەفونچییەکە کرد ژمارەیەکی بۆ وەرگرێ و لەبارەی مۆڵەتی مانەوەی منەوە هێندێ دەستووری دان.

دوای ئەوەی سەرهەنگ هۆتێلی بەجێ هێشت، ئەمن بۆ گەڕان چوومە نێو شار. زانستگە بەسەر شاریدا دەڕوانی و دەیانگوت شار ٤٠ کلیسای لێیە. گەڕیدەکان زۆریان حەز لە دیتنی ئەم شارە دەکرد و هەتا ساڵی ١٩٨٠ کە ئەمنیەتی شار لەنێو چوو و گەڕیدەکان ئەمنیەتیان نەما و بە ئاسانی دەکوژران، دەستەدەستە خەڵک دەهاتنە سەردانی ئەم شارە. پاش ساڵی ١٩٨٥ شارەکە بە ڕەسمی بە ڕووی خەڵکی گەڕیدەدا داخرا و هەربۆیە ٢٥٠٠٠ حەشیمەتی ئەو شارە وا بە وردی دەمنەوە ڕادەمان، چونکە دیار بوو بێگانەم.

وەختێک لە گەڕانی نێو شارەوە چوومەوە هۆتێل، مۆڵەتی مانەوەکەم لەبن دەرگای ژوورەکەم دانرابوو. هەر کە دەستم بە خوێندنەوەی مۆڵەتەکە کرد، ئەفسەرێکی پۆلیس هاتە ژوورەکەم و گوتی، ئەو دەزانێ کە ئەمن پرۆفیسۆرێکی گرنگی ئیسرائیلیم و دەیەوێ ئەوەندی بکرێ بۆ پاراستنی گیانی من هەوڵ بدا. ئەو گوتی، بۆ ئەو مەبەستە، دەبێ ئەتۆ هەموو ڕۆژێ تەلەفون بۆ پۆلیس بکەی و ئاگاداری بکەیەوە کە لەکوێی. ئەمن پێمگوت، ئێوە بۆ گیانی من

نیگەران مەبن. ئەگەر ئەوان کارێکیان بەمن هەبوو، ئەمن لە زانستگە دەبم.

یەکەمین وتاردانی من لە زانستگە بە سەرکەوتوویی تەواو بوو. بابەتی وتارەکەم ئابووری و سیستمی کیبووتزی ئیسرائیلی بوو. دوای تەواوبوونی وتارەکە، سەرۆکی بەشی ئینگلیزیی زانستگە بەناوی «ڕۆبیرتۆ» پێوەندیی پێوە کردم. دەبێ بگوترێ کە ئەو لەڕاستیدا لە سەرۆکی بەشی ئینگلیزیی زانستگە کە خۆی بەو ناوە دەناساند، هەورازتر بوو. چونکە ئەندامی ڕێبەریی نیشتمانیی El Sendero Luminoso ڕاپەڕینی «ڕێگای درەوشاوە» بوو.

لێیم پرسی: «ئەتۆ ناترسی سوپا بتگرێ؟»

ئەو سەری ڕاوەشاند. بەپێی قانوون و ڕێوشوێنەکانی پێڕوو، ئەندامەتیی هەموو ڕێکخراوێک ئازادە، مەگەر کەسێک چەک هەڵبگرێ یان کار بۆ ڕووخاندنی دەوڵەت بکا. سوپا، ئەندامانی بزووتنەوەی «ڕێگای درەوشاوە»ی لەژێر چاوەدێریدا بوو، بەڵام لە بنەوە لەنێوان سوپا و بزووتنەوەی ڕێگای درەوشاوەشدا لێکتێگەیشتنێک هەبوو.

«ڕۆبێرتۆ» بۆ نانی نیوەڕۆ بانگهێشتنی کردم بۆ ماڵی خۆی لەوێ بۆی ڕوون کردمەوە کە بزووتنەوەی ڕێگای درەوشاوە هێندێ بیروباوەڕی بۆ حکوومەتی پێڕوو هەیە کە پاش بەدەستەوەگرتنی دەسەڵات جێبەجێ بکرێن. وەک ئەوە کە لە پێڕوو بازاڕی ئازاد، دەبێ لەسەر بناخەی سیستمی کیبووتز دروست بێ، نەک سیستمی تاکەکەسی. ئەو سیستمە هەروا دەبێ پشت بە فەرهەنگی خەڵکی پێڕوو (Inca) ببەستێ کە پێش هاتنی ئیسپانیاییەکان بۆ ئەم ناوچەیە سیستمی بەکۆمەڵیان هەبووە. «ڕێگای درەوشاوە» پێوەندیی ئیدئۆلۆژیکیی تەنیا دەگەڵ ئالبانی هەبوو کە پاش ستالین پێوەندییەکانیی دەگەڵ سۆڤیەت بەستبوو.

لە «ڕۆبێرتۆ»م پرسی، دەتوانم چاوم بە دامەزرێنەری بزووتنەوەی «ڕێگای درەوشاوە» بکەوێ.

«نا، چونکە ئەو نەماوە.»

بەڵام کەمێک دواتر، پێی لێنا کە «گووزمەن» ماوە. ئەو گوتی: «دیتنی گووزمەن زۆر دژوارە و بەتایبەتی کێشەی گەورەی ئەم دیدارە ئەوەیە کە ئەندامانی سوپا ئەو دیدارە دەخەنە ژێر چاوەدێری.»

بەو حاڵە گوتی، بۆ ئەوەی خزمەتێکم پێکردبێ، ئەوپەڕی هەوڵی خۆم بۆ ڕێکخستنی ئەو دیدارە دەدەم.

دوایە لەحاڵێکدا یەکێک لە قژە تەنکەکانی ڕادەکێشا، گوتی: «ئەمن خەریکە قژم لەدەست دەدەم. دەڵێن لە ئینگلستان دەرمانێک هەیە کە وەرینی موو چارەسەر دەکا. دەکرێ ئەو دەرمانەم بۆ دابین بکەی؟»

گوتم، ئەوپەڕی هەوڵی خۆم لەم ڕێیەدا دەخەمە کار. لێرەدا پێوەندییەکانم بوونە دۆستایەتیی کەسی و ئەمە زۆر دڵخواز بوو.

ئەو شەوە، سەرهەنگ «کۆردۆڤا»ش هاتە سەردانم و گوتی، حەز دەکەم قسەت لەگەڵ بکەم. کاتێک ئەو هێشتا لەوێ بوو، «ڕۆبێرتۆ»ش دەگەڵ کەسێک کە خۆی بەناوی «مارکووس» مامۆستای زمانی ئینگلیزی و ئەندامی حیزبی کۆمۆنیست دەناساند، هاتن.

ئەمن ئاماژەم بە سەرهەنگ «کۆردۆڤا» و میوانە تازەکان کرد و گوتم: «پێم وایە ئێوە یەکتر دەناسن.»

«ڕۆبێرتۆ» بە بێزەوە سەیرێکی سەرهەنگ «کۆردۆڤا»ی کرد و گوتی: «بەڵێ، ئەمە کەسێکە کە جووتیاران دەکوژێ.»

سەرهەنگ «کۆردۆڤا» هەستا و دەستی بۆ تۆقەکردن درێژ کرد، بەڵام تازەهاتووەکان وەڵامێکی جووڵەی دەستی ئەویان نەدایەوە. ئەمن چەند دەقیقە هەوڵم دا سەهۆڵی پێوەندیی ساردی ئەوان دەگەڵ یەکتر، بشکێنم و بۆ ئەو مەبەستە گوتم، بۆ مرۆڤێکی ئیسرائیلی چەند جوانە ئەمانە لێک نزیک بکاتەوە. ئەمن داوای قاوەم کرد. بەڵام «کۆردۆڤا» نارەحەت دیار بوو. ئەو سەرەنجام گوتی، دەبێ بڕوا و

ئێمەی بەجێهێشت. کاتێک ئەو خەریکی ڕۆیشتن بوو، «ڕۆبێرتۆ» گوتی: «لەوە زیاتر جووتیاران مەکوژە.»

سەرهەنگ بە پێکەنینێکی دەستکردەوە گوتی: «ئێمە هەوڵ دەدەین لە شەڕی ئێوەیان بپارێزین.»

چەند ڕۆژ دواتر، پاش ئەوەی چەند وتاری دیکەم لە زانستگە پێشکێش کردن، بە فڕۆکە چوومە لەندەن و تەلەفونم بۆ «نیکۆلا دیڤیس» کرد. کاتێک داوام لێکرد شووشەیەک لوسیۆنی موو بۆ «ڕۆبیرتۆ» بنێرێ، پێی وابوو ئەمن شێت بووم، بەڵام ئەمن دەمزانی ئەم کارە چەندی خێر بۆ پێوەندییە گشتییەکانی ئێمە دەبێ. «دیڤیس» پێیگوتم، وێنەگرێکی گۆڤارەکەی ئێمە کە ئەومان دەناسی، دەگەڵ ڕۆژنامەنووسێک بە ناوی «باربارا دۆر» لە لیما دەژی. ئامۆژگاریی کردم کە بە هۆی ئیسرائیلەوە پێوەندیی پێوە بگرم، لەوانەیە سوودی بۆ ئێمە هەبێ.

ئەمن بەهۆی تەل ئەبیبەوە بنۆم دەرکەوت «باربارا دۆر» هەواڵنووسێکی نیوەوەختە کە لە پێڕوو کار بۆ Financial Timesی لەندەن دەکا. ئەو شەوە، پاش ئەوەی تەلەفونم بۆ وێنەگرەکە «پیتەر جۆردان» Peter Jordan کرد، ئەمن و «باربارا دۆر» و «پیتەر جۆردان» سێبەسێ پێکەوە نانمان خوارد. ئەمن ڕوونم کردەوە کە لە «ئایاکووچۆ» دەرس دەڵێمەوە و «جۆردان» بۆ «دۆر»ی ڕوون کردەوە کە ئەمن تا ساڵێک لەوە پێش کارم بۆ ڕێکخراوی هەواڵگریی ئیسرائیل کردوە. «دۆر» زۆر چووە ژێر کاریگەریی ژیاننامەکەی من و هەرسێکمان ماوەی سەعاتێک پێکەوە قسەمان کرد. «دۆر» ژنێکی زۆر زیرەک بوو و ئەمن دڵنیا بووم ڕۆژێک کەلکی بۆ من دەبێ.

وەختێک چوومەوە «ئایاکووچۆ» «ڕۆبیرتۆ» پێیگوتم: «داخوازەکەت جێبەجێ دەبێ.»

«ڕۆبێرتۆ» کات و ڕۆژێکی دانا کە ئەمن بچمە ماڵەکەی. چەند ڕۆژ دواتر هەر بەوجۆرە کە فێری کردبووم، چوومە ماڵەکەی. لەوێ

وانێت (پیکاب)ێک ئامادە بوو. داوایان لە من کرد لە پشتەوەی وانێتەکە سوار بم. وانێتەکە پەنجەرەی نەبوو. ئەمن لە پشتەوە دانیشتم و کاتێک وانێتەکە لە قووڵکەیەکەوە دەکەوتە قووڵکەیەکی دیکە، ئەمنیش بەملاولادا دەکەوتم. پاشان لە درێژەی ڕێگاکەدا وانێت لە پشت ماڵێک ڕاوەستا و لەوێ داوا لەمن کرا بچمە وانێتێکی دیکەی وەک ئەوەی پێشوو کە ئەویش پەنجەرەی نەبوو. لەوێڕا تا ئەو جێی مەبەست بوو، دوو سەعاتەڕێ بوو.

منیان ڕێنوێنی کرد بۆ ماڵێکی دێهاتی کە بەهۆی گرووپێکی کلاشینکۆفبەدەست دەپارێزرا. پاشان چوومە ژوورێک کە پیاوێکی سەرڕووتاوەی لێبوو لە تەمەنی پەنجا ساڵیدا کە وەک پرۆفیسۆری کالێجەکان دەچوو. پیاوەکە، یەکی خەپەتۆڵەی دەستەپیاو (نە کەڵەگەت نە کورتەبالا) بوو کە چاکەتێکی سپۆرتی دەگەڵ کراسێکی ئێخەکراوەی بێ کراوات (بۆینباغ)ی دەبەردا بوو. ئەو بەرەو لای ئێمە هاتە پێش و بێئەوەی بزەی بێتێ، خۆی بە ناوی «ئێبی مائیل گووزمەن» ناساند.

پێمگوت: «بۆ پیاوێکی مردوو، جەنابت زۆر زیندوو دیاری.»

ئەو زەردەیەکی هاتێ کە نیشانەی متمانەبەخۆبوون و سەرنج-ڕاکێشیی ڕوخساری بوو. چاوەکانی تیژ و ئارام دەهاتنە بەرچاو. «گووزمەن» پیاوێکی زۆر بەهۆش و بەدگومان دیار بوو. بەمنی گوت: «ئەتۆ کێی؟ کارمەندی CIA، مۆساد؟ KGB؟ هەرکەس بی، مرۆڤێکی خۆشبەختی کە ئەو هەموو ڕێگایەت بڕیوە و هێشتا ماوی.»

ئەمن ڕاستییەکەم پێگوت. گوتم ئەمن ڕاوێژکاری تایبەتی هەواڵگریی دەفتەری سەرۆک وەزیری ئیسڕائیلم و حەز دەکەم موعامەلەت لەگەڵ بکەم.

«گووزمەن» سەری ڕاوەشاند و سەری سوڕ ما. پێیگوتم: «ئەتۆ هاتوویە ئایاکووچۆ، ڕۆبێرتۆ تۆی دەگەڵ کۆردۆڤای پیاوکوژ دیوە و ئێستاش بە من دەڵێی کە ئەفسەری هەواڵگریی ئیسڕائیلی. دۆستانی

ئێمە لە سوێد لەبارەی تۆوە هێندێ زانیارییان داوینێ و ئێمە خەریکی لێکۆڵینەوەی کەسیەتیی تۆین و بۆخۆت دەزانی ئەگەر لێرە نەڕۆی، ئێمە دەتکوژین.»

دەگەڵ ئەو ناوبانگە خەراپەش کە بزووتنەوەی ڕێگای درەوشاوە هەیبوو، ئەمن لە قسەکانی نەترسام. «گووزمەن» لە قسەکانیدا زۆر جیددی دیار نەبوو و ئەگەر بمەوێ ڕاستییەکەی بڵێم، ئەمن چێژم لە ئەنجامدانی ئەو مەئموورییەتە وەردەگرت. پاش چەندین ساڵ کە دەگەڵ ئێرانییەکان بەو پووڵە زۆرە موعامەلەی کەرەسەی شەڕم کردبوو، ئەو مەئموورییەتە بۆمن خۆش بوو. دیارە ئەمن لەبارەی شۆڕشگێڕانی گەورەی وەک فیدل کاسترۆ، چ گیڤارا و هۆشی مینە زۆرم خوێندبۆوە. بەڵام لێرە ئەمن لەگەڵ شۆڕشێکی دەستی یەکەم بەرەوڕوو ببووم کە لە قووڵایی [چینەکانی] خوارەوەی کۆمەڵ خەریکی ڕووان بوو و ئەم دەرفەتە بۆ من بەقیمەت دیار بوو.

«گووزمەن» داوای قاوەی کرد و دەگەڵ من بە شێوەیەکی دۆستانە کەوتە گێڕانەوەی مێژوولکەی ژیانی. ئەو بۆی باس کردم کە خاوەنی خوێنی یەهوودییە و ئەم بابەتە تووشی سەرسوڕمانی کردم. ئەو کوڕی ژنێکی کارەکەری خەڵکی پێڕوو بووە کە لە ساڵەکانی دەیەی ١٩٢٠دا، لە ماڵی یەکێک لەو جوولەکە ئەڵمانییە پووڵدارانە کە لە ئورووپاوە کۆچیان کردوە بۆ پێڕوو، کاری کردوە. دایکی لە مێردێک کە ژنەکەی منداڵی نەبووە زگپڕ بووە. کاتێک ژنی ئەو پیاوە لە زگپڕیی دایکی [گووزمەن] ئاگادار بووە ئەوی لە ماڵەکەی دەرکردوە.

بابی «گووزمەن» بەر لەوەی ئەو لەدایک بێ مردوە و هێشتا منداڵ بووە کە دایکیشی کۆچی دوایی کردوە. پاشان نەنکی کە خەڵکی پێڕوو بووە، «گووزمەن»ی داوەتە زڕدایکەکەی و ئەویش ڕازی بووە کە گەورەی بکا. ئەو «گووزمەن»ی بۆ خوێندن ناردۆتە زانستگەیەک لە سوێد و «گووزمەن» پاش تەواوبوونی خوێندن

گەڕاوەتەوە پێڕوو و دەستی کردوە بە دەرسدانی فەلسەفەی خۆی کە تێکەڵێک بووە لە ئیدئۆلۆژیی کیبۆتز و ئینکا.

لە یەکەمین دیدار لەگەڵ «گووزمەن»دا ئەمن ئاشقی کەسایەتیی موگناتیسیی ئەو بووم. ئەو پیاوێکی زۆر خوێندەوار و بیرمەند بوو. لەحاڵێکدا توندەتەبیات و خۆبەزلزان دیار بوو، بەڵام خاوەنی بەهرەی قسەخۆشییش بوو.

ئەمن ئەو شەوە لەوێ مامەوە و بەیانیی ڕۆژی دواتر بردیانمەوە «ئایاکووچۆ». پاش حەوتوویەک دەرس‌گوتنەوە، سەفەرێکی کورتی لیمام کرد. لە گەڕانەوەم بۆ «ئایاکووچۆ»دا، دووبارە هەر بەو تەدارەکی جاری پێشوو، چوومە سەردانی «گووزمەن».

گووزمەن گوتی: «ئەتۆ بۆ لێرە ناڕۆی، چیت لە ئێمە دەوێ؟»

ئەمن ئامانجی سەفەری خۆم بۆ ئەو ناوچەیەم بۆ گووزمەن شی کردەوە. هەروا بۆم ڕوون کردەوە کە ئەوان پێشتر لە لیما ئەو کەرەسە مەعدەنییەیان بە سەوداگەرێکی فەڕانسەیی بە ناوی «ریچت مایەر» Richtmeyer فرۆشتوە. ئەوەشم ڕوون کردەوە کە ئەو کەرەسانە کە لە شەڕە تاکتیکییەکاندا بەکار دەبرێن بۆ پەرەپێدانی بەرنامەی ئەتۆمیی ئیسرائیل پێویستن. لێشم زیاد کرد کە لە تەنیشت پەیمانی ئاشتی، ئەو کەرەسە جەنگییانە باشترین ئامرازی بەرگری بۆ ئیسرائیلن.

«گووزمەن» بە شک و گومانەوە سەیرێکی منی کرد و پرسی: «ئەم کارە بۆ بزووتنەوەی ڕێگای درەوشاوە چسوودێکی هەیە؟»

«پوول و ئێوەش بەو پوولە دەتوانن کۆمەگی جووتیارانی ئەم ناوچەیە بکەن.»

«قسەکەت ڕاستە، بەڵام کەرەسەی شەڕ چی؟»

ئەمن سەرم ڕاوەشاند و گوتم: «ئەمە ناکرێ. ئیسرائیل دەگەڵ پێڕوو پێوەندیی دۆستانەی هەیە و بۆیە ناتوانێ کەرەسەی شەڕتان

بداتێ. بەڵام کاتێک پووڵتان هەبێ، دەتوانن چەکی پێویستی خۆتـان لـە جێیەکی دیکە بکڕن.»

ئەو گوتی، ئێمە بۆ دەستپێکردنی موعامەلەکە ١٠ میلیۆن دۆلارمـان دەوێ. لەپێشـــدا دەبـێ دراوەکـــە لـــە بـانکێکی ئورووپـایی بڕژێتـــە حیسابەوە و پاشان ئێمە لەبارەی موعامەلەکەوە دەکەوینە وتووێژی جیددی. بەوحاڵە، هێشتا ئەو متمانەی تەواوی بە قسە و ئامانجەکەی من نەبوو.

لـە لیمـا تەلـەفونم بـۆ «ئـەڤی پزنـەر» ڕاوێژکـاری سـەرۆکوەزیـر «شامیر» کرد و پێمگوت کە هەموو شتێک بەپێی بەرنامەکە بە باشی جێبەجێ بووە. ئەو ژمارە حیسابەشم دایە کە درابوو بە من و گوتی پووڵەکـە دەڕژێتـە حیسـاب. نەخشـەکە وا دانرابـوو کـە ٤ فڕۆکـەی سێسـنا لـە کۆلۆمبیـاوە ئامـادەی فـڕین دەبـن بـۆ فڕۆکەخانەیـەک کـە پاشان «گووزمەن» دیاریی دەکا و ئەو فڕۆکانە کەرەسە کڕاوەکان دەگوازنـەوە ڤـەنزۆئیلا. بۆیـە کۆلۆمبیـا وەک خـاڵی دەسـتپێکی فـڕین دیاری کرابوو، کە ئەگەر فڕۆکەکان لە ڕێگادا ئاشکرا بوون، پێڕوویی-یـەکان وا بیـر بکەنـەوە کـە کۆکاییینیـان پێیـە. دەبـێ بـزانین کـە زۆر فڕۆکەی چووکەڵە لە پێڕووڕا گەلای کۆکایان دەگوازتەوە.

پاشان ئەمن تەلەفونم بۆ «باربارا دۆر» کرد و لێمپرسی داخوا پێی خۆشە وتووێژ دەگەڵ «گووزمەن» بکا. ئەو بە بیستنی ئەو خەبەرە یەکجار خۆشحاڵ بوو و هەژا. بەڵام، ئامانجی من لەوکارە ئەوە بوو کـــە بـــەو وتـــووێژە بـــە ســـەرۆکەکانم بســـەلمێنم کـــە بەڕاســـتی «گووزمـەن»م دەسـت کـەوتوە، چونکـە دەنگۆ بـوو کـە «گووزمـەن» مردوە و ئەگەر ئەو دەنگۆیە گەیشتبایەوە سەرۆکەکانی من، ئـەوان لـە دانی ١٠ میلیۆن دۆلار بە بابایەکی مردوو ناڕەحەت دەبوون.

دوای تەلـەفون بـۆ «باربـارا دۆر» بـۆم دەرکـەوت کـە هـەنگاو بـە هەنگاو بەدوامەوەن، بـەڵام دیـارە ئـەوە کـاری دەوڵـەتی پێڕوو نـەبوو. ئـەمن قسـەم لەگـەڵ «پیتـەر جۆردان» دۆسـتە وێنەگرەکـەی «نیکۆلا

دیڤیس» کرد و ئەو ئاگاداری کردم کە «باربارا دۆر» پێوەندیی من دەگەڵ بزووتنەوەی ڕێگای درەوشاوەی بۆ کووبایییەکان باس کردوە. لەوێدا تێگەیشتم کە کووباییەکان لە خەبات دژی گرووپی ڕێگای درەوشاوەدا کۆمەگی حکوومەتی پێڕوو دەکەن. ئەمن نە پێم خۆش بوو بکەومە بەر ڕاونانی هێزە هەواڵگرییەکان و نە حەزم دەکرد «باربارا دۆر» دەست دەکارەکانم وەردا و ببێتە سەربارم. بۆیە تەلەفونم بۆ سەرۆکی نوێنەرایەتیی ئیسرائیل لە پێڕوو کرد و بە زوویی ڕێگاچارەیەک بۆ کارەکە دۆزرایەوە. بەوجۆرە کە بڕیار درا، پۆلیسی دژی تێرۆریزم بە تۆمەتی دیدار لەگەڵ گرووپی ڕێگای دەرەوشاوە «باربارا دۆر» بگرێ و پاشان ئێمە بە قازانجی ئەو بچینە نێو بابەتەکە و لە گرتووخانە ڕزگاری بکەین. بەوجۆرە، پاش ئازادبوون ئەو سوپاسگوزاری ئێمە دەبێ و هاوکاریمان دەکا.

ئێمە بیرمان کردەوە، کە گیرانی وی، هەرنەبێ وای لێدەکا لەبارەی دانی زانیاری بە کووباییەکانەوە پتر بیر بکاتەوە. ئەوکاتەی «باربارا دۆر» لە ئیدارەی ناوەندیی پۆلیس گیرابوو و نوێنەرانی باڵیۆزخانەکانی بریتانیا و ئەمریکا دەگەڵ کارمەندانی ئەنجومەنی ڕۆژنامەنووسە دەرەکییەکان داوای ئازادیی ئەویان دەکرد، ئەمن تەلەفونم بۆ سەرۆکی پۆلیسی دژی تیرۆریزم کرد. ئەو گوتی، ئاگام لە نەخشەکەی ئێوە نەبووە، بەڵام داوام لێکراوە کە هەروەخت ئەتۆ چوویە ئیدارەی ناوەندیی پۆلیس، لەسەر داوای تۆ «باربارا دۆر» ئازاد بکەم. بۆیە ئەمن وام ڕێکخست کە «باربارا دۆر» بزانێ لەسەر داوای من ئازاد کراوە.

ئەو شەوە ئەمن سەرێکی ماڵی «باربارا دۆر»م دا و ئەو سوپاسی کردم. چونکە قەرار بوو چاوم بە سەرهەنگ «کۆردۆڤا» کە سەری لیمای دەدا، بکەوێ، «باربارا دۆر»م بەجێ هێشت. بەڵام، سەرهەنگ «کۆردۆڤا» وەختی بۆ دیتنی من نەبوو، چونکە پێنج لە ئەفسەرەکانی بەهۆی ئەندامانی گرووپی ڕێگای درەوشاوەوە کوژرابوون.

ئەو بە تووڕەیی گوتی: «ئەمن دەبێ هەقی ئەوانە بنێمە دەستیان و دەرسێکی باشیان دابدەم. ئەمن هەمووانیان لەنێو دەبەم.»

گوتم: «چما شێت بووی؟ ئەتۆ ناتوانی هەموو خەڵکی گوندەکە سزا بدەی، مەگەر ئەوان چییان کردوە؟»

بەڵام سەرهەنگ «کۆردۆڤا» گوێی لەو قسانە نەبوو. ئەمن بە پەلە چوومەوە ماڵەکەی «باربارا دۆر» و تکام لێکرد تەلەفون بۆ ڕادیۆی CBS کە لەوێ کاری دەکرد، بکا و داوا بکا خەبەری کوژرانی پێنج ئەفسەری سوپای پێروو و ئەوە کە سەرهەنگ «کۆردۆڤا» دەیەوێ بەتۆڵەی وان دەست بداتە کوشتاری بەکۆمەڵی خەڵکی گوندەکە، لە ڕادیۆ بڵاو بکرێتەوە. ئەمن پێموابوو ئەگەر بابەتەکە لە ڕادیۆ بڵاو بێتەوە، سەرهەنگ «کۆردۆڤا» واز لە کوشتاری بەکۆمەڵی خەڵکی دێیەکە دێنێ. بەڵام، کارمەندانی ڕادیۆی CBS بەویان گوت، ئەگەر باسەکە لە ڕادیۆ بڵاو بێتەوە و سەرهەنگ «کۆردۆڤا» کارێک بۆ کوشتاری خەڵکی گوندەکە نەکا، ئەودەم بڵاوکردنەوەی خەبەرەکە بێئاکام دەبێ. بەوجۆرە، خەبەرەکە هەرگیز لە ڕادیۆ بڵاو نەبۆوە. چەند ڕۆژ دواتر، ئەمن لە ڕۆژنامەی El Diarioی پێروودا کە هی گرووپی ڕێگای درەوشاوە بوو، خوێندمەوە کە دەیان کەس لە خەڵکی بێگوناحی گوندەکە کوژراون.

چونکە لە نیزیکەوە ئاگام لەو ڕووداوە بوو، بابەتەکە منی زۆر هەژاند. لە ڕاستیدا ئەم ڕووداوە پتر لە کوشتاری بەکۆمەڵی شەڕی ئێران- عێراق کە لەوێدا بەرپرسیارەتیی ڕاستەوخۆم هەبوو، کاری تێکردم. ئەمن تێگەیشتم کە پێویستیم بە حەسانەوە هەیە، بۆیە سەرەتای ئاوریلی ساڵی ١٩٨٨ گەڕامەوە ئیسرائیل و حەوتوویەک لەوێ مامەوە. دیداری «ئۆرا» کە زگپڕییەکەی ئەوی سەنگینتر کردبوو، دیمەنێکی دڵگری بۆ من هەبوو.

ئەوکاتەی ئەمن لە ئیسرائیل بووم، کاری گوازتنەوەی کەرەسە مەعدەنییەکان بۆ ئیسرائیل ڕێکخرا و بڕیار درا کارمەندانی

هـەواڵگریی لۆژیسـتیکیی ئیسـرائیل لەپێشـدا بچنـە کۆلۆمبیـا و دوای بـەکرێگرتنی چەنـد فڕۆکەیـەک کەرەســەکە بەرنـە فڕۆکەخانـەکانی ڤەنزۆئیلا. ئەو فڕۆکانـەی بۆ ئـەو مەبەسـتە دیاری کرابوون، جۆری دوو مـاتۆڕەی هـاتوچوو بـوون کـە کورسـییەکانیان بۆ ئـەو مەبەسـتە هەڵـدەگیران. قاچاغچییـە کۆلۆمبیـاییـیـەکانی مـاددەی هۆشـبەر، بـۆ قاچاغی مادده هۆشبەرەکان ئەم شێوەیەیان بـەکار دەبرد و دەوڵـەتی پێـڕوو هـیچ کۆسـپێکی نەدەخسـتە سـەر ڕێگایـان، چونکـە قاچـاغی کەرەسـە هۆشـبەرەکان ڕێگایـەک بـوو بۆ پەیداکردنی دراوی بێگانـە. دەوڵـەتی پێـڕوو ئەوەنـدە پێویسـتیی بـە دراوی بێگانـە هـەبوو، کـە تەنانـەت بـە نرخـی بەردرانـەوەی فڕۆکـەی هـەڵگری مـاددەی هۆشـبەر بەهۆی گرووپی ڕێگای درەوشاوە یـان جووتیارەکانیشـەوە، پێشـی بـە کارەکانیان نەدەگرت.

ئێمـە هـەروەها وامـان کـرد کـە کەشـتییەکی ئیسـرائیلی لـە بەنـدەری ڤەنزۆئیلا ئامادە بێ و کەرەسـەکان بگوازێتەوە بۆ ئیسـرائیل. ڕایەڵکـەی هــەواڵگریی ڤــەنزۆئیلا و ئیســرائیل پەیوەندییــەکی گــەرمیان لــەنێودا هــەبوو و ڤــەنزۆئیلا کێشــەیەکی بـۆ عەمــەلیاتی ئیســرائیل دروســت نەدەکرد.

نێوەڕاستی مانگی ئاوریل کاتێک گەڕامـەوە لیمـا، بـەوجۆرەی پێشـتر بە تەلەفون قەرارمان دانابوو، «باربارا» لە فڕۆکەخانە چـاوەڕێم بـوو. ئەمن پێمگوت، ئیسـرائیلییەکان تۆیـان لـە زینـدان ڕزگـار کـردوە، ئـەتۆ کارێکیان بۆ بکە. دیارە ئەمن چـاوەڕوانیی کـارێکی گـرنگم لـەو نـەبوو. تەنیا لێمدەویست دەگەڵ من سەفەری «ئایاکووچۆ» بکا تـا هـیچ نـەبێ دڵنیا بـم ڕۆژنامەنووسـێک ئاگـای لـێم دەبێ. دیـارە وەختێـک نوێنـەری ڕۆژنامەیـەک لـە مەسـەلەیەک ئاگـادار بـێ، بارودۆخەکـە زۆر دژوار نابێ.

باربـارا ڕازی بـوو کـە دەگـەڵ مـن بفـڕێ بـۆ «ئایـاکووچۆ». کاتێـک گەیشـتینە فڕۆکەخانـە، پـۆلیس سـڵاوی لـەمن کـرد کـە ئیـدی ببوومـە

تەماشاچییەکی ئاشنا. بەڵام «باربارا»ی ڕاگرت. ئەمن بە ئەفسەرانی پۆلیسم گوت کە ئەو هاوسەفەری منە و بۆیە ڕێگایان دا بچێتە نێو شار. ئێمە بە تاکسی چووینە هۆتێل و ڕاست سەعات ١٢ی نیوەڕۆ ئەندامانی «ڕێگای درەوشاوە» هێرشیان کردە سەر بنکەیەکی پۆلیس و شەش ئەفسەری پۆلیسیان کوشت. پاشان ئەوان بە بڵاوکردنەوەی بەیاننامەیەک ڕایانگەیاند کە ئەوکارەیان بە تۆڵەی کوشتاری جووتیاران بووە و لەمەودواش دیسان عەمەلیاتی تۆڵەئەستاندنەوە بەڕێوە دەبەن.

ئەو شەوە ئەمن «باربارا»م لە هۆتێل بەجێ هێشت و بە پێیان چوومە ماڵی «ڕۆبێرتۆ». ئەو داوای لە من کردبوو سەعات ٨ی دوانیوەڕۆ لە ماڵەکەی بم. کاتێک گەیشتمە نزیک ماڵەکەی، لەنەکاو تەقە دەستی پێکرد و دەنگی قیژە و هەرا و شیوەن و گریان لە دەوروبەر بەرز بۆوە. ئەمن دەسبەجێ لەسەر زەوی درێژ بووم. وەختێک تەقە ڕاوەستا، بەپەلە چوومە ماڵی «ڕۆبێرتۆ». لەحاڵێکدا لێی توورە بووم گوتم، بۆچی وەختێکت بۆ دیداری من داناوە کە لەوانە بوو گیانم بکەوێتە مەترسییەوە.

وەڵامی دایەوە: «ئێمە ناتوانین لەبارەی عەمەلیاتی خۆمانەوە پێشتر قسە بکەین.»

ئەمە ڕیزە عەمەلیاتێک بوو کە لەودا گرووپی «ڕێگای درەوشاوە» پەلاماریان بردە سەر بارەگای پۆلیس و هەموو زیندانییەکانی وێیان ڕزگار کرد.

لەنەکاو کارەبای ئەو ناوچەیە بڕا. «ڕۆبێرتۆ» لە تاریکیدا پێی‌گوتم، ئێستا ئەو کاتەیە کە دەبێ بچینە سەردانی «گووزمەن». گوتم، ئێستا سوپاییەکان لە هەموو جێیەک ئامادەن. بە پێکەنینەوە گوتی، پاش دوو سەعات هەموو شتێک وەک خۆی لێ‌دێتەوە. پاشان ئەو بەستەیەم وێ دا کە «نیکۆلا دیڤیس» لە لەندەنەوە ناردبووی و

پێوەنـــدیی بـــە چاندنـــەوەی مـــووی ســـەرەوە هـــەبوو. ئـــەم بابەتـــە پێکەنینەکەی ویی زیاتر کرد.

دوای دوو ســـەعات لێخـــوڕین بـــە دوو وانێـــت گەیشـــتینە شـــوێنی دانیشتنی «گووزمـەن». ئەمن بەوپەڕی ڕاستوێژییەوە پێمگوت، پێم-خۆشـە ئـەو دەگـەڵ ڕاپۆرتنووسـێکی ڕۆژنامـە وتـووێژ بکـا، چونکـە دەنگۆ هەیـە کـە ئـەو مـردوە و بۆیـە ئـەو گومانـە دەخوڵقێ کـە منیـان فریو داوە و ناچاریان کردووم وا بکەم وڵاتەکەم ١٠ میلیۆن دۆلاری لەدەست بچێ.

ئـەو گـوتی: «ئـەمن نـاتوانم دەگـەڵ ڕۆژنامەیـەکی سـەرمایەداریی بێگانە وتووێژ بکەم.»

«بـــەڵام ناتـــەوێ پاشـــماوەی پووڵەکـــەت بـــدرێتێ؟ ئـــەمن دەبـــێ بەڕێگایەکدا بیسەلمێنم کە ئەتۆ زیندووی.»

«داخوا سەرۆکەکانت قسەی تۆ قبووڵ ناکەن؟»

گوتم، ئەوان قسەی من قبووڵ دەکەن، بەڵام وتووێژێکی ڕۆژنامـەیی کۆمـەگ بـەو بابەتـە دەکـا. سـەرەنجام پـاش ئـەوەی تاوێـک لـەبارەی مووی سەری و هۆی وەرینەکەی باسمان کرد، «گووزمـەن» ئامـادە بوو وتووێژێک دەگەڵ ڕۆژنامەی El Diatia بکا.

لەنێو قساندا «گووزمـەن» تکای کرد چەند کاری بۆ بکرێن. یەک ئەوە کە ئیسرائیلییەکان پێنج ڕۆژنامـەی زنجیرەیی Ocho Group بۆ بزووتنەوەی «ڕێگای درەوشاوە» بکڕن. یەکی دیکە ئەوە بوو کە ئەو فڕۆکـە «سێسـنا»یانـەی لـە کۆلۆمبیـاوە دێنـە «ئایـاکووچۆ» دەزگـا و ئامرازی پزیشکیی بۆ دەگەڵ خۆیـان بێنن. پاشـان ئـەو دەزگایانـە لـە فڕۆکـەکان دابەزێنـدرێن و لـە هـەر فڕۆکەیەکـدا تـەنیا ٢٠٠ کیلـۆ لـە هـەرکامیان بمێنـێ. ئـەمجار ئـەو شـوێنێکی بـە مـن گـوت کـە فڕۆکـە «سێسـنا»کـان لـە پێـڕوو لێـی بنیشـنەوە. بـەم جـۆرە دیـداری مـن و «گووزمەن» بە ڕەزامەندیی تەواوەوە کۆتایی هات.

دواتر بە تەلەفون بە من گوترا کە «گووزمەن» دۆستێکی نزیکی هەیە، بەناوی «سینتیا مەک نامارا» Cynthia Mc Namara کە ئەمریکایی‌یە و بە تۆمەتی بەشداری لە هێرشێکی گرووپی ڕێگای درەوشاوەدا، لە لیما زیندانییە. پاشان زانیمەوە کە «سینتیا» هیپی-یەکە لە سالآنی سەرەتای چل سالّیدا. ئەو بۆ کۆکردنەوەی شوێنەواری هونەریی خەڵکی ناوچەکە چۆتە ئیکوادۆر و دوایە چۆتە پێڕوو و لە شاری «ئایاکووچۆ» ئاشقی دوکتورێکی جوانچاک بووە بەناوی «ئەنریکۆ» Enrico. ئەو هەروەها چاوی بە «گووزمەن» کەوتوە و دەگەڵی بۆتە دۆست و دوایە کەوتۆتە زیندان. ئێستا «گووزمەن» داوای لە من دەکرد، کە بەڵکوو بتوانم بەهۆی باڵیۆزی ئیسرائیلەوە لە زیندان ئازادی بکەم. ئەمن لەوبارەیەوە بەڵێنێکم نەدا.

بەپێی ئەوە کە «گووزمەن» شوێنی نیشتنەوەی فڕۆکەکانی دیاری کرد و بە منی ڕاگەیاند، قەرار بوو، هەینیی دواتر، کەرەسە مەعدەنییەکان بکڕرێن و بگوازرێنەوە. تەنیا گیروگرفتی کارەکە ئەوە بوو کە دەبووایە بۆخۆم بۆ ئاگادارکردنەوەی ئەو کەسانەی قەرار بوو کەرەسەکان بگوازنەوە، بچمە لیما و لەوێڕا تەلەفون بۆ کاراکاس بکەم و مەسەلەکەیان پێ‌بڵێم. ئەمنیش لە بیانوویەک دەگەڕام کە بتوانم خۆم لە دەرسی زانستگە بدزمەوە. بەهەرحاڵ، زانستگە منی وەک مامۆستا وەرگرتبوو، بەڵام ئەمن ماوەیەک لە سەفەر ببووم و نەمتوانیبوو درێژە بە دەرسگوتنەوە بدەم.

«باربارا» مشووری بیانووەکەی بۆ خواردم. بە کاربەدەستانی زانستگەم گوت کە گوێزینگی لاقی بە توندی وەرگەڕاوە، دەبێ دەگەڵی بچمە لیما و بۆ چارەسەری پزیشکی کۆمەگی بکەم. ئێمە دوو ڕۆژ بەر لەوەی کەرەسە مەعدەنییەکان بگوازرێنەوە، گەیشتینە پێتەختی پێڕوو و ئەمن لە شوێنێکی ئەمنی باڵیۆزخانەی ئیسرائیل ئەو تەلەفونانەم کرد کە پێویست بوون. پاشان تەلەفونم بۆ «ڕۆبێرتۆ» کرد تا بەرنامەی گوازتنەوەکە پەسند بکا.

ئەو پرسی: «ئێوە کەرەسەکە لە ئیسرائیل لە کەشتی دادەبەزێنن؟»

وەڵامم دایەوە: «ئێمە دەزانین کارەکە ڕێکبخەین، ئێوە تەنیا هەوڵ بدەن ئەوانمان تەحویل بدەن.»

ئەم بەرنامەیە بەڕاستی دەبوو لەسەر بناخەی متمانەی دوولایەنە جێبەجێ بکرێ. ئەگەر یەکێک لە بەشەکانی ئەو عەمەلیاتە بە لاڕێدا ڕۆیشتبا،تەواوی بەرنامەکە تێکدەچوو. ئەمن بە نارەحەتییەوە لە هۆتێلەکەم بە ناوی Country Club hotel لە لیما چاوەڕوانی وەرگرتنی هەواڵی فڕۆکەکان بووم. سەرەنجام ئاگادار کرام کە فڕۆکەکان بە کەرەسەکانەوە گەیشتوونە ڤەنزۆئیلا. هەموو عەمەلیاتەکە وەک میلەکانی سەعات هەڵسووڕابوون.

دووشەممەی دواتر، کاتێک ئەمن بەنیازی چوونەوەی «ئایاکووچۆ» بووم، ڕوخساری دەمبەبزەی «گووزمەن»م لە لاپەڕی یەکەمی ڕۆژنامەدا چاو پێکەوت. ئەو بەڕاستی، هەر بەڵێنێکی لەبارەی موعامەلەکەوە دابووی بەجێی هێنابوو.

ئەمن چەند دانەیەکم لە ڕۆژنامەکە کڕی تا دەگەڵ خۆم بیانبەمەوە «ئایاکووچۆ». چونکە ئێمە لە یەکەم سەعاتەکانی بەیانیدا بەرەو لیما هەڵدەفڕیین، کەوابێ یەکەم دانەی ئەو ڕۆژنامەیە، ئێمە دەماندایە دەستی. ئێمە هەروەها خەبەرێکی خۆشمان لە بارەی «سینتیا»ی دۆستیشیەوە بۆ ئەو پێبوو، «باربارا» ئاگادار ببوو کە «سینتیا مەک نامارا» سێ ڕۆژ پێش لە زیندان ئازاد بووە.

بەیانیی ئەو ڕۆژە، کاتێک گەیشتینە «ئایاکووچۆ»، ڕووداوێک هاتە پێش کە ویژدانی منی لەوەی نەمتوانیبوو بچمە زانستگە و دەرس بڵێمەوە، پاک کردەوە. بەوجۆرە کە ئەو وەختەی ئێمە بە تاکسی لە فڕۆکەخانەوە دەچووینە هۆتێل، لەنەکاو بوو بە تەقە و شۆفیری تاکسییەکە چووە سەر پیادەڕێیەکە. ئێمە خۆمان هاویشتە سەر کورسییەکان و درێژ بووین. بەڵام، دیارە گوللەکان ڕوویان پێ لە ئێمە نەکرابوو. لە خاڵێکی ڕێبەندان کە لەپێش ئێمەوە بوو، سەربازان

تیرباریکیان لە ترۆمبێلی چەند خوێندکارێکدا دۆزیبۆوە و لە ئاکامدا لە نێو سەربازان و خوێندکارەکاندا ببووە تەقە و سێ لە خوێندکارەکان کوژرابوون. پاش ئەو ڕووداوە ڕاگەیەندرا کە زانستگە دەستی بە مانگرتنێکی ناسنووردار کردوە. بۆیە، ئەگەر لەجێدا ئەم کارە دەکرا بۆمن بە ئیشێک بژمێردرێ، ئەمن بێئیش بووم.

بەڵام ئیشەکەی دیکەم درێژەی کێشا. ئێمە پێویستیمان بە کڕینی کەرەسەیەکی شیمیایی زۆرتر هەبوو و بۆیە دەبوو ئەمن دەگەڵ «گووزمەن» بکەومە گفتوگۆ بۆ موعامەلەی زۆرتر. لە وتووێژەکانی دواتردا «گووزمەن» سەررەق بوو و چاوەڕوانیی وەرگرتنی پووڵێکی زۆر لە ئیسرائیلی هەبوو. ئەو داوای کرد ماڵێکی لە ناوچەیەکی خۆشی لیما بۆ بکڕێ، ڕۆژنامەیەکی زنجیرەیی بخرێتە بەر دەست و ٢٨ میلیۆن دۆلاریشی بدرێتێ. ئەو بۆ چەسپاندنی داواکانی، گوتی بەپێی بابەتێک کە پرۆفیسۆرێکی فیزیکی زانکۆ بۆی باس کردوە، ئیسرائیل بە هەبوونی ئەو کەرەسەیەی موعامەلەی لەسەرە، وای لێدێ کە لە شکان نایە.

«گووزمەن» گوتی: «ئەو کەرەسەیەی ئێمە دەتاندەینێ بایەخی نرخێکی وای هەیە. حکوومەتەکەتان داردەستی ئەمریکایە، پووڵەکەشتان لە ئەمریکاوە دێ و ئێمە بۆ خەڵکی پێڕوو پێویستیمان بەو پارەیە هەیە.»

پاش تەواوبوونی قسەکانی، چون هەستی دەکرد کە ئەمن لەبارەی داخوازەکانیەوە باسی لەگەڵ دەکەم، بڕیاری دا بەم ڕستەیە باسەکەی ببەستێ: «ئەتۆ جوولەکەیەکی سەررەقی.» دوایە، کەمێک ڕاوەستا و بۆ پتەوکردنی ئەوەی گوتبووی، درێژەی دایە: «ئەمن نیازی سووکایەتی بە تۆم نیە، ئەمن بۆخۆشم نیوەجوولەکەم. بەڵام، لە هەمووی گرنگتر، هەموو ئێمە مرۆڤین، هەموومان یەکین.»

ئەو هەروەها باسێکی زیاتری فەلسەفەی ئەو بزووتنەوەیەی کرد کە دایمەزراندبوو. ئەو بیروباوەڕی سەیری هەبوون کە بە لینین و پێوەندیی نێوان ژن و پیاویەوە دەبەستەوە.

ئەو گوتی: «لە ئاکامی ئەندیشەکانی لینیندا، سۆڤیەتەکان دژی زەماوەند وەستان و هانی پێوەندیی سێکسییان دا. کاتێک لە ساڵی ۱۹۳۰دا ستالین لە شوورەوی هاتە سەرکار، کۆمەڵێکی زۆر لە منداڵانی بێ بنەماڵە کە هیچ پێوەندییەکی خێزانییان نەبوو، لە گۆشەوکەناری شووروەوی سەرگەردان بوون. بۆیە، ستالین بە مەبەستی ڕێزدانان بۆ مافی ژنان ڕایگەیاند کە بنەماڵە بنیاتێکی کۆمەڵایەتییە. دۆستانی سۆڤیەتیی ئێمە بە هەڵبژاردنی ئەم شێوەیە یارییان بە هەموو شتێک کرد. ئێمە لە گرووپی ڕێگای درەوشاوە پێمان وایە ڕێگای دروست ئۆگریی هەمیشەیی نێوان ژنێک و پیاوێکە. دیارە وەختێک ئەو پێوەندییە نەیتوانی درێژەی هەبێ، ژن و پیاو دەبێ لە یەکتر جودا ببنەوە، بەڵام ئەم کارە هەرگیز نابێ هان بدرێ.»

ڕواڵەتی فەلسەفەی سەیروسەمەرەی «گووزمەن» ئەوە بوو کە ژیانی بەکۆمەڵ نابێ، پێوەندیی سێکسییش بگرێتەوە.

ئەو پرسی: «ئەو هەموو هەڵلایە لەسەر پێوەندیی سێکسی لەبەر چییە؟ ئەمن پێموایە هەر ژن و مێردێک دەبێ تەنیا یەک منداڵیان هەبێ، بڕوانە، ئێستا چەندە منداڵی بێ ماڵوحاڵ لە لیما هەیە، چەند سامناکە کە دەبینین تەنیا ئومێدی ئەو منداڵانە ئەوەیە کە بە ژن-ومێردێکی بێگانە کە منداڵیان نابێ، بفرۆشرێن.»

لێمپرسی، ئەو چۆن دەیەوێ ئەم گیروگرفتە چارەسەر بکا؟ قسەکردن لەبارەی ئەو گیروگرفتەوە ئاسانە، بەڵام بەکردەوە دەبێ چۆن دەگەڵ ئەو گیروگرفتە بەرەوڕوو بین؟

ئەو زەردەیەکی هاتێ و گوتی: «ئێمە لە پێڕوو کاتنامەی خۆمان لە ساڵی سفرەوە دەست پێدەکەین. لە سەرەتای ئەم ڕۆژگارەوە هەر هاونیشتمانێکی پێرووی، ژیانی خۆی بەجێ دێڵێ و دێتە نێو ژیانی

بەکۆمەڵ (Commune). لیما لە ڕووبەری تۆپی زەوی پاک دەبێتەوە - بەڕاستی ئەم شارە ئێستا بەو هەموو بەشە پیس و هەژارنشینە و نەبوونی ئاوی خاوێن و سیستمی ئاوەڕۆوە بۆتە شارێکی سامناک.

فەلسەفەی «گووزمەن» لەبارەی ئەم بابەتەوە بەتوندی کاری لەمن کرد، چونکە ئەو بابەتانە وەک ئەو بیرە ساویلکانەیە وایە کە لە تەمەنی پێش ٢٠ ساڵییەوە لە مێشکمدا پەروەردەم دەکرد. بەومانایە کە هەموو کەسەکان دەبێ لە ڕیزێکدا دابنرێن و ژیان لە نوێوە دەست پێ بکرێ.

پاشان ئێمە دووبارە هاتینەوە سەر گفتوگۆی ئەسڵی لەبارەی موعامەلەکەوە. بڕیار درا ئیسڕائیل بڕی ١٨ ملیۆن دۆلاری دیکە، واتە بەو ١٠ ملیۆن دۆلارەوە کە پێشتر درابوو، ٢٨ ملیۆن دۆلار بدا و ٣٠٠ کیلۆ لە هەرکام لە کەرەسە پێویستەکان وەربگرێ.

لـه حاڵێکـدا سەرمەسـتی سـەرکەوتن لـه مەئموورییەتەکـەم بـووم، سەرەتای ژوئەن (حوزەیران)ی ساڵی ١٩٨٨ به فرۆکه چوومه لەندەن. داوام لـه «باربـارا»ش کردبـوو لـەم سـەفەرەدا دەگـەڵم بـێ، چونکـه دەمزانـی لەوانەیـه لـه ڕێگـا تووشـی گیروگرفتـی پێشـبینی‌نـەکراو بـم و بۆیـه دەمەویسـت شـاهیدێک لـه بەسـەرهاتەکەدا ئامـاده بـێ. دیـاره سـەفەری بـێ‌بەرنامـەی مـن بـۆ لەنـدەن بـەپێی ڕێنوێنییـەک بـوو کـه «ئیسحاق شامیر»ی سـەرۆکوەزیـر پێـی دابووم. سـەرهەنگ جـەلالی وەزیری بـەرگریی ئێران داوای کردبوو دیدارێکی دەگەڵ من هـەبێ. ئـاخر جـار ئـەمن سـەرهەنگ جـەلالیم دەگـەڵ «ڕابێـرت گەیـتس» لـه کانزاس دیبوو، ئەو لـه دیدارەکـەدا داوای کـرد دڵنیـا بکرێ کـه دەگەڵ ئەوەی مەسـەلەی ئێران -کۆنترا لەقاو دراوه، نـاردنی کەرەسـەی شـەڕ بۆ ئێران درێژەی دەبـێ. لـەو کاتـه بـه دواوه ئیسـرائیل بڕیـاری دابـوو نـاردنی کەرەسـەی شـەڕ بـۆ ئێـران ڕابگـرێ. چونکـه شـەڕی ئێـران و عێراق تووشی ئاگربەسێکی لـەرزۆک و متمانەپێنـەکراو هـاتبوو. ئێسـتا جـەلالی دەیەویسـت، لـه ڕێـی کانـاڵی دیکـەوه دەسـت بکـا بـه کڕینـی کەرەسەی جەنگی.

له حاڵێکدا «باربارا»م دەگەڵ بوو، به تاکسی چووینه ماڵێکی گەوره لـه «بێلگراڤیا» Belgravia. پۆلیسـەکانی لەنـدەن لەبـەر دەرگـای ماڵەکـه خەریکی ئەرکەکانیان بوون و پیاوانی ئەمنیەتیی ئێرانی له بەرهـەیوانی ماڵەکه خەریکی نیگابـانی بـوون. ئـەم ماڵـه لـه ڕاستیدا هـی سـەرهەنگ جەلالی بوو. ئەو به تامەزرۆیی چاوەڕێی ئێمـه بـوو. ئـەمن ئـەوم وەک دۆستێکی خـۆم بـه نـاوی حوسـێن ناسـاند. حوسـێن، نـاوێکی خـوازراو بوو که سەرهەنگ جەلالی له لەندەن بۆخۆی دانابوو.

سـەرهەنگ جـەلالی ئێمـەی ڕێنـوێنی کـرد بـۆ ژووری میوانداری کـه میوانەکانی دیکەی لێ کۆ ببوونەوه. ئەوانەی لەوێ بوون بریتی بـوون لـه: مینـا، هاوسـەری سـەرهەنگ جـەلالی، یـەکێک لـه هاوکـارانی سەرهەنگ جەلالی دەگەڵ خێزانی، «جان دولارۆک» و سـەوداگەرێکی

کەرەسەی شەڕی ئەڵمانی بە ناوی «ویرنەر کرووگەر» Wernner Kruger کە کاری دەگەڵ ئیسرائیلییەکان دەکرد. پاش سڵاو و چاک-وخۆشی ئەمن و سەرهەنگ جەلالی چووینە باغچەی ماڵێ و لەبارەی ئەسڵی بابەتەکەوە کەوتینە قسەکردن. ئەو دڵساردیی لەوە دەربڕی کە ئەمریکاییەکان کۆمەگی عێراقیان دەکرد و ببوونە مایەی بەهێزبوونی. ئەمریکا پشتیوانیی لە بەرهەمهێنەرانی چەکی پێشکەوتوو و شیمیایی لە شیلی دەکرد و دوای ئەوەش چەکە بەرهەمهاتووەکان دەچوونە عێراق.

سەرهەنگ جەلالی گوتی: «ئەگەر سەددام حوسێن، پەلاماری ئێمە نەدا، سەرنجی دەچێتە سەر عەرەبستانی سعوودی و کووەیت.»

جەلالی نامەیەکی ڕەسمیی وەزارەتی بەرگریی حکوومەتی کۆماری ئیسلامیی دایە من کە بیدەم بە سەرۆکوەزیری ئیسرائیل. نێوەرۆکی نامەکە نیگەرانیی ئێران لە چەکە شیمیاییەکانی عێراقی نیشان دەدا. ئەمنیش داوایەکم لەو کرد و گوتم ئێمە چاوەڕوانیمان لە ئێرانییەکان هەیە کە کۆمەگ بکەن سێ کەسی ئەمریکایی کە لە لوبنان بە دیل گیراون، ئازاد بکرێن.

جەلالی گوتی: «ئێمە بەوپەڕی خۆشحاڵییەوە بۆ ئەوکارە هەنگاو دەنێین، بەڵام، دیارە دەبێ ئەم کارە لە ڕووبەرێکی بەربڵاوتردا ئەنجام بدرێ. ئێمە پێشتر داوامان لە تۆ کردوە هەوڵ بدەی، ناردنی چەکە شیمیاییەکان بۆ عێراق ڕابگیرێ، و ئەمن دەبێ بە سوپای پاسداران نیشان بدەم کە لە بەرامبەر ئەم کارەدا، هێندێ کۆمەگم لە ئیسرائیل وەرگرتوە.

پرسیارم کرد: «مەبەستت چیە؟»

«ئێمە پێویستیمان بە سێ دانە فڕۆکەی C-130 هەیە، کە دیارە پارەکەشیان دەدەین. ئەمن بە مەلا توندڕەوەکان دەڵێم کە بەرامبەر بە هەر سەربازێک، فڕۆکەیەک وەردەگرین. ئێوە ئەو فڕۆکانە بۆ ئێمە ئامادە بکەن و ئێمە سەربازەکانتان بۆ ئازاد دەکەین.»

لێرەدا وتووێژەکانمان لە بارەی موعامەلەکەوە تەواو بوون و ئێمە بەرەو باربیکیو (برژاندن) و کەبابی گۆشت وەڕێ کەوتین. پاشان، وەختی ماڵئاوایی هەر میوانێک پاکەتێک پستە (فستق)ی بە دیاری وەرگرت.

قەرار بوو ئەمن لە لیما «باربارا» ببینم و دوایە بفڕم بۆ ئیسرائیل. لە بەشی دەرەجە یەکی فڕۆکە لە فڕۆکەخانەی «هیترۆ» Heathrowی لەندەن، بە ڕێکەوت چاوم بە ژەنراڵ «دیڤید ئیڤری» Davyd Ivry، بەڕێوەبەی گشتیی وەزارەتی بەرگریی ئیسرائیل کەوت. ئەو لەجێدا سەر بە حیزبی کرێکار بوو، بەو حاڵە ئەمن بابەتی داخوازی ئێرانییەکانم لە بارەی فڕۆکەی C-130یەوە دەگەڵ ئەو باس کرد. چونکە، ئەو بە هەرحاڵ لە بابەتەکە ئاگادار دەبوو. بەڵام وا دیار بوو ئەو زۆر دەگەڵ ئەو کارە مووافیق نیە.

ئەو گوتی ئەتۆ دەبێ بزانی کە «شامیر»ی سەرۆکوەزیر ناتوانێ لەوبارەیەوە بە تەنیا بڕیار بدا. ئەو دەبێ ڕەزامەندیی حیزبی کرێکاریش لە حکوومەتی هاوپەیمانیدا بە دەست بێنێ، چونکە فرۆشتنی کەرەسەی شەڕ بە ئێران بە تەواوی ڕاگیراوە.

ڕۆژی دواتر ئەمن لە دەفتەری سەرۆکوەزیر، هەموو داستانی موعامەلە دەگەڵ «گوورزمەن»م بۆ ڕاوێژکاری سەرۆکوەزیر (ئەوی پزنەر) ڕوون کردەوە. ئەو گوتی ١٨ میلیۆن دۆلاری دیکە دەڕژێتە حیسابە بانکییەکەی سویس و کڕینی ڕۆژنامەی زنجیرەیی و خانوو لە لیماش ڕێکدەخرێ.

ئەمن بڕیارم دا بابەتی فڕۆکە C-130یەکان بۆخۆم دەگەڵ سەرۆک-وەزیر باس بکەم و «پزنەر»یش دیدار دەگەڵ سەرۆکوەزیری ڕێک-خست.

کاتێک ئەمن دەگەڵ «پزنەر» چوومە ژووری سەرۆکوەزیر، ئەو پێیگوتم: «ئیسرائیل بە تۆ قەرزدارە.» پاشان لە کاتێکدا منی بۆ سەر مۆبڵێک (قەنەفە) ڕێنوێنی دەکرد کە تایبەت بە میوانان بوو، لە پشت

مێزەکەی دانیشت. جەستە چووکەڵەکەی لەنێو کورسییە چەرمییە گەورەکەیدا ون بوو و تەنیا سەروکەللەی کە لەچاو لەشی نائاسایی دەینواند، لە پشت مێزەکە دیار بوو. دەفتەری سەرۆکوەزیر بە مۆبڵی مۆدێرنی چەرم و مێزێکی تایبەتی قاوە کە «شامیر» میوانداریی پێ لە میوانانی دەکرد، ڕازابۆوە. دیار بوو ئەو مۆبلانە بە نرخێکی گران کڕراون. لەسەر مێزەکەی «شامیر» ئالایەکی چووکەڵەی ئیسڕائیل و لەسەر دیواری ژوورەکەشی هێندێ پۆستەری «دیڤید ستێرن» David Stern و «ڤلادیمیر جابۆ تینسکی» Vladimir Jabotiniski، سەر بە بزووتنەوەی پێداچوونەوەخوازی زایۆنیستیی خەباتگێر کە نەخشێکی گرنگیان لە دروستکردنی دەوڵەتی ئیسڕائیلدا هەبوو و هەروەها «تیئۆدۆر هێرزل» Theodor Herzl بناخەدانەری تیئۆریی سیاسیی زایۆنیزم کە پتر بەناوی باوکی سۆسیالیست ناسراوە، دەبینران.

ئەمن وردەکاریی دۆخی پێرووم بۆ «شامیر» شی کردەوە و ئەو خۆشحاڵ بوو کە پارەیەکی کەم بۆ کڕینی کەرەسە پێویستەکان خەرج کراوە.

ئەو گوتی: «ئێمە چاوەڕوان بووین تا ئێرە ٥٠ میلیۆن دۆلار بدەین. دوعای خێری من بۆ هەرکارێک کە بە پێویستی دەزانی، بە دواتەوە دەبێ. بە سەرنجدان بەوەش کە هاوسەرەکەت چاوەڕێی لەدایکبوونی منداڵێکە، ڕێز بۆ ئەو کاتە دادەنێم کە بۆ ئەنجامدانی ئەو مەئموورییەتە سەرفت کردوە.»

دوایە ئەمن نامەی ئێرانییەکانم دا بە «شامیر» و بە زمانیش داخوازەکەیانم بۆ کڕینی فڕۆکە C-130یەکان پێڕاگەیاند. «شامیر» نامەکەی کە لەودا ئێرانییەکان داوایان کردبوو چەکێکی پتریان پێ- بفرۆشرێ و ناردنی چەکی شیمیایی لە شیلییەوە بۆ عێراق رابگیرێ، خوێندەوە و پاشان بە ئارامی لەسەر مێزەکەی خۆی دانا.

ئەو گوتی: «ئەمن بەڕەسمی وەلامی ئەم نامەیە نادەمەوە. ئێمە دەگەڵ ئەمریکایییەکان ڕێککەوتووین کە لەم کاتەدا ئیدی کەرەسەی

شـەڕ بـە ئێران نەفرۆشـین». دیـارە ئـەمن ئاگـام لـەو بابەتـە هـەبوو. سـەرەتای ئـەو سـاڵە، دوای ئـەوەی شـەڕی ئێـران و عێـڕاق بـە دژوارییەکی زۆر ڕاوەستابوو، «ڕابێرت گەیتس» لەلایەن ئەمریکا و «ئـەوی پزنـەر» لـە لایـەن ئیسرائیلەوە بـە نهێنی ڕێک کـەوتبوون کـە فرۆشتنی کەرەسـەی شـەڕ بـە ئێران ڕابگیـرێ. لـە ڕێککەوتننامەکـەدا ئـەوەش هـاتبوو کـە ئـەمریکا هـەوڵ دەدا، ناردنی چـەکی شـیمیایی بـۆ عێراق ڕابگیرێ. بەڵام بەوجۆرەی ئەمن ئاگادار کرامـەوە، هیچکام لـە دوو لایـەنی ڕێککەوتنەکـە بەڵێنـەکانی خۆیـان بـەجێ نەگەیانـدبوو. «شـامیر» گـوتی: «تکا دەکـەم بـەو ئێرانییانـە کـە پێوەنـدیت لەگـەڵیان هەیە ڕابگەیەنە کە نامەکەیانم وەرگرتوە و خەریکم موتاڵای دەکەم.»

تێنەگەیشتم داخوا مەبەستی سەرۆکوەزیر ئـەوە بـوو کـە داخـوازی ئێرانییەکان بۆ کڕینی فڕۆکەی C-130ی ڕەت کردۆتەوە یان نـا. ئەگـەر مەبەستی ئەوە بوو کە دەبێ داخوازی ئێرانییـەکان لەوبارەیـەوە ڕەت بکرێتەوە، کەوابوو دەبوو سەربازە ئیسرائیلییەکان لە لوبنان هەروا بـە دیلی لەلای دوژمن بمێننەوە.

وا دیار بـوو سـەرۆکوەزیر بیری منی لـەو بارەیەوە خوێندۆتـەوە. چونکە پـاش ئـەوە گـوتی: «لـەبارەی فڕۆکـە C-130یەکانـەوە هـەنگاوی پێویست بهاوێژن. لەو بارەیەوە ڕەزامەندی و پشتیوانیی منتـان لەگـەڵ دەبێ.»

لەو وەختەدا، ئەمن دەبوو بچمەوە پێڕوو. بەڵام بڕیارم دا، ماوەیـەک لەلای «ئۆرا» بمێنمەوە. هەرچەند ڕۆژە گەرمـەکانی مـانگی ژوئەنمان بەسەر دەبرد، بەڵام ئەو ڕۆژانـە بـۆ مـن ئەفسـووناوی بـوون. ئەمن و «ئۆرا» چووینە «دەریای مردوو»، هەروا کە لـە قـەراغ ڕادەوەسـتا و دەیڕوانیـە ئـاوی دەریـا، جوانییەکـەی منـی سەرسـام دەکـرد. دوایـە چووینـە بـاکووری دەریـای جەلیلـە و شـەوەکەمان لـەوێ بەسـەر بـرد. ئەمن دەستم لەسەر زگی «ئۆرا» دانا و هەستم کرد منداڵەکەی پێلەقە دەوەشـێنێ. کاتێک گەڕاینـەوە ئۆرشـەلیم، ئـەو خرایـە ژێر ئـەزموونی

سەروو دەنگ (Ultra Sound) و پێیان گوتین کە منداڵەکەی کچ دەبێ. ئەم خەبەرە بووە هۆی ئەوە کە خۆم لە ئاسماندا ببینم.

کەچی، هەستم کرد «ئۆرا» لە شتێک ناڕەحەتە. لێم‌پرسی، ناڕەحەتییەکەی چیە.

ئەو دەیویست بزانێ، «باربارا کێیە؟»

بەجارێک دڵم داخورپا. ئەو حەقی بوو لە پێوەندیی من و «باربارا» بەگومان بێ. ئەمن لەپێشدا بۆیە لە «باربارا» نزیک ببوومەوە کە ئەو شایەتی چالاکییەکانی من و دەستەبەری ئەمنیەتم بێ. پاشان ببووینە دۆست و سەرەنجام لەوەش بەولاوەتر چووبوو. لە «ئۆرا»م پرسی: «ئەتۆ لەکوێ ئەو دەناسی؟»

«کە لە پێڕوو بووی هەتا تەلەفونم بۆ دەکردی، ئەو هەڵی‌دەگرت.»

گوتم: «ئەو پێوەندیی بە کارەکەمەوە هەیە. ئەو ڕۆژنامەنووسێکی ئەمریکاییە کە بۆ ڕۆژنامەیەکی گەورەی ئینگلیزی کار دەکا. ئەو لەڕاستیدا ئەمنیەتی من دەستەبەر دەکا.» وەختێک ئەم قسەیەم کرد، خۆم زۆر چووکەڵە هاتە بەرچاو، بەڵام «ئۆرا» قسەکانمی قبووڵ کرد، یان ئەمن لەو کاتەدا وای تێگەیشتم.

پێنج ڕۆژ دواتر، ئەمن بە فڕۆکەی لووفت هانزا لە تەل ئەبیبەوە چوومە فرانکفۆرت. هاوکاری سەرهەنگ جەلالی کە پیاوێکی زمانخۆش و خاوەنی بزنەڕیشێکی کورپە بوو، لە سالۆنی هۆتێلی فڕۆکەخانە چاوەڕێم بوو. وەختی شێوخواردن بۆم ڕوون کردەوە کە نامەکەیان لەبارەی داخوازی کڕینی چەکی زۆرترەوە دراوەتە سەرۆکوەزیری ئیسرائیل و لە کابینەی وەزیراندا لێی دەکۆڵرێتەوە. بەڵام لەبارەی فڕۆکە C-130یەکانەوە ئێمە خەریکی کارین.

ئەو دەیەویست بزانێ، نرخەکەیان چەند دەبێ.

لەبارەی نرخی فڕۆکەکانەوە هیچ بە من نەگوترابوو. بۆیە بەپێی ئەزموونی پێشترم لە فرۆشتنی فڕۆکەی هێرکوول، ژمارەیەکم لە مێشکمدا دروست کرد و گوتم: «هەر یەکەی ١٢ میلیۆن دۆلار.»

«ئێوە هەم ٣٦ ملیۆن دۆلار پووڵی سێ فڕۆکەی C-130تان لێمان دەوێ و هەم سەربازە بەدیلگیراوەکان؟»

«نا، ئێمە ٣٦ ملیۆن دۆلار بۆ فڕۆکەکان داوا دەکەین. بەڵام پێشمان خۆشە سەربازەکانمان ئازاد ببن. ئیسرائیل نابێ بکەوێتە بارودۆخێکەوە کە بزانرێ بۆ ئازادیی بارمتەکانی کەرەسەی شەڕ دەدا. هەرنەبێ نابێ ئەم بابەتە ئاشکرا بێ.»

ئەمن دوو ژمارەحیسابی بانکیم دان بەو و داوام کرد هەر حیسابەی ١٨ ملیۆن دۆلاری تێبکرێ. پووڵەکان دەبێ «لەماوەی دە ڕۆژدا بخرێنە حیسابەوە.» ئەو بەڵێنی دا کە ئەوپەڕی هەوڵی خۆی بۆ ئازادبوونی بارمتەکان بەکار بەرێ.

لێیپرسیم: «پێت خۆشە بارمتە ئەمریکاییەکانیش ئازاد بکرێن؟»

«ئەم کارە پێوەندیی بە ئیسرائیلەوە نیە. بەڵام ئەگەر ئەتۆ بتوانی ئەوانیش ئازاد بکەی، ئێمە خۆشحاڵ دەبین.»

سەرەتای مانگی ژووئیە گەڕامەوە پێڕوو و لە فکری پەیداکردنی خانوو بۆ بزووتنەوەی ڕێگای درەوشاوەدا بووم. لە کاتی گەڕان لە خانوو بۆ بزووتنەوەکەدا ماڵێکی گەورە و بەشکۆم دیتەوە کە حەوزی مەلە و ٩ خزمەتکاری هەبوون. ئەوکەسەی ماڵەکەی بەمن نیشان دا، پیاوێک بوو بە ناوی «ئەنریک» Enrique کە ماڵەکە هی دایکی بوو. بەڵام ئەمن بەڵێنم نەدا خانووەکە بکڕم. ئەو بنەماڵەیە هەروەها خاوەنی ڕۆژنامەی زنجیرەیی Ocho بوون کە مەبەستی ئێمەی تەواو دەکرد. ئاشکرا بوو کە ئەمن دەبوو لەپێشدا دەگەڵ «گووزمەن» لەبارەی ئەو خانووەوە قسە بکەم، چونکە نەمدەتوانی بیر بکەمەوە کە نەزەری وی لەبارەی ئەو ماڵە و ئەو هەموو جوانکارییەوە چیە.

«ئەنریک» داوای لێکردم بۆ کڕینی خانووەکە، دەگەڵ یەکێک لە دۆستانی کە وەزیری کاروباری دارایی پێڕوو بوو، قسە بکەم. ئەو

دەیەویست بزانی، بۆچی ئەمن لەو بارودۆخە ناجێگیرەی پێڕوودا بڕیارم داوە بە کڕینی ئەو ماڵە دەست بدەمە وەبەرهێنان.

گوتم: «ئێستا قیمەتەکان لە خوارێن و ڕۆژێک وەسەر دەکەون.»

ئەو نەختێک بیری کردەوە و گوتی: «فکری چاکە، بەلام ئەگەر ڕێگای درەوشاوە لەم ولاتە حکوومەت بەدەستەوە بگرێ، ئەم کارە سوودێکی نابێ.»

ئەمن بە فڕۆکە چوومە «ئایاکۆچوو»و هەر ئەو شەوە چوومە سەردانی «گووزمەن». ئەو پێیگوتم، کارێک کراوە کە پاش ئەوەی ئیسرائیل پارەی خانوو و ڕۆژنامەکەی دا، بازرگانێکی خەڵکی پێڕوو وەریان بگرێ. ئەو هەروەها هێندێ خەبەری خۆشی بۆ من هەبوون، بەوجۆرە کە ئەمن دەتوانم تەلەفون بۆ هاوکارەکانم بکەم و پێیان بڵێم کە ڕۆژی هەینی -٤ ڕۆژی دیکە- کەرەسەکان وەربگرن و ڕەوانەی ئیسرائیلیان بکەن. ئەگەر بمویستایە بچمە لیما و بە تەلەفونێکی بێ-مەترسی ئەو کەسانە ئاگادار بکەم کە دەبوو کەرەسەکە وەربگرن، ئەوان کاتێکی زۆریان بۆ خۆئامادەکردن بۆ سەفەر نەدەبوو، بۆیە بڕیارم دا، لە هۆتێلەکەی خۆمەوە لە «ئایاکۆچوو» تەلەفونیان بۆ بکەم.

لە ژوورەکەی خۆمڕا داوام لە تەلەفونچییەکە کرد تەلەفونەکەم بە ئۆرشەلیمەوە ببەستێ. وەختێک «ئۆرا» تەلەفونەکەی هەڵگرت، پێمگوت تەلەفون بۆ «ئەوی پزنەر» بکا و بەسادەیی پێی بڵێ، بەرنامەی گۆڕین دەبێ ڕۆژی هەینیی ئەم حەوتوویە جێبەجێ بکرێ و ئیدی دامنایەوە. نیوسەعات دواتر، تەلەفونێکم لە ئەندامانی تیمی گوازتنەوەی ئیسرائیلی لە کاراکاسەوە بۆ هات. لێیان پرسیم، بەرنامەکە ڕۆژی هەینییە؟ گوتم بەڵێ و تەلەفونەکەم دانایەوە.

ئەمن چوومەوە لیما و ڕۆژانی ١٢ و ١٣ی ژووئیە کاری کڕینی خانووەکە و ڕۆژنامەیەکی زنجیرەییم وەڕێ خست — ٤٠٠٠٠٠ دۆلار بۆ خانووەکە و ٢ میلیۆن دۆلار بۆ ڕۆژنامەکە- بەلام لێرەدا زەحمەتی

من کەمتر بۆوە. ڕێبەرانی گرووپی ڕێگای درەوشاوە، باوەڕی خۆیان لەبارەی کڕینی خانووەوە گۆڕیبوو. ئەوان گەیشتبوونە ئەو ڕایە کە لە دۆخـی ناسـەقامگیری سیاسـیدا گوازتنـەوەی ئەنـدامانی پایەبـەرزی بزووتنـەوە بۆ لیما کـارێکی زۆر مەترسـیدارە، چونکە هـەموو کاتێک لەوانەیە بکەونە بەر هێرشی سوپاییەکان.

کاتێک کەرەسەکان بەڕێ کرانە ئیسرائیل، ئەمن بـەنیاز بـووم پێڕوو بەجێ بێڵم، بـەڵام، زانایـانی ئـەتۆمیی ئیسـرائیل ئـەو فکرەیـان بۆ هاتـە پێش کـە لەوانەیـە پێویسـتییان بـە ٥٠٠ کیلـۆی زیـاتر لـەو کەرەسـەیە هەبێ. هەربۆیە منیان ڕاسپارد پێش بەجێهێشتنی پێڕوو، کڕینـی ٥٠٠ کیلۆی دیکە لەو کەرەسانەی پێویستن ڕێک بخـەم. ئـەمن تەلـەفونم بـۆ «ڕۆبێرتۆ» کرد، و مەسـەلەکەم تێگەیاند و کـاری کڕین و ڕاگـوازتنی ئەوانیش وەک ئەوانی پێشوو جێبەجێ کرا.

کاتێک دوابەشی ئەو کەرەسانەی کڕرابوون بـەرەو ئیسـرائیل بـەڕێ بوون، ئـەمن گـەڕامـەوە ئۆرشـەلیم. ـئەمـە ڕاسـت ئـەو وەختـە بـوو کـە کچەکـەم ڕۆژی ٢٢ی ژووئیـەی ١٩٨٨ لـەدایک بـوو. ئـەمن کـاتی لـەدایکبوونی «شـیرا»ی کچـم، لـە نەخۆشـخانەی Hadassah دەگـەڵ «ئۆرا»ی هاوسـەرم بـووم. بـە خۆشـییەوە لەوکاتـەدا، لیمـا، گرووپـی ڕێگـای دەروشـاوە، سـەرهەنگ «کۆردوڤـا» و «باربـارا» هـەموویانم بـەجێهێشـتبوون. مەئموورییەتەکـەم بەوپـەڕی سـەرکەوتنەوە ئـەنجام درابـوو و ئێسـتا ئیسـڕائیل دەیتـوانی، بەرهـەمهێنان و پەرەپێـدانی بەرنامە ئەتۆمییەکانی درێژە پێبدا.

دوو ڕۆژ پاش لـەدایکبوونی «شـیرا» دەسـتوورێکم بۆ دەرچـوو کـە تاسـاندمی. زانایـانی ئـەتۆمی تووشـی هەڵـەی لێکدانـەوە ببـوون و پێویستییان بە ٥٠ کیلۆی دیکە لـە یـەکێک لـە کانزاکـان هـەبوو و ئـەمن دەبوو بۆ کڕینەکەی دیسان سەفەری پێڕوو بکەم.

ئـەمن سـەرەتای مـانگی ئـووت گەڕامـەوە لیمـا. پێشـتر تەلـەفونم بـۆ «باربـارا» کردبـوو و ئـەو لـە فڕۆکەخانـە سـەری دام. خەبـەرم بـە

«ڕۆبێرتۆ»ش دابوو کە ئەمن خەریکی گەڕانەوە بۆ پێڕووم و ئەویش بە فڕۆکە هاتبووە لیما. هەرسێکمان لە سالۆنی هۆتێل Caesar یەکترمان دیت و پاشان بەرەو شەقام ڕۆیشتین. ئەمن هۆی گەڕانەوە بۆ پێڕووم بۆیان ڕوون کردەوە.

«ڕۆبێرتۆ» گوتی: «ئەمن تەلەفون بۆ «ئایاکوچوو» دەکەم و ئاکامەکەت پێدەڵێم.»

«ڕۆبێرتۆ، ئەمن وەختم زۆر نیە کە لێرە وەمێنم. مانەوە لێرە بەرەبەرە بۆ من مەترسیدار و جگە لەوەش، ئەمن کچێکی تازەلەدایکبووم لە ئیسرائیل هەیە و هەرچی زووتر دەبێ لە ئاکامی کارەکەی تۆ ئاگادار ببمەوە.»

ئەو بەڵێنی دا، کە بەیانی یەکەم کاری، ئەوە دەبێ کە لەبارەی ئاکامی ئەم کارەوە دەگەڵ سەرۆکەکەی لە «ئایاکۆچوو» گفتوگۆ بکا.

پاش ئەوەی «ڕۆبێرتۆ» بەجێی هێشتین، «باربارا» پێیگوتم کە کۆنسوولی ئەمریکا «دانا هامیلتۆن» Donn Hamilton ، حەز دەکا قسەم لەگەڵ بکا. ئەمن دەسبەجێ چوومە دەفتەرەکەی. ئەو کە ژنێکی زۆر میهرەبان و خۆشئەخلاق بوو، پێیگوتم کە پێویستیی بە کۆمەگی من هەیە. «سینتیا مەک نامارا» کە ژنێکی ئەمریکایی بوو، دووبارە ڕۆژی ٢ی ئووت گیرابۆوە. دادوەرێک لە «کانگالۆ» Cangallo کە گوندێکی چووکە بوو لە «ئەندێز» Andes لە ٤٠ کیلۆمیتریی «ئایاکۆچوو» بڕیاری دابوو بیبەنەوە مەڵبەندی دادوەریی خۆی. «کانگالۆ» لە ناوچەی ژێر کۆنترۆڵی بزووتنەوەی «ڕێگای درەوشاوە» بوو و هێزێکی زۆری سەربازی لەنێو گوندەکە نیشتەجێ ببوون و تەنیا ڕێگا کە «باربارا» دەیتوانی بچێتە وێ، ئەوە بوو کە گرووپێکی سەربازی دەگەڵی بچن. کۆنسوولی ئەمریکا، هەوڵی دابوو دادگا ڕێگا بدا کە «مەک نامارا» لە لیما بخرێتە گرتووخانە، بەڵام لەوکارەدا سەر نەکەوتبوو.

تۆمەتی «مەک نامارا» ئەوە بوو کە بە قاچاغی کەلوپەلی پزیشکیی دابـووە گرووپـی «ڕێگـای درەوشـاوە». کاتێـک ئـەو لۆرییـە کـە کەلوپەلەکەی بار کردبوو، بۆ پشکنین لە لایەن فەرمانبەرانی دەوڵـەتی پێرووەوە ڕاگیرابوو، سـێ کـەس بـە گوللـە کوژرابـوون. گوترابـوو کـە هێرشبەران ژنێکی بێگانەیان دەگەڵ بووە کە تایبەتمەندییەکانی دەگەڵ «مـەک نامـارا» بەرامبـەر بـووە. بـەڵام، دیـارە، بەڵگەیـەکی ڕوون بەدەستەوە نەبوو کە ئەو ژنە «مەک نامارا» بووە.

هـامیلتۆن کۆنسـوولی ئـەمریکا گـوتی: «ئـەم دادوەرە ئـارەقخۆرێکی لەمێژینەیـە و دەبـێ کەسـێک دەگـەڵی بکەوێتـە وتـووێژ و لـە داوای گێڕانەوەی «مەک نامارا» پاشگەزی بکاتەوە.»

ئەمن دەمزانی بۆچی کۆنسوولی ئەمریکا جێبەجێکردنی ئەو کارەی لەمن خواستوە. چونکە ئـەمن یـەک لـە چەند کەسێکی کـەم بووم کە هەم دەمتوانی بچمە ناوچەی ژێر کۆنترۆڵی «ڕێگای درەوشاوە» و هـەمیش دەمتـوانی لـە کاربەدەسـتە سـەربازییەکانی پێـروو مۆڵـەتی چوون بۆ پێگەکانی ئەوان، یانی ئـەو جێیە کە دەفتـەری دادوەرەکەی لێبوو، وەربگرم. ئەمن بە کۆنسوولم گوت، هەوڵی خۆم بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە وەگەڕ دەخەم.

بەیانیی ڕۆژی دواتر کاتێک دەگەڵ «ئـەنریک» -کـە دەگـەڵی ببوومـە دۆسـتێکی زۆر نزیـک- قاوڵتیمـان دەخـوارد، پێمگـوت بـەنیازم بچمـە گوندی «کانگالۆ» و چاوم بە دادوەر بکەوێ. ئەو سەری ڕاوەشاند.

«ئەگـەر خـەڵکانی ڕێگـای درەوشـاوە نـەتگرن، سـەربازەکان لـە گرتووخانـەت دەکـەن. ئەگـەر لـە دەسـتی سـەربازەکانیش ڕزگـار بـی، دزەکانی ئاوایی بۆ کراس و کەوشەکانت مشوورت دەخۆن. باشترین ڕێگا ئەوەیـە داوا لـە دۆسـتە پرۆفیسـۆرەکەت بکـەی ئاگـای لێت بـێ. چونکە ئەوانەی ڕەنگە هێرشت بکەنە سەر پیاوانی ئەون.»

گـوتم: «لەڕاسـتیدا ئـەمن حـەزم لـەو کـارە نیـە، ئـەمن لـەم شـەڕەدا بێلایەنم و کارم بە کاری هیچکام لە لایەنەکانی شەڕ نیە.»

ئەمن تێگەیشتم کە «ئەنریک» دەیەوێ تاقیم بکاتەوە تا بزانێ لایەنگری گرووپی «ڕێگای درەوشاوە» بووم، یان نا.

بە هەرحاڵ، پاش بیرکردنەوەیەکی زۆر، دەگەڵ «باربارا» بە فڕۆکە چوومە «ئایاکۆچوو» و داوام لە «ڕۆبێرتۆ» کرد، وابکا بتوانم دادوەرەکە ببینم. ئەو بەڵێنی دا کە ئەو کارە دەکا.

بەیانیی ڕۆژی دواتر داوام لە تاکسییەک کرد من و «باربارا» بەرێتە «کانگالۆ». ئەو گوتی، ئێوە شێتن و ڕۆیشت.

چوارەمین هەوڵی من بۆ ئەوەی تاکسییەک پەیدا بکەم ئامادە بێ بچێتە گوندی «کانگالۆ» بە ئاکام گەیشت. ئەمن سەد دۆلارییەکم لەبەر چاوی ڕاوەشاند و ئەو حازر بوو بمباتە وێ. ئەو ڕوونی کردەوە کە بۆ چوونی «کانگالۆ» ڕێگایەکی دیاریکراو نیە و جگە لەوەش ئەو دەبێ تایەی یەدەک و چەند قتوو بەنزین ئامادە بکا. بە هەرحاڵ، سەعاتەکانی دواتری ئەو بەیانییە ئەمن و «باربارا»، «ئایاکۆچوو»مان بەرەو ... خوا دەزانێ کوێ؟ بەجێ هێشت.

ئەو ڕێیەی دەچووە «کانگالۆ»، زۆر پڕتۆزوخۆڵ و ناخۆش بوو. لەم ڕێیەدا هێندێ پنچکە گیای پەرشوبڵاو کە هێندێ تەپۆلکەی بەردینی چووکەڵە سەریان لێ وەدەر نابوون. جارجار کەسانی سەربە «ڕێگای درەوشاوە» ڕایاندەگرتین و کە منیان دەدی، ڕێگایان دەدا بڕۆین. وا دیار بوو «ڕۆبێرتۆ» پێشتر خەبەری دابوونێ کە ئێمە بەو ڕێگایەدا دەڕۆین. ئەمن دەبوو بۆ ئەم کارە سوپاسی «ڕۆبێرتۆ» بکەم.

سەعات ٦ی دوای نیوەڕۆ گەیشتینە پردێک کە لەڕاستیدا بە دەروازەی گوندی «کانگالۆ» دەژمێردرا. لەسەر پردەکە پۆستێکی سەربازی هەبوو. سەربازەکان بە سەرسوڕمانەوە دە تاکسییەکەوە ڕامابوون کە بە ترەتڕ بەرەو ئەوان دەچووە پێش. کاتێک لێیان نیزیک بووینەوە، چەکەکانیان بەرەو ئێمە ڕاداشت. ئەمجار نامەیەکم نیشان

دان کە لە لیما سەرهەنگ «کۆردوڤا» پێیدابووم و لەودا مووافەقەتی کردبوو کە یارمەتیمان بدا.

بە منیان گوتبوو کە دادوەر لە سەربازخانە دەبێ، بەڵام وەختێک گەیشتینە سەربازخانە و ئەمن خۆم بە فەرماندەری سەربازخانەکە ناساند، پێیان گوتین کە دادوەر تا سبەینێ بەیانی نایەتەوە.

فەرماندەری سەربازخانە کە سەروانێک بوو، گوتی: «ئەو خەریکی ڕاگەیشتن بە کوشتارێکی بەکۆمەڵە.» چەند پرسیارێکی دیکە لێرە و لەوێ بۆی ڕوون کردینەوە کە دادوەر سەرگەرمی لێکۆڵینەوەی کوشتارێکە کە ئەمن سەرەتای ساڵ هەوڵم دا نەیەڵم سەرهەنگ «کۆردوڤا» بیکا.

ئێمەماڵێکی چووکەڵەمان لە ئاوایی پەیدا کرد و ژوورێکمان بۆخۆمان و ژوورێک بۆ شۆفیری تاکسییەکە گرت. ئێمە شێوی ئەو شەوەمان کە بریتی بوو لە برنج و لووبیا (فاسوولیا)، لەبەر سێبەری مۆم خوارد، چونکە گوندەکە کارەبای نەبوو.

وە سبەینێ بەیانیڕا، دادوەرم لە دەفتەری کارەکەی بینی. بۆم ڕوون کردەوە کە، هاتوومە ئێرە تا لەلایەن «سینتیا مەک نامارا»وە قسە بکەم. کاتێک زانی ئەمن پارێزەر نیم، گوتی: «ئەمن ناتوانم قسە دەگەڵ تۆ بکەم.» دوایە کەمێک بیری کردەوە و گوتی: «نا، ئەتۆ دەتوانی لە لایەن ئەوەوە قسە بکەی، چونکە بەپێی قانوونی پێڕوو، هەموو کەس دەتوانێ لە دادگا بەرگری لە یەکی دیکە بکا.»

دادوەر کە پیاوێکی ڕووخۆش بوو، بەرگی نارەسمیی دەبەردا بوو و ساڵەکانی دەیەی ٣٠ی تەمەنی بەڕێ دەکردن، گوتی «مەک نامارا» لەسەر هەوڵی ڕووخاندنی دەوڵەت و بەشداری لە کردەوەی تێرۆریستیدا بانگ کراوەتە دادگا. ئەو پەرێشان دەهاتە بەرچاو و لەنێو دەفتەرەکەی دەهات و دەچوو. ئەو چەندین جار بە تەلەفون قسەی کرد و کەمێک دواتر کۆمەڵێک لە ئەندامانی پۆلیسی دژی تێرۆریزم هاتنە دەفتەرەکەی. پاش چەند ساتێک حەسانەوە، دۆسیەی

«مەک نامارا»ی دەرکێشا و چاوی لێکرد. هەروا کە چاوم لە پۆلیسەکان دەکرد، کەوتمە ئەو فکرەوە کە ڕەنگە وای هەست کردبێ ئەمن چوومە وێ بۆئەوەی هەڕەشەی لێبکەم.

دادوەر لە حاڵێکدا تەماشای وێنەی «مەک نامارا»ی دەکرد گوتی: «کچێکی جوانە. ئەمن پێم ناخۆش نەبوو بیبینم، بەڵام بردوویانەتە دادگای لیما. ئەمن حەز ناکەم دووبارە بیخەمە ژێر لێپرسینەوە. ئەم کارە لەوانەیە دووهێندەی مەترسی هەبێ. لەلایەکی دیکەوە بەڵگەی پێویست لە دژی وی لە دەستدا نیە. بۆیە ئەمن دەستوورەکەم وەردەگرمەوە.»

ئەمن لەو بڕیارە خێرایەی سەرم سوڕما و پرسیم، داخوا دەتوانم بەڵگەی ئەو بڕیارەی دەگەڵ خۆم بەرم. هەروەها حەزم دەکرد، لەبارەی کوشتارە بە کۆمەڵەکەوە زانیاریی پتر خڕ کەمەوە. هەرکە دەستم بە پرسیار کرد، سێ شووشە ویسکیی جانی واکێرم کە دەگەڵ خۆم هێنابوومن لەسەر مێزەکە دانان.

وا دیار بوو لەو ڕەفتارەی من ڕاچەنیوە، بەڵام ئەمن پێم داگرت کە ئەمانە دیاریی دۆستێکن. پاشان کەمێک پێم لەسەر بابەتی کوشتارە بەکۆمەڵەکە داگرت. لە وەڵامدا ئەو ڕوونی کردەوە کە پۆلیس -نەک سەربازانی سوپا- ئەویان بردۆتە شوێنەکە و گۆڕێکی بەکۆمەڵیان نیشان داوە کە ٩٠ کەسی تێدا نێژراون. سوپا بەرپرسایەتیی ئەو کوشتارە بەکۆمەڵەی خستۆتە سەر شانی «ڕێگای درەوشاوە» و ئەم گرووپەش بەرپرسایەتیی تاوانەکەی خسۆتە ئەستۆی سوپا.

ئەمن گوتم: «بەڕێز، حەز دەکەم بە سوێندێکی نووسراو، پێت بڵێم کە بەرپرسایەتیی ئەو کوشتارە لە ئەستۆی کێیە.»

ئەمن بۆ دادوەرم ڕوون کردەوە کە «کۆردوڤا» ئەو خەڵکانەی بە تۆڵەی کوژرانی سەربازەکانی لەنێو بردوە و لێم زیاد کرد کە ئەمن داوام لە «باربارا» کردبوو،کە هەواڵی ئەو کوشتارە بەکۆمەڵە بۆ ڕادیۆ بنێرێ، بەڵکوو پێش بەوکارەساتە بگیرێ. دوای ئەوەی

قسەکانی من تەواو بوون و لە پێش چاوی دوو پۆلیس ئیمزام کرد، دادوەر گوتی: «ڕافائیل کۆردوڤا، دۆستی منە، بەڵام دۆستانی منیش لەوانەیە هەڵە بکەن. هێندێ لە جووتیارەکانیش بەدژی وی شایەتییان داوە و لە دوو ڕۆژی ڕابردوودا ئەو لە لیما بووە. هێندێ لە ژنانیش شایەتییان داوە کە مێردەکانیان لەبەر چاوی خۆیان کوژراون و بە هێلیکۆپتەر بردوویاننەوە «ئایاکۆچوو». مایەی بێبەختییە کە ڕووداوێکی وا لە ناوچەی داوەریی مندا ڕووی داوە. هەرکەس لەو ڕووداوەدا گوناحکار بێ، دەکەوێتە بەر دادپرسی- چ ئەندامانی ڕێگای درەوشاوە بن، و چ ڕافائیل یان هەرکەسی دیکە. ئەمن بە وردی کار بۆ ئەوە دەکەم کە قانوون جێبەجێ بکرێ.»

بە ئیمزای ئەو شایەتنامەیە، سروشتی بوو کە ئەمن خۆم خستۆتە بەرامبەری سەرهەنگ «کۆردوڤا». «باربارا» لەو باسەدا گوتی: «ئەمن بەگومانم کە تەمەنمان مۆڵەت بدا، دووبارە لیما ببینین.»

ئێمە گەڕاینەوە «ئایا کۆچوو». ئێستا ئەمن دەبوو ئەو بەڵگانە کە نیشانیان دەدا دادوەر دەستووری خۆی هەڵوەشاندۆتەوە، بدەمە دادگای وێ، بەڵام سەعات ٥ی پاشنیوەڕۆ بوو و هەموو چووبوونەوە ماڵەکانیان. بەخۆشییەوە ئەمن توانیم، ئادرەسی ماڵی سکرتێری دادگا بەدەست بێنم و بەڵگەکانم بۆ بردنە ماڵەکەی. ئەو دۆسیەکەی وەرنەگرت و گوتی، ئەوانە دەبێ بە پۆست بەڕێ بکرێن.

ئەمن بە سکرتێری دادگام گوت، نیوسەعاتی دیکە دێمەوە و چوومە لای «مارکووس» ئەندامی حیزبی کۆمۆنیست. کە «مارکووس»م دیتەوە ٣٠٠ دۆلارم دایە و تکام لێکرد لە نێوان سکرتێری دادگا و سەرۆکی دادگادا بەشی بکا. پاش ماوەیەکی کورت «مارکووس» هاتەوە و گوتی سەرۆکی دادگا پێی خۆشە هەر ئێستا لە ماڵەکەی خۆی بتبینێ.

کاتێک چوومە ماڵی سەرۆکی دادگا، گوتی، لەپێشدا پێم وابوو دیتنی خەڵک دوای کاتەکانی دادگا ناقانوونییە، بەڵام پاش تەماشای کتێبی

قانوون، بۆم دەرکەوت کە لەکاتی بەپەلەدا هاونیشتمانێکی باش دەتوانێ بەڵگەکان بێنێ و بەرێ. بە هەرحاڵ، بەڵگەکان بێجگە لە سەرۆکی دادگا دەبوو دوو دادوەری دیکەش ئیمزایان بکەن و دوایە بنێردرێن بۆ لیما. پاش وتووێژێکی پتر ئەو ڕازی بوو کە تەلەفون بۆ دادیار و سکرتێری دادگا بکا و بانگیان بکاتە ماڵەکەی خۆی. سەعاتێک دواتر کۆبوونەوەی دادگا بە دژی «سینتیا مەک نامارا» لە ژووری دانیشتنی سەرۆکی دادگا پێکهات.

دادیار گوتی تۆمەتی «مەک نامارا» بەهێزە، چونکە دوو جووتیار ئەویان دەگەڵ گرووپی «ڕێگای درەوشاوە» دیوە، بەڵام دیارە ناوی جووتیارەکان ڕوون نیە. لە حاڵێکدا ئەمن ئەرکی پارێزەری «مەک نامارا»م بەجێ دێنا، گوتم، دادوەری «کانگالۆ» لە تۆمەتەکەی کۆڵیوەتەوە و بەڵگەیەکی دژی ئەو پەیدا نەکردوە و ئەمنیش دەگەڵ ڕایەکەی موافیقم.

سەرۆکی دادگا کەمێک بیری کردەوە و دوایە ڕایگەیاند: «ئەمن پێشنیاری پارێزەری خاتو «مەک نامارا» هاونیشتمانی باش، بێ مۆناشێ قبووڵ دەکەم. بابەتی تۆمەتەکە نەما.»

بەو حاڵە، دادیاری «ئایاکۆچوو» هەوڵی دا هەندێ تۆمەتی دیکە دژی «مەک نامارا» بدۆزێتەوە و ئەو ماوەی ۱۰ ڕۆژی دیکە لە زیندان وەمێنێ. سەرەنجام شەوی ۲۲ی ئووت ئەو لە زیندان ئازاد کرا و ڕۆژی دواتر پێرووی بەرەو ئیرلەند بەجێهێشت.

پاش بەرگرییەکی سەرکەوتوو کە بۆ یەکەمجار لە نەخشی پارێزەرێکدا ئەنجامم دا، گەڕامەوە لیما و چاوەڕێی وەرگرتنی هەواڵی گوازتنەوەی کەرەسە ئەتۆمییەکان لە لایەن «ڕۆبێرتۆ»وە بووم. لەو کاتەدا، خەبەرێک لە ڕۆژنامەکاندا بڵاو بۆوە کە بۆ مە ڕاچڵەکێن بوو. بەوجۆرە کە نووسیبوویان، گرووپی «ڕێگای درەوشاوە» هێرشیان کردۆتە سەر پێگەیەکی سەربازیی نیزیکی «کانگالۆ»، و دادوەرێکیان کوشتوە. ئەم دادوەرە، ڕاست ئەو کەسە بوو کە چەند ڕۆژ لەوەپێش

دیتبووم و نەخشی «کۆردوڤا» لە کوشتاری بەکۆمەڵی جووتیارانمدا بۆ شی کردبۆوە و شایەتیم دابوو. ئەمن بێ دوودڵی دەمزانی کێ بەرپرسی کوژرانی ئەم دادوەرە بووە.

لە ماوەی ٢٤ سەعاتدا تەواوی ڕاستیی مەسەلەکە ئاشکرا بوو. وردەوردە بەرپرسایەتیی ڕوداوەکە بەرەو سوپا ڕۆیشت و ڕادیۆی پێروو ڕاپۆرتی دا کە دوو هێلیکۆپتەری سوپا لە ناوچەی «ئایاکۆچوو» بە مووشەکی Stinger تەقیونەوە و ٢٠ سەرباز لەو ڕووودوەدا کوژراون. بۆ من ڕوون بوو کە مووشەکەکان هەر ئەو مووشەکانە بوون کە سەرهەنگ «کۆردوڤا» بە بزووتنەوەی «ڕێگای درەوشاوە»ی فرۆشتبوون، و ئێستا ئەندامانی بزووتنەوەی «ڕێگای درەوشاوە» ئەو مووشەکانەیان بە دژی هێزەکانی «کۆردوڤا» بەکار بردبوو. بێگومان «کۆردوڤا» لەپێشەوە ئەوکارەی پێش‌بینی کردبوو.

ئەمن لە پێشەوە قەرارم دانابوو نانی شەو دەگەڵ سەرهەنگ «کۆردوڤا» بخۆم و حەزم دەکرد ئەو بەرنامەیە سەر بگرێ. پێش ئەوەی ئەمن و «باربارا» و «کۆردوڤا» یەکتر ببینین، دەنگوباسی هێرشی بزووتنەوەی «ڕێگای درەوشاوە» لە هەموو جێیەک بڵاو ببۆوە. ئێمە لە ڕێستوورانێکی بەشکۆی لیما چاومان بە یەکتر کەوت.

ئەمن پێم گوت: «دەنگوباسێکی زۆر لەبارەی ئەم ڕووداوەوە باس دەکرێ و ئەمنیش لەو بارەیەوە بۆچوونی تایبەت بە خۆمم هەیە.» بەڵام، دیارە بۆچوونەکەمم شی نەکردەوە.

«بۆ من فەرق ناکا ئەتۆ چۆن بیر دەکەیەوە یان چدەبیسی. ئەمن بۆ چاکە و قازانجی نەتەوەکەم ئەرک بەڕێوە دەبەم.»

گوتم: «بەڵێ، ئەمن لەوەی دەیفەرمووی دڵنیام.»

«هەر کارێک دەیکەم، بۆ قازانجی خەڵکە، و ئەوان دەبێ بزانن دەسەڵات بەدەست کێوەیە. ئێمە دەمانەوێ پرد و جادە بۆ ئەو جووتیارە دەستکورتانە دروست بکەین. بەڵام ئەگەر ئەوان ببنە وەحشی و قانوون و ڕێوشوێنەکان لەبەر چاو نەگرن، هێندێ جار

دەبێ توند بەرامبەریان بجوولێینەوە. ئەگەریش پەیڕەوی لە قانوون و ڕێوشوێنەکان بکەن، ئێمە یارمەتییان دەدەین. ئەمن گومانم نیە کە ئەتۆ میکانیزمی ڕەفتاری ئێمە تێدەگەی. ئێوەش فەلەستینییەکان دەکوژن، وا نیە؟»

«ئەمن دەگەڵ ئەم قسانەت موافیق نیم.»

ئێمە بەبەر ئەم قسانەوە نانەکەی خۆمان خوارد. گومان نەبوو کە ئەو دەیەوێ بڕوا و خۆی لەدەست ئەو باسە ناخۆشە نەجات بدا، بەڵام حەزیشی دەکرد دوا قسەکانی خۆی بکا. بۆیە گوتی: «کارێک کە ئێمە لێرە دەیکەین پێوەندیی بە ئێوەوە نیە. ئێوە باشترە دەست لە کاری ئێمە وەرنەدەن. لەڕاستیدا، پێم وایە وەختی ئەوە هاتوە هەردووکتان ناوچەکە بەجێ بێڵن. دیارە پێڕوو هەمیشە ڕێز لە میوانانی خۆی دەگرێ، بەڵام وا بزانم خەریکە مانەوەتان لێرە مەترسیی بۆ ساز دەبێ. ئەندامانی «ڕێگای درەوشاوە» زۆریان ڕق لە ئێوە هەستاوە.»

«سەیرە؟»

هەرچەند سەرهەنگ «کۆردوڤا» ئاماژەیەکی بەو بابەتە نەکرد، بەڵام ئەمن دەمزانی ئەگەر ئازارێک بە ئێمە گەیشتبایە، گوناحەکەی داویشتە ئەستۆی «ڕێگای درەوشاوە». بەهەرحاڵ، ئێمە هێشتا دەمانتوانی لە مەسەلەی ئەو مووشەکانەی ئەو بە «ڕێگای درەوشاوە»ی فرۆشتبوون و ئێمە لە بەسەرهاتەکەی ئاگادار بووین، کەلک وەرگرین. جگە لەوەش، «باربارا»م لەگەڵ بوو و ئەگەر کەسێک نیازی کوشتنی ئێمەی هەبایە دەگەڵ ڕقی حکوومەتی ئیسرائیل بەرەوڕو دەبوو. لەبەر ئەم هۆیانە، ئەو نەیدەتوانی بە ئاسانی بێدەنگم بکا.

ئەمن بەنیاز بووم پێڕوو بەجێ بێڵم. بەڵام دەمەویست لەپێشدا مەئموورییەتەکەم جێبەجێ بکەم. بەیانیی ڕۆژی دواتر، «ڕۆبێرتۆ» تەلەفونی بۆ کردم و گوتی لە فرۆشتنی کەرەسەکاندا گیروگرفتێک

نیە، بەڵام ئەم کارە کەموزۆر دەوری ٣ یان ٤ حەوتوو دەخایەنێ. هەرچەند بڕیاری گوازتنەوەی کەرەسەکان هەروەک جارەکانی پێشوو بوو و هەر ئەو فڕۆکانە و ئەو فڕۆکەخانەیە بەکار دەبران، بەڵام تیمی لۆژێستیکیی ئیسرائیل دەبوو لە کاراکاس ئامادە بمێننەوە، چونکە هەمیشە لە دواساتی وەرگرتن و بەڕێکردنی کەرەسەکاندا زەنگی تەلەفون لێی دەدا. هەرچۆن بوو، ئەمن ڕاپۆرتی پێویستم لەو بارەیەوە بۆ ئیسرائیل بەڕێ کرد.

لەو وەختەدا کاری من لە پێروو تەواو ببوو. بەڵام پێش گەیشتنەوە بە ئیسرائیل، دەبوو مەئموورییەتێکی دیکە ئەنجام بدەم. بەو مەبەستە چوومە لەندەن و لەبارەی ئەو سێ فڕۆکەیەوە کە ئێرانییەکان داوایان کردبوون و «ئیسحاق شامیر»یش مووافەقەتی دەگەڵ فرۆشتنیان کردبوو، چاوم بە «نیکۆلا دیڤیس» کەوت.

ئێرانییەکان پێشتر بڕی ٣٦ میلیۆن دۆلار پارەی فڕۆکەکانی گۆڕینیان ڕژاندبووە دوو ژمارە حیسابی جەزایر «کەیمەن» Cayman، بەڵام، ئەمن دەبوو مەرجەکانی حکوومەتی ئیسرائیل لەبارەی فرۆشتنی ئەو فڕۆکانە بە ئێرانییەکانەوە دەگەڵ «دیڤیس» باس بکەم. ئەو دەبوو بە ئێرانییەکان بڵێ هەرچەند ئەوان پێشتر پووڵی فڕۆکەکانیان داوە، بەڵام تا دڵنیامان نەکەن سێ سەربازە ئیسرائیلییەکە لە لوبنان ئازاد دەکرێن، فڕۆکەکان خاکی ئیسرائیل بەجێ ناهێڵن.

بە خۆشحاڵی لەوەی هەموو مەئمووریەتەکەم بە سەرکەوتنەوە کۆتایی هاتبوو، گەڕامەوە ئیسرائیل. ئەو ئەزموونەی لە پێروو فێری بووم، بۆ بەرەوڕووبوونەوەی ئەو گیروگرفتانە کە لە دوارۆژدا لەپێشم بوون، زۆر بەنرخ بوو.

لە نێوەڕاستی ئووتی ساڵی ١٩٨٨دا، ئیسرائیل هەستی دەکرد دەگەڵ یەکێک لە ناسکترین هەڵکەوتەکانی مێژووی خۆی بەرەوڕوو بووە. «ئیسحاق شامیر» سەرۆکوەزیری ئیسرائیل دەستووری دابوو کۆنفرانسێک بۆ لێکدانەوەی ئەو قەیرانە پێک بهێنرێ و لە حاڵێکدا وا دەهاتە بەرچاو بەو جەستە لاوازەیەوە لەشساغییەکی جێی ڕەزامەندییشی نیە، دەگەڵ دووکەس لە هاوکارەکانی بە قەڵسی و تووڕەیی لە دالانی دەفتەری کاریەوە بەرەو ژووری کۆنفرانس هەنگاوی دەنا.

لەو کاتەدا، کەرەسەی شیمیایی شەڕ، مووشەک و تەکنۆلۆژیی ئەتۆمی کە لە خۆرئاواوە دەچوونە عێراق، «ئیسحاق شامیر»یان جاڕز کردبوو و ئەو بەنیاز بوو مەئموورییەت بدا بە گرووپێک لە کارمەندە ئیسرائیلییەکان کە ئەو ڕەوتە بوەستێنن. ئەندامانی ئەو گرووپە بریتی بوون لە: «ئەوی پزنەر» سەرۆکی ڕاوێژکارانی «ئیسحاق شامیر» کە بە سەرۆکی گرووپەکە هەڵبژێردرابوو، دووکەس لە ڕێکخراوی لێکۆڵەرانی هەواڵگریی سوپا بۆ ڕوونکردنەوەی مێژوولکەی بابەتەکە، دووکەس لە «مۆساد» بۆ پشتیوانیی عەمەلیاتی و ئەمنیش لەلایەن دەفتەری سەرۆکوەزیرەوە، هاوبەندیی گرووپەکەم لە ئەستۆ بوو. «شامیر» پێی خۆش بوو، عەمەلیاتەکە ڕاستەوخۆ لە دەفتەری خۆیەوە ڕێنوێنی بکرێ. چونکە دوو وڵاتی ئەمریکا و شیلی کە لەو کارەدا کۆمەگی عێراقیان دەکرد، هەردووکیان پێوەندیی دۆستانەیان دەگەڵ ئیسرائیل هەبوو،و لەبەر ئەوە مەسەلەکە زۆر ناسک بوو. ئەمن پێم سپێرابوو هەر پرۆژەیەک بۆ ئەو ئامانجە دابنرێ، جێبەجێی بکەم. «شامیر» و «پزنەر» تەنیا لە بەشێکی کاتی ئەو کۆنفرانسەدا ئامادە بوون. ئەوانی دیکەمان بە درێژایی ماوەی کۆنفرانسەکە لە گفتوگۆکاندا ئامادە بووین.

لەڕاستیدا عێراق، بۆ ئیسرائیل ببووە مایەی نیگەرانییەکی زۆر. ئەمریکا نەکھەر لەو بارەیەوە گوێی نەدەدایە نیگەرانیی ئیسرائیل، بەڵکوو لە بەرھەمهێنان و عەمبارکردنی کەرەسەی پێشکەوتووی شەڕدا کۆمەگی سەددام حوسێنیشی دەکرد. وڵاتانی شیلی و ئەفریقای باشووریش لافاوی کەرەسەی شیمیایی و دەزگا و ئامرازی پێوەندیداریان بەرەو عێراق وەڕێ خستبوو، و ئیسرائیل نەیدەتوانی ئەو ڕەوتە بوەستێنێ. بەڵام، ئاشکرا بوو کە ئیسرائیل ناتوانێ بەرامبەر بەو بابەتە بێدەنگ دانیشێ و پێویستە جووڵەیەک وەڕێ بخا.

کاتێک ئێمە بیرمان لە کۆمەگی شیلی بە عێراق لەبارەی ناردنی چەکی شیمیایی بۆ ئەو وڵاتەوە دەکردەوە، لە مێشکی ھەمووماندا وێنەی «پیشەسازیی کاردۆئێن» Cordoen Industries شەپۆلی دەدان. «پیشەسازیی کاردۆئێن» کۆمپانییەکی بەرھەمھێنانی کەرەسەی شەڕ بوو کە ناوەندە سەرەکییەکەی لە «سانتیاگۆ»ی وڵاتی شیلی بوو. خاوەنی ئەو کۆمپانییە «کارلۆس کاردۆئێن» Carlos Cordoen بوو کە ٩٩ لە سەدی بەشەکانی ھی خۆی بوون و یەک لە سەدی بەشەکانی کۆمپانییەکەشی دابوو بە ھاوسەرە تازە (دووەم)ەکەی.

وەختێک ئێمە لە ژووری کۆنفرانسی باڵەخانەی سەرۆکوەزیری دانیشتبووین، مێژوولکەی کۆمپانیی «کاردۆئێن»مان بۆ ڕوون کرایەوە. «کاردۆئێن» سەربە بنەماڵەیەکی دەوڵەمەندی شیلی و خاوەنی ڕەگەزێکی ئیتالیایی بوو. ئەو لە سەرەتای دەیەی ٢٠ ساڵیی خۆیدا لە ئەمریکا بەشی ئەندازیاریی کان (معدن)ی خوێندبوو و پاش کودەتای ژەنراڵ «ئاگووستۆ پینۆشێ» Augusto Pinochet، لە ساڵی ١٩٧٣دا گەڕابۆوە سانتیاگۆ و لە ڕێکخراوی کانەکانی شیلیدا کە سەربە دەوڵەت بوو، دەستی بەکار کردبوو. بەشێک لە کارەکەی ئەوە بوو کە بۆ کاروباری کانەکان کەرەسەی تەقینەوە بکڕێ و ئەو کارەی بۆخۆی بە کارێکی پڕسوود زانیبوو. کارمەندە ھەواڵگرییەکانی

ئیسرائیل دیتبوویان کە کۆمپانیی جۆراجۆر لە «کاردۆئێن» نزیک دەبنەوە، بۆئەوەی دینامیتی پێبفرۆشن. دیارە ئەگەر «کاردۆئێن» بڕیاری کڕینی دینامیتی دەدا، کۆمپانیی فرۆشیار کۆمیسیۆنی[٢٢] دەدایە. بۆیە ئەو هەر لە سەرەتای کارەوە فێری چۆنیەتیی پارەکۆکردنەوە ببوو.

«کاردۆئێن» دەگەڵ سەرۆکی ئەندازیارانی ڕێکخراوی کانەکانی شیلی ببووە دۆست و لەو دۆستایەتییە بە قازانجی خۆی کەلکی وەردەگرت. پاش ئەوەی لە لایەن ڕێکخراوی کانەکانی شیلییەوە دڵنیا کرا کە ئەو ڕێکخراوە هەموو پێویستییەکانی کاری تەقینەوە لەو دەکڕێ، لە کارکردن لەو ڕێکخراوەدا کشایەوە و وەک پەیمانکارێکی کەسی دەستی بە کار کرد. سەرکەوتنی «کاردۆئێن» لە موعامەلەی دینامیتدا هەستی بەرزەفڕی و سوودپەرستیی ناوبراوی زیاتر کرد و بڕیاری دا بکەوێتە نێو موعامەلەی چەکی وردە. دیارە سەرکەوتن لەو بوارەدا کارێکی زۆر ئاسان نەبوو.

ساڵی ١٩٧١ «کارلۆس کاردۆئێن» سەفەری ئیسرائیلی کرد و داوای لە Sibat، ئیدارەی هەناردەکردنی وەزارەتی بەرگری کرد ڕێگای پێبدرێ کەرەسەی جەنگیی ئیسرائیلی بە ئەفریقای باشوور بفرۆشێ. لە تیئۆریدا هەرکەس بیهەوێ لە ئیسرائیلەوە کەرەسەی جەنگی بەرێتە دەرەوە، دەبێ لەو ئیدارەیە مۆڵەتنامە وەربگرێ.

Sibat کاتەلۆگێکی بە زمانی ئینگلیزیی بە وێنەی ڕەنگاوڕەنگ و کاغەزی بریقەدار چاپ کردبوو و وردەکاریی ئەو چەکوچۆڵەیەی کە ئیسرائیل بۆ فرۆشتن هەیبوو، لە چەکی دەستییەوە تا تانک بە زمانێکی چەور و سەرنجڕاکێش لەو کاتەلۆگەدا شی کردبۆوە. کاتێک نوێنەری وڵاتێکی بێگانە، چەکوچۆڵەی پێویستی خۆی لەو کاتەلۆگەدا

[٢٢]- کۆمیسیۆن بەو پارەیە، یان داشکاندنە دەگوترێ کە لەوجۆرە موعامەلانەدا دەدرێ بە کڕیار، یان دەلال. (وەرگێڕ)

هەڵدەبژارد، داوای مۆڵەتی کڕینی لە Sibat دەکرد. لەو حاڵەتەدا Sibat فۆڕمێکی دەدا بە خوازیار کە دەبوو پڕی بکاتەوە و ئامانجی کڕیارەکە و دوابەکاربردنی چەکوچۆڵەکە لەسەر کاغەزێک بنووسێ و بە داخوازینامەکەیەوە بلکێنێ.

سەرۆکی Sibat کە بەڕێوەبەری گشتیی وەزارەتی بەرگری و سەرپەرستی فرۆشتنە دەرەکییەکانە، بۆ هەرداخوازێک کە بۆ کڕینی کەرەسەی جەنگی وەریدەگرێ، دۆسیەیەک دروست دەکا. پاشان کارمەندەکانی لێدەکۆڵنەوە داخوا ئەو کەرەسە داواکراوانە هەن یان نا؟ ئایا لەباری سیاسییەوە فرۆشتنیان ڕێگەپێدراوە یان نا؟ داخوا کڕیارەکە ئامانجی کڕینی چەکوچۆڵەکە و دوامەسرەفی کەرەسەکەی بە تەواوی ئاشکرا کردوە یان نا؟ و ئایا ئەو کەسەی بۆتە نێوبژیوانی کڕینوفرۆشتنەکە، کەسێکی شەریف و متمانەپێکراوە یان نا؟ پاشان دۆسیەکە دەنێردرێتە دەفتەری بەڕێوەبەری گشتیی وەزارەتی بەرگری و ئەویش دوای پەسندکردنی بابەتەکە دەینێرێتە کۆمیتەی وەزیران کە حەوتووی جارێک پێکدێ. ئەندامانی کۆمیتەی وەزیران بریتین لە: سەرۆکوەزیر، وەزیری بەرگری، وەزیری دەرەوە و وەزیری کاروباری دارایی. ئەگەر کۆمیتەی وەزیران، فرۆشتنی کەرەسە جەنگییەکە بە خوازیاری کڕینەکەی پەسند کرد، دۆسیەکە دەنێردرێتەوە Sinat و ئەو ڕێکخراوە مۆڵەتنامەی فرۆشتنی کەلوپەلە داواکراوەکە دەردەکا. هێندێ وەخت، کۆمەڵە مەرجێکی دیکەش بەسەر کڕیاری چەکوچۆڵەکەدا دەسەپێندرێن.

Sibat بۆ ئیشکەرانی پێشووی سوپای ئیسرائیل و کەسانی دیکەش کە پێیان خۆش بێ لە ئیسرائیل کۆمپانیی موعامەلەی کەرەسەی شەڕ دامەزرێنن و لقی لە وڵاتانی دیکەش هەبێ، مۆڵەتنامە دەردەکا. Sibat هەروەها بۆ سەوداگەرانی بێگانەی چەکوچۆڵیش مۆڵەتنامە دەردەکا و لەو ڕێگایەوە شایەتی دەدا کە خاوەنی مۆڵەتنامەکە سەوداگەرێکی

متمانەپێکراوی کەرەسەی شەڕە کە دەتوانێ پێشنیاری کڕینی چەک بە ئیسرائیلیش بدا. ئێستا دەبێ بزانین کە ساڵی ١٩٧٩، ئەو کاتەی «کارلۆس کاردۆئێن» داوای مۆڵەتنامەی کڕین و فرۆشتنی کەرەسەی شەڕ لە ئیسرائیلی کردبوو، مۆڵەتنامەی لە جۆری ئاخر بۆ دەرکرا. دیارە «کاردۆئێن» بۆ بەدەستهێنانی مۆڵەتنامەی ئیسرائیل، مۆڵەتنامەیەکی بە کاربەدەستانی ئیسرائیل نیشان دابوو کە پێشتر وەزارەتی بەرگریی شیلی بۆی دەرکردبوو و ئەوان لەسەر بناخەی مۆڵەتنامەی وڵاتی شیلی مۆڵەتنامەیان بۆ دەرکردبوو.

ساڵی ١٩٧٩، کاتێک «کاردۆئێن» هاتبووە سەردانی ئیسرائیل، ئیدارەی پێوەندییەکانی دەرەوەی وەزارەتی بەرگریی ئەم وڵاتە کە بەرپرسی پێوەندییەکانی نێوان ڕێکخراوی هەواڵگریی سوپا و خزمەتە بێگانەکان بوو، داوای لە Sibat کردبوو کە چۆنیەتیی ڕابردووی «کاردۆئێن» لە پاشکۆی سەربازیی شیلی لە ئیسرائیل بپرسێ. ئەمن، ئەوکاتە لە ئیسرائیل «کاردوئێن»م دیبوو. ئەوم وەک پیاوێکی بەرزەفڕ هاتە بەرچاو کە خوێندەوارییەکی باشی هەبوو. بەڵام، ئەو خۆپارێز نەبوو، دیار بوو گوێی نەدەدایە بارودۆخی سیاسیی دەوروبەری خۆی. ئەو زیاتر وەک بەکرێگیراوێک دەچوو کە دەیەویست بە شەوێک لە تەمەنی لاوەتیدا دەستی بگاتە سەروەت و سامان (لەپڕێک ببێتە کوڕێک)، بەڵام دیارە متمانەبەخۆبوونی بەهێز بوو و لە «سانتیاگۆ»ش ڕێکخراوێکی ئیداریی گەورەی هەبوو.

بەڵام، وەختێک بۆ یەکەمجار، «کاردۆئێن» داوای مۆڵەتنامەی کڕینی کەرەسەی شەڕی لە ئیسرائیل کرد، بۆ ماوەیەکی کورت تووشی نائومێدی بوو. چونکە ئیسرائیل داخوازەکەی ڕەت کردەوە. تەنیا پێشینەیەک کە ئیسرائیل لە «کاردۆئێن»ی لەدەستدا بوو، ئەوە بوو کە ئەو لە ڕابردوودا دینامیتی کڕیبوو.

ئەوکات تا ئەو جێیە کە ئێمە دەمانزانی، «کاردۆئێن» خاوەنی پێوەندیی سیاسی نەبوو. ئەگەر ئەو خاوەنی ئەو جۆرە پێوەندییانە بووایە، بێگومان شانسێکی زیاتری بۆ بەدەستهێنانی مۆڵەتنامەی موعامەلەی کەرەسەی شەڕ دەبوو. ئێمە دواتر پێمانزانی کە ئەو لە شیلی کاتەلۆگەکانی Sibatی بە خەڵک نیشان داوە و بەڵێنی پێداون، کە دەتوانن ئەوەی لە کاتەلۆگەکەدا هاتوە بکڕن. بەڵام ئیسرائیل تەنیا دەگەڵ کەسانی پیشەیی موعامەلەی دەکرد. وەک ژەنراڵەکانی پێشووی سوپا کە خاوەنی پێوەندیی سیاسییش بوون. بۆیە، هیچ ڕێگایەک نەبوو بۆئەوەی کەسێکی لاو و نەناسراو کە خەڵکی شیلی بوو، بتوانێ مۆڵەتنامەی کڕین و فرۆشتنی کەرەسەی شەڕ لە ئیسرائیل بەدەست بێنێ، بەتایبەتی کە ئەو گومانەش هەبوو کە سەوداگەرانی وەکوو ئەو تەونوبەستێکیان دەگەڵ دوژمنانی ئیسرائیل هەبێ.

پاش ئەوەی داخوازی «کاردۆئێن» ڕەت کرایەوە، ئەو ڕاستەوخۆ لە ئیسرائیلەوە فڕی بۆ ئەفریقای باشوور. لە ئەفریقای باشوور ئەو بە کۆمەگی باڵیۆزی شیلی لەو وڵاتە کە دۆستی بابی بوو، لە ڕێکخراوی بەرهەمهێنی کەرەسەی شەڕ بۆ حکوومەتی ئەفریقای باشوور، (ARMSCOR) مۆڵەتنامەیەکی سەوداگەریی کەرەسەی شەڕی بەدەست هێنا. پاشان ئەو بە مۆڵەتنامەکەوە گەڕایەوە شیلی و بە کۆمەگی دۆستانی بابی هێندێ قەرزی لە بانکەکانی شیلی وەرگرت. بەڵام، دیارە ئەم بەشە لە ژیانی «کاردۆئێن» و هۆی سەرکەوتنەکانی لە ئەنجامدانی ئەو بەرنامانەدا بۆ ئێمە ڕوون نیە.

لە کۆنفڕانسی ئووتی ١٩٨٨دا، سەرۆکوەزیر «شامیر» کە بە وردی گوێی بۆ مێژوولکەی ژیانی «کاردۆئێن» ڕادەگرت، گوتی: «ئەم کاردۆئێنە پێی وایە متمانەی بەخۆیەتی، بەڵام لەڕاستیدا وا نیە.»

«شـــامیر» و «پزنـــەر» هـــەر بەشـــێک لـــە مێژوولکـــەی ژیـــانی «کـــاردۆئێن»یـــان گـــوێ لێگـــرت، بـــەڵام ئەنـــدامانی دیکـــەی کـــۆنفرانس دەگەڵ ژیانی وی تا ئەو دەمەساتە کە دەستی بە فرۆشتنی چەک بە عێـراق کردبـوو، ئاشـنا بـوون. کارمەنـدانی هـەواڵگریی ئیسـرائیل، ڕوونیـان کـردەوە کـە لـە دەوروبـەری سـاڵی ١٩٨٢دا، یـەکێک لـە ئیشکەرانی ARMSCOR، «کاردۆئێن»ی بۆ کڕینی کەرەسەی شـەڕ، بـە جێگری سـەرۆکی سـتادی سـوپای عێراق ناسـاندوە و لـە سـەرەتای ساڵی ١٩٨٥ەوە «کاردۆئێن» بـەکردەوە، بۆتـە فرۆشیاری کەرەسـەی جەنگی بە عێراق.

«کـاردۆئێن» فرۆشـتنی کەرەسـەی شـەڕ بـە عێراقـی بـە کۆمـەگی ARMSCOR و پشـتیوانیی هێنـدێ کەسـی سـەربە حکوومـەتی ئـەمریکا ئەنجام دەدا. یەک لەو کەسانە «ئالان سەندێرز» بـوو کـە سـەربە CIA بـوو. «سـەندێرز» لـەژێر سەرپۆشـی کۆمپانیی iitico یـان «کۆمپـانیی نێونەتـــەوەیی تەکنۆلۆژییـــە پێگەیشـــتووەکان»دا کـــاری دەکـــرد. «کـاردۆئێن» کـە یەکـەمین و ڕەنگـە تاقـە کڕیارەکـەی، عێـراق بـوو، فۆرمـوولی تـەکنۆلۆژیی بۆمبـە هێشـوویی‌یـەکانی لـە «سـەندێرز» وەردەگرت. دەگەڵ ئەوەی ڕێکخراوی نەتـەوە یەکگرتووەکان، کڕین و فرۆشتنی کەرەسـەی شـەڕی لـە شیلی قەدەغـە کردبوو، «کاردۆئێن» دەگـــەڵ ڕێکخـــراوی پیشەســـازیی ســـەربازیی شـــیلی و بـــەهۆی مۆڵەتنامەیەکەوە کە ئەمریکا بـە نهێنـی بـۆی دەرکردبوو، دەستی کرد بە بەرهەمهێنانی بۆمبی هێشوویی.

ساڵی ١٩٨٥ مەئمووریـەت درا بـە مـن کـە بچمـە ئـەمریکا و خـۆم لـە «سـەندێرز» نیزیـک بکەمـەوە. پـاش پێوەنـدی دەگـەڵ «سـەندێرز» پێمگـوت دەمـەوێ بـۆمبی هێشـوویی بـۆ ئیسـرائیل بکـرم. دیـارە ئێمـە بۆمبی هێشووییمان لە ئەفریقای باشوور وەردەگرتن، بـەڵام ئیسـرائیل دەیەویست لەو بۆمبانەی زیاتر هەبێ و بـە تایبـەتی دەسـتی بـە بۆمبـە

هێشوویی‌یەکانی دروستکراوی شیلی ڕابگا کە تازەترین تەکنۆلۆژیی ئەمریکا لە بەرهەمهێنانیاندا بەکار دەبرا. لەلایەکی دیکەوە،ئێمە دەمانەویست بزانین داخوا لەجێدا ئەو جۆرە بۆمبانەمان پێ دروست دەکرێ یان نا. ئەمن باش دەمزانی کە لە لەوکاتەدا فرۆشتنی بۆمبی هێشوویی بە ئیسرائیل لە لایەن ئەمریکاوە قەدەغە کراوە و «سەندێرز»یش ئەم بابەتەی وەبیر هێنامەوە. بەوحاڵە، ئەو منی بردە دەفتەری «ڕیچارد بابایان» لە ڤێرجینیا. «ڕیچارد بابایان» ئەرمەنییەکی ئێرانیی سەوداگەری کەرەسەی شەڕ و پەیمانکار (قۆنتەراتچی)ی CIA بوو. ئەمن بەڕێکەوت تێگەیشتم کە « بابایان» ٢٠ ساڵ پێشتر لە قوتابخانەی کۆمەڵی ئەمریکایی‌یەکان لە تاران هاوپۆلی من بووە. «بابایان» بۆی ڕوون کردمەوە کە «کاردۆئێن» دەتوانێ بۆمبی هێشوویی بە ئیسرائیل بفرۆشێ و ئەمە ئەو شتە بوو کە دەمەویست بیزانم.

«سەندێرز» ڕوونی کردەوە: «کاردۆئێن هەرکەس پووڵی بداتێ، بۆمبی پێ‌دەفرۆشێ.»

چەند حەوتوو دواتر، سندووقێکی داری سەربە نوێنەرایەتیی ئیسرائیل کە بۆمبی هێشوویی تێدا بوون لە «سانتیاگۆ»وە نێردرایە نیۆیۆرک و لەوێوە بە فڕۆکەیەکی بۆینگی ٧٠٧ی سەربازیی ئێمە گەیشتە تەل ئەبیب. ئەگەر بەدەستهێنانی بۆمبی هێشوویی بۆ ئێمە ئەوەندە ئاسان بوو، خوا دەزانێ عێراق چەند دانە لەوانەی لە «کاردۆئێن» دەست کەوتبوون.

ساڵی ١٩٨٥ کە ئێمە لە بارودۆخەکە ئاگادار بووین، «ناچووم ئەدمونی» سەرۆکی «مۆساد» پێوەندیی دەگەڵ «ڕابێرت گەیتس» جێگری هەواڵگریی CIA گرت و پێی‌گوت کە ئیسرائیل لەو کۆمەگە سەربازییانەی بەعێراق دەکرێن، بە تایبەتی کۆمەگی وڵاتانی شیلی و ئەفریقای باشوور، زۆر نیگەرانە. «کاردۆئێن» لەو کاتەدا، دوو

کارخانەی بۆ بەرهەمهێنانی کەرەسەی شیمیایی شەڕ لە سانتیاگۆ دامەزراندبوون. کارخانەیەکیشی بە هاوکاریی سوپای شیلی، بۆ بەرهەمهێنانی بۆمبی شیمیایی هەبوو و هەروەها کارخانەیەکی سێیەمیشی بۆ بەرهەمهێنانی کەرەسەی شیمیایی شەڕ لە «پاڕاگوا» دروست کردبوو. بێجگە لەوە، ئەو سەرگەرمی بنیاتنانی کارخانەیەکی بەرهەمهێنانی کەرەسەی شیمیایی شەڕ لە دەرەوەی بەغدا بوو.

ئامراز و دەزگاکانی بەرهەمهێنانی کەرەسەی شیمیایی شەڕ بۆ کارخانەکانی «کاردۆئێن»، کابرایەکی میسری بە ناوی «ئیحسان باربووتی» کە لە ئەمریکا دەژیا، لە ئەڵمانی خۆرئاوا دابینی دەکردن. «باربووتی» پێشتر کەرەسەی شیمیایی شەڕی بۆ لیبیا دابین دەکرد و ئیسرائیلییەکان بۆیان دەرکەوتبوو کە ئەو لە ساڵەکانی دەیەی ١٩٥٠دا، کارێکی کردبوو کە زانایانی پێشووی نازی لە وڵاتی میسر لەسەر تەکنۆلۆژیی مووشەک کار بکەن. دیارە لە کۆتایی ساڵەکانی دەیەی ١٩٥٠دا «مۆساد» هەموو زانایانی ناوبراوی لەنێو برد. «باربووتی»یش بە ئاسانی دەکرا لەلایەن کارمەندانی «مۆساد»ەوە بکوژرێ، بەڵام خۆی شاردەوە و کردیە دەنگۆ کە مردوە. لە ساڵەکانی سەرەتای دەیەی ١٩٨٠دا، دووبارە سەروسەکوتی «باربووتی» لە ئەمریکا دەرکەوتەوە. ماوەیەک پاش ئەوەی «باربووتی» کەرەسەی شیمیایی شەڕی دا بە لیبیا، بەگوێرەی پێشینەکانی ڕێکخراوی هەواڵگریی ئیسرائیل ئەو لە تەکزاس و فلۆریدا جێگیر بوو و دەگەڵ CIA ڕێک کەوت کە لە نێو وڵاتانی عەرەبیدا کاری بۆ بکا.

لە جەنگەی کۆنفرانسی ئووتی ١٩٨٨دا، کارمەندانی هەواڵگریی ئیسرائیل ڕوونیان کردەوە کە «کاردۆئێن» کەرەسەی شیمیایی شەڕ کە لە «سانتیاگۆ» و «پاڕاگوا» بەرهەم هاتوە دەگەڵ دەزگاگەلێک کە «باربووتی» بۆی ئامادە دەکا، بە فڕۆکەی باریی ٧٤٧ی فڕۆکەوانیی

عێراق دەنێرێتە بەغدا. بەجۆرێک کە نووسراوی سەر سندووقە دارەکانی ئەو کەرەسە شیمیاییانە کە نیشانی دەدا دەبێ بچنە عێراق، بە ئاشکرا لە گۆشە و کەناری فرۆکەخانەی «سانتیاگۆ» دیار بوون. «کاردۆئێن» بۆ فرۆشتنی بەرهەمە جەنگییەکانی لە بانکەکانی ئەمریکا وەک Valley National لە ئەیالەتی ئاریزۆنا بەهرەی وەردەگرت. ئەو هەروەها لە کارخانەیەک لە «بۆکا ڕاتۆن»ی ئەیالەتی فلۆریدا بۆ وەدەستهێنانی کەرەسەی خاو بۆ بەرهەمهێنانی کەرەسەی شیمیایی شەڕ کەلکی وەردەگرت. ئێمە دەشمانزانی، لەحاڵێکدا «ئالان سەندێرز» فۆرموولی بۆمبە هێشوویییەکانی دەدا بە «کاردۆئێن»، کۆمپانیی «گاما» لە ئەمریکا کە سەربە ڕێکخراوی CIA بوو، کەرەسە و کانزای پێویست بۆ بەرهەمهێنانی بۆمبی هێشوویی بە «کاردۆئێن» دەفرۆشت.

کۆتایی ساڵی ١٩٨٦، سەرۆکوەزیر «شامیر» نیگەرانیی توندی خۆی لە ناردنی کەرەسەی جەنگی بۆ عێراق بە ئەمریکا ڕاگەیاند و هەڕەشەی کرد کە ئەگەر گوێ نەدرێتە نیگەرانیی ئیسرائیل لەو بارەیەوە، ئەو پەنا بۆ کۆنگرەی ئەمریکا دەبا. «ڕابێرت گەیتس» کە ئەودەم، جێگری CIA بوو، تەنیا بۆ ئارامکردنەوەی ئیسرائیلییەکان، کۆنفرانسێکی نهێنیی لە «سانتیاگۆ» ڕێکخست. ئەو کۆنفرانسە لە ژوورەکەی من لە هۆتێل Carrera پێکهات. لە دیدارێکدا کە ئێمە دواتر لە ئووتی ساڵی ١٩٨٨دا لە دەفتەری سەرۆکوەزیری ئیسرائیل بوومان، ئەمن وردەکاریی ئەو کۆنفرانسەم بۆ کەسەکانی دیکە ڕوون کردەوە.

بەشدارانی کۆنفرانسی نهێنیی «سانتیاگۆ» بریتی بوون لە: «کارلۆس کاردۆئێن»، «ڕابێرت گەیتس»، «سەناتۆر جان تاوەر»، ژەنراڵ «پیتەر ڤان دێر ویست هووەیزن»، سەرۆکی ڕێکخراوی هەواڵگریی سوپای ئەفریقای باشوور، دەگەڵ نوێنەری Armscor،

ژەنـراڵ «ئـادۆلفۆ سـتانگ» Adolfo Stange سـەرۆکی پۆلیسـی شێوەسەربازیی شیلی و خودی خۆم. نوێنەرانی شیلی و ئەفریقای باشوور پێرستێکی ئەو کەرەسە جەنگی و دەزگایانەیان نیشانی ئەندامانی کۆنفرانس دا کە بەپێی پێ‌لێنانی خۆیان بە عێراقیان فرۆشتبوون. پێرستی ئەو چەکوچۆڵانە بریتی بوو لە: ئامرازی تۆپخانە، ترومبێلی زرێ‌پۆش، تایە، ئامرازی یەدەکیی فڕۆکەی سەربازی و تەقەمەنی، ڕاکێت، نارنجۆکی دەستی و شتی دیکە. وەک دەبینرێ لەو پێرستەدا هیچ ئاماژەیەک بە کەرەسەی پێشکەوتووی شەڕ نەکراوە.

لەو کۆنفرانسەدا «گەیتس» بە ئاشکرا گوتی ئەمریکا پێی‌خۆشە، ڕێگای ناردنی چەک بۆ عێراق ئاوەڵا بمێنێ. ئەو ڕوونی کردەوە، «بە فرۆشتنی کەرەسەی ئاسایی شەڕ -نەک پێشکەوتوو- دەبێ کۆمەگ بەعێراق بکەین تا لە ناوچەی نفووزی خۆیدا بمێنێتەوە». «گەیتس» لێی زیاد کرد کە ئیسرائیل بە خۆڕایی تووشی نیگەرانی بووە و بەڵێنی دا کە لەو ڕێگایەوە زیانێک بە ئیسرائیل ناگا. هەروەها لە قسەکانی وا دەردەکەوت کە ئیسرائیلییەکان درێژە بە فرۆشتنی کەرەسەی شەڕ بە ئێران دەدەن و وڵاتی ئەفریقای باشووریش دەگەڵ ئەوەی ئیسرائیل پێی ناخۆشە، کەرەسەی جەنگی بۆ عێراق دەنێرێ.

بێگومان ئەو کۆنفرانسە بۆیە پێکهاتبوو تا پەردەیەکی خوری بە چاوی ئیسرائیلدا بدا. دوای کۆتایی کۆنفرانس، هەروەک چاوەڕوان دەکرا، «کاردۆئێن» درێژەی بە فرۆشتنی کەرەسەی شیمیایی شەڕ و بۆمبی هێشوویی بە عێراق دا و ئیسرائیل لەوە کە ئەمریکا کارێکی بۆ ڕاگرتنی چوونی چەک بۆ ئەو وڵاتە نەکرد، لە نیگەرانیدا مایەوە. بە درێژایی ساڵی ۱۹۸۷، ئیسرائیل چەندین جار داوای لە شیلی کرد ناردنی کەرەسەی شەڕ بۆ عێراق ڕابگرێ، بەڵام هەروەک ئەمریکا

گوێی نەدایە داخوازی ئیسرائیل لەوبارەیەوە، پریزیدێنت پینۆشێیش ئاوڕی لەو بابەتە نەدایەوە.

ئەو بارودۆخە ڕۆژبەڕۆژ ترسی ئیسرائیلی زیاد دەکرد: بەهێزترین دوژمنی ئێمە واتە عێراق، ڕۆژبەڕۆژ بە کۆمەگی بەناو دۆستەکانمان پاشەکەوتی چەکە سامناک و کوشندەکانی زیاد دەکرد، و چونکە «ڕابێرت گەیتس»یش بە ئاشکرا ناردنی کەرەسەی جەنگی بۆ عێراقی پشتڕاست کردبۆوە، ئێمە دەبوو بۆخۆمان لە فکری چارەدا بین.

«ئیسحاق شامیر» پیاوێک نەبوو بە ئاسانی لە ئەمنیەتی ئیسرائیل بگوزەرێ، ئەویش بە قسەی کارمەندێکی CIA. بۆیە لە کۆنفرانسی ئووتی ١٩٨٨دا ئێمە گەیشتینە ئەو ئاکامە کە بۆخۆمان دەبێ بەگژ گیروگرفتەکەدا بچینەوە و ڕێگەچارەسەرێکی بۆ بدۆزینەوە. بۆ ئەو مەبەستە، ئەمن فێر کرام بچمە شیلی، چاوم بە «کاردۆئێن» بکەوێ و هەوڵ بدەم بە شێوەی ئاشتیخوازانە هانی بدەم هاوکاریی ئیسرائیل بکا. ئەگەر ئامادە نەبوو هاوکاری بکا، دەبوو تێیبگەیەنم کە چاوەڕوانی هەنگاوی دواتری ئێمە بێ.

ئەمن سێپتامبری ١٩٨٨ گەیشتمە شیلی. ئەو ڕۆژنامەیەی «باربارا» کاری دەگەڵ دەکرد، ئەوی لە پێڕووە گوازتبۆوە شیلی و لە سانتیاگۆ ئاپارتمانێکی بەکرێ گرتبوو. ئەمن بە تاکسی بەرەو ئاپارتمانەکەی وەڕێ کەوتم. باڵەخانە بازرگانییەکانی «سانتیاگۆ» کە لەنێو کلیسا دێرینەکاندا سەریان گەیاندبووە ئاسمان، سەرنجی منیان ڕاکێشا.

جیاوازیی نێوان دەوڵەمەندان و دەستتەنگان لەڕادە بەدەر بوو. خانووە ڕازاوەکانی چینی ناوەندی کەوتبوونە بەشی باکووریی شارەکە و ماڵە پیسەکانی هەژاران لە پشت دار و دیواردا شاررابوونەوە. بەجۆرێک کە نەدەکەوتنە بەر چاوی ئەو تەماشاچییانە کە لە فرۆکەخانەوە دەچوونە بەشی باکووریی شارەکە و ئەوان

نەیاندەتوانی دۆخە ڕاستەقینەکە ببینن. جارێکیان ڕۆژنامەنووسێک کە بە سەردان چووبوو، گوتی شیلی خەریکە لە پێکهاتەی نەریتیی وڵاتانی ئەمریکای باشوور جیا دەبێتەوە و ڕەگەڵ کۆمەڵە پێشکەوتووەکانی ئورووپا دەکەوێ. بێگومان ئەو کەسە یەک لە خەڵکێکی زۆر بوو کە لە تێگەیشتنی ژیانی ڕاستەقینەی خەڵکی ئەم وڵاتەدا فریو درابوون.

ئەمن لە سەفەری ساڵی ١٩٨٦ی خۆم بۆ شیلیدا کە دەگەڵ «گەیتس» و کەسانی دیکە کۆنفرانسێکمان لە «سانتیاگۆ» هەبوو، باشم لەبیرە کە ئەگەر لە ڕێستوورانێکی کراوەی ناوچەی باشووری شار دانیشی، دەتوانی ببینی کە منداڵان لە دەفری زبڵوزاڵی دەوڵەمەندەکاندا بۆ خواردەمەنی دەگەڕێن. ئەمن هەروەها لەبیرمە کە ئەم وڵاتە، زۆری ئەمریکایی خۆوڵاتی لێنین، کۆچەرە ئورووپایی-یەکان بە کوشتنی خۆوڵاتییەکان گیروگرفتی وانیان چارەسەر کردوە. دواتر شیلی بوو بە یەکێک لە یەکەمین دێموکراسییەکانی ئەمریکای باشوور. ئەو تیئۆرییە کە دەڵێ «ناحەزانی دێموکراسی بکوژە، تا دێموکراسی دروست ببێ» ئەمڕۆش وەک خۆی ماوە.

لەو بارودۆخە تایبەتییەدا، مەئموورییەتی من ئەوە بوو کە یەکێک لە سامناکترین ڕێژیمەکانی ئەمریکای باشوور قانیع بکەم کە ناردنی کەرەسەی کوشندەی شیمیایی شەڕ بۆ عێراق ڕابگرێ. هەزاران کەس لە وڵاتی شیلی لەسەر ئەوەی پێیان لەبەرەی خۆیان پتر ڕاکێشابوو، بەشێوەیەکی ئەفسووناوی مردبوون. تەنیا چەکی من بۆ بەجێگەیاندنی مەئموورییەتەکەم وشەکان بوون و ئەمن دەمزانی کە دەبێ زۆر بە وردی بەکار ببرێن.

یەکەمین چاوپێکەوتنم دەگەڵ ژەنەڕاڵ «ئادۆڵفۆ ستانگ» فەرماندەری پۆلیسی نیوەسەربازیی پریزیدێنت «پینۆشێ» بوو.

ئیـــدارەی ناوەنـــدیی پـــۆلیس باڵەخانەیـــەکی قـــایمی هـــەبوو و پەنجـەرەکانی بـە میلـەی ئاسـن پـارێزرابوون. منیـان بـردە بـەرزترین نهـۆمی باڵەخانەکـە. کاتێـک لـە ئاسانسـۆر چوومـە دەرێ دەگـەڵ دەرگایـەکی شووشـەیی بـەرەوڕوو بـووم کـە کـامێرا ئەمنیەتییەکـەی لەسـەری دابەسـترابوو، لەسـەرمن ڕاگیـرا. پـاش ئـەوەی بـە داڵانێکدا تێپـەڕیم کـە فەڕشـی سـووری لـێڕاخرابـوو و پەنجـەرەکانی بەسـەر شاریاندا دەڕوانی، پیاوێکی بەسام بۆ سڵاوکردن بەپیرمەوە هات. ئەم پیاوە ژەنراڵ «ستانگ» بوو کە پیاوێکی وەنێوکەوتووی سەرڕووتاوە بـوو و یۆنیفـۆڕمێکی سـەوزی دەبـەردا بـوو. ژەنـراڵ «سـتانگ» لـە دووسـاڵ پێشـترەوە کـە بـۆ دواجـار لـە هـۆتێلی Crrera دیتبووم، هیچ نەگۆڕابوو. ئەوەی گۆڕابوو، ژمارەی ئـەو کوژراو و بێسەروشوێنانە بوو کە هۆکاری لەنێوبردنیان بە ناوی ئەوەوە بەسترابۆوە.

ئـەو بـە ئینگلیزییـەکی ڕەوان گـوتی: «دووبـارە بـەخێرێی بـۆ شـیلی، جـەنابی بـن مۆناشـی. هیـوادارم مـاوەی مانـەوە لێـرەت خـۆش لـێ-بگوزەرێ. لە هۆتێل Carrera دابەزیوی؟»

«نەخـەیر، ئاپارتمـانێکم لێـرە بـەکرێ گرتـوە، چونکـە ماوەیـەک لێرە دەمێنمەوە.»

بۆ ساتەوەختێک بێدەنگییەکی سەرسوڕهێن کەوتە سەر ژوورەکە و نیگەرانییـەکی قـووڵ لەسـەر ڕوخسـاری دەرکـەوت، بـەڵام هـەوڵی دا بیشارێتەوە.

«ئاوا، کەوایە ماوەیەک میوانی ئێمـە دەبی. زۆر بـەخێر بێی. هـەوا خەریکە گـەرمی بکـا و ئـەمن هیـوادارم زۆر چێـژ لـە شـیلی وەربگـرێ. دڵنیـام جـاری دیکـەش یـەکتر دەبینـین. تکـا دەکـەم ئێـرە وەک مـاڵی دووەمی خۆت دابنێ.»

ئـەو گـوتی چێـژم لـە سـەردانی ئیسـڕائیل بەتایبـەتی ئۆرشـەلیم و بەیتوللەحم وەرگرت.

«دڵنیام باڵیۆزخانەی ئیسرائیل و باڵیۆزی ئێوە لە بوونی تۆ لێرە ئاگادارن.»

«ژەنراڵ، ئەمن لەلایەن سەرۆکوەزیری ئیسرائیلەوە و بەنهێنی هاتوومە ئێرە تا بابەتگەلی دڵخوازی وی بە ئاگاداریی ئێوە بگەیەنم.»

بە ڕووگرژییەوە پرسی: «ئێستا تێدەگەم بۆچی هاتوویە ئێرە؟ داخوا بەڵگەنامەی سیاسی بۆ شیلیت پێیە؟»

«نەخەیر بەڕێز، ئەمن پاسپۆرتێکی ئاسایی و یەکی سیاسیم پێیە کە من وەک باڵیۆزی گەڕۆکی دەفتەری سەرۆکوەزیری ئیسرائیل نیشان دەدا.»

«زۆر باشە، تکایە پرسیارەکەم بە بێئەدەبی مەزانە. دەمەوێ لە وەزعی مانەوەت لێرە ئاگادار بم و بزانم بە شێوەی کاتی کەلک لە شوێنی مانەوەی باڵیۆزەکەتان وەردەگری، یان نا.»

« بەباوەڕی جەنابت بوونی من لێرە گیروگرفتێکی هەیە؟»

«نا،نا، هیوادارم خەراپ حاڵی نەبی. لێرە ڕێز بۆ هاتنت دادەنرێ. لێرە پێویستیت بە هەر شتێک هەبێ، لەلایەن دەفتەری منەوە بۆت دابین دەکرێ – ئەمنیەت، پاراستن، ئامرازی هاتوچۆ و هەر شتێکی دیکە کە لە ئێمە بخوازی. ئێرە ماڵی خۆتە. دیارە ئێرە ئۆرشەلیم نیە، بەڵام هیوادارم جێگرەوەیەکی باش بۆ ئەوێ بێ.»

ئەو گوتی ڕەنگە ماندوو بی و ڕێنوێنیی کردم بۆ ژوورێکی میوانداریی تایبەت کە بە دەفتەرەکەیەوە لکابوو. دەستووری خواردنی دا و کاتێک پێمگوت، ئەمن گۆشتخۆر نیم، گوتی: «بەڵێ، دیارە، لەبیرمە.»

سەرۆکی ستادی ژەنراڵیش بۆ نانخواردن ڕەگەڵمان کەوت و پێشخزمەتەکان بە جلکی یەکفۆرم و کراواتی ڕەشەوە کەوتنە میوانداری لە ئێمە. ئەمن قسەکانم بە وەبیرهێنانەوەی کۆنفرانسێک دەست پێکرد کە ساڵی ١٩٨٦ دەگەڵ ئەوم ببوو و پێم لەسەر ئەو

مەترسییە داگرتەوە کە فرۆشتنی کەرەسەی پێشکەوتووی شەڕ بە عێراق بۆ ئیسرائیلی پێکدێنێ. ئەمن هەروەها بە ئاشکرا گوتم کە ئێمە باش ئاگادارین کە حکوومەتی ئەمریکا، لەو بارەیەوە پشتیوانی لە شیلی دەکا.

کاتێک وردەکاریی سیاسەتی ئەمریکام شیکردەوە و گوتم کە بۆچی ئیسرائیل پڕچەککردنی عێراق بە چەکی پێشکەوتوو، بۆخۆی بە مەترسی دەزانێ، یەکێک لە سکرتێرەکانی دەفتەری وی بابەتەکانی خێرانووس دەکرد. بەوم گوت، نامەیەکم لە سەرۆکوەزیر «شامیر»ەوە ڕوو بە پریزیدێنت «پینۆشێ» هێناوە کە بۆخۆی داوای کردوە، شیلی موعامەلە دەگەڵ عێراق ڕابگرێ. ژەنراڵ «ستانگ» بە ئەدەبەوە گوتی، پریزیدێنت «پینۆشێ» ئەم ڕۆژانە زۆر سەرقاڵە. لەپێشدا سەعات ١٠ی بەیانیی ڕۆژی دواتر بۆ دیداری من دەگەڵ «پینۆشێ» دیاری کرا کە نامەی سەرۆکوەزیری ئیسرائیلی بدەمێ، کەچی ئەم دیدارە هەڵوەشایەوە. بەڵام، ئەو گوتی ئەتۆ هەمیشە دەتوانی تەلەفون بۆ سەرۆکی ستادی من بکەی و نامەکەش دەدرێ بە «پینۆشێ.»

لێرەدا ئەمن هەوڵم دا، دڵساردی و نارەزایەتییەکەم بشارمەوە و لەڕاستیدا کارێکی دیکەشم لەدەست نەدەهات. بەوحاڵە بڕیارم دا چەند پرسیارێکی دەربارەی دەنگەکانی خەڵکی شیلی لەو گشتپرسییەدا کە قەرار بوو بە زوویی لەبارەی پریزیدێنت پینۆشێوە ئەنجام بدرێ و ئەوە کە ئایا ئەو لەو گشتپرسییەدا سەر دەکەوێ و تا ساڵی ١٩٩٧ لە دەسەڵاتدا دەمێنێ یان نا، دەگەڵ بێنمە گۆڕێ.

بۆیە لێمپرسی: «ژەنراڵ، هەستی ئێوە لەبارەی گشتپرسیی خەڵکی شیلییەوە چیە؟ بەپێی قانوونی بنەڕەتیی شیلی، ئەگەر پریزیدێنت پینۆشێ لە گشتپرسیدا سەرکەوتن بەدەست نەهێنێ، دەبێ هەڵبژاردن

بکرێ. بەباوەڕی ئێوە ئەگەر ئەو بدۆڕێ، دووبارە لە هەڵبژاردندا بەشدار دەبێ؟»

«دیارە، ئەگەر ئەو لە گشتپرسیدا سەر نەکەوێ و لە هەڵبژاردنی تازەدا بەشدار بێ، هەموومان خۆشحاڵ دەبین. بەلام، هەرلەوکاتەدا، پێمان وایە وەختی ئەوە هاتوە کە بەربژێرێکی تازە لە هەڵبژاردندا بێتە گۆڕێ.»

«ژەنراڵ، جەنابت خۆت بەربژێر دەکەی؟»

تاوێک تەماشای کردم، دوایە زەردەیەکی هاتێ و گوتی: «ئەگەر شیلی پێویستیی بە من هەبێ، دیارە لە هەڵبژاردندا بەشدار دەبم. ئەمن خۆم لە ئەنجامدانی هەر خزمەتێک کە بۆ وڵاتەکەم پێویست بێ، نابوێرم. ئەمن حەز ناکەم هێزی نەگونجاو لەم وڵاتەدا بێتە سەر کار.»

کاتێک تەماشای یۆنیفۆرمی ژەنراڵ «ستانگ»م دەکرد و گوێم لە بەرزەفڕییەکانی دەگرت، کەوتمەوە یادی ئەو فیلمانە کە بە منداڵی لە ژەنراڵەکانی نازیم دیبوون. پێمگوت، «کارمەندانی هەواڵگریی ئیسرائیل دیتوویانە کە گازی میکرۆبی و ژەهراوی و چەکی شیمیایی لە شیلییەوە دەنێردرێتە عێراق». هەر وا وەبیرم هێنایەوە کە چەند سەعات لەمەوبەر، کاتێک فڕۆکەکەی من خەریکی نیشتن لە فڕۆکەخانە بوو، دیتم دوو فڕۆکەی ٧٤٧ی عێراقی لەسەر باندی فڕۆکەخانە نیشتنەوە.

ئەو گوتی: «دیارە ئێمە دەگەڵ دنیای عەرەب کڕین و فرۆشتنی بازرگانیمان هەیە.»

«ئەتۆش و ئەمنیش باش دەزانین، ڕاستییەکە چیە. ئەم ڕەوتە بە هەر نرخێک بووە، دەبێ ڕابگیرێ. ئەگەر پێویست بێ، ئیسرائیل مەسەلەکە بەرێتە کۆنگرەی ئەمریکا، ئەو کارە دەکا. ئەگەر پێویست

بێ کارگوزارانی خۆمان ئەم ڕەوتە ڕاگرن، ئەم کارە دەکرێ. باوەڕ بکەن، ئێمە ئەم ڕەوتە ڕادەگرین.»

بە بیستنی قسەکانی من سەرگۆناکانی داکەوتن. سامناکترین پیاوی ولاتی شیلی، فێر نەببوو کەس هەڕەشەی لێبکا.

ئەو گوتی:«ئەمن ناتوانم کاردۆئێن و ئەمریکای کۆنترۆڵ بکەم. ئەو مرۆڤێکە و ئەمریکایییەکانیش ... ئەمریکایین.»

«ژەنراڵ، ئێوە دەبێ ئەم کارە لە ولاتەکەتان ڕابگرن. ئەمن دڵنیام، ئێوە حەز ناکەن بەرپرسایەتیی کوژرانی منداڵانی کەلیمی بە گاز بکەوێتە ئەستۆی ئێوە.»

ئەو بەڕاستی ڕاچڵەکیبوو. مژێکی قووڵی لە سیگارەکەی دەستی دا و قومێکی شەراب خواردەوە. لە جەرگەی باسەکەماندا تەلەفون زەنگی لێدا و سەرۆکی ستادەکەی هەڵیگرت.

ئەو گوتی: «ژەنراڵ، سەرۆکی دەبیرخانەی پریزیدێنت بۆ وەرگرتنی نامەکە هاتۆتە ئێرە.»

لەم ساتەدا ئەمن داوام کرد، تەلەفون بۆ ئاپارتمانەکەم بکەم و بڵێم، درەنگ دێمەوە.

«ستانگ» بە ئاماژەی سەر تەلەفونەکەی نیشان دام. تەلەفونم بۆ «باربارا» کرد و بەجۆرێک کە ژەنراڵ گوێی لێبێ گوتم، دەگەڵ ئەوەی ژەنراڵ سەرقاڵە، بە میهرەبانی و بەخشندەیی پێویست بڕیاری داوە، ماوەیەک لە وەختی خۆی بۆ من تەرخان بکا.

کە تەلەفونەکەم دانایەوە، بە ڕاوێژێکی دۆستانە پرسی: «ئەتۆ دەگەڵ دۆست یان هاوسەرت هاتوویە ئێرە؟»

گوتم، ئەو هەواڵنووسی ڕۆژنامەی Financial Timesی بریتانیا لە شیلییە. مانای ئەم قسەیە ئەوە بوو کە ڕۆژنامەنووسێکی گرنگم لەگەڵە کە ئەمریکایی نیە. ئەم بابەتە بە هەڕەشەیەکی دەمامکداری دیکە بۆ ژەنراڵ دەژمێردرا. وا دەهاتە بەر چاو کە هەست دەکا، ئەمن

بە ئەسپایی دەرزیی دەلەشیڕا دەکەم. قومێکی دیکەی ویسکی دەزاری کرد. سەرۆکی دەبیرخانەی «پینۆشێ» کە خاوەنی چاکەتێکی خوریودەزووی قاوەیی گەش، کراسێکی سپی، کراواتێکی قاوەیی تاریک و پانتۆڵێکی قاوەیی تاریک بوو، هاتە ژووری.

ئەمن جگە لەوە کە نامەکەی تەسلیم بکەم چارەیەکم نەبوو. نامەکە لە پاکەتێکی گەورەی سپیدا بوو کە سووچی لای چەپی مۆری دەوڵەتی ئیسرائیل Menorahی لێدرابوو. لەژێر مۆرەکە وشەگەلی «دەفتەری سەرۆکوەزیر» بە ڕەنگی ئاوی چاپ کرابوون. کیفەکەم کردەوە و نامەکەم دا بە سەرۆکی دەبیرخانەی پریزیدێنت. ئەو دڵنیای کردم کە نامەکە دەسبەجێ دەچێتە سەر مێزی پریزیدێنت. پێیم گوت، وەڵامەکەی دەبێ بدرێتەوە بەخۆم نەک باڵیۆزخانەی ئیسرائیل لە شیلی. ئەگەر ئەمن لەبەر دەست نەبووم، نامەکە بە ئادرەسی «ئەوی پزنەر» بنێردرێ کە ئاگای لە مەسەلەکەیە.

کە خەریک بووم دەفتەری ژەنراڵ بەجێ بێڵم، ئەو بۆ نانخواردنی سبەی شەو بانگهێشتنی کردم. بەڵام، سەرۆکی ستاد گوتی سبەی شەو کاری دیکەت هەیە. دەستووری دا: «هەڵیوەشێننەوە.»

پاشان، بە منی گوت: «ترومبێلێک دەنێرم کە بتهێنێتە ماڵەکەم و تکا دەکەم لەوە کە پریزیدێنت پینۆشێ سەرقاڵ بوو و نەیتوانی بتبینێ، عوزری من بگەیەنە سەرۆکوەزیری ئیسرائیل. دڵنیام کە، قەرەبووی دەکەمەوە». لێشی زیاد کرد: «ئەگەر شتێکت پێویست بوو، ئاگادارمان بکە، دەسبەجێ داخوازەکەت جێبەجێ دەکرێ.»

پێشنیاری پێکردم بمگەیەنێتەوە ماڵێ. لە پشتەوەی ترومبێلێکی سەوزی سەربازی کە شۆفیرەکەی جلکی ڕەسمیی دەبەردا بوو و سەرۆکی ستادی ژەنراڵیشم بە یۆنیفۆرمی سەربازییەوە دەگەڵ بوو، گەیەندرامەوە ئاپارتمانی «باربارا» کە لە Calle Lus لە گەڕەکی دەوڵەمەندنشینی Las Conds هەڵکەوتبوو.

«باربــارا» دەزگایــەکی VCRی (ڤیــدیۆ) کڕیبــوو، ئاپارتمانەکــەی پارێزەرێکی هەبوو کە ژوورەکەی لەوبەری ئاشپەزخانەکە بوو. ئەو شـەوە خـەریکی تەماشـای فیلمێک بـووم و هـەتا درەنگانێک بەخەبەر بووم. لای نیوەشەوێ تازەم خەو لێکەوتبوو، لە ئیسـرائیلەوە تەلـەفونم بۆ کرا. ئـەودەم بـەکاتی ئیسـرائیل سـەعات ٩ی بـەیانی بـوو. «ئـەوی پزنەر» لێی پرسیم: «بارودۆخەکە چۆنە؟»

پێمگوت تاڕادەیـەک لـە کارەکاندا پێشـکەوتن بەدەسـت هـاتوە بـەڵام وادەی دیدارم دەگەڵ پریزیدێنت هەڵوەشاوەتەوە. پێی گوتم، سبەینێ بەیانی بچۆ باڵیۆزخانەی ئیسرائیل و لە تەلەفونێکی ئەمینەوە قسەم لـە گەڵ بکە. لێشی زیاد کرد کە کارەکان ڕێک دەخرێن.

بـەیانیی ئـەو ڕۆژە هـەتا درەنگانێـک لەخـەو هەڵنەسـتام. سـکرتێری دووەمی باڵیۆزخانەی ئیسرائیل کە هەر لەوکاتەدا نوێنەری «مۆسـاد» لە «سانتیاگۆ»شە، تەلەفونی بۆ کردم و گوتی تەلـەفونێکی ئـەمینت بـۆ پێوەندی لەگەڵ ئیسرائیل لەبەر دەسـت دەبێ. باڵیۆزخانـەی ئیسـرائیل، لە نیزیک ئاپارتمانەکە بوو و ئەمن هەتا وێ بـە پیاسـە ڕۆیشـتم. دوای پێوەندی دەگەڵ «پزنەر» پێمگوت کە ژەنراڵ «ستانگ» بۆ ئێوارێ لـە ماڵێ خۆی بانگهێشـتنی کـردووم. هـەروەها وەگـوێم هـەڵێنا کـە هێشـتا پێوەندیم دەگەڵ «کاردۆئێن» نەگرتوە.

«پزنەر» گوتی: «زۆر وریا بە، پێویست نیە ئەمن پێت بڵێم کە ئـەتۆ لەسـەر سـەهۆڵێکی تـەنک ڕاوەسـتاوی. لـەبیرت بـێ، ئەمـە یـەکێک لـە گرنگترین ئەرکەکانە کە تائێستا بـە تـۆ سـپێردراون، ئـەم مەئموورییەتـە تەنانەت لە وەی پێرووش گرنگترە.»

پێمگـوت، ئــەمن بــۆ دیتنــی «کــاردۆئێن» لــە دەرفــەتێکی گونجــاو دەگەڕێم. هەردووکمان دڵنیا بووین کە ئـەم سـەوداگەرەی کەرەسـەی شەڕ پێشتر لە بوونی من لەوێ ئاگادار بۆتەوە.

خەڵک پێیان وایە ژیانی جاسووسێک یان هەرکەس کاری نهێنی بۆ حکوومەتێک دەکا، سەرنجڕاکێش و هەژێنەرە. ئەمن لەو بەسەرهاتەدا نەخشی دیپلۆماتێک لە مەئمووریەتێکی نهێنیمدا یاری دەکرد، بەڵام هیچ ڕاکێشەری و هەژانێکم تێدا نەدی. ئەمن لەڕاستیدا نەمتوانی خۆم لەو بیرە بدزمەوە کە ئەریٚ ئامانجم لە «سانتیاگۆ» چبوو، ژن و منداڵی تازەلەدایکبووم بەجیٚ هێشتبوون، دەگەڵ ژنێکی دیکە دەژیام و گرفتاریگەلێکی پێچەڵپووچم لەپێشدا بوون، پێڕوو بۆ من سەرنج-ڕاکێش، بەڵام «سانتیاگۆ»م بۆ تاقەتپڕووکێن بوو. تەلەفونم بۆ «ئۆرا» کرد و ئەو پێیگوتم کە بیٚئەندازە وەڕەزیی کردووم. ئەو دەیەویست بزانیٚ کە داخوا ئەمن هێشتا دەگەڵ «ئەو»م، ئەو متمانەی بە پێوەندیمان دەگەڵ یەکتر نەبوو. ئەگەر قەرار بیٚ ڕاست بڕۆم، بۆخۆشم لە پێوەندیم دەگەڵ «باربارا» دڵنیا نەبووم.

«ستانگ» سەعات ٥:٤٥ی دوای نیوەڕۆ ترومبێلێکی بۆ ناردم. کە دەچووم بۆ ماڵی ژەنڕاڵ، لەحاڵێکدا سەرۆکی ستادەکەیشیم دەگەڵ بوو، بابەتێک سەرنجی ڕاکێشام. چەکێکی ئیسرائیلی لە تەنیشت شۆفیرەکە بوو. ئێمە لە ڕێگادا گەیشتینە شەقامێک کە ئەندامانی پۆلیسی شێوەنیزامی بەستبوویان، بەڵام بە ئاماژەی دەست مۆڵەتی ڕۆیشتنیان پێدابن. لە کۆتایی شەقامەکە، خانوویەکی زۆر گەورە، لەودیو چەند دەرگایەکی کانزایی دەهاتە بەرچاو. نیگابانەکانی ئەو باڵەخانەیە، نیشانەی تێپەڕینیان دایێنیٚ. ژەنڕاڵ «ستانگ» بە پانتۆڵی شین و کراسی سپییەوە کە سەردەستەکانی هەڵدابوونەوە، لە شیپانەی دەرگادا چاوەڕوانی گەیشتنی ئێمە بوو. وام هاتە بەر چاو کە ئەمن بە جلکی شین و کراواتی زریشکیی خۆم تەرپۆشیم کردوە، چونکە، جلوبەرگی خانەخویٚ نیشانی نەدەدا کە هی میوانداریییەکی ڕەسمی بیٚ.

ئەو منی بە هاوسەرەکەی، کە ژنێکی جوان بوو و بزەیەکی شیرینی لەسەر لێوان بوو، ناساند. لەکاتێکدا ئەو ڕێنوێنیی دەکردم بۆ ژووری زۆر ڕازاوەی دانیشتن، پێشخزمەتەکان بە پەلە دەهاتن و دەچوون. تابلۆیەکی گەورەی قەڵەمکێشی ژەنراڵ و هاوسەرەکەی، لەحاڵێکدا سەریان پێکەوە نابوو، لەسەر دیوار سەرنجەکانی بۆ لای خۆی ڕادەکێشا. «ستانگ» گوتی: «ئەمن سێ میوانیشم هەن کە ئێوە دەیانبینن.»

پیاوێکی جوانچاک کە ساڵەکانی ٣٠ی تەمەنی تێپەڕ دەکردن و خاوەنی مووی ڕەش و جلوبەرگی شین و کراسی سپی و کراواتی خەتخەت بوو، هاتە ژووری، هاوسەرەکەی کە ژنێکی جوان، باڵابەرز و قەدباریک و قژڕەش و چاوشین بوو، داوێنێکی (تەنوورە) سەوزی کاڵی دەبەردا بوو کە دەگەیشتە سەر ئەژنۆی و لە هەردوو لای کراوە بوون. ئەمن دەسبەجێ پیاوەکە و هاوسەرەکەیم ناسین. بەڵێ، ئەوان بەڕێز «کاردۆئێن» و خانمەکەی بوون.

ئێمە سڵاو و چاکوخۆشیمان لەگەڵ یەک کرد و ئەمجار میوانی سێیەم هات. ئەو تاڕادەیەک خەپەتۆڵە بوو، بەوحاڵە زۆر جوان دیار بوو، قژی ڕەش و کورت و چاوەکانی گەورە بوون. ئەو بە ناوی خاتو «ئیزابێل بیانکی» Isabel Bianchi، هاوسەری سەرهەنگێکی هێزی هەوایی کە پێشتر سەرۆکی هێزەکانی شیلیی سەربە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان بوو، بە من ناسێندرا. دیارە ئەو یەکەیە لە لایەن ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە لە نێوان بەرزاییەکانی گۆلان، نێوان ئیسرائیل و سووریە ئەرکی خۆی بەجێ دێنا. خاڵێکی دیکە ئەوە بوو کە خانمی «بیانکی» زمانی عیبریشی دەزانی. هەروەها، بە من گوترا کە مێردەکەی ئێستا فەرماندەری هێزی هەوایی شیلی لە ئوقیانووسی سەهۆڵبەستووی باشوور، واتە لەوسەری دنیایە.

بە فکرمدا هات کە دەبێ شەوێکی سەرنجڕاکێشمان لەپێش بێ.

ئێمە لەبارەی ئەو گشتپرسییەوە کە بە زوویی دەکرا، دەستمان بە قسە کرد و خانەخوێ و میوانەکانی دیکە ڕایان وابوو کە پریزیدێنت «پینۆشێ» پێی خۆشە هەتا دەمرێ لەسەر کار بمێنێتەوە. بەڵام، لە درێژایی باسەکەدا، ئەمن وشیاری «کاردۆئێن» بووم. ڕوخساری نیشانی دەدا کە پیاوێکی لەخۆڕازییە. ژەنەڕاڵ «ستانگ» بە بانگهێشتنی ناوبراو بۆ ئەو میوانداریيە، دەیەویست، پەیامێکی بێدەنگ بۆ ئیسرائیلییەکان بنێرێ. بەو مانایە کە پێیان بڵێ: «ئەمن ئەو کەسە دەناسم، ئەو دۆستی منە و تەنانەت بۆ نانخواردنیش بانگهێشتنی ماڵەکەم دەکرێ.»

دیار بوو کە تەواوی بەرنامەکە لەپێشەوە داڕژابوو. بەڵام ئەو قسانەی لەسەر نانخواردن پێکەوە کران، هەستی ڕاستەقینەی وانیان بەرامبەر بە «پینۆشێ» ئاشکرا کرد. کاتێک ئەوان دەیانەویست ناوی بەرن، لەجیاتی «پریزیدێنت» دەیانگوت «پیاوە پیرەکە». «ستانگ» هەمیشە دووپاتی دەکردەوە کە «پینۆشێ» لە ڕێگایەک دەگەڕێ کە هەتا ماوە لە شیلی لەسەر حوکم بمێنێ. ئەمن گومانم نەبوو کە «ستانگ» حەزی لێیە ببێتە جێنشینی.

هەر تاوناتاوێک ژنێک کە بە جلکەکانیڕا دیار بوو خەریکی ئەنجامدانی ئەرکی خۆیەتی، دەهاتە ژووری نانخواردن و بە «ستانگ»ی دەگوت تەلەفون کاری پێتە. کەسێکی دیکەش هەبوو کە سەرنجی خانمێکی ڕاکێشابوو. ئاشکرا بوو کە «ئیزابێل» بۆیە بانگهێشتی ئەو میوانداریيە کراوە کە ببێتە هاودەمی من و ئەو بە چاوبڕکێ و بزە ئەرکی دڵڕفێنیی خۆی بە باشی بەجێ دێنا. «کاردۆئێن» گوتی: «ئاری، گۆیا ئەتۆ ماوەیەک لێرە میوانمان دەبی؟»

«بەڵێ، ئەمن بەرنامەیەکی خێرام بۆ ڕۆیشتن لێرە نیە.»

ئەو پێکەنی و گوتی: «دیارە، ئەگەر سبەینێ بەیانی بەرنامەیەکت نیە، سەعات ١٠ وەرە دەفتەری من. دڵنیام کە پێیدەزانی.»

سەعات ٩ی پاش نیوەڕۆ، ژەنراڵ بە داوای لێبووردنەوە گوتی کە دەبێ بۆ دیدارێکی لەنەکاو کە پێوەندیی بە ئەمنیەتی نیشتمانییەوە هەیە بچێتە دەفتەری پریزیدێنت. ئەوەشی لێ زیاد کرد کە: «پریزیدێنت، حەز دەکا ئەو جۆرە دیدارانە بە شەو ئەنجام بدا.»

چونکە سەرۆکی ستادی ژەنراڵ دەبوو لەگەڵی بێ، «کاردۆئێن» پێشنیاری کرد، کە بمباتەوە شوێنی مانەوەم. هەموو شتێک بە وردی بەرنامەی بۆ دانرابوو. ئەمن دەگەڵ «ئیزابێل» لە پشتەوەی ترومبێلی مارسدسی 230Eی ئەو دانیشتم و لە ڕێگای گەڕانەوە بۆ شاردا، «کاردۆئێن» پرسیاری کرد: «ئەتۆ شارەزای سانتیاگۆ هەی؟»

«بەڵێ، دیارە، بەڵام ... »

ئیزابێل هاتە نێو قسەکانمانەوە و گوتی: «پێت خۆشە شارت نیشان بدەم؟»

گوتم: «دیارە».

«ئەمشەو ئەو بەرنامەیە ئەنجام دەدەین».

ئەو داوای لە «کاردۆئێن» کرد بیباتەوە شوێنی خۆی تا ترومبێلەکەی خۆی بێنێ، بەڵام ئەمن گوتم، ترومبێلێکی کرێم لەلایە کە دەتوانین بەکاری بەرین. بۆیە، ئەوان منیان بردەوە پارکینگی باڵەخانەی ئاپارتمانەکە. کاتێک چوومە نێو ترومبێلەکە و شەوخۆشم لە «کاردۆئێن» و خانمەکەی کرد، چاکەتەکەمم داکەند، کراواتەکەمم کردەوە، بەشێوەی ژەنراڵ «ستانگ» قۆڵم هەڵکرد و لە «ئیزابێل»م پرسی، بچمە کوێ؟

«ڤینا دێل مار» Vina del Mar کە تەنیا دوو سەعات لێرە دوورە.

ئێستا سەعات ٩:٣٠ی پاش نیوەڕۆ بوو. گوتم: «زۆر باشە، با بڕۆین.»

چووینە سەر شاڕێیەک کە بەرەو خۆرئاوا دەچوو و دەگەڵ ئیزابێل باسی بارودۆخی سیاسی و ئەو شوێنانەمان کرد کە ئەو لە ئیسرائیل

دیتبوونی. گەیشتینە تونێلێک کە بە تیشکی نارنجی ڕوون کرابۆوە، هەستم کرد دەستێک هاتە سەر ئەژنۆم.

ئەو گوتی: «ئاری، ئەمن تۆم خۆش دەوێ. پاشان بە زمانی عیبری لێی زیاد کرد: «با چێژ لە یەکتر وەرگرین. ئەمن هەمیشە پیاوانی ئیسرائیلیم پەسند کردوون.»

ئەمن لێمدەخوڕی بەرەو «ڤینا دێل مار» شوێنی ژیانی دەوڵەمەندان. کاتێک گەیشتمە ئەو شارە کە خەڵکەکەی پێی دەڵێن «مرواریی ئوقیانووسی ئارام»، لێم پرسی: «ئەدی مێردەکەت؟»

«ئەگەر پێ بزانێتەوە، هەردووکمان دەکوژێ. بەڵام، نیگەران مەبە، ئەو ئێستا لە ئوقیانووسی سەهۆڵبەستووی باشوورە.»

ئێمە لە پێش هۆتێلێک ڕاوەستاین و بۆ بەستەنیخواردن چووینە هۆتێلەکە. دوایە بە ئارامی لە لێوارەکە دەستم کردەوە بە لێخوڕین. بەڕاستی جێیەکی جوان بوو. سەیر نەبوو کە پریزیدێنت «پینۆشێ» کۆشکی هاوینیی خۆی لەوێ دانابوو. کەمێک دوای نیوەشەو پێشنیارم پێکرد، بچینەوە شوێنی خۆمان. ئەمن بە ڕاشکاوی قسەم دەگەڵ دەکرد، بەڵام ئیزابێل لە فکرێکی دیکەدا بوو.

ئەو گوتی: «بڕوانە، مێردەکەم لێرە نیە، دوو کچیشم هەن لەکن دایکوبابمن. باشترە، شەوێ لەم هۆتێلە بین.»

بەڵام ئەمن پێم داگرت کە بنیادەمێک نیم بە ئاسانی دەست لە ئامانجم بەردەم. بەهەرحاڵ، ئەمن گەڕامەوە و بەرەو «سانتیاگۆ» وەڕێکەوتم. لێرەدا ئیدی بزەیەک لەسەر لێوانی بەستبووی.

ئەو گوتی: «ئاری، ئەمن بەڕاستی تۆم خۆش دەوێ، بەڵام، دەبێ بابەتێکت پێبڵێم. ئەتۆ لێرە یارییەکی پڕمەترسیت دەست پێکردوە و گیانت لە ئەماندا نیە. عادەتەن هەمیشە گیانی سەربازان دەکەوێتە مەترسییەوە، نەک ژەنڕاڵەکان. ئەتۆ سەربازی ژەنڕاڵ شامیری. ئەتۆ بەڕاستی پێتوایە دەتوانی ئەو خەڵکە لە کردەوەکانیان بگێڕیەوە؟ ئەگەر پێتوایە دەتوانی ئەو کارە بکەی پێم بڵێ چۆن؟»

ئـــەمن دەمزانـــی هـــەرچی پێـــیبڵـــێم، یەکســـەر دەچێتـــەوە لای «کاردۆئێن» و «ستانگ». بۆیە گوتم: «ئەگەر ناچار بین ئەوان یەک بە یەک بکوژین، ئەو کارە دەکەین. ژیانی من بایەخێکی نیە. ئەوەی گرنگە دەوڵەتی ئیسرائیل و مانی ئەم وڵاتەیە.

ئەو پرسی: «ئەمریکاییەکان چی؟ داخوا دەزانی ئەوان پشتیوانیت لێدەکەن؟

«ئەم بابەتە پێوەندیی بە سەرۆکەکانمەوە هەیە».

سەعات ٢ی بەیانی گەیشتینە ماڵەکەی وی. لێمپرسی، چۆن دەتوانم بچمەوە شوێنەکەی خۆم. گوتی، بە ترومبێل وەپێشت دەکەوم و ئەتۆ وەدوام کەوە.

«بەڵام لەپێشدا دەبێ جلکەکانم بگۆڕم.». ئێمە چووینەماڵەکەی و ئـــەو ســـینییەکی بـــاقلاوا هێنـــا و بـــە بزەیەکـــەوە گـــوتی: «ئەمانـــە فەلەستینییەک دروستیان دەکا. هیوادارم ئەوەی دروستیان دەکا تۆ نارەحەت نەکا.»

«نا، بەهیچ جۆر.»

ئیزابێل جلکەکانی گۆڕی بە جینێک و کراسێکی کێش. بێگومان ئەو مەمکبەندی لێدابوو. لەسەر کراسە کێشەکەی نووسرابوو: «دایک و بابم چوونە ئۆرشەلیم و ئەوەی وەگیر من کەوت، ئەم کراسە دزێوە بوو.»

ئەو هاتە لام و باوەشی پێدا کردم. ئەمن لەباری لەشییەوە بەکێش کرام. بەڵام زۆرم هەست بە ماندوویی دەکرد. بۆیە خۆم لە باوەشی دەرهێنا.

پێمگوت: «ئەتۆ ژنێکی زۆر ڕاکێشەری، بەڵام ئەمن دەبێ بەتەنیا بخەوم.»

ئەمن وەدوای کەوتم بۆ ئاپارتمانەکە و لەوێ سەرم بردە ژووری ترومبێلەکەی و ماچی شەوخۆشم لێکرد. ئەو کارتی ویزیتی خۆی دامێ. لەسەر کارتەکەی چاپ کرابوو:

Isabel Bianchi Cardoen Industries

ناوەندی ئیداریی پیشەسازیی «کاردۆنە» لە باڵەخانەیەکی بەرزی Avenida Santa لە بەشی نیشتەجێی دڵڕفێنی Sheraton San Cristobal Maria هەڵکەوتبوو. گاردی ئەمنیەتی تایبەتی لە بەشی پێشوازیی باڵەخانەکە لە کەسیەتیی منیان پرسی و دوایە چوومە نێو ئاسانسۆر.

یەک لە سکرتێرەکان بردمی بۆ دەفتەری «کاردۆئێن». یەکەمین شت، کە منی وشیار کردەوە، تەنانەت پێش سڵاوی خاوەنی کۆمپانییەکە، دوو وێنەی لەقابگیراوی گەورە بوون کە لە ژوور سەری هەڵواسرابوون. یەکیان وێنەی پریزیدێنت «پینۆشێ» و ئەوی دیکە وێنەی سەددام حوسێن بوو. «کاردۆئێن» خوڵقی کردم دانیشم و بە کێک و چا میوانداریی لێکردم.

«کاردۆئێن» جلک و کراواتێکی ئاسایی لەبەردا بوون و بەپێچەوانەی شەوی ڕابردوو کە ئارام و سەنگین دەجووڵایەوە، ئەو ڕۆژە توورە و تۆسن دەرکەوت و دەسبەجێ هاتە نێو گفتوگۆ.

«گۆیا ئێوە ئیسرائیلییەکان دەمنتان هەڵپێچاوە.»

ئێستا دەمتوانی تێبگەم کە، بۆچی توورە دیار بوو. گوتم: «وا نیە، هەرنەبێ ئێستا وا نیە، لەلایەکی دیکەوە، ئێمە تۆ بە یاریدەدەری خۆمان دەزانین.»

پێش ئەوەی، ئەو قسەیەکی دیکە بکا، لێم زیاد کرد: «ئەتۆ ئەو ڕێککەوتنانەت شکاندوون کە پێشتر دەگەڵ ئێمەت هەبوون. لەبیرتە لە کۆنفرانسی ساڵی ١٩٨٦دا، دڵنیات کردینەوە کە هەنگاوێک بە دژی ئێمە ناهاوێژن. بەڵام لەوکاتە بەدواوە، ئێوە یاریتان بە ئاگر کردوە. ئێمە ئاگادارین کە ئێوە نەکهەر کەرەسەی شیمیایی بۆ عێراق دەنێرن، بەڵکوو پشتیوانی لە کەسانی جۆراوجۆر دەکەن کە موعامەلەیان دەگەڵ عێراق هەیە.

«کاردۆئێن» باشی دەزانی کە ئەمن باسی ئەو زانایانەم دەکرد کە کاریان دەگەڵ «ئیحسان باربووتی» دەکرد. ئەوکەسانە عێراقیان بە

تـەکنۆلۆژیی کەرەسـەی هەسـتەیی تـەیار دەکـرد. هـەروەها «جێـراڵ بوول» Geral Bull زانایەکی کانادایی و ئەندازیاری کاروبـاری فـەزایی خەریکی بەرهـەمهێنانی تفـەنگێکی پێشکەوتوو بۆ عێراق بوو کـە زۆر دوور دەڕۆیشت و بێئەوەی پێویستیی بـە مووشـەک هـەبێ، دەیتـوانی زۆر لە دوورەوە ئامانج بپێکێ.

وا دیار بوو، توندیی هێرشـەکانی مـن بـۆ سـەر «کاردۆئێن» ئـەوی گێژ کردوە. بە سەرسوڕماوی دەمنەوە ڕامابوو و دەسـتی کردبوونـە مسـتەکۆڵە. ئـەمن دووپاتـەم کـردەوە: «دەوڵـەتی ئیسـڕائیل، بێکـار دانانیشـێ هـەتا منداڵـەکانی بـە گـاز دەکـوژرێن.» «کـاردۆئێن» هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و پاشان لەسەر کورسییەکەی هەسـتا و لەحاڵێکدا لە نێو دەفتەرەکـەی پیاسـەی دەکـرد، گـوتی: «لەپێشـدا دەبـێ بزانـی کـە زانیارییـەکانت ڕاسـت نـین. ئـەمجار سـەددام حوسـێن لـە خۆرهـەڵاتی نێوەڕاسـت لایـەنگری ئاشـتییە و پاشـانیش جگـە لـە ئێـوە کەس لە خۆرهەڵاتی نێوەڕاست، خاوەنی چەکی ئەتۆمی نیە.»

«بەڵێ، ئەگەر گازەکانی ئێوە لە وڵاتەکەمان بدرێن، دەتوانن دڵنیا بن کە ئیسـڕائیل کـەلک لـە بۆمبـە ئەتۆمییـەکانی وەردەگرێ. لـەو حاڵـەدا، عێـڕاق لــە ڕووی نەخشــە دەســڕێتەوە و ئێــوەش هــەروا، جــەنابی کاردۆئێن».

لە حاڵێکدا بە توندی هـەڵچووبوو، ڕووی تێکردم و گـوتی: «ئەگـەر دەتـەوێ هەڕەشـەم لـێبکـەی، ئـەمن حـەز ناکـەم درێـژە بـە قسـەکردن لەگەڵ تۆ بدەم.»

«ئەگەر دەتەوێ کۆتایی بـە باسـەکە بێنـی، ئـەمنیش مـووافیقم، بـەڵام ئەمن قسەی دیکەم هەن بیانکەم کە ڕەنگە بۆ تۆ سەرنجڕاکێش بن.»

ئەو شانی هەڵتەکاند و گوتی: «فەرموو، بەڵام، باشترە ئاقڵانـە قسـە بکەین. ئەتۆ دەبێ بزانـی کـە ئـەمن سیاسـەتی ئـەمریکا بـەڕێوە دەبـەم، دەبێ ئاگاداری ئەم ڕاستییە بی. جگە لەوە، ئـەتۆ دەبـێ بزانـی کـە زۆر لە حکوومەتەکانی خۆرئاوا پشتیوانی لە من دەکەن.»

تکام لێکرد، بۆ سەلماندنی قسەکانی، چەند دانە لەو ولاتانە ناو بەرێ.

چەند ساتێک راما و دوایە گوتی: «ئەتۆ دەبێ بزانی کە ئێمە کار بۆ ئاشتی لە خۆرهەلاتی نێوەراست دەکەین.» بەمجۆرە، ئەو لەنەکاو بوو بە مرۆڤێکی ئاشتیخواز کە دەیەوێ دژی ئەو گێچەلانەی ئیسرائیلییەکان دەیانەوێ بە عێراق و خەلکەکەی بفرۆشن، خزمەت بەوان بکا.

گوتم: «باشتر وایە کۆتایی بەو قسە بێسەروبەرانە بێنی.» و چەند پەرە کاغەزم بۆ هاویشتن و گوتم: «ئەمانە بخوێنەوە.»

نامەکان نە دیار بوو بۆ کێ نووسراون، نە ئیمزایان پێوە بوو، نە نیشانەیەک لەو کەسەی نووسیونی.

ئەو پالی بە کورسییەکەیەوە دا و بۆ چەند دەقیقە خەریکی خوێندنەوەی نامەکان بوو، لەوکاتەدا ئەمن مەیلم بەرەو شێوەیەکی ئاشتیخوازانە دەچوو. کاتێک خوێندنەوەی نامەکانی تەواوکرد، لێم-پرسی: «جان لە کوێیە؟ ئەمن هیچ وەخت رێز و ئیعتیبارێکم بۆ ئەو پیاوە دانەناوە.»

ئەمن هەستام بچمە تەوالێت و بە ئەنقەست کیفەکەمم کە بەتایبەتی دروست کرابوو و ئامرازی هەوالگریی پێوە بوون، بە کراوەیی لەسەر مێزەکەی بەجێهێشت. کیفەکە نەخشەیەکی پاراگوای تێدابوو کە لەودا شوێنی کارخانەی گرنگی شیمیایی «کاردۆئێن» بە خالێکی سوور دیاری کرابوو و هێلێکی گەورەی رێنوێنیشی بۆ راکشابوو. کاتێک گەرامەوە، ئەو هیچی نەگوت.

بۆم روون کردەوە، کە ئەو کاغەزانەی پێمداون، بەندەکانی قەرارومەدارێکیان تێدان، کە بەپێی ئەوان، ئەو دەتوانێ لە شێلی کارخانەیەک دامەزرێنێ و کەرەسەی شەری وەک یووزی، گلیل، گوللەتۆپ و خومپارەی ٥١ میلیمیتری بەرهەم بێنێ و رێکخراوی پیشەسازیی سەربازیی ئیسرائیل، مۆلەتی ئەو کارەی بۆ دەردەکا.

بێجگە لەوەش، دەوڵەتی ئیسرائیل مۆڵەتێکی بۆ دەردەکا کە بەپێی ئەو، بتوانێ ئەوکەرەسە جەنگییانە هەر بۆخۆی بەتەنیا لە هەموو وڵاتانی ئەفریقای باشوور بفرۆشێ. ئەو هەروەها دەبێتە دەڵاڵی فرۆشتنی هەموو کەرەسە جەنگییەکانی ئیسرائیل بە وڵاتانی ئەمریکای باکووری. بەوجۆرە ئێمە پێمانگوت کە ئەگەر شێوەی کەسبوکارەکەی بگۆڕێ، ئێمە چەند میلیۆن دۆلاری بۆ مسۆگەر دەکەین.

ئەو گوتی: «ڕۆژگار چۆن هەموو شتێک دەگۆڕێ. لەبیرتە، وەختێک ئەمن هاتمە ئیسرائیل بۆ دەرکردنی مۆڵەتنامەیەک دەپاڕامەوە. ئێستاش دەگەڵ پێشنیارێکی ئاوا بەرەوڕوو دەبم.»

ئەمن بە ڕووگرژی لێی مۆڕ بوومەوە و گوتم: «شەق لە بەختی خۆت هەڵمەدە (زۆر لە بەختی خۆت دوور مەکەوەوە) جەنابی «کاردۆئێن».

ئەو گوتی: « بۆخوت دەزانی ئەمن بۆ ئەوکارە پێویستیم بە مۆڵەتنامەی حکوومەتی شیلی هەیە -لەلایەکی دیکە، ئەمن پێموایە پێشنیاری تۆ، بەرنامەیەکی حیسابکراوە، چونکە ئێوە کەسێک نین کە بەو جۆرە قەرارومەدارانە وەفادار بمێننەوە.»

«مۆڵەتنامەی خۆت وەرگرە، هەرکارێک دەتەوێ بیکە. بەڵام هەر لەوکاتەدا وەبیرت دێنمەوە کە تەنیا دوو حەوتووت وەخت هەیە بۆئەوەی لەو بارەیەوە بیر بکەیەوە. ئێوە بە سەرۆکەکانتان لە واشینگتۆن و بەغدا و وڵاتانی دیکە بڵێن، ئێمە بێکار دانانیشین، تا سەددام حوسێن چیی پێخۆشە بیکا. ئێوە هەروەها دەتوانن بە سەرۆکەکانتان لە ئەمریکا بڵێن کە ئێمە دەزانین، یەکەم کار کە سەددام حوسێن دەیکا، ئەوە دەبێ کە عەرەبستانی سعووی و میرنشینە یەکگرتووەکانی عەرەب بکاتە ئامانج.»

ئەمە یەکەمجار نەبوو کە ئەم هۆشدارە دەدرا – سەرهەنگ جەلالی، وەزیری بەرگریی ئێرانیش ساڵی ١٩٨٧، لە کاتی دیداری «گەیتس» دا

لە شاری تەکزاس، بە ئاشکرا ئاماژەی بە نەخشەکانی سەددام حوسێن بۆ خۆرهەلاتی نێوەڕاست کردبوو.

قسەکانمان لێرەدا تەواو بوون، بەلام، بەرلەوەی دەفتەری «کاردۆئێن» بەجێ بێلم، بۆئەوەی سەهۆلەکانی نێوانمان بشکێنم، پرسیارم کرد: «بەڕاست، ئیزابێل لە کوێیە؟»

ئەو پێکەنی و گوتی : «بە هاوسەرەکەت دەلێم. ئەو لێرەیە ئەگەر ئەو بتوانێ چێژی مانەوەت لێرە زیاتر بکا و دیارە بۆخۆشی پێی خۆش بێ، چەندی مۆلەت بوێ دەیدەمێ. ئەو کچێکی باشە، بەلام دەگەل مێردەکەی هێندێ کێشەی هەن.»

«کاردۆئێن» بانگی کرد، ئەو سەرتاپێ پێکەنین هاتە ژوورێ. وا دیار بوو ڕەفتاری ناشیرینی شەوی ڕابردووم ئەوی نەڕەنجاندوە.

گوتم: «بەرنامەی نیوڕۆژی شیراتۆن سەعات ١٢ دەست پێدەکا.»

ئیزابێل پێکەنی و گوتی: «دەگەلت دێم.»

«کاردۆئێن» هەتا بەر دەرگا بەڕێی کردین و گوتی: «ئێوە دوو باڵندەی ئاشق وەدوای کاری خۆتان بکەون. ئەمنیش لێرە بەدوای ڕسقوڕۆزیدا دەگەڕێم.» هەرچەند هەولی دەدا شۆخیمان لەگەل بکا، بەلام ئەمن شوێنەواری نیگەرانیم لە ڕوخساریدا دەخوێندەوە. لەبیربردنەوەی هۆشدارەکانی کارمەندێکی هەوالگریی ئیسرائیل، بۆ وی کارێکی ئاسان نەبوو.

ئەمن و ئیزابێل نانمان لە تەنیشت ئەستێر (استخر، مەلەوانگە) خوارد. خواردنەکە سالادی یۆنانی و پاستا بوو. لەسەر نانخواردن دەستی ئیزابێلم گرت و پێمگوت: «ئەگەر ئەو لە ماوەی دوو حەوتوودا موعامەلەکەی دەگەل سەددام حوسێن تەواو نەکا بۆ ئەوەی بیکەینە پەندی عالەم دەیکوژین.»

ئێمە لەبن چەترێکی هاوینی دانیشتبووین، گەڕیدەکان لەسەر کورسییە ڕەحەتەکان پالیان دابۆوە و لە دنیای خۆیاندا پینووکلادایان دەخواردەوە.

هۆشدارەکەم کاری کردە سەر نیگاکانی ئیزابێل. ئەو گوتی: « ئاری، چما ئەتۆ شێت بووی؟»

«نا، ئەمن کە شتێکم گوت، لەسەری ڕادەوەستم. ئەمن گاڵتە دەگەڵ کەس ناکەم، ئەگەر پێتخۆشە لەسەر کیفەکەم دەنووسم، هەرگیز دووبارە.» (مەبەستی نووسەر ئەوەیە کە ویستیان پایەدارە و لە بڕیاری خۆیان ناکشێنەوە. مترجم فارسی)

«ئاری، ئەمانە دەتکوژن، ئەمانە خەتەرناکن، زۆر، زۆر خەتەرناکن. ئەمن لەجێی تۆ بایەم هەرچی زووتر ئەم وڵاتەم بەجێ دەهێشت، تەنانەت بە یەکەمین فڕین. ئەمانە خەڵکی وا دەکوژن کە دەگەڵیشیان باش بن. خۆ ئەتۆش بە هیچ جۆر ڕەفتارت لەگەڵیان باش نەبووە.»

ئەمن، چەکم پێنەبوو، کارمەندێکی زەبروەشێنی «مۆساد» نەبووم. تەنیا شت کە منی لە پارێزرانم لەم وڵاتە دڵنیا دەکرد، ئاگاداری لەو ڕاستییە بوو کە «لەنێوبردن»ی من بۆ وان کارێکی ئاسان نەبوو. ئەمن بۆ بەجێگەیاندنی ئەرکێکی ڕەسمی سەفەری ئەو وڵاتەم کردبوو. ئەگەر ئەوان منیان لەنێو بردبایە، هەموو کارەکان تێک-دەچوون. بەڵام دیارە «ڕێکەوت» هەمیشە لەوانەیە بۆ مرۆڤ بێتە پێش.

بەدەمیەوە پێکەنیم و خواردنەکەمم تەواو کرد.

ئەو ڕۆژە دوانیوەڕۆ، تەلەفونم بۆ لووفت هانزا کرد و بۆ ڕۆژی دواتر کورسییەکم بۆ سەفەری ئورووپا گرت. بە «باربارا»م گوت، ئێستا ئەمن ئەم وڵاتە بەجێ دێڵم. بەڵام لەو بارەیەوە ڕوونکردنەوەیەکی پترم نەدایە. دیارە ڕۆژی دواتر فڕۆکەکە بێ-بەشداریی من «سانتیاگۆ»ی بەجێهێشت، چونکە ئەمن بە فڕۆکەی شیلی IAN چوومە مادرید و لەوێوە بە فڕۆکەیەکی ئێل عاڵ هاتمەوە ئیسرائیل.

پشـووی کۆتـایی حـەوتووم لـە ئوورشـەلیم تێپـەڕ کـرد. لـەوێ چالاکییـەکی زۆر هـەبوو. کارمەنـدانی هـەواڵگریی ئیسـڕائیل دەگـەڵ سەوداگەرێکی چەکوچۆڵە کە بەستراوەیی تایبەتی بەوانەوە هەبوو و ڕاست لەو ئاپارتمانەش دەژیا کە «جێرار بوول» لە برۆکسێل لێی دەژیا، پێوەندییان گرت و لێیان پرسی داخوا دەتوانێ دیدارێکی نێوان نوێنەرێکی دەفتەری سەرۆکوەزیری ئیسڕائیل و «بوول» ڕێک بخا. وەڵامەکە دەسبەجێ هاتەوە کە «بوول» بەو پەڕی خۆشحاڵی و هەژانەوە ئەم بانگهێشتنەی قبووڵ کردوە. بێگومان ئەو نەیدەزانی چ-نەخشەیەکیان بۆ کێشاوە. ئیسڕائیل ئیدی بێدەنگیی بە دروست نەدەزانی و بڕیاری دابوو بە هەر نرخێک بووە موعامەلەی چەک-وچۆڵەی عێراق بوەستێنێ.

ئەمن لە تەل ئەبیبەوە فڕیم بۆ برۆکسێل. لە فڕۆکەخانە ٤ کارمەندی ئەمنیەتیی ئیسڕائیل بە چەکەوە هاتبوونە پێشوازیم. ئەوان بەڕاستی چەکدار بوون. بارودۆخی ئوورووپا دەگەڵ شیلی جیاواز بوو. لە شیلی ئەوان نەیاندەتوانی کارێک بە دژی من ئەنجام بدەن. بەڵام لە ئوورووپا دۆخێکی دیکە لە ئارادا بوو. زۆر کەسی گومانلێکراو خەریکی چالاکیی جاسووسی بوون و خاکی ئوورووپا ببووە مەیدانی کوشتار.

ئەو شەوە ئەمن لە هۆتێلەوە تەلەفونم بۆ «بوول» کرد و گوتم ئەمن ئەو نوێنەرەم کە قەرارە چاوم پێی بکەوێ. دۆستێکیش هاوکاریی دەکردم -کە دیارە یەکێک لە کارمەندانی ئەمنیەتی بوو-. سێ کارمەندە ئەمنیەتییەکەی دیکە لەنێو ترومبێلەکە مانەوە. وا ڕێک-خرابوو کە «بوول» دەسبەجێ بێتە لای من و قسەم لەگەڵ بکا.

بەپێی زانیارییەک کە درابوو بەمن، دەمزانی کە «بوول» زانایەکە کە دەیەوێ تیئۆرییەکەی لەو بارەیەوە کە بە دروستکردنی تفەنگێکی پێشکەوتوو لە هەلومەرجێکدا دەتوانرێ کڵاوەی مووشەکەکان لە مەودایەکی زۆر دوورەوە بکرێنە ئامانج ئیسبات بکا. بەپێی تیئۆریی

«بوول» هەرچەندی زیاتر سووتەمەنی بکرایە دەزگاکەوە، گوللەکە زیاتر دەڕۆیشت. بەم جۆرە بە بەراوردێکی دروست، هەر شوێنێک تفەنگ‌هاوێژ بیویستایە گوللەکەی دەگەیشتێ و ئامانجی دەپێکا.

ساڵی ١٩٨١ «بوول» بۆ فرۆشتنی پرۆژەکەی خۆی سەفەری ئیسرائیلی کردبوو. تەکنیسیەنەکانی ڕێکخراوی پیشەسازیی سەربازیی ئیسرائیل لە تیئۆرییەکەی ئەویان کۆڵیبۆوە و گەیشتبوونە ئەو ئاکامە کە تیئۆرییەکەی دروست و کردەنییە. بەڵام، ئەوان حەزیان بە تەکنۆلۆژیی مووشەک دەکرد نەک تۆپخانە.

ساڵی ١٩٨٣، «مارک تاچێر»، کوڕی «مارگرێت تاچێر» سەرۆک-وەزیری بریتانیا، «بوول»ی بە ژەنراڵ «پیتەر ڤان دێر وێست هووەیزن» سەرۆکی ڕێکخراوی هەواڵگریی سوپای ئەفریقای باشوور ناساند. ژەنراڵ «وێست هووەیزن» تێزەکەی ئەوی بردە Armscot . Armscot ڕێککەوتننامەیەکی بەرهەمهێنانی تفەنگەکەی دەگەڵ «بوول» ئیمزا کرد. بەڵام، لە سەفەرێکدا کە «بوول» بۆ ئەمریکای کرد، بە هۆی داواکاری گشتیی بەشی باشووری نیویۆرک و کارمەندانی خزمەتە گومرکییەکانەوە بە تۆمەتی سەرپێچی لە قانوونی هەناردەکردنی گوللە و فیشەک گیرا. تۆمەتەکەی بریتی بوو لە: ناردنی تەکنۆلۆژیی سەربازی بۆ ئەفریقای باشوور کە کەوتبووە بەر گەمارۆی ئابووری. ئەم ڕووداوە، کاتێک ڕووی دا کە ئەمریکا بە مسۆگەری کەرەسەی شەڕی بۆ ئەفریقای باشوور دەنارد.

«بوول» ماوەی ٦ مانگ لە زیندانێکی فیدڕاڵ بە تۆمەتی تووشبوونی خیلاف بە پلەی تاوان، زیندانی کرا و پاش ئازادبوون لە زیندان بە دڵشکاوی چووە برۆکسێل و لەوێ دوکانێکی دانا. ئەو حەزی دەکرد، پێوەندیی خۆی دەگەڵ ئەفریقای باشوور بپارێزێ، بەڵام وەختێک گەڕایەوە ئەو وڵاتە، بەهۆی ئەوەی لە ئەمریکا زیندانی کرابوو، بە ساردی وەریانگرت. بەڵام کارگوزارانی ئەفریقای باشوور، ئەویان بە جێگری سەرۆکی ستادی کڕین- واتە کەسێک کە

بەرپرسایەتیی کڕینی لەئەستۆ بوو، ناساند. ئەم ناسیارییە بووە هۆی ئـەوە کـە، عێـراق مەئمووریـەت بـدا بـە «بـوول» کـە تفەنگـە پێشکەوتووەکەی بۆ ئەو وڵاتە دروست بکا. بەڵام دیارە ئەرکی دانی پـارە بـە نـاوبراو، خرابـووە ئەسـتۆی ڕایەڵکـەی مـاڵیی «کـارلۆس کـاردۆئێن». ئـەم بابەتـە ببـووە هـۆی ئـەوە کـە ئـەمن لـە ژووری هۆتێلەکەم لە برۆکسێل دەگەڵ «بوول» بەرەوڕوو بم.

«بوول» پیاوێکی وەنێوکەوتووی بەخۆوە و بێفیز و مووخەنەیی بوو. ئەو لەسەر کورسییەکی دەسکدار پاڵی دایەوە و لە بارەی تفەنگە پێشکەوتووەکەیەوە دەستی بە قسە کرد. بەپێچەوانەی ئەوە کە ئەو دەیەویست دەگـەڵ عێراق بکەوێتـە موعامەلـە، ئـەمن بەڕاسـتی ئـەو پیاوەم خۆش دەویست. ئەو نە لە پووڵ دەگەڕا، نـە بـەرزەفڕ بوو، نـە ئیدئۆلۆژییەکی هەبوو. تەنیا دەیەویست بیسەلمێنێ کە پرۆژەی تفەنگە پێشکەوتووەکەی کردەنییە. لەوبارەیەوە پێی دادەگرت کە: «پرۆژەکەم کردەنی و جێی متمانەیە.»

گوتم: «بەڕێز بوول، ڕەنگە پرۆژەکەت کردەنـی بێ، بەڵام لەبارەی ئەو کەسانەوە کە پێی دەکوژرێن دەڵێی چی؟»

«چەندین سەدەیە خەڵک بە هۆی جۆراوجۆرەوە دەمرن، بەڵام ئەم تفەنگە بۆ ئەوەیە کە عێراق بتوانێ بەرگری لەخۆی بکا. بە بوونی ئەو تفەنگـە کـەس نـاوێرێ پـەلاماری ئـەو وڵاتـە بـدا. ئەمـەش بێگومـان هەنگاوێکە بەرەو ئاشتی.»

«بـەڕێز بـوول، ئـەتۆ دڵنیـای کـە عێراقییـەکان تـەنیا بـۆ بـەرگری لەخۆیان کەلک لەو تفەنگە وەردەگرن؟ دەتوانی پێمبڵێی کێ هێرش دەکاتە سەر عێراق؟»

«دیـارە ئـەمریکاییـەکان،و ئێـوە ئیسـرائیلییەکان کـە پێشـتریش پـەلامارتان داون. ئێوە سـاڵی١٩٦٧، بەغداتان کردە ئامـانج، و سـاڵی ١٩٨١یش لە کارخانەکانی عێراقتان دا.»

«ئێمە لە دامودەزگا ئەتۆمییەکانی وانمان دا.»

«بەڵێ، ئێوە دامودەزگا ئەتۆمییەکانی وانتان تەقاندنەوە، لەحاڵێکدا هەرئەوکاتە بۆخۆتان بۆمبی ئەتۆمیتان هەبوو. ئێوە ئامرازی بۆمب-هاویشتنیشتان هەیە. ئەگەر ئەمن بتوانم هاوتایی دەسەڵات و سام لە خۆرهەڵاتی نێوەڕاست پێکبێنم، لەم ناوچەیەدا ئاشتی بەرقەرار دەبێ و بەردەوامیش دەبێ.»

هەرچەند لە بەرامبەرمدا ڕاوەستابوو و دەگەڵ قسەکانم موخالیف بوو، هەستم کرد بەڕاستی ئەو پشتیوانی لە کەسێکی تایبەتی ناکا. گوتم: «بەڕێز بوول، تکا دەکەم، ئەم بەرنامەیە ڕابگرە، ئێمە بە تێکدانی ئەو موعامەلەیە دەگەڵ عێڕاق چیت زیان پێدەگا، بۆت دەبژێرین.»

«مەبەستت چیە؟»

«ئێمە دەزانین ئەتۆ دەگەڵ عێڕاق قەرارومەدارێکت ئیمزا کردوە» کیفەکەم کردەوە و نەخشەیەکم پێنیشان دا. «ئێرە ئەو پارچە زەوییەیە کە ئەوان بۆ تاقیکردنەوەکانی تۆ لە خۆرئاوای عێڕاق بۆیان داناوی.»

ئەو سەری سوڕ ما. «ئێوەی حەرامزادە، لە هەموو جێیەک بەدوای منەوە بوون.»

داوام لێکرد ئیزن بدا بۆ نانی شەو بانگهێشتنی ژوورەکەمی بکەم. ئەو تەماشایەکی ئەو پیاوە ئەمنیەتییەی کرد کە لەگەڵم بوو، و گوتی: «بە مەرجێک دێم ئەم کابرایەمان دەگەڵ نەبێ.»

ئێمە شێومان پێکەوە خوارد. ئەمن دووبارە پێم داگرتەوە کە ئەگەر ئەو دەست لە بەرنامەکەی دەگەڵ عێڕاق هەڵگرێ، ئیسرائیل هەموو زیانە ماڵییەکانی بۆ قەرەبوو دەکاتەوە.

«داخوا ڕێگام پێدەدرێ پرۆژەی تفەنگە پێشکەوتووەکەم لە جێیەکی دیکە جێبەجێ بکەم؟»

«نا، بە هیچ جۆر.»

هەروا کە شەڕابە سپییەکەی دەخواردەوە، لیمپرسی، ئەو چۆن دەگەڵ عیڕاق و «کارلۆس کاردۆئێن» ئاشنا بووە.

«بەهۆی سەردانەکانم لە ئەفریقای باشوور. جگەلەوە، ئەمن و حکوومەتەکانی ئەفریقای باشوور و شیلی، لەگەڵ (مارک تاچێر) دۆستین و باشترە ئێوە زۆرم تین بۆ نەهێنن. چونکە سەرۆکوەزیری بریتانیا نارەحەت دەبێ.»

گوتم: «زۆر باشە، بەڵام ئەتۆ هێشتا پێتنەگوتووم کێ تۆی دەگەڵ کاردۆئێن ئاشنا کرد.»

گوتی: «بۆچی پێمگوتی مارک تاچێر ئەو کارەی کردوە.»

ئێمە بە بێدەنگی نانەکەمان خوارد. بەڵام ئەمن دەستبەرداری بابەتەکە نەبووم. پێمگوت: «ئەتۆ دەزانی ئیسرائیلییەکان ناوبانگێکی زۆر خراپیان هەیە. ئەوان دەگەڵ کەسێک کە بیهەوێ خەڵکەکەیان گازکوژ بکا، زۆر مێهرەبان نابن.»

«تکا دەکەم تەواوی کە. ئەمریکایییەکان بە ڕادەی پێویست منیان تاقی کردۆتەوە، ئێوەی جوولەکە هەوڵ دەدەن، هەمووکەس بە تاوانبار نیشان بدەن.»

لێرەدا پێمگوت: «بەڕێز بوول، کاتەکەت تەواو بوو، لە هاتنت بۆ ئێرە زۆر مەمنوونم.»

ئەو هۆشدارەکەی وەرگرتبوو.

بەیانیی ڕۆژی دواتر ئەمن دەگەڵ یەکێک لە پارێزەرەکانم فڕیم بۆ فرانکفۆرت. پاشان پارێزەرەکەم لەو شارە بەجێهێشت و لەوێڕا فڕیم بۆ «ئاسۆنسیۆن» Asuncion پێتەختی پاراگوا. پێشتر داوا لە سەرکۆماری پاراگوا کرابوو کە لەبەر کارێکی زۆر پێویست ڕێگا بدا چاوم پێیبکەوێ. لە فڕۆکەخانەی نێودەوڵەتیی Alfredo Stressnerەوە بە تاکسی چوومە هۆتێل Excelsior. پۆستەرێکی گەورەی وێنەی سەرکۆماری پاراگوا لە ساڵۆنی پێشوازیی هۆتێلەکە بەرچاو دەکەوت.

پریزیدێنت «سترۆسنێر» ساڵی ١٩٥٤ بەهۆی CIAوە لە پاراگوا هاتبووە سەر کار تا ئەفسەرانی نازی و زانایانی ئەڵمانی کە ئەمریکا پاش دووەمشەڕی جیهانی دەگەڵیان ڕێک کەوتبوو، لەو وڵاتە ڕاگرێ و بیانپارێزێ. لە کۆتایی شەڕدا، ڕێکخراوی خزمەتە ستراتیژییەکانی ئەمریکا نازییەکانی وەک دوژمن چاو لێنەدەکرد، بەڵکوو وڵاتی یەکیەتیی کۆمارەکانی شووڕەوی بە ڕێبەریی ستالینی، بۆخۆی بە مەترسییەکی ڕاستەقینە دەژمارد. هەربۆیە، ئەمریکایییەکان، ئەفسەرانی هەواڵگریی نازی و کارناسانی چەکسازیی ئەڵمانییان دامەزراندن تا لەبارەی سۆڤیەتەکانەوە زانیارییان بۆ کۆ بکەنەوە و هێندێک لەوانیان لە ئەمریکا و هێندێکی دیکەیان بە گۆڕینی ناسنامە لە ئەمریکای باشوور نیشتەجێ کرد. چونکە پریزیدێنت «سترۆسنێر» ڕابردوویەکی ئەڵمانیی هەبوو و لە شەڕی دووەمی جیهانیدا هێندێ پێوەندیی دەگەڵ حیزبی نازی هەبوو، باشترین کاندیدا بوو کە CIA دەیتوانێ بۆ ئەنجامی ئەرکێکی وا هەڵیبژێرێ. بەم جۆرە، ئەو بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ کاری بۆ ئەمریکا دەکرد.

پێوەندیی نێوان وڵاتی پاراگوا و حکوومەتی ئیسرائیل، دەگەڕایەوە سەردەمێک کە «گولدا مایر»، وەزیری دەرەوەی ئیسرائیل بوو. «گولدا مایر» لە ساڵەکانی دەیەی ١٩٥٠دا لە دروستکردنی پێوەندیی نێوان ئیسرائیل و ئەڵماندا زۆر سوودمەند بوو. چونکە لەوکاتەدا، پێکهێنانی بارودۆخێکی ئەوتۆ لە ئیسرائیل زۆر ئەستەم بوو. «گولدا

مـایر» لـە دروسـتکردنی پێوەنـدیی نێـوان پـاراگوا و ئیسرائیلیشـدا ڕۆڵێکی باشی گێڕا. لە حاڵێکدا ئەمریکا حازر نەبوو باڵیۆزخانەی خۆی لـە شـاری دێرینـی مەزهـەبیی ئۆرشـەلیم دابنـێ و هـەتا ئـەمڕۆش باڵیۆزخانەکەی لە تـەل ئەبیبە،[٢٤] پریزیدێنت «ستڕۆسنێر» ڕازی بـوو کە باڵیۆزخانەی پاراگوا لە شاری ئۆرشەلیم دابمەزرێ.

دیارە پێوەنـدیی ئیسـرائیل دەگـەڵ پاراگوا بـە تـەواوی پتـەو نـەبوو. کـارگوزارانی هـەواڵگریی «مۆسـاد» لـە دەیـەی سـاڵەکانی ١٩٥٠ و ١٩٦٠دا، بـەدوای گرووپـەکانی نـازی و ناسـینەوەیاندا گـەڕان و لـە ئاکـامی ئـەو کـارەدا هەرنـەبێ دوو ئیسـرائیلی کـوژران. سـەرەنجام «ستڕۆسنێر» زۆری هەوڵ دا ناوبانگی نازیدۆستیی خۆی بشواتەوە و بەڵێنی بە ئیسرائیل دا کە ئەوپەڕی هاوکاری دەگەڵ ئـەو وڵاتـە بکا. هەرچەند ئەم بابەتە کۆمەکێکی بـە چارەسـەری گیروگرفتی نازییـەکان نـەکرد، بـەڵام بـووە هـۆی ئـارامبوونـەوەی شـەڕی کـارگوزارە هەواڵگرییەکانی ئیسرائیل بۆ لەنێوبردنی نازییەکان.

بەوحاڵـە، ئیسـرائیل بـۆ گوازتنـەوەی ئـەو کەرەسـە جەنگییانـەی دەیفرۆشـتن، کـەلکی لـە هاوکـاریی پـاراگوا وەرگـرت. چونکـە، پـاراگوا هەوڵی دا چاوی خۆی لەو کەرەسە جەنگییانـە کە بە فڕۆکەخانەکەیدا تێدەپـەڕین، بنـووقێنێ. لـە دەیـەی سـاڵەکانی ١٩٦٠دا، بڕێکـی زۆر لـەو کەرەسـە جەنگییـە ناقانوونییانـە کە دەبـوو لـە وڵاتـانی جۆراوجـۆرەوە بنێردرێنـە ئیسـرائیل، لەپێشـدا دەچوونـە پـاراگوا و پاشـان لـەوێڕا بـار دەکـران بـۆ تـەل ئـەبیب. ئیسـرائیل هـەروەها لـە خـاکی پـاراگوا وەک ڕێگایـەک بـۆ گوازتنـەوەی ئـەو ماددانـە کـەلکی وەردەگـرت کـە بـۆ بەرهـەمهێنانی بـۆمبی ئـەتۆمی لـە ئـەفریقای باشـوورەوە دەیبردنـە «دیمۆنا». پێوەندییەکانی ئیسرائیل و پاراگوا بە ڕادەیەک بـەهێز بـوون

---

[٢٤]-مانگی مای (ئەیار)ی ٢٠١٨ باڵیۆزخانەی ئەمریکا گوازرایەوە شاری ئۆرشەلیم یان بیت المقدس. (وەرگێڕ)

کە هەتا ئەمڕۆش هێڵی ئاسمانی مانگی جارێک لە «ئاسانسیۆن» فڕۆکەیەکی دەچێتە تەل ئەبیب. هەر مانگەی فڕۆکەیەکی جیاواز دەچێتە ئیسرائیل و ماوەی دوو حەوتوو لەو وڵاتە دەمێنێتەوە بۆ ئەوەی ڕێکخراوی پیشەسازیی فڕۆکەوانیی ئیسرائیل چاکی بکاتەوە. ساڵی ١٩٧٧، کاتێک «مەناخیم بگین» بوو بە سەرۆکوەزیری ئیسرائیل، پێوەندیی ئیسرائیل دەگەڵ پاراگوا نەگۆڕا، بەڵام پتەوتریش نەبوو. سەرۆکانی نوێنەرایەتیی سیاسیی ئیسرائیل لە پاراگوا، تەنانەت لە سەردەمی سەرۆکوەزیریی «مەناخیم بگین»یشدا، لە حیزبی کرێکار هەڵدەبژێردران.

لەو هەلومەرج و بارودۆخەدا، شەوێک کە لە مانگی سێپتامبردا ئەمن گەیشتمە «ئاسانسیۆن»، تەلەفونێکم لە ماڵی باڵیۆزی ئیسرائیلەوە بۆ هات، کە «ئەوی پزنەر» دەیەوێ بە تەلەفونێکی ئەمن لە باڵیۆزخانەی ئیسرائیلەوە قسەم لەگەڵ بکا. ئەمن لە چۆنیەتیی قسەکردنی باڵیۆزرا تێگەیشتم کە ئەو بە ئاسوودەیی قسە ناکا.

ئەو پرسی: «دەکرێ، پێم بڵێی ئەتۆ کێی؟»

بە سادەیی پێمگوت: «کار بۆ دەفتەری سەرۆکوەزیر دەکەم.»

«بۆچی منیان لە هاتنی تۆ ئاگادار نەکردوە؟»

لە حاڵێکدا دەمەویست بە ئارامی هەموو شتێکی تێبگەیەنم، گوتم: «بەڕێز، بابەتەکە سەخت مەگرە.»

بەڵام ئەو وای نەکرد و لێی زیاد کرد: «دەفتەری سەرکۆماری پاراگوا تەلەفونی بۆ من کردوە و ویستوویەتی لەبارەی تۆوە وردەکارییان بدەمێ. هەروەها بە منیان گوتوە کە ئەتۆ قەرارە سەرکۆمار ببینی. ئەمن پێدادەگرم کە کاتی دیتنی سەرکۆمار ئەمنیش ئامادە بم، ئەگینا، بابەتەکە بە وەزیری دەرەوە ڕادەگەیەنم.»

«ئێمە ناتوانین ڕێگا بدەین پێوەندییەک کە بە چەندین ساڵ دەگەڵ پریزیدێنت «ستڕۆسنێر» دروستمان کردوە، زیانی پێبگا. ئێمە ڕێگا نادەین ئەم پێوەندییە بەهۆی لیکوودەوە تێکبدرێ.»

گوتم: «بەڕێز، ئەگەر ئەتۆ پێ لەسەر ئەم بابەتە بچەقێنی، دەگەڵ دەفتەری سەرۆکوەزیر بەرەوڕوو دەبی.»

گوتی: «تێناگەم دەڵێی چی؟»

«دەڵێم ئەگەر وابێ کارەکەتت لەدەست دەچێ.»

بە بیستنی ئەم بابەتە تەلەفونەکەی داخستەوە.

هەر ئەو شەوە چوومە باڵیۆزخانەی ئیسرائیل تا قسە لەگەڵ «ئەوی پزنەر» بکەم. بەخۆشییەوە، باڵیۆز لەوێ نەبوو. ئەمن بۆ شەڕەقسەیەکی دیکە ئامادە نەبووم. «ئەوی پزنەر» پێی‌گوتم: «ئێمەش ئێستا ئاگادار بووین کە ناوەندی سەرەکیی عەمەلیاتی کاردۆئێن لە پاڕاگوایە.»

«پزنەر» هەروەها گوتی: «دۆستەکانمان (ئارژەنتینییەکان) هێندێ وێنەی کارخانەی کاردۆئێن لە پاڕاگوایان بۆ ناردووین کە ئێستا بەدەستمانەوەن.» ئەمە ئەرکی من بوو کە هەموو هەوڵی خۆم بدەم پریزیدێنت «سترۆسنێر»ی قانیع بکەم کە ئەو کارخانەیە دابخا.

ئەو شەوە پێش ئەوەی بخەوم، تەلەفونم بۆ «ئۆرا» کرد و گوتم ئەمن لە پاڕاگوام و حاڵیشم باشە. ئەمە یەکەمین جار بوو کە ئەوم لە شوێنی خۆم ئاگادار دەکرد. چونکە نەمدەویست خەڵکی دیکە پێشوەخت لە شوێنی سەفەرەکانم ئاگادار بن و بکەومە مەترسییەوە.

بەیانیی ڕۆژی دواتر، ترومبێلەکەی من کە مێرکوورییەکی ڕەشی گەورەی باڵیۆزخانە بوو، بە ئاڵا و ژمارەی دیپلۆماتییەوە کە ڕۆژی پێشتر لە قسە زلەکانمدا لە باڵیۆزی ئیسرائیلم داوا کردبوو، بەدوامدا هات. ئەمن لە کورسیی پشتەوە دانیشتم و ئەو پارێزەرەی بۆ من دانرابوو لەسەر کورسیی پێشەوە دانیشت.

کۆشکی پریزیدێنت لەسەر خاکێکی بەربەرین لە پشت دیوارێکی بەرزی خشتی سوور بوو و دیارە لەلایەن گاردێکی زۆرەوە دەپارێزرا. هەرکە لە دەرگا کانزایی‌یەکان نزیک بووینەوە ئەوان بۆمان کرانەوە. کاتێک گەیشتینە دەفتەری پریزیدێنت، گاردێک کە جلکی

یۆنیفۆڕمی دەبەردا بوو، دەرگای بۆ کردینەوە و لەوێڕا یەکێک لە سکرتێرەکانی کۆشک لەگەڵمان هات.

لە کۆتایی ساڵۆنێکی میچبەرز کە بە چلچرا (لۆستەر)ێکی زۆر ڕازابۆوە، پۆستەرێکی گەورەی وێنەی پریزیدێنت چاومی بەمۆلەق وەستاند. سکرتێر ئێمەی بۆ دەفتەرێک ڕێنوێنی کرد کە فەرشێکی زریشکیڕەنگی لێ ڕاخرا بوو، پاشان بە پلیکانێکی مارپێچدا سەرکەوتین و لەوێ ڕێنوێنی کراین بۆ دەفتەرێک کە مۆبڵ (قەنەفە)یەکی زۆر قیمەتیی لێدانرابوو.

بە منیان گوت: «پریزیدێنت لە دەفتەری کاری خۆی دەتبینێ.»

چەند دەقیقە دواتر، خۆم لە بەرامبەر پیاوێکدا دیت کە ماوەی ٣٤ ساڵ بوو فەرمانڕەوای پاڕاگوا بوو. پیاوێک کە دەیەی ساڵەکانی دوای ٧٠ ساڵیی دەگوزەراند. قژی سەری تەنک و خەتخەت سپی و قاوەیی بوون. پریزیدێنت «ستڕۆسنێر» بە گەرمی دەستی گرتم و گوتی بە دیتنت یەکجار خۆشحاڵم. پاشان بە زمانی ئینگلیزی گوتی، ئەمە یەکەمجارە کە سەرۆکوەزیری ئیسڕائیل ڕاستەوخۆ نوێنەرێک دەنێرێ کە قسەم لەگەڵ بکا.

ئەو گوتی: «ئەمن لەبارەی بابەتەکەوە پرسیاریشم نەکرد، بەڵام بەوەیڕا کە کارەکە زۆر بە پێویست دانرا، پێموایە دەبێ بابەتەکە زۆر گرنگ بێ. ئەمن هەموو دیدارەکانی دیکەم هەڵوەشاندۆتەوە تا بتوانم تۆ ببینم.» ڕەنگە ئەگەر ئەو زانیبای ئەمن چیم لە مێشکدایە، هیچ خۆی نارەحەت نەکردایە.

ئەمن بەمجۆرەم دەست بە قسەکرد: «زۆر بەڕێز، ئەمن بۆ گرنگترین بابەت کە دەتوانێ هەبێ هاتوومە دیداری جەنابت. ئێوە دەتوانن وای دابنێن ئەوەی لە منی دەبیسن، لەڕاستیدا بۆخۆتان لە سەرۆکوەزیری ئیسڕائیلتان بیستوە. ئێمە پێویستیمان بە کۆمەگی ئێوە هەیە.»

ئـەمن لـەبارەی پیشەسـازیی «کـاردۆئێن» و چالاکییـەکانی لـە بەرهـەمهێنان و نـاردنی کەرەسـەی شـیمیایی و میکرۆبیـی شـەڕ بـۆ عێراق و ئاکامەکانی ئەم بابەتە بۆ ئیسرائیل، ڕوونکردنەوەی پێویستم بـۆ دا. «ئـەم پیـاوە کارخانەیەکیشـی بـۆ بەرهـەمهێنانی ئـەو کەرەسـە جەنگییانە لە پاڕاگوا هەیە.»

ئـەو بـە ئەسـپایی سـەری ڕاوەشـاند و گـوتی: «بـەڵێ، ئاگـام لـە مەسـەلەکە هەیـە، بـەڵام ئـەوان کەرەسـەی شـیمیایی و گـازیی شـەڕ بەرهەم ناهێنن. ئەگەر ئەتۆ بتوانی دەری بخـەی کە ئەوان ئـەو جۆرە چەکانە دروست دەکەن، ئەمن تەلەفون بۆ دۆستم ژەنڕاڵ «پینۆشێ» دەکەم و لێی دەپرسم، بۆچی ئەوان ئەو چەکانە لە وڵاتی من بەرهـەم دێنن.»

«پایەبـەرز، ئێمـە داوا لـە جـەنابت دەکـەین، ئـەم کارخانەیـە دابخـەن. ئـەم کـارە بـە سـوودی وڵاتـە باشـەکەی ئێوەیـە. ئێمـە نـاتوانین دووبارەبوونەوەی مێژووی نازییەکان و کوژرانی خـەڵکی وڵاتەکـەمان بە گاز ببینین.»

ئێستا وەختـی ئـەوە هـاتبوو کـە زمـانی ئاشتیخوازانە بـەکار بـەرم: «سـەرۆکوەزیـری ئیسرائیل دەسـەڵاتی بـە مـن داوە بـڕی ٣٠ میلیـۆن دۆلار ئیعتیبـار بـۆ کۆمـەگی سـەربازی بـە ئێـوە پێشنیار بکـەم. دیـارە ئەگـەر پێویسـتیی دیکەشـتان هـەبێ، بەوپـەڕی خۆشـحاڵییەوە دەتاندرێتێ.»

بـێئـەوەی یـەک وشـەی دیکـەی بەزمانـدا بـێ، «سترۆسـنێر» بـە تەلەفون بە یەکێک لە یاریدەدەرەکانیی گوت: «ئەمن حەز دەکەم ڕێکی بخـەی کـە بـەڕێز بـن مۆناشـێ و تیمێکـی لێکۆڵینـەوەی سـەربازی سـەردانی کارخانـەی پیشەسـازیی (کـاردۆئێن) بکـەن. ئـەم کـارە بـۆ سبەینێ ڕێک بخەن.»

گـوتم: «پایـەبـەرز، ئـەمن پـێش دەرچـوونی دەسـتووری سـەردانی کارخانەکە چاوەڕوانیی لوتف و هاوکاریم لە جـەنابت هەیـە. سـەرۆک-

وەزیـر شـامیر چـاوەڕوانیی لـە جـەنابت هەیـە وەڵامـی بدەیـەوە کـە داخوازەکەمان جێبەجێ دەکەی و ئەم کارخانەیە دادەخەی.»

ئـەو پرسـی داخـوا ئیسـڕائیل ڕازی دەبـێ گرووپێـک لـە گاردەکـانی سەرکۆماری و نەک سـوپا بـۆ کـاری بەربـەرەکانیی تێرۆریـزم ڕابێنـێ. وەڵامم دایەوە کە ئەم کارە بێ هیچ گومانێک جێبەجێ دەدکرێ.

پریزیـدێنتی بەسـاڵداچوو لەحاڵێکـدا زەردەخەنەیـەکی لەسـەر لێـوان بـوو، هەسـتایە سـەر پـێ و بانگهێشـتنی کـردم کـە شـەوی دواتـر دوای سـەردانی کارخانـەی «کـاردۆئێن» بـۆ نـانی شـەو بچمـە ماڵەکـەی. سوپاسـی ئەو کاتەم کرد کە دابووی بە من. لـە ڕاسـتیدا تاڕادەیـەک لـە ئەنجامی ئەرکەکەمدا چووبوومە پێش. ڕۆژی دواتـر دەمتـوانی تێبگـەم کە «کاردۆئێن» لەم وڵاتەدا چالاکیگەلێکی بەدەستەوەیە.

کاتێک گەڕامـەوە هۆتێل، پەیامێکم لـە دەفتـەری فەرمانـدەی فێرگـەی سـەربازیی پـاراگوا، ژەنـڕاڵ «ئانـدرێ ڕۆدریگێـز» Andres Roddriguesەوە کـە ماوەیـەکی کـەم دواتـر، لـە مەیـدانی جۆراوجـۆری جیهانیدا زۆری ناو بیسترا، بۆ هاتبووە هۆتێل. ئەم ناوە بـۆ مـن ئاشـنا بوو. لەبارەی «مارتا»ی کچیەوە کە لـە سـاڵانی ٣٠ی تەمەنیدا بـوو و مێـردی بـە کـوڕی دووەومـی «سترۆسـنێر» کردبـوو، هێنـدێ دەنگـۆ هەبوون.

کوڕی گەورەی پریزیـدێنت، ئەفسـەری هێزی هـەوایی بوو و وا قـاو بـوو کـە هـاوڕەگەزخـوازە. لـە ئاکامـدا ئـەو نەیـدەتوانی کاندیـدای سـەرکۆماری بـێ. بۆیـە لـەنێوان پریزیـدێنت «سترۆسـنێر» و ژەنـڕاڵ «ڕۆدریگێز»دا موافەقـەت کرابـوو کە لـە هـەڵبژاردنی سـاڵی ١٩٩١دا، «سترۆسـنێر» دەسـت لـە کـار بکێشـێتەوە و ئیـزن بـدا کـە ژەنـڕاڵ «ڕۆدریگێز» وەک کاندیدای سەرکۆماری لە حیزبی «کۆلۆڕادۆ» کە تاقە حیزبی گرنگ لە شارەکەدا بوو، بەشدار بێ.

بـەڵام، لـەنێوان ژەنـڕاڵ «ڕۆدریگێـز» و کـوڕی دووەمـی «سترۆسنێر»دا کـە گیـرۆدە بـە کۆکـایین بـوو، لەسـەر سـەرکۆماریی

ئەو وڵاتە ناكۆكییەكی توند هەبوو. «مارتا سترۆسنێر» لە ژیان دەگەڵ هاوسەرە كۆكایینییەكەی بێزار و ماندوو ببوو و كەین-وبەینێكی دەگەڵ دووەمین كوڕی «ئانا ستازیۆ سمۆزا» سەركۆماری لەكارلادراوی نیكاراگوا پێكهێنابوو. پاش ئەوەی «ئانا ستازیۆ سمۆزا» بە مووشەكێكی TOW كە ئەندامێكی «سەندی نیستا» ساڵی ١٩٨٠ لە ترومبێلەكەی دا، كوژرا، كوڕەكەی لە «ئاسانسیۆن» درێژەی بە ژیان دا.

ئەمن لە وەڵامی ژەنراڵ «رۆدریگێز»دا تەلەفونم بۆی كرد، سەرۆكی ستادەكەی وەڵامی تەلەفونەكەی دایەوە. ئەو گوتی، ئەگەر بانگهێشتنی ژەنراڵ بۆ شێوی ئەمشەو لە ماڵی وان قبووڵ بكەی پێی سەربەرز دەبێ. بەمجۆرە بانگهێشتنێكی دیكەی شێوم پێگەیشت و ئەمن نەمدەزانی ئەمجار چخەونێكیان بۆ دیوم.

سەعات ٧ی پاش نیوەڕۆ، ترومبێلێكی مارسدس بێنزی ڕەش لە هۆتێل ئامادە بوو. دوو پیاو كە جلوبەرگی ڕازاوەیان دەبەردا بوو، هاتنە پێشەوە و بە بەخشینی ناسناوی «جەنابی باڵیۆز» سڵاویان لێكردم. چوومە نێو ترومبێلەكە و بردیانمە باڵەخانەیەكی گەورە و بەشكۆ لە بەشی دەوڵەمەندنشینی شار. ژەنراڵ لەنێو ئەستوندەكەكانی هەیواندا چاوەڕێی من بوو. ئەو پیاوێكی بەخۆوە بوو كە لە ساڵەكانی سەرەتای دەیەی ٦٠ ساڵیی خۆیدا دەژیا و جلوبەرگی ئازاد و نارەسمیی دەبەردا بوو. بەخێراتنی كردم و گوتی، پاراگوا بە ماڵی دووەمی خۆت بزانە، ئەمە ڕستەیەك بوو كە لە میوانداریییەكانی پێشتریشدا لە خانەخوێكانم لە شارەكانی دیكە بیستبوو.

ماڵی ژەنراڵ زۆر بە بریقوباق بوو. تەختی ژوورەكانی مەڕمەڕی ئیتالیایی بوو و مافوورەی هاوریشم و مەخمەریان لێڕاخرابوو. قەنەفەی ژوورەكان قورس و قیمەتی بوون. ئەو منی بە هاوسەر و مارتای كچی كە زۆر جوان بوو و زۆرم لەبارەیەوە بیستبوو، ناساند.

گوتی: «فەرموو، شێو بخۆین.»

دیار بوو وا ڕێکخرابوو کە ئەمن و ئەو بەتایبەتی پێکەوە بین. ژنەکانمان بەجێ هێشتن و چووینە ژوورێکی دیکە کە مێزێکی چوار گۆشەی بۆ دووکەس لێ ڕازابۆوە. ئەو خزمەتکارێکی ژنی کە لە سووچێکی ژوورەکە ڕاوەستابوو ئیزن دا. بەڵام کاتێک زانی ئەمن گۆشت ناخۆم، ئەوی بانگ کردەوە. لە حاڵێکدا داوای لێبووردنی لێ-دەکردم کە پێشتر نەیزانیوە ئەمن گیاخۆرم، گوتی ئیشکەرەکانی باشترین پاستای مومکین دروست دەکەن.

پاشان دەستی بە قسە کرد و گوتی: «پریزیدێنت سەردانی کارخانەی کاردۆئێنی بۆ تۆ ڕێکخستوە، بەڵام نازانم، ئێوەی ئیسرائیلی بۆچی بەرامبەر بەو بابەتە هێندە هەستیارن.»

پێش ئەوەی قسەیەک بکەم، ئەو لێی زیاد کرد: «جگە لەوە، ئەمن ئاگادارم کە ئەتۆ بەڕێز کاردۆئێنت لە شیلی دیوە و هەروەها دەگەڵ دۆستی خۆشەویستی من ژەنراڵ ستانگ شێوتان پێکەوە خواردوە.»

ئاشکرا بوو کە ئەو بە چاکی لە چالاکییەکانی من ئاگادارە.

ئەو لەسەری ڕۆیشت: «پریزیدێنت، لە هەموو ئەو کارانەی لەم وڵاتە دەگوزەرێن ئاگادار نیە. ئەو کاری لەوە پترە کە بزانێ لە هەر کارخانەیەکی ئەم وڵاتە چڕادەبرێ. پاش ئەوەی دەستووری سەردانی کارخانەکەی دەرکرد، ئێمە پشکنیمان و بەو ئاکامە گەیشتین کە ئەو تەنیا کارخانەیەکی پرۆژەی کشتوکاڵییە.»

ئەمن لەوێ بێدەنگ دانیشتبووم و گوێم بۆ قسەکانی ڕاگرتبوو. ئەو بێگومان دەیەویست پێمبڵێ کە زەحمەتی پشکنینی کارخانەکە نەکێشم و ئەمنیش گومانم نەبوو کە ئەو پێشتر دەگەڵ «کاردۆئێن» و «ستانگ» بە تەلەفون قسەی کردوە.

ئەمن حەوسەلەی باسکردنم نەبوو. ئێستا کە بۆم دەرکەوتبوو بۆچی بانگهێشتنی کردووم، دەمەویست لەوێ بڕۆم. بۆیە شێوەکەمم بە پەلە و بە ئەدەبەوە خوارد و پێشمگوت: «بەڕێز، مەسەلەکە زۆر سادەیە. سەرۆکی ئێوە ڕازی بووە ئەمن سەری کارخانەکە بدەم و

ئەمنیش سەرۆکوەزیری ئیسرائیلم لە بابەتەکە ئاگادار کردوە. بۆیە پێمخۆشە فەرمانی پریزیدێنت جێبەجێ بکرێ.»

چەند ساتێک تیمەوە ڕاما و گوتی: «ئەتۆ لەو کارخانەیە بەگومانی؟»

«ژەنراڵ، ئەگەر بکرێ پێمخۆشە سەردانی بکەم.»

«بەڵام، ئەگەر پێتوایە کارێکی ناڕەوا لەم کارخانەیە ئەنجام دەدرێ، ئێمە ئاگادار بکەوە و ئێمە چارەسەری دەکەین.»

بێگومان ئەمن نەمدەتوانی واز لە سەردانەکەی بێنم. ئەو بە نابەدڵی، ڕازی بوو کە سەعات ٧ی بەیانی ترومبێلێک بنێرێ کە من بەرێتە کارخانە.

کاتێک هاتمەوە هۆتێل دەگەڵ باڵیۆزی ئیسرائیل کە ئەمجارە دۆستانە قسەی لەگەڵ کردم، بە تەلەفون قسەم کرد. هۆی ئەوە کە دۆستانەی قسە دەگەڵ کردم، ئەوە بوو کە ئەو لەباری ئیدارییەوە ژێردەستی «ئەوی پزنەر» بوو و «ئەوی پزنەر» دەستووری پێ-دابوو، کە هاوکاریم بکا. بەهەرحاڵ، لە باڵیۆزی ئیسرائیلم پرسی، لەبارەی ژەنراڵ «رۆدریگێز»ەوە هەرچی دەزانی، پێمبڵێ.

«پاش سترۆسنێر ئەو بەهێزترین کەسی شارەکەیە. دیارە دەنگۆیە کە ئەو ئەندامی CIAیە. ئەو بەتەنیا خاوەنی مافی هێنانی سیگاری ئەمریکایی بۆ پاراگوایە و ئێمە نازانین بەو نرخە هەرزانە کە ئەو سیگاری پێدەداتە فرۆشیارەکان، چۆن دەتوانێ سوود لەوکارە ببینێ. ئەتۆ نازانی ئەو تاچڕادەیەک سیگار بەهەرزانی دەفرۆشێ.»

«داخوا لە وڵاتانی دیکە ... وەک شیلی، خەڵک دەزانن کە پێوەندیی بە CIAوە هەیە؟»

«بەڵێ سترۆسنێر دۆستی نیزیکی پینۆشێ و «رۆدریگێز» دۆستی نزیکی ستانگە.»

دوایە، ئەمن قسەم لەگەڵ «پزنەر» کرد. ئەو پێیگوتم، کاتێک بۆ سەردان چوویە کارخانە دەبێ بۆ هێندێ بۆشکە (بەرمیل)ی گەوەری

شلەمەنی بگەڕێی کە بۆنی سۆلفۆر، بۆنێکی وەک بۆنی هێلکەی گەنیوی لێدێ. چونکە بوونی ئەو جۆرە بۆشکانە نیشانەی ئەوەیە کە ئەو کارخانەیە کەرەسەی شیمیایی شەڕی لێ دروست دەکرێ. دیارە، لەوانەیە کەرەسەی شیمیایی دیکەشی لێ‌هەبن، بەڵام ئەمە ئاسانترین ڕێگایە بۆ ئەوەی دڵنیا بی کە لەوێ کەرەسەی شیمیایی شەڕ بەرهەم دێ.

بەیانیی ئەو ڕۆژە منیان بە ترومبێلێکی سەوزی سەربازی بردە فڕۆکەخانەیەک، کە دەوری ۱۵ دەقیقە لە هۆتێلەکەم دوور بوو. ئەفسەرێک بە یۆنیفۆرمی سەربازییەوە لەوێ بوو، خۆی بە ناوی «خۆزە ڕۆدریگێز» ناساند کە هیچ خزمایەتییەکی دەگەڵ ژەنراڵ «ڕۆدریگێز» نەبوو. ئەو بوو بە فڕۆکەوانی هێلی کۆپتێرێکی Bellی دوو نەفەری و منی لەگەڵ خۆی هەڵگرت.

ئەمن بۆ ئەندامەکانی تیمە سەربازییەکە دەگەڕام کە قەرار بوو بۆ سەردانی کارخانەکە دەگەڵم بن، بەڵام ئەو گوتی: «کەسی دیکەمان دەگەڵ نابێ. ئەمن دەتبەمە کارخانە و ئەتۆ هەرکوێیەکت بوێ دەتوانی بچی.» وا دەهاتە بەر چاو کە ئەو پێی سپێردراوە بە فڕینێکی خۆشی میوانداریم بکا.

پاراگوا وڵاتێکە کە ڕێگای بۆ دەریا نیە و بێجگە لە شارێیەکی دەوری شاری «ئاسانسیۆن» شارێیەکی دیکەی نیە. دەرچوون لەو وڵاتە کە سەردەمێک پێتەختی بەشی باشووری ئەمریکای باشوور ئیستیعماری بوو، بێ هێلیکۆپتێر یان فڕۆکە کارێکی ئاسان نیە. زەوییەکانی دەرەوەی شاری «ئاسانسیۆن» کراونە مەزرای دەوڵەمەندانی ئیسپانیایی و ئەڵمانی کە خەڵکە خۆوڵاتییەکە لەواندا خزمەتی ئەو ئاغایانە دەکەن.

بەو دەشتانە و بەو گیا سەوز و لەشۆق و پرپشتانەوە، پاراگوا شوێنێکی یەکجار لەبار بۆ شاردنەوە و وەکارخستنی کارخانەیەکی نهێنی وەک کارخانەی بەرهەمهێنانی کەرەسەی شیمیایی شەڕە کە

هی «کاردۆئین»ە. هەر خوا دەزانێ لە مەزرا و زەوییە پانوبەرین و بەدناوەکانی ئەو وڵاتەدا چ‌دەگوزەرێ. ئەم وڵاتە بەهەشتی بازاڕی ڕەشە کە هەموو شتێکی لێ دەست دەکەوێ. سیگاری مارلبۆرۆی ئەمریکایی لە پاڕاگوا بە هەرزانتر لە قیمەتی دروستکردنی دەفرۆشرێ. ترومبێلی مارسدسی ١٠٠ لەسەد نوێ کە ڕەنگە لە بریزیل دزرابن و هێنرابنە ئەم وڵاتە، بە مۆڵەتنامەی ڕەسمی و ژمارەگەلێک کە حکوومەتی پاڕاگوا بۆیان دەردەکا، تەنیا بە ١٠ هەزار دۆلار دەفرۆشرێن. زۆر لەو شتوومەکانەی لە «ئاسانسیۆن» دەست دەکەون، یان دزراون یان لە ڕێگای ساختەوە لە وڵاتانی دیکەی دنیاوە هاتوونە ئەم وڵاتە. یەکێک لە گەورەترین سەوداگەرانی هیندی کە لە بازاڕە ماڵییەکاندا پێیان‌دەگوت «سوامی خەڵکی مەدرەس» و لە موعامەلەی ناقانوونی لە قالبی ڕەوا (مشروع)دا پسپۆڕ بوو، لە «ئاسانسیۆن» نوێنەری هەبوو. تەنانەت ئامراز و کەرەسەی شەڕ کە لە ئەمریکای باشوورەوە دێ، لە ڕێگای پاڕاگواوە تێدەپەڕێ و بەو شێوەیە عەمەلیاتەکە سەرپۆشی بۆ دروست دەبێ.

کە هێلیکۆپتێرەکە لە زەوی هەستا، ئەمن چاوم لە جەمسەر-نوێنەکەی خۆم کرد بۆ ئەوەی دڵنیا بم هێلیکۆپتێرەکە بەرەو ئەو لایە دەچێ کە کارخانەکەی لێیە. ئەمن چاوەڕێ بووم هێلیکۆپتێرەکە بەسەر دەشتی وشکارۆدا بفڕێ، بەڵام چەندین مایل بەسەر لێڕەوارێکی سەوزدا هەڵفڕیین. سەفەرەکەمان دەوری نیوسەعات بەسەر مافوورەیەکی سەوزدا درێژەی کێشا و لەنەکاو، دیتم هێلی-کۆپتێر لە فەزا سەوزەکە دەچێتە دەر. ناوەندی کارخانەکە کە ٤ ڕیز خانووی پان و تەختی وەک سەربازخانە بوو، لە دووڕرا دەرکەوت.

کارخانەکە هەروا بورجێکی ئاو و دەزگایەکی موخابەرات (تەلگرافخانە)ی هەبوو. لە نزیک کارخانەکە فرۆکەخانەیەکی چووکەڵەش هەبوو کە دەتگوت هالیوودێکە بۆ فیلمە جیمزباندییەکان دروستیان کردوە.

کە هێلیکۆپتێرەکە دەنیشتەوە، پرسیارم کرد: « چەند کەس لەم کارخانەیە کار دەکەن؟»

سەرهەنگ «رۆدریگێز» وەڵامی دایەوە، ٥٠ یان ٦٠ کەس کە پتریان ئەندازیارن. ئەو لێی زیاد کرد کە سەرۆکی کارخانە هەموو رۆژێ لە «ئاسانسیۆن»ەوە بە هێلیکۆپتێر دێتە کارخانە، بەڵام ئەندازیارەکانی کارخانە لە کێڵگەکانی دەوروبەرەوە بە ئوتوبووس دێنە وێ. هێلیکۆپتێر لە پەنا خانوویەکی چکۆڵە نیشت و لەوێرا یەکێک لە کرێکارەکان بە ترومبێل ئێمەی بردە یەکەمین خانووبەرەی ئەسڵی.

پیاوێک کە لە ٥٠ ساڵەی تەمەنیدا بوو، بە جلوبەرگ و کراواتەوە سڵاوی لێکردم. ئەو ریشێکی بزنیی قاوەیی هەبوو و بە زمانی ئینگلیزی، بەڵام بە راوێژی ئەڵمانی قسەی دەکرد. ئەو خۆی بە «هانس مایەرز» Hans Mayers ناساند. ئەمن هەرگیز ئەوم لەبیر ناچێ.

ئەو گوتی: «بەخێر بێی بەرێز بن مۆناشێ، ئێمە چاوەڕوانت بووین. زۆر خۆشحاڵم کە هاتوویە سەردانی پرۆژەی کشتوکاڵیی ئێمە. ئێمە کارخانەیەکی زۆر باشی جانەوەرکوژمان لێرە هەیە. حەزت لە قاوە هەیە؟»

ئەمن لە خواردنەوەی قاوە داوای لێبووردنم کرد و سەردانەکەمان دەست پێکرا.

ئەو بردمیە یەکەمین خانووبەرە کە کرێکارەکان لەوێ بە جلکی خاکی و دەمامکێکی سپییەوە کە ئەملاولای دەموچاویانی گرتبوو، کاریان دەکرد. ئەوێ وەک عەمبارێکی گەورە دەچوو کە لەو سەرێی چەند بۆشکەی گەورە هەبوون. بۆم ڕوون کرایەوە کە لێرە شلەمەنیی کوشتنی جرۆجانەوەر لە هەوا دروست دەکرێ. دەگەڵ گوێگرتن لە قسەکانی، بۆنێکی وەک بۆنی هێلکەی گەنیو بەری لووتی گرتم. جۆرێکی دیکە بڵێین، ئەمانە بۆشکە شلەمەنییەکان بوون و ئەمەش

ڕاست ئەو بۆنە بوو کە «ئەوی پزنەر» بە منی گوتبوو، بەدوایاندا بگەڕێم.

«مایەرز» پرسی: «حەز دەکەی دەمامک لێدەی؟»

ئەمن تێیەوە ڕامام و گوتم: «بەڵێ، بێگومان بۆ سەردانێکی وا بەکارهێنانی دەمامک حەتمییە.»

«ئێوە چلەو کەرەسانە دەکەن- ئەوان بە خەڵکیش هەڵدەپرژێنن؟»

ئەو بە زمانلووسی وەلامی دایەوە: «دیارە وەختێک بە کێڵگە کشتوکاڵییەکانیاندا دەکەین، خەڵک نابێ لە کێڵگەکاندا بمێنن.»

پرسیم: «ئەم کەرەسانە دەنێردرێنە کوێ.» وەلامی دایەوە، دەنێردرێنە شیلی، و لێشی زیاد کرد کە خاوەنەکەی «کارلۆس کاردۆئێن» دەگەڵ ولاتی عێراق هێندێ پرۆژەی کشتوکاڵی هەن و هێندێک لەو جانەوەرکوژانە کە لە کارخانەکە بەرهەم دێن بە فڕۆکەی بارهەڵگری عێراقی ٧٤٧ لە «سانتیاگۆ»وە بار دەکرێن بۆ عێراق.

هەروا کە بە دەوری بۆشکە شلەمەنییەکاندا دەگەڕاین، «مایەرز» گوتی: «ئێمە هەوڵ دەدەین کۆمەگ بە خۆرهەلاتی نێوەڕاست بکەین، بەڕێز بن مۆناشێ. خەڵکی عێراق پێویستییان بە خۆراک هەیە و کۆمپانییەکەی ئێمە لە شیلی کۆمەگ بە پرۆژە کشتوکاڵییەکانیان دەکا.»

لێمپرسی: «بەڕێز «باربووتی»یش لەم بەرنامەیەدا بەشدارە؟» مەبەستم لەو پرسیارە ئاماژە بە کەسانێک بوو کە لە ئەیالەتی فلۆریدا پێوەندییان بە «کاردۆئێن»ەوە هەبوو.

ئەو بە سەرسوڕمانەوە چاوی لێکردم و گوتی: «دەیناسی؟»

گوتم: «بەڵێ دەیناسم.»

«بەڵێ، ئەو لێرە چالاکیی هاوبەشی هەیە. ئێمە هێندێ لەو کەرەسانەی پێویستمانن لە ئەیالەتەکانی فلۆریدا وتەکزاس دابین دەکەین.»

ڕێنوێنەکەم پێشنیاری کرد کە باشترە نەچینە بەشەکانی دیکە، چونکە ئەوان بۆنی زۆر ناخۆشیان لێدێ.

ئەمن تەنیا ١٥ دەقیقە لەوێ مامەوە. ئەوەی دیتبووم و بیستبووم بەسم بوو.

لە کاتی گەڕانەوە بۆ «ئاسانسیۆن»دا لە سەرهەنگم پرسی، بۆچوونی لەبارەی ئەو خانووەوە چی بوو. وەڵامی دایەوە: «ئەمن شتێکم نیە بیڵێم. تەنیا ئەرکی من ئەوە بوو کە تۆ بەرمە وێندەرێ.»

لێمپرسی، داخوا بەرهەمی ئەو کارخانەیە تەنیا کەرەسەی جانەوەرکوژە؟

«ئەمن ئەوەندە دەزانم، کە دەیبیسم.»

«کەوایە ئەتۆ ئاوا بوویە سەرهەنگ.»

ئەو ئەمەی پێخۆش نەبوو و پاشماوەی سەفەرەکە بە بێدەنگی تێپەڕی. دەوری سەعات ١٠ی پێش نیوەڕۆ گەیشتمەوە هۆتێل.

تەلەفونم بۆ «پزنەر» کرد و ئەوەی دیتبووم بۆم باس کرد. گوتی: «ئەوێ دەبێ دابخرێ.»

داوام لە «پزنەر» کرد، ئەگەر دەکرێ با سەرۆکوەزیر «شامیر» تەلەفونێک بۆ پریزیدێنت «ستڕۆسنێر» بکا و قسە بکەن. ئەمن پێم-وایە ئەگەر شامیر قسە لەگەڵ سەرکۆماری پاراگوا بکا، ئەو هان دەدرێ هێندێ کار بکا. هەروەها داوام لە «پزنەر» کرد بە «شامیر» بڵێ کە ئەمن ئەمشەو «ستڕۆسنێر» دەبینم. جا ئەگەر بتوانی کارێک بکەی کە «شامیر» پێش دیداری من دەگەڵ «ستڕۆسنێر»، قسەی دەگەڵ بکا، زۆر باشتر دەبێ.»

شێو لە بەشی تایبەتیی «ستڕۆسنێر» لە کۆشک ڕێکخرابوو. ئەو گوتی: «ئێمە خواردنێکی گیاییمان بۆ ساز کردووی. دوایە ئاگاداری کردم کە نیوەڕۆی ئەو ڕۆژە بە تەلەفون قسەی لەگەڵ سەرۆکوەزیر «شامیر» کردوە.»- سەعاتێک دوای تەلەفونی من بۆ «پزنەر.»

«هەرچەنــد بــە منیــان گوتــوە کــە لــەم کارخانەیــەدا کەرەســەی جانەوەرکوژ بەرهەم دێ، بەڵام ئەمن و سەرۆکوەزیر ڕێککەوتووین کــە ئــەو کارخانەیــە دەبــێ دابخــرێ. ئــەمن بــاش دەزانــم کــە لــە کارخانەیــەکی وادا دەکــرێ کەرەســەی شــیمیایی شــەڕیش دروســت بکرێ. ئـەمن دەسـتووری پێویسـت دەدەم کە ئـەو کارخانەیـە کۆتـایی فێوریـەی ۱۹۸۹ دابخـرێ. ئێمـە هـەروەها ڕێـککـەوتین کـە ئیسـڕائیل یەکەیـەکی دژی تێرۆریسـتی بۆ گـاردی سـەرکۆماری ڕابهێنـێ و ئێمـە لەسەر ئیعتیبارێکی ۳۰ میلیۆن دۆلارییش ڕێککەوتووین.»

تێگەیشــتم کــە پــێش تەلــەفونی ســەرۆکوەزیــر «شــامیر» بــۆ «ئاسانسیۆن»، «پزنەر» ئەوی بە تەواوی لە مەسەلەکە حاڵی کردوە.

پریزیـدێنت گـوتی: «ئـەمن دەگـەڵ ژەنـڕاڵ ڕۆدریگێـز ڕێککـەوتنێک دەکەم کە لەباری ماڵییەوە بۆی قەرەبوو دەکەمەوە.

ئــەم بابەتــە تووشــی سەرســوڕمانی کــردم. «مەبەســتتان چیــە، جەناب؟»

ئەو گوتی: «نیگەران مەبە. ئەم کارخانەیە بابەتێکی نێوخۆییە و بە خێرایی جێبەجێ دەکرێ. ئەگەر لەم کارخانەیەدا گاز بەرهـەم بهێنرێ، دەستی بەرهەمهێنەکە دەبڕرێ.»

دوای شــێوخواردن، ئــەمن سوپاســی «ستڕۆســنێر»م کــرد بــۆ هاوکارییەکەی. دەگەڵ ئەوەی پیاوەکە پێشینەیەکی نازیگـەریی هـەبوو و بـارودۆخی پـاڕاگواش داخهێنـەر بـوو، بـەڵام بەرامبـەری هەسـتم بـە نیزیکــی کــرد. لــەوەی گــوتی گومــانم نــەما کــە لــە نێــوان ئــەو و «ڕۆدریگێز»دا شەڕێکی دەسەڵات هەبوو و بوونی من لـەوێ کێشـەی نێوان ئەو دوو پیاوە بەهێزەی توندتر کرد.

وەختێـک گەڕامـەوە هۆتێـل، تەلـەفونم بـۆ مـاڵی «پزنـەر»کـرد. لـە ئیسـڕائیل سـەعات ۳ی بـەیانی بـوو. پێمگـوت، دەبـێ ئـەوان کەسـێک بنێرنە پاڕاگوا کە ئاگای لـە جێبـەجێکردنی بەڵێنەکەی پریزیـدێنت بـێ. لەو کاتەدا، ئەمن دەبوو بچمەوە شیلی. چونکە، ئەو دوو حـەوتووە کە

مۆڵەتم دابوو بە «کاردۆئێن» تا بیر لە بڕیاری داهاتووی دەربارەی هاوکاری دەگەڵ سەددام حوسێن بکاتەوە، تەواو ببوو.

لە کاتی قسەکردن دەگەڵ «پزنەر»دا پێمگوت ئەوەی ئەمڕۆ پێت دەڵێم لەبیرت نەچێ. لە پاڕاگوا لە نێوان «سترۆسنێر» و «رۆدریگێز»دا شەڕی دەسەڵات لە ئارادایە و ئاکامی ئەو شەڕە هەردەم لەوانەیە بتەقێتەوە.

«پزنەر» پێی‌گوتم، سەرۆکی «مۆساد» لە بۆینۆس ئایرێس کە سکرتێری دووەمی باڵیۆزخانەی ئیسرائیل لە ئارژەنتینە، دێتە وێ. گوتم، ئەمن چاوەڕێی هاتنی دەبم و دوای ئەوەی ئەوم لە مەسەلەکە ئاگادار کرد، ئێرە بەجێ دێڵم. ئەمن ئەو پیاوەم کە پایەبەرزترین ئەفسەری هەواڵگریی ئیسرائیل لە ئەمریکای باشوور بوو، لەکۆنەوە دەناسی. لە هەموو ئەو ساڵانەدا کە ئەمن کارم بۆ کۆمیتەی هاوبەش دەکرد، ئەو کۆنترۆڵچیی «مۆساد» بوو و چاوەدێریی بەسەر هەموو خەرجییەکانی ئێمەدا دەکرد. ساڵی ١٩٨٨ کە کۆمیتە لەنێو چوو، ئەو نێردرایە ئەمریکای باشوور.

لە یەکەمین سەعاتەکانی ڕۆژی دواتردا، ئەو تەلەفونی بۆ کردم و گوتی، دەوروبەری نیوەڕۆیە یەکتر دەبینین. پاشان دوانیوەڕۆیە، ئێمە بۆ گەڕان چووینە نێو شار و ئەمن هەرچی لەوێ دیتبووم و بیستبووم، بۆم شی کردەوە.

ئەو گوتی: «رۆدریگێز» مووچەخۆری CIA و دۆستی نزیکی جێگری عەمەلیاتیی CIA (کلێر جۆرج)ە. ئێمە پێمان وایە رۆدریگێز بەرتیل لە کاردۆئێن وەردەگرێ و دۆستی نیزیکی ژەنراڵ ستانگە. رۆدریگێز و ستانگ هەردووکیان لە ئارەزووی گەیشتن بە سەرکۆماریدان.»

«بەڵێ، ئەمنیش هەر پێموایە.»

ئەمن چەندین شتی دیکەم لەبارەی بارودۆخی پاڕاگواوە بۆ دەرکەوتبوو کە ئەو هەموویانی پشتڕاست کردەوە: «لە نێوان

سترۆسنێر و رۆدریگێزدا شەڕی دەسەڵات لە ئارادایە. ئەمن دەمەوێ پێوەندی دەگەڵ کەسانێک بگرم کە لە سترۆسنێر نیزیکترن تا رۆدریگێز. دەبێ بە زوویی چاوەڕوانی هێندێ پێشهات لەم ولاتە بین. بەڵام لەبیرت بێ کە CIA لایەنگری لە رۆدریگێز دەکا. هۆیەکەشی ئەوەیە کە کوڕی سترۆسنێر گیرۆدەی ماددە هۆشبەرەکان بووە و جگە لەوەش ئەو دژی ئەمریکایە و دەیەوێ رێگایەکی سەربەخۆ بۆ پاراگوا هەڵبژێرێ.»

ئێمە زەردەخەنەیەکمان پێک گۆڕیەوە. خۆمان لە شەڕێکی سەخت دەگەڵ کارخانەی «کاردۆئێن» دا دەدی.

ئەو لێی زیاد کرد: «جگە لەوانە، رۆدریگێز ئاشنایەتیی دەگەڵ ئارل بریان سەرۆکی یەکیەتیی نێونەتەوەیی چاپەمەنی UPAش هەیە کە دیارە سەربە CIAشە.»

ئەمن پێمگوت کە سبەینێ دەبێ بچمە «سانتیاگۆ». بەڵام، ئەو حەزی دەکرد کارێک بکەم کە دەگەڵ دەفتەری سەرکۆمار ئاشنا ببێ و پێوەندییان دەگەڵ بگرێ. ئەمن تەلەفونم بۆ پریزیدێنت «سترۆسنێر» کرد و چاوپێکەوتنێکم بۆ رۆژی دواتر رێکخست.

پاش ئەنجامدانی ئەو کارانە لە «پاراگوا»، رۆژی ۱۸ی سێپتامبری ۱۹۸۸، چوومە شیلی. بە پێچەوانەی بەڵێنەکانی پریزیدێنت «سترۆسنێر» هەستم کرد نابێ چاوەڕوانی ئاڵوگۆڕێک بم. وام دەهاتە بەرچاو کە بەڵێنەکانی پریزیدێنت بە توندی لە حەوادا هەڵاوەسراون.

دوای گەیشتن بە «سانتیاگۆ» راستەڕێ چوومە ئاپارتمانەکەی «باربارا»، ئەو بە کامپیۆتەرەکەی خەریکی ئامادەکردنی داستانێک لەبارەی شیلییەوە بۆ Financial Times بوو. پێم نەگوت ئەمن چووبوومە پاراگوا. دەمەویست وا بیر بکاتەوە چوومە ئیسرائیل. بەڵام، ئەو دەیەویست بزانێ، بۆچی تەلەفونم بۆ نەکردوە. پێمگوت، هەموو سەفەرەکەم ١٠ رۆژی کێشا-دوو رۆژ لە ئیسرائیل، دوو رۆژ

لـه ئورووپـا دەگـەڵ «جیـرار بـوول»و دەوری سـێ ڕۆژ لـە پـاڕاگوا. ئەوی دیکەشی لە فڕۆکەدا بووم.

وەڵامـی پرسـیاری «باربـارا»م نەدایـەوە، بـەڵکوو لـێم‌پرسـی، داخـوا حەز دەکا بۆ پشووی کۆتایی حـەوتوو دەگـەڵم بێتـە «پوورتونانت».

«پوورتونانـت» شـارێکی سـەرسـوڕهێن بـوو کـە ماڵـەکانی لـە تەختـە دروست کرابوون و لە Lake District لە ٧٠٠ کیلۆمیتریی باشوور بـوو. ئەوێ ١٠ سـەعاتەڕێ بـە ترومبێل بـوو و ئـەمن پێشـنیارم پێ‌کرد کـە نیوەشــەوێ وەڕێ‌کــەوین. ئـەو گـوتی، ئەگـەر وا بکـەین، لـە ڕێگـادا دیمەنگـەلێکی زۆر نـابینین. بۆیـە بڕیارمـان دا دەوری ٢ تـا ٤ی بـەیانی وەڕێ‌کەوین. کەچی، هەموو بەرنامەکانمان بوونە بڵقی سەر ئاو.

دەوری سـەعـات ١٠ی ئـەو شـەوە «کـارلۆس کـاردۆئێن» تەلـەفونی بۆمن کرد و گوتی: «زۆر خۆشحاڵم کە هاتوویەوە شار. بـەڵام بۆچی تـەلـەفونت بـۆ نـەکردم؟ بەهـەرحاڵ، پێت‌خۆشـە بانگهێشـتنت بکـەم بـۆ ئەوەی بچینە «پوورتونانت؟»»

لە دڵـی خۆمدا گوتم، ڕووداوێکـی سـەیرە! ئـەو کابرایـە دەبـێ فکـری منی خوێندبێتەوە. یان ... لەوانەیە ئەو کاتەی دەگـەڵ «باربـارا» باسـی سەفەرەکەمان کردوە، پێشـخزمەتەکەی کـە لـە دەوروبـەرمان خـەریکی کار بوو، باسـی بڕیارەکـەی ئێمـەی گەیاندبێتـەوە «کـاردۆئێن». ئەگـەر وا نەبووبێ، دەبێ کەسێکی دیکە گوێی لە قسەکانمان گرتبێ.

بە هەرحاڵ، پێم‌گوت: «فکری چاکە. ئەمن ئـەم بەرنامەیـەم زۆر پێ-خۆشـە. لـەم سـەفەرەدا ئـەو پووڵـە خـەرج دەکرێ کـە ئـەتۆ لـە خـوێن کۆت کردۆتەوە.»

گـوتی: «ئـاری، وا قسـە مەکـە. ئـەمن سـەعات ٦ی بـەیانی دێـم دەتبەم.»

ئـەمن بەڕاسـتی دەمەویسـت لەبـەر ئـەو کەسـانە هـەڵێم، کـەچی قورسایی وانم لەسەر شانەکانم هەست پێ‌دەکرد.

ئەمن بابەتی وتوویژی تەلەفونی دەگەڵ «کاردۆئێن»م بۆ «باربارا» شی کردەوە، ئەو بە توورەیی و ڕەنجانەوە گوتی: «ئەم ئاپارتمانە نەحلەتییە، وەک ئانتێن (ئاریەل)ی رادیۆ وایە.»

«کاردۆئێن» سەری سەعات بە مارسدسێکی 220Eی زریشکی هات بەدوامدا. ئەو جین و کراسێکی سپیی دەبەردا بوو. لە شار دەرکەوتین، نانی بەیانیمان لە ڕێگادا خوارد و دوایە، بە نۆرە لێمان-خوڕی.

بەشی باشووریی شیلی بە ڕاستی جوانە. کاتێک پیاو لە «سانتیاگۆ» دەچێتە دەر، دیمەنگەلێکی وەک تەپۆڵکەی زۆر سەوز و سەرسوڕهێنی دێنە بەرچاو کە زۆر لە سویس جوانترن. خەڵکی وێ کە کورتەباڵا و چوارگۆشە دیار بوون، جووتیارانی خەڵکی ڕۆمانییان وەبیر من هێنایەوە. ئەوە تاقە شارێکای ئەو ناوچەیە بوو. تەنیا دوو هێڵی تێپەڕینی هەبوون کە لە باکوورەوە دەچوونە باشوور و لەبەر چاڵ و چووڵە کونکون بوون. لەکاتێکدا لەپشت لۆرییەک گیرمان کردبوو کە دووکەڵی لێ‌هەڵدەستا، لە دڵی خۆمدا گوتم، ئەگەر پریزیدێنت پینۆشێ زگی بەم وڵاتە و ژێرخانەکەی سووتابایە، هەرنەبێ جادەیەکی ٦ یان ٨ سایدیی لەم ناوچەیە دروست دەکرد.

«کاردۆئێن» پێی‌گوتم کە ژیان لە شیلی زۆر ئاسوودەیە و پینۆشێ، سەرکۆمارێکی زۆر گەورەیە. وەبیرم هێنایەوە کە چەند ڕۆژ لەوە پێش لە ماڵی ژەنڕاڵ «ستانگ» بە بۆچوونێکی ڕەخنەگرانەوە ئەوی بە «پیرەپیاوەکە» ناو بردبوو.

«دیارە هێندێ گیروگرفت لەم وڵاتە هەن، بەڵام لەسەر یەک وەزع باش و جێی ڕەزامەندییە.» پاشان پرسی: «مووچەی تۆ چەندە؟ حکوومەتی ئیسرائیل چەندت پووڵ دەداتێ؟ ئەتۆ هەموو تەمەنت تەرخان کردوە بۆ ئەوەی کاریان بۆ بکەی، چما ئەوان چەندت دەدەنێ؟»

ئـەمن لـە پەنجـەرەی ترومبێلەکـەوە چـاوم لـە خـانووە نزمـەکانی گونـدێک دەکـرد کـە بـە بەرامبەریـدا ڕەت دەبـووین. ئـەو باسـەی «کاردۆئێن» دەستی پێکردبوو، بۆ من خۆش و سەرگەرمکەر بوو.

ئەو درێژەی پێدا: «داخوا تا ئێستا بیرت لەوە کردۆتەوە دەست لە کارەکەت بکێشیەوە؟ ئەتۆ دەتوانی ببیە سەرۆکی بەشی فرۆشتنی من یان ئەگەر پێتخۆشە، حکوومەتی شیلی دەتکاتە ڕاوێژکاری ئەمنیەتی نیشتمانیی سەرکۆمار. بەهـەرحاڵ، هەرنـەبێ ئەو هـەتا مـانگی مارسـی ۱۹۹۰ لـە دەسـەڵاتدا دەمێنـێ. ئـەوان مووچەیـەکی زۆرزۆرت دەدەنـێ. ئەتۆ دەتوانی وەک بەرپرسی پێکهێنانی هاوسەنگیی دەسـەڵات کار بۆ پیشەسازیی کاردۆئێن بکەی، بەومانایە کە عەرەبەکان ئەوەندە بـەهێز بکـەی کـە هەڕەشـە لـە ئیسـرائیل بکـەن و حکوومـەتی خۆتـان ناچـار بکەی مل بۆ ئیمزای پەیمانی ئاشتی ڕابکێشێ.»

لە دڵی خۆمدا بیرم کردەوە کە ئەمە پێشنیارێکە ئاغاکانی لـە CIAدا خستوویانەتە دەمیەوە.

لەنێو ڕێگـادا ئەفسـەرانی پۆلیسـی شێوەسـەربازی، جارجـار چاویـان لـە بڕوانامـەی لێخـوڕین و کـارتی ناسـیاریمان دەکرد. مـومکین نـەبوو پتر لە نیوسـەعات بێئەوەی ئەفسـەرانی یۆنیفۆرمسـەوز ڕامـان بگـرن، لێبخوڕین.

«کاردۆئێن» بە ئاشـکرا پێشـنیاری پێکـردم ئەگـەر بمـەوێ لـە شـیلی کـار بکـەم پیشەسـازیی کـاردۆئێن مـاڵ و ترومبێـل و دەفتـەری کـار و مووچەیـەکی زۆرزۆرم بـداتێ. «ئاشکراشـە کـە ئێمـە دەسـبەجێ مـافی هاونیشتمانەتیی شیلی و پاسپۆرتی ئەم وڵاتەت دەدەینێ.»

وەختێـک گەیشـتینە Lake District ی جـوان، لـە جـادەی سـەرەکی چووینـە دەر و لـە لێوارەکـانی Lake Villarrica ترومبێلمـان ڕاگـرت. لەوبەری ئاوەکە، لە لووتکەی کێوێکی ئاگرپژێن کە بـەفر دایپۆشـیبوو، دووکەڵێکی سپی دەهاتە دەر.

«کاردۆئێن» گوتی: «دیارە، ئەمن زانیومە کە ئەتۆ ئەم دواییانە لە پاراگوا بووی و سەری کارخانەکەی منت داوە.»

گوتم: «دیارە، بەڵام ئەتۆ پێتوایە جوولەکەکان جرو‌جانەوەرن؟»

ئیزن بدە ئەمن وتوویژی فەرماندەی بەرەی باشووریی عێراق دەگەڵ یەکێک لە رۆژنامەنووسان بگێرمەوە کە پاش شەڕێک دەگەڵ ئێرانییەکان گوتی: «ئێمە ئەوانمان هەڵفڕاند.»

ئەم پیاوە شێوەیەکی تایبەتیی بیرکردنەوەی هەبوو. ئەو پێی وابوو هەر شتە نرخێکی هەیە و هەر ئینسانە نرخێکی هەیە. بەڵێ، ئەندامانی کۆمەڵ رەنگە نرخێکیان هەبێ. بەڵام هەمیشە نرخی وان پارە نیە. ئەمن تینووی پارە نەبووم. ئەمن هیچکاتێک ئینسانێکی ماددەپەرست نەبووم. پووڵ بۆ من ئامرازی گەیشتن بە ئامانجە، نەک ئامانج خۆی. بەڵام، ئەمن ئێستا داخوازێکی دیکەم هەبوو – داخوازەکەم ئەوە بوو کە بەڵێنم پێبدرێ موعامەلەی شیمیایی دەگەڵ عێراق رابگیرێ- و رەنگە تەنیا نرخێک کە دەبوو بیدەم، گیانم بووبێ.

لە حاڵێکدا دە پانایی ئاوی گۆل (دریاچە، بحیرە)کەوە رامابووم، گوتم: «بیری لێبکەوە کە ئەگەر ئێوە هەروا لێتان گەڕێن، لە ماوەی دە ساڵدا رێئاکتۆرێکی ئەتۆمی لەمبەر ئاوەکە و پێگەیەکی مووشەکی لەوبەر ئاوەکە دەبینرێ.»

سەعات ٧ی پاش نیوەڕۆ، ئێمە گەیشتینە «پوورتومانت». ئەگەر هاوڕێیەتیی ئەو نەبووایە شۆفیری بۆ ئەم جێیە کەموزۆر دڵگیر بوو. ئێمە چووینە باشترین هۆتێلی شار کە بەپێی ستانداردە نێونەتەوەییەکان هۆتێلێکی توورستی بوو. دیارە دەگەڵ ئەوەی ئێمە چووبووینە ئەو هۆتێلە هێشتا بۆ پاسێکی ژاپۆنییەکان کە بە دووربینەوە هاتنە ئەو هۆتێلە جێگای مابوو.

ئێوارەی ئەو رۆژە کاتێک لە رێستوورانێکی سادە، بەڵام خاوێن و باش نانمان دەخوارد، «کاردۆئێن» زۆری خواردەوە و سەرخۆش

بوو، ئیدی نەیدەتوانی بە شێوەی ئاسایی قسە بکا. بەڵام، ئەمن دڵنیا نەبووم کە ئەو بە ئەنقەست وا ناکا.

ئەو پرسی: «ئاری، دەگەڵ کچان چۆنی؟ ئەمن لە پوورتومانت چەند دۆستی ژنم هەن. ئەگەر پێتخۆشە، تەلەفونیان بۆ دەکەم و بەرنامەیەکی ڕابواردن دادەنێین.»

سوپاسی پێشنیارەکەیم کرد و گوتم، بۆ ئەو کارە زۆر ماندووم.

پێش ئەوەی بچێتەوە ژوورەکەی، گوتی: «ئاری، ئەتۆ دەبێ بزانی کە هیچکەس لە دنیا ناتوانێ من ڕابگرێ.»

بەیانیی ڕۆژی دواتر، کاتێک دیتمەوە، هیچ نیشانەیەکیم لە سە رخۆشیی شەوی پێشوو پێوە نەدی. ئێمە بەرەو بەندەر لێمانخوڕی و لەوێوە بەرەو دورگەی گەورەی Chiloe کە جێیەکی دڵخواز بۆ ڕابواردنی پشووی خەڵکی شیلییە، بەلەم (قایق)مان لێخوڕی. دوایە لە دەوروبەری شاری شێوەقەڵای دێرینی ANKUD کەوتینە پیاسەکردن و لە کافەیەکی چووکەڵە نانمان خوارد. بەڵام بچیە هەر خاڵێکی ئەو شارە ناتوانی لەبیری بکەی کە لە شیلیی. چونکە لە هەموو جێیەک پیاوانی پۆلیس و سوپا دەبینی.

«کاردۆئێن» گوتی: نیگەرانی وان مەبە. ئەوان هەر بەدوای تێرۆریستە کۆمۆنیستەکاندا دەگەڕێن.

لە یەکەم سەعاتەکانی پاش نیوەڕۆی ئەو ڕۆژەدا ئێمە بەرەو «سانتیاگۆ» گەڕاینەوە. لە ڕێگادا «کاردۆئێن» کارتەکانی خۆی ئاشکرا کردن. ئەو گوتی: «ئاری، ئەمن بێ پێچوپەنا قسەت لەگەڵ دەکەم. یان پێشنیارەکانم قبووڵ دەکەی یان ئێمە مشوورت دەخۆین. ئێمە دەگەڵ پیشەسازیی سەربازیی ئیسرائیلی فاشیست هیچ موعامەلەیەک ناکەین.

ئەمن تێنەگەیشتم ئایا ئەو هەڕەشە لەمن دەکا یان لە ئیسرائیل-هەرچۆنێک بێ قسەکانی ناشیرین بوون.

ئەو زیادی کرد: «ئەتۆ دەبێ لەبیرت بێ کە ئەمریکا پشتیوانی لە من دەکا، ئەتۆ ئەم بابەتە دەزانی. ئەتۆ لێرە «گەیتس»ت لەگەڵ من چاو پێکەوت. «گەیتس» پشتیوانیمان لێ دەکا. ئەتۆ لێرە جان تاوەریشت لەگەڵ من دیت...»

«تاوەر لەبەر ئێمە لەوێ بوو، نەک ئەمریکاییەکان.»

«مەبەستت چیە؟»

«سەرۆکوەزیر «شامیر» بۆخۆی دەستی لەکاری خاوەنکارەکەی، رابێرت ماکسوێلی بڵاوکەرەوە وەردا و پێی‌گوت، ئەگەر تاوەر ساڵی ١٩٨٦ نەچێتە شیلی، خەراپی لەسەر دەوەستێ.»

«دەتەوێ پێم‌بڵێی کە ماکسوێڵ بۆ ئێوە کار دەکا؟»

«ئەتۆ پیاوێکی بەهۆشی، بۆخۆت لێکی بدەوە.»

ئەمن ئەو بابەتەم بۆیە هێنایە گۆڕێ تا ئەو هەست بکا تەنافی لە مل کراوە. بەڵام، هەر لەوکاتەدا وریا بووم، زۆریش نەچمە پێش. ئەمن دەبوو، پێوەندیی ئیسرائیل دەگەڵ ئەمریکا، دەگەڵ شیلی و دەگەڵ ئەفریقای باشووریشم لەبەر چاو بێ.

بەرەبەرە تاریک دادەهات. شوقی چرای ئەو لۆرییانە کە لە بەرامبەرمانەوە دەهاتن، لە ڕوخسارماندا ڕەنگی دەدایەوە. ئەمن بە ڕوونی تووڕەیی و ڕەنجانم لە ڕوخساریدا دەدی.

ئەو گوتی: «ئەتۆ نازانی، دەگەڵ کێ تێکەوتووی. ئێمە عەمەلیاتێکی گەورە بەڕێوە دەبەین و هیچ شتێک، بەتایبەتی ئێوەمانان ناتوانێ بمان‌وەستێنێ. ئێمە هەموو تەکنۆلۆژیی خۆمان ڕاستەوخۆ لە CIA وەردەگرین و ئامراز و دەزگاکانیشمان ڕاستەوخۆ لە ئەمریکاوە دێن. ئەوان بەهۆی faucettەوە بە فڕۆکە لە مەیامییەوە دەچنە پێڕوو و لەوێوە دێنە «سانتیاگۆ». ئێمە لەو بارەیەوە پەیمانمان دەگەڵ حکوومەتی ئەمریکا هەیە. ئیحسان باربووتییش ئەڵقەی پێوەندیی ئێمەیە. ئیدی دەتەوێ چ‌ژەهرەمارێک بزانی؟ هەرچی دەتەوێ، بزانی، ئەمن پێت دەڵێم. ئالان باند Alan Bond کە کومپانیی تەلەفونی لێرە

هەیە، لە ئوستڕالیا و کەسانێکیش لە بریتانیا سەرمایەمان بۆ دادەنێن. ئەگەر ئێوەمانان وازمان لێنەهێنن، مشوورتان دەخۆین. حکوومەتەکانی ئەمریکا و شیلی پشتیوانی لە من دەکەن. وازم لێ بێنە و لاچوو لەبەر چاوم.»

ڕقی کەڵەکەبووی «کاردۆئێن» خەریکی هەڵچوون بوو و شۆفیرییەکەی نائاسایی بوو. ئەمن وەڵامێکم نەدایەوە.

ئەو درێژەی دایە: «ئەتۆ ڕیچارد بابایان دەناسی، ئەو دۆستی تۆیە. ئەتۆ ڕیچارد شکووردیش دەناسی. ئێوە کاتێک بۆمبی هێشوویتان دەفرۆشت، هەموو ئەمانەتان دیوە -پێت وایە، ئەوانە چۆن و لەکوێوە پشتیوانییان لێدەکرێ؟ بۆچی وازمان لێناهێنی. ئەگەر گلەیی و شکایەتێکت هەیە، باشترە بچی دۆستە ئەمریکاییەکانت ببینی. باشترە تاچەری سەرۆکوەزیر ببینی.»

«تاچەر؟»

«بەڵێ، دۆستی خۆم. ئەمن ئەو کارە ڕێکدەخەم. ئەم حەوتووە دەتوانم تۆ بە کوڕەکەی بناسێنم. ڕەنگە ئەم بابەتە بە تۆی بسەلمێنێ کە چکەسانێک پشتیوانی لەمن دەکەن و بۆچی ئیسرائیل دەبێ دەست بۆ ئەم کارانە درێژ نەکا.»

ئەو پێشتر وەختی نەدابوومێ، لێی بپرسم: «چبڕە پارەیەک دەدەیە سترۆسنێر؟»

دیار بوو زۆر لەوە قەڵسە کە ڕێگە بەمن درابوو سەرلە کارخانەکەی پاراگوای بدەم.

«جەنابی بن مۆناشێ، ئێوەی جوولەکە هیچوەخت تێناگەن، کە ئەم دنیایە چۆن دەسووڕێ. لەوەش زیاتر، ئێوە پێتان وایە لە دنیادا هەر ئێوە هەقتان هەیە موعامەلەی کەرەسەی شەڕ بکەن. بەڵام، ئەوە ئێوەن کە منداڵانی فەلەستینییەکان دەکوژن.»

لەنەکاو ئەو ببوو بە لایەنگرێکی گەورەی فەلەستینییەکان. خوێنی هاتبووە کوڵ و ببووە مرۆڤێک کە کۆنترۆڵ نەدەکرا. ئەو بۆ ئەوەی

پـێش لۆرییـەک کـەوێ کـە ئـەویش دەیویسـت وەپـێش لۆرییـەکی پردووکەڵی دیکە بکەوێ، پێی لەسەر گاز داگرت و زراوی منی برد. ئەو بۆخۆی نەیتوانی بزانێ چکارێکی پرمەترسیی کردوە.

«ئـەمن کۆمپانییـەکی خـۆم هەیـە و هـیچکـەس بـە تایبـەتی ئیسـڕائیلییەکان نـاتوانن دەسـت لـە کارخانـەکانی مـن لـە پـاڕاگوا و جێیەکانی دیکە بدەن. ئەمن لەو بابەتە دڵنیام و دۆستانی منیش ڕێگا نادەن، شتی وا ڕوو بدا.»

ئـەو ئامـادە نـەبوو دابنـوێنێ. «ئێـوە ئیسـڕائیلییە دوابڕاوەکـان، تـەکنۆلۆژیی ناوکیتـان بـردە ئـەفریقای باشـوور و ئێسـتا ئـەو تەکنۆلۆژییـە لـەم وڵاتـەوە براوەتـە عێراق. بـۆچی لـە جیراڵد بـوولی دۆستم ناپرسی. چەند ڕۆژ لەمەوبەر ئەو قسەی دەگەڵ کردم. گوتی کـە چـاوی بـە تـۆ کـەوتوە. ئێوە لـە هـەموو جێیـەک خـەڵک ئەزیـەت دەکەن. بەڵام، باشترە لەبیرتان بێ کە لەم دنیایەدا هێزی بەتواناتر لە ئیسرائیلیش هەن.»

دەمزانـی قسـەی دواتـری چدەبـێ. «سـۆڤیەتەکانیش کۆمـەگی عێراقییەکان دەکەن.»

گوتم: «دیارە، بەڵام سۆڤیەتەکان کەرەسەی شیمیایی شەڕ و چەکی ئەتۆمی نادەنە عێراقییەکان.»

پاشـماوەی ڕێگاکـەمان بـە بێـدەنگی گوزەرانـد. کاتێـک گەیشـتینە دەوروبەری «سانتیاگۆ» کە بە شۆقە کزەکانی ڕووناک کرابۆوە، و لـە شـەقامە چۆڵەکانـدا بـەرەو ئاپارتمـان وەڕێ کـەوتین، گـوتم: «تکـا دەکەم هەروەخت ئامادەی من بە دۆستەکەت بەڕێز تاچەر بناسێنی، تەلەفونم بۆ بکە.» لە حاڵێکدا پێم لە ترومبێلەکە دەبردە دەر لێم زیاد کرد: «پێم وایە دوو حەوتووم وەخت دابوو بە تۆ کە لەبارەی بڕیاری خۆت و درێژەی هاوکاری دەگەڵ عێراق یان پچڕاندنی، بیر بکەیەوە. ئێستا کاتی ئەو مۆڵەتە کۆتایی هاتوە.»

ئەو بە نەڕاندنەوە لە تاریکایی شەودا ون بوو.

کاتێک گەیشتمە ئاپارتمانەکە، «باربارا» هیچ حەوسەلەی نەبوو. چونکە لە پشووی کۆتایی حەوتوودا بەتەنیا مابۆوە. دەردی دڵی کرد کە ئەمن دوو حەوتوو لەوێ نەبووم و ئێستاش دووبارە بەتەنیا جێم هێشتبوو و ڕۆیبووم.

ئەو بە هاتوهاوار گوتی: «لێرە هەموو ژیانی من لەژێر جاسووسیدایە. لەپەستا تەلەفونم زەنگ لێدەدا و کاتێک هەڵیدەگرم، تەلەفونەکە دەپچڕن. چووبوومە وەرزشی ڕاکردن، کەوتم و ئەژنۆم بریندار بوو. هەموو دۆستانی من چوونە دەرەوەی شار. ئەمن کەسم نیە دەگەڵی هاونشین بم. بۆ من گرنگ نیە کە ئێوە باسی چدەکەن، پێم‌وایە بۆ من ئیدی بەسە، ئاری.»

گوتم: «زۆر باشە، بڕۆ جێیەکی دیکە بۆ ژیان بدۆزەوە و بەختەوەر بە.»

«ئەمن بە ویژدانی پاکەوە لێرە لەگەڵ تۆ ژیاوم، نازانم چیت لە من دەوێ؟» ئەو ئیدی هیچی نەگوت و چووە نێو نوێنی خەوتن.

بەیانیی ڕۆژی دواتر چوومە نێو شار، تەلەفونم بۆ «پزنەر» کرد و ئەوەی «کاردۆئێن» لە سەفەرەکە پێی‌گوتبووم بۆم گێڕایەوە و گوتم کە «سترۆسنێر» دەیەوێ هاوکاریمان بکا. «پزنەر» تەواوبوونی ئەو مۆڵەتەی بۆ «کاردۆئێن»م دیاری کردبوو، پەسند کرد و گوتی، کە دەیەوێ، کابینەی وەزیران ڕاگرتنی ناردنی کەرەسەی سەربازی لە ئیسرائیلەوە بۆ شیلی پەسند بکا و لەو بارەیەوە نامەیەکی ڕەسمی دەنێردرێتە باڵیۆزخانەی شیلی لە ئیسرائیل.

«پزنەر» درێژەی پێدا: «ئاری، ئەتۆ دەبێ لەبارەی موعامەلەی فرۆکە C-130یەکانەوە تەلەفون بۆ وەزیری بەرگریی ئێران بکەی.»

ئەمن پێشتر دوو پەیامم لە «نیکۆلا دیڤیس»ەوە بۆ هاتبوون لەو بارەیەوە کە جێگری سەرهەنگ جەلالی، دەیەوێ چەندی بکرێ زووتر قسە لەگەڵ من بکا. ماوەیەک بوو پێوەندیم دەگەڵیان نەگرتبوو. بەهەرحاڵ، ئەمن لە ئیدارەی پۆستەوە تەلەفونم بۆ جێگری سەرهەنگ

جەلالی لە تاران کرد. ئەو داوای لێکردم تەلەفون بۆ سەرهەنگ جەلالی لە ماڵەکەی خۆی بکەم. سەرهەنگ جەلالی خەبەرێکی ناخۆشی بۆ من پێبوو. ئەو گوتی، بە هەموو هەوڵێک کە بەکاری بردوە هێندێک لە بارمتە ئەمریکایی‌یەکان ئازاد دەکرێن. بەڵام ئێستا دەرەتانی ئازادبوونی سێ بارمتەی ئیسرائیلی نیە. ئەو ئەم مەسەلەیەی بە بەدشانسی دانا.

پێمگوت بۆمن ناگونجێ ئەم خەبەرە بدەم بە سەرۆکوەزیر «شامیر.»

ئەو گوتی: «ئێمە لەوبارەیەوە ناتوانین کارێک بکەین، چونکە کۆنترۆڵی تەواومان بەسەر حیزبوڵڵای لوبناندا نیە.»

خەم سەر تا پێمی داگرت و هەموو لەشم سڕ بوو. سەربازێکی لاوی ئیسرائیلی کە لە لوبنان بە بارمتە گیرابوو، کوڕی جوولەکەیەکی کۆچەری یەمەنی لە (الشیخ) بوو. لە پشوویەکی کۆتایی حەوتوودا کە لە ئیسرائیل بووم، بنەماڵەکەیم دیتبوو و بەڵێنم پێدابوون کە ئەوپەڕی هەوڵمان بۆ ئازادیی کوڕەکەیان بەکار دەبەین، و ئێستا هەستم دەکرد ئەوان بە بیستنی ئەم خەبەرە دڵشکاو دەبن. بۆ من ئەم بابەتە شتێکی کەسی بوو، نەک سیاسی.

بە جەلالیم گوت، ئەگەر ئێوە نەتوانن سەربازە ئیسرائیلییەکان ئازاد بکەن، ئێمە ۳٦ میلیۆن دۆلارەکەتان وێ دەدەینەوە. بەڵام جەلالی، هێشتا بە تەواوی نائومێد نەبوو. ئەو گوتی: «ئێوە پووڵەکە ڕاگرن. ئێمە پێویستیمان بە فڕۆکەکان هەیە.»

پێمگوت، لەو بارەیەوە دەبێ ڕاوێژ دەگەڵ سەرۆکەکانم لە ئیسرائیل بکەم و دڵنیام کردەوە، کە دووبارە تەلەفونی بۆ دەکەم. دووبارە تەلەفونم بۆ «پزنەر» کردەوە، کاتێک پێمگوت تەنیا بارمتە ئەمریکایی‌یەکان ئازاد دەکرێن، زۆر ناڕەحەت بوو و گوتی: «ئەمن چۆن دەتوانم ئەم خەبەرە بدەم بە شامیر. ئەو بە بیستنی ئەم خەبەرە

تێکدەقرمێ. ئەو دەیەوێ،سەربازانی ئێمە ئازاد بکرێن. دەزانی، ئاری، ئەمن دەترسم لەوەی خەبەرێکی وای بدەمێ.»

«تەلەفونی من بەوەوە گرێ بدە، بۆخۆم بابەتەکەی پێدەڵێم.»

«نیوسەعاتی دیکە تەلەفون بکە، ئەم کارە دەکەم.»

بەوم گوت، ناتوانم لە ئاپارتمانەکەمەوە تەلەفون بکەم و بۆم ڕوون کردەوە کە چەند دەمەساتێک دوای ئەوەی سەفەر بۆ «پوورتونانت»م دەگەڵ «باربارا» ڕێکخست، «کاردۆئێن» تەلەفونی بۆ کردم و بانگهێشتنی کردم کە دەگەڵی بچمە «پوورتونانت». «پزنەر» گوتی، کارزانێکی زۆر کارامە لە باڵیۆزخانەی ئیسرائیل لە «بۆینۆس ئایرێس» دەنێرم، بۆ ئەوەی ئاپارتمانەکەت لە دەزگای گوێگرتنی جاسووسی پاک بکاتەوە.

نیوسەعات دواتر دووبارە تەلەفونم بۆ دەفتەری سەرۆکوەزیر کرد و کاتێک شامیر تەلەفونەکەی هەڵگرت ئاگادارم کرد کە ئێرانییەکان دەڵێن، تەنیا بارمتە ئەمریکایییەکان ئازاد دەکرێن. بڕیاری وی زۆر خێرا بوو.

«کەوایە، ئێمەش موعامەلەیەکیان دەگەڵ ناکەین. بارمتە ئەمریکایی-یەکان هیچ پێوەندییەکیان بە ئێمەوە نیە. ئێرانییەکان تەنیا وەختێک دەتوانن فڕۆکە C-130یەکان لە ئێمە بکڕن کە کوڕەکانمان ئازاد بکرێن.» دەبێ بزانین کە لەبەر بیروڕای گشتی، ئیسرائیل لە هەموو جێیەک ڕایگەیاندبوو کە هیچکاتێک بۆ ئازادکردنی بارمتەکان مل بۆ موعامەلەی کەرەسەی جەنگی ڕاناکێشێ، بەڵام لەجێدا وا نەبوو.

ئێمە بەڵگەنامەکانی ئەو سەودایەمان بەهۆی کۆمپانییەکی ئەمریکایی بە ناوی «جی‌یوو میلی تەک» GMTوە و بە کەلکوەرگرتن لە ئیشکەرێکی ئەو کۆمپانییە بە ناوی «میک تیمپانی» ئەنجام دابوو. «تیمپانی»یش قەرار بوو بە زوویی لە کارکردن لەو کۆمپانییە بکشێتەوە. کۆمپانیی GMT، بەهۆی CIAوە بەڕێوە دەچوو و هەر ئەو کۆمپانییە بوو کە ئیسرائیل ساڵی ١٩٨٥ بەهۆی منەوە کەرەسەی

جەنگیی لەهیستانیی بۆ کۆنتراکان لێ کڕیبوو. لەهیستانییەکانیش لە بەرامبەردا داوایان لە کۆمپانییGMT کردبوو کە کەرەسەی ئەمریکایی بدا بە ڕێکخراوی هەواڵگریی شووڕەوی. لەبارەی فرۆشتنی فڕۆکە C-130یەکان بە ئێرانەوە، ئێمە کارێکمان کردبوو کە کۆمپانییەک لەلایەن GMTیەوە موعامەلەکە ئەنجام بدا و بۆ ئەو کارە ٦ میلیۆن دۆلار وەربگرێ. ئێمە بۆیە کۆمپانیی GMTمان بۆ سەودای فڕۆکە C-130یەکان هەڵبژاردبوو کە نەوەکا لە داهاتوودا حکوومەتی ئەمریکا، ولاتی ئیسرائیل تۆمەتبار بکا کە کەرەسەی ناقانوونیی شەڕ بە ئێران دەفرۆشێ. پاش ئابڕووچوونەکەی ئێران- کۆنترا لە ساڵی ١٩٨٦دا، ئێمە هەمیشە ئەم شێوەیەمان بۆ موعامەلەی کەرەسەی شەڕ بەکار دێنا.

«شامیر» گوتی: «ئەگەر بڕیاری من گیروگرفتێک بۆ ئەمریکایی-یەکان، دروست بکا، بۆم گرنگ نیە. فڕۆکەکانی ئێمە نابێ بۆ ئازادیی ئەمریکاییەکان لە لوبنان کەلکیان لێوەرگیرێ. ئەمن دەمەوێ کوڕەکانی خۆمان ئازاد بکرێن و فڕۆکەکانمان بێ دڵنیابوون لەو مەسەلەیە، لەجێی خۆیان نابزوون.»

پاش ئەم قسانە «شامیر» بە تووڕەیی و ڕەنجاوی تەلەفونەکەی دانایەوە. بارودۆخ یەکجار ئاڵۆز ببوو. ئێرانییەکان پێشەکی پووڵی فڕۆکەکانیان دابوو و ئەمن گومانم نیە کە ئەگەر سەودایەکە کرابایە، ئەوان هەوڵی خۆیان بۆ ئازادیی سەربازە ئیسرائیلییەکان درێژە دەدا. بەلام، سەرۆکی من، سەرۆکوەزیری ئیسرائیل، هەرچەند سەرەتا بەو موعامەلەیە ڕازی ببوو، ئێستا نەزەری گۆڕیبوو. عەیبی کارەکە ئەوە بوو کە ئەو پێشبینیی نەکردبوو، کە لەوانەیە هەر بارمتە ئەمریکایی-یەکان ئازاد بکرێن. ئەمن دەمتوانی، جۆری بیرکردنەوەکەی تێبگەم، بەلام ئەو هیچ گوێی نەدایە بیروڕای من.

ئەمن تەلەفونێکی دیکەم بۆ سەرهەنگ جەلالی کرد و گیروگرفتەکەم دەگەڵ هێنایە گۆڕێ. پێمگوت، وا دێتە بەرچاو کە دەبێ پوولەکەتان وێ دەینەوە.

ئەو گوتی: «جەنابی بن مۆناشێ، دووبارە پێت دەڵێم، ئێمە نامانەوێ پوولەکەمان وێ بدەنەوە. ئێمە ئەو فڕۆکە C-130یانەمان دەوێن.»

ئەمن تەلەفونم بۆ «نیکۆلا دیڤیس» لە لەندەن کرد و بابەتەکەم بۆ شی کردەوە و داوام لێکرد بە «میک تیمپانی» بڵێ کە موعامەلەی فڕۆکە C-130یەکان سەر ناگرێ. ئەمن دەمزانی ئیشکەرانی کۆمپانی GMT زۆر نارەحەت دەبن، چونکە بە «تیمپانی» گوترابوو کە ئەو دوو میلیۆن دۆلار لەو موعامەلەیە قازانج وەردەگرێ. قەرار بوو بۆ ئەو سەودایە «باربارا ستادلی» Barbara Studley و هاوکارەکەی، «جان سینگلاب» لە کۆمپانیی GMT دوو میلیۆن دۆلار وەربگرن و لەنێو خۆیاندا بەشی کەن و ۲ میلیۆن دۆلاری دیکەش بدرێ بە کۆمپانییەکە. «نیکۆلا دیڤیس» گوتی پوولی فڕۆکەکان لەپێشەوە خراوەتە بەرنامەوە، بەڵام ئەمن گوتم بۆ بابەتەکە فەرقێک ناکا.

لە حاڵێکدا بە تەواوی خەفەت دایگرتبووم، چوومەوە ئاپارتمانەکە و دوو ڕۆژی دواتر هیچ کارێکم نەکرد. پاشان ئەوەی نەدەبوو بکرێ، کرا. باڵیۆزی ئیسرائیل چووە وەزارەتی دەرەوەی شیلی و گوتی ئیسرائیل بە ڕەسمی ناردنی هەموو جۆرە کەرەسەیەکی شەڕی بۆ شیلی قەدەغە کردوە. لە وەلامدا بە باڵیۆز گوترا کە ئەم بابەتە شوێنەواری زۆر نالەبار لەسەر پێوەندییەکانی شیلی و ئیسرائیل دادەنێ. نە باڵیۆزی ئیسرائیل و نە وەزارەتی دەرەوەی شیلی، هیچیان هۆکاری ئەم بابەتەیان نەدەزانی و لەو بارەیەوە شتێکیان بۆ ڕوون نەکرابۆوە.

هەر لەوکاتەدا و هەر بەو هۆیە، ئیسرائیل ناردنی کەرەسەی شەڕ بۆ ئەفریقای باشووریشی ڕاگرت. هاوتای من لە ئەفریقای باشوور، هەوڵی دەدا، هەر ئەو مەئمووریەتە کە ئەمن لە شیلیم هەبوو، لە ئەفریقای باشوور ئەنجام بدا. واتە تێبکۆشێ حکوومەتی ئەفریقای باشوور قانیع بکا کە ناردنی کەرەسەی شەڕ بۆ عێراق بوەستێنێ. وا دیار بوو باروودۆخی وی لە ئەفریقای باشوور، لە هی من خەراپتر بوو. ئەو هەڕەشەی لە ژەنراڵ «پیترۆن دێر وێست هووەیزن» کردبوو کە ئەگەر ناردنی تەکنۆلۆژیی مووشەک بۆ عێراق لەلایەن ARMSCORەوە -کە ئەویش ئەو تەکنۆلۆژییەی لە کەسانی سەربە «گەیتس» وەردەگرت، ڕانەگیرێ بۆ ژەنراڵ خەراپ دەبێ. لێرەدا دەبێ وەبیر بێنمەوە کە «کلێر جۆرج» جێگری «گەیتس» لە ئیدارەی ناوەندیی CIA هەمیشە لە «لانگلی»ی ڤێرجینیاوە، سەفەری ئەفریقای باشووری دەکرد.

سەرەنجام دوای سێ ساڵ کە ئیسرائیل لەپێشدا تکای لە دوو وڵاتی شیلی و ئەفریقای باشوور کرد و دوایە لەبەریان پاڕایەوە کە ئەو کەرەسە جەنگییانەی لەسەر داوای CIA دەیاننارنە عێراق ڕابگرن و ئاکامێکی لەو کارە وەرنەگرت، ناچار بوو بۆخۆی ناردنی کەرەسەی شەڕ بۆ ئەو دوو وڵاتە ڕابگرێ. لە ئەمریکاش کۆمیتەی بەهێزی کاروباری هەمووانیی ئەمریکا بۆ ئەو ئامانجە، لە کۆنگرەی ئەمریکا لە هەوڵدا بوو. بەڵام، لەبارەی بریتانیاوە، «شامیر» سەرۆکوەزیری ئیسرائیل، نامەیەکی زۆر دۆستانەی بۆ «تاچەر» سەرۆکوەزیری بریتانیا نارد و بێئەوەی ناوی کوڕەکەی بەرێ گوتبووی هێندێک لە هاونیشتمانانی بریتانیا بە مۆڵەتی ئەمریکاوە ئامرازی پێشکەوتووی تەکنۆلۆژیکی دەنێرنە عێراق. لەڕاستیدا، ڕێکخراوی هەواڵگریی ئیسرائیل، دەیزانی کە «مارک تاچەر» کە پێشتر لە موعامەلەی کەرەسەی شەڕ دەگەڵ وڵاتی شیلی جێی خۆی کردبۆوە، لە ساڵی

١٩٨٣وە موعامەلـەی چـەکوچۆڵـەی دەگـەڵ ئـەفریقای باشـووریش دەسـت پێکردبـوو، لەجێدا هـەر «مـارک تاچـەر» بـوو کـە «جێراڵـد بوول»ی دۆستی خۆی بە کارگوزارانی ئەفریقای باشوور ناساندبوو.

ئـەمریکاییـەکان بڕیاریـان دابـوو، ڕێگـا نـەدەن، سـەرۆکوەزیـر «شامیر» هەرچی پێیخۆشـە بیکا و خـەباتێکیان بـەدژی دەسـت پێ-کردبوو. CIA و کۆشکی سپی ڕاگەیەنە گشتییەکانیان وا تێگەیاندبوو کـە «شـامیر» کەسـێکی شـەڕخـوازە کـە هـەوڵ دەدا، وتووێژەکـانی ئاشتیی خۆرهـەڵاتی نێوەڕاست بوەستێنێ. بەوحاڵە ئەمریکاییـەکان زۆریـش دەسـتیان لـە بەربـەرەکانیی «شـامیر»دا ئـاوەڵا نـەبوو. لەوکاتەدا، ململانەی هەڵبژاردنی ساڵی ١٩٨٨ی سـەرکۆماریی ئـەمریکا دەست پێکرابوو و «جۆرج بووش» کە دەیزانی دەنگی جوولەکـەکان لـە هـەڵبژاردنی سـەرکۆماریی ئـەمریکادا چەنـدە کاریگـەرە، تێدەکۆشـا نیشان بدا کە دۆستایەتیی نیزیکی دەگەڵ ئیسراییل هەیە. بۆیـە، لـەو کاتەدا کۆشکی سپی لەسـەر دوو پەت یـاریی دەکرد. یـەکیان خـەباتی چاپەمەنی بە دژی «شامیر» و یەکیش ئەوە کە وا نیشان بدا دۆستـی نزیکی ئیسراییلە و ئەگەر ببێتە سەرکۆمار، زۆر خزمـەت بـە ئیسراییل دەکا.

سـەرەنجام لـەو هـەموو کـردەوە و دژکردەوەیـە، ئاکـامێکی ئـەرێنی بەدەسـت هـات. بـەو جـۆرە کـە لـە کۆتـایی سـێپتامبری ١٩٨٨دا، پـاش حەوتوویـەک لـە گفتوگـۆی مـن دەگـەڵ سـەرۆکوەزیـر «شـامیر»، «ڕابێـرت گەیـتس» جێگـری CIA بـە فڕۆکـە چـووە «سـانتیاگۆ» و دیـدارێکی نهێنیـی دەگـەڵ «سـتانگ» نـەک «پینۆشـێ» ئـەنجام دا. زانیاریی ئێمە لەسەر سەفەری «گەیتس» بۆ شیلی بەهۆی پیاوێکەوە دەسـت کـەوت کـە ئـەمن نەمدەناسـی و بـەناوی «مارگارتـا» کـاری

دەکرد.[25] ڕاپۆرتێک کە «مارگارتا» دەیدا بە ڕێکخراوی هەواڵگریی ئیسرائیل، بە هۆی Tsometەوە، کە بەشی هەواڵگریی ئینسانیی «مۆساد» بوو، لێی دەکۆڵرایەوە.

ئێمە بە هۆی «مارگارتا»وە ئاگادار بووین کە کۆشکی سپی دەستووری داوە، پاش بەڕێوەچوونی هەڵبژاردنی سەرکۆماریی ئەمریکا کەرەسەی شەڕ بۆ عێراق نەنێردرێ. ئەم دەستوورە ڕاستەوخۆ لە دەفتەری جۆرج بووش جێگری سەرکۆماری ئەمریکاوە بۆ «ڕابێرت گەیتس» نێردراوە و «ویلیام وێبستێر» ئاگای لە دەرچوونی ئەو دەستوورە نەبووە. وا دەهاتە بەرچاو کە «وێبستێر» پاش مەرگی لەنەکاوی «ویلیام کەیسی» لە ساڵی ١٩٨٧دا و دوای ئەوەی کاندیدابوونی «ڕابێرت گەیتس» بۆ سەرۆکایەتیی CIA لەلایەن کۆنگرەوە ڕەت کرایەوە، بۆتە سەرۆکی ئەم ڕێکخراوە، ئاگای لە نێردرانی کەرەسەی جەنگیی وڵاتانی شیلی و ئەفریقای باشوور بۆ عێراق نەبووە.

کاتێک ئیسرائیلییەکان بۆ زانینی ئاکامی وتوویژەکانی «گەیتس» و ژەنراڵ «ستانگ» پرسیاریان لە کارگوزارە هەواڵگرییەکانی خۆیان کرد، وەڵام درایەوە کە ئامانجی دیدارەکە ئەوە بووە کە لەبارەی پێوەندییەکانی ئەمریکا و شیلیی نوێوە (دوای تێشکانی پینۆشێ لە ڕاپرسیی گشتیدا) لێکۆڵینەوەی پێویست ئەنجام بدرێ. دیارە لەو کاتەدا پێشبینی دەکرا کە خەڵکی شیلی دەنگ بە مانەوەی پینۆشێ لە پۆستی سەرکۆماریدا نادەن و لە لایەکی دیکەشەوە، وا بیر دەکرایەوە کە «جۆرج بووش» بە سەرکۆماری ئەمریکا هەڵدەبژێردرێ. بۆیە،

---

[25] -ئیسرائیل زۆر جار و تەنانەت پاش ئاشکرابوونی مەسەلەی «پوولارد»یش بەڵێنی دابوو کە جاسووسی لەدژی ئەمریکا نەکا. بەڵام هەر ئەمە بە تەنیایی نیشانەی ئەوەیە کە ئەم بابەتە هەرگیز ڕاست نەبووە و ئیسرائیل هەمیشە بەدژی ئەمریکا جاسووسیی کردوە.

پینۆشێ زۆر نیگەران بوو و حەزی نەدەکرد، لەکاتی ڕاپرسیی گشتیدا، موعامەلە چەکفرۆشییە نێونەتەوەییەکانی ئاشکرا ببن.

بەهەرحاڵ، پاش ئەنجامی دیداری نهێنیی «گەیتس» و «ستانگ»، ئەوەی دوایە بە منی گوت کە فرۆشتنی کەرەسەی شەڕ بە عێراق ڕادەگیرێ. دیارە ئەم خەبەرە نەیتوانی دەفتەری سەرۆکوەزیریی ئیسرائیل خۆشحاڵ بکا. هەموومان دەمانزانی کە پاش هەڵبژاردنی سەرکۆماریی ئەمریکا، فرۆشتنی کەرەسەی جەنگی بە عێراق دەست پێدەکاتەوە. ئەو موعامەلانە پووڵێکی زۆریان لێ بەدەست دەهات و بۆیە، بەو ئاسانییە نەدەکرا کارەکە بۆ هەمیشە ڕاگیرێ.

یەکێک لەو کەسانە کە لە موعامەلەی کەرەسەی جەنگیدا، نەخشی گرنگیان لە ئەستۆ بوو، بازرگانێکی ئوسترالیایی بەناوی «ئالان باند» بوو. ڕاست لەوکاتەدا کە «گەیتس» و «ستانگ» پێکەوە لە گفتوگۆدا بوون، ئەفسەرێکی هەواڵگریی باڵیۆزخانەی ئیسرائیل لە «کانبێرا» Canberra دیدارێکی دەگەڵ سەرۆکی ڕێکخراوی خزمەتەکانی ئاسایش و هەواڵگریی ئوسترالیا (ASIS) پێکهێنا و چۆنیەتیی چالاکییەکانی «باند» لە شیلیی بۆ شی کردەوە.

بەگوێرەی ڕاپۆرتی یەکێک لە جاسووسەکانی ڕێکخراوی هەواڵگریی ئیسرائیل لە کۆمپانیی «کاردۆئێن»، «ئالان باند» هێندێ قەرزی لە بانکەکانی ئوسترالیا وەرگرتبوو و لە دروستکردنی کارخانەیەکدا کە «کاردۆئێن» لە دەرەوەی بەغدا خەریکی دانانی بوو، وەبەرهێنانی پێکردبوو. لە ڕاستیدا «کاردۆئێن» پێویستیی بە وەبەرهێنانی خەڵکی بێگانە لە کۆمپانییەکەیدا نەبوو، بەڵام هەوڵی دەدا، خەڵکانێکی بێگانە کە جێگە و پێگەیەکی بەرچاویان هەبوو، لە چالاکییەکانی کۆمپانییەکەیەوە گلێنێ، تا بایەخ و ئیعتیبارەکەی زیاتر بکا.

ئیسرائیلییەکان هەرگیز نەیانتوانی، تێبگەن «ئالان باند» چۆن دەستی گەیشتە «پینۆشێ» و چۆنی ڕازی کرد کە کمپانیی تەلەفونی

وڵاتی شیلی بە ٣٠٠ میلیۆن دۆلار پێ بفرۆشێ. دیارە «باند» بەڵێنی بە «پینۆشێ» دابوو کە پاش کڕینی تەلەفونەکە بە شێوەیەکی باش پەرەی پێبدا. بەڵام بێگومان ئەو نەیدەزانی کە تەلەفونەکانی کۆمپانی، هەر لە سەرەتاوە پێویستییان هەم بە پووڵی زۆر و هەم بە زانیاریی بەرزی تەکنیکی هەیە. هەر بەو هۆیەوە، پاش ئەوەی «باند» کۆمپانیی تەلەفونەکەی کڕی، دۆخەکەی زۆر لە پێشوو خەراپتر بوو. بێجگە لە هەموو ئەمانەش، ئەو حەزی نەدەکرد لەو کۆمپانییەدا سەرمایە وەکار بخا و هەوڵی پێویست بۆ باشکردن و پەرەپێدانی بدا.

دوای ئەوەی ئەفسەری هەواڵگریی ئیسرائیل چاوی بە کارگوزارانی ASIS کەوت و بەڵێنیان پێدا کە سەرۆکوەزیری ئوستڕالیا «ڕابێرت هاک» Robert Hawke کە هەم دەگەڵ «باند» و هەم دەگەڵ ئیسرائیل پێوەندیی دۆستانەی هەبوو، لە چۆنیەتیی چالاکییەکانی «ئالان باند» ئاگادار بکەن، «باند» لە پێشدا لە کۆمپانیی «کاردۆئێن» و دوایە لە وڵاتی شیلییش چووە دەرێ.

ئەگەر «ئالان باند» لە کۆمپانیی «کاردۆئێن»دا مابایەوە، ئێمە ئامانجی ناوبراومان لە پێوەندییەکەی دەگەڵ ئەو کۆمپانییە بە باشی دەدۆزیەوە. «مۆساد» توانیبووی خزمەتی دوو کەس لە کرێکارانی کۆمپانیی «کاردۆئێن» بۆ جاسووسی بکڕێ و ئەوان هێندێ وێنەی بەڵگەنامەکانی «کاردۆئێن»یان کە پێوەندییان بە چالاکییەکانیەوە هەبوو، ئامادە دەکرد و دەیاندان بە یەکێک لە کارگوزارە هەواڵگرییەکانی «مۆساد، لە «سانتیاگۆ». بۆ هەرکام لەم دوو کەسە، بڕی پێنسەد هەزار دۆلار [٢٦] دەخرایە دوو حیسابی بانکی لە ئورووپا. یەک لەو دوو کەسە هەتا ئەمڕۆ کار بۆ «کاردۆئێن» دەکا و ئەوی دیکەشیان ون بووە.

---

[٢٦]- بەڕواڵەت ٥٠٠ هەزار دۆلار یەکجار زۆر دێتە بەرچاو. وێدەچێ ٥٠٠ دۆلاری مانگانە یان ٥٠٠٠٠٠ بۆ هەموو خزمەتەکانیان بێ. (وەرگێر)

ئەو کەسەی «پزنەر، بەڵێنی دابوو لە باڵیۆزخانەی ئیسرائیل لە ئارژەنتینەوە بینێری تا ئاپارتمانەکە لە دەزگای خەبەروەرگرتنی جاسووسان پاک بکاتەوە، هاتە ئاپارتمانەکە. ئەو پیاوێکی سەرڕووتاوە بوو کە دەیەی پەنجا ساڵەی تەمەنی بەڕێ دەکرد. بە زمانی عیبری سڵاوی لێکردم و جانتایەکی چووکەڵەی پێبوو، کردیەوە دەسبەجێ دەستی بەکار کرد.

ئەو لەپێشدا چووە لای تەلەفونەکە، گوێچکە (گوشی، سماعە)کەی کردەوە و شتێکی پلاستیکی بە ئەندازەی نینۆکێکی چووکەڵەی لێ- دەرهێنا و دوای ئەوەی پووچەڵی کردەوە، گوتی: «ئەمە شیلییەکان دروستیان نەکردوە، ئەم ئامرازە CIA دروستی کردوە و ئەمریکایی- یەکان بەکاری دەبەن، و ئەمەش تەنیا تەلەفون کۆنترۆڵ ناکا، بەڵکوو هەموو ژوورەکە لە ژێر کۆنترۆڵیدایە.

لێمپرسی: «چۆنی کەلک لێوەردەگرن و لە کوێ گوێی لێدەگرن.»

«هەتا ٥٠ میتری دەتوانن گوێی لێبگرن. بۆیە ئەوان دەبێ لە یەکێک لەو ئاپارتمانانەی نزیکی ئێرە بن.»

ئەو ئامرازێکی زۆر چووکەڵەی دۆزینەوەی کانزای لە جانتاکەی دەرهێنا و بە هەموو جێیەکی ئاپارتمانەکەیدا گێڕا و ئامرازێکی ئەلیکترۆنیی دیکەی خەبەروەرگرتنی جاسووسیی دۆزیەوە کە لەبن تەلەفونی دیواری دایاننابوو.

پاش ئەوەی ئامرازێکی پلاستیکیی دیکەی لێ دەرهێنا و ئەویشی پووچەڵ کردەوە، گوتی: «ئەم یەکەیان دەبێ لە شیلی دروست کرابێ، ئەمە مۆدێلێکی کۆنی ئەڵمانییە کە لە ساڵەکانی دەیەی ١٩٧٠دا دروست کراوە. ئەم ئامرازەش ٥٠ میتر دەڕوا، بەڵام بەهۆی ئەو کەسانەوە کە ئامرازەکەی پێشوویان داناوە، کەلکی لێوەرنەگیراوە. ئەمانە تیمێکی دیکەن کە دەبێ هەر لەم دەوروبەرانە بن.

دوایە بە دەزگاکانی، سیمی تەلەفونەکەی تاقی کردەوە و گوتی: «لەمەشدا ئامرازی خەبەروەرگرتنی جاسووسییان وەکار خستوە.»

ئەمجار داوای لە ژنی خاوەنماڵ کرد، قاوەیەکی بۆ ساز کا. کاتێک ئەو بۆ سازکردنی قاوەکە چووە ئاشپەزخانە، گوتی: «ئەگەر ئەمن لەجێی تۆ بام خۆم لەدەست ئەم پیاوە ڕزگار دەکرد.»

دووبارە ئامرازەکەی بە هەموو لایەکدا گێڕا و گوتی: «ئێستا دەتوانم دەستەبەرێکی نووسراو و ئیمزاکراوت بدەمێ کە ئاپارتمانەکە لە هەرچەشنە ئامرازێکی خەبەروەرگرتن پاک کراوەتەوە، جگە لە سیمی تەلەفونەکە. ئەمن لەبارەی ئەوەوە ناتوانم هیچکارێک بکەم.»

هەر ئەو ڕۆژە کۆتاییمان بە خزمەتی ژنە کارەکەرەکە هێنا و پارەی پێویستمان پێدا تا بتوانێ ماوەی سێ مانگ ژیانی خۆی تێپەڕێنێ. پاشان تەلەفونم بۆ کرا و بانگهێشتن کرام کە بەیانیی ڕۆژی دواتر بچمە دەفتەری «کاردۆئین». لە دڵی خۆمدا گوتم ئەگەر بتوانن ئامرازی گوێگرتن لە ئاپارتماندا دامەزرێنن، دەتوانن لە ترومبێلیشدا ئەوکارە بکەن. بۆیە ئەو ترومبێلەی بەکرێم گرتبوو، دامەوە و ترومبێلێکی دیکەم بەکرێ گرت.

ئەمن ئەو کاتەی دەبوو بچمە دەفتەری «کاردۆئین» گەیشتمە وێ. یەک لە سکرتێرەکانی ڕێنوێنیی کردم بۆ دەفتەرەکەی. سەرۆکی پیشەسازیی «کاردۆئین» لەپشت مێزەکەی دانیشتبوو و پۆستێری وێنەی پینۆشێ و سەددام حوسێنیشی لە ژوور سەری هەڵواسرابوون. کەسێکی گەنجیش کە پشتی دەمن بوو، لە دەفتەرەکەی بوو. کە وەژوور کەوتم، ئاوڕی لێدامەوە، ڕاوەستا و چاوی تێوە بڕیم. «کارلۆس کاردۆئین» گوتی: «جەنابی بن مۆناشێ، حەز دەکەم دەگەڵ دۆستەکەم یەکتر بناسن. ئەو پیاوە گەنجە دەستی بۆ لای من درێژ کرد و ئەمنیش هەر وام کرد. «کاردۆئین» پێکەنی و گوتی: «پێموانیە پێشتر بەڕێز مارک تاچەرت دیتبێ.»

ئەمن ڕوخساری کوڕی سەرۆکوەزیری بریتانیام لە ڕووی ئەو پۆستەرانەوە کە پێشتر لێم دیتبوون، ناسیەوە. لەگەڵ دەستلێدانەوە زەردەخەنەیەک کەوتە سەر ڕوخساری ساردی. بەڵام ئەمن نەمگوت ڕوخساری بۆ من ئاشنا بووە، چونکە بەم قسەیە خۆشحاڵ دەبوو.

بەهەرحاڵ، «کاردۆئێن» هێشتا ڕێوڕەسمی پێکناساندنی ئێمەی تەواو نەکردبوو.

ئەو درێژەی دایە: «بەڕێز بن مۆناشێ بۆ دەفتەری سەرۆکوەزیری ئیسڕائیل کار دەکا و ئێمە بۆ موعامەلە دەگەڵ یەکتر کەوتووینە وتوویژەوە.» پاشان لەحاڵێکدا چاوی لە من دەکرد، لەسەری ڕۆیشت: «بەڕێز تاچەر، هاوکاری ئێمەیە، ئێمە دان و ستاندنی بازرگانیمان پێکەوە هەیە.»

گوتم: «چجۆرە دان و ستاندنێک؟»

تاچەر گوتی: «ئەمن بازرگانی کەرتی تایبەتیم.»

لێمپرسی: «هیچ پێوەندییەکت دەگەڵ حکوومەتی بریتانیا هەیە؟»

ئەو سەری لە پرسیارەکەم سوڕ ما و گوتی: «دەزانی، هێندێ جار، باش نیە پیاو خۆی بە کەسێکی بەناوبانگەوە گرێ بدا.» ئەمن تێگەیشتم کە ئەو دەیزانی، لە وەزعی وی ئاگادارم. ئەو زیادی کرد: «ئەمن بازرگانێکی تایبەتیم. دایکی من کاری خۆی هەیە و ئەمنیش بۆخۆم کار دەکەم.»

ئەمن بڕیارم دا، بۆچوونەکەی لەو بارەیەوە کە پێشتر ناسیومە، بگۆڕم. بۆیە، گوتم: «ئەمن جەنابت بە چۆنیەتیی ترومبێلئاژۆتنەکەت دەناسم.» دەبێ بزانین کە مارک تاچەر لە کێبەرکێیەکی بەناوبانگی لێخوڕینی ترومبێلدا لە ئەفریقای باشوور ون ببوو. دوایە لێم زیاد کرد: «ئەمن جەنابت لە نووسینەکانی ڕۆژنامە و گۆڤارەکانەوە دەناسم. چۆن لەو بیابانە ڕێگات لێ ون بوو.»

پێکەنی و گوتی: «بەڵێ، زۆرکەس لەوبارەیەوە قسە دەکەن، بەڵام ئەمن حەز لە شۆفیریی بەکۆمەڵ دەکەم.»

لە منی پرسی، ئەتۆ لە بریتانیا بووی، وەڵامم دایەوە، چەندین جار بە سەفەر چوومە بریتانیا و هێندێک ئەندامی بنەماڵەکەشم لەو وڵاتە دەژین. پاشان بابەتی قسەکانمان هێنایەوە سەر بنەماڵەی پادشایەتی.

گوتم: «لەو وڵاتە پادشاش و سەرۆکوەزیریش ژنن، داخوا ئەمە ڕاستە کە شاژنی بریتانیا دەیەوێ بە قازانجی چارلزی کوڕی بکشێتەوە؟»

بە بیستنی ئەم قسەیە پێکەنین لە ڕوخساری باری کرد. شکی تێدا نەبوو کە ئەو ڕێزی بۆ بنەماڵەی پادشایی بریتانیا نەبوو. بەوحاڵە، خۆی دەگەڵ شازادە چارلز بەراورد دەکرد.

ئەو گوتی: «دایکی وی شاژنە و ئەمنیش دایکی خۆمم هەیە. ئێمە زۆر شتمان وەک یەک دەچێ. ئەمن بۆخۆم ژیانم بەڕێوە دەبەم، بەڵام چارلز وا نیە. بنەماڵەی پادشایەتی جێیان نەگۆڕە، بەڵام ڕێبەرەکان دێن و دەڕۆن.»

«کاردۆئێن» لەپشت مێزەکەی دانیشتبوو و ئەمن و تاچەر ڕووبەڕوو دانیشتبووین و باسی سیاسەتمان دەکرد. تاچەر گوتی، کە ئەو وەک ڕێبەرێک زۆری ڕێز بۆ پینۆشێ هەیە و هەروا کە قسەی دەکرد چاویشی لە وێنەکەی بوو. ئەو لێی زیاد کرد: «ئەمن تێناگەم، بۆچی ئەمریکایی‌یەکان ئەوەندە لەبارەی پێشێلکردنی مافی مرۆڤەوە تین بۆ پینۆشێ دێنن. ئەمن لەو بارەیەوە هیچم نەدیوە و نەبیستوە.»

ئەمن لە بارەی فالکلەندەوە پرسیارم لێکرد. وەڵامی دایەوە، شیلی لە کاتی شەڕی فالکلەندا دۆستێکی گەورەی بریتانیا بوو.

ئەمن باش دەمزانی کە پینۆشێ لە شەڕی فالکلەندا ڕێگای بە بریتانیایی‌یەکان دابوو کەلک لە خاکی شیلی وەرگرن و ئەم بابەتەش بۆ بریتانیا زۆر گرنگ بوو. پاش کۆتایی شەڕ پریزیدێنت پینۆشێ و

«مارگارێت تاچەر» دۆستایەتییەکی زۆر نزیکیان دروست کردبوو. بۆیە بەڕێکەوت نەبوو کە کوڕی تاچەر، ٤٨ تانکی چیفتێنی بە شیلی فرۆشتبوو.

ئاشکرا بوو کە «مارک تاچەر» پرسیارەکانی منی پێخۆش نین. لەوکاتەدا، ئەو هەستا و گوتی: «هیوادارم بمبووری، ئەمن دەبێ بڕۆم.» پاشان لە حاڵێکدا چاوی لە «کاردۆئێن» دەکرد، گوتی: «ئەمشەو دووبارە یەکتر دەبینین.»

«مارک تاچەر» ماڵئاوایی لە من خواست و ڕۆیشت. ئێستا «کاردۆئێن» بەپێوە وێستابوو و بەدەم منەوە پێدەکەنی. دەستەکانیی هەڵێنان و دایانەوە.

ئەو گوتی: «خۆ دەبینی؟»

بێگومان، ئەوەی حەزی دەکرد بیبینم، دیتبووم -«مارک تاچەر» و دایکی لە پشتیوانانی وی بوون. لەم دیدارەدا کارێکی دیکە نەکرا.

ڕاوەستانی ناردنی کەرەسەی شەڕ لە ئیسرائیلەوە بۆ شیلی، ئەم وڵاتەی زۆر تووڕە کرد و سەرەتای نۆڤامبر، پاش تەواوبوونی ڕاپرسی لەبارەی سەرکۆماری ئەو وڵاتەوە، ئەمن ماوەی دوو حەوتوو لە ئیسرائیل مامەوە و دەگەڵ بنەماڵەکەم بەسەرم برد. پاشان بۆ سەردانێکی ژەنراڵ «ڤێن دێر وێست هووەیزن» چوومە وڵاتی ئەفریقای باشوور.

کارگوزارانی حکوومەتی ئەفریقای باشوور هەوڵیان دەدا پێمان نیشان بدەن کە پێیان خۆشە هاوکاریی تەواویان دەگەڵ ئیسرائیل هەبێ. لە دیدارێکدا کە دەگەڵ ژەنراڵ «وێست هووەیزن»م هەبوو، بەوپەڕی مهرەبانی و لەدڵەوە پێی‌گوتم کە ئەفریقای باشوور، بە تەواوی ناردنی تەکنۆلۆژی بۆ عێراقی ڕاگرتوە. ئەو هەروەها وەبیری هێنایەوە کە کۆمپانییەکانی سەربە ڕێکخراوی CIA کە بۆ سەرپۆشی عەمەلیاتی ئەم ڕێکخراوە بە ناوی خۆیان موعامەلە دەکەن، وەک کۆمپانیی «گاما» لە ماساچووسێت، ئامراز و کەرەسە و تەکنۆلۆژی سەرەتا بە قاچاغ دەبەنە ئەفریقای باشوور و دوایە لەم وڵاتەوە دەیگوازنەوە بۆ عێراق.

ئەمن داوام لە ژەنراڵ کرد، پێرستێکم لە ناوی ئەو کۆمپانییانە بداتێ کە «کاردۆئێن» کەلکی لێ‌وەردەگرتن و ژەنراڵ ئەم کارەی کرد. ئەو هەروەها ناوی کارگوزارانی عێراقی و کۆمپانییەک لە تەکزاسی کە هی «مارک تاچەر» بوو و ڕاستەوخۆ لە بریتانیاوە ئامراز و دەزگای بۆ عێراق بار دەکردن، دا بە من. ناوێکی دیکە کە لە گفتوگۆیەکانی ئێمەدا هاتە گۆڕێ، «جان نایت» John Knight لە کۆمپانیی «دیناڤێست» Dynavest لە لەندەن بوو کە پارچەی یەدەکیی بۆ عێراق دەناردن. «جان نایت» لە دوا ساڵەکانی دەیەی ١٩٧٠وە دەگەڵ گرووپی «توونی پێرسۆن- نیکۆلا دیڤیس» کاری دەکرد و ناوەکەی بۆ ئێمە ئاشنا بوو، بەڵام ژەنراڵ «هووەیزن» ناوی هێندێک کۆمپانیی دیکەی لە بریتانیا، بێلژیک و لووکزامبوورگ دا بەمن کە هەموویان بە

هۆی «کاردۆئێن»ەوە لەژێر چەتری ماڵیی CIAدا بەڕێوە دەبران و دەزگای ئەتۆمی و شیمیاییەیان دەناردنە عێراق. ناوی ئەو کۆمپانییانە بۆ ئێمە تازە بوو.

پاشان ژەنەڕاڵ «ڤێن دێر ویێست هووەیزن» خەبەرێکی زۆر ناخۆشی دامێ، لەسەر ئەوە کە مووشەکە سکادەکانی عێراق بە کڵاوەی ئەتۆمیی بێ توانای تەقینەوەوە لە تاقیکردنەوەکاندا کەلکیان لێ وەردەگیرێ.

ژەنەڕاڵ گوتی: «ئێمە حەز دەکەین، ئیسرائیلییەکان بزانن کە ئێمە خەڵکی ئەفریقای باشوور سەروکارمان دەگەڵ هیچکام لەو کەسانە نیە.» ئەو هەروەها دووپاتەی کردەوە کە «مارک تاچەر» ماوەیەکی درێژە دەگەڵ ئەفریقای باشوور موعامەلەی کەرەسەی شەڕ دەکا.

لەو هۆتێلەی «پریتۆریا» کە لێی مابوومەوە، چاوم بە هاوتا ئیسرائیلییەکەم لە ئەفریقای باشوور کەوت. ئەو پێی‌گوتم کە وڵاتی ئەفریقای باشوور، بەڕاستی بڕیاری داوە، ناردنی تەکنۆلۆژی بۆ عێراق ڕابگرێ. چونکە حەز دەکا هاوکارییە ئەتۆمییەکانی دەگەڵ ئیسرائیل دەست پێبکاتەوە. ئەو لێی زیاد کرد کە لەجێدا ئەفریقای باشوور، دەیەوێ دەستی ئەوانە کە یارمەتیی عێراقیان داوە، کورت بکاتەوە و ئەفریقای باشوور بەنیازە، «ڤێن دێر هووەیزن» لە هەموو کارە ڕەسمییەکانی بەرکەنار بکا.

دۆستە ئیسرائیلییەکەم لەسەری ڕۆیشت: «ئێمە ئێستا دەبینین کە هەوڵێکی سەربەرزانە بۆ پچڕینی موعامەلە دەگەڵ عێراق دەست پێ-کراوە، بەڵام بۆ بەدبەختی ئەم کارە زۆر درەنگ دەستی پێکردوە. سەددام حوسێن، زانا و تەکنۆلۆژیی پێویستی، بە تایبەتی بەهۆی ئەڵمانییەکانەوە بەدەست هێناوە. CIA، لەڕاستیدا کۆمپانیی ARNSCORی ئەفریقای باشووری بۆ ئەو بابەتە بەدەستەوە گرتوە. ئیشکەرانی ئەو پیشەسازییانەش کۆمپانییە ئورووپاییەکان بۆ سەددام حوسێنیان دابین دەکەن.»

ئەمن دەگەڵ دۆستە هەواڵگرەکەم بۆ بەشداری لە کۆنفرانسێکی پلەبەرز لە دەفتەری سەرۆکوەزیردا کە سەرۆکانی لقەکانی TSOMETو عەمەلیاتیی «مۆساد»یش لەوێ دەبوون، گەڕامەوە ئیسرائیل. قەرار بوو، لەو کۆنفرانسەدا، هەوڵ بدرێ گیروگرفتی گۆرین، واتە لەنێوبردنی ئەوانە کە هۆی ناردنی کەرەسەی شەڕ بۆ عێراق بوون، بەجۆرێک چارەسەر بکرێ کە باری تایبەتی و کەسیی هەبێ. داوا لە ئێمە کرا کە پێرستێکی تەواو لە ناوی هەموو ئەو کەسانە کە لە وڵاتانی شیلی، ئەمریکا، ئوستڕالیا و بریتانیا دەستیان لە ناردنی کەرەسەی شەڕ بۆ عێراقدا هەبووە، ئامادە بکرێ.

لە حەوتووەکانی دواتردا، هەشت کەس لە زانایانی ئەڵمانی کە لە کۆمپانییەکەی «ئیحسان باربووتی» لە مەیامی دامەزرابوون و هەمیشە لە چوون و گەڕانەوەی عێراقدا بوون، لەنێو چوون و دوو زانای پاکستانییش کە لە ئورووپا بوون، کوژران. پاشان ئەڵمانییەکی دیکە، بەناوی «هانس مایەرز»، کە ئەمن لە کارخانەکەی «کاردۆئێن» لە پاڕاگوا، چاوم پێی کەوتبوو، لە دەرەوەی شاری موونیخ، لە رووداوێکی ترومبێلدا بە شێوەیەکی دڵتەزێن کوژرا. لە بریتانیاش چوار بازرگانی عێراقی مردن. دوایە سێ میسری و فەرانسەییەکیش کوژران و کۆی کوژراوان گەیشتە ١٩ کەس.

هەموو ئەو کەسانە لە کۆتایی ساڵی ١٩٨٨دا لەنێو چوون. ٤ تیمی زەبروەشێنی رێکخراوی «مۆساد» بۆ کوشتنی ئەو کەسانە دیاری کرابوون. ئەو تیمە زەبروەشێنانە کە «مۆساد» بۆ کوشتنی کەسانی دیاریکراو، هەڵی بژاردبوون، تایبەتمەندییەکی تازەیان هەبوو. بەومانایە کە هەموویان لەنێو فەلەستینییەکان هەڵبژێردرابوون. ئەوان نەیاندەزانی کار بۆ کێ دەکەن و پێیان وابوو بوونە کارمەندی کەسایەتییەکی سیسیلی و ئەو کوشتارانە بۆ ئەو دەکەن. دیارە ئەو کەسایەتییە سیسیلییە بۆخۆی کارمەندی «مۆساد» بوو. ئیسرائیل بۆیە، تیمە زەبروەشێنەکانی لە فەلەستینییەکان پێکهێنابوو کە ئەگەر

ئەوان لە عەمەلیاتەکەدا کوژران یان گیران، ئاشکرا بێ کە ئەوان ئیسرائیلی نین.

کوژرانی ئەو ١٩ کەسە زەنگی مەترسیی لە گوێی خاوەنکارەکان و ئاغاکانیاندا وەزرینگە خست.

کۆتایی نۆڤامبری ساڵی ١٩٨٨، ئەمن دووبارە دەگەڵ دوو پارێزەرم بۆ دیتنی «جیراڵد بوول» سەفەری ئورووپام کرد. لەو کاتەدا لە ئورووپا کوشتاری یاریدەدەرەکانی عێراق دەست پێکرابوو. لەڕاستیدا، دوو کەس لەو ئەڵمانییانەی کوژرابوون، کاریان بۆ «جیراڵد بوول» دەکرد. ئەمن «بوول»م لە ئاپارتمانە زۆر ڕازاوەکەی لە بڕۆکسێل چاو پێکەوت. ئەو خەبەری کوشتاری بەرهەمهێنەرانی کەرەسەی دژی ئیسرائیلیی شەڕی بیستبوو و زۆر بەکەیف نەبوو. پێشنیارم پێکرد، ٥ میلیۆن دۆلار لە ئێمە وەرگرێ و بەرنامەی دروستکردنی تفەنگە پێشکەوتووەکەی بوەستێنێ.

ئەو گوتی: «بیری لێدەکەمەوە و سبەینێ ئاکامەکەت پێدەڵێم.»

ڕۆژی دواتر، چوومە سەردانی. گوتی: «ئەمن هیچ پوولێک لە ئێوە وەرناگرم.»

گوتم: «بەداخم کە خەبەرێکی وا دەبیسم. ئیسرائیل زۆر نیگەرانی گیانی هاونیشتمانانی خۆیەتی و بۆ لابردنی مەترسی، خۆ لە هیچ کردەوەیەک ناپارێزێ. ئەتۆ دەبێ بەرامبەر بەو عەمەلیاتەی ئێستا لە ئارادایە، بێخەم نەبی. داخوا ئاگات لێیە خەڵکی جۆراوجۆر چۆن تووشی ڕووداوی سەرسوڕهێن دەبن و دەمرن؟»

گوتی: «بەڵێ ئاگادارم.»

دوایە داوای لێکردم بەجێی بێڵم.

ئەمن فڕیم بۆ لەندەن و چاوم بە «ئەمیرام نیر»، ڕاوێژکاری دژی تێرۆریستیی پێشووی «شیمۆن پریز» کە دەگەڵ «ئۆلیڤێر نۆرت» دە بابەتی ئێران - کۆنتراوە گلابوون، کەوت. ئەو کەموزۆر هاوتەمەنی من بوو و دوا ساڵەکانی دەیەی سی ساڵی یان سەرەتاکانی دەیەی

چل ساڵی تێدەپەڕاند و قەرار بوو یەکێک لە شایەتە گرنگەکانی دادگایی «ئۆلیڤێر نۆرت» بێ. دیارە شایەتیدانی «ئەمیرام نیر» هەم بۆ «شیمۆن پرێز» و هەم بۆ پریزیدێنت ڕەیگان ناخۆش و جێی ترس بوو. چونکە «نیر» زانیارییەکی زۆری لەسەر عەمەلیاتی شیمیایی باربووتی لە مەیامی هەبوو. ئەمن بەنیاز بووم زانیاریی پتر لەبارەی ئەو کەسەوە بەدەست بێنم.

ئەمن بۆ سەردانی «نیر» چوومە ئاپارتمانەکەی، کە لە ئاپارتمانەکەی خوشکم زۆر دوور نەبوو. کاتێک گەیشتمە ئاپارتمانەکەی، چۆنیەتیی ژیانی تازەی وی منی تووشی سەرسوڕمان کرد. ئەو، هاوسەرە میلیۆنێرەکەی خۆی لە ئیسرائیل بەجێ هێشتبوو و دەگەڵ ژنێکی مووڕەشی دڵگیر دەژیا. «نیر» ئەوی بە ناوی «ئادریانا ستانتۆن» Adiriana Stanton خەڵکی کانادا بە من ناساند. بەڵام، ئەمن پێشتر دەمناسی. ناوی ڕاستەقینەی «ئادریانا ستانتۆن» نەبوو، بەڵام «نیر» لەو بابەتە بێئاگا بوو.

لە ژنەکەم پرسی: «ئێمە پێشتر یەکترمان دیوە؟»

گوتی: «پێم وانیە» و بیانوویەکی دۆزیەوە و لە ئاپارتمانەکە چووە دەرێ.

ئەمن هۆشدارم دایە «نیر»، «ئەتۆ دەبێ زۆر لەم ژنە وریا بی.» ئەو پێکەنی و گوتی، ئەم ژنە مەترسییەکی بۆ من نیە. دوایە، ئەو بەڵێنی دا، لە شیلی سەرم بدا و گوتی، «کاردۆئێن» و باربووتیی باش دەناسێ و زۆر خۆشحاڵ دەبێ کە لەبارەی وانەوە یارمەتیی من بدا.

لە کۆتایی نۆڤامبردا دەگەڵ دوو پارێزەرەکە گەڕامەوە شیلی. هەرچەند ئەوان وەختی هەڵفڕین چەکدار نەبوون، بەڵام پاش گەیشتن بە «سانتیاگۆ» باڵیۆزخانەی ئیسرائیل دوو چەکی «برێتا» Berettasی وێ دان. ئەمن باشم دەزانی، لەوکاتەدا، حکوومەتێک کە نوێنەرایەتیم دەکرد، مەترسییەکی گەورەی بۆ ئەو کەسانە کە بە دوای دەسەڵاتدا

دەگـەڕان، لـەو شـارەدا دروسـت کردبـوو. هـەروەها دەمزانـی کـە «کـاردۆئێن» لـە خەبـەری کوشـتاری ئـەو کەسـانە کە کاریـان بـۆی دەکرد، ئاگادار بووە و دەیزانی کێ ئەوانەی کوشتوە.

ڕۆژی ٣٠ی نۆڤـامبری ١٩٨٨، واتـە ٤ ڕۆژ پـێش سـی‌وحەوتـەمین سـاڵوەگەڕی لـەدایکبوونم، «ئـەمیرام نیـر» بـەپێی بەرنامەیـەکی پێشتردانراو، قەرار بوو بێتە شیلی و سەرم بدا. تەلەفونی ئاپارتمان زەنگـی لێدا، ئـەمن گوێچکەکـەم هـەڵگرت و پـێم وابـوو «نیـر»ە و دەیەوێ سەعاتی هەڵفڕینەکەیم پێبڵێ. کەچی دەرکەوت «ئۆرا»یە لە ئۆرشەلیمەوە تەلەفون دەکا.

ئەو گوتی: «ئاری، خەبەرێکی زۆر ناخۆشم بۆ تۆ پێیە. ئەمیرام نیر، دوێنێ لە ڕووداوێکی فڕۆکەدا لە مەکزیک کوژرا.»

خوێن لە لەشمدا بەستی.

ئەو ڕاپۆرتانەی بڵاو ببوونەوە، نیشانیان دەدا کە «ئەمیرام نیر» بە فڕۆکەیـەکی «سێسـنا»210-Tی کـرێ بـۆ پشـکنینی بەرهـەمی هـەرمێی خۆی کە لە شاری مەکزیکۆ سەرمایەی تێدا وەکار خستبوو، لەڕێگادا بـوو کـە فڕۆکەکـەی لـە خۆرئـاوای شـاری مـەکزیکۆ، کەوتـە خـوار. لەبارەی بەربوونەوەی فڕۆکەی «نیر»ەوە هەواڵگەلێکی جۆراوجۆر و ناڕاسـت بـڵاو بوونـەوە. یـەکێک لـە ڕۆژنامـەکان نووسـیبووی کـە لـەم ڕووداوەدا، «ئـەمیرام نیـر» و فڕۆکەوانەکـە کـوژراون، بـەڵام سـێ کەسی دیکە لەوانەی لە فڕۆکەکەدا بوون، یـەک لـەوان ئـەو ژنـە کـە لـە ئاپارتمانەکـەی «نیـر» چـاوم پێـی‌کـەوت، بـە ئـازارێکی کـەم گیانیـان دەربردوە.

ڕاپۆرتێک کە لە ڕاپۆرتـەکانی دیکـە پتر قبووڵ کرا، ئەوە بـوو کـە «نیر» بە ناوی ساختەی «پات ویبێر» فڕۆکەیـەکی بـەکرێ گرتـوە و لە کاتی فڕیندا، فڕۆکەکە بەربۆتـەوە. ئـەو ڕاپۆرتـە ڕوونـی کـردەوە کـە هاونیشـتمانێکی گومـانلێکراوی ئـارژەنتینی کـە کـاری بـۆ کـردوە، تەرمەکەی ناسیوەتەوە و وەری گرتۆتەوە.

سەرۆکوەزیر «شامیر» دەستووری بە ڕێکخراوی هەواڵگریی ئیسرائیل دا کە لێکۆڵینەوە لە ڕووداوی کوژرانی «ئەمیرام نیر» بکا و ئەو ڕێکخراوە دوای لکۆڵینەوەی پێویست ڕاپۆرتی بە «شامیر» دایەوە کە بەبێ گومان «ئەمیرام نیر» لە لایەن ژنەکەیەوە تەقەی لێکراوە. بنەماڵەی «نیر» هیچوەخت نەیانتوانی، تەرمەکەی وەرگرنەوە.

بەڕاست کێ «ئەمیرام نیر»ی کوشت؟ ڕێکخراوی هەواڵگریی ئیسرائیل، هەمیشە پێی وابووە CIA بە بەرنامەیەکی هەڵسەنگێندراو ئەو کارەی کردوە. «نیر» قەرار بوو لە دادگایی «ئۆلیڤێر نۆرت»دا شایەتی بدا و ئەمەش بۆ «شیمۆن پرێز» و ڕەیگان یان بووش ببووە مایەی نیگەرانییەکی سەخت. بە مردنی «نیر» هەموو ئەوانە هەناسەیەکی ئاسوودەیان هەڵکێشا. ژیانی «نیر» لە لەندەن بۆ وی ببووە جارڕزکەر و خەفەتهێن و ئەو بەنیاز بوو کتێبێک بنووسێ. لەوبارەیەوە تەنانەت پێوەندیی دەگەڵ ڕۆژنامەنووسێکیش گرتبوو و هێندێک لە گفتوگۆیەکانی خۆی دەگەڵ کارگوزارانی ڕەسمیی ئەمریکا بۆ باس کردبوو.

ڕۆژی ٢ی دیسامبر، ڕاست سێ ڕۆژ پاش مردنی «نیر»، کاتێک لە ئیدارەی پۆستی «سانتیاگۆ» دەچوومە دەرێ، یەک لەو پەنجەرانەی بەلایاندا تێدەپەڕیم، وردوخاش بوو. دوایە شتێک بەر ئەو کیفە دەستییە کانزایییە کەوت کە پێم بوو و بە ڕادان و بەتایبەتی دروست کرابوو. ئەمن و پارێزەرەکانم زانیمان کەسێک تەقەمان لێدەکا و خۆمان لە زەوی مەلاس کرد.

پیاوانی پۆلیس، لەو ڕووداوەدا پەلاماری دوو کەسیان دا و گرتیانن. لەپێشدا، بە منیان گوت بچمە ئیدارەی پۆلیس و لەو بارەیەوە هێندێ ڕوونکردنەوە بدەم بە پۆلیس، بەڵام پاش ئەوە ئیدی کەس پێوەندیی دەگەڵ نەگرتم. ئەمن وای بۆ دەچم، لەو ڕووداوەدا دەیانویست یان

بمکوژن یان بمترسێنن. بەڵام ئێستاش نازانم کێ ئەو بەرنامەیەی دانابوو.

بە لەبەرچاوگرتنی ئەوە کە ژەنڕاڵ پینۆشێ، لە ڕاپرسیی گشتیدا تێشکابوو، دەبوو لە شیلی هەڵبژاردنێکی تازە ئەنجام بدرێ. لەو جەرگەیەدا دوو کەس لە بەهێزترین پیاوانی دەوڵەتی ئەو کاتی شیلی، واتە ژەنڕاڵ «ستانگ» و ژەنڕاڵ «فێرناندۆ مەتهی ئابێل» Fernando Matthei Aubel، فەرماندەی هێزی هەوایی بە ئاشکرا بە ئیسرائیلیان گوت کە حەز دەکەن، کێشەی فرۆشتنی کەرەسەی شەڕ بە عێراق دەگەڵ ئیسرائیل چارەسەر بکەن. ژەنڕاڵ «مەتهی» دەیەویست لە تێشکانی ژەنڕاڵ پینۆشێ بە قازانجی خۆی بەهرە وەرگرێ و بۆیە هەر زوو خۆی بۆ سەرکۆماری کاندید کردبوو.

ئەمن ژەنڕاڵ «مەتهی»م لە دەفتەری خۆی لە ناوەندی پۆلیسی شێوە سەربازی لە «سانتیاگۆ» چاو پێکەوت. ئەو گوتی: «هەروەک ئەفریقای باشوور ناردنی کەرەسەی جەنگی بۆ عێراقی ڕاگرت، ئێمەش بۆ هەمیشە کۆتایی بەو سەودا ناخۆشە دێنین. بەڵام، ئێمەش چاوەڕوانیی کۆمەگمان لە ئێوە هەیە. ئێمە حەز دەکەین ناردنی کەرەسەی جەنگیی ئیسرائیل بۆ شیلی دەست پێبکرێتەوە و ئێمە هەروەها پێویستمانە، هێندێ ئامراز و کەرەسەی جەنگی بە ئێران بفرۆشین.

ئەمن پرسیم: «ئێوە دەتانەوێ پێشنیار بکەن کە فرۆشتنی کەرەسەی شەڕ بە عێراق ڕابگرن؟»

ئەو گوتی: «بێگومان ئەو کارە دەکەین. ئێمە دەزگای کۆنی ئەمریکاییمان هەن کە حەز دەکەین بە ئێرانییەکانیان بفرۆشین و لە بەرامبەردا کەرەسەی تازەی شەڕ لە ئیسرائیل بکڕین. لە ئاکامی گەڕانەوە بۆ ڕای گشتیدا کە زۆر خاوێن و بە ویژدانەوە ئەنجام درا، هەموو حکوومەتەکان، لەوانە بریتانیا چەکمان پێ دەفرۆشن. بێجگە لەوە، ئێمە بەڵێن دەدەین کە هەموو توانامان بەکار دەبەین بۆ ئەوەی

ناردنی کەرەسەی شەڕ بۆ عێراق لە داهاتوودا، ڕابگیرێ. ئێمە بە هەموو تواناوە تێدەکۆشین بۆ ئەوەی تەنانەت پێشی قاچاغی کەرەسەی شەڕیش بگیرێ.»

ئەمن قەولم دا هەموو ئەم بابەتانە بگەیەنمە ئیسرائیل. دوو ڕۆژ دواتر، دیدارێک لەنێوان من و ژەنراڵ «ستانگ» و ژەنراڵ «مەتهی» و سەرۆکی ستادەکەی، سەرهەنگ «ماریۆ ڤیلا گۆدۆی» Maryo Vila Godoyدا ڕێکخرا. ئەوان بە منیان گوت، هێندێ فڕۆکەی Northrop F-5E Tigerیان هەن کە حەز دەکەن، بیانفرۆشن. ئەوان کڕیارێکی تایبەتییان بۆ فڕۆکەکانیان لە نەزەردا نەبوو، بەڵام دەیانەویست هەرکەس بێ، پێی بفرۆشن.

ئەمن ڕووم کردە ژەنراڵ «ستانگ» و گوتم: «وای بۆ دەچم ئێوە پێتان ناخۆش نیە ئەو فڕۆکانە بچنە ئێران.»

گوتی: «بەڵێ، هەروایە. ئێمە دەگەڵ «ڕابێرت گەیتس» لەو بارەیەوە قسەمان کردوە و ئەو ڕازی بووە کە فڕۆکەکان بە ئێران بفرۆشرێن. بەڵام، نامانەوێ کۆنگرەی ئەمریکا پێبزانێ کە ئەوانمان بە ئێرانییەکان فرۆشتوون. کارێک کە ئێمە دەتوانین بیکەین، ئەوەیە کە ئەوان بە سەنگاپوور بفرۆشین. ئیدی کارمان بەوە نیە لە سەنگاپوورەوە دەچنە کوێ. بەڵام، ئێمە ئاگامان لێیە کە پێش ئەوەی ئێمە فڕۆکەکان بنێرینە سەنگاپوور، ئێوە دەتوانن نوێیان بکەنەوە.»

ئەو گوتی، وردەکاریی فرۆشتنی فڕۆکەکان دەبێ دەگەڵ ژەنراڵ «ڤێگا» Vega، جێگری هێزی هەوایی شیلی و ژەنراڵ «کلارک» Clark سەرۆکی لۆژیستیکیی هێزی هەوایی چارەسەر بکرێ. «ستانگ» گوتی، ئەمن بە هەموو ئەوانەی دەستیان لەو موعامەلەیەدا هەیە، دەڵێم کە حکوومەتی ئەمریکا دەگەڵ فرۆشتنی ئەم فڕۆکانە موافیقە. (دواتر ئێمە پێمان زانی کە کارگوزارانی شیلی لە بارەی ڕەزامەندیی ئەمریکا بۆ فرۆشتنی ئەو فڕۆکانەوە، درۆیان کردوە. لەو وەختەدا، ئەمریکا کەرەسەی شەڕی بە عێراق دەفرۆشت نەک بە ئێران).

ژەنراڵ «ستانگ» گوتی: «ئێمە دەتوانین ئێوە دڵنیا بکەین کە ئەگەر ئەم فڕۆکانە لە ڕێگای سەنگاپوورەوە بچنە ئێران و ئیسرائیلیش کەرەسەی نوێی شەڕ بە ئێمە بفرۆشێ، هیچکام لە بەرهەمە شیمیایی-یەکانی کارخانەی «کاردۆئێن» ناچنە عێراق -هەرچەند حکوومەتی شیلی هیچ دەستێکی لەو سەودایەدا نیە.»

هەنگاوی دواتری من ئەوە بوو کە تەلەفون بۆ «ژۆزێف ئۆتوول» Joseph O,Toole، سەرهەنگی پێشووی هێزی هەوایی ئەمریکا کە دوا کاری، بەرپرسایەتیی کڕین بوو و پێوەندیی زۆر نیزیکی دەگەڵ CIAش هەبوو، بکەم. پاش ئەوەی سەرهەنگ «ئۆتوول» ساڵی ١٩٧٨ خانەنشین بوو، وەک سەرۆکی بەشی فرۆشتنی فڕۆکە لە کۆمپانیی نێونەتەوەیی FXC لە «سانتا ئانا» Santa Ana لە ئەیالەتی کالیفۆرنیا دامەزرا.

کۆمپانیی FXC هەتا وەختێک کە «فرانک شێڤرییەر» Frank Chevrier هاتە ئەو کۆمپانییە چەتری ڕزگاربوونی بۆ خەڵکی غەیرە نیزامی (مەدەنی) بەرهەم دێنا. «شێفرییەر» هاونیشتمانێکی کانادایی – فەڕانسەیی بوو کە بەبێ ئەوەی سەنتێکی پووڵ پێبێ چووە کالیفۆرنیا و وەک کرێکارێکی سادە لەو کۆمپانییە دەستی بە کار کرد. خاوەنی کۆمپانییەکە کە منداڵی نەبوون، «شێڤرییەر»ی خۆش ویست و ئەوی کردە بەڕێوەبەری کۆمپانییەکە. «شێڤرییەر» بەرەبەرە، کارخانەی FXCی بەدەستەوە گرت و کاتێک خاوەنکارخانەکە مرد، وەسیەتی کرد کە کارخانەکە بکرێتە مڵکی «شێڤرییەر». پاش ئەوەی کۆمپانیی FXC چووە ژێر کۆنتڕۆڵی «شێڤرییەر»، حکوومەتی ئیسرائیل پێوەندیی دەگەڵ گرت و بڕیار درا، کۆمپانییەکە بە کەلکوەرگرتن لە تەکنۆلۆژیی ئیسرائیل، خەریکی بەرهەمهێنانی چەتری ڕزگاری بۆ ئامانجە سەربازییەکان بێ.

کۆمپانیی FXC هێندێ هاوکاریشی لە وڵاتانی سەنگاپوور، ئوستڕالیا و شوێنەکانی دیکەی دنیا هەبوون. دوای ئەوەی ئەو کۆمپانییە بوو بە

کارخانەیەکی گەورە، CIA پێوەندیی دەگەڵ گرت و پێشنیاری کرد کۆمپانییەکە بەشێک بۆ فڕۆکە لە سیستمی خۆی زیاد بکا و بە هۆی ئەوەوە لەلایەن ئەمریکاوە ببێتە دەلالی فرۆشتنی فڕۆکە نهێنییەکان لە سەرانسەری دنیادا. چونکە ئیسرائیلییەکان پێشتر پێوەندییان دەگەڵ کۆمپانیی FXC دامەزراندبوو، بەڵگەکانی فرۆشتنی ئەو بەشە لە کەرەسەی جەنگیی ئەمریکا کە فرۆشتنیان ناقانوونی بوو، لەلایەن ئەم کۆمپانییەوە دەردەچوون. ڕێکخراویٔ هەوالگریی ئیسرائیل، پێی وابوو، یەکێک لەو هۆیانە کە وایان لە حکوومەتی ئەمریکا کرد دەگەڵ کۆمپانیی FXC تێکەوێ، ئەوە بوو کە دەیەویست چاوی بەسەر ئەو موعامەلانەوە بێ کە ئیسرائیل بەهۆی ئەو کارخانەیەوە دەیکردن. بەمجۆرە، ئەمریکا لە فرۆشتنی هەموو ئامراز و دەزگاکانی خۆی بەهۆی کۆمپانیی FXCیەوە ئاگادار دەبوو.

لەبەر ئەوەی لەوکاتەدا پێم وابوو کاربەدەستانی حکوومەتی شیلی لەبارەی ڕەزامەندیی ئەمریکا بۆ فرۆشتنی فڕۆکەکانیان بە ئێران، ڕاست دەکەن و «ڕابێرت گەیتس» دەگەڵ ئەو کارە مووافیق بووە، بۆ «ئۆتوول»م ڕوون کردەوە کە حکوومەتی شیلی حەز دەکا، فڕۆکە F-5Eیەکانی خۆی بە هۆی سەنگاپوورەوە بە ئێران بفرۆشێ. بۆیە، پێشنیارم بە «ئۆتوول» کرد کە کۆمپانیی FXC لەو موعامەلەیەدا نەخشی سەوداگەر بگێڕێ و لەلایەن ئیسرائیلەوە، ئەو فڕۆکانە لە شیلی بکڕێ. ئەم کارە، بەشێوەی سروشتی دەیتوانی مۆری پەسندی ئەمریکایییەکان لەو موعامەلەیە بدا. «ئۆتوول» گوتی، کێشەیەک لەم کارەدا نابینم.

پاشان تەلەفونم بۆ «ئەوی پزنەر» کرد و لێمپرسی نەزەرت لەسەر فرۆشتنی جێتە شەڕکەرەکانی «کەفیر» Kafir بە شیلی بەرامبەر بە ڕاگرتنی فرۆشتنی کەرەسەی شیمیایی شەڕ لەلایەن شیلییەوە بە عێراق، چیە؟ جێتە شەڕکەرەکانی «کەفیر» بە هۆی پیشەسازیی فڕۆکەوانیی ئیسرائیلەوە، دروست دەکران و کۆپیی شەڕکەرە

میراژەکـانی فەڕانسـە بـوون. لـە سـاڵانی ١٩٦٨ و ١٩٦٩دا، پـڕۆژەی میراژی ٣، بەهۆی «ئالفرێد فرانکنێخت» Alfred Frauenknechtەوە، لـە بەرهەمهێنـە سویسییەکەی کـە ئەنـدازیارێکی پایەبـەرز بـوو، دزرا و حکوومـەتی ئیسـڕائیل بەرامبـەر بـەو زەحمەتـەی لـەو بارەیـەوە کێشـابووی، چەنـدین هـەزار دۆلاری دایـە. کاتێک بەرهـەمهێنانی ئـەو فڕۆکانە لەلایەن ئیسڕائیلەوە خەریک بوو تـەواو بێ، مەسـەلەکە لـەقاو درا و لە ئاکامدا «فرانکنێخت» گیرا. بەڵام چونکە ئیسڕائیل داوای کرد سزاکەی کەم بکرێتەوە، ئەو تەنیا دووساڵ و نیو لـە زینـدانی سویسـدا مایـەوە. لەڕاسـتیدا ئـەو کاتێـک ئـازاد بـوو و گەڕایـەوە ئیسـڕائیل کـە توانی، قۆناخەکانی تاقیکردنەوەی ئەو فڕۆکانە پێش هەڵفڕین ببینێ.

چونکە «پزنەر» دژایەتییەکی دەگەڵ فرۆشتنی فڕۆکە کەفیرەکان بـە شیلی نەبوو، ئەمن بۆ ئەنجامدانی سەودایەکە دەگەڵ ژەنڕاڵ «ڤێگا» و ژەنـڕاڵ «کـلارک» و دوو ئەفسـەر کـە بـۆ ئەنجامـدانی ئـەو موعامەلەیـە دیـاری کرابـوون، بـە جیاجیـا کۆبوومـەوە. ئـەو کاتـەی دیدارم دەگەڵ ژەنڕاڵ «ڤێگا» هـەبوو، سـەرهەنگ « گیلێرمـوو ئێرد» Guillerma Aird سەرۆکی ستادی «ڤێگا»ش ئامادە بوو. ئـەوان داوایـان لەمن کرد کە وردەکاریی مەرجەکانی موعامەلەکە بنووسمەوە.

ژەنڕاڵ «کلارک»یش بـە مەرجـەکانی موعامەلەکە ڕازی بـوو، بـەڵام لـەو کاتـەدا، هێندێ ڕاپۆرتمـان لـە ڕۆژنامەنووسـەکانمان لـە کۆمپـانیی «کاردۆئێن» پێگەیشتن، کە فرۆشتنی کەرەسەی شیمیایی دەست پێ-کراوەتەوە و هیچ نیشانەیەک لە ڕاوەستانی بەدی ناکرێ. هەڵکەوتێکی پڕژانەسـەر بـوو، بـەڵام تـەنیا ئومێـدی مـن ئـەوە بـوو کـە وەختێـک فرۆشتنی فڕۆکە -F٥Eیەکان ڕێک خرا، ئەو کارە ڕابگیرێ.

ژەنڕاڵ «کلارک» بێجگە لـە جێتـە شـەڕکەرە کەفیرەکان داخـوازێکی دیکەشـی هـەبوو- بـەهۆی پێویسـتییەکی زۆر کـە شـیلی بـە پارچـەی یەدەکیی فڕۆکە چووکەکانی T-37ی هەبوو، ئەو پێی دادەگرت کە ئـەو پارچـە یەدەکییانەشـیان بـدرێتێ. بۆچـوونی مـن ئـەوە بـوو کـە لەبـەر

ئــەوەی پێوەندییــەکانمان دەگــەڵ شــیلی بــاش دەچوونــە پــێش، ئیسرائیلییەکان دەبێ ئەو موعامەلەیە دەگەڵ شیلی ئەنجام بدەن. پاش گفتوگۆی من دەگەڵ «ستانگ»، «مەتهی»، «ڤێگا» و «کلارک» و سەرۆکانی ستادەکانیان، بڕیارم دا پێوەندی دەگەڵ «کاردۆئێن» نەگرم. پریزیدێنت «سترۆسنێر» قەولی بە ئەفسەری «مۆساد» دابوو کە هەتا کۆتایی فێوریەی ساڵی ۱۹۸۹ کارخانەی «کاردۆئێن» لە پاراگوا دابخا. وا دەهاتە بەرچاو کە ئەمریکایی‌یەکانیش کێشەیەک بۆ داخستنی کارخانەی «کاردۆئێن» ساز نەکەن. چونکە «بووش» تازە ببووە سەرکۆماری ئەمریکا و ئەو و هاوکارەکانی بەرامبەر بە ڕەخنەی کۆنگرە لە عەمەلیاتی حکوومەتی ئەمریکا، زۆر لەسەر هەست بوون.

لە نێوەڕاستی دیسامبری ساڵی ۱۹۸۸دا، ئەمن بڕیارم دا بچمەوە ئیسرائیل و ڕاپۆرتی کاروبارەکە بدەمەوە «پزنەر». ئەویش وای کرد کە سەنەد و بەڵگەکانی فرۆشتنی فڕۆکە F-5Eیەکان لەلایەن ژەنراڵ «وینستۆن چوو»ەوە کە سەرۆکی ستادی هێزەکانی سوپای سەنگاپوور بوو و پێوەندیی دەگەڵی هەبوو، ڕێک بخرێن. قەرار بوو ئەمن بچمە ئورووپا و چاوم بە وەزیری بەرگریی ئێران بکەوێ و ئیسرائیلییەکی دیکەش بچێتە ئاسیای باشووری خۆرهەڵات و موعامەلەکە دەگەڵ سەنگاپوور تەواو بکا. سەنگاپوور لەو موعامەلەیەدا ڕۆڵی دەلاڵ یان سەرپۆشی دەگێڕا و قەرار وابوو، مۆڵەتنامەی دوابەکارهێنانی فڕۆکەکان بۆ حکوومەتی شیلی دەربکا. دەربارەی فرۆشتنی فڕۆکە کەفیرەکان بە شیلییش، دەبوو بابەتەکە بەهۆی بەڕێوەبەری کاری وەزارەتی بەرگریی ئیسرائیل، ژەنراڵ «دیڤید ئێڤری» David Ivryیەوە لێی بکۆڵرێتەوە و بڕیاری لەسەر بدرێ.

ژەنراڵ «ئێڤری» بۆ وتوویژ لەبارەی فرۆشتنی فڕۆکە کەفیرەکانەوە بانگ کرایە دەفتەری سەرۆکوەزیر و وەبیری هێنایەوە

کە ئەو فڕۆکانە ماتۆڕی ئەمریکاییان لەسەرە و ئەگەر بە شیلی بفرۆشرێن، کۆنگرەی ئەمریکا نارەحەت دەبێ. بۆیە ئیسرائیلییەکان بڕیاریان دا فڕۆکە کەفیرەکان بە ماتۆڕی Bet Shemeەوە کە پێش هەڵگیرسانی ناکۆکی دەگەڵ ئەفریقای باشوور، لەسەر عێراق بە کۆمەگی ماڵیی ئەفریقای باشوور دروست کرابوون، بە شیلی بفرۆشن.

ئەمن ڕۆژەکانی دیکەی دیسامبری ساڵی ١٩٨٨م دەگەڵ «ئۆرا» و کچە پێنج مانگەکەمان «شیرا» گوزەراند. بەڵام ئەم دەورە حەسانەوەیە کورت بوو. ڕۆژی ٥ی ژانویەی ١٩٨٩، دەگەڵ دوو پارێزەرەکەم بە فڕۆکە چوومە فرانکفۆرت و شەوی ئەو ڕۆژە سەرهەنگ جەلالیم لە هۆتێلی فڕۆکەخانە چاو پێکەوت. دیداری من و ئەو زۆر گەرم بوو. بەڵام یەکەمین بابەت کە سەرهەنگ جەلالی پێشنیاری کرد، ئەوە بوو کە ئەو حەز ناکا لەبارەی فڕۆکە C-130یەکانەوە قسە بکا. چونکە بەپێچەوانەی دژایەتیی «شامیر» دەگەڵ فرۆشتنی ئەو فڕۆکانە، ئەو چاوەڕوان بوو کە بدرێن بە ئێرانییەکان. ئەو هەروەها ڕوونی کردەوە کە پووڵی ئەو فڕۆکانە، دەگەڵ نرخی ئەو فڕۆکانە کە قەرار بوو لە شیلی بۆیان بکڕرێن، دەبێ بە جیا حیساب بکرێن. لەو نێوەدا، جەلالی، نرخی فڕۆکە F-5Eیەکانی لە من پرسی.

لە کۆتایی دەیەی ١٩٦٠دا کە فڕۆکەکان دروست کرابوون، نرخی هەریەک لەوان ٨ میلیۆن دۆلار بوو، بەڵام ئێستا ئەو ئامرازە ئەلیکترۆنییانەیان لێ دەرهێنرابوون، کە پێشتر تێیاندا دانرابوون، وەک کۆنترۆڵی بۆمب و دەزگای تیشکی خوار سوور تایبەت بە کەلک-وەرگرتن لەشەودا و تەنیا ڕاداری ئاسایی بۆ کاتی هەڵفڕین و نیشتنەوەیان هەبوو.

ئەگەرچی ئەو فڕۆکانە بەپێی بارودۆخی ئەوکاتەیان، نیو میلیۆن دۆلاریان زیاتر نەدێنا، ئیسرائیل قەرار بوو بۆ هەرکامیان ٦ میلیۆن

دۆلار بدا بە حکوومەتی شیلی. بەلام ئێرانییەکان دەبوو بۆ هەر فڕۆکەیەک ١٤ میلیۆن دۆلار بدەن. ئەو بڕە پارەیەی ئیسرائیل دەیدا بە شیلی، ١ میلیۆن دۆلار بۆ چاککردنەوەی هەر فڕۆکەیەک، بیمە، هەقی مانەوە لە سەنگاپوور و خەرجی پێشبینینەکراویشی دەگرتەوە.

سەعات ١٠ی بەیانیی ڕۆژی دواتر، وتوویژ بۆ سەودایەکە دەگەڵ سەرهەنگ جەلالی لە هۆتێلەکەی خۆی درێژەی کێشا. بەوجۆرە کە وا دانرا، ئێران بۆ هەر فڕۆکەیەک ١٤ میلیۆن دۆلار بدا. لەو بڕە قەرار بوو، تاران ٦ میلیۆن دۆلار بۆ هەریەک لە فڕۆکەکان لەپێشەوە بدا بە حکوومەتی شیلی. ئەوەی دەمایەوە لەکاتی تەحویلدانی فڕۆکەکاندا، دەبوو بە نەغد بدرێ بە ئیسرائیل.

سەرهەنگ جەلالی پاش بیستنی ئەو مەرجانە، شانی هەڵتەکاند و گوتی: «ئێمە پێویستیمان بەو فڕۆکانە هەیە و پووڵەکەیان بۆ ئێمە گرنگ نیە. ئێمە دەبێ بەرگری لەخۆمان بکەین.» ئەو هەروەها وەبیری هێنایەوە کە ئەگەرچی ئێستا شەڕ دەگەڵ عێراق تەواو بووە، بەلام نابێ لە بەرامبەریاندا کەمتەرخەم بین.

ئەمن تێنم بۆ سەرهەنگ جەلالی هێنا کە بە دانی پووڵەکە بە شیلی ڕازی بێ و هەروەها داوام لێکرد، نوێنەرێک بنێرێتە «سانتیاگۆ». چونکە، ئێمە دەمانەویست کارێک بکەین خەبەر بگاتە ڕۆژنامەکان کە ئێران دەگەڵ شیلی کەوتۆتە موعامەلە. سەرهەنگ جەلالی بە باوەشی ئاوەڵاوە بە پێشنیارەکەی من ڕازی بوو، چونکە ئێرانییەکان زۆر لەو ڕەفتارە ڕازی بوون کە ئیسرائیل بە دژی عێراق هەڵیبژاردبوو.

ئەمن هەموو ئەوکارانەم بەو هیوایە دەکرد کە کۆنفرانسێک لە شیلی بە بەشداریی نوێنەرێکی ئێران، سەرلەشکر «ئێڤری»، ژەنراڵەکانی شیلی: «ڤێگا» و «کلارک» و ڕەنگە «مەتهی» و «ئۆتوول» و تەنانەت «ڕابێرت گەیتس»یش بگیرێ. هەرچەندی ژمارەی بەشدارانی کۆنفرانس پتر بووایە بۆ ئێمە ئاکامی باشتری دەبوو. چونکە

خەبەرەکەی لە عێراق بە گوێی سەددام حوسێن دەگەیشتەوە و پێی ناڕەحەت دەبوو.

ئەمن ڕۆژی ٦ی ژانویە فڕیم بۆ «سانتیاگۆ» و داوام کرد چاوم بە ژەنڕاڵ «مەتهی» بکەوێ. بەڵام پێیان گوتم کە بۆ پشوودان چۆتە سویس و ژەنڕاڵ «ڤیگا» کارەکانی وی دەکا. کاتێک ژەنڕاڵ «ڤیگا» وەری گرتم، لێمپرسی، داخوا ئەو ڕازییە لە کۆنفرانسێکدا بە ئامادەیی نوێنەرێکی ئێران، «ئێڤری» و «گەیتس» بەشدار بێ. ئەو گوتی ئەگەر «گەیتس» بەم پێشنیارە ڕازی بێ، ئەمنیش کێشەیەک لە بەڕێوەبردنیدا نابینم.

ئەمن لە شیلییەوە تەلەفونم بۆ «گەیتس» کرد و لێمپرسی کە حازرە بێتە شیلی و لە بارەی فرۆشتنی فڕۆکە F-5Eیەکانەوە گفتوگۆ بکا. ئەو زۆر بەئەدەبەوە وەڵامی دایەوە کە ئەو هیچ ئاگای لە فرۆشتنی ئەو فڕۆکانە نیە و هیچ کاتێک موافەقەتی دەگەڵ فرۆشتنیان نەکردوە.

«ئێڤری» هاتە «سانتیاگۆ». لەوکاتەدا «مەتهی» گەڕابۆوە شار. ئەمن دیدارێکم دەگەڵ ئەو و «ڤیگا» و «کلارک» کرد و ڕێککەوتننامەیەک ئیمزا کرا کە ئیسرائیل ١٢ دانە فڕۆکەی پێشکەوتووی کەفیر بە ماتۆڕی دروستکراوی ئیسرائیلەوە هەرکامەی بە ١٤ میلیۆن دۆلار بە شیلی بفرۆشێ. ڕێککەوتننامەیەکی دیکەش ئیمزا کرا کە ئیسرائیل ١٣ فڕۆکەی F-5E بەو دۆخەوە کە ئێستا هەیانە هەر یەکەی بە ٦ میلیۆن دۆلار لە شیلی بکڕێ. لەو ڕێککەوتننامەیەدا نووسرابوو کە ئەو فڕۆکانە لە ئیسرائیل نوێ دەکرێنەوە و دەنێردرێنە ولاتێکی دیکە. بەڵام ناوی ولاتی بەکاربەری وان لە ڕێککەوتننامەکەدا نەهات. بەوحاڵە ئاماژە کرا کە سەنگاپوور حەز دەکا ئەو فڕۆکانە بکڕێ. ئیسرائیل فڕۆکەکانی بە هۆی کۆمپانیی ئەمریکایی FXCوە کە سەوداگەری موعامەلەکەیان بوو، کڕین. دوای

نـوێکردنـەوەیان ئیسـرائیلیش قـەرار بـوو، لـە ژێـر نـاوی کۆمپـانیی FXCدا، موعامەلەکە درێژە بدا و تەواو بێ.

کۆمپانیی FXCیش قـەرار بوو، بڕی ۲۰۰۰۰۰ دۆلار بۆ کڕینـی هـەر فڕۆکەیـەک و بـڕی ۲۰۰۰۰۰ دۆلار بـۆ فرۆشـتنی هـەرکامێکیان وەربگرێ. ئەم بابەتەش بە ڕوونـی قبـووڵ کرا کە وڵاتی شـیلی، هیچ جۆرە کەرەسـەیەکی شـەڕ بۆ عێراق نـانێرێ. هـەروەها سـەوداگەرانی شـیلی پێیـان داگـرت کـە حکوومـەتی ئـەمریکا فرۆشـتنی فڕۆکـە F-5Eیەکانی پەسـند کـردوە. لەحاڵێکدا ئێمـە دەمـانزانی وا نیـە و کەسـێک کـە لـە لایـەن حکوومـەتی ئـەمریکاوە موعامەلەکـەی پەسـند کـردوە «ڕابێرت گەیتس» بووە، کە ئەمـەش هـەر ڕاسـت نـەبوو، ئەگـەرچی ژەنـراڵ «سـتانگ» بۆ بەشـداری لـە دیدارەکـەدا بانگهێشـتن کـرا بـوو، بەڵام بەشدار نەبوو و بۆ ئەوکارە داوای لێبووردنی کرد.

پاش ئەو دیدارانە «ئیڤری» شـیلیی بـەجێ هێشـت و ڕۆژێـک دواتـر، دوکتۆر ئەحمەدی ئۆمشی، لەلایـەن حکوومـەتی ئێرانـەوە بۆ ئـەنجامی موعامەلـەی فڕۆکـە F-5Eیـەکان گەیشـتە «سـانتیاگۆ». پـێش هـاتنی دوکتۆر ئۆمشی، فرۆشتنی فڕۆکەکان بەهۆی «نیکۆلا دیڤیس»ەوە لـە لەندەن ڕێکخرابوو. «ئۆمشی» لە وەزارەتی بـەرگری کـاری دەکـرد و لە کۆنفرانسەکانی ساڵی ۱۹۸۰ی پاریسدا کە بە بۆنەی ئازادیی بارمتە ئەمریکاییەکانەوە ڕێکخرابوون بەشدار ببوو.

پاش دیتنی «ڤێگا»، دوکتۆر ئۆمشی ئیعتیبارێکی بە بڕی ۷۸ میلیۆن دۆلار بـۆ مـاوەی ۹۰ ڕۆژ بـەناوی حکوومـەتی شـیلی لـە بـانکێکی لووکزامبوورگدا کردەوە. ئەمە کۆی ئەو بڕە پارەیە بوو کە ئیسـرائیل بۆ کڕینی ۱۲ فڕۆکەی F-5E دەبوو بیداتـە شـیلی. مەرجـەکانی کەلک-وەرگرتن لەو ئیعتیبارنامە بانکییە ئەوە بوون کە ۱۲ فڕۆکە F-5Eیەکە شـیلی بـەجێ بـێڵن و بـەهۆی کۆمپـانیی FXCیـەوە بگوازرێنـەوە بـۆ ئیسـرائیل. حکوومـەتی شـیلی قـەرار بـوو ۱۳۰۰۰۰۰ دۆلار و ئیسـرائیلیش بەرامبـەری ئەمـە بـدەن بـە کۆمپـانیی FXC. حکوومـەتی

شیلییش بەڵێنی دا، ئیعتیبارنامەیەک بە بڕی ١٦٨ میلیۆن دۆلار بۆ کڕینی شەڕکەرە کەفیرەکان بە ناوی حکوومەتی ئیسرائیل بکاتەوە.

سەرۆکی لقی «مۆساد» لە «بۆینۆس ئایریس» تەلەفونێکی بە پەلەی بۆ من کرد و گوتی: «بارودۆخی پاراگوا ئاڵۆزە و ئێمە دەبێ بە پەلە یەکتر ببینین.» ئەو هەر ئەو ڕۆژە کە لە ڕۆژەکانی کۆتایی ژانویەی ١٩٨٦ بوو، گەیشتە «سانتیاگۆ» و ڕاستەڕێ هاتە ئەو ئاپارتمانە کە ئەمنی لێ‌بووم.

ئەو گوتی: «کارگوزارە هەواڵگرییەکانی ئیسرائیل ڕاپۆرتیان داوینێ کە ژەنراڵ «ڕۆدریگێز» خەریکی بەرپاکردنی کۆدەتایەک بە دژی پریزیدێنت ستڕۆسنێرە. ئەمریکایی‌یەکانیش دەستیان لەم کۆدەتایەدا هەیە و ئارل بریان هاوکاری نزیکی گەیتس و کلێر جۆرج، جێگری عەمەلیاتیی CIA ئەم دوایی‌یانە چۆتە پاراگوا و چاوی بە ژەنراڵ ڕۆدریگێز کەوتوە.»

داخوا CIA بۆ ڕاگرتنی «کاردۆئێن» لە جێگەکەی، حازرە حکوومەتی ئەم وڵاتە بڕووخێنێ؟ پریزیدێنت «ستڕۆسنێر» بەڵێنی دابوو، کارخانەی «کاردۆئێن» دابخا و «ڕۆدریگێز»یش تینووی دەسەڵات بوو. ئەم هۆیانە، نیشانەی دروستبوونی خەبەرە هەواڵگرییەکە بوون. بەوحاڵە، باوەڕکردن بە خەبەرێکی وا ئاسان نەبوو. ئەمن لە سەرۆکی بەشی «مۆساد»ی بۆینۆس ئایرێسم پرسی، ئەم خەبەرە تا چ‌ڕادەیەک ڕاستە.

وەلامی دایەوە: «دەوروبەری سەد لە سەد. کارگوزارانی هەواڵگری، وەدوای دیدارەکانی ژەنراڵ ڕۆدریگێز دەگەڵ باڵیۆزی ئەمریکا لە پاراگوا کەوتوون و ئەو سەرهەنگانەش کە پێوەندیی دۆستانەیان دەگەڵ ئیسرائیل هەیە، گوتوویانە کە سوپا خەریکی کۆدەتا و داگیرکردنی سەربازیی وڵاتە. داخستنی کارخانەی کاردۆئێن لە ئەنجامی کۆدەتاکەدا نەخشێکی گرنگی هەیە و ململانە لەسەر دەسەڵات لەنێوان ڕۆدریگێز و ستڕۆسنێریدا گەیاندۆتە لووتکە».

ئـەمن تەلـەفونم بـۆ ئیسـڕائیل کـرد و لەوبارەیـەوە قسـەم دەگـەڵ «پزنەر» کرد. ئەو پێشتر لە خەبەری ڕووداني کۆدەتا و کاتەکەی کە بۆ شەوی دووەمی فێوریە دانرابوو، ئاگادار بوو و هەربۆیە نارەحەت بوو. ئـەو گـوتی: «ئیشـکەرانی ئێمـە لـە بۆینـۆس ئـایرێس، بـە منیـان گوتوە کە ئەمریکایی‌یەکان لە پشتەوەڕا خەنجەرمان لێدەدەن. هـەر بۆیـە، موعامەلـەی فڕۆکـە کـەفیرەکان و هـەروەها فڕۆکـە F-5Eیـەکان هەڵدەوەشێتەوە و ناردنی کەرەسەی شیمیایی شەڕ بۆ عێراق درێژەی دەبێ. ئەمریکایی‌یەکان تـا ڕادەیـەک دەسـتیان لـەو کۆدەتایـەدا هـەبووە کە تەنانـەت لـە بەرنامەداڕشتنیشـدا یارمـەتیی «ڕۆدریگێـز»یـان داوە. بەپێی زانیارییەک کە ئێمە دەستمان کەوتوە، ئێستا نزیکەی ١٠ تـا ١٥ کـەس لـە کـارگوزارانی CIA لـە باڵیۆزخانـەی ئـەمریکا لـە پـاڕاگوا سەرگەرمی چالاکین.»

پـاش تـەواوبوونی گفتوگـۆ تەلەفۆنییەکـە دەگـەڵ «پزنـەر»، ئـەمن تەلـەفونم بـۆ «ستڕۆسـنێر» کـرد. پـێم وابـوو بۆخـۆی لـە خەبـەری ڕووداني کۆدەتا ئاگادارە، بەڵام بەهەرحاڵ، تەلەفونەکە زیانێکی نەبوو.

ئەو گوتی: «بەڵێ، لەوبارەیەوە بۆخۆم ئاگادارم».

ئـەمن لـە وتووێژەکـەڕا وا تێگەیشـتم کـە گـاردی سـەرکۆماری بەپێچەوانـەی سـوپا بـە «ستڕۆسـنێر» وەفـادارە، لـە دەوروبـەری کۆشکی سەرکۆماری لە حاڵی ئامادەییدا بوو. «ستڕۆسنێر» هـەوڵی دەدا دەگەڵ «ڕۆدریگێز» بکەوێتە گفتوگۆ، بـەڵام ئـەمن ئومێدێکم بـە ئاکـامی گفتوگۆکانیـان نـەبوو. ئـەمریکایی‌یـەکان بـە ئاشـکرا بڕیاریـان دابوو حکوومەت سەرەونخوون بکەن.

بڕیار درا، ئەمن لە «سانتیاگۆ» وەمێنم و دۆستەکەم کە ئەندامی «مۆسـاد» بـوو، بفـڕێ بـۆ پـاڕاگوا. یەکـەم ڕۆژی فێوریـە ئـەو لـە «ئاسانسیۆن»ڕا تەلەفونی بۆ کردم و گوتی: «باشترە، ئەتۆ بێیە ئێرە. ڕێـی تێدەچێ «ستڕۆسنێر» لـە دەسـەڵاتدا وەمێنـێ. چونکـە ئـەو دوو کـەس لـە ژەنڕاڵـەکانی بـۆ لای خـۆی ڕاکێشـاوە، و ئەگـەر ئەمـە ببـێ،

دەبێ ئەتۆ لێرە بی و هانی بدەی کە دەسبەجێ کارخانەکەی «کاردۆئێن» دابخا.»

ئەمن ٢ی فێوریە، «سانتیاگۆ»م بەجێ هێشت و یەکەمین سەعاتەکانی دوای نیوەڕۆ گەیشتمە «ئاسانسیۆن». دۆستەکەم لە فرۆکەخانە چاوەڕێم بوو و هەردووکمان چووینە کۆشکی «ستڕۆسنێر». هەرچەند گاردەکانی دەوروبەری کۆشک، هێزیان بۆ هاتبوو، بەڵام دەتگوت کەس ئاگای لە ئاگری بن خۆڵەمێش نیە.

لەحاڵێکدا «ستڕۆسنێر» نارەحەت دیار بوو، ئێمەی لە دەفتەری کارەکەی وەرگرت و دڵنیای کردین کە کۆنترۆڵی بەسەر بارودۆخەکەدا هەیە، ئەو شەوە شتێک بە دژی ئەو ڕوو نادا و سبەینێ بەیانی «ڕۆدریگێز» دەگیرێ.

ئەمن گوتم: «بەڕێز گیان، ئەمە خەبەرێکی خۆشە. ئەگەر «ڕۆدریگێز» لەو ململانەیەدا سەرکەوتبایە، گیروگرفتێکی گەورە بۆ ئیسرائیل دروست دەبوو. بەڵام ئێمە داواتان لێدەکەین ئەم حەوتوویە کارخانەکەی «کاردۆئێن» دابخرێ.»

پریزیدێنت «ستڕۆسنێر» گوتی: «ئێوە دەبێ دڵنیا بن کە ئەم کارە دەکرێ. ئەمن لەو دیدارەوە کە پێشتر پێکەوەمان هەبوو، لەو ٣٠ میلیۆن دۆلار ئیعتیبارە کە بەڵێن بەمن دراوە، ١٢ میلیۆن دۆلار، چەکی وردم وەرگرتوە.»

لە حاڵێکدا دەستی بە نیشانەی پەسندکردن بەرز کردەوە، زەردەیەکی هاتێ و گوتی: «تکا دەکەم ئێوە بەڕێزان سەعات ٦ی پاش نیوەڕۆ، لەکاتێکدا کاری ڕۆدریگێز تەواو بووە بۆ سەردانی من وەرنە ئێرە.» لە دەنگیدا باوەڕبەخۆبوون هەبوو، بەڵام لە چاوانیدا نیگەرانیم دەدی.

ئێمە لە هۆتێل «ئێکزێلسیوور» کە ئورووپایی و ئەمریکایییەکانی لێ دەمێننەوە، بووین. هەر کاممان چەند تەلەفونێکمان بۆ ئیسرائیل و باڵیۆزی ئیسرائیل کە لە زانیارییەکانی «مۆساد» بێخەبەر بوو، کرد.

هۆشدار درا بە باڵیۆزی ئیسرائیل، کە ڕەنگە ڕووداوێک خەریکی تەقینەوە بێ و ئەو دەبێ پێشبینیی پێویست بۆ ئەمنیەتی ئیشکەرانی خۆی بکا.

ئەو لە منی پرسی: «لە بارودۆخێکی وادا بۆخۆت پێویستیت بە چاوەدێریی ئەمنیەتی هەیە؟»

گوتم: «نا، سوپاست دەکەم. ئەمن دوو پارێزەری خۆمم لەگەڵن.» دیارە ئەوان چەکدار نەبوون، بەڵام دەیانزانی چۆن پارێزگاری لە منیش و خۆشیان بکەن.

هەر چوار کەسمان، سەعات ٦ی دوانیوەڕۆ بۆ شێوخواردن چووینە ڕێستووڕانێکی عەرەبی کە لە نزیک هۆتێلەکە بوو. هەروا کە بەرەو ڕێستووڕانەکە دەچووین، لۆریی پڕ لە سەربازمان دیتن کە دەهاتنە نێو شار و لەمبەر ئەوبەری شەقامەکان دادەمەزران. بۆمن دژوار بوو بزانم ئەوانە سەربە کام لایەنی ململانەکەن. خەڵک ڕادەوەستان و بە سەرسوڕمانەوە سەیریان دەکردن. ئەوان بەرەبەرە هەستیان بە دۆخی نائاسایی شار دەکرد، بەڵام هێشتا ترس و تۆقانیان بەسەردا زاڵ نەببوو.

دوای شێوخواردن کاتێک چووینەوە هۆتێل، دۆخەکە تەواو گۆڕابوو. لەو کاتەدا شار پڕ ببوو لە سەرباز و شەقامەکان لە هاتوچۆکەران بەتاڵ ببوون.

سەربازان ساڵۆنی پێشوازیی هۆتێلەکەشیان داگیر کردبوو، بەڵام موسافیرەکان بە ئازادی هاتوچۆی وێیان دەکرد. خەڵکی دەوڵەمەندی شار دەگەڵ موسافیرەکان تێکەڵ ببوون و لە مەیخانەی ساڵۆنی هۆتێلەکە خەریکی خواردنەوە بوون. ئێمەش لە ساڵۆنی هۆتێل دانیشتبووین و چاوەڕێی ئاکامی ڕووداوێک بووین کە لەوکاتەدا، چارناچار دەبوو ڕوو بدا. بەڵام بەڕاستی داخوا جموجۆڵی سەربازەکان لەنێو شار، مانۆڕێک بوو کە «سترۆسنێر» بەدژی «ڕۆدریگێز» ئەنجامی دەدا، یان بەپێچەوانە. ئێمە دەمانزانی، کە

هـەرچی ئـەو شـەوە ڕووی دەدا، شـوێنەواری لەسـەر چۆنیـەتیی ئەمنیەتی ئیسرائیلیش دادەنا.

دەوری سـەعات ١١ی شـەو، دەنگی گرمـەی تۆپخانـە، هۆتێلەکـەی لەرزاند. ئەمن و هاوڕێکانم چووینەوە ژوورەکەی من و لە پەنجەرەوە چاومان لە بارودۆخی سامناکی شار کرد. تانکەکان لە جێی خۆیان لـە نێوەڕاستی شاری «ئاسانسیۆن»ەوە کۆشکی سەرکۆمارییان تۆپ-باران دەکرد. لەوکاتـەدا، ئێمە هەرنـەبێ تێگەیشتین کە ئەوان سـەربە کام لایەنن.

دەنگی گرمەی گوللە بە درێژایی شـەو دەهاتـە بـەر گوێ. کاتێک لـە بێدەنگیـی یەکـەمین سـەعاتەکانی خۆرهەڵاتنـدا ئێمـە وێرامـان بچینـە شەقامەکان، دیتنی تەرمی کوژراوان، تێیگەیاندین کە شـەوی پێشتر چ ڕووی داوە.

ژەنراڵەکانی سوپا بـەڵێنیان بـە «سترۆسنێر» دابوو کە پشتیوانیی لێدەکەن، بەڵام «ڕۆدریگێز» کە هەم فەرماندەی کۆلێژی سـەربازی و هەم فەرماندەی یەکەی تانک بوو، بڕیاری دابوو، لـە هـەموو حاڵێکدا بەرنامـەی کودەتـا جێبـەجێ بکـا. هـەموو ٢٠٠٠ سـەربازی کـۆلێژی سـەربازی بـە لـۆری هێنرابوونـە شـاری «ئاسانسیۆن» و فـەرمانیان پێدرابوو کۆشکی سەرکۆماری گوللەباران بکەن، ٦ تانـک لـە جێیـەکی چووکەڵەی ناوەندی شار دامەزرابوون و ئەرکیان پێ سـپێردرابوو کـە شارەکە داگیر بکەن. «سترۆسنێر» پاش دیتنی دۆخەکە، دەستووری بـە یەکـە سـەربازییەکانی دیکـە دابـوو، بێنـە کۆمـەگی، بـەڵام ئـەوان فەرمانەکەیان بەجێ نەگەیاند. چونکە نەیاندەویست دەگـەڵ تانکـەکان و ئەو یەکە سەربازییانە کە ناوەندی شاریان گرتبوو، بەرەوڕوو بن.

گـاردی کۆشـکی سـەرکۆمارییش ٢٠٠٠ سـەربازی هـەبوو کـە «سترۆسنێر» دەستووری بە ١٠٠٠ کەسیان دا بە تیربـاری یـوزیی ئیسـرائیلییەوە، بـە لـۆری بێنـە نێـو شـار و بەرامبـەر بـەو هێزانـەی «ڕۆدریگێز» خڕی کردبوونـەوە شـەڕ بکـەن. شـەڕێکی سـامناک لـە

دەوروبەری شوێنی تانکەکان هەڵگیرسا کە لە ئاکامیدا ٦٠٠ کەس لە سەربازانی کۆشکی سەرکۆماری بەهۆی سەربازانی یەکەی تانکەوە درویێنە کران. سەعات ٢ی بەیانی «سترۆسنێر» خۆی بەدەستەوە دا.

کاتێک بەنێو تەرمە لەبەریەکهەڵوەشاوەکانی سەربازاندا تێدەپەڕیین، دۆستەکەم گوتی: «کارەکە تەواو بوو.» بەڕاستی دیمەنێکی ترسێنەر بوو.

ئەمن گوتم: «گیروگرفتی ئێمە دەگەڵ «کاردۆئێن» هێشتا کۆتایی نەهاتوە، ئەم ڕووداوە دەبێتە هۆی بەتاڵبوونەوەی هەموو سەودایەکان. ئێمە گەڕاوینەوە خانەی یەکەم.»

لەکاتی چوونەوەی هۆتێلدا تووشی چەند ئەفسەرێک بووین کە پێیان وابوو، تووریستین و بۆیە پێیانگوتین نیگەران مەبن. ئێمە لە سالۆنی هۆتێل دانیشتین و چاومان لە هێنانەخواری پەیکەری «سترۆسنێر» بەهۆی ئەفسەرەکانەوە کرد.

لەم کاتەدا، تەلەفونەکانی هۆتێل وەکار کەوتنەوە. ئەمن تەلەفونم بۆ «ئۆرا» کرد بۆ ئەوەی پێیبلێم باشم.

ئەو گوتی: «ئەتۆ لەو دۆزەخدەرەیە چدەکەی؟ ئەمن بارودۆخەکەم لە تەلەڤیزیۆن دیوە. دوێنێ تەلەفونم بۆ کردی، گوتیان لە پاراگوایە و ئێستا دەزانم کە لەوێ کودەتایەک کراوە. لە هەرکوێ قەیران هەبێ، ئەتۆ لەوێی».

پاشنیوەڕۆی ئەو ڕۆژە، بڕیارمان دا پێوەندی دەگەڵ ژەنراڵ «ڕۆدریگێز» بگرین و پیرۆزبایی لێبکەین. گوتمان بەوکارە شتێک لەدەست نادەین. تەلەفونمان بۆ کۆشکی سەرکۆماری کرد. ڕوونم کردەوە کە نوێنەری تایبەتیی سەرۆکوەزیر «شامیر»م و حەز دەکەم دەگەڵ ژەنراڵ «ڕۆدریگێز» قسە بکەم.

ئەوان وەڵامیان دایەوە کە ئەو زۆر سەرقاڵە، بەڵام پەیامەکەتی پێ-دەگەیەنین. نیوسەعات دواتر، سەرۆکی ستادی «ڕۆدریگێز»

تەلەفونی بۆ کردم و بەوپەڕی ئەدەبەوە گوتی پێم وانەبوو ئێوە لە شارن.

ئەو گوتی: «هیوادارم ڕووداوەکانی شەوی ڕابردوو، ئێوەیان ناڕەحەت نەکردبێ.» قسەکانی وەک ئەوە دەچوون کە یەکێک باسی میوانداری بکا.

ئەمن پرسیم، داخوا دەکرێ چاومان بە ژەنراڵ بکەوێ. گوتی: «مەبەستتان پریزیدێنتە.»

«دیارە.»

نیوسەعات دواتر دووبارە تەلەفونی کرد و گوتی، پریزیدێنت نیگەرانی ئەمنیەتی تۆیە و ئەگەر بڕوانامەت پێنەبێ، باشترە هەر بە کرانەوەی فڕۆکەخانە شەوەکەی، وڵات بەجێ بێڵی. دیارە، مانای ئەم قسەیە ئەوە بوو کە «لاچوو لەبەر چاوم و لەوە زیاتر سەرم مەیەشێنە.»

ئەمن و دۆستەکەم کە سەربە «مۆساد» بوو، گەیشتینە ئەو ئاکامە کە «ڕۆدریگێز» کارخانەی «کاردۆئێن» داناخا و ڕەنگە باشتر بێ بە قسەی پریزیدێنتی تازە بکەین. کە ئێمە چاوەڕوانی شەوداهاتن و کرانەوەی فڕۆکەخانە بووین، دیتمان گرووپێک ئەمریکایی هاتنە هۆتێل. یەک لەوانم پێشتر دەناسی. -ئەو پیاوێکی ڕیش‌سپی بوو بە ڕوخسارێکی وێچوو و جلوبەرگێکی ڕازاوەوە. ناوی «جۆرج کیڤ Jeorge Cave بوو، واتە ڕاست ئەو کەسە کە لەنێو قەیرانی ئێران – کۆنتڕادا بوو.

ڕاستەڕێ بۆ لای چووم و گوتم: «هەلەو، جۆرج. حاڵتان چۆنە؟»

بە سەرسوڕمانەوە لێم ورد بۆوە و پرسی: «ئەتۆ لێرە چدەکەی؟»

«مەئمووریەتی دەوڵەتیم هەیە.»

«ئەمن نەمدەزانی، ئێوە دەستتان لەم کارەدا هەبووە؟»

«ئەمن سەربە هیچ لایەک نیم. ئەمن بۆ کاروباری خۆم هاتوومە ئێرە و لەنەکاو دەگەڵ کۆدەتا بەرەوڕوو بووم.»

گوتم: «بەڵێ، هەروایە کە دەفەرمووی. ئەدی ئارل بریان چی؟ ئەمن نەمدیوە، بەڵام ئەو هەمیشە دەگەڵ تۆ نیە؟»

ئەو بە ڕقەوە پێکەنی و گوتی: «ئارل دەبێ لێرە بێ. ڕێکخراوی نێونەتەوەیی چاپەمەنی زۆر ئۆگری بەدواداچوونی ئەم جۆرە ڕووداوانەیە.»

وەڵامێکم نەدایەوە. ئەمن ئەوەندە لە هاتنەپێشی ئەو ڕووداوانە ناڕەحەت بووم کە نەمدەزانی دەبێ پێبکەنم یان بگریم.

وا دیار بوو نەیتوانی بەرامبەر بە قسەکانم بێدەنگ بێ. بایدایەوە سەرم و گوتی: «پێویستە ئاگادارت بکەم کە ئەگەر کەسێک دەست لەو کارانە وەربدا کە ئێمە دەیانکەین، بێدەنگی دەکەین.»

نیوەڕۆی ڕۆژی دواتر، ئەمن لە پاڕاگواوە بەرەو دەرەوە فڕیم. کارێکی دیکەم لەدەست نەدەهات. لە فڕۆکەوە تەماشای شارم کرد، ماڵەکان و ئامرازە ماتۆڕییەکان سەرنجیان ڕاکێشام. مەئموورییەتەکەمان شکستی هێنابوو.

لە فڕۆکەخانەی «سانتیاگۆ»، «ژۆزێف ئۆتوول» نوێنەری کۆمپانیی FXC کە ماوەیەکی کەم پێش ئەوەی ئەمن بفڕم بۆ پاڕاگوا، گەیشتبووە «سانتیاگۆ»، پێشوازیی لێکردم. دوو ڕۆژ دواتر، ڕۆژی ٦ی فێوریە، ئێمە دەگەڵ ژەنراڵ «کلارک» چاومان پێک کەوت. هەرچەند دەمانزانی ئەمریکاییەکان، بابەتی موعامەلەی فڕۆکەکان پەسند ناکەن، بەوحاڵە هەوڵمان دا سەودایەکە تەواو بکەین. «ئۆتوول» لەوکاتەدا، وەک سەوداگەرێکی ئازاد کاری دەکرد و کاری بە ئاغا ئەمریکاییەکانی نەبوو.

لە دیدارێکدا کە دەگەڵ ژەنراڵ «کلارک»م هەبوو، ئەو هێندێ بابەتی باس کردن کە ترسی ئێمەی لە موعامەلەی فڕۆکەکان قایمتر کرد. ئەو گوتی: «حکوومەتی شیلی بڕیاری داوە، ڕێز بۆ قانوون و ڕێوشوێنە نێودەوڵەتییەکان دابنێ و خۆ لە فرۆشتنی فڕۆکە F-5Eیەکان بپارێزێ. ئێمە پێویستییەکمان بە فڕۆکەی کەفیر نیە و

لــەجیاتی وان، فرۆکــەی میــراژی ۲۰۰۰ دەکــڕین. کــەوابێ، ئێمــە ئیعتیبارێــک بــۆ ئیســرائیل ناکەینــەوە و کــەلک لــەو ئیعتیبــارەش وەرناگرین کە دوکتۆر ئۆمشی بۆ حکوومەتی شیلیی کردۆتەوە.»

ئــەمن لــە قســەکانی ژەنــڕاڵ «کــلارک»ڕا هەســتم کــرد کــە لــەنێو دەوڵەتــدارانی حکوومــەتی شــیلیدا، ململانەیــەک بــۆ دەســەڵات هەڵگیرساوە. پینۆشــێ دەگەڵ ژەنــڕاڵ «مــەتهی» و ژەنڕاڵ «ســتانگ» کە هەردووکیان بۆ گەیشتن بە سەرۆکایەتیی کۆمار خاوەنی هەستی بــەرزەفڕی بــوون، موخــالیف بــوو. ژەنــڕاڵ «کــلارک» کــە ســەرۆکی لۆژیستیکیی سوپا بوو، بە شێوەی سروشتی دەبوو گوێ لە فەرمانی هــەورازتر لــەخۆی، ژەنڕاڵ «مــەتهی» بگرتایە، بــەڵام چونکە پینۆشــێ ئــەوی لــەو پۆســتەدا دانــابوو، بــەو وەفــادارتر بــوو تــا «مــەتهی» و «ستانگ».

لە دەرفەتێکی گونجاودا، ئەمن داوام کرد چاوم بە ژەنڕاڵ «مـەتهی» بکەوێ، بێئەوەی «ئۆتوول» لەوێ بێ. ئـەم داوایـە بـە پەلـە جێبـەجێ بــوو. لــە دیدارەکــەدا «مــەتهی» بارودۆخەکــەی بــۆ ڕوون کردمــەوە و لێی زیاد کرد کە ئەو دەگەڵ سیاسەتی ئێستادا نیە.

ئــەو گــوتی، ئێســتا کــە پینۆشــێ لــە بەدەســتهێنانی دەنگــی گشــتیدا شکستی هێناوە، بۆی دەرکەوتوە کە ئەمریکاییەکان بۆ گەیشتنی بە پۆســتی ســەرکۆماریی شــیلی، پشــتیوانیی لــێ ناکــەن. بۆیــە بۆتــە دژی سیاســەتەکانی ئــەوان. ژەنــڕاڵ «مــەتهی» بــە پشــتیوانیی ئــەدمیراڵ «جۆســە مێرینــۆ کەســترۆ» Jose Merino Castro فەرمانــدەی هێــزی دەریایی، هەوڵی دەدا، فرۆشتنی کەرەسەی شــەڕ بــە عێراق بوەستێنێ و نەزەری کۆنگرەی ئەمریکا بۆ لای خۆی ڕاکێشێ. بۆ ئــەو مەبەستە، تێدەکۆشــا «ئێــدمۆن ماســـکی» Edmond Muski، یــەک لــە سیاســەتمەدارانی دێمــوکراتی ئــەمریکا، کــە یــەکێک لــە وەزیرانــی دەرەوەی پێشــووی ئــەمریکا بــوو، بکاتــە ڕاوێژکــاری خــۆی. بــەڵام «ماسـکی» پێشـنیارەکەی ڕەت کـردەوە. یـەکێک لـەو کەسـانە کـە لـە

دەفتەری «ماسکی» کاریان دەکرد، ئەم خەبەرەی لەقاو دا، بەڵام لەو کاتەدا، «مەتهی» هێشتا بە هیوای ڕاکێشانی کۆنگرەی ئەمریکا لەگەڵ «ماسکی» خەریکی وتوویژ بوو.

هەرچۆنی بێ، قسەکانی «ماسکی» بۆ من ئومێدبەخش بوون. ئەو هێشتا هیوادار بوو موعامەلەی فرۆشتنی فڕۆکە F-5Eیەکان تەواو بکا و ناردنی کەرەسەی شیمیایی شەڕ بۆ عێراق ڕابگرێ. لەو دەمەدا دیار نەبوو لەو ململانەیەدا کە لە شیلی لەسەر بەدەستهێنانی دەسەڵات هەبوو، کێ سەر دەکەوێ، بەڵام ئەگەر «مەتهی» لەو ململانەیەدا سەر بکەوتایە، مەئموریەتەکەی ئێمە بە سەرکەوتنەوە کۆتایی دەهات.

بەڵام ئومێدە دڵخۆشکەرەکانی من، کەمتەمەن بوون.

سەرەتای فێوریەی ١٩٨٩، «ڕابێرت گەیتس» بۆخۆی تەلەفونی بۆ «ناچووم ئەدموونی» سەرۆکی «مۆساد» کرد و گوتی، ئەمریکا موافیقی ئەو کارە نیە، کە ئیسرائیلییەکان لە شیلی دەیکەن. وا دیار بوو خەبەری نەخشەکانی ژەنراڵ «مەتهی» گەیشتبۆوە ڕێکخراوی حکوومەتی «جۆرج بووش» و بە «گەیتس» سپێردرابوو کە سەرپەرستیی بابەتەکە بگرێتە ئەستۆ. «گەیتس» لە «ئەدموونی»ی پرسی، داخوا ئەو ئاگاداری ئەوەیە کە لە پاراگوا ڕوویداوە، یان نا و دوایە وەبیری هێنایەوە کە ئەمریکا بۆ پاراستنی قازانجی خۆی هەر کارێکی بەفکریدا بێ،دەیکا. «گەیتس» هەروەها لە چالاکییەکانی من لە شیلی توورە بوو. ئەو لەلای «ئەدموونی»[٢٧] گلەیی کردبوو کە ئەمن

[٢٧]-ساڵی ١٩٨٩، «ناچووم ئەدموونی» دەستی لە سەرۆکایەتیی «مۆساد» کێشایەوە. ئەو یەکەمین سەرۆکی «مۆساد» بوو کە دەستلەکارکێشانەوەکەی لە ڕۆژنامە نێونەتەوەیییەکاندا بلاو کرایەوە. «ئەدموونی» بەهۆی خەراپحاڵیبوونێک کە دەگەڵ دەفتەری سەرۆکوەزیر پەیدای کرد، دەستی لە کار کێشایەوە. هەرچەند ئەو لەبارەی چۆنیەتیی خەرجی قازانجی فرۆشتنی کەرەسەی شەڕەوە دژایەتیی بۆچوونی سەرۆکوەزیری کردبوو و دەگەڵێ کەوتبووە باسکردنەوە و هەروەها

بوومە هۆی ئەوەی ڕۆژنامەی Financial Times تۆمەتگەلێک بەدژی «کاردۆئێن» چاپ و بڵاو بکاتەوە.

ئەم بابەتە تەواو ڕاست بوو. ئەمن بۆ ئەوەی سۆزی گشتیی خەڵکی دنیا بۆ لای ئیسرائیل ڕاکێشم، بوومە هۆی ئەوەی «باربارا» نووسراوێک لەبارەی چالاکییەکانی «کاردۆئێن» لە ناردنی کەرەسەی شیمیایی شەڕ بۆ عێراقەوە ئامادە بکا و بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە بی-نێرێ بۆ ئیدارەی ڕۆژنامەکەی خۆی. ئەو نووسراوە کە ١١ی نۆڤامبری ١٩٨٨ لەو ڕۆژنامەیەدا بڵاو بۆوە، یەکەمین نووسین بوو کە لەو بارەیەوە لە دنیادا چاپ و بڵاو کرایەوە. دوای ئەوە، ڕۆژنامەکانی Times و Independnt لە لەندەنیش، وتارگەلێکیان لە بارەی چالاکییە ناقانوونییەکانی «کاردۆئێن»ەوە لە بڵاوکراوەکانی خۆیاندا چاپ کرد. بێجگە لەوەش، لە مەیدانە خەبەرییە نێونەتەوەیی-یەکاندا بابەتەکە زار بە زار گەڕا. بەڵام، لەوکاتەدا، نووسینی «باربارا» تاقە نووسراو بوو کە پەردەی لەسەر عەمەلیاتی «کاردۆئێن» هەڵدەدایەوە و هەربۆیە، «گەیتس»ی تووڕە کردبوو. «گەیتس» بە «ئەدموونی»ی گوتبوو، تەنانەت ئەگەر ئەو نووسینە ڕاستیش بێ، بە هیچجۆر پێوەندیی بە ئەمریکاوە نیە.

«ئەدموونی» دواتر بە منی گوت کە وەڵامەکەی بۆ «گەیتس» سارد بووە. نووسینەکە پێوەندیی بە فرۆشتنی کەرەسەی شیمیایی شەڕ لە لایەن «کاردۆئێن»ەوە بە عێراق بوو و باسێکی لە دەست-بوونی ئەمریکا لەو بابەتەدا نەکردبوو. «ئەدموونی» باسی وتەیەکی عیبریی کرد، کە دەڵێ: «کڵاوی سەری دز ئاگر دەگرێ.» مەبەستی «ئەدموونی» لە هێنانی ئەم وتەیە، کەموزۆر ئەوە بوو کە ئەمریکایی-یەکان ویژدانیان گوناحکارە.

---

بەتوندی دژی نەخشی «ماکسوێل» لەو بابەتەدا بوو، پاش کشانەوە لە «مۆساد»، کرا بە ڕاوێژکاری نارەسمیی «شامیر» و لە کۆمپانییەکی نادەوڵەتییشدا کرایە بەڕێوەبەر.

«گەیتس» وەڵامی دایەوە کە دەوڵەتدارانی حکوومەتی شیلی - مەبەستی گرووپی سیاسیی سەربە ژەنراڵ «مەتهی» بوو- زۆر گوێ لە قسەی ئیسرائیلییەکان دەگرن و بۆیە دەبێ دەرسێک دابدرێن.

ئەو دەرسە کە «گەیتس» هەڕەشەی کردبوو، فێری دەوڵەتدارانی وڵاتی شیلیی بکا، بە زوویی جێبەجێ کرا. بەوجۆرە کە ڕێکخراوی خۆراکی و دەرمانیی ئەمریکا، سێ هێشووی چووکەڵە تریێی لە میلیۆن میلیۆن هێشووە تری کە ساڵانە لە شیلییەوە دەچێتە ئەمریکا، دۆزیەوە کە ژاریان لێدراوە. دەبێ لەبیرمان بێ کە وڵاتی شیلی هەر ساڵە بایی ٨٥٩ تا ٩٠٠ میلیۆن دۆلار ترێ دەنێرێتە ئەمریکا.

دوای ئەوە ڕێکخراوی خۆراکی و دەرمانیی ئەمریکا، هاتنی هەموو کەرەسەیەکی خواردەمەنیی بەرهەمهاتووی شیلی بۆ ئەمریکای قەدەغە کرد. دوکان و فرۆشگا گەورەکانی کەرەسەی خواردەمەنی لە سەرانسەری ئەمریکا،کەرەسەی خواردەمەنیی بەرهەمی شیلییان لە سەر مێزەکانی خۆیان خڕ کردەوە. لەسەر مێزی بەتاڵی دوکان و فرۆشگاکان کارتێک دانرابوو کە دەیگوت، بۆ پاراستنی سەلامەتیی کڕیارەکان، هێندێ شتوومەکی خۆراکیی بەرهەمی شیلی، کە ترسی ئەوە هەبووە ژاراوی بن، لەسەر مێزەکان لابراون.

ئاکامی ئەو کارە بۆ ئابووریی شیلی، کارەساتبار بوو. کاتێک ئەم بەرنامەیە جێبەجێ کرا، ئەمن هێشتا لە شیلی بووم. وەرزێرانی شیلی کە لۆرییە ترێیەکانیان هێنابوونە «سانتیاگۆ»، لەحاڵێکدا فرمێسک لە چاویاندا قەتیس مابوو سندووقە ترێیەکانیان بە خۆڕایی دەدا بە خەڵک. ئەو وەرزێرانە لە حکوومەتی ئەمریکا و هەروا حکوومەتی خۆشیان تووڕە و ڕەنجاو بوون و دەستیان دابووە خۆپیشاندان. ئەوان بەڕادەیەک نائومێد و دڵسارد ببوون کە نەیاندەزانی چبکەن. لەجیاتی ئەوەی پیاوانی پۆلیسی شێوەسەربازی گازی فرمێسکڕێژ بەو وەرزێرانەدا بدەن کە بەدژی پێنۆشی خۆپیشاندانیان وەڕێ خستبوو، ئەوە جووتیارەکان بوون کە ترێیەکەی خۆیان بەملا و

ئەولادا دەهاویشت. بەپێچەوانەی مێزی بەتاڵی فرۆشگاکانی ئەمریکا، فرۆشگاکانی شیلی، سندووقە ترێیەکانیان بەخۆڕایی بەجێ دەهێشتن. قیمەتی کەرەسەی خۆراکی لەنەکاو دابەزی و ژێرخانی ئابووریی وڵاتی شیلی کەوتە مەترسییەوە. هۆی تەواوی ئەو ڕووداوانەش تەنیا سێ هێشووە ترێ بوو.

ڕێکخراوی کەرەسەی خۆراکی و دەرمانیی ئەمریکا، هەوڵی دا ئورووپاییەکانیش قانیع بکا، کە هاتنی هەناردەی شیلی بۆ وڵاتەکانیان قەدەغە بکەن، بەڵام کاریگیان پێنەکرا.

ئەدمیراڵ «مێرینۆ» یەکێک لە چوار دەوڵەتداری گرنگی شیلی کە بەرپرسایەتیی ئیدارەی کاروباری ئابووریی وڵاتی لە ئەستۆ بوو، بەهۆی تەلەڤیزیۆنەوە هەوڵی دا، خەڵکی ئارام بکاتەوە و دڵنیایان بکا کە حکوومەت خەریکی لێکۆڵینەوەیە، بۆ ئەوەی هۆی ئەو قەیرانە بدۆزێتەوە. ئەو لە قسەکانیدا بەتایبەتی ئاماژەی بەو بابەتە کرد کە شیلی لەو بارەیەوە هیچ خەتایەکی نەکردوە و ئەم وڵاتە هەرگیز نە کەرەسەی ئالوودە بەرهەم دێنێ و نە میوەی ئالوودە بە ژار.

لە دەفتەری ژەنراڵ «مەتهی»یەوە تەلەفونم بۆ کرا کە دەسبەجێ بچمە وێ. کاتێک چاوم پێی‌کەوت، لێی‌پرسیم، ئەتۆ تا چ‌ڕادەیەک لە هۆی ئەم ڕووداوە ئاگاداری. ئەمن وردەکاریی وتووێژی گەیتس – ئەدموونیم بۆ ڕوون کردەوە. ئەو پێکەنینێکی ساردی هاتێ و گوتی: «ئەمنیش هەروای بۆ دەچم.» گومان نەبوو کە ئەو لە ململانەی دەسەڵاتدا شکستی هێناوە.

وڵاتی شیلی دەسبەجێ بە ئەمریکاییەکانی ڕاگەیاند کە فڕۆکە F-5Eیەکانی بە ئێرانییەکان نافرۆشێ. مانای ئەم قسەیە ئەوە بوو کە ئەوان پەیڕەوی لە خەتی ئەمریکاییەکان دەکەن و موعامەلە دەگەڵ عێراق درێژە پێدەدەن. ئەم هەنگاوە دەسبەجێ کاری خۆی کرد. لەنەکاو، مەسەلەی خواردەمەنیی ئالوودەی شیلی لەبیر چۆوە، قەدەغەی هاتنی کەرەسەی خۆراکیی شیلی بۆ ئەمریکا هەڵگیرا و

دووبـاره کەرەسـەی خـۆراکیی شـیلی لەسـەر مێـزی فرۆشـگاکانی ئەمریکا دەرکەوتەوە.

لێرەدا هەم CIA بردیەوە و هەم «کارلۆس کاردۆئێن.»

ئەمن لە ئوورشەلیمەوە تەلەفونم کرد و گوتم: «ئەمن دەبێ چبکەم؟ حـەز دەکـەن بەتـەنیا دەسـتبـەکار بـم و کارخانـەی کـاردۆئێن بتەقێنمەوە؟»

«پزنەر»گوتی: «برۆوە ماڵێ، ئاری.»

پێمگوت: «ئەمن بەتەواوی لە مەئمووریەتەکەمدا شکستم هێناوە.»

«پزنـەر» گـوتی: «ئـەتۆ پێرسـتێکی بەکـەلکت لـە نـاوی ئەوکەسـانە بەدەسـت هێنـاوە کـە موعامەلـە دەگـەڵ «کـاردۆئێن» دەکـەن و نـابێ لەبیرت بچێ کە ئەفریقای باشوور موعامەلە دەگەڵ عێراقی ڕاگرتوە».

ئـەمن سـەرم ڕاوەشـاند. بابـەتێکی دیکـە هـەبوو کـە کـاتی وتـووێژە تەلەفونییەکە، بەوم نەگوتبوو. پاش ئەوەی، بەدوای کۆدەتای پاڕاگوادا چوومـە «سـانتیاگۆ»، کاتێـک لـە دەوروبـەری ئەسـتێری هـۆتێلی «شێراتۆن سەن کریستۆ بێل» دەگەڕام لەنەکاو دیتم دووکەس لەوێ پێکەوە دانیشتوون. ئەم دووکەسە یەکیان ژەنڕاڵ «ڤێن دێر وێست هـووەیزن» بـوو و ئـەوی دیکـە «مـارک تاچـەر» ئـەوان لـە دەوری مێزێکـی کـانزایی سـپی، نزیـک بارەکـە دانیشـتبوون و دوو پـەرداخ خواردنەوەیان لەپێش بوو. لە پێکەنینەکەیان دەگەڵ یـەکترڕا، گومـانم نەما کە ئەمانە دۆستی یەکجار نزیکی یەکترن.

دواتر، دەرکەوت کە بۆچوونەکەم لەبارەی ئەواندا دروست بووە. لـە حاڵێکدا، وڵاتی ئەفریقای باشوور، موعامەلەی کەرەسەی شـەڕ دەگـەڵ عێراقـی ڕاگرتبـوو، ئـەم وڵاتـە دەگـەڵ شـیلی موعامەلـەی دەکـرد و ئەمـەش بەقـەد موعامەلـە دەگـەڵ عێـراق مەترسـیدار بـوو. ڕاپۆرتـە هەواڵگرییەکانی ئیسرائیل و هەڵسەنگاندنی ڕێکخراوە هەواڵگرییـەکانی دیکـە دەریـانخسـت کـە «مـارک تاچـەر» لـە ڕێگـای «کـاردۆئێن»ەوە درێژە بە ناردنی کەرەسەی جەنگی بۆ عێراق دەدا، هەموو پڕۆژەکـانی

مووشەکی ناوکیی عێراق بەهۆی ڕایەڵکەی «کاردۆئێن» و پڕۆژەکانی ئیحسان باربووتییەوە لە شیلی، جێبەجێ دەکران. «مارک تاچەر» دەگەڵ ئیحسان باربووتییش پێوەندیی زۆر نزیکی هەبوو. یەکی دیکە لە هاوکارانی ئیحسان باربووتی، سەوداگەرێکی دووڕەگەی (ئەمریکایی -لوبنانی)، بوو بەناوی «سەرکیس سۆگانالیان» sarkis Soganalian . کەسێکی دیکە کە لەوبارەیەوە هاوکاریی ئەمریکایی-یەکانی دەکرد، هاوقوتابخانەی کۆنی دووڕەگەی (ئەمریکایی-ئێرانی)ی من بوو، بەناوی «ڕیچارد بابایان». ئەم کەسە لە واشینگتۆن دی سی، ڕایەڵکەیەکی گەورەی بۆ هەناردەکردنی کەرەسەی شەڕ بۆ ئێران [عێراق ڕاستە. وەرگێڕ] بەڕێوە دەبرد. ئەو زۆر جار بە منی دەگوت: «ئەمن ئێرانییەکی نیشتمانپەروەرم و هەوڵم بۆ ئەوەیە ئێران لەدەست خومەینی ڕزگار بکەم.»

حکوومەتی ئیسرائیل لە ناردنی کەرەسەی شەڕ بۆ عێراق ناڕەحەت بوو. ئێمە دەمانتوانی چبکەین؟ «پزنەر» داوای لە من کرد، قسە بۆ سەرۆکانی ئێستا و ڕابردووی ڕێکخراوە هەواڵگرییەکانی ئیسرائیل بکەم. ئەمانە، کۆمیتەیەکیان بۆ جێبەجێکردنی بڕیارەکانی کابینە لەبارەی کاروباری هەواڵگرییەوە پێکهێنابوو و دەسەڵاتیان هەبوو بۆ جێبەجێکردنی بڕیارەکانی کابینە، لێکۆڵینەوەی پێویست بکەن و بەرنامە بۆ پڕۆژەی کرداری دابڕێژن. ئەندامانی ئەو کۆمیتەیە کە هەموویان لە کارگوزارانی هەواڵگری و جاسووسی پیشەیی بوون، دەسەڵاتی کوشتن یان زیندووهێشتنەوەی ئەو کەسانەشیان هەبوو کە بۆ ئەمنیەتی ئیسرائیل خەتەرناک بوون. ئەم گرووپە نهێنییە، دەیانتوانی بڕیار بدەن چکەسێک بۆ ئەمنیەتی دەوڵەتی ئیسرائیل مەترسیدارە، چکەسێک دەبێ زیندوو بمێنێ و کێ دەبێ بکوژرێ.

لە وتووێژەکانی ئەم کەسانە لەکاتی کۆبوونەوەکاندا پێشینەیەک هەڵنەدەگیرا. بەمجۆرە، هیچکام لە ئەندامانی ئەو کۆمیتەیە، وەک خۆیان بە بەرپرسی بڕیاری لەنێوبردنی کەسێک نەدەژمێردران.

ئەندامانی ئەو کۆمیتەیە لە سەرۆکانی پێشوو و ئێستای ڕێکخراوەکانی «شاباک»، «مۆساد»، هەواڵگریی سوپا و هەواڵگریی پۆلیس پێکهاتبوون. هەمووی ئەو ئەندامانە لە هەموو کۆبوونەوەکانی کۆمیتەکەدا ئامادە نەدەبوون، بەڵام بۆ پێکهێنانی کۆبوونەوەی کۆمیتە، ئامادەبوونی لانی کەم ٦کەس پێویست بوو.

مانگی مارسی ١٩٨٩، ئەمن لە ڕاپۆرتێکدا بارودۆخی شیلیم بۆ یەکێک لە کۆبوونەوەکانی کۆمیتە، کە لە ڤیلاکەی «مۆساد» پێک-هاتبوو شی کردەوە. هەرچەند ئەمن ڕاپۆرتەکەمم دەگەڵ هاوکارێک کە سەربە ڕێکخراوی «مۆساد» بوو، ڕێکنەخستبوو، بەڵام ڕاپۆرتی هەردووکمان لەبارەی «کاردۆئێن» و عێراقەوە وەک یەک بوو.

لەنێو ئەو کەسانەدا کە ئەو کۆمیتەیە، بە دوژمنی دەوڵەتی ئیسرائیلی دانابوون، کەسی پایەبەرزی وەک «ڕابێرت گەیتس» هەبوو. کەسانی دیکە کە ئەو کۆمیتەیە بە دوژمنی دەوڵەتی ئیسرائیلی ناسیبوون، بریتی بوون لە: ڕیچارد بابایان، جیراڵد بوول، ئیحسان باربووتی، کارلۆس کاردۆئێن، رۆدۆلفۆ ستانگ، کلێر جۆرج، ئاندرێ رۆدریگێز، بڕووس ریووپۆرت، گرووپێک لە پیاوانی بانکیی کاردۆئێن لە ئەمریکا و ژمارەیەک لە زانایانی ئەڵمانی کە دەگەڵ جیراڵد بوول و عێراق کاریان دەکرد. هێندێک لەو زانا ئەڵمانییانە تازە هاتبوونە مەیدانی چالاکییەوە، بەڵام بەشێکیان لە یەکەمین کوشتاری گرووپە زەبروەشێنەکانی «مۆساد» لە ئورووپا ڕزگاریان ببوو.

ئەمن یەکێک لەو بەشە لە ئەندامانی کۆمیتە نەبووم کە دەسەڵاتی بڕیاردان لەبارەی مەرگ و ژیانی کەسەکانیەوە هەبوو. داوا لەمن کرابوو کە تەنیا لە کۆبوونەوەکانی کۆمیتەدا بەشدار بم. کاتێک ئەندامانی کۆمیتە، دەیانەویست بڕیاری کۆتایی بدەن، داوا لەمن و لێکۆڵەرەکانی دیکە دەکرا کۆبوونەوەکە بەجێ بێڵین.

دوو ڕۆژ دواتر داوام لێکرا دووبارە لە کۆبوونەوەی کۆمیتەدا لە ڤیلاکەی «مۆساد» بەشدار بم و لەسەر ڕاپۆرتەکەم لەبارەی

شیلییەوە ڕوونکردنەوەی زیاتر بدەم. دواتر، کۆمیتە بڕیاری دا، ئیحسان باربووتی کە بە ڕەگەز میسری بوو، بەڵام لە ئەمریکا دەژیا، جیراڵد بوول، داهێنەری تفەنگی پێشکەوتوو کە لە بێلژیک دەژیا و ١٢ کەسی دیکە کە زۆربەیان زانایانی ئورووپایی بوون، بخاتە پێرستی ئەو کەسانەوە کە دەبوو تێرۆر بکرێن. بەڕواڵەت لەبەر ئەوەی «کارلۆس کاردۆئێن» لە دەوڵەتدارانی پلە یەکی شیلی نزیک بوو و مردنی هەڵلای لێ دروست دەبوو، چاوپۆشی لە کوشتنی کرا.

ئەگەرچی کۆمیتە بڕیاری دا کە تێرۆری کەسانی نێو پێرستەکە، دەسبەجێ دەست پێبکرێ، بەڵام شامیر، سەرۆکوەزیر کە نیگەرانی دژکردەوەی ئەمریکا لەوبارەیەوە بوو، دەستووری دا، ئێستا ئەو بڕیارەی کۆمیتە جێبەجێ نەکرێ. ئەو هەروەها لە دانانی «ڕابێرت گەیتس» و «ڕیووپۆرت» لە لیستی دوژمنانی ئیسرائیلدا سام گرتی.

سەرەتای ئاوریلی ساڵی ١٩٨٩، ئەمن بۆ دواجار بە مەبەستی کۆتاییهێنان بە کاروباری خۆم چوومە شیلی. کاتێک ئەمن لەوێ بووم، ژۆزێف ئۆتوول لە سەنتا ئاتای کالیفۆرنیاوە تەلەفونی بۆ کردم و گوتی سێ فڕۆکەی C-130 بەپێی بەرنامەی پێشترڕێکخراو بە تاران دەفرۆشرێن. ئەو هەروەها ڕوونی کردەوە کە ئێرانییەکیش بەهۆی «ڕیچارد سەنت فرەنسیس» Richard St. Francisەوە هاتۆتە نێو موعامەلەکە. «فرەنسیس» کاری بۆ«میک تیمپانی» و کۆمپانیی Trans Capital لە ئەیالەتی کێنێتیکات دەکرد کە ئامرازی کامپیۆتەری بۆ کەلکی «پرۆمیس» دەفرۆشت. «میک تیمپانی» لەوکاتەدا پێوەندیی دەگەڵ کۆمپانیی GMT پچراندبوو.

ئەمن گوتم، ئەو سەودایە سەر ناگرێ، چونکە دەگەڵ ئەوەی ئێرانییەکان پێشتر پووڵی فڕۆکەکانیان داوە، بەڵام چونکە نەیانتوانیوە ئازادیی سێ سەربازی ئیسرائیلی مسۆگەر بکەن، «شامیر»ی سەرۆکوەزیر بە فرۆشتنی فڕۆکەکان ڕازی نەبووە.

ئەو فڕۆکانە بەدەست ئیسڕائیلەوە بوون، بەڵام ئەمریکا ئەوانی بە هی خۆی دەزانی. چونکە تەکنۆلۆژیی ئەمریکا لە دروستکردنیاندا بەکار برابوو. ئاشکرایە کە ئیسڕائیل، دەیتوانی ئامراز و دەزگاکەلی ئەمریکایی کە تەکنۆلۆژییەکەیان ٢٠ ساڵ کۆن بوو، بفرۆشی. بەڵام، ڕوون نەبوو ئەو قاعیدەیە ئەو فڕۆکانەش دەگرێتەوە یان نا. چونکە، ئیسڕائیل ٨٥ دانەی لەو فڕۆکانە ساڵانی ١٩٨٥ و ١٩٨٦ هەریەکەی بە ٢٠٠٠٠٠ دۆلار لە ڤێتنام کە ئەوانی وەک دەسکەوتی شەڕ بەدەست هێنابوو، کڕیبوو.

«ئۆتوول» دەشیویست ١٢ فڕۆکەی C-130یش کە هی ئیسڕائیل بوون و لە کانادا ڕاگیرابوون، بکڕێ. ئەو فڕۆکانە بەهۆی کۆمپانیی Industis Northwestern لە «ئەدمۆنتۆن» Edmontonی «ئالبێرتا»Albertaوە نوێ کرابوونەوە. لەپێشدا، ئەو باسێکی لە کڕیاری ئەو فڕۆکانە نەکرد، بەڵام دوایە گوتی، کەسێک بە ناوی «لیتنێر» Lettner دەیەوێ بۆ ئێرانیان بکڕێ و ئەو گیروگرفتێک لەم کارەدا نابینێ. ئەمن بە «ئۆتوول»م گوت سەرۆکوەزیر «شامیر» مووافەقەت دەگەڵ سەودایەکی وا ناکا. لەلایەکی دیکەوە، ئەمن کەسێک بە ناوی «لیتنێر» ناناسم کە بیهەوێ ئەو فڕۆکانە بۆ ئێران بکڕێ.

«ئۆتوول» پێی داگرت کە ئەمن ئەو پیاوە ببینم و گوتی، ئەمریکاش بە فرۆشتنی ئەو فڕۆکانە ڕازییە. ئەمن تەلەفونم بۆ ئیسڕائیل کرد و یەکێک لە کارگوزارە پلەبەرزەکانی وەزارەتی بەرگری پێیگوتم، «ئۆتوول» دیسامبری ١٩٨٨ لە ئیسڕائیل بووە و قسەی لەگەڵ کەسانی سەربە حیزبی کرێکار و کاربەدەستانی وەزارەتی بەرگری کردوە. بیستنی ئەم بابەتە بۆ من سەرسوڕهێن بوو. لەڕاستیدا پێم وابوو «ئەو ماستە بێموو نیە.»

تەلەفونم بۆ سەرهەنگ جەلالی، وەزیری بەرگریی ئێران کرد و لێم-پرسی داخوا کەسێک بە ناوی «لیتنێر» دەناسێ، یان خەبەرێکی

لەبارەی موعامەلە دەگەڵ ئەمریکاوە بیستوە. جەلالی، وەڵامی دایەوە کە هەرگیز ناوی «لێتنێر»ی نەبیستوە و جگە لەو سێ فڕۆکەیە کە قەرارە ئێران بە هۆی منەوە لە ئیسرائیلیان بکڕێ، ئاگای لە هیچ سەودایەکی کڕین و فرۆشتنی فڕۆکەی C-130 نیە.

قەرار بوو پاشنیوەڕۆی ڕۆژی ٢٠ی ئاوریلی ١٩٨٩، لە ماڵێکی «پاراموس»ی نیووجێرسی چاوم بە «ڕابێرت گەیتس» بکەوێ. ئەم دیدارە بە هۆی دەفتەری سەرۆکوەزیری ئیسرائیلەوە ڕێکخرابوو و ئامانجی ئەوە بوو بۆ دواجار داوا لە «گەیتس» بکرێ کە فرۆشتنی کەرەسەی شەڕ بە عێراق ڕابگیرێ. بە پێشنیاری «پزنەر» کە زۆری پێخۆش بوو مەتەڵۆکەی «لێتنێر» هەڵێنرێ، ئەمنیش دەگەڵ «ئۆتوول» وامان دانابوو کە پاش ئەوەی دەگەڵ دوو پارێزەرەکەم لە شیلییەوە گەیشتمە نیۆیۆرک، لە فڕۆکەخانەی کەنەدی چاوم بە «لێتنێر» بکەوێ.

سەری سەعاتی دیاریکراو، پیاوێکی مووخۆڵەمێشی، کە دەیەی چل ساڵەی تەمەنی بەسەر دەبرد و جلوبەرگێکی ڕێکوپێکی ئورووپایی دەبەردا بوو، هاتە لام. ئەمن هەرگیز کەسێکی وام نەدیبوو. ئەو خۆی بە ناوی «ڕیچارد سەنت فرەنسیس» کە لە ئەیالەتی کێنێتیکات خەریکی موعامەلەیە، بە من ناساند. ئەو داوای لێکردم بچینە باری قاوەخواردنەوەی نهۆمی سەرەوە و لەوێ دەگەڵ «لێتنێر» نوێنەری ئێرانییەکان دیدار بکەم. گوتم، زۆر باشە و چووینە وێ. باڕی قاوەکە زۆر قەرەباڵغ بوو. دوای ئەوەی قاوەمان داوا کرد، پیاوێکی زۆر قەڵەو بەرەو ئێمە هات و دەستی بۆ لای من درێژ کرد. بەڕاستی دەستێک بوو کە دەیتوانی میلە ئاسنێک بشکێنێ. ئەم کەسە بە دڵنیایی نەیدەتوانی مامۆستای ڕۆژی یەکشەممەی قوتابخانە بێ. (مامۆستای ڕۆژی یەکشەممەی قوتابخانە کەسێکە کە خەڵکی دیکە فێری ڕێوشوێنی ئایینی دەکا. مترجم فارسی)

ئەو خۆی بە ناوی «لێتنێر» ناساند.

لەحاڵێکدا چاوم دە چاویەوە بڕیبوو، گوتم: «ئەتۆ بەڕاستی کێی و چیت دەوێ؟ ئەمن تەلەفونم بۆ وەزیری بەرگریی ئێران کرد، دەڵێ تا ئێستا ناوی تۆی نەبیستوە.»

ئەو گوتی: «ئەم قسەیە پووچە. ئەمن هەر ئێستا لە تارانەوە دێم و لەوێ دیدارم دەگەڵی هەبووە.»

پێمگوت، ئەگەر قەرار بێ فڕۆکەی C-130 بە ئێران بفرۆشرێ، دەبێ حکوومەتەکانی ئەمریکا و ئیسڕائیل ئەو موعامەلەیە پەسند بکەن. جگە لەوەش ئیسڕائیل پێویستیی بە مۆڵەتنامەی ساختەی دوابەکارهێنانی ئەو فڕۆکانە نیە. حکوومەتەکانی باسمان کردن، بۆخۆیان مۆڵەتی دوابەکارهێنانی فڕۆکەکان دەردەکەن.

ئەمن گومانم نەبوو کە ئەو کابرایە کارگوزارێکی نهێنیی هەواڵگرییە و گفتوگۆکانی منی لەسەر شریت تۆمار دەکرد. بۆمن مسۆگەر بوو کە ئەو دەیەوێ بەتەڵەمەوە بکا.[۲۸] چالاکییەکانی من لە ئەمریکای باشوور، زۆر کەس و یەک لەوان «ڕابێرت گەیتس»یان نارەحەت کردبوو. ئەمن هەوڵم دەدا، لە قسەکانمدا ئاماژە بەو بابەتە بکەم کە قەرار بوو، لە سەعاتەکانی دواتری ئەو ڕۆژەدا چاوم بە «ڕابێرت گەیتس» بکەوێ.

بە «لیتنێر»م گوت، ئەگەر ئەو نوێنەری وڵاتێکی دیکەیە و دەیەوێ موعامەلە بۆ ئێران بکا، دەبێ کەسایەتیی خۆی ئاشکرا بکا و سەرۆکوەزیری ئیسڕائیلیش دەبێ موعامەلەکە پەسند بکا. ئەگەر وا نیە و ئەو درۆ دەکا، دەبێ وریای خۆی بێ.

---

[۲۸]-وەک دوایە لە دادگا پێی لێنا، ئەو کارگوزاری نهێنیی خزمەتە گومرکییەکانی ئەمریکا و ناوی ڕاستەقینەشی «جان لیسکا» John Licica بوو.

ئەم بابەتە لە شریتێکدا کە لە دادگا نیشان درا، تۆمار نەکرابوو «لیتنێر» پێی لێنا کە هۆی نەبوونی ئەو بابەتە لە شریتەکەدا ئەوە بووە کە نەیتوانیوە، بێئەوەی ببینرێ، شریتەکە بگۆڕێ.

دوایە هەستام و لە قاوەخانەکە دەرکەوتم. لەوێ لیمووزینێکم گرت و لە حاڵێکدا دوو پارێزەرەکەم و کەلوپەلەکەم لەوێ بەجێ هێشت، چوومە فڕۆکەخانەی «نیۆئارک» Newark. ئەوێ زۆر لە «پاڕاموس» دوور نەبوو. لە فڕۆکەخانەی «نیۆئارک»ەوە بە تاکسی چوومە ماڵەکە و ڕاست سەعات ٢ی پاش نیوەڕۆ گەیشتمە وێندەرێ. ئەوێ ماڵێکی ئاسایی بوو، لە پێشەوەی باغێکی چووکەڵەی گوڵ و لە پشتەوەشی باغێکی دیکە هەبوو.

زەنگی دەرگام لێدا. «ڕابێرت گەیتس» دەرگای لێکردمەوە. ڕۆژێکی گەرمی بەهار بوو. «ڕابێرت گەیتس» کراسێکی سپیی قۆڵ-کورتی یەخەئاوەڵا و پاتۆڵێکی شینی دەبەردا بوو و جلیقەیەکی لەسەر کراسەکەیەوە دەبەر کردبوو. ئەو ڕێنوێنیی کردم بۆ ژووری دانیشتن. بۆنی قاوەی تازەدروستکراو لە ئاشپەزخانەوە دەهات. ئەو قاوەی بۆ خۆشی و بۆ منیش هێنا. وەک ئەوە نەدەچوو خانووەکە هی خۆی بێ. بەڵام وا دیار بوو لەو ماڵە ئاسوودەیە. ئەمن لەبارەی ئەو کەسەوە کە ئەو ڕۆژە دیتبووم و شکوگومانم لەسەری، دەگەڵ «گەیتس» دەستم بە قسە کرد.

ئەو گوتی: «نیگەرانی ئەم بابەتە مەبە.»

«بەڵام ئەمن بەڕاستی نیگەرانی ئەم بابەتەم. ئەو دەیەویست من بخاتە تەڵەوە و هەوڵی دەدا هانم بدا لەسەر فرۆشتنی ناقانوونیی فڕۆکە بە ئێران موافەقەت نیشان بدەم و ئەم وتووێژەشی تۆمار دەکرد.»

ئەو بە ئاماژەی دەست هەوڵی دەدا تێمبگەیەنێ کە ئەم بابەتە، ڕووداوێکی نەخوازراو و لابەلا بووە کە دەبێ لەبیر بچێتەوە. ئەمن ئیدی لەسەر بابەتەکە نەڕۆیشتم، بەڵام نەمدەتوانی ئەو بابەتە لەبیر بەرمەوە کە دیدارەکەی بۆ پێکهاتبوو، و دووبارە مەسەلەی فرۆشتنی کەرەسەی شیمیایی شەڕ بە عێراقم هێنایەوە گۆڕێ.

ماوەی پتر لە ٢ سەعات ئەوەی لەسەر چالاکییەکانی «کاردۆئێن» و مەترسییەک کە عێراق بۆ ئیسرائیلی پێکهێنابوو،قسەم بۆ

«گەیتس» کرد. دیارە ئەو هەموو وردەکاریی مەسەلەکەی پێشتر بیستبوو، بەڵام بە حەوسەلە و بێئەوەی قەولی ئەنجامدانی هیچ کارێک بدا، گوێی دایە قسەکانم. سەعات ٤،٣٠ی دوای نیوەڕۆ، پێم-گوت دەبێ بڕۆم. دەمزانی قسەکانم هیچ کاریگەرییان نەبووە. ئەو تەلەفونی کرد، تاکسییەک بێتە وێ و ئەمن ئەوێم بەرەو فڕۆکەخانەی «نیۆئارک» بەجێهێشت.

ئێمە پێشتر بۆ چوونی لەندەن جێمان لە فڕۆکە گرتبوو و دوو سەعات پێش کاتەکە چووینە لای بەرپرسی پێوەندیدار. ئەو گوتی کەسێک جێگرتنەکەی ئێوەی بەتاڵ کردۆتەوە. گوتم بلیتەکانی ئێمە پێشتر پەسند کراون. بەرپرسەکە تەلەفونی بۆ سەرووتر لە خۆی کرد و ئەو دەستووری دا فڕینەکەمان پەسند بکرێ. ئەمن چەند ڕۆژ لە لەندەن مامەوە و دوایە گەڕامەوە ئیسرائیل.

لێرەدا مەئمووریەتی شیلی لە مێژووی ژیانی مندا بەستر‌ا، مەئمووریەتێک کە تووشی شکست هاتبوو. بەڵام، دەبێ بزانین ئەگەر گوشارەکانی ئیسرائیل نەبوونایە، پاشەکەوتی کەرەسەی جەنگیی عێراقییەکان چەند هێندە ترسناکتر و مەرگبارتر لەوە دەبوو.

وەک دەزانین ئەو مووشەکە سکادانە کە عێراق لە شەڕی کەنداوی فارسدا بەکاری هێنان، نەیاندەتوانی کڵاوەی قورسی شیمیایی هەڵبگرن. هۆیەکەی ئەوە بوو کە ئەو زانایانەی قەرار بوو، کڵاوە شیمیاییەکان بۆ سەددام ئامادە بکەن، پێش تەواوکردنی کارەکە، بەهۆی ڕێکخراوی هەواڵگریی ئیسرائیلەوە لەنێو بران. یەکێک لەو زانایانە، «جیراڵد بوول» بوو کە بەهۆی ئیسرائیلییەکانەوە کوژرا و تەرمەکەی لە مارسی ١٩٩٠دا لە ئاپارتمانەکەی لە شاری بڕۆکسێل دۆزرایەوە.

سەرمایەی ڕەشی ئیسرائیل بێ بەهرە گەیشتبووە ٦٠٠ میلیۆن دۆلار و بەبێ مەترسی لە بانکەکانی ولاتانی بلووکی خۆرهەلاتدا دەپارێزرا. سەرمایەی ڕەشی CIAش بەبێ بەهرە ٦٠٠ میلیۆن دۆلار بوو و لە بانکەکانی دەرەوەی ئەمریکا دانرابوو. تێکڕای ئەو دووانە، سەرمایەیەک بوو، دەورووبەری ١\١٢ میلیارد دۆلار. ئەمریکاییەکان هەرگیز ڕێگایان بە خۆیان نەدەدا، پێی لێبنێن کە سەرمایەیەکی وایان هەیە. سالی ١٩٨٧، کە بەربژێریی «ڕابێرت گەیتس» بۆ سەرۆکایەتیی CIA شکستی هێنا و ئەمریکاییەکان دیتیان ئازاریان پێدەگا، ئەوانەی لە واشینگتۆن دەسەلاتیان بەدەستەوە بوو، بڕیاریان دا، خۆیان لەو پارەیە بە دوور بگرن.

ئەمریکاییەکان دەگەل دەفتەری سەرۆکوەزیر «شامیر» لەبارەی ئەو پوولەوە کەوتنە گفتوگۆ و بڕیار درا، ئەوان ناوی ئیسرائیل لەسەر پوولەکەیان دابنێن، بەلام خاوەندارەتییەکەی هەروەک پێشوو بۆخۆیان ڕابگرن. ئەوکاتە کە ئەمن ئەندامی کۆمیتەی هاوبەشی ئێران – ئیسرائیل بووم، یەکێک بووم لە سێ کەس کە بۆ کەلکوەرگرتن لەو دراوە هەقی ئیمزایان هەبوو. ئێستا، بەوجۆرە، پوولی CIAش دەکەوتە بەر ئیمزای من. دوو کەسی دیکە کە بۆ کەلکوەرگرتن لەو پوولە هەقی ئیمزایان هەبوو، بریتی بوون لە «ناچووم ئەدموونی» سەرۆکی «مۆساد» و یەکی دیکە لە ئەندامانی ئەو ڕێکخراوە.

ئەمن لە بوونی ئەو دەسەلاتە زۆر خۆشحال بووم. تەنیا نیگەرانیم ئەوە بوو کە ئەمریکاییەکان بەهۆی ئەو ناڕەحەتییانەی لە ئەمریکای باشوور بۆم دروست کردبوون، وەلام بنێن. دوا چاوەڕوانی کە ئەمریکاییەکان لەمنیان هەبوو ئەوە بوو کە ئەو فرتوفێلەی لە فرۆشتنی «پرۆمیس» لە سەرانسەری دنیادا بەکار برابوو، لەقاو بدەم. ئەوان هەڕەشەیان لێکردبووم کە ئەگەر ئەوکارە نەکەم، بۆ ڕاگرتنی فرۆشتنی کەرەسەی شەڕ بە عێراق، هیچ کارێک ناکەن. بەلام بە لەبەرچاوگرتنی ئەوە کە تاڕادەیەک کۆنترۆلم بەسەر پارەکەیانەوە

هەبوو، نەمدەزانی دەتوانن چکارێک بە دژی من ئەنجام بدەن. ئەوان پێشتر بە قورمیشکردنی دۆستی تازەم «لێتنێر» چنگ و ددانیان بە من نیشان دابوو.

ساڵی ۱۹۸۸، بڕێکی زۆر لە سەرمایەی ڕەش وەکار کەوت. لە کۆتایی ئەو ساڵەدا، «ڕابێرت ماکسوێل» پێوەندیی بە «ئیسحاق شامیر»ەوە گرت و داوای لێکرد بۆ وەرگرتنی قەرز بە مەبەستی پەرەپێدانی ئیمپەڕاتۆرییە چاپەمەنییەکەی، گەرەنتییەکی پێبدرێ. «ئیسحاق شامیر» بڕیاری دا، ئەگەر ئەمریکاییەکان ڕازی بن، لە پووڵەکانی وان بۆ گەرەنتیکردنی قەرزی «ڕابێرت ماکسوێل» کەلک وەربگرن. بەپێی قسەی «ئەوی پزنەر»، سێناتۆری پێشووی ئەمریکا «جان تاوەر» لەلایەن ئەمریکاییەکانەوە، ئەم ڕێگەیەی بە «شامیر» دا.

بەبڕی یەک میلیارد دۆلار گەرەنتی کە بۆ قەرزی «ماکسوێل» تەرخان کرا، ئەو چەندین میلیۆن دۆلاری قەرز لە بانکە جۆراوجۆرەکان وەرگرت و ساڵانی ۱۹۸۸ و ۱۹۸۹ دەستی بە عەمەلیاتێکی گەورە کرد. ئەو کۆمپانییەکی موخابەراتیی لە ژاپۆن کڕی و هەوڵی دا، ڕۆژنامەی The Aje لە مێلبۆڕن melbourneی ئوسترالیا بە ۷۵۰ میلیۆن دۆلار بکڕێ و بڕی ۲۳۰ میلیۆن دۆلاریشی بۆ کڕینی پتر لە سەدی ۵۰ی بەشەکانی ڕۆژنامەی مەعاریف لە ئیسرائیل پێشنیار کرد، بەلام حکوومەتی کرێکاری ئوستڕالیا، بەپێی سیاسەتی خاوەندارێی دەرەکیی خۆی دژی ئەو کارە ڕاوەستا.

«ماکسوێل» لە ڕێگای ئەو هەموو کۆمیسیۆن (دەستخۆشانە)یەوە کە لە کڕین و فرۆشتنەکانی دەگەڵ ئیسرائیل وەریدەگرت ڕادەیەکی یەکجار زۆر لە قەرزەکانیی دایەوە. لەوکاتەدا، ئەم سەوداگەرە بریتانیاییە کە ئیددیعای دەکرد، لە چێکوسلۆڤاکی لەدایک بووە، بەوپەڕی کامەرانییەوە دەژیا. بەلام لەسەریەک، بارودۆخی وی جێگیر نەبوو. ئەو گەرەنتییانەی ببوونە پشتیوانی قەرزەکانی، دەبوو هەر

سێ مانگ جارێک تازە بکرێنەوە و لە کاتی تازەکردنەوەی گەرەنتینامەکاندا، عادەتەن ئێمە پووڵەکەمان لە بانکە جۆراوجۆرەکاندا جێگۆڕکێ پێدەکرد. ئێمە ئەو سێ کەسە کە بۆ کەلکوەرگرتن لەو پووڵانە، مافی ئیمزامان هەبوو، بە سادەیی دەمانتوانی بە ئیمزای پەڕەکاغەزێک، یەک میلیارد دۆلار بگوازینەوە بانکێکی دیکە و بەم-جۆرە بە خۆبواردن لە ئیمزای گەرەنتینامەی قەرزەکان گەڕانی کاروباری ماڵیی «ماکسوێل» بوەستێنین، بەڵام، دیارە هێشتا ئەو فکرە بە مێشکماندا نەهاتبوو.

شەوێک لەنێوەڕاستی ساڵی ١٩٨٩دا، کاتێک ئەمن دەگەڵ «ئۆرا» و «شیرا»ی کچمان لە ماڵێ بووم، بیرم لە ڕووداوە سەرسوڕهێنەکانی چەند ساڵی ڕابردوو کردەوە. ئەمن لە دوارۆژ دەترسام. سەدان میلیۆن دۆلار لە فرۆشتنی پەنامەکیی تەگەرە فڕۆکەکان خڕ کرابۆوە. هیچکەس لەبیری ئەوەدا نەبوو کە لەوانەیە سەرەنجامی ئەو موعامەلە نهێنییانە ڕۆژێک بتەقێتەوە و ئاگرەکەی هەرنەبێ لە داوێنی من بە ربێ.

ئەمن کارەکەمم سەردەمێک کە لاوێکی ٢٩ ساڵەی سادە و خوێنگەرم بووم دەگەڵ گەورەکانی ڕێکخراوی هەواڵگریی ئیسرائیل بە هیوا و ئاواتێکی زۆرەوە دەست پێکرد. سەرەتا بارە نێونەتەوەیی-یەکانی کارەکە بۆ من هەژێنەر بوون، ئەو پووڵانەی لە چالاکییەکاندا دەهاتنە گۆڕێ، سەرسوڕهێن بوون و هەموو ئەو کارانەش بۆ قازانجی ئیسرائیل کە ئەمن بە قووڵی باوەڕم پێی هەبوو، ئەنجام دەدەران. ئەمن هەستم دەکرد لە ناوەندی ئەو چالاکییانەدام و دەبمە هۆی دروستکردنی ڕووداوگەلی گرنگ لە جیهاندا. بەڵام، لە ساڵانی ١٩٨٥ و ١٩٨٦دا تێگەیشتم کە بۆچوونەکەم هەڵە بووە و ئەمن تەنیا جێبەجێکەری سیاسەتی کەسانی دیکە بووم. بەمجۆرە هەژانەکەی پێشوو لەبەین چووبوو و ئەمن لە کارەکەم ماندوو ببووم. لە موعامەلەی کەرەسەی شەڕدا ئەمن دەبوو دەگەڵ کەسانی زۆر

ناپاکی وەک «ڕابێرت ماکسوێڵ»، «ڕۆدلفۆ ستانگ» و «کارلۆس کاردۆئێن» تێکەوم. کاتێک ئەمن لە پێوەندییەکانی ئیسرائیل دەگەڵ ئەفریقای باشوور ئاگادار بووم، لە کارەکەم دڵساردتر بووم. هەموو ئەو بارودۆخە قورسایی دەخستە سەر ویژدانی من. ئەمن وەک لاستیکێکم لێهاتبوو کە لەڕادەبەدەر کێشابوویان و خەریک بوو بە یەکجاری بپسێ.

هێندێ وەخت بیرم دەکردەوە، لە کارەکەم بکشێمەوە، ئەو پارەیە کە یەک لە سێی کۆنترۆڵەکەیم بەدەستەوە بوو، لەبیر بەرمەوە و کارێکی ئەمنتر بۆخۆم پەیدا بکەم. بەڵام، لەلایەکی دیکەوە دەمزانی کە بەڕاستی ئەم کارەم بۆ ناگونجێ. لەوەش بگوزەرێ، ئەمن بێ ئەندازە لە ڕەمز و نهێنییەکانی جیهان ئاگادار ببووم.

ئەگەرچی «ئیسحاق شامیر»ی سەرۆکوەزیر، وەک کەسایەتییەکی نیشتمانی و هەمووانی دەهاتە بەرچاو، بەڵام بەڕاستی ئەو لە دنیای خۆیدا دەژیا. ئەو خەباتی نهێنیی بەدژی ئینگلیزییەکان دەکرد و پاشان پاشماوەی تەمەنی لە ڕێکخراوی «مۆساد»دا سەرف کردبوو و لە ئورووپا کرابوو بە سەرۆکی عەمەلیاتی ئەو ڕێکخراوە و لەبەر ئەوە، فێر ببوو کە نابێ متمانە بە خەڵک بکا. بێمتمانەیی ناوبراو بە خەڵکی دیکە لە چۆنیەتیی ئەو ئەرکانەڕا کە لە پۆستی سەرۆکوەزیریدا ئەنجامی دەدان، بە باشی دیار بوو. چونکە زۆر لە بڕیارەکانیی تەنانەت لە ئەندامەکانی حیزبی خۆشی دەشاردەوە. «شامیر» پاراستنی ڕەمز و ڕازی پۆستەکەی لە ئەزموونەدا فێر ببوو. ئەو هێندێ لە نهێنییەکانیی تەنیا دەگەڵ ڕاوێژکارە جێمتمانەکانی دەهێنانە گۆڕێ، کە ئەمن یەکێک لەوان بووم. بۆنموونە، تەنیا ئەمن ژمارە حیسابی بانکیی «بەعیر»ی کوڕی «شامیر»م دەزانی. ئەو حیسابە لە ساڵی ١٩٨٧ەوە کرابۆوە و دەستی بە کار کردبوو. ئەمن دەمزانی کە «شامیر» هێندێ وەختان، کاروبارێکی کە پێی وابوو بە سوودی ئیسرائیلە، بێ ڕەزامەندیی کابینە جێبەجێ دەکرد. یەکێک لەوانە،

ناردنی من بۆ وڵاتی پێڕوو، بۆ پەیداکردنی کەرەسەی پێویست بۆ بەرهەمهێنانی چەکی ناوکی بوو.

ئەمن هەروەها ئاگاداری نیزیکیی «شامیر» لە شوورەوییەکان بووم. لە ساڵی ١٩٨٤ەوە دەستووری دابوو، دەنگوباسی هەواڵگری و جاسووسیی ئیسرائیل، یەک لەوان ڕاپۆرتە پاڵاوتەکانی هەواڵگریی ئەمریکایی‌یەکان لەبارەی بابەتە ئەتۆمییەکان و هەروەها ڕاپۆرتی هەڵسەنگاندنی ئەمریکایی‌یەکان لە تەکنۆلۆژیی ئەتۆمیی شوورەوییەکان، دەگەڵ ئەم وڵاتە دان و ستانیان پێ‌بکرێ. ئەم ڕاپۆرتانە تاڕادەیەک لە ڕایەڵکەیەکی جاسووسی دەست دەکەوتن کە «ڕافی ئەیتان» لە ئەمریکا پێکی هێنابوو. یەکێک لە کۆبوونەوەکانی دان و ستاندنی دەنگوباسی هەواڵگری لە نیوودەلهی، لەنێوان KGB، «مۆساد» و ڕێکخراوی هەواڵگریی هیندوستاندا، بە مەبەستی باس لەبارەی ڕێئاکتۆری ئەتۆمیی پاکستان و حەزی هیندوستان بۆ لەنێوبردنی، پێکهات. ئەم نەتەوانە، هەرسێکیان لە بەرنامەی ئەتۆمیی پریزیدێنت زیائولحەق تۆقیبوون. دیارە ئەمریکایی‌یەکان ئاگایان لە چۆنیەتیی بەرنامەی ئەتۆمیی پاکستان هەبوو، بەڵام وەک پاداشێک بۆ پشتیوانیی پاکستان لە موجاهیدینی ئەفغانستان، چاویان لە بەرنامە ئەتۆمییەکانی پاکستان نووقاندبوو. «شامیر» کۆمەگی ماڵیی لیبیا بۆ تەیارکردنی هێندێک لە وڵاتانی کە ناوی نرابوو «بۆمبی ئیسلامی»، بە ئەندازەی بەرنامەی ئەتۆمیی عێراق بۆ ئەمنیەتی ئیسرائیل بە مەترسیدار دەزانی. خاڵی زۆر سەرسوڕهێن ئەوە بوو کە ئەمریکای هاوپەیمانی ئێمە و دۆستەکانی وەک پاکستان و عێراق، لەبارەی کەرەسەی ئەتۆمیی شەڕەوە، پێکەوە بە دژی ئیسرائیل ڕیزیان بەستبوو و بۆیە «شامیر»یان ناچار کردبوو پشتیوانیی شوورەوی بۆلای خۆی ڕابکێشێ.

ساڵی ١٩٨٦، پاش ئەوەی «چبریکۆف» و «شامیر» لەبارەی کۆچی جوولەکەکانی شوورەوی بۆ ئیسرائیلەوە ڕێک کەوتن، هەڵەڕژانی

دەنگوباسی هەواڵگریی ئیسرائیل بۆ شووروەوی، زۆرتر لە پێشوو پەرەی گرت. ئیسرائیل بە ڕێکوپێکی دەگەڵ شوورەوییەکان لەبارەی تواناکانی ولاتانی عەرەبی لایەنگری ئەمریکا -عەرەبستانی سعوودی، ئۆردۆن، میسر و تەنانەت عێراقەوە کە شوورەوی کەرەسەی شەڕی بۆ دەنارد، خەریکی دان و ستاندنی دەنگوباسی هەواڵگری بوو. شوورەوییەکانیش بەنۆرەی خۆیان هەتا ساڵی ١٩٨٩ بەهۆی ڕایەڵکەی هەواڵگریی خۆیانەوە لە عێراق، چۆنیەتیی کەرەسە شیمیایی و ئەتۆمییەکانی عێراقیان دەدایە ئیسرائیل. شوورەوییەکان هەروەها ڕاپۆرتی پێوەندییەکانی ئەمریکا و ولاتانی دیکە دەگەڵ عێراقیان دەدایەوە بە ئیسرائیل.

ئیسرائیل بەڕاستی پێوەندیی زۆر دۆستانەی دەگەڵ شوورەوی هەبوو و بەتایبەتی دوای ئەوەی ئیسرائیلییەکان، پووڵی «سەرمایەی ڕەش»یان ناردە بانکەکانی بلووکی خۆرهەلات، ئەو پێوەندییانە زیاتر بوون. «شامیر» و ئەندامانی دیکەی کۆمیتەی هاوبەشی ئیسرائیل – ئێرانیش دەگەڵ «چبریکۆف» زۆر لێک نزیک کەوتنەوە. لە ئاکامی ئەو پێوەندییانەدا کە ئیسرائیل دەگەڵ بلووکی خۆرهەلات پەیدای کردن، ئەمن دواتر بە لایەنگری لە شوورەوی تۆمەتبار کرام.

یەکێک لەو نهێنییانە کە «شامیر» بە باشترین شێوە لە خەڵکی دیکەی دەشاردەوە، هەوڵی نهێنیی خۆی بۆ پێوەندی دەگەڵ PLO و چارەسەری کێشەی فەلەستینییەکان بە فۆرمووڵی تایبەتیی خۆی بوو.

بە پێچەوانەی ئەوەی هەمووان پێیان وابوو، لەنێوان PLO و «شامیر»دا دوژمنایەتی هەیە، ڕێبەرانی PLO و «شامیر» هەر دوو لا لەسەر ئەوە هاوڕا بوون کە کلیلی ئاشتی لە خۆرهەلاتی نێوەڕاست ئەوە نیە کە ئیسرائیل لێوارەی خۆرئاوا و کەرتی غەززە ئازاد بکا، بەڵکوو ئاشتی کاتێک لە خۆرهەلاتی نێوەڕاست پێکدێ کە ئیسرائیل ڕێگا بدا، فەلەستینییەکان لە سەرزەمینی ئۆردۆن، دەوڵەتێکی ئازاد بۆخۆیان دامەزرێنن.

دەوڵەتی ئۆردۆنی هاشمی، لەجێدا بەهۆی دوژمنایەتی و کینەیەک کە لەنێو کوڕەکانی پادشای سعوودی، سعوود بن عەبدولعەزیزدا لەسەر جێنشینیی ئەو هەبوو، دامەزرا. بەوجۆرە کە بریتانیایییەکان کە کۆنترۆڵی ئەو ناوچەیەیان لەدەستدا بوو، بۆ ڕازیکردنی کوڕەکانی سعوود بن عەبدولعەزیز بەشێک لە سەرزەمینی فەلەستین و بەشێک لە شێوەدوڕگەی عەرەبستانیان پێکەوە لکاند و شانشینێکی تازەیان بەناوی ئۆردۆنی هاشمی لەو سەرزەمینە پێکهێنا، تا هەموو برایانی سعوودی ڕازی بن. بەم شێوەیە، لە حاڵێکدا دەوری ۷۰ لەسەدی حەشیمەتی ئۆردنی تازە فەلەستینی بوون، خەڵکە خۆوڵاتییەکەی ئەو سەرزەمینە، کەوتنە ژێر کۆنترۆڵی سوپا کە پێگەی دەسەڵاتی شا بوو.

تا شەڕی ساڵی ۱۹٦۷ی نێوان عەرەب و ئیسرائیل، حیزبی کرێکاری ئیسرائیل، هیچکاتێک فەلەستینییەکانی بۆ ئەمنیەتی خۆی بە مەترسیدار نەدەزانی. حیزبی کرێکار، وەک گرووپێکی تێرۆریستی پیاوکوژ چاوی لە فەلەستینییەکان دەکرد کە مەترسیی سیاسییان بۆ ئیسرائیل نەبوو و بۆیە هیچوەخت هەوڵی نەدا، گیروگرفتەکانیان بخاتە بەر سەرنج و لێکۆڵینەوە. بەڵام دوای شەڕی ساڵی ۱۹٦۷ کە کەرتی غەززە و لێوارەی خۆرئاوای چۆمی ئۆردۆن کەوتنە دەستی ئیسرائیل، ۱/۵ میلیۆن فەلەستینی کەوتنە ژێر کۆنترۆڵی سوپای ئیسرائیل و بۆیە، ئیسرائیل ئیدی نەیدەتوانی بەرامبەر بە فەلەستینییەکان بێخەم بێ.

یەکێک لەو کەسە کەمانەی حیزبی کرێکاری ئیسرائیل، کە ئاگاداری گیروگرفتی فەلەستینییەکان بوو، «لێڤی ئیشکۆل»، سەرۆکوەزیری ئەو کاتی ئیسرائیل بوو. ئەو بۆی دەرکەوت کە ئیسرائیل بۆ نیشتەجێکردنی پەنابەرە فەلەستینییەکان دەبێ دەگەڵ وڵاتانی عەرەبی و بەتایبەتی فەلەستنییەکان بگاتە جۆرە ڕێککەوتنێک.

«ئیشکۆل» پێشنیاری بە جەمال عەبدوnناسر، سەرکۆماری میسر کرد کە ڕێککەوتننامەیەکی هەمەلایەنە کە بابەتی نیشتەجێکردنی فەلەستینییەکانیش بگرێتەوە لە نێوان ئیسڕائیل و عەرەبەکاندا ئیمزا بکرێ. ئەو تەنانەت دوو جار بۆ وتووێژ لەبارەی ئەو بابەتەوە، بە نهێنی چاوی بە جەمال عەبدولناسر کەوت. بەڵام، هەردووکیان لە ماوەی یەک ساڵدا مردن. جەمال عەبدولناسر، لەکاتێکدا خەریکی وتارخوێندنەوە بوو، بەهۆی سەکتەی مێشکەوە مرد و «لیڤی ئیشکۆل»یش کاتێک سەرگەرمی کیبووتزی خۆی بە ناوی «دیگانیا» Degania بوو، بە ڕاوەستانی دڵ کۆچی دوایی کرد.

ئەنوەر سادات، جێنشینی جەمال عەبدولناسر، پێی وابوو باشترین ڕێگای گەیشتن بە ئاشتی ئەوەیە کە گیروگرفتی فەلەستینییەکان لە وتووێژی ئاشتیدا نەیەتە گۆڕێ. جێنشینی «ئیشکۆل» لە ئیسڕائیل «گۆلدا مایر» وەزیری دەرەوەی پێشووی ئیسڕائیل بوو کە ڕوانینێکی سیاسیی بەرتەسکی هەبوو و نەیدەتوانی ئامانجە درێژخایەنەکان تێبگا. «گۆلدا مایر» ساڵی ١٩٤٨ دەگەڵ مەلیک عەبدوڵڵا پادشای ئۆردۆنی هاشمی، دۆستایەتیی ڕێکخست. ئەو دوو کەسە هەردووکیان باوەڕیان وابوو کە گیروگرفتی فەلەستینییەکان ڕۆژێک هەر بۆخۆی چارەسەر دەبێ.

مەلیک عەبدوڵڵا لە ئاکامی دۆستایەتیی دەگەڵ ئیسڕائیلدا گیانی خۆی لەدەست دا. چونکە، ساڵی ١٩٤٨، کاتێک سەری مزگەوتی (الاقصی) لە خۆرهەڵاتی ئۆرشەلیمی دەدا، کە ئەوکات بەشێک لە ئۆردۆن بوو، بە زەبری چەقۆ کوژرا. پاش مەرگی مەلیک عەبدوڵڵا، (طلال)ی کوڕی، جێی گرتەوە و بۆ ماوەی چەند مانگ پادشای ئۆردۆن بوو. بەڵام بەهۆی نەخۆشیی دەروونی نێردرایە نەخۆشخانەیەکی سویس و سەرەنجام، لەوێ بە ئارامی سەری نایەوە. پاش وەلانانی (طلال) لە پادشایەتی، حوسێنی کوڕی بوو بە جێنشینی ئەو و پادشای ئۆردۆن. مەلیک حوسێن پاش گەیشتن بە

پادشـایەتیی ئـۆردۆن وێـڕای ڕاوێژکارەکـانی دەگـەڵ کاربەدەسـتانی حیزبـی کرێکـار، یـەک لـەوان «گۆلـدا مـایر» کەوتـە گفتوگـۆ. ئـەو کەسانەش باوەڕیان وابوو گیروگرفتی فەلەستینییەکان هەر بۆخۆی چارەسەر دەبێ.

ڕەفتاری مەلیک حوسێن سەرنجی ئەمریکای بۆلای خۆی ڕاکێشا و مەلیک حوسێن بوو بە یەکێک لە ڕێبەرانی خۆشەویستی ئەمریکا لەو ناوچەیە. ئەمریکا پێی وابوو، هەتا کاتێک مەلیک حوسێن لە ئۆردۆن حکوومەت دەکا و لەو وڵاتەدا دەوڵەتی فەلەستینی نیە، خەباتگێڕانی فەلەسـتینی بـۆ وڵاتـی خـاوەن‌نـەوتی دراوسـێی ئـۆردۆن، واتـە عەرەبسـتانی سـعوودی بـە هەڕەشـە دانـانرێن. «گۆلـدا مـایر» و ڕێبەرانی دیکەی حیزبی کرێکاریش لەم بارەیەوە پەیڕەوی ڕەفتاری ئـەمریکا بـوون و حـەزیان نـەدەکرد، مـەلیک حوسـێن لـە پادشـایەتیی ئۆردۆن وەلا بنرێ.

دوای شەڕی ساڵی ١٩٦٧،PLO و گرووپە فەلەستینییەکانی دیکە لە لێوارەی خۆرئـاوای چـۆمی ئـۆردۆن و کـەرتی غـەززەوە چوونـە ئۆردۆن. مـەلیک حوسـێن بـە هەڵـە پێـی وابـوو دەتـوانێ بـە ئـارامی حکوومـەت بەسـەر فەلەستینییەکاندا بکا. بـەڵام، PLO لـە سـەرزەمینی ئۆردۆن، دەوڵەتێکی لەنێو دەوڵەتی ئەو وڵاتەدا پێکهێنا و لە ئاکامدا چەند بەشێکی خاکی ئۆردۆن بە تەواوی لە کۆنترۆڵی مەلیک حوسێن چوونـە دەرێ. PLO دەسـتی کـرد بـە فڕۆکەڕفانـدن و هێنانیـان بـۆ ئۆردۆن. ساڵی ١٩٧٠ کاتێک PLO سێ فڕۆکەی ڕفاندن و ئەوانی لە «الزرقا»ی ئۆردۆن نیشاندەوە، کێشەی فەلەستینییەکان لە ئۆردۆن گەیشـتە لووتکـەی قـەیرانی خـۆی. چونکـە فەلەسـتنییەکان پـاش نیشاندنەوەی فڕۆکەکان لە «الزرقا»، دەستووریان دا، موسافیرەکان دابـەزن و فڕۆکـەکانیان تەقاندنـەوە و مـەلیک حوسـێن نـەیتوانی لـەو بارەیەوە کارێک بکا.

مەلیک حوسێن کە خۆی لە بەرامبەر فەلەستینییەکاندا بێدەسەڵات دیت، بڕیاری دا سوپای ئۆردۆن ڕووبەڕووی فەلەستینییەکان بکاتەوە. ئەو لەم ڕێگایەدا تا ڕادەیەک سەرکەوتنی بەدەست هێنا، تا ئەوەی ساڵی ١٩٧٠، سووریا بڕیاری دا بە پشتیوانیی فەلەستینییەکان بچێتە نێو کێشەکەوە. لەوکاتەدا، کێشەکە ئەوە بوو کە داخوا لە ئۆردۆن، دەبێ مەلیک حوسێن درێژە بە پادشایەتی بدا، یان لەم وڵاتەدا دەوڵەتێکی فەلەستینی دروست ببێ. لە گەرمەی ئەو کێشەیەدا، «گۆلدا مایر» سەرۆکوەزیری ئەوکاتی ئیسرائیل گەورەترین هەڵەی مێژووی ئیسرائیلی کرد. بەو جۆرە کە دەستووری دا، هێزەکانی بەرگریی ئیسرائیل بە دژی سووریا وەخۆ کەون. بەوکارە «گۆلدا مایر» پێشگیریی لە دروستبوونی دەوڵەتێکی فەلەستینی لە سەر خاکی ئۆردۆن کرد و مەلیک حوسێنی لە ئۆردۆن لە دەسەڵاتدا هێشتەوە. ئاشکرایە کە لە ئاکامی ئەوکارەدا، چاڵە نەوتەکانی عەرەبستانی سعوودی لە مەترسیی خەباتگێڕانی فەلەستین لە ئەماندا مانەوە و ئەم کارە بە شێوەی سروشتی، ئەمریکاشی ڕازی کرد. بەڵام بە جێبەجێکردنی ئەم سیاسەتە، لە ڕاستیدا قازانجی درێژخایەنی ئیسرائیل پشت گوێ خرا و هەموو ئومێدێک بە دامەزرانی دەوڵەتێکی فەلەستینی لەسەر خاکی ئۆردۆن لەبەین چوو. دەبێ پێی لێبنرێ کە بڕیار و هەنگاوی «گۆلدا مایر» بۆ هێشتنەوەی مەلیک حوسێن سەرەنجام بووە هۆی لەمەترسیکەوتنی بوونی دەوڵەتی ئیسرائیل.

لە ئاکامی بڕیاری «گۆلدا مایر»دا مەلیک حوسێن بەهۆی سوپاکەیەوە ٢٠٠٠٠ فەلەستینیی کوشتن و ئەوانی دیکەشی لە ئۆردن وەدەرنان. بەمجۆرە، فەلەستینییەکان چوونە لوبنان و زۆر لە شەڕکەرەکانیان بۆ ڕزگاربوون لە دەستی سوپای مەلیک حوسێن، چوونە سنووری ئۆردۆن – ئیسرائیل و خۆیان تەسلیمی سەربازانی ئیسرائیل کرد. چونکە قاو بوو کە سەربازە خۆوڵاتییەکانی ئۆردۆن

حەزیان لە زیندانیکردنی دوژمنانیان نیە. (مەبەستی نووسەر ئەوەیە کە سەربازە ئۆردۆنییەکان، فەلستینییەکانیان بە دیل نەدەگرت، بەڵکە دەیانکوشتن. مترجم فارسی.)

پاش ئەوەی ساڵی ١٩٧٧ حیزبی لیکوود لە ئیسرائیل هاتە سەر کار، «مەناخیم بگین» سەرۆکوەزیری ئەو وڵاتە و پریزیدێنت ئەنوەر سادات لە گفتوگۆیەکانی ئاشتیدا باسیان لە سەربەخۆیی لێوارەی خۆرئاوا بۆ هاتنەسەرکاری دەوڵەتێکی فەلەستینی لەم ناوچەیە کرد. لە ئاکامی رێککەوتنێکدا کە ئاخرەکەی، لە نێوان سەرکۆماری میسر و سەرۆکوەزیری ئیسرائیلدا کرا، «بگین» رازی بوو کە بیابانی سینا بدرێتەوە بە میسر و ساداتیش بابەتی لێوارەی خۆرئاوای چۆمی ئۆردۆن و کێشەی فەلەستنییەکانی لەبیر خۆی بردەوە. تەنیا ئامانجی سادات وەرگرتنەوەی سینا بوو و ئەمەشی دەست کەوت. سادات گوێی نەدەدایە وەرگرتنەوەی کەرتی غەززە کە پێش شەڕی ١٩٦٧ بەشێک لە خاکی میسر نەبوو، چونکە بەشێکی زۆری لەو سەرزەمینە خاوەنی حەشیمەتی فەلەستینی بوو. بۆ «بگین»، بە پێچەوانە، لێوارەی خۆرئاوا و کەرتی غەززە زۆر گرنگ بوون، چونکە ئەو دوو سەرزەمینە بۆ ئیسرائیل بایەخی مێژوویی و ستراتیژیکییان هەبوو.

پاش رێککەوتننامەکانی «کەمپ دێڤید»، و دوای ئەوەی ساڵی ١٩٨١، کۆمارخوازان لە ئەمریکا حکوومەتیان بەدەستەوە گرت، ئەمریکا و وڵاتانی نەرمڕۆی عەرەب پێیان لەسەر دامەزراندنی دەوڵەتێکی چووکەڵەی فەلەستینی لە کەرتی غەززە و لێوارەی خۆرئاوا داگرت. دەبێ بزانین کە حیزبی لیکوودی ئیسرائیل لایەنگری دروستبوونی دەوڵەتێکی فەلەستینی لە ئۆردۆن بوو کە ئەمە دەیتوانی بۆ قازانجە نەوتییەکانی ئەمریکا خەتەرناک بێ، بەڵام دروستبوونی دەوڵەتێکی چووکەڵەی فەلەستینی لە کەرتی غەززە و لێوارەی خۆرئاوا، ئەم مەترسییەی نەبوو. لیکوود باوەڕی وابوو کە ئیسرائیل دەتوانێ هاوکاریی ئاشتیخوازانەی دەگەڵ دەوڵەتێکی

فەلەستینی لە ئۆردۆن هەبێ. بەڵام کارێکی بۆ ئەنجامدانی ئەو بەرنامەیە نەکرد. لە هەڵبژاردنی ساڵی ١٩٨٤دا، چون هیچکام لە حیزبەکانی کرێکار و لیکوود نەیانتوانی زۆرایەتیی پارلمان بەدەست بێنن، حکوومەتێکی هاوپەیمانی لە ئیسرائیل پێکهات و بڕیار درا، ڕێبەرانی ئەو دوو حیزبە، هەریەکەی ماوەی ٢ ساڵ، وەک سەرۆک-وەزیر حکوومەت بەسەر وڵاتەکەوە بکەن. «شیمۆن پرێز» کە لە ساڵی ١٩٨٤ تا ١٩٨٦ سەرۆکوەزیری ئیسرائیل بوو، ڕازی بوو کە بۆ هاوکاری دەگەڵ سیاسەتی ئەمریکا، پێکهێنانی کۆنفرانسێکی نێونەتەوەیی بۆ باس لەسەر دروستکردنی دەوڵەتێکی فەلەستینی لە لێوارەی خۆرئاوا و کەرتی غەززە بخاتە بەر لێکۆڵینەوە. بەڵام، حیزبی لیکوود کە لە حکوومەتی هاوپەیمانیدا بەشدار بوو، بە تەواوی دژی ئەم بیرۆکەیە بوو، ئەمەش بووە هۆی ئەوە کە ئەمریکا بەرەو عێڕاق بکشێ.

ساڵی ١٩٨٦ کە «شامیر» بوو بە سەرۆکوەزیر، بە نهێنی دەگەڵ فەلەستینییەکان، یەک لەوان PLO – هەرچەند تا ئەمڕۆش ئەو ڕێکخراوە بە ڕەسمی نەناسراوە- کەوتە گفتوگۆ. بابەتی ئەو گفتوگۆیانە ئەوە بوو کە سەرزەمینی ئۆردۆن لە دەستی مەلیک حوسێن پادشای ئەم وڵاتە بێتە دەرێ و حکوومەتێکی فەلەستینی لەم وڵاتەدا بێتە سەر کار. نابێ لەبیرمان بچێ کە بە هەرحاڵ ٧٠ لە سەدی حەشیمەتی ئۆردۆن فەلەستینین. بەرنامەیەکی وا بەبێ گومان، حیزبی کرێکاری ئیسرائیل، حکوومەتی کۆمارخوازانی ئەمریکا، پادشای ئۆردۆن و عەرەبستانی سعوودیی تووڕە دەکرد. بەڵام، توێژە جۆراوجۆرەکانی فەلەستین، بەتایبەتی توندڕەوەکانیان و هەروەها وڵاتانی سووریا و شووڕەوی بەتەواوی دەگەڵ جێبەجێ-بوونی ئەم بەرنامەیە موافیق بوون.

شووڕەوییەکان باوەڕیان وابوو کە بوونی دەوڵەتێکی فەلەستینی لە لێوارەی خۆرئاوا، لە نێوان وڵاتانی ئۆردۆن و ئیسرائیلدا دەبێتە هۆی

نائارامییەکی زیاتر لە ناوچەیەی خۆرهەلاتی نێوەڕاستدا و شوێنەواری بوونی ئیسرائیل وەک دەوڵەتێک کە بۆتە هۆی هاوسەنگیی هێزەکان لە ناوچەدا، لەبەین دەبا. ئەگەرچی بەڕواڵەت شووڕەوی پەیڕەویی لە سیاسەتی دژەئیسرائیلی دەکرد، بەلام لەڕاستیدا شووڕەوییەکان دەگەڵ بیروباوەڕی «شامیر» دەربارەی دامەزرانی دەوڵەتێکی فەلەستینی لە ئۆردۆن موافیق بوون. لە دیدارێکی نهێنیدا کە ساڵی ۱۹۸٦ لەنێوان «شامیر» و «چبریکۆف» سەرۆکی KGBدا ئەنجام درا، ئەو دووە ڕێک کەوتن کە لەبارەی دروستکردنی حکوومەتێکی فەلەستینی لە لێوارەی خۆرئاوا و کەرتی غەززە وتووێژێک دەگەڵ PLO نەکرێ. ئەوان تەنیا ڕێگای چارەسەری کێشەی خۆرهەلاتی نێوەڕاستیان لە لابردنی مەلیک حوسێن لەسەر تەختی پادشایەتیی ئۆردۆندا دەدی.

«شامیر» و «چبریکۆف» لە دیداری خۆیاندا ڕێککەوتن کە ئەگەر حیزبی لیکوود ڕەفتاری سیاسیی خۆی لەسەر بناخەی دژایەتی دەگەڵ دروستکردنی دەوڵەتێکی فەلەستینی لە لێوارەی خۆرئاوا و کەرتی غەززە دابنێ و بەرنامەی ئاشتیی ئەمریکاییەکانیش بە نەبوو دابنێ، شووڕەوی کۆمەگی پێدەکا. کۆمەگی شووڕەوییەکان بە ئیسرائیل ئەوە دەبێ کە موافەقە و هاوکاری بکا بۆ ئەوەی نەک هەر کۆچەرە جوولەکەکانی شووڕەوی، بەڵکوو کۆچەرە جوولەکەکانی ئەتیووپییش کە لەژێر نفووزی واندا بوون، لە لێوارەی خۆرئاوا، نیشتەجێ بکا.

بەجۆرێک کە ڕووداوەکانی ساڵانی دواتر دەریانخست، ڕێککەوتنێک کە لە نێوان «شامیر» و «چبریکۆف»دا پێکهاتبوو، موو بە موو جێبەجێ کرا. چونکە ساڵی ۱۹۹۱، ۲۵۰۰۰۰ جوولەکە لە شووڕەوی و ۳۰۰۰۰ جوولەکە لە ئەتیووپییەوە کۆچیان کردوە بۆ ئیسرائیل.

پێوەندییەکی پتەو کە لە نێوان شووروەوی و ئیسرائیلدا دروست ببوو، بەهێزتر لەوە بوو کە کەس بتوانێ تێیبگا. چونکە ئیسرائیل لە خاکی شوورەوی نوێنەرایەتیی سیاسیی هەبوو، جوولەکەکانی شوورەوی، بۆ نیشتەجێبوون لە سەرزەمینی بنەرەتیی خۆیان (ئیسرائیل)، لە ولاتانی ئوتریش و ئیتالیا داوای ڤیزایان دەکرد، تا لەوانەوە برۆنەوە. پاشان کاتێک دەگەیشتنە ئەو دوو ولاتە، داوای کۆچکردن بۆ ئەمریکایان دەکرد. دواتر بۆ ئەوەی پێشگیری لەو کارە بکرێ، ئیسرائیل لقێکی کۆنسوولیی لە مۆسکۆ کردەوە و ڤیزای بۆ ئەو جوولەکانەی شوورەوی دەردەکرد کە حەزیان دەکرد کۆچ بکەن بۆ ئیسرائیل. کارەکە جۆرێک رێکخرابوو کە هەموو کاروباری کۆچی جوولەکەکانی شوورەوی لە مۆسکۆ جێبەجێ دەبوو و هەموو جۆرە دەرفەتێکی داوای کۆچکردن بۆ ئەمریکایان لێ ئەستێندرابوو. ئامانج ئەوە بوو کە جوولەکەکانی شوورەوی راستەوخۆ بچنە ئیسرائیل و بە وەرگرتنی پارچە زەوییەک لە لێوارەی خۆرئاوا و نیشتەجێبوون لەو ناوچەیە، نەخشەی ئەمریکا بۆ دانانی حکوومەتێکی فەلەستینی لەو ناوچەیە پووچەڵ بکەنەوە.

پاش دەستپێکردنی راپەرین (انتفاضە) لە لێوارەی خۆرئاوا و کەرتی غەززە،کێشەی فەلەستینییەکان گەیشتە لووتکەی خۆی. ئەمریکا لەبارەی پێکهێنانی کۆنفرانسێکی ئاشتییەوە دەگەڵ فەلەستینییەکان خەریکی گفتوگۆ بوو و بەرەسمی هەوڵی دەدا، وتووێژێک کە لە توونس لە نێوان باڵیۆزی ئەمریکا و رێبەرایەتیی PLOدا کرابوو جێبەجێ بکرێ. بەڵام «شامیر» لەجیاتی ئەوەی تەسلیمی گوشاری ئەمریکا ببێ و پێشنیارەکانی ئەو ولاتە بۆ ئاشتی قبووڵ بکا، رایگەیاند کە بۆخۆی بەرنامەیەکی جیاواز بۆ ئاشتی دێنێتە گۆرێ.

پرۆژەی «شامیر» بۆ دروستکردنی دەوڵەتێکی فەلەستینی لەسەر خاکی ئوردۆن، هیچکاتێک نەخرایە پێش چاوی بیرورای گشتی، بەڵام

«شامیر» لەبارەیەوە گفتوگۆی دەگەڵ ڕاوێژکارانی کرد. لە جەرگەی ئەم وتوویژانەدا یاسر عەرەفاتیش تەپڵی شەڕ لەگەڵ ئۆردۆنی لێدا. دیارە دەستپێکردنی کارێکی ئەوتۆ دوور لە مەترسی نەبوو. بەڵام «شامیر» لەژێر گوشاری ئەمریکادا ناچار ببوو ئەو مەترسییە قبووڵ بکا.

بەدوای جێبەجێکردنی ئەو ئامانجەدا، «شامیر» دەستووری بە چەند کەس لە ڕاوێژکارەکانی دا کە چاویان بە ڕێبەرانی PLO لە شوێنە جۆراوجۆرەکانی دنیا بکەوێ و دەربارەی پێکهێنانی دەوڵەتێکی فەلەستینی لە ئۆردۆن گفتوگۆیان لەگەڵ بکەن. «شامیر» دەستووری بە یەک لە ڕاوێژکارانیشی دا کە بچێتە توونس و دەگەڵ یاسر عەرەفات لەو بارەیەوە وتوویژ بکا. ئەم دیدارە کۆتایی ژوئەنی ١٩٨٩ ئەنجام درا و یەکەمین دیدار لە سێ دیدار بوو کە لەلایەن «شامیر»ەوە دەگەڵ ڕێبەری PLO ڕێکیخست.

لەو دیدارانەدا چۆنیەتیی دەرەتانی ڕاپەڕینی فەلەستنییەکان لە ئۆردۆن بە دژی مەلیک حوسێن و پشتیوانیی ئیسرائیل لەو ڕاپەڕینە بۆ ڕووخاندنی مەلیک حوسێن و دروستکردنی دەوڵەتێکی فەلەستینی لەو وڵاتە، کەوتە بەر باس. ئەمە یەکێک لە بەرنامە نهێنییەکانی «شامیر» بۆ چارەسەری کێشەی فەلەستینییەکان بوو کە بەوپەڕی سەرسوڕمانەوە دەگەڵ یاسر عەرەفاتی هێنایە گۆڕێ.

پاش ئەنجامدانی ئەم گفتوگۆیانە دەگەڵ عەرەفات، یەکێک لە جێگرەکانی «شامیر» بە ناوی «ئیهوود ئوولمارت» Uhud Ulmart کە زۆر لە «شامیر» نزیک بوو، لەماڵێکی کەسی لە شاری توونس چاوی بە ڕێبەری PLO کەوت و لەبارەی دەرەتانی جێبەجێکردنی بەرنامەکەوە وتوویژی پتری دەگەڵ کرد.

بەپێی ئەو وتوویژانە، «شامیر»ی سەرۆکوەزیر، مەئموورییەتێکی تازەی بۆ من دانا. مەئموورییەتەکە تاڕادەیەک پێچەڵپووچ بوو، بەڵام ئەگەر سەر کەوتبایە دوو ئاکامی دەبوون -یەک، ئەوە کە دەبووە

هۆی ئازادبوونی ئەو سێ سەربازە ئیسرائیلییە کە لە لوبنان بە بارمتە گیرابوون و دوو، ئەوە کە ئێمەی بۆ گفتوگۆی زیاتر، لە PLOنیزیکتر دەکردەوە. بۆ ئەنجامی ئەو بەرنامەیە دەبوو بچمە «سری لانکا».

ئەمن مانگی ژووئیەی ساڵی ١٩٨٩ بۆ ئەنجامدانی مەئموورییەتەکە بە فڕۆکە چوومە کۆلۆمبۆ. ئەم مەئموورییەتە وەک یارییەکی شەترنجی سیاسی بوو کە لەو یارییەدا یەکێک دەچێتە پێش، بەڵام هەوڵ دەدا قازانجەکانی خۆی بپارێزێ. هەرلەوکاتەدا هەردەم لەوانەیە پێشهاتێکی نەخوازراو ڕوو بدا.

بە پێچەوانەی ئەو بڕیارە کە پێشتر «شامیر» بۆ هەڵوەشاندنەوەی فرۆشتنی فڕۆکە C-130یەکان بە ئێرانی دابوو، دووبارە هاتە سەر ئەو باوەڕە کە بەرنامەی فرۆشتنی ئەو فڕۆکانە بە تاران، لە بەرامبەر ئازادیی سەربازە ئیسرائیلییەکاندا گفتوگۆی لەسەر بکرێ. ئەمجارە ئێمە بڕیارمان دا لە کۆمەگی PLOش کە نوێنەرێکی لە سری لانکا هەبوو، بۆ ئازادیی سەربازە ئیسرائیلییەکان بەهرە وەرگرین. ئەگەر ئێران توانیبای، شوێنی ڕاگرتنی سەربازە ئیسرائیلییەکان بدۆزێتەوە، PLO دەیتوانی ئەوان لە بەندی ئەو شیعانە کە بە بارمتەیان گرتبوون، ڕزگار بکا.

هۆی ئەوە کە وڵاتی سری لانکا بۆ ئەو کارە دیاری کرابوو، ئەوە بوو کە وەختێک فڕۆکە سەوداپێکراوەکان بەڕێگای ئەم وڵاتەدا بەرەو شوێنی مەبەست تێدەپەڕین، سەرپۆشی پێویست بۆ عەمەلیاتی ئەنجامدانی ئەو موعامەلەیە پێک دەهات و ئەمجار PLO نوێنەرێکی لەم وڵاتە هەبوو کە دەمتوانی قسەی دەگەڵ بکەم. یاسر عەرەفات کاتی وتووێژە نهێنییەکەی خۆی لە توونس، پێشنیاری کردبوو کە لە بەرامبەر کۆمەگی PLOدا دەبێ حکوومەتی ئیسرائیل پووڵێک بداتە چریکەکانی «تامیل» Tamil لە سری لانکا، بۆ ئەوەی بتوانن بەو پووڵە چەک لە PLO بکڕن.

بەوجۆرە ئێمە قەرار بوو هەم لە حکوومەتی سری لانکا وەک سەرپۆشێک بۆ فرۆشتنی فرۆکەکانمان بە ئێران کەلک وەرگرین و هەمیش لە چریکەکانی «تامیل» وەک سەرپۆشێک بۆ دانی پووڵ بە PLO لە بەرامبەر هاوکارییەکانیاندا سوود ببینین. بەڕاستی، وێستگەیەکی سەرسوڕهێن و پێکەنیناوی بوو. ئیسرائیل، لەلایەک، ڕاوێژکاری ناردبوونە سری لانکا بۆ ئەوەی بە دژی یاخیبووەکانی «تامیل» کۆمەگی سوپای ئەم وڵاتە بکەن و لەلای دیکەش، ئەمن لەلایەن حکوومەتی ئیسرائیلەوە چووبوومە ئەو وڵاتە، هەتا پووڵێک بدەم بە یاخیبووەکانی «تامیل» تا بتوانن چەکی پێ‌بکڕن و بەرامبەر بە سوپای سری لانکا بجەنگن.

ئەمن لە کۆلۆمبۆ پێتەختی سری لانکا لە هۆتێل «ڕەمادا» کە کەوتبووە ناوەندی شارەکە، مامەوە و شەوی یەکەمی گەیشتنم بەو شارە، لەحاڵێکدا لە سالۆنی هۆتێلەکە خەریکی بەستەنی‌خواردن بووم، دەگەڵ کەسێک کە خۆی بەناوی شارژە دافێر دەناساند، کەوتمە وتووێژێکی دۆستانە. لەکاتێکدا ئێمە پێکەوە سەرگەرمی قسەکردن بووین، بەوپەڕی سەرسوڕمانەوە دیتمان پیاوێکی خۆرئاوایی کە دواساڵەکانی دەیەی شەستی تەمەنی بەڕێ دەکرد و ڕیشێکی سپیی هەبوو، بە هەوای مووزیکێک کە تیمێکی چووکەڵە لە هۆتێل لێی‌دەدا بە تەنیایی سەمای دەکرد.

هاوکارە میسرییەکەم گوتی: «بڕوانە ئەو شێتە. ئەم پیاوە یان شێتە یان پێی خۆشە بەتەنیا سەما بکا یان ناتوانێ ژنێک وەبینێ کە سەمای دەگەڵ بکا.»

دوای تەواوبوونی مووزیکەکە، ئەو هاتە لای من و لەحاڵێکدا خۆی هاویشتبووە سەر مۆبلێک و بە کراسەکەی خۆی خۆی باوەشێن دەکرد، گوتی: «وەرزشێکی چاک بوو». پاشان دەستی دە گیرفانی کراسەکەی ڕاکرد و کارتی ویزیتەکەی دەرهێنا. زەمینەی کارتەکەی

نەخشەیەکی هەبوو کە هەسارەکانی لە دەوری زەوی نیشان دەدا و لەسەر کارتەکە چاپ ببوو.

One Universe:

A Non- Profit Alliance,

Leon Siff, Chief Organizer,

National Food Relief - Homes for the Homeless,

Counseling Without Walls - Advocates for the Homeless

«سیف» دەستی درێژ کرد و ڕوونی کردەوە کە کاری بۆ سیستمی سزایی لۆس ئانجلێس کردوە، بەڵام ئێستا خانەنشین بووە و خەریکی کاروباری خێرخوازییە. ئەو گوتی، ئەگەرچی کارتەکەی ناوی تەواوی ڕێکخراوەکەی نیشان نادا، بەڵام ناوی ڕێکخراوەکەی «دۆستانی گیتی» Friends of the Universeە و ئامانجی کۆمەگ بە کەسانێکی بێ-ماڵوحاڵە کە لە بەخش (ناحیە)ی Venice Beach و دەوروبەری لە لۆس ئانجلێس دەژین.

دواتر ڕوونی کردەوە کە جوولەکەیە و هاتوتە سری لانکا تا چاوی بە کوڕەکەی بکەوێ کە بۆتە ڕاهیبێکی بوودایی. ئەمن لە درێژەی مانەوەم لە شاری دووکەڵاویی کۆلۆمبۆ، زۆر شتی دیکەم لە«سیف» دی.

پاش ئەوە، بەوجۆرەی لەپێشدا ڕێکخرابوو، تەلەفونم بۆ نوێنەری PLO کرد و ئەو گوتی، بە خۆشحاڵییەوە دەتبینم. ئێمە کاتی یەکتردیتن بە زمانی عیبریمان قسە دەکرد. ئەو بە تاوانی بۆمب-دانانەوە لە شاری «ئەفولا» Afula ماوەی ١٢ ساڵ لە ئیسرائیل زیندانی ببوو. بۆمبەکەی پێش وەختی دیاریکراو تەقیبوو و کەموزۆر خودی وی کوشتبوو.

دیداری دواتری من کە ئەویش پێشتر ڕێکخرابوو، دەگەڵ وەزیری هەواڵگریی سری لانکا لە ماڵەکەی خۆی بوو. وەزیری هەواڵگریی سری لانکا دۆست و هاوڕازی نزیکی پریزیدێنت «ڕاناسینگە

پرێماداسا» Ranasinghe PrEmadasa بوو و هەر بۆیەش ئەمن دیداری ئەوم بە یەکەمین هەنگاوی سەرکەوتنی مەئموورییەتەکەم دادەنا. لە کاتی شێوخواردندا بۆم ڕوون کردەوە کە ئەگەر سری لانکا یارمەتی بدا کە ئێمە لە ڕێگای ئەم ولاتەوە فڕۆکە C-130یەکانمان بە ئێران بفرۆشین، سەرۆکوەزیری من زۆر سوپاستان دەکا و کۆمەگە سەربازییەکانی خۆی بە سوپای ولاتەکەشتان زیاد دەکا. وەزیری هەواڵگری، ڕێکیخست کە ڕۆژی دواتر لە کۆشکی سەرکۆماری چاوم بە سەرکۆمار بکەوێ. لێرەدا یەکەم هەنگاوی مەئموورییەتەکەم بە سەرکەوتنەوە کۆتایی هاتبوو.

بەیانیی ڕۆژی دواتر، ئەمن سووکە قاوڵتییەکم دەگەڵ نوێنەری PLO خوارد و پێمگوت، ئەگەر PLO یارمەتی بدا کە سێ سەربازی ئیسرائیلی لە بەندی شیعەکانی لوبنان ئازاد بن، ئیسرائیل ٨ میلیۆن دۆلار دەداتە چریکەکانی «تامیل». دیارە لە باری ڕەسمییەوە، ئەو دراوە لەبەر لایەنی مرۆڤایەتی دەدرایە «تامیل»، بەلام هەم ئێمە و هەم ئەو گرووپە دەمانزانی کە ئەم پوولە بۆ کڕینی کەرەسەی شەڕ خەرج دەکرێ.

شەوی ئەو ڕۆژە، دووبارە دیتم «سیف» بەتەنیایی دەگەڵ خۆی سەما دەکا. وەختێک چاوی بەمن کەوت، شوێنی سەماکەی بەجێ هێشت و هاتە لام. دوایە لێیپرسیم، ڕۆژەکەمم چۆن تێپەڕ کردوە و لەو ڕۆژەدا چیم کردوە و چوومە کوێ. ئەمن هەوڵم دا، خۆ لە وەلامدانەوەی ببوێرم. دوایە ئەو بابەتی قسەکانی گۆڕی بۆ باس لەبارەی پوولەوە.

ئەو گوتی: «ئاری، گرووپەکەی من پێویستیی بە پشتیوانی هەیە. ئەمن دەزانم ئەتۆ دەتوانی کۆمەگمان بکەی. حەز دەکەم، وەختێک بێیە ئەمریکا و سەری چالاکییەکانمان بدەی.»

گوتم: «حەتمەن، ئەگەر بێمە لۆس ئانجلێس چاوم پێت دەکەوێ.»

لە ٤٨ سەعاتی دواتردا، ئەمن چاوم بە سەرکۆماری سری لانکا، فەرماندەی هێزی هەوایی ئەم وڵاتە و نوێنەری PLO کەوت و لەلای هەمووان پێم داگرت کە بۆ فرۆشتنی فڕۆکە C-130یەکان بەرامبەر بە ئازادیی سەربازانی ئەو وڵاتە یارمەتیی ئیسرائیل بدەن. هەرچەند لە لەندەن پێوەندی دەگەڵ دەفتەری «تامیل» گیرابوو بۆ ئەوەی پارەکەیان بدرێتی، بەوحاڵە ئەمن ناچار بووم بیانبینم. دیارە حکوومەتی سری لانکا ئاگای لەو بابەتە نەبوو.

سەفەری من بۆ «جەفنا» Jaffna بێکێشە نەبوو. ئەمن بڕیارم دابوو، بۆخۆم بەتەنیا ترومبێل لێبخوڕم، چونکە دەمویست کەس ئاگای لە چالاکییەکان یان دیدارەکانم دەگەڵ ئەندامانی گرووپی «تامیل» نەبێ. کە بە جادەیەکی باریکدا لێمدەخوڕی، چەندین جار تووشی ڕێبەندانی سوپای سری لانکا و سوپای هیندوستان بووم. هیندییەکان دەرهەق بە گەڕیدەیەک کە لەکاتی چالاکیی یاخییەکانی «تامیل»دا ڕوو بە باکوور و بەرەو «جەفنا» دەڕۆیشت، زۆر بەگومان بوون. بەڵام پاش دەمەقاڵییەکی زۆر کە دەگەڵیانم کرد، هەرچەند بەشی باکوور بە ناوچەی عەمەلیاتی سەربازی ڕاگەیەندرابوو، ڕێگایان دا تێپەڕم.

ئەو شەوە، هەروەک لەپێشەوە بەهۆی نوێنەری PLOوە ڕێک-خرابوو، منیان لە هۆتێل سبحیی «جەفنا»ڕا هەڵگرت و بردیانمە گوندێک کە بەدەست «تامیل»ەکانەوە بوو. ڕێنوێنەکەم بردمیە ماڵێکی گەورە کە کوڕانی نێوان ١١ هەتا٢٠ساڵە هەر یەکەی بە کەلاشینکۆفێکەوە نیگابانییان لێدەدا. ئەمن چوومە ژوورێک کە کۆمەڵە پیاوێک لەبەر شۆقی چرای گازی چاوەڕێم بوون. ڕێبەرەکەیان کە ناوە ساختەکەی «بەوری ژمارە ١» بوو، خۆی و هاوکارەکانیی پێناساندم و پاشان دەستی بە پڕوپاگەندە کرد و ئەمن دەبوو گوێی بۆ ڕاگرم.

بەوری ژمارە ١، پیاوێکی وەنێوکەوتووی ڕەشتاڵە، خەپەتۆڵە و کورتەباڵا بوو. ئەو هەروا کە لە ژوورەکەدا پیاسەی دەکرد، پێی‌گوتم کە ٥٠ میلیۆن «تامیل» لە سەرزەمینی ئەسڵی هیندوستان لە «تامیل نادۆ» Tamil Nadu دەژین و هەموویان لە ڕەفتاری «ڕاجیف گاندی» و حیزبی کۆنگرەی وی ناڕازین. گاندی لە سری لانکا، بەرەیەکی لایەنگری هیندوستانی دامەزراندوە و بەنیازە ناوچە «تامیل»نشینەکانی سری لانکا بخاتە سەر هیندوستان.

بەوری ژمارە ١، بە تووڕەیی لەسەری ڕۆیشت: «ئەو بۆتە سەرەڕۆ، تەنانەت نیازی وایە بەشی سەرووی سری لانکاش کە نیشتمانی باپیرانمانە، داگیر بکا. بەڵام، ئێوە دەبێ بزانن کە ڕاجیڤ گاندی باجی کردەوەکانی دەدا. ئێمە بۆ ئازادیی خۆمان تا دوادڵۆپی خوێنمان شەڕ دەکەین و هیچ هۆکارێک ناتوانێ دەستمان پێ لە شەڕ هەڵبگرێ.»

ئەمن ڕوونم کردەوە کە سەفەری ئەو ناوچەیەم کردوە بۆ ئەوەی یارمەتیی ماڵییان بدەمێ هەتا بتوانن بە ئامانجەکانیان بگەن. ڕێبەری «تامیل» دەسبەجێ گوتی، ڕاستە کە ئیسرائیل بەنیازە ٨ میلیۆن دۆلارمان کۆمەگ پێبکا، بەڵام ئەو وڵاتە بە دژی «تامیل» یارمەتیی سوپای سری لانکا دەدا. بەوحاڵە ئەوان پێویستیی خۆیان بەو پووڵە پشتڕاست کردەوە. ئەمن ڕوونم کردەوە کە ئەو پووڵە، لەڕاستیدا خوێن‌بایی سێ سەربازی ئیسرائیلییە، بەڵام دەربارەی فرۆشتنی فڕۆکە C-130یەکان بە ئێران هیچ قسەیەکم نەکرد.

ئەمن دەگەڵ خانەخوێیەکانم موعامەلەیەکم ڕێک‌خست. بەوجۆرە کە ئەوان کۆمەگی ماڵیی ئیسرائیل قبووڵ بکەن و لەگەڵ نوێنەری PLO لە کۆلۆمبۆ پێوەندی بگرن و لەم مەسەلەیە ئاگاداریان بکەن. لەو حاڵەدا ئێمە دەتوانین چاوەڕوان بین کە PLO هەوڵی پێویست بۆ ئازادکردنی سەربازە ئیسرائیلییەکان بدا.

گەڕانــەوەی مــن بــۆ کۆلۆمبــۆ زۆر ســامناک بــوو. لــە ڕێگــادا ترومبێلەکـەم خـەراپ بوو و ناچار بووم لـە نێو ترومبێلەکە بخـەوم. لەوکاتـەدا کـە لـە ترومبێلەکـەدا خـەوتبـووم، گرووپێـک لـە چەتـەکانی «تامیـل» بـە هەڕەشـەی چـەک داوای پوولیـان لـێکـردم. سـەرەنجام ترومبێلەکەمیان بە یەدەککێشێک بردە کۆلۆمبۆ.

کاتێـک گەڕامـەوە کۆلۆمبۆ تەلـەفونم بـۆ «نیکـۆلا دیڤـیس» کـرد و پێمگوت بۆ ئەنجامدانی موعامەلەکە هـەنگاوی پێویسـت باوێژێ. ئێمـە پێشـتر قـەرارمان لەگـەڵی دانـابوو کـە بـە نیشـانەی باسـکراو، بڕی ٨ میلیـۆن دۆلار بداتــە نوێنەرایەتییەکــەیان لــە لەنــدەن. بــە شــێوەی سروشتی ئەو دراوە لە «سەرمایەی ڕەش» دابین دەکرا.

ئەمن لە گەرمەی باهۆزێکدا کە پێوەندیی ئێمە دەگەڵ PLO دروستی کردبـوو، گەڕامــەوە ئیســڕائیل. ئــەمن لــە ڕێگــای خاخــام «ئۆڤادیـا یۆسـف» Ovadiayosef ڕێبـەری «شـاس»ەوە کە بۆخۆشـی لە بـارەی کێشــەی فەلەســتینەوە بــاس و وتــووێژی دەگــەڵ ڕێبــەرانی عــەرەب کردبـوو، ئاگـادار بـووم کـە هــەواڵی پێوەنـدی و گفتوگـۆ دەگـەڵ PLO چۆتـە دەرێ. هێنـدێک لـە ئەنـدامانی حکوومـەتی هاوپـەیمانی زۆر لـەو بابەتە توورە ببوون. «شامیر» بە توندی کەوتبووە بەر ڕقی ئەوان و بۆیە دەبوو بەجۆرێک، حاشا لەو بابەتە بکا و بۆ ئـەو کارەش دەبـوو بەلاگێڕەوەیەک پەیدا بکا.

بە پێشبینیی ئاسـۆی دواڕۆژ، ئـەمن بڕیـارم دا، هـەنگاوێک وەپێش ڕووداوەکـان بکـەوم. بۆیـە دەگـەڵ دوو کەسـی دیکـە کـە بـۆ کـەلک-وەرگرتن لە «سەرمایەی ڕەش» مافی ئیمزایان هەبوو، ڕاوێژم کرد و ئـەوانم هـان دا، مووافەقـەت بکـەن بـۆ ئەمنیـەتی فیزیکی و مـاڵیی ئـەو کەسـانەی ئەنـدامی کۆمیتـەی هاوبــەش بـوون، پـووڵی CIA کـە لـە کۆنترۆڵی ئیسڕائیلدایە، بگوازرێتەوە بۆ بانکەکانی بلووکی خۆرهەلات.

دارایـی CIA کـە لـەو کاتـەدا گـەیبووە ٧١٠ میلیـۆن دۆلار، بـە چەنـد حەواڵەی ڕاسـتەوخۆ، بێئـەوەی پێویسـت بـێ بـۆ ڕاگـوازتنی کـەلک لـە

کۆمپانییەکانی «ماکسویڵ» وەربگرین، گوازرایەوە بلووکی خۆرهەڵات. ئەم کارە «ماکسویڵ»ی خستە دۆخێکی ناسەقامگیر. چونکە، ئەو بانکانەی ساڵی ١٩٨٨ پارەیان بە قەرز دابوویە، ئیدی دەستەبەرێکیان بۆ قەرزەکانیان نەبوو. «شامیر» لەوە کە دۆستەکەی کەوتبووە دۆخێکی خەراپەوە، زۆر نارەحەت بوو و ناچار بوو، بە پێوەندیی بە پەلە دەگەڵ بانکەکان، قانیعیان بکا، کە پشتیوانیی خۆیان بۆ «ماکسویڵ» درێژە بدەن.

سەرەتای پاییزی ساڵی ١٩٨٩،«شامیر» بانگی کردمە دەفتەرەکەی خۆی. ئەو لە پشت مێزەکەی دانیشتبوو و لەشە چکۆڵەکەی چووبووە نێو کورسییە چەرمەکەیەوە. ئەمن بێدەنگ دانیشتم و چاوم بڕیە قەڵافەتە تێکڕماوەکەی.

ئەو گوتی: «ئەتۆ زۆر لە دوژمنەکانمان نزیک بوویەوە.»

«ئەگەر مەبەستت نوێنەرانی PLOن کە پێوەندیم پێوە کردوون، بۆخۆت دەزانی ئەمن فەرمانم بەجێ هێناوە. جگە لەوەش، ئەمن بۆخۆم بەڵێنم بە بنەماڵەی سەربازە بەبارمتەگیراوەکان داوە، کە هەرچی لە تواناماندایە، بۆ ئازادکردنی ئەو سەربازانە بیکەین.»

لەحاڵێکدا ڕوخساری، وەک بەرد، سارد و خۆڵەمێشی ببۆوە، گوتی: «ئەتۆ لەو دەسەڵاتەی پێت دراوە، بەولاوەتر چووی. ئەتۆ بەنیازی دزینی ئەو پووڵەی؟»

وتەیەکی عیبریم بە مێشکدا هات و گوتم: «ئەو دزەی لە دزێکی دیکە بدا، سەری بە فەتەرات ناچێ.»

ئەو ساتێک تێمەوە ڕاما و پاشان بە ئاماژەی دەست دەستووری پێدام: «بڕۆ!» ئەمن لە دەفتەرەکەی چوومە دەر، بەڵام چاکم دەناسی و دەمزانی کارەکە بەوەندەوە ناوەستێ.

نەخشەی نهێنیی «شامیر» بۆ دروستکردنی سەرزەمینێکی فەلەستینی لە ئۆردۆن کە ئێستا دەیەویست حاشای لێبکا، هەرگیز نەگەیشتە جێیەک. ململانەی نێو کابینە بووە هۆی ئەوەی هەموو

جۆرە پێوەندییەک بەینی PLO و دەفتەری «شامیر» بپچڕێ. مەلیک حوسێن لە ڕێگای ڕایەڵکەی هەواڵگریی خۆیەوە لە پڕۆژەی «شامیر» بۆ لەسەرکارلابردنی ئاگادار بوو و دەستی دایە زنجیرەیەک قایمەکاری (احتیاط). بۆیە زۆر لە سەددام حوسێن نیزیک بۆوە و تەنانەت بەڵێنیشی لێوەرگرت کە ئەگەر ڕاپەڕینێک لە ئوردونی هاشمی ڕووی دا، ئەو بەهاواریەوە بچێ.

لەو بگرە و بەردەیەدا، ئەمریکاییەکانیش «شامیر»یان بۆ جێبەجێکردنی پڕۆژەکەی خستە تەنگانەوە. ئەوان دەگەڵ وڵاتانی میسر، ئوردون و عێراق بوونە هاوڕا و پێیان داگرت کە لێوارەی خۆرئاوا و کەرتی غەززە دەبێ وڵاتی دوارۆژی فەلەستینییەکان بن. مەلیک حوسێنیش بە ڕەسمی هەموو بەرپرسایەتییەکی لەبارەی فەلە ستینییەکان یان لێوارەی خۆرئاواوە لە ئەستۆی خۆی دارنی و گوتی لەمەودوا هیچ حەز لە گفتوگۆ دەربارەی دروستکردنی فیدراسیۆنی ئوردون- فەلەستین ناکا. لە گەرمەی ئەم بارودۆخەدا، ئەمریکا لە ئووتی ساڵی ١٩٩٠دا دەگەڵ سەددام حوسێن ناکۆکیی پەیدا کرد و بڕیاری دا، هێزی سەربازیی خۆی بەرێتە ئەو ناوچەیە.

کاتێک لە سەرەتای ساڵی ١٩٩١دا،سەددام حوسێن دەگەڵ ئەمریکا کەوتە شەڕ، فەلەستینییەکانی سەرانسەری دنیا لەنەکاو، بە چاوی قارەمان و ڕێبەرێک سەیریان کرد کە بە تاقی تەنیا بە دژی ئیمپەریالیزم کەوتۆتە شەڕ. عەرەفات، جگە لەوەی بە دژی ئەمریکا پشتیوانیی لە عێراق بکا، چارەیەکی نەبوو. پادشای ئوردون کە لەو کاتەدا وەفادارییەکەی لەنێوان ئەمریکا و سەددام حوسێندا بەش ببوو، لەپێشدا نەیدەزانی بە کام لایدا بشکێنێ، سەرەنجام بڕیاری دا پشتی سەددام حوسێن بگرێ و بە فەلەستینییەکان نیشان بدا کە ئەویش پشتیوان و کلکەی عەرەبەکانە. بەڵام، سووریاییەکان کە دژی سەددام حوسێن بوون، لەنەکاو هەڵوێستی خۆیان گۆڕی و بەرەو ئەمریکا بایاندایەوە.

کاتێک شەڕی خەلیجی فارس بە نرخی شکانی عێراق و لەبەین-چوونی هەزاران سەربازی عێراقی کۆتایی هات، عەرەفات پێگەی خۆی لەدەست دا. سەرچاوە دارایی‌یەکانی لە عەرەبستانی سعوودی و وڵاتانی دیکەی خەلیجی فارس وشک بوون و تۆزە ئیعتیبارێک کە لە خۆرئاوا بۆخۆی پەیدا کردبوو، لە بەین چوو. هەرچەند پادشای ئۆردۆن لە شەڕی خەلیجدا پشتیوانیی لە سەددام حوسێن کردبوو، پاش کۆتایی شەڕ بە پەلە بای‌دایەوە لای ئەمریکا. سووریایی‌یەکان، بە پاداشی هاوکاری دەگەڵ ئەمریکا لەشەڕدا، ڕێگایان پێ‌درا کۆنترۆلی لوبنان بەدەستەوە بگرن. لە ئاکامی ئەو کردەوە و دژکردەوانەدا، ئیسرائیل دووبارە کەوتەوە یەکێک لە دژوارترین هەڵکەوتە سیاسییەکان. چونکە ئەمریکایی‌یەکان گوتیان لە وتوویژەکانی ئاشتی دەگەڵ ئیسرائیلدا، دەبێ PLO وەلا بنرێ و فەلەستینییە نەرمڕۆکان لە گفتوگۆیەکانی ئاشتیدا لەبارەی لێوارەی خۆرئاوا و کەرتی غەززەوە بەشدار بن.

هەموو ئەو گفتوگۆیانەی ساڵانی ١٩٨٨ و ١٩٨٩ لە نێوان حیزبی لیکوود و PLOدا ئەنجام درابوون بوونە بڵقی سەر ئاو. بەم جۆرە، جارێکی دیکە هەرجۆرە هەوڵێکی شێلگیرانە بۆ چاری کێشەی فەلەستین بێ‌ئەوەی بوونی ئیسرائیل بکەوێتە مەترسییەوە، بەهۆی ئەمریکا و دۆستەکانیەوە لەبەین برا.

ئۆکتۆبری ساڵی ١٩٨٩، دوو حەوتوو دوای ڕووبەڕووبوونەوەی من دەگەڵ «شامیر»، ڕاوێژکارەکەی، «ئەوی پزنەر» پێشنیاری پێ-کردم بۆ ماوەیەک مۆڵەتی پشوو وەربگرم. ئەمن پێشوازیم لەو بۆچوونە کرد. ئەو ساڵە، بۆ من زۆر پڕمەترسی بوو. ئەمن ئەو ساڵە هەموو دەمێک لەوانە بوو بکوژرێم یان بگیرێم. بۆیە، بەڕاستی پێویستیم بە مۆڵەتێک هەبوو.

لە «ئۆرا»م پرسی، داخوا حەز دەکا بۆ ماوەی دوو حەوتوو بچینە سیدنی، شارێک کە لە سەردانەکانی پێشوومدا، ئاشقی ببووم. بەڵێنیشم پێدا کە دەگەڵ «شیرا» دەیانبەمە ئۆپێرا و لە قەراغ دەریا بە بەلەم دەگەڕێین. «ئۆرا» پێشنیارەکەمی زۆر پێ خۆش بوو.

ڕۆژی پێش وەڕێکەوتنمان بۆ ئوستڕالیا تەلەفون زەنگی لێدا. کارگوزاری سەفەرەکەمان کە کاروباری سەفەری ئیشکەرانی دەوڵەت، وەکوو منی ڕێکدەخست، گوتی بلیتی سەفەرەکەتان بەهۆیەکی نادیار ون ببوو. بەڵام چارەسەر کراوە و بلیتەکانتان ئامادەن. دوایە، شەوەکەی تەلەفون زەنگی لێدایەوە.

«ئاری، ئەمن لیۆن سیفم، منت وەبیر دێتەوە؟»

چۆن دەمتوانی لیۆن سیف سەماکەری بەناوبانگی سریلانکایی لەبیر بەرمەوە.

«هەی، تەلەفونم کرد ئەحواڵت بپرسم. ئەتۆ گفتت دا هەروەخت بۆت بگونجێ، سەرم بدەی، ئەمن هێشتا چاوەڕوانی سەردانتم. ئەمن حەز دەکەم ئەتۆ عەمەلیاتی ڕێکخراوەکەم کە ناوی عەمەلیاتی دۆستانی گێتییە، ببینی.»

هەستی کاتدۆزینەوەی «لیۆن» بۆ ئەوەی تەلەفونم بۆبکا لەوکاتەدا، ئەقڵ نەیدەگرت. لە دڵی خۆمدا گوتم ڕەنگە عەمەلیاتێکی

شاراوە لەوبارەیەوە لەگۆڕێدا بێ و هەستی کونپشکنی (کنجکاوی)م بزووت. پێمگوت، تەلەفونت بۆ دەکەم.

بیرم کردەوە، ئەگەر بچمە لۆس ئانجلێس و پێشنیار بکەم «ئۆرا» و «شیرا» بەبێ من بچنە سیدنی، «ئۆرا» تاڕادەیەک دەرەنجێ. بەلام، بەوپەڕی سەرسوڕمانەوە دیتم ئەو بە هیچ جۆرێک بەو پێشنیارە ناڕەحەت نەبوو.

«ئەمن هیچ ئۆگریم بەو شتە نیە کە دۆستەکەت دەیەوێ نیشانت بدا، بەلام هەرچۆنی بێ کێشەیەک لەو کارەدا نابینم. ئەتۆ بۆ سەردانی دۆستەکەت بچۆ لۆس ئانجلێس و لەوێرا وەرە سیدنی.»

ئێمە لەسەر ئەم فکرە ڕێککەوتین. ئەمن خەتەکەمم گۆڕی و بڕیارم دا لە ئیسرائیلەوە بچمە لۆس ئانجلێس و لەوێوە بڕۆمە سیدنی.

دوای بەجێهێشتنی ئیسرائیل، ئەمن لەسەر ڕێگا بۆ لۆس ئانجلێس، دوو ڕۆژم لە باشووری فەڕانسە دەگەڵ «جان دولارک» بەسەر برد و ڕۆژی یەکشەممە ٢٨ی ئۆکتۆبر گەیشتمە لۆس ئانجلێس. «لیۆن سیف» چاوەڕێی گەیشتنم بوو و بە دیتنم زۆر شاد بوو. ئەگەرچی ئەمن لەپێشەوە ژوورێکم لە هۆتێل بۆخۆم گرتبوو، ئەو گوێی نەدایە قسەی من و گوتی ئەتۆ میوانی منی. پاشان لە هالیوود بردمیە ماڵێک کە ئادرەسەکەی ڕاست، ئەو ئادرەسە بوو کە لەسەر کارتەکەی بۆ «دۆستانی گێتی» چاپ کرابوو.

بە منی گوت: «بۆ من زۆر جێی بەختەوەرییە کە ماوەی چەند ڕۆژ خانەخوێی تۆ بم و ئەم ڕێکخراوەت پێنیشان بدەم.»

«زۆر باشە، بەلام ئەمن دەبێ ڕۆژی سێ شەممە لێرە بڕۆم.»

بە بیستنی ئەم قسەیە ڕەنجانێکی ساختەی لە ڕوخساریدا دروست کرد و گوتی: «ئەتۆ ناتوانی ڕۆژی سێشەممە بڕۆی، چونکە ئەمن بە شانازیی تۆ میوانداریەکم ڕێکخستوە.»

ئەو هێندەی پێ داگرت کە دووبارە تەسلیمی پێشنیارەکەی بووم و ڕازی بووم کە هەموو ڕۆژەکانی حەوتوو لەوێ وەمێنم. بۆیە تەلەفونم بۆ «ئۆرا» کرد و مەسەلەکەم تێگەیاند. لەحاڵێکدا دژکردەوەکەی دیسان سەرسوڕماوی کردم، دەسبەجێ گوتی، کێشە نیە، چەند ڕۆژی دیکە لە ئیسرائیل دەمێنمەوە و دوایە ڕۆژی دووشەممە لە سیدنی دەتبینم.

لیۆن بە ترومبێل، دەوروبەری لۆس ئانجلێس و Venice Beash، ئەو شوێنەی خەڵکە بێماڵوحاڵەکەی لێ دەژیان، بەمن نیشان دا. ئەو گوتی کە هیوادارە، پارچە زەوییەک لە سریلانکا بۆ ڕێکخراوەکەی بکڕێ.

ئەمن هێشتا چاوەڕێی بیستن یان ڕووبەڕووبوونەوە دەگەڵ ئەسڵی بابەتەکە بووم.

بەپێی بەرنامە، سێ شەممە، شەوەکەی بۆ میوانداری دانرابوو. لەو شەوەدا دۆستانی لیۆن کە گرووپێک لە دەرسخوێندووانی درۆیین و چەند هیپی لە تەمەنی جۆراوجۆردا بوون، هاتنە ژوورەکە. ئەمن، واتە ئەو میوانەی میوانداریيەکە بە شانازیی وی بەرپا کرابوو، لەنێو واندا هاتوچۆم دەکرد و ئامانجی میوانداریيەکە نەختێک گێژی کردبووم. لەنەکاو ڕوخسارێکی ئاشنا لەنێو حەشیمەتەکەدا سەرنجی ڕاکێشام. بە دیتنی ڕوخساری، ترس سەر تا پێمی داگرت. ئەو دۆستی لەمێژینەم «ژۆزێف ئۆتوول»، پیاوێک بوو کە چەندمانگ پێشتر دیداری من و «ڕیچارد سەنت فەڕەنسیس»ی دەگەڵ «لیتنێر» لە فڕۆکەخانەی کەنەدی ڕێکخستبوو. بە دیتنی «ئۆتوول» هەستی مەترسییەکی جیددی، هێنامیەوە سەر هۆش.

لەحاڵێکدا «ئۆتوول» بۆ چاکوچۆنی، لەمن نیزیک دەبۆوە، ئەمن ڕووم کردە «لیۆن» و ئەوەندەی دەنگم دەیبڕی بەوپەڕی ساویلکەیی پرسیم: «ئێوە ئەو دووکەسە چۆن یەکتر دەناسن؟»

«ئۆتوول» گوتی: «ئەمن بیستم ئەتۆ لێرەی و هاتم سڵاوێکت لێ-بکەم.» هەستم کرد بابەتەکە بەو سادەیی‌یە نیە. «سیف» و «ئۆتوول» بێگومان دۆست و ئاشنای یەکتر بوون.

«ئۆتوول» باسەکەی هێنایە سەر سێ فڕۆکە C-130یەکە.

ئەو گوتی: «کۆمپانییەکەی من موعامەلەی ئەو سێ فڕۆکەیەی ڕێکخستوە. ئێمە قەرار بوو، لە موعامەلەی نێوان ئیسرائیل و ئێراندا نەخشی دەلاڵ بگێڕین، بەڵام ئێوە ئێمەتان لە موعامەلەکە دەرکردوە. ئێوە بەنیازن، ئەو موعامەلەیە بەهۆی سری لانکا و بەبێ بەشداریی ئێمە ئەنجام بدەن؟»

ئەمن باسی ئەوەم نەکرد کە ئێرانییەکان هەرگیز هاوکارەکەی، واتە «لێتنێر»یان نەناسیوە. هەوڵی من تەنیا ئەوە بوو کە دەگەڵ ئەو پیاوە نەدوێم.

ماوەیەک دواتر پرسیارێکی گرنگم لە «سیف» کرد: «لەم دۆزەخدەرەیە چباسە؟»

ئەو شانی هەڵتەکاندن و گوتی نازانم باسی چدەکەی. هەستی زگماکی (غریزی)م خەبەری دامێ کە بەرنامەیەک بەڕێوەیە و هەر لێرەش جێبەجێ دەکرێ.

سێ ڕۆژ دواتر کە ڕۆژی هەینی ۲ی نۆڤامبر بوو و ئەمن وەسبەینێڕا دەبوو ئەمریکا بەرەو سیدنی بەجێ بێڵم، و بەڕاستییش بۆ چوونی وێ زۆر تامەزرۆ بووم، دەوروبەری نیوەڕۆیە لە حەمامی «سیف» خەریکی خۆشوتن بووم، لەپڕ دەرگای حەمام کرایەوە. لەنێو

هەڵمی ئاوەکەڕا دیتم، گرووپێک بە یوونیفۆڕمی شینەوە چەکەکانیان بەرەو من ڕاداشتوە.

پیاوێک بۆ لای من هات، لێمپرسی: «چباسە؟»

ئەو گوتی: «تکا دەکەم لە حەمامێ وەرە دەرێ و خۆت پۆشتە بکەوە.» هەروا کە بە تەنیشتیاندا تێدەپەڕیم، چەکەکانیان بەرەو من ڕاداشتبوون. لەنێو واندا ژنێک هەبوو کە دواتر زانیم ناوی «ئێلێن بانار» Elaine Banar، بەرپرسی دەستگیرکردنی خزمەتە گومرکییەکانی ئەمریکا بووە. کاتێک بەرەو ژووری خەوتن دەچووم، دیتم «لیۆن سیف» بێئەوەی یەک قسە بکا یان بەرامبەر بەوەی دەگەڵ منیان دەکرد نارەزایەتییەک دەربڕێ، بێدەنگ و ئارام لەوێ ڕاوەستاوە و سەیری ڕووداوەکە دەکا.

ئەوان کیفە دەستییەکەمیان کە بەڵگە و سەنەد و دەفتەری ئادرەس و پاسپۆرت و پووڵ و کارتە ئیعتیبارییەکانمی تێدا بوون، زەوت کرد. پاشان منیان بۆ جلدەبەرکردنەوە ئازاد کرد، دوای ئەوەی جلەکانمم دەبەر کردنەوە، دەستمیان بردنە پاشەسەرم و دەستبەندیان لێدا. ئەمن بە مۆڕەوە چاوێکم لە «سیف» کرد و گوتم: «سوپاست دەکەم لیۆن.»

دوایە ڕووم کردە ئەوانەی گرتبوویانم و پرسیم: «ئێوە لەبەر چیتان گرتووم؟»

وەڵامەکەیان منی حەبەساند، پیلانگێڕان بۆ فرۆشتنی سێ فرۆکەی دروستکراوی ئەمریکا بە ئێران بە پێچەوانەی قانوونی کۆنترۆڵی هەناردەکردنی کەرەسەی جەنگیی ئەمریکایی. ئەوان لێیان زیاد کرد، بەڵگەیەک کە بۆ سابیتکردنی تۆمەتەکەم لە دەستیاندایە، دیدارێکە کە لە بارێ قاوەی فرۆکەخانەی کەنەدی دەگەڵ «لیتنێر»م هەبووە.

بردیانمـە لای ترومبێلێـک و لەسـەر کورسـیی پێشـەوە دایـان‌نـام. «ئێلێن بانار» لەسەر کورسیی پشتەوە دانیشت. چەند ترومبێلی دیکە لـە پێشـەوە و پشـتەوەی ئـەو ترومبێلـە کـە منیـان سـوار کردبـوو، دەڕۆیشتن کە هەموویان پڕ بوون لە کارگوزارانی تایبەتی. لە پشت فـەرمان (سـکان)ی ئـەو ترومبێلـە کـە ئـەمن تێیـدا دانیشـتبووم. کارگوزارێکی تایبەتی هەبوو بە ناوی «ستادینگەر» Staudinger. ئەو بـە بێسـیم گـوتی: «ئێمـە بـۆ تاوانبـارێکی یـەکجار خەتـەرناک و دەسـتدرێژکەر کـە هـەر ئێسـتا گرتوومانـە، پێویسـتیمان بـە کۆبوونەوەیەکی دادپرسی هەیە تا دەستووری گوازتنەوەی بۆ بەشی باشووریی نیۆیۆرک دەربکرێ.»

پاشان لە دادگای بەشی فیدراڵی لۆس ئانجلێس، ئەمن بەرگری لە خۆمم گرتە ئەستۆ و بە قازیم گوت، ئەگەر بە پەلە بمگوازنەوە بۆ نیۆیۆرک، ئەمن بۆخۆم ڕەزایەت دەدەم. ئەمن داستانی سامناکم لە سەفەری ئەو پاسانە بیستبوون کە زیندانییانیان لە لۆس ئانجلێسەوە بردبوونە نیۆیۆرک. یەک لەوان ئەوە کە سەفەرێکی وا ماوەی سێ مانگی پێدەچێ، و بۆیە هەوڵم دەدا دەسبەجێ بە فڕۆکە بمگوازنەوە بۆ نیۆیۆرک.

سـەرۆکی دادگـا دەسـتوری دا ئـەمن لـە مـاوەی دە ڕۆژدا بگوازرێمەوە بەشی باشووریی نیۆیۆرک. پاشان ئەوان زنجیریان لە دەست و لاقان دام و بردیانمە ناوەندی گرتووخانەی شار و ماوەی سێ ڕۆژ لـەوێ ڕایـانگرتم. لـەو گرتووخانەیـە،دەرەتانی تەلـەفونی نێونەتـەوەیی نـەبوو و جگـە لـەوە، ئـەمن دەفتەرتەلەفونەکەشمم پێ-نەبوو. بۆیە تەنیا کار کە دەمتوانی بیکەم، ئەوە بوو کە بە خەرجی خۆی تەلـەفون بـۆ «لیۆن سیف» بکـەم. کاتێک بـە تەلـەفون قسـەم

دەگەڵ کرد، ئەو حاشای کرد کە هیچ نەخشێکی لە گرتنی مندا هەبێ و گوتی، بەنیازم وەکیلێکت بۆ بگرم.

ئەمن کاتی بەجێهێشتنی ئیسرائیل، ژمارە تەلەفونی «لیۆن سیف»م دابوو بە «ئۆرا» بۆ ئەوەی ڕێگایەکی پێوەندیمان هەبێ. بۆیە، کاتێک دەگەڵ «لیۆن سیف» بە تەلەفون قسەم کرد، گوتی کە «ئان ماگۆری» Ann Magori تەلەفونی بۆ کردووم و بۆ دیتنم دێتە ئەمریکا. «ئان ماگۆری» کارگوزارێکی ماڵ و ملکی ئیسرائیلی بوو و ئەمن و «ئۆرا» کاتێک لە ئاپارتمان دەگەڕاین، دەگەڵی بووینە ئاشنا. دوای ئەوە هەرسێکمان بووینە دۆست و «ئان» بڕیاری دابوو بۆ سەفەری ئوستڕالیا، دەگەڵمان بێ. ئەو لە ئەمریکا لەدایک ببوو. بەڵام پرسیارێک کە لەو ساتەوەختەدا بۆم هاتە پێش، ئەوە بوو کە بۆچی ئەو لە جیاتی «ئۆرا» دەیەوێ بێتە ئەمریکا؟

لە «سیف»م پرسی:«ئەدی خێزانم؟»

ئەو گوتی، ئەمن نازانم داخوا «ئۆرا» ئاگای لە گیرانی تۆ هەیە یان نا.

پارێزەرێک کە « سیف» بۆی گرتبووم، لە گرتووخانە هاتە دیتنم. ئەو خۆی بە «هاری وەیس» Harry Weiss ناساند و گوتی خەریکی لێکۆڵینەوەی دۆسیەی منە و دڵنیایە لە بارەی دۆسیەکەمەوە، دەتوانرێ موعامەلەیەک بکرێ. بەڵام، لەهەرحاڵدا ئەمن دەبوو لەپێشدا بچووبامایە نیۆیۆرک.

کاتێک «ئان ماگۆری» گەیشتە ئەمریکا، لە زیندان هاتە لام و گوتی: «بابەتەکە وا سادە نیە. ئەمن یەک ڕۆژی تەواو دەگەڵ لیۆن سیف باسی تۆم کردوە و پێموایە ئەو و دۆستانی هەموو سەربە حکوومەتی ئەمریکان. ئەتۆ دەبێ زۆر وریای خۆت بی.»

دەوری سەعات ٣ی ڕۆژی پێنجشەممە ٩ی نۆڤامبر، زنجیریان لێدام و بە پاسێک کە پڕ بوو لە زیندانی، بردیانم. دیمەنێکی سامناک بوو کە سەدە تاریکەکانی وەبیر مرۆڤ دێنایەوە. پیاوانی ڕوخسارتۆزاوی بە خرینگەخرینگی ئەو زنجیرانەوە کە لێیان بەستبوون لە پاسەکەدا دەهاتن و دەچوون. زۆر لەوان، تاوانباری خەتەرناک بوون. لەو پاسەدا، بۆ پیاوێک کە جگە لە خزمەتی دڵسۆزانە بە وڵاتەکەی کارێکی نەکردبوو، ڕێزێکیان لەبەرچاو نەگرتبوو. بەڕاستی، پێچەوانەی ئەم بابەتە دروست بوو.

بردیانینە فڕۆکەخانەیەک، پاشان لە پاسەکەیان دابەزاندین و داوایان لێکردین بەدوای یەکدا ڕیز بین. لەحاڵێکدا شۆقی بەهێزی پرۆژێکتۆرەکان لێی دەدایین، چەند کەس لە فەرمانبەرانی ئەمریکایی بە چەکەوە گەمارۆیان داین. ماوەی سەعاتێک لەوێ چاوەڕوان بووین هەتا فڕۆکەیەکی کۆنی ٧٣٧ کە ڕەنگی تەواو سپی بوو، لە فڕۆکەخانە نیشت. چونکە پێشتر سەعاتیان لێستاندبووم، بە دڵنیایی نازانم چ- سەعاتێک بوو، بەڵام وابزانم دەوری ٤ یان ٥ی بەیانی بوو.

فڕینی فڕۆکەکە، لەلایەن بەڕێوەبەریی زیندانەکانەوە ڕێکخرابوو و تایبەت بوو بە گوازتنەوەی زیندانیان بۆ سەرانسەری ئەمریکا.

بەو زنجیرانەوە کە لە دەست و لاقیان بەستبووین، بە زەحمەت لە پلیکانەکانی فڕۆکە وەسەر کەوتین. خزمەتی نێو فڕۆکەکە هەر بۆ باسکردن نابێ. یەک لە زیندانییەکان داوای ئاوی خواردنەوەی کرد. پێیانگوت، فڕۆکەکە ئاوی تێدا نیە. زیندانییەکە گوتی، ئەم کارە بە پێچەوانەی مافەکانی هاونیشتمانانی ئەمریکایە کە لە قانوونی بنەڕەتیدا پێشبینی کراوە، و داوای کرد ناوی ئەو فەرمانبەرەی بدەنێ کە ئاوی نەدابوویە. فەرمانبەرەکە پێیگوت، تاوێک ڕاوەستە. چەند

چرکە دواتر، ئەو لە پشتەوەی فڕۆکەکەوە دەگەڵ سێ کەسی دیکە هاتنە پێش و بە شەپلاغە دایگژانێ و بە ولاغێکی بەهۆشیان ناو برد.

فڕۆکە پاش بڕینی مەودایەک لە جێیەک نیشتەوە، هێندێک لە زندانییەکانیان دابەزاند و چەند زیندانیی تازەیان سوار کردن کە ئەمجارە چەند ژنیشیان لەنێودا بوون. دوایە فڕۆکەکە لە شوێنێکی دیکە نیشتەوە و هەر ئەوکارە دووپاتە بۆوە. ئەو ژن و پیاوانەی کەلکیان لە ئاودەستی فڕۆکەکە وەردەگرت، بە جلی پیس‌بووەوە لە ئاودەست دەهاتنە دەرێ، چونکە زنجیرەکانیان لە ژووری چکۆڵەی ئاودەستدا ڕێگەی جووڵانی ئازادی پێ‌نەدەدان. تەنیا خواردن کە لە گوازتنەوە لە خۆرئاواوە بۆ خۆرهەلاتی ئەمریکا پێیان داین، خواردنەوەیەکی شیرن و چوکلیاتێک و سێوێک بوو.

سەعات ١٠ی پاش نیوەڕۆ، فڕۆکەکە لە شاری ئۆکلاهووما نیشتەوە. ناوی من و چەند کەسی دیکە خوێندرایەوە و فەرمانبەرێک بۆ چاوەدێریی ئێمە لە نیگابانەکانی پێشوو زیاد کرا. منیان بردە زیندانی فیدراڵی «ئێل ڕێنۆ» El Reno و بە پلیکانێکی کانزاییدا بردیانمە سللوول (بە بۆچوونی من خانەی تاکە کەسی لە جیات سللول گونجاوترە) (قاوش)ێک لە نهۆمی خوارێ. ئەگەر کەسێک هەر دوو دەستی بۆ ئەملا و ئەولا درێژ بکا، دەستی لە هەر دوو دیواری قاوشەکە دەدرێ. لەلایەکی قاوشەکە تەختێکی خەوتن هەبوو. کەسێک کە پێش من لەو سللوولە ببوو، شەکری بەسەردا ڕشتبوو. بۆیە سوورکە غارغارێنیان بەسەردا دەکرد. چیمەنتۆی تەختی ژوورەکە تەڕ بوو. لە سووچێکی سللوولەکە ئاودەستێکی ئالوومینیۆم و دەستشۆرێک هەبوون. ئاودەستەکە کاری دەکرد، بەلام دەستشۆرەکە خەراپ ببوو.

بۆ ماوەی دوو ڕۆژ لەوێ ڕایانگرتم. دواتر تێگەیشتم کە ئەوێ خەراپترین زیندانی ئەمریکا بووە. ڕاگرتنی زیندانی لەو ماوەیەدا بێ-ئەوەی ڕێگای بدرێ لە هەوای ئازاددا وەرزش بکا، ناقانوونی بوو. بەڵام ئەوان گوێیان نەدەدایە ئەو قسانە. تۆمەتی «زیندانیی خەتەرناک»یان دابوومە پاڵ و کەسیش نەیدەتوانی شەڕیان لەگەڵ بکا.

تەنیا شت کە بووە مایەی سوکناییم ئەوە بوو کە ڕێگایان دام بە خەرجی خۆی تەلەفون بۆ «لیۆن سیف» بکەم.

کاتێک «لیۆن» گوێچکەکەی هەڵگرت، گوتی: «ئەمن حەز ناکەم قسەت لەگەڵ بکەم، ئەتۆ تاوانباری. دۆستەکەت «ئان» لێرەیە، ئەو دەیەوێ قسەت لەگەڵ بکا.»

قسەکانی «ئان» بەڕاستی کوشتیانم. گوتی: «هیوادارم لە زینداندا بڕزی.» تەلەفونم بۆ«هاری وەیس»، ئەو پارێزەرەی «لیۆن سیف» بۆی گرتبووم، کرد و داوام لێکرد، تەلەفونێکی سێلایەنیم دەگەڵ «ئۆرا» لە ئیسرائیل و خۆی بۆ ڕێکبخا. ئەمن دەمزانی کارگوزارە دەوڵەتییەکانی ئەمریکا گوێ لەو تەلەفونە ڕادەگرن و بۆیە دەمەویست هەرنەبێ «ئۆرا» ئەوە پشتڕاست بکاتەوە کە ئەمن کارم بۆ حکوومەتی ئیسرائیل کردوە.

وەختێک «ئۆرا» هاتە سەر خەت، هومێدەکانم لەو بارەیەشەوە بوونە بڵقی سەر ئاو. چونکە، گوتی: «ئاری، ئەمن نازانم چۆن دەتوانم یارمەتیت بدەم.»

«کۆمەگێک کە دەتوانی بەمنی بکەی، ئەوەیە کە دەسبەجێ بێیە ئێرە، پارێزەرێکم بۆ بگری و بەمانەش بڵێی ئەمن چکەسێکم.»

«ئەمن ناتوانم ئەو كارە بكەم. لێرە لەبارەی تۆوە قسەم لەگەڵ كەسانی سەربە حكوومەت كردوە و ناتوانم بێمە وێندەرێ. لەجێدا، ئەمن هیچ كارێكم لە دەست نایە.»

«ئەی خوایە گیان! ئۆرا، یانی ئەوان تۆشیان بۆلای خۆیان ڕاكێشاوە؟»

ئەو وەڵامێكی نەدایەوە و ئەمنیش تەلەفونەكەم پچڕاند.

ڕۆژگارم تێكچووبوو. بۆ ماوەی پتر لە دە ساڵ ئەمن دەگەڵ بڕواپێنەكراوترین كەسانی سەر زەوی كە منیان لەڕادەبەدەر بەرامبەر بە مرۆڤ بەدگومان كردبوو، تێكەوتبووم و دیارە زەماوەندی من دەگەڵ «ئۆرا»ش لە یەكەم ساتەوە، لەسەر بناخەی بێمتمانەیی دامەزراوە و ئەویش لایەنی ئەمریكایی‌یەكانی گرتبوو. بێگومان بۆخۆشم بە نووستن دەگەڵ ئەم و ئەو متمانەی ئەو بە خۆمم لەق كردبوو. دەگەڵ ئەوەش، لە قووڵایی ڕووحمدا دەمەویست باوەڕ بكەم كە ژن و مێرد لەكاتی تەنگانەدا دەچنە كۆمەگی یەكتر. كاتێك دەنگی وی لەدوورەوە بە منی گوت كە ئەمن لەو بۆچوونەمدا بەهەڵە چووم، بەجارێك جەرگ و دڵم بەربوونەوە.

هەتا دەوری سەعاتێك دواتر، لەسەر تەختەخەوی ژوورەكەم دانیشتبووم و بیرم دەكردەوە كە لە دنیادا چەند تەنیا ماومەوە.

ڕۆژی دووەم، هاوبەندییەكیان ناردە سللوولەكەی من. هەرچەند ئەویش وەك هەموو زیندانییەكان، یۆنیفۆڕمی خاكیی زیندانییانی دەبەردا بوو، بەڵام ڕەنگی پێستی كەمێك تاوەسووت [؟] بوو، ڕیشی تاشیبوو و بەپێچەوانەی بەندییەكانی دیكە سەعاتی دەدەستیدا بوو. هەر كە هاتە ژووری قاوشەكە، دەسبەجێ داستانی ژیانی خەفەتباری خۆی بەم جۆرە بۆ من شی كردەوە كە ئەو خاوەنی كانگایەكی مس بووە و كارگوزارە حەرامزادەكانی حكوومەتی فیدڕاڵی ئەمریكا،

لەسەرماڵیات ئەویان هاویشتۆتە زیندان. دوایە دەسبەجێ لەمنی پرسی: «ئەدی ئەتۆ بۆ کەوتوویە زیندان؟»

ئەمن وای بۆ چووم کە ئەو پیاوە دەزگای دەنگتۆمارکردنی پێوە بەستراوە. بۆیە، شانم هەڵتەکاند و متەقم نەکرد. ئەمجار پاڵم وە تەختەخەوەکەم دا، تا بزانم، دوایە چدەبێ.

ئەو تێگەیشت کە هیچی لە من دەست ناکەوێ. جگە لەوەش، گۆیا بۆگەنی ئەو قاوشە شێدارە نەحلەتییە و بێدەنگیی من، حەوسەلەیان بردوە. بۆیە، لەنەکاو بەسەر یەکێک لە نیگابانەکانی زیندانیدا نەڕاند: «بۆچی ئێوەی دایک...ی حەرامزادە منتان لێرە ڕاگرتوە؟»

نیگابانانی زیندان پەیامەکەیان وەرگرت، هاتنە سللوولەکە و ئەویان دەگەڵ خۆیان برد- ئەمن پێم وایە گێڕایانەوە سەر ژیانی خۆی.

لە حاڵێکدا سەرۆکی دادگا دەستووری دابوو، ئەمن لە ماوەی ١٠ ڕۆژدا بگوازرێمەوە نیۆیۆرک، سەرەنجام دوای ١٢ ڕۆژ گەیشتمە نیۆیۆرک. ئەمن دەمزانی ئەوان دەیانەوێ ڕووحم بێننە سەر لووتم بۆئەوەی پێ لە تاوانێک بنێم کە هیچ کات نەمکردوە. ئەزموونێکی سامناک بوو. ئەمن لە وڵات، لە بنەماڵە و لە دۆستانم دوور کەوتبوومەوە و لەلایەکی دیکەش بەرەبەرە کەوتبوومە ئەو فکرەوە کە چما ئەمن دۆستێکیشم هەیە. ڕەفتاری «ئۆرا»ش تووشی سەرسوڕمانی کردبووم. داخوا بەڕاستی، ئەوانە مێشکی ئەویان لە بارەی منەوە شوتبۆوە؟ ئایا ئەو و «شیرا»یان بەر هەڕەشە دابوو؟ یان ئەو، بەرلەوەی ئەمن لە ئیسرائیل دەرچم، دەیزانی چ-چارەنووسێک چاوەڕێمە؟ هەرچۆنی بێ، ئەو ماوەیەک کاری بۆ ڕێکخراوی هەواڵگریی ئیسرائیل کردبوو. ئەوەش سەیر بوو کە ئەو دەگەڵ هەموو ئەو ئاڵوگۆڕانە موافیق بوو کە لە دواساتدا لە بەرنامەی سەفەرەکەماندا کردبوو. داخوا «ئۆرا» پێوەی کردبووم؟

نەمدەویست بیر لە شتی وا بکەمەوە. ئەمن باوەڕی وام لە مێشکم وەدەر نا – یان هەرنەبێ، هەوڵم دا وەدەری نێم.

لە پیکابی زینداندا کە لە فڕۆکەخانەوە دەیبردینە زیندانی ناوەندیی شار لە مانهاتان، ئەمن لە پەنای پیاوێکی خەڵکی ئەمریکای باشوور دانیشتبووم کە لە مەیامییەوە بە فڕۆکە چووبووە ئۆکلاهوومـا و لەوێڕا چووبووە نیۆیۆرک.

ئەو گوتی: «دۆستی تاوانبار، ئەو دەزگایە کە پێی دەڵێین کۆمەڵ، تۆی فڕێ داوەتە دەرێ. ڕاست، فڕێی داویە دەرێ.»

لە ناوەندی زیندان، منیان لەو زیندانییانە کە پێکەوە هاتبووینە زیندان، جیا کردەوە. هەمووانیان جلکی یەک سەریی قاوەیی‌ڕەنگیان دانێ، بەڵام جلکی یۆنیفۆڕمی ڕەنگنارنجییان دا بە من. منیان بە زیندانییەکی خەتەرناک دانابوو. ئەوان بەڕاستی بڕیاریان دابوو تێکم-بشکێنن.

دوو ڕۆژ دواتر، لە کاتی دادپرسییەکی کورت لە دادگادا، لە سەرۆکی دادگام پرسی، بۆچی منیان خستۆتە ڕیزی زیندانییە خەتەرناکەکانەوە. جێگری داواکاری گشتیی ئەمریکا بۆ بەشی باشووری نیۆیۆرک بە ناوی «باڕووخ وەیس» دەسبەجێ هاواری کرد: «ئەمە هەڵە بووە، پایەبەرز.»

پارێزەرێک کە «هاری وەیس» بۆ بەرگری لە من پەیدای کردبوو، ناوی «دان سەن تێلێری» Don San telleri بوو. ئەو پێشنیارێکی زۆر سەرسوڕهێنی بەمن کرد. ئەو گوتی، خۆی و هاوکارەکەی لە تایوان تەنیا بۆ سەردانی من هاتوونە ئەمریکا و پێیان‌خۆشە لە چالاکییەکانی من لە کۆریای باکووری ئاگادار بن. گوتم، ئەم بابەتە هیچ پێوەندییەکی بەو تۆمەتەوە نیە کە کاربەدەستانی ئەمریکایی دەیانەوێ بە منیەوە بچەسپێنن، کە بریتییە لە موعامەلەی کەرەسەی شەڕ و

پرسیارم کرد، بۆچی ئەوان ئەوەندە ئۆگرییان بە بابەتێکی واوە هەیە. ئەوان گوتیان، ئێمە پارێزەری کەسێکی دیکەین کە زانیاریی لەسەر موعامەلەی فرۆکەگەلی C-130 لە کۆریای باکووری و ڤێتنام هەیە. گوتم، لەوبارەیەوە لەوە زیاتر قسە ناکەم.

«سێن تیلێری» پێی داگرت، کە بابەتەکە زۆر سادەیە. «ئەتۆ پێش ئەوەی داوای سزات بۆ بکرێ، کرێی پارێزەرییەکەی ئێمە دەدەی. پاشان پێ لە تاوانەکەت دەنێی و دەچیەوە وڵاتی خۆت. ئەودەم، ئێمە دەگەڵ داواکاری گشتی کارەکە جوور دەکەین.»

گوتم: «زۆر باشە، و کرێی پارێزەرییەکەتان چەندە؟»

«١٢٥٠٠٠دۆلار.»

گوتم: «ئەمن موعامەلەی وا ناکەم.»

ئەوان پێیان دادەگرت، کە دەبێ دان بە تاوانێکدا بنێم کە نەمکردبوو. ئەمن ئامادە ببووم بە هەموو تواناوە هەتا قۆناغی کۆتایی بەرگری لە خۆم بکەم. ئەوان بە سەرنجدان بەو ململانە درێژەی لەپێشمدا بوو، خواحافزییان کرد و بەجێیان هێشتم.

پاشان، کاتێک ئەمن لە شوێنێکی هەمووانیی زیندانی ناوەندیی شار دانیشتبووم، پێیانگوتم، پارێزەرێک هاتوتە سەردانم. ئەمن چوومە ژووری کۆنفرانسی پارێزەرەکان و دیتم پارێزەرێکی زۆر ناودار دەستی دەگەڵ لێدامەوە و خۆی بەمن ناساند.

پرسیارم کرد: «جەنابت هاتوویە سەردانی من؟ داخوا ئەتۆ خێری منت دەوێ؟»

زەردەیەکی هاتێ و گوتی، ئەو پارێزەری حکوومەتی ئیسرائیلە. ڕوونی کردەوە کە ئەمن دەبێ پێ لە تاوانەکەم بنێم و دوایە بچمەوە ئیسرائیل. بەوپەڕی ئەدەبەوە پێمگوت، ئەمن کاری وا ناکەم.

جاری دووەم پارێزەرێکی دیکە لەلایەن حکوومەتی ئیسرائیلەوە چاوی بە من کەوت و لەبارەی ئەو دراوەوە کە لە ئورووپای رۆژهەڵات شاردراوەتەوە، پرسیاری کرد. ئەو بەڕادەیەک خستمیە بەر گوشار کە پێمگوت، ئەگەر وازم لێنەهێنن، بابەتی «رابێرت ماکسوێڵ» بە دنیا دەڵێم.

ئەو دەستی لە پێداگرتنەکەی هەڵنەدەگرت و درێژەی دایە: «ئەتۆ دەبیە لاوێکی دەوڵەمەندی خانەنشین.»

ئەم قسەیە، بەڕاستی توورەی کردم. ئەوان دەیانەویست، ئەمن لە نوختەیەکی دنیا «ئۆرشەلیم، ئالاباما» بچمە لێرەوارێک و ئیدی کەس گوێی لە دەنگم نەبێ. ئەوان دەیانەویست، کەلکم لێوەرگرن، بەداومەوە بکەن و فڕێم دەن. چۆنم دەتوانی متمانە بەمانە بکەم؟ ئەگەر بە قسەی وانم کردبایە، لەوانە بوو لەماوەی دوو مانگدا وەک «ئەمیرام نیر» مردبام. بە هەرحاڵ، ئەو دووەمین پارێزەرە کە لەلایەن حکوومەتی ئیسرائیلەوە پێوەندیی پێوە گرتم، بە نائومێدی بەجێی هێشتم.

پاشان «مایکل فاستێر»، کارگوزاری تایبەتیی FBI و کەسێک کە لە لایەن «لارێنس والش»ەوە ببووە لێکۆڵەری تایبەتیی مەسەلەی ئێران – کۆنتڕا، بۆ سەردانی من هاتە زیندان و لەبارەی «رابێرت مەک فارلین»ەوە پرسیاری لێکردم. پێشنیاری موعامەلەیەکم پێکرد. بەوجۆرە کە ئەو دۆسیە و لێپرسینەوەی من لەکۆڵ بکاتەوە و ئەمنیش هەموو شتێکی لەبارەی «مەک فارلین»ەوە پێبڵێم. ئەو داوای لێکردم لەپێشدا، ئەمن ئەوەی لەبارەی «مەک فارلین»ەوە دەمزانی پێیبڵێم. ئەمن گوتم، نا. ئەو گوتی، دووبارە دێمە سەردانت. بەڵام وەختێک بۆ جاری دواتر هاتە سەردانم، ملی بۆ مەرجەکانم ڕانەکێشا.

سـەرەنجام دەگـەڵ «بـاڕووخ وەیـس» جێگـری داواکـاری گشـتیی بەشی باشووریی نیویۆرک ملم بۆ ڕێککەوتنێک ڕاکێشا. بەوجۆرە کە ئامادە بووم، بێ ئامادەبوونی پارێزەر قسەی دەگەڵ بکەم، بەومەرجە لە هەر بارێکەوە قسـەم کرد پارێزراو بم. ئـەم کارەم لەبـەر هۆیـەکی سادە ئەنجام دا. دەمەویست، هەرکـەس کـارم دەگـەڵی کردبوو، بزانـێ کە ئامـادە بـووم، خـۆی و عەمەلیاتەکـەی بۆ هـەمووان ئاشـکرا بکـەم. بۆچوونی مـن ئـەوە بـوو کـە «وەیس» کـە نزیکـەی ٤٠ سـەعاتم قسـە دەگەڵ کرد و پێم وابوو هەمووی تۆمـار کـردوە، پەیامەکـە دەگەیەنێتـە ئەوانەی دەبێ بیانگاتێ و هەر واش دەرچوو.

لـە یـەک حاڵەتـدا، «وەیـس» وای کـرد لـە دەفتەرەکـەیڕا دەگـەڵ «ڕابێـرت ماکسـوێڵ» و «نیکـۆلا دیڤـیس» قسـە بکـەم. لـەو قسـانەدا داوای کۆمەگم لە هەردووکیان کرد. هـەردووکیان پێیـان گـوتم: «ئـەتۆ ئیدی بوویە بەشێک لە مێژوو.»

گفتوگۆی مـن دەگـەڵ «نیکـۆلا دیڤـیس» کـە بـەهۆی کاربەدەسـتانی پێوەندیدارەوە کۆنتڕۆڵ دەکرا، زۆر سـەرنجڕاکێش بوو.

ئەمن گوتم: «نیک، بۆچی ئەتۆ ڕاستییەکەیان پێ ناڵێی؟»

ئەو گوتی: «ئـەمن تـەنیا ڕۆژنامەنووسـێکم و نـازانم ئـەتۆ باسـی چ-بابەتێک دەکەی.»

دوای ئەوە «وەیس» بە منی گوت کە هەرجۆرە پێوەندییـەک دەگـەڵ گرووپـی ڕۆژنامـەی Mirrorی سـەربە «ماکسـوێڵ» دەبـێ بـەهۆی وەکیلەکەی «دیڤید زۆرنۆ» David Zornow وە ڕێک بخرێ.

نـاوی «زۆرنـۆ» ئـاوازێکی تـازەی لـە گـوێی منـدا زرینگانـدەوە. «زۆرنۆ» کەسـێک بـوو کـە لـە لایـەن گرووپـی «لارێنس واڵش»ەوە سەرهەنگ «ئۆلیڤێر نۆرت»ی خستبووە بـەر بەدواداچوونی قانوونی. ئـەمجار، ئـەو پـارێزەریی کەسـانێکی سـەرنجڕاکێشـی قبـووڵ کردبـوو:

«ماکسوێل»، «دیڤیس» و «تاوەرز». دیارە دواتر، دەرکەوت کە ئەو خزمەتێکی شیاوی بە وەکیلگر (موکل)ەکانی کردوە. هەرچەند، ئەو بۆخۆی کاتی دادپرسی لە دادگا ئامادە نەبوو، بەڵام توانی دەگەڵ کارگوزارە قانوونییەکان بکەوێتە وتووێژ و کارێکی کرد کە ناوی ئەو کەسانە لە دادگا نەیەتە گۆڕێ.

ئەمن دووبارە هەوڵم دا دەگەڵ «ئۆرا» بە تەلەفون قسە بکەم و قەناعەتی پێ بێنم، کە کۆمەگم بکا. بەڵام وەڵامەکەی توورەتری کردم. چونکە گوتی نایەمە ئەمریکا.

ئەمن نەمدەتوانی پارێزەر بۆخۆم بگرم. چونکە کاربەدەستانی کۆنترۆڵی پارەی بێگانە لە ئیسرائیل، ڕێگایان نەدەدا دایکم لە ئیسرائیلەوە پووڵێک بۆمن بنێرێتە ئەمریکا. سەرنجڕاکێش ئەوەیە کە قانوون و ڕێوشوێنەکانی ئیسرائیل باس لەوە دەکەن کە ئەگەر هاونیشتمانێکی ئیسرائیلی لە دەرەوەی وڵات، گرفتاریی قانوونیی هەبێ، دەتوانێ لە ئیسرائیلەوە پووڵ بگوازێتەوە بۆ دەرەوە. بەڵام بەپێچەوانەی ئەو قانوونە، کاربەدەستانی ئیسرائیل ڕێگایان نەدا دایکم پووڵم بۆ بنێرێتە ئەمریکا. بەوحاڵە، وەختێک دادوەری دادگا دەستووری دا، کە دادگا بۆخۆی پارێزەرم بۆ بگرێ، داواکاری گشتی بە بیانووی ئەوەی ئەمن موحتاج و دەستتەنگ نیم، دژایەتیی ئەوکارەی کرد.

ڕۆژی ١٨ی ژانویەی ١٩٩٠، پاش تێپەڕبوونی ٧٥ ڕۆژ لە زیندانی-بوونم،«باڕووخ وەیس» ئەو تۆمەتانەی بۆ باس کردم کە درابوونە پاڵم. هەروەها سەرۆکی دادگا بەپێی قانوونی دەزگای دادی تاوانباران، پارێزەرێکی بۆ دیاری کردم. لەمکاتەدا دۆستایەتییەکەمان گوڵی کردبوو، ئەو پارێزەرەی بۆ بەرگری لەمن دیاری کرابوو «تۆماس دوون» Thomas F.X Dunn پارێزەرێکی کاتوولیکی بەڕەگەز ئیرلەندی بوو کە لە نیۆیۆرک لەدایک ببوو. هەرچەند ئەو زۆری

لەسەر ناوچەی خۆرهەڵاتی نێوەڕاست، ئیسرائیل، یان کردەوە و دژکردەوە هەواڵگری و جاسووسییە نێونەتەوەییەکان نەدەزانی، بەوحاڵە حەزی دەکرد لەو بارەیەوە زانیاری پەیدا بکا.

بۆمن وەک ڕۆژ ڕووناک بوو کە ئیسرائیل دەبێ بەقەد ئەمریکا بۆ گرتنی من سەرکۆنە بکرێ. بەهەرحاڵ، ئەمن لەو ڕووەوە کە «تۆماس دوون» پێوەندیی بە ئیسرائیلەوە نەبوو، خۆشحاڵ بووم.

ڕۆژێک «دوون» خەبەری دامێ کە داواکاری گشتیی ئیسرائیل، بەنیازە «ئۆتوول» و «ڕێچارد سەنت فرەنسیس» واتە ئەو پیاوەی لە فرۆکەخانەی کەنەدی «لیتنێر»ی گومانـاویی هێنابووە دیتنی مـن، بخاتە بەر بەدواداچوونی قانوونی.

ئەمن گوتم: «شتی وا نابێ. چونکە «ئۆتوول» کار بۆ حکوومەتی ئەمریکا دەکا و ئەو کەسەیە کە لە فرۆکەخانەی کەنەدی منی بەگرت دا.» ئەمن نەمتوانی تێبگەم، بۆچی ئەو قەرار بوو، بکەوێتە ژێر بەدواداچوونی قانوونی.

«دوون» شارەزای وردەکاریی دۆسیەکەی من نەبوو -تەنانەت لە سەرەتادا، نەیدەزانی C-130 چیە. بەڵام، داوای لێکردم کە تەواوی وردەکارییەکانی بابەتەکەی بۆ ڕوون بکەمەوە. کاتێک ئەو لە نەخشی «ئۆتوول» و «سەنت فرەنسیس» ئاگادار بوو قبووڵی کرد کە بارودۆخەکە زۆر سەیروسەمەرە دێتە بەرچاو.

هیوای من بەوە کە بە دەستەبەر (کەفالەت، زەمانەت) ئازاد بکرێم دەگەڵ شکست بەرەوڕوو بوو. داواکاری گشتی بۆ دەستەبەری من داوای بارمتەیەکی دەکرد کە هەرنەبێ ۱۲۰۰۰۰ دۆلاری قیمەت بێ و لە ئەمریکاش بێ. ئەمنیش نەمدەتوانی، دراوی نەغد بێنمە ئەمریکا، چونکە حکوومەتی ئیسرائیل دژی ئەوکارە دەوێستا.

«دوون» گوتی، ئەوان بە دژایەتیی گوازتنەوەی پووڵ بۆ ئەمریکا، دەیانەوێ تۆ لە زینداندا ڕابگرن.

ڕۆژی پێنج شەممە، یەکەمی فێوریەی ۱۹۹۰، داوای سزام بۆ دەرچوو و دووبارە گیرایانمەوە زیندان. دوایە تێگەیشتم کە «ئۆتوول» و «سەنت فرەنسیس»، پێش من لە ئاوریلی ۱۹۹۰دا، گیراون و بە دەستەبەر ئازاد بوون. بەڵام هەتا مانگی مارسی ۱۹۹۰ داوای سزایان بۆ نەکراوە.

ئەو تۆمەتانەی درابوونە پاڵ ئێمە زۆر درێژ نەبوون. تۆمەتەکان لەجێدا بریتی بوون لەوە کە «سەنت فرەنسیس» و «ئۆتوول» و من ڕێککەوتووین، ئەمریکای بە سەرپۆشی ناقانوونی فریو بدەین و هەوڵ بدەین بە پێچەوانەی قانوونەکانی فیدراڵ، سێ فڕۆکە بە ئێران بفرۆشین.

ئەوان ئیددیعایان کرد کە ئێمە بۆ فرۆشتنی سێ فڕۆکەی C-130ی بارهەڵگری سەربازی لە نێوان فرۆشیارێکی ئیسرائیلی و کڕیارێکی ئێرانیدا دەلالیمان کردوە. هەروەها بۆ ئەنجامدانی ئەو سەودایە پلانمان داناوە کە نامەیەکی ڕاشکاوانە لە کۆمپانییەکی برێزیلی بەدەست بێنین کە بڵێ فرۆکەکان بۆ ئەو کۆمپانییەن و بەوجۆرە هەوڵمان داوە ڕاستییەکە لە ئیدارەی کۆنترۆڵی ئەمریکا بشارینەوە و نەمانهێشتوە ئەو ئیدارەیە ئاگاداری ڕاستییەکە بێ و بزانێ کە دوا قۆناخی فرۆکەکان ئێرانە نەک برێزیل.

سزای ئەو تاوانە بۆ هەرکام لە ئێمە هەتا ٥ ساڵ زیندان و ٢٥٠٠٠٠ دۆلار تەمبێیانە دەرۆیشت. دیارە توندی و نەرمیی سزاکە بەسترابۆوە بەوەی فڕۆکەکان چەندە پێشکەوتوون.

منیان ماوەی ١١ مانگ لە زیندان هێشتەوە و دادپرسییەکەم مانگی دوازدەیەمی گیرانم دەستی پێکرد و ئەمە یەکێک لە ناخۆشترین ئەزموونەکانی ژیانم بووە. ئەمن هەوڵم دەدا، لە زیندان، بارودۆخی ئاڵۆزی خۆم بۆ پارێزەرێک کە بۆم دانرابوو و بە ئاسانی نەیدەتوانی لە قسەکانم حاڵی بێ، شی بکەمەوە.

سـەیر ئـەوە بـوو حکوومـەتی ئیسـرائیل حاشـای لـەوە دەکـرد مـن بناسـێ یـان هـیچ وەخـت لەخزمەتیدا بـووبم یـان هـەرگیز کـارم بـۆی کردبێ.

«دوون» پێویستیی بە چەند شایەت هەبوو کە شایەتی بدەن، ئەمن کارم بۆ حکوومەتی ئیسرائیل کردوە و ئەمریکاش لەوە ئاگادار بووە. بەڵام، ئەمە نەدەگونجا. ئەو کەسانەی ئەمن کارم دەگەڵ کردبوون، تەنانەت ئامادە نەبوون قسەشم دەگەڵ بکەن، تا دەگا بەوەی خزمەتم بە حکوومـەتی ئیسـرائیل پشتڕاسـت بکەنـەوە. «دوون»چەنـد مانـگ تێکۆشـا ڕابـردووی خزمـەتی مـن لـە ئیسـرائیل داوا بکـا، بـەڵام بـۆی نەکرا. دایکم چوار بەرگ بیروڕای سەرۆکەکانمی بۆ ناردم و دامن بە داواکـاری گشـتی، بـەڵام حکوومـەتی ئیسـرائیل هـەموویانی بـە سـاختە دانـا. ناچـار، بیروڕایـەکان نـاردران بـۆ «ڕابێـرت پـەری» Robert Parry کـە ئـەودەم کـاری بـۆ گۆڤـاری Newsweek دەکـرد. ئـەو، ڕاسـتیی ئیعتیبارنامەکان و ئیمزاکانی پشتڕاست کردەوە. ئەم بابەتە بووە هۆی ئەوە کە حکوومـەتی ئیسـرائیل ڕەفتـاری خـۆی لـەو بارەیـەوە بگـۆڕێ. لـەوە بـەدوا، حکوومـەتی ئیسـرائیل قبـووڵی کـرد کـە سـەربەوم، بـەڵام دەیگـوت ئـەمن وەک وەرگێڕێکـی پلـەنزمی زمـانی فارسـی، خزمـەتیم کردوە و بەڕواڵـەت، پـاش ئـەوە بۆخـۆم کەوتوومـە کڕین و فرۆشـتنی ناقانوونیی کەرەسەی شەڕ.

چونکە ئیسرائیلییەکان ئیدی نەیاندەتوانی حاشا لەوە بکەن کە ئـەمن کـارم بـۆ ئـەو وڵاتـە کـردوە و ئیـددیعایان دەکـرد کـە تـەنیا وەرگێـڕی زمانی فارسی بووم، دەبوو ئەوان لەوبارەیەوە پێشـینەی کـاری منیـان هەبێ. دیارە دەمزانی ئـەوان لـەو بارەیـەوە پێشـینەی سـاختە دروسـت دەکـەن، بـەڵام هـەرچۆنی بێ هیـوادار بـووم ئـەو بەڵگـە و سـەنەدانەی دروسـتیان دەکـەن و بـەناوی ڕابـردووی خزمـەتی مـن دەیـانێنن، بتـوانن کۆمـەگ بـە ڕوونبوونـەوەی ڕاسـتییەکان بکـەن. لـە جەرگـەی

دادپرسییەکەمدا، پێشینەی خزمەتەکەم گەیشت و تێگەیشتم هەرنەبێ لەو ئیدارەیەی لەپێشدا کارم لێکردوە، دۆستێکی بێناوم هەیە.

بەلام بەرلەوەی ئەو خەبەرە سەرسوڕهێنەمان پێبگا، «دوون» توانی دەستی بگاتە تەنیا کەس، کە ئامادە بوو لە دادگا بە سوودی من شایەتی بدا. لەو گفتوگۆ زۆرانەدا کە دەگەڵ «دوون»م هەبوون و لەواندا هەوڵم دەدا، بۆی دەربخەم کە ئەمن بەشداری چالاکییە پلەبەرزەکانی حکوومەتی ئیسرائیل بووم، ڕاجی سەمغئابادی، ڕاپۆرتنووسی گۆڤاری «تایم»م وەبیر هاتەوە. بەوجۆرەی لە وتارەکانی پێشوودا شی کرایەوە، ئەمن پێش ئەوەی کەس ئاگای لە مەسەلەی ئێران – کۆنتڕا هەبێ، وردەکاریی بابەتەکەم بۆ سەمغ-ئابادی ڕوون کردبۆوە و داوام لێکردبوو، باسەکە لە گۆڤاری «تایم»دا چاپ بکا. بێگومان شایەتیدانی وی دەیتوانی کار بکاتە سەر بۆچوونی لیژنەی داوەرانی دادگا.

سەمغئابادی لەپێشدا حەزی نەدەکرد شایەتیم بۆ بدا. ئەو نەخۆشییەکی توندی بێهێزیی دەمارەکانی هەبوو و هەربۆیەش گۆڤاری «تایم» مۆڵەتی دەرمانکردنی پێدابوو. جگە لەوەش، ئەو، منی بە یەکێک لە هۆکارەکانی نەخۆشییەکەی دەزانی. بەلام، کاتێک بۆی دەرکەوت، ئەگەر بۆ شایەتی نەیەتە دادگا، فەرمانی ئامادەبوونی بۆ دەنێردرێ، قبووڵی کرد لە دادگا شایەتیم بۆ بدا.

کۆبوونەوەی دادپرسی ڕۆژی ١٧ی ئۆکتۆبر لە دادگای ناوچەیی مانهاتانی خواروو دەست پێکرا. دادپرسی دادگا، «لوویی ستانتۆن» Louis Stanton بوو. ئەمن لە تەنیشت «ڕیچارد سەنت فرەنسیس» سەوداگەری کێنێتیکاتی دانیشتبووم. لەسەر داوای ئێمە، دۆسیەی «ئۆتوول» لە ئێمە جیا کرابۆوە، چونکە ئەو بۆ پێوەکردنی من دەستی دەگەڵ حکوومەتی ئەمریکا تێکەڵ کردبوو. دواتر، ئەو تۆمەتبار کرا کە هەوڵی داوە، بە شێوەی ناقانوونی مووشەکی

ستینگێر له ئیسرائیله‌وه به وڵاتێکی دیاری‌نه‌کراو بفرۆشێ، له‌حاڵێکدا به‌ڕاستی وا نه‌بوو. دۆستانێکی که‌م که له حکوومه‌تی ئیسرائیلدا بۆ من مابوونه‌وه، کۆمه‌گیان کرد که ئه‌مریکا داوای سزای بۆ بکا. بۆیه، ئێستا ئه‌من و «ئۆتوول» که‌وتبووینه دۆخێکی به‌رامبه‌ره‌وه.

له‌کاتێکدا «باڕووخ وه‌یس» یارمه‌تیده‌ری داواکاری گشتی، تۆمه‌ته‌کانی «سه‌نت فره‌نسیس» و من و وتووێژه‌کانی من له فرۆکه‌خانه‌ی که‌نه‌دیی به‌درێژی شی ده‌کردنه‌وه، که‌وتمه بیری ئه‌وه که تا چماوه‌یه‌کی دیکه، له زیندان ده‌مێنمه‌وه.

ئه‌م کاره زۆر درێژ نه‌بۆوه. پاش ٤ ڕۆژ دادپرسی که به‌شی زۆرتری سه‌رفی لێکۆڵینه‌وه‌کانی کارگوزارانی حکوومه‌تی و هه‌ڵسه‌نگاندنی نێوه‌رۆکی گفتوگۆکان کرا، دادپرسیی دادگای «ستنتۆن» به ده‌سته‌به‌ری ۳۰۰۰۰ دۆلار منی له زیندان ئازاد کرد. ئه‌و سه‌ره‌نجام، نێوه‌رۆکی ئه‌و گفتوگۆ نه‌حله‌تییانه‌ی که «لیتنێر» تۆماری کردبوون، به ته‌واوی هه‌ڵسه‌نگاندبوو و گه‌یشتبووه ئه‌و ئاکامه که ئه‌وانه نابنه تۆمه‌ت. «لیتنێر» کارگوزاری نهێنیی گومرک بوو که ناوه ڕاستییه‌که‌ی «جان لی سیکا» بوو، به‌ڵام ئه‌من ناوه ساخته‌که‌ی «لیتنێر»ی بۆ به‌کار ده‌به‌م. هه‌رچۆنی بێ، ئه‌من دوای ۱۱ مانگ و سێ حه‌وتوو، له زیندان ئازاد بووم.

به‌شێکی گرنگ له‌و به‌ڵگانه که به دژی من هه‌بوون، شریتی گفتوگۆیه‌کانی فرۆکه‌خانه‌ی که‌نه‌دی بوو. هه‌رچه‌ند زۆر به باشیم ئه‌وانه له‌بیر نه‌بوون، به‌ڵام ده‌مزانی که له‌وکاته‌دا به دروستیم قسه کردوه و هه‌رکه‌س ئه‌و وتووێژانه‌ی هه‌ڵسه‌نگاندبا، به باشی تێ-ده‌گه‌یشت که ئه‌من وه‌ک مه‌ئمووریکی ڕه‌سمیم کار کردبوو.

دیاره «وه‌یس» به په‌یڕه‌وی له ویسته‌کانی ده‌فته‌ری «شامیر» پێی داگرت که ئه‌من پێشتر وه‌رگێڕێکی سه‌ربازی بووم و ئه‌مه‌شم بۆ سوودی خۆم کردوه.

بەلام نێوەرۆكی شریتەكان نیشانی دەدا كە ئەمن بۆ حكوومەت كار دەكەم. بۆ نموونە «لێتنێر» لە سەرەتای وتووێژەكەدا هەوڵی دا من هان بدا ئەگەر ئەم سەودایە بە سەركەوتنەوە ئەنجام بدرێ، دەرەتانی زۆر هەیە بۆ ئەوەی ئێرانییەكان هان بدرێن كە موعامەلەیەكی پترمان دەگەڵ بكەن. ئەمن لە وەلامدا گوتبووم نا،«موعامەلەیەكی دیكە لەگۆڕێدا نابێ.» بەلام جێگرەكەی بەڕێز «وەیس» ئاماژەی بەم بابەتە نەكرد.

هەروەها ئەمن پێم لەسەر ئەوە داگرت كە «لێتنێر» دەبێ كەسیەتیی خۆی و پێوەندییەكەی دەگەڵ تاران سابیت بكا. (بەلام ئەو هیچكام لەوانەی جێبەجێ نەكرد). هەروا داوام لێكرد ناوی كەسێكم لە تاران بداتێ كە بتوانێ لێبكۆڵێتەوە چكەسێك دەسەلاتی ئەو سەودایەی داوە بەو، كە ئەم كارەشی نەكرد.

هەروەها ئەگەر بەشێك لە تۆمەتەكانی حكوومەتی ئەمریكا بە دژی ئێمە ئەوە بوو كە ئێمە پلانمان داناوە كە مۆڵەتنامەی ساختە لەلایەن ئەو دەوڵەتەوە كە دوا بەكاربەری كەرەسە سەوداپێكراوەكەیە، ئامادە بكەین، بەلام ئەمن بە «لێتنێر»م گوتبوو كە: «بۆچوونی من ئەوەیە كە ئێوە بۆ ئەنجامدانی موعامەلەكە هەوڵ دەدەن مۆڵەتنامەی ئەو ولاتە بەدەست بێنن كە دوا جار كەلك لەو فڕۆكانە وەردەگرێ. ئەمن نازانم ئێوە بۆ دەبێ پێویستیتان بە مۆڵەتنامەیەكی وا هەبێ.» چونكە سەوداگەرێكی تایبەتی دەبێ نیگەرانی مۆڵەتنامەی ئەو ولاتە بێ كە ئاخر جار كالاكە بەكار دێنێ، نەك نوێنەری دەوڵەتێك. ئەمن هەروا وەگوێی «لێتنێر»م هەڵێنا كە فڕۆكەوانانی ئیسرائیلی فڕۆكەكان لێدەخوڕن.

دوای ئەوە، گرنگترین بەشی وتووێژی نێوان من و «لێتنێر» ئەنجام درا. «لێتنێر» گوتی: «بەهەرحاڵ، دەبێ بكەوینە نێو بابەتەكەوە، هیچ-كەس بەدوای ناوبانگی بێجێدا ناگەڕێ.»

وەڵامـم دایـەوە: «ئـەمن لـەبارەی بابـەتێکی دیکەشـەوە ڕاشکاوانە و بێپەردە قسە دەکەم. ئەو کەسانە، ڕێگای ئەنجامدانی ئەم سەودایەیان داوە.»

«لیتنیر»: «ببوورە، دەکرێ دووپاتی بکەیەوە؟»

ئـەمن: «ئـەو کەسـانە ڕێگـای ئەنجامـدانی ئـەو سـەودایەیان داوە.» مەبەستم لەو «کەسانە» حکوومەتی ئەمریکا بوو.

«لیتنیر»: «بەڕاست»

ئەمن: «ئەوان لە وەختی خۆیدا حاشا لەم قسەیە دەکەن.»

«لیتنیر»: «دیارە.»

ئەمن: «بەڵام ئێمە بەبێ جۆرێک ڕەزامەندی، دەست نادەینە کارێکی وا»

«لیتنیر»: «ئاها.»

ئەمن: «لە ئیسرائیل، هیچکام لەوانەی سەروکاریان دەگەڵ سیاسەت هەیە، نایانەوێ ئەم کارە کۆنترۆڵ بکەن.»

«لیتنیر»: «بەڵێ، ئەمە ئاشکرایە.»

بـۆ «وەیـس» دژوار بـوو ئـەم بابەتـە بـۆ لیژنــەی داوەران شــی بکاتەوە. بەڵگە و سـەنەدەکانی حکوومـەت، قسـەکانی منیـان پشتڕاست دەکردەوە کە کارەکـانی مـن لـە لایـەن هـەردوو حکوومـەتی ئـەمریکا و ئیسرائیلەوە ڕێگاپێدراو بوون.

بابەتێکی دیکەش هەبوو کە ڕوونکردنەوەی بۆ «وەیس» کارێکی ئاسـان نـەبوو، بـەڵام بـۆ «دوون» لـەکاتی بـەرگری لـە منـدا مایـەی سەرگەرمی بوو -ئەویش بابەتی پاسپۆرتەکانی من بوو. ئەمن هـەموو پاسپۆرتە کۆنەکانم پێنـەبوون، بـەڵام سـێیانم لەبـەر دەسـت بـوون و سـەفەرەکانی منیــان لــە ســاڵی ١٩٨٥ تــا ١٩٨٩ نیشــان دەدا. (پاسپۆرتەکانی مـن، عادەتـەن پێش تـەواوبوونی کـاتی ئاخریـان بـەتاڵ

دەبوونەوە و پاسپۆرتی تازەیان بۆ دەردێنام. چونکە بەهۆی سەفەری زۆر کە دەمکردن لاپەڕەکانی تایبەتی ڤیزا بە خێرایی پڕ دەبوونەوە.)

پاسپۆرتەکانی من نیشاندەری سەفەری زۆرم بۆ فەڕانسە، ئینگلستان، گواتمالا، ئەمریکا، ئیسرائیل، ئێلسالوادۆر، پێرۆو، جامایکا، ئوستڕالیا، پاراگوا، ئارژەنتین، سری لانکا، ئوتریش و شیلی بوون و جگە لەوەش بۆ هەرکام لەوانە چەند جارم سەفەر کردبوو و بۆیە، مۆرێکی زۆری چوونەژووریان پێوە بوو. کەموزۆر لە ماوەی چەند ساڵدا، ئەمن ٧٠ یان ٨٠ سەفەرم بۆ وڵاتانی جۆراوجۆر کە زۆربەیان لە نیوەتۆپی خۆرئاوا بوون، ئەنجام دابوو. بەجۆرێک کە «دوون»ی پارێزەرم بە وردەکارییەکی زۆرەوە بۆ لیژنەی داوەرانی شی کردنەوە. وەرگێڕێکی پلەنزمی زمانی فارسی، ناتوانێ ئەو هەموو سەفەرەی کردبێ. بەڵام «وەیس» کە نەخشی کۆمەگداوەری لە ئەستۆ بوو، ڕوونی کردەوە کە هەموو ئەو سەفەرانە بۆ تێپەڕاندنی پشووەکانی خۆی بوون. بەم جۆرە «وەیس» منی وەک وەرگێڕێکی پلەنزم دەناساند کە داهاتی لە داهاتی هەموو وەرگێڕە پلەنزمەکانی جیهان پتر بووە.

وەختێک «وەیس» خەریکی کۆکردنەوەی بەڵگە بە دژی من بوو، بۆم دەرکەوت کە لەو ئیدارەیەی پێشتر کارم لێکردوە، دۆستێکم هەیە. پاش ئەوەی ئیسرائیلییەکان پێیان لەوە نابوو کە ئەمن لە ڕێکخراوی هەواڵگریی سوپا کارم کردوە، «وەیس» داوای لێ-کردبوون ئەو پێشینەیەی نیشان دەدا ئەمن وەرگێڕێکی پلەنزم بووم، بۆ ئەو بنێرن تا بە نیشاندانی بە لیژنەی داوەران ئیددیعانامەکەی پتەو بکا.

کاتێک ئەو بەڵگانە لە پاکەتێکی سەربەمۆردا گەیشتن، «وەیس» دەبوو پێشانی دادگایان بدا. بەڵگەکان، ڕاپۆرتی چۆنیەتیی ئەنجامدانی ئەرکەکانم و هەروەها ٤ نامەیان تێدا بوون کە ئەو کاتەی ڕێکخراوی

هـەواڵگریی سـوپام بـەجێ دەهێشـت، سـەرۆکەکانم بـۆ قـەدرزانی لـە کارەکـەم بۆیـان نووسـیبووم و «وەیـس» ئـەوانی بـە سـاختە نـاو بردبوو. (ئەوان بـەر لـەوەی ئـەمن بچمـە ڕێکخـراوی سـەرۆکوەزیری نووسیبوویان، بەڵام کەس ئەم بابەتەی پشتڕاست نەدەکردەوە.)

هــەروەک بۆخـۆم بیـرم دەکـردەوە، پێشـینەی خزمەتـەکانمیان لـە ئیسرائیل گۆڕیبوو، دوایە ناردبوویان بۆ دادگا. هـەموویان منیـان وەک وەرگێڕ نیشان دەدا، دوو لەوان هیچ شوێنێکیان بۆ خزمـەتی مـن بـاس نـەدەکرد. ئـەو دوو بەڵگەیـە ئەوانـە بـوون کـە دۆسـتە نەناسـراوەکەم ئامــادەی کردبــوون و منیــان ســەربە یەکەیــەک نیشــان نــەدەدا. وەرگێـڕراوی ئینگلیزیـی ئـەو بەڵگانــە دەیگـوت: «ئەفســەری سـتاد، ئامرازی شەڕ.»

ڕوونکردنەوەی ئەم بابەتـە بـە «باڕووخ وەیس» نـەدەکرا. ئـامرازی شەڕ بریتی بـوون لـە هـەموو جۆرە کەرەسـەیەکی سـوپایی، ئـامراز و کەلوپەلی سەربازی -ئەمە شتێک بوو کە هەمیشـە وەک بـواری کـاری خــۆم نــاوم بردبــوو، و «ئەفســەری ســتاد»، نەیــدەتوانی مانــای وەرگێڕێکی پلەنزم بدا.

ئەو نامەگەلە کە سەرۆکەکانم بۆ قەدرزانی لە مـن نووسـیبوویانن و وەک بەشـێک لـە بەڵگـەکانی پێشـینەی خزمـەتی مـن گەیشـتنە دادگـا، دیارییـەکی دیکـە بـوون کـە دۆسـتە نەناسـراوەکەم بـۆی نـاردبووم و وەک گـوڵی سـەر کێکـی شـیرینی وا بـوون. یەکـەمینیان سـەرهەنگ «پەسا مێلووانی» Pesah Melowany نووسیبووی. بەشێکی بـەم جـۆرە بوو:

«بەڕێز بن مۆناشێ لە پۆستە گرنگەکانی ئیدارەی پێوەندییـەکانی دەرەوەی هێزەکـانی بـەرگریی ئیسـڕائیلدا کـاری کـردوە. بـەڕێز بـن مۆناشێ، لەو پۆستانەدا بەرپرسی ئەنجامی مەئمووریەتی جۆراوجۆر، گرنگ و پێچەڵپووچ بووە کە لێوەشاوییەکی دەگمەنیان بۆ لێکدانـەوە و

جێبەجێکردن پێویست بووە. لە ئاشنایەتیی وی لەم ئیدارەیەدا، ئەمن ئافەرین بۆ توانا و فیداکارییەکەی دەنێرم. ئەو مەئموورییەتەکانی بەشێوەیەکی زۆر شیاو و دەستپاکانە ئەنجام داون.»

نامەیەکی دیکە لە سەرهەنگ «ئاریە شوور» Arieh Shurەوە دەڵێ:

«بەڕێز بن مۆناشێ لە ماوەی خزمەتی لەم ئیدارەیەدا، ئەرکێکی لە ئەستۆ بوو کە کارزانیی لە لێکۆڵینەوە و جێبەجێکردندا پێویست بوو. بەڕێز بن مۆناشێ، ئەرکەکانی بە زیرەکی، کارزانی و لێبڕاوییەوە ئەنجام داون. خۆی دەگەڵ هەلومەرجی جۆراوجۆر گونجاندوە.»

دوو نامەی دیکە وەک ئەم دوو نامەیەش هەبوون کە ئاماژەیان بە «پۆستگەلی گرنگ» و «بەرپرسایەتیی گەورەگەورە» کردبوو.

بەم جۆرە، دادیار چەک کرا و داستانی وەرگێڕی پلەنزم لە ئاودا مرد. (مەبەستی نووسەر ئەوەیە کە ماسییەکە پێش ئەوەی بگیرێ، لەنێو ئاودا مرد. «مترجم فارسی»)

پێش ئەوەی «دوون» دەست بکا بە بەرگری لە من، ئێمە کەلکمان لە پشوو وەرگرت. لەم ساتەدا «ڕیچارد سەنت فرەنسیس» کە لەم ڕووداوەدا بە هەڵە تۆمەتبار کرابوو، تووڕە بوو و ڕوو بەو ڕۆژنامەنووسانە کە گوێیان لێی بوو، گوتی کۆمپانیی Transcapital کە ئەو کاری بۆ کردوە، بۆتە هۆی گیران و تۆمەتبارکرانی. ئەو بە هەڵچوونەوە گوتی، هۆی ئەوە کە کۆمپانییەکە ناوی ویی هێناوەتە نێو ئەو داستانە، ئەوە بووە کە ئەو بە ئاشکرا لەبارەی نەخشی ئەو کۆمپانییە لە فرۆشتنی سەختئامێری کامپیوتەر بە دەرەوەدا قسەی کردوە.

سەرەنجام دادگا دووبارە پێکهاتەوە و ئەمجارە نۆرەی ئێمە هات. «دوون» تاقە شایەتی کە ئێمە هەمانبوو، بۆ شایەتیدان بانگ کرد. ئەو ڕاجی سەمغئابادی، هەواڵنووسی گۆڤاری «تایم» بوو. سەمغ-

ئابـادی، کـەمێک بـەخۆوە و خـەڵکی ئێـران بـوو. ئـەو بـە هـەژان و هاندانـەوە قسـەی دەکرد و دادپرسـی دادگـا، چەنـد جـار داوای لێکـرد ئارام بێ. کاتێک داوای لێکرا لەبارەی ژیانی لە ئێرانـەوە ڕوونکردنـەوە بدا، ئـەو باسـی کۆمۆنیسـتەکان و موسـوڵمانە توندڕەوەکانی کـرد کـە گیانی لە دەستیان ڕزگار کردبوو، دەستی بە قسەی بێ سەرەوبەرە و درێژدادڕی کرد و ڕوونـی کردەوە کە تەنانـەت بۆ گاڵتـە و ڕابواردن بردوویانەتە بن داری ئیعدام، بەڵام ئیعدامیان نەکردوە.

کاتێک لـە ڕاجی سـەمغئابـادی پرسـرا، پێوەنـدیی دەگـەڵ مـن چـۆن بووە، گوتی: «بەئازار، ناخۆش، خەتەرناک و هێندێ جار لەتوانابەدەر، بـەڵام بەهـەرحاڵ ئـەمن ناچـار بـووم سـەروکارم دەگـەڵی هـەبێ.» جارێکیش کە دەیەویست ناوم بێنێ، گوتی: «ئـەو کابرایـە»، جـارێکیش کە «دوون» شێوەی پرسیارلێکردنی گۆڕی بێئـەوەی هیچ ئاکامێکی هەبێ، ئەو بە «دوون»ی گوت: «ئەوەش بزانە کـە ئـەمن هـیچ ڕێـزێکم بۆ وەکیلگرەکـەت نیـە.» دوایـە وەختێـک دادپرسـی دادگـا، دەیەویسـت ئـارامی بکاتـەوە و پێـی گـوت: «باشـترە کـەمێک پیاسـە بکـەی و ئـارام ببیەوە،» قیژاندی و گوتی:

«پایەبەرز، دوو میلیۆن کەس یان کوژران یان شـەل و کوێر بوون، و ئێمە ئەو زبڵوزاڵەمان لەوێ داناوە تا کردەوەکانی جۆرج بـووش و شامیری پێ داپۆشین. ئەمن بابەتی وام پێ قبووڵ ناکرێ.»

ئەمەش شایەتێک بوو بۆ بەرگری لە من!

«وەیس» بەشـی زۆری ئـەو کاتـەی لـە دادگا پرسـیاری لـە سـەمغ-ئابادی دەکرد، بۆ ئەوە تەرخان کردبوو کە هانی بدا، پێ لەوە بنێ کە ئەمن پێمگوتوە، پێوەندیم بە ڕێکخـراوی هـەوالگریی ئیسـرائیلەوە هەیـە و ئەوەندەی ئەو ئاگادارە، ڕەنگە ئەمن وەرگێڕێکی پلەنزم بووبم. بۆیـە کاتێـک «وەیـس» لێـی پرسـی داخـوا ئـەمن هـیچ وەخـت باسـی وەرگێڕبوونی خۆمم کردوە، ئـەو بێ ڕاوەسـتان و بیرکردنـەوە گوتی:

«وەرگێڕێـک هـیچ کـات دەگـەڵ ئەنـدامانی کابینـە تریـاک ناکێشـێ.»
دادپرسـی دادگا بـە ئەندامانی لیژنـەی داوەرانی گوت ئـەم قسـەیە بـە نەبوو دابنێن. بەڵام ئەمن دڵنیا نیم ئەوان بـە ئامۆژگارییەکەی ئـەویان کردبێ.

کورتییەکـەی ئەوەیـە، سـەرەنجام ڕاجـی سـەمغئابـادی، سـوێندی خـوارد کـە چەنـد مانـگ پـێش ئـەوەی داسـتانی ئێـران -کـۆنترا لـە ڕۆژنامـەی «الشـریعە» دا چـاپ و بـڵاو بێتـەوە، ئـەمن هـەموو وردەکارییـەکانی فرۆشـتنی ئـەو کەرەسـە جەنگییانـەم بـۆ ڕوون کردۆتەوە کە پێوەندییان بە مەسەلەی ئێران -کۆنتراوە هەبووە.

«تۆماس دوون»ی پارێزەرم، پیاوێکی کەڵەگەت و ڕەقەڵە بوو کە سـمێڵێکی درێـژ و پـڕی هـەبوون. ئێسـتا ئامـادە ببـوو کـە بابـەتی گرنگترین دۆسیە کە لـە تەمەنی پیشەکەیدا دەگەڵی بەرەوڕوو ببوو، بـۆ لیژنـەی داوەران ڕوون بکاتـەوە. ئـەو دڵنیـا بـوو ئـەوەی بۆکورتکردنـەوە لـە کۆتـایی بەرگرییەکەیـدا پێویسـتی بوو،دراوەتـە دەستی. ساڵێک پێشتر ئەو هیچ هاندەرێکی بۆ پارێزگاری لەمن نـەبوو، تەنانەت بە زەحمەت دەشیناسیم. بـەڵام ئێستا تێگەیشتنێکی قووڵ و بـەهێزی لـەو گێژاوە کـە ئـەمن تێی کـەوتبووم پەیدا کردبوو. ئـەو بـە لیژنەی داوەرانی گوت:

ئـەو کەسـەی ئێسـتا لێرە دانیشتوە، بەڕاستی قوربانییـەکی دیکەیـە، قوربانییـەکی ئیسـڕائیلی، قوربـانیی کۆمـەڵێک لـە کەسـانی جۆراوجـۆر؛ قوربانیی خزمەتە گومرکییەکانی ئـەمریکا، قوربـانیی حکوومـەتی وڵاتـە یـەکگرتووەکانی ئـەمریکـا و سـەرەنجام، قوربـانیی حکوومـەتی خـۆی، ئیسڕائیل، کە ئـەوی تـەنیا و بێکـەس وێڵ کـردوە... ئـەمریکایی‌یـەکان و ئیسـڕائیلییەکان هـەوڵ دەدەن، ڕاسـتییەکان لـە پـەردەدا بشـارنەوە، و ئێسـتا هـەمووان ئـەم پیاوەیـان لـەبیر بردۆتـەوە، تـا بـۆ زیندووومانـەوە پەلەقاژە بکا...

ئەو ڕوونی کردەوە: «بەڕێز بن مۆناشی بە هیچ جۆر نەیدەویست قانوون و ڕێوشوێنەکانی ئەمریکا بشکێنێ. ئەو کاری بۆ حکوومەتی ئیسرائیل دەکرد. هەرچەند کەس پێی لەو ڕاستییە نانێ، بەڵام وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا (لەڕاستیدا CIA)، عەمەلیاتی وی پەسند کردبوو. ئەگەر لەبیرتان بێ، ئێمە هەمیشە هەوڵمان داوە، عەمەلیاتی ئەوانەی دەستیان لە بابەتی وەک (واترگێت)، (ئێران- گێت)دا هەبوو، داپۆشین و حاشای لێبکەین. بەڵام سەرەنجام ئەوان پێیان لە ڕاستییەکە نا. داستانێک کە ئێمە ئەمڕۆ دەگەڵی بەرەوڕووین، یەکێک لەو جۆرە ڕووداوانەیە.»

«دوون» داوای لە لیژنەی داوەران کرد، کەمێک بیر لە شایەتییەکەی سەمغئابادی بکەنەوە. «ئەگەر ئەم پیاوە [ئەمن] دەمی پێکەوە نابایە، ئەمن و ئێوە و هەرکەسی دیکەی لەم وڵاتە دەژی، هەتا ئەمڕۆ لەبابەتی ئێران – کۆنترا ئاگادار نەدەبوو. ئێوە پێتان وا نیە ئەوان (حکوومەتی ئەمریکا) لەم بارەیەوە سەرکۆنە کران. نازانن ئەوان دەیانەوێ، کەسێکی دیکە باجی عەمەلیاتەکەیان بدا.»

«دوون» وردەکاریی سەفەرەکانی من بۆ وڵاتە جۆربەجۆرەکان و هەروەها نێوەرۆکی نامەگەلێکی کە سەرۆکەکانم نووسیبوویانن و قەدرزانییان لێم کردبوو، وشە بە وشە بە درێژی شی کردەوە.

لیژنەی داوەران بۆ بیرکردنەوە لەبارەی ڕایەکەیەوە لە دادگا چووە دەرێ. لە کاتێکدا ئەمن لە دەرەوەی دادگا دانیشتبووم و دەگەڵ ڕۆژنامەنووسان و کەسانی دیکە کە ڕەوتی دادگایان دیتبوو، قسەم دەکرد، بیرم لەوە دەکردەوە داخوا ڕای لیژنەی داوەران چدەبێ. ئەمن تەنیا دەمتوانی دوعا بکەم کە ئەوان تێبگەن ئەو شایەتییەی بۆ بەرگری لەمن لە دادگادا بیستوویانە، ڕاستە. چونکە ئەگەر وا بایە، ئەوان ڕێیەکیان نەدەبوو جگە لەوە کە من بە بێگوناح بناسن. پاش دووسەعات و نیو دەنگەدەنگێک بەرز بۆوە و ئەندامانی لیژنەی

داوەران هاتنــەوە دادگــا... بــەڵام، نەهاتبوونــەوە ڕای خۆیــان دەربــڕن، ئەوان دەیانەویست دووبارە گوێ لــە شــریتێک بگــرن کــە «لیتنێــر» لــە فرۆکەخانە لە گفتوگۆیەکانی من دەگەڵ خۆی ئامادەی کردبوو.

٣٠ دەقیقــە دواتــر، دووبــارە ئەنــدامانی لیژنــەی داوەران گەڕانــەوە دادگا. دوای شــەش حەوتوو کە بەسەر ڕەوتی دادگادا تێپەڕیبوو، ئەمــە ئەو دەمەســاتە بــوو کــە هــەم ئارەزووی گەیشــتنیم دەکــرد و هــەم لێــی دەترسام. ئەمن دەمزانی بێگوناحم؛ بەڵام لەوە نیگەران بووم کە ڕای لیژنەی داوەران بە دژی من ڕابگەیەندرێ. لە حاڵێکدا هەوڵم دەدا، ڕای ئەندامانی لیژنەی داوەران لە ڕوخساریاندا بخوێنمەوە دڵم بە توندی لێیدەدا. هەمیشــە پێم وابــوو، دەتــوانم فکــری خــەڵک لــە ڕوخســاریاندا بخوێنمــەوە، بــەڵام هەســتم دەکــرد ئــەو توانایــەم لــێ زەوت کــراوە. هــەرچۆنی بــوو، چــاوم نووقانــدن. حــەزم دەکــرد هــەموو دادگــا لەنێوچووبا و ئەمنیش لە کونێکی گەورەی ڕەشدا ون بووایەم.

«بێگوناح!» ئــەم وشــەیە لــە مێشــکمدا زرینگایــەوە. لــەپڕ چاوەکــانم کرانــەوە، ئەنــدامانی لیژنــەی داوەران تەماشــایان دەکــردم و زەردەیــان دەهــاتێ. پــاڵم وە کورســییەکە دا. سەرانســەری ڕوخســاری «ســەنت فرەنســیس» کــە ئــەویش بــە بــێگونــاح ناســرابوو، بــە پێکــەنین داپۆشــرابوو. هــەمووان پێیــان گوتبــووم، هــیچکــەس لــە تۆمەتــەکانی فیدراڵ بێگونــاح دەرنــاچێ و باوەڕیــان وا بــوو چونکــە بێگونــاحم، ســزایەکی ســووکم دەدەنــێ. «تۆمــاس دوون» دەســتی بــۆ تۆقــە و پیرۆزبایی لەمن ڕاداشتبوو. دادپرسی تەواو ببوو.

ئەمن بە بێگوناح ناسرابووم. پیاوێکی ئازاد.

ئــەو ڕۆژە ٢٨ی نۆڤــامبری ١٩٩٠ بــوو. ســاڵوەگەڕی دەیــەمی ئــەو ڕۆژە کە کرابوومــە ئەنــدامی کۆمیتــەی فرۆشــتنی کەرەســەی شــەڕ بــە ئێران.

لەو کاتەوە کە لە دادگا بە بێگوناح ناسرام، زۆر ڕووداو هاتنە پێش. گرووپێک لە ڕۆژنامەنووسان هێندێک لەو ڕووداوانەیان خستوونە بەر لێکۆڵینەوە، کە ئەمن باسم کردوون و هەرنەبێ بەشێک لەم داستانە ئێستا خەریکە ڕوون دەبێتەوە. «ڕابێرت پێری» لە دوو نووسینی زۆر بەرزدا، وردەکاریی بەسەرهاتی فرۆشتنی چەکوچۆڵە بۆ ئازادیی بارمتەکانی لە PBSدا بڵاو کردەوە.

«گری سیک» ڕاوێژکاری پێشووی کارتەر لە کاروباری ئێراندا کتێبە گرنگەکەی خۆی لە ژێر ناوی October Surpriseدا بڵاو کردەوە. ئەو بەڵگە و سەنەدانەی بە دەستی هێنان ئەویان قانیع کرد کە ڕەیگان و هاوڕێیانی بە نهێنی موعامەلەیان دەگەڵ خومەینی کردوە. ئەو ڕاستییانەی کتێبی بەرزی «سەیموور هێرش» Seymour Hersh لە ژێر ناوی The Samson Option لەبارەی بەرنامەی ئەتۆمیی ئیسرائیل و «ڕابێرت ماکسوێل»ەوە بڵاوی کردنەوە، دەنگ و هەرایەکی زۆریان وەڕێ خست. کتێبی تازەی «پاتریک سیل» Patrick Seals لە ژێر ناوی Abu Nidal: A Gun for Hireدا لەبارەی پێوەندییەکانی ئیسرائیل دەگەڵ تیرۆریستەکانی فەلەستین بەرچاوڕوونی دەدا. چەند کەس لە ڕاپۆرتنووسانی دلێر و بێ پەروای ڕۆژنامە و گۆڤارەکان هەر ئێستا سەرگەرمی لێکۆڵینەوە لە فرۆشتنی کەرەسەی شیمیایی شەڕ لەلایەن «کارلۆس کاردۆئێن»ەوە بە سەددام حوسێن لە ساڵەکانی دەیەی ۱۹۸۰دان کە ئەمریکا پشتیوانیی لێدەکرد.

ئەو بابەتانەی ڕۆژنامە و گۆڤارەکان لەبارەی ئەو حاڵەتانەوە چاپ و بڵاویان کردوونەوە، تاڕادەیەک کاریگەر بوون. ئەنجومەنی نوێنەران و سێنای ئەمریکا، هەردووکیان لەبارەی ئەو ڕووداوانەوە کە لە کتێبی Oktober Surpriseدا باس کراون، لێکۆڵینەوەیەکیان دەست پێکردوە. دیارە سێنای ئەمریکا، دەنگی «نا»ی بە لێکۆڵینەوەی ڕەسمی لەو بارەیەوە دا. بەلام کۆمیتەی پێوەندییەکانی دەرەوەی

سـێنا بڕیـاری دا بـە کـەلکوەرگـرتن لـە بوودجـەی ئاسـایی خـۆی، لێکۆڵینەوەیەک دەربارەی موعامەلـەی کەرەسـەی جـەنگی بـۆ ئـازادیی بارمتـەکان وەڕێ بخـا. هـەروەها ئـەنجومـەنی نوێنـەرانی ئـەمریکاش، بوودجەیـەکی دیـاری کـرد کـە گرووپێـک بـە شـێوەی تـەواووەخت، لەبارەی ئەو بابەتانەوە کە ئـەمن و «سـیک» و کەسـانی دیکە شـیمان کردوونـەوە توێژینـەوە بکـەن. سـەرۆکی ڕاوێژکـارانی ئـەو گرووپـە، دادیاری پێشووی فیدراڵ «لارێنس بارسێلا» E.Lawrence Barcellaیە.

ژوئەنی ساڵی ١٩٩٢، گرووپی ناوبراو وتووێژێکی تـەواویان دەگـەڵ مـن کـرد. ئاگـادار بوومـەوە، کـە پـێش ئـەوەی گرووپـی نـاوبراو بـۆ لێکۆڵینەوەکە پێک بهێنرێ، بەڕواڵەت لـە نێوان حیزبـەکانی کۆمـارخواز و دێموکراتــدا، ڕێککــەوتن کــراوە کــە ئــەو گرووپــە پــێش یەکــەمی ژووئیەی ١٩٩٢، ڕاپۆرتێکی کاتی ئامادە بکا بە خێرایـی جۆرج بووش لـە دەسـتبوون لـەو ڕووداوانـەدا بـە تـەواوی بێبەری بکـا. بۆیـە، ئـەو ڕاپۆرتە کاتییە کە ٣٠ی ژوئەن بەهۆی گرووپی «لـی هـامیلتۆن» Lee Hamilton نوێنەری کۆنگرەوە دەرچوو، تەنیا بە یەک ئاکام گەیشـتبوو: «بـەڕێز بـووش، لـەماوەی نێـوان ١٨ تـا ٢٢ی ئۆکتـۆبردا هـەمووی لـە ئـەمریکا بـووە و کەوایــە بـۆ بەشــداری لــە دیـداری نهێنـی دەگـەڵ کاربەدەستانی ئێران، سەفەری پاریسی نەکردوە.»

ئەگەرچی لەو ڕاپۆرتەدا بە ڕاشکاوی گوترابوو کە گرووپەکە تـەنیا دەگـەڵ ٥٠ کـەس لـەو ١٥٠ شـایەتە کـە لـە پێرسـتی وتووێژلەگـەڵ-کراوەکاندا هاتوە، وتووێژی کردوە و تەنیا بەشێکی چووکی ئەو بەڵگە و سەنەدانەی دەست کەوتوە کە بەدوایاند دەگەڕێ، بەڵام بەو حاڵە بە دڵنیایییەوە جۆرج بووشی لە هەرجۆرە بەشدارییەک لەو عەمەلیاتەدا، بە بێئاگـا زانیبـوو. «لـی هـامیلتۆن» لـە کۆنفرانسـێکی چاپەمەنیدا کـە سەرەتای ژووئیە بۆ ئەو مەبەستە ڕێکخرابوو، گوتی، هـەموو بەڵگە

باوەڕپێکراوەکـان، دەری دەخـەن کـە جـۆرج بـووش لـەو کاتـەدا لـە پاریس نەبووە.

مـانگی ژوئـەنیش ئـەمن لـە بەرامبـەر کۆمیتـەی پێوەندییـەکانی دەرەوەی سـێنادا کـە دەرگاکـانی خـۆی پێـوە دابـوون بـە سوێندخواردنەوە و بە ڕاشکاوی گوتم جۆرج بووشـم لـە کۆنفڕانسـی پـاریس، دیتـوە، بـەڵام هیـوادار نـیم ڕاپـۆرتی کۆمیتـەی پێوەندییـەکانی دەرەوەی سێنا لەو بارەیەوە فەرقێکی دەگەڵ ڕاپۆرتی کـاتیی گرووپـی گۆرین لە ئەنجومەنی نوێنـەران هـەبێ. دیـارە لەوانەیـە زۆر کـەس لـەو ڕووداوەدا سـەریان تێدا بچـێ. بـەڵام وا دیـارە پریزیـدێنت بـووش لـە هـەڵبژاردنی لەمـەودوادا سـەرکەوێ یـان بـدۆڕێ، سـەری خـۆی دەپارێزێ.

ئێستا لـە بریتانیـاش چەنـد کۆمیتـەی ڕەسـمیی لێکۆڵینـەوە لـەبارەی عەمـەلیاتی «ڕابێرت ماکسـوێڵ» دەسـتبەکار بوون. لـە ئوسـتڕالیاش کۆمیسـیۆنێک بـە نـاوی کۆمیسـیۆنی بـەرزی ئوسـتڕالیای خۆرئـاوا لەبارەی ئەو شـتانەوە کـە ئـەمن باسـم کـردوون، لێکۆڵینـەوەی کـردوە. بـەڵام هێشـتا زوویـە پـێش‌بینـی بکـرێ کـە ئـەو لێکۆڵینەوانـە، دەگەنـە هەنگاوی زیاتر و ئاکامێکیان دەبێ یان نا.

زۆر لەو کەسانە کە لـە کتێبەکەمـدا نـاوم بـردوون، تووشـی ئاڵوگـۆڕ هـاتوون. جـۆرج بـووش هێشـتا سـەرکۆماری ئەمریکایـە، بـەڵام پلـەی خۆشەویستییەکەی بە خێرایی لە دابەزینـدایە. چونکـە هـەتا دێ، دۆخـی ئابووریی ئەمریکا دژوارتر دەبێ و خەڵکی ئەمریکا لە موعامەلەی ئـەم وڵاتە دەگەڵ عێراق، زانیاریی تازە بەدەست دێنن. وا دێتە بەر چاو کە سەرکەوتنی لە هەڵبژاردنی دادێی ئەمریکادا کارێکی هاسان نەبێ.

«ڕابێـرت گەیـتس» بـۆ دووەم جـار بـووە کاندیـدای سـەرۆکایەتیی CIA. کاتێـک ئـەمن و خـەڵکی دیکـە لـە کۆتـایی بـەهاری سـاڵی ۱۹۹۱دا، لەبەر دەمی کۆمیتەی پێوەندییەکانی دەرەوەی ئەنجومەنی نوێنـەران و

سێنا و هەروەها کۆمیتەی هەواڵگریی سێنادا کە دەرگاکانی خۆیان پێوە دابوون، شایەتیمان لەسەری دا، پەسندکردنی هەڵبژاردنی بە سەرۆکایەتیی CIA هەتا مانگی ئۆکتۆبری ئەو ساڵە وەدوا کەوت. بەڵام دواتر پاش پشتگیریی سەیروسەمەرەی «کلارێنس تۆماس» Clarence Thomas بە ئەندامەتیی دادگای بەرزی ئەمریکا، کاندیداتۆریی «ڕابێرت گەیتس» بۆ سەرۆکایەتیی CIAش پەسند کرا.

سێناتۆری پێشوو، «جان تاوەر» کتێبێکی لەبارەی ئێران - کۆنتراوە نووسی کە نە شتێکی تازەی تێدا نووسی و نە خەڵکی ئەمریکاش پێشوازییان لێکرد. «جان تاوەر» سەرەتای ساڵی ۱۹۹۱ لە ڕووداوێکی فڕۆکەدا لە ئەیالەتی جۆرجیا کوژرا.

«ڕابێرت مەک فارلین» کە ئێستا وەک هاونیشتمانێکی ئاسایی لە ئەمریکا دەژی، سەرەتای ساڵی ۱۹۹۱، لەلایەن دژی هەواڵگریی FBIیەوە لەسەر پێوەندی دەگەڵ «ڕافی ئەیتان» و ڕێکخراوی هەواڵگریی ئیسرائیل و بەشداری لە ڕەوتی جاسووسیی «یوولارد» کەوتە بەر لێکۆڵینەوە. هەتا ئەمڕۆ هیچکەس لە ئاکامی لێپرسینەوەکانی لەلایەن FBIیەوە ئاگادار نەبووە. بەڵام ئۆکتۆبری ساڵی ۱۹۹۱ «کرێگ ئونگێر» Craig Unger لە وتارێکدا کە لە گۆڤاری Esquire بڵاوی کردەوە، قسەکانی من لەسەر «مەک فارلین»ی پشتڕاست کردنەوە. کرێگ ئونگێر لەو وتارەدا نووسی کە مەک فارلین لە لایەن ڕێکخراوی هەواڵگریی ئیسرائیلەوە بۆ جاسووسی بە قازانجی ئەو وڵاتە بەخزمەت گیراوە و لە ڕەوتی جاسووسیی «یوولارد» بە دژی ئەمریکادا بە ناوی X بەشدار بووە. مەک فارلین لەسەر چاپی ئەو نووسینە گۆڤارەکەی خستە ژێر بەدواداچوونی قانوونی و مەسەلەی ئەو دادخوازییە ئێستاش هەر لەگۆڕێدایە.

بەڵام لەبارەی ئیسرائیلییەکانەوە، سەرەتای ساڵی ۱۹۹۲، شیمۆن پرێز بە هۆی خەنیمە کۆنەکەی، ئیسحاق ڕابینەوە لە ڕێبەریی حیزبی

کرێکار لادرا. ڕۆژی ۲۳ی ژوئەن، حیزبی کرێکار لە هەڵبژاردندا بە جیاوازییەکی زۆر سەر کەوت و «ڕابین» لە جێی شامیری ٧٦ ساڵە بە سەرۆکوەزیری ئیسرائیل هەڵبژێردرا. لادرانی شامیر لە سەرۆک-وەزیریی ئیسرائیل، هیوای ئەمریکایی‌یەکانی بە جێبەجێکردنی بەرنامەی ئاشتیی جۆرج بووش لە خۆرهەڵاتی نێوەڕاستدا زیاتر کرد.

«ڕافی ئەیتان» لە ڕێکخراوی هەواڵگری خانەنشین کرا و هەموو ئەو پووڵانەی ئازاد کرد کە «بسەرمایەی ڕەش» لەبەر دەستی بوون. بەوپەڕی سەرسوڕمان، بەپێی نووسراوی ڕۆژنامەیەکی ئیسرائیلی، ئێستا ئەو کار بۆ ڕێکخراوێکی نێونەتەوەیی دەکا کە بەپێچەوانەی گەمارۆی ئابووریی ئەمریکا، فرۆشتنی نەوتی عێراقی وەئەستۆ گرتوە.

مۆشێ هیبرۆنی ئێستا کار بۆ ڕێکخراوی جوولەکەکان دەکا و «یەهووشو ئاساگی» بە نوێنەری ئەنجومەنی قانووندانانی ئیسرائیل (کنیست) هەڵبژێردراوە. «ئەوی پزنەر» وتەبێژی شامیر بەهۆی چاپەمەنییەوە لەسەر ئەو درۆیانە کە حکوومەتی ئیسرائیل لەبارەی منەوە کردبوونی، کەوتە ژێر گوشار. ئەو ساڵی ١٩٩١ کرا بە سەرۆکی نوێنەرایەتیی ئیسرائیل لە ئیتالیا. «ناچووم ئەدموونی» ساڵی ١٩٨٩ لە سەرۆکایەتیی «مۆساد» لادرا، بەڵام وەک ڕاوێژکاری هەواڵگریی شامیر کاری دەکرد. ئەو ئێستا سەرۆکی ڕێکخراوێکی پێوەندیدار بە سوودی هەمووانییەوە، لە ئیسرائیلە. دۆستە ئێرانییەکەم؛ سەید مەهدیی کاشانی، ساڵی ١٩٩٣ [٢٩]خۆی بۆ نوێنەرایەتیی مەجلیسی ئیسلامی کاندید کرد. بەڵام دوو ڕۆژ پێش هەڵبژاردن بۆمبیان لە ترومبێلەکەیدا دانا و کوژرا. سەرهەنگ

---

[٢٩]-ساڵی ١٩٩٣ هیچ هەڵبژاردنێک لە ئێران نەکراوە. دەکرێ ١٩٩٢ بێ. (وەرگێڕ)

موحەممەدی جەلالی ئێستا خانەنشین بووە و لە ئێران دەژی. ئەو خانوویەکیشی لە لەندەن هەیە.

لە عێراق پریزیدێنت سەددام حوسێن لە ئوتی ساڵی ١٩٩٠دا بە شەوێک لە کەسایەتییەکی خۆشەویستی ئەمریکاوە بوو بە پیاوێکی شێت و شەیتانسروشت. لە مانگەکانی ژانویە و فێوریەی ساڵی ١٩٩١دا وڵاتەکەی کەوتە بەر توندترین بۆمبارانی هەوایی کە لە دووەم شەڕی جیهانییەوە نموونەی نەبووە. ڕاپۆرتە پێوەندیدارەکان نیشان دەدەن کە لە ئاکامی شەڕی کەنداوی فارسدا ١٠٠٠٠٠ عێراقی کوژراون، بەڵام سەددام حوسێن هێشتا لە دەسەڵاتدایە.

وڵاتی شێواوی شووڕەوی ئێستا ئاڵوگۆڕی سەرسوڕهێنی بەخۆیەوە دیوە. هاوینی ساڵی ١٩٩١ میخائیل گۆرباچۆف گیانی سلامەتی لەو کۆدەتایە دەربرد کە لە دژی ڕێکخرابوو. بەڵام پاشتر ناچار بە کشانەوە لە دەسەڵات کرا. وڵاتی یەکیەتیی کۆمارەکانی شووڕەوی بوو بە چەند دەوڵەتی جیاجیا و ڕێکخراوی KGB دەسەڵاتی خۆی لەدەست دا. یەکێک لە سەرۆکانی پێشووی KGB ڤیکتۆر چبریکۆف، کە یارمەتیی ئێمەی دابوو بۆ ئەوەی دارایی «سەرمایەی ڕەش» بگوازینەوە بانکەکانی بلووکی خۆرئاوا، ئێستا کارەکەی لەدەست داوە و بە بێدەنگی وەک هاونیشتمانێکی ئاسایی لە شووڕەوی دەژی.

لە وڵاتی پێروو، «ئالبێرتۆ فووجیمۆری» Alberto Fujimori سەرەتای ساڵی ١٩٩٢، پتر بۆ خەبات دژی «ڕێگای درەوشاوە» قانوونی بنەڕەتیی پێرووی هەڵوەشاندەوە. ئەم کارەی فووجیمۆری، لە لایەن ناوەندە جۆراوجۆرە جیهانییەکانەوە مەحکووم کرا. سەرەتای سێپتامبری ١٩٩٢، لە لیما ڕاگەیەندرا کە «ئابیمائیل گووزمەن» و گرووپێکی دیکە لە ڕێبەرانی «ڕێگای درەوشاوە» گیراون. ئێستا

دەبێ بزانین ئەم کارە پێشی هەڵدانی خێرای دەسەلاتی بزووتنەوەی «ڕێگای درەوشاوە» دەگرێ یان نا.

کارلۆس کاردۆئێن هێشتا ڕێبەریی پیشەسازییەکەی دەکا. پاش ئەوەی هێندێک لە ڕۆژنامەکان داستانی تێکەلاویی ئەو دەگەڵ عێراقیان چاپ و بلاو کردەوە، ڕێکخراوی خزمەتە گومرکییەکانی ئەمریکا لە ئاوریلی ساڵی ١٩٩٢دا، هێندێ لێکۆڵینەوەی لەبارەی چالاکییەکانیەوە دەست پێکرد و دۆسیەیەکی بەدژی ئەو لە مەیامی ڕێکخست. ساڵی ١٩٨٩، کارخانەکەی وی لە پاراگوا بەهۆی پشتیوانیی پریزیدێنت «ئاندرە ڕۆدریگێز»ەوە دانەخرا. «ئاندرە ڕۆدریگێز» هێشتا لە سایەی سەری ئەمریکاوە درێژە بە حکوومەتی خۆی لە پاراگوا دەدا.

چەند کەس لەو ئوستڕالیاییانە کە ئەمن چالاکییەکانیانم باس کردوە، دەگەڵ هێندێ گیروگرفت بەرەوڕوو بوون. دیسامبری ساڵی ١٩٩١ سەرۆکوەزیری ئەم ولاتە «باپ هاک» Bob Hawke، لە کۆبوونەوەیەکی حیزبیدا شکستی هێنا و ناچار بوو لە پۆستی سەرۆکوەزیری بکشێتەوە. پاش کشانەوەی ئەو «پاوڵ کیتینگ» Paul Keating، لە جێگەی دانرا. بۆ چەند ساڵ کیتینگ بە جێنشینی سروشتیی هاک دەژمێردرا، بەلام هاک دواتر لەسەر کاتی کشانەوەی خۆی ناکۆکیی دەگەڵ کیتینگ لێ پەیدا بوو. «بریان بوورک» Brian Burkeسەرۆکوەزیری ئوستڕالیای خۆرئاوا کە ئێمە لە مەڵبەندی داوەریی ئەودا ڕێگامان درابوو فڕۆکەکەمان ڕابگرین، ناچار بە کشانەوە کرا و لە لایەن کۆمیسیۆنی بەرزەوە خرایە بەر لێپرسینەوەی درێژخایەن و «ئالێن باند» سەوداگەری دەوڵەمەندی ئوستڕالییی کە لە عەمەلیاتی کارلۆس کاردۆئێن لە شیلی و عێراقدا تێوە گلابوو، لە مانگی مای ساڵی ١٩٩٢دا بە تۆمەتی کلاولەسەرنان لە بانک حوکم درا. ئەو دوو ساڵ و نیو زیندانی بۆ بڕایەوە و ئێستا

لە زیندان دەورانی مەحکوومییەکەی دەگوزەرێنێ. بەڵام دیارە داوای پێداچوونەوەی حوکمی دادگای کردوە.

بابەتگەلێک کە لە چاپەمەنیی بریتانیادا بڵاو بوونەوە، ڕێز و ئیعتیباری «ڕابێرت ماکسوێڵ» و «نیکۆلا دێڤیس»یان کە ئەمن لە لەندەن هاوکاریی نزیکم دەگەڵیان هەبوو، لەنێو برد. کتێبی سەیموور هێرش کە ئۆکتۆبری ساڵی ١٩٩١ بڵاو بۆوە و ڕابێرت ماکسوێڵی بە پیاوی ڕێکخراوی هەواڵگریی ئیسرائیل ناو برد، سەرەتای کۆتایی بوو. ماکسوێڵ و گرووپی ڕۆژنامەی Mirror «هێرش»یان خستە ژێر بەدواداگەڕانی قانوونی و ڕۆژنامەی Daily Mirror نووسینێکی بەربڵاوی چاپ کرد و ئەو تۆمەتانەی ڕەت کردنەوە کە لە ڕابێرت ماکسوێڵ و نیکۆلا دێڤیس درابوون. (دێڤیسیش شکایەتی لە هێرش کرد، بەڵام وەدوای نەکەوت.) دەکرێ بڵێین دەسبەجێ پاش ئەوەی Mirror نووسینی گۆڕینی لە دژی «هێرش» بڵاو کردەوە، ڕاستیی هێندێک لەو بابەتانە کە ڕۆژنامەی ناوبراو حاشای لێکردبوون، ڕوون بۆوە و «هێرش» و بڵاوکەرەوەکانی کتێبەکەی، لە بەرامبەردا بە دژی ماکسوێڵ، دێڤیس و گرووپی Mirror شکایەتیان کرد. بەڵام، ڕاست لە جەرگەی کردەوە و دژکردەوەی شکایەتی هەریەک لەم دوو گرووپە بەدژی یەکتردا، ڕۆژی ٥ی نۆڤامبر تەرمی بێگیانی ماکسوێڵ لە لێواری دورگەکانی «قەناری» دۆزرایەوە و بوو بە هۆی هەڵلایەکی نێونەتەوەیی. تەرمی ماکسوێڵ پاش دۆزرانەوەی لە ئیسپانیا توێکاری (کالبدشکافی) کرا و هۆی مردنەکەی بە ڕووداوی هاتوچۆ ڕاگەیەندرا. دوایە تەرمەکەی جارێکی دیکە لە ئیسرائیل توێکاری کرا و هۆی مردنەکەی کوژران ڕاگەیەندرا. بەپێی قانوون و ڕێوشوێنەکانی بریتانیا، شکایەتی ماکسوێڵ بە مردنەکەی ئارشیف کرا و مانگی ژووئیە دادگا شکایەتی گرووپی Mirrorیشی بە نەبوو دانا. گرووپی Mirror بە بڕیاری دادگا ناڕازی بوون و داوای

پێداچوونەوەیان کرد. ئەو شکایەتانەی بەدژی گرووپی Mirror کراون ئێستاش هەر لەجێی خۆیانن.

پاش بەخاکسپاردنی «ماکسوێڵ» لە «مۆنت ئۆلیڤێر»ی ئیسرائیل، ئیمپەراتۆرییە چاپەمەنییەکەی لەبەر یەک چوو. چاپەمەنیی بریتانیا ئەویان وەک هەبوو، ناسی – پیاوێکی ناڕاست و کڵاوچی کە بە ملیارد دۆلاری لە مووچەی خانەنشینیی ئیشکەرانی خۆی دزی. هێندێ باسی بەردرێژیش دەربارەی پێوەندییەکانی دەگەڵ ڕێکخراوە هەواڵگرییەکان و کۆمیتە پارلمانییەکانی ئیسرائیل، بولغارستان، شووڕەوی و بریتانیا لەژێر لێکۆڵینەوەدان. لە ئەمریکاش چەند لیژنە لەلایەن کۆنگرەوە خەریکی لێکۆڵینەوەی چالاکییەکانی وین. دوو کوڕی ماکسوێڵ بە ناوەکانی «کوین» و «یان» کە بوونە میراتگری ئیمپەراتۆرییە تێکشکاوەکەی، مانگی ژوئەنی ۱۹۹۱، بە تۆمەتی کڵاولەسەرنان لە لەندەن گیران.

نیکۆلا دیڤیس سەرنووسەری دەرەکیی Daily Mirror لەلایەن سە یمووور هێرش و چەند بڵاوکراوەی بریتانیاییەوە، بە جاسووسی ئیسرائیل و سەوداگەری شەڕ ناو برا. دیڤیس بە تەواوی حاشای لەو تۆمەتانە کرد کە درابوونە پاڵی، بەڵام ئەو کاتەی بەشێک لە درۆیەکانی لەسەر ساغ بوونەوە، سەرەتای نۆڤامبر لە Mirror دەرکرا. ژوئەنی ساڵی ۱۹۹۲، ئەو کتێبێکی لەبارەی شازادە دیاناوە بڵاو کردەوە، بەڵام لە بەرامبەر کتێبێکدا کە کەموزۆر هەر لەوکاتەدا لەلایەن «ئەندروو مۆرتۆن» Andrew Morto ەوە دەربارەی ئەو بابەتە بڵاو بۆوە، سەرکەوتنێکی بەدەست نەهێنا. دەڵێن ئێستا خەریکی نووسینی کتێبێکە بەناوی «ڕابێرت ماکسوێلی ڕاستەقینە». ڕێکخراوەکانی دژی کڵاوچیەتیی MI5ی پۆلیسی سکاتلەندیارد و ماڵیاتەکان، خەریکی لێکۆڵینەوە لە کاروباری «نیکۆلا دیڤیس»ن.

بەڵام لەبارەی خۆمەوە، پاش ئەوەی لە دادگا بێگوناح دەرچووم، زوو لـە نۆڤـامبری ١٩٩٠دا، ئاپارتمـانێکم لـە شـاری «لێگزینگتـۆن» Lexinbtonـای ئەیالـەتی کێنتـاکی بـەکرێ گـرت. چونکـە نیگـەرانی گیـانی خۆم بووم، ئەو دۆستانەی لـەو شـارەم هـەن و پلەوپایـەی بـەرزیان هەیە، ئەمنیەتی منیان گرتە ئەستۆ. (ئـەم کەسـانە چەنـدین سـاڵ لـەوە پێش لە موعامەلەی کەرەسەی شەڕدا دەگەڵ ئیسرائیلییەکان شـەریک بوون) ئەمن تـا نێوەڕاستی ئـاوریلی ١٩٩١ لـەو شـارە ژیـام. دوایـە بـە پاسـپۆرتە ئیسـرائیلییەکەم کـە هـەتا سـاڵی ١٩٩٤ کـاری پـێدەکـرێ، چوومە شاری سیدنی لە ئوسترالیا. ئەمن لەو شارە لەو ڕۆژانـەوە کـە خەریکی موعامەلەی کەرەسەی جەنگی بووم، هێندێ دۆسـتم هـەبوون کـە بەشـێکیان لـە ڕابـردوودا پلەوپایـەی بـەرزی دەوڵـەتییان بووبـوو. ئـەوان بـەڵێنیان پـێدام کـە دەتـوانم لـە ئوسـتڕالیا لەپێشـدا پەنابـەریی سیاسـی و لـە کۆتاییـدا هاونیشـتمانەتی وەرگـرم و لـەوێ درێـژە بـە مانەوە بدەم.

لە چەند مانگی دواتردا زۆریان ئۆگری بەمن پەیدا کرد. ئـەمن لەبـەر دەم کۆمیتـەکانی کۆنگرەی ئـەمریکادا شـایەتیم دا و کتێبـی سـەیموور هێرشـیش بـڵاو بـۆوە. لەنـەکاو، ڕۆژی ٢٨ی دیسـامبری ١٩٩١، سـێ ڕۆژ پێش هـاتنی جۆرج بووش بۆ ئوسـتڕالیا بـە مەبەسـتی سـەردانی ئـەم وڵاتـە، کاتێـک لـە سـەفەرێک بۆ ئورووپـا و ئـەمریکا دەگەڕامـەوە، ڤیزایەکەم لـە فڕۆکەخانـەی سیدنی هەڵوەشـایەوە. کاربەدەسـتانی ئـەو بەشە گوتیان ئەتۆ هـەقت هەیـە تـەنیا یـەک مانـگ لـەو وڵاتـە بمێنیـەوە. ئـەم بابەتـە سـەرنجی تایبـەتیی چاپەمـەنیی ئوسـتڕالیای بۆ لای خـۆی ڕاکێشـا. ئـەوان حکوومـەتی ئوسـتڕالیایان تۆمـەتبار کـرد کـە چونکـە بوونی من لە ئوستڕالیا دەبووە هۆی دڵگرانیی سـەرۆکایەتیی کۆمـاری ئەمریکا، بۆیە حکوومەتی ئوستڕالیا تەسلیمی گوشـاری ئـەمریکا بـووە و ڤیزای منـی هەڵوەشـاندۆتەوە. ئـەمن لـە دادگـا شـکایەتم لـە وەزیـری

کۆچی ئوسترالیا کرد. قازیی فیدراڵ «گراهام هیل» Graham Hill دەستووری دا ئەو کەسە وەدۆزرێ کە بەرپرسی هەڵوەشاندنەوەی ڤیزای من بووە و هەموو ئەو بەڵگە و سەنەدانەی بۆ ئەو مەبەستە ئامادە کراون، بۆ ئەو بنێردرێن تا لێیان بکۆڵێتەوە. بەڵام حکوومەتی ئوسترالیا لە جیاتی ئەو کارانە ڤیزاکەی بۆ من گەڕاندەوە و ڕازی بوو خەرجییەکانی من بۆ دادگایەکەش بدا.

لەو بەینەدا، سەرەتای ساڵی ۱۹۹۱، CIA بەهۆی یەکێک لە ڕۆژنامەنووسەکانی خۆیەوە بەناوی «هێربێرت ئالوین ئاسمیت» Herbert Alwyn Asmith پێوەندیی دەگەڵ گرتم. ئەم کەسە بریتانیایی بوو و بە هۆی کڕین و فرۆشتنی کەرەسەی شەڕەوە بە زیندان مەحکووم کرابوو و ئەمن لە زینداندا ئەوم ناسیبوو. «ئاسمیت» پێشنیاری پێکردم بەو مەرجە ئەمن بێدەنگ بم و نامەیەک ئیمزا بکەم کە هیچ داوایەکی قانوونی و هیچ قسەیەکم بە دژی حکوومەتی ئەمریکا نیە، ئەو ڕێکخراوە دوو میلیۆن دۆلارم بداتێ و بمکا بە هاونیشتمانی ئەمریکا. تەنانەت ئیعتیبارنامەیەکی دوو میلیۆن دۆلارییشیان دامێ کە ئەمن کەلکم لێوەرنەگرت.

دوایە لە ماوەی ساڵێکدا، ئاسمیت پێنج کەڕەت لە ئوسترالیا چاوی بەمن کەوت. بە نێوبژیوانیی ئاسمیت قەرار بوو ئەمن لە ئووتی ساڵی ۱۹۹۱دا دەگەڵ دوو کارگوزاری ڕەسمیی CIA و هەر لەو مانگەدا لەگەڵ «ڕابێرت ماکسوێل» لە شووڕەوی دیدارم هەبێ. ئامانجی ئەو دیدارانە ئەوە بوو کە وا بکەن ئەمن کۆنترۆڵی بەشێک لە «سەرمایەی ڕەش» بدەم بە CIA. لەحاڵێکدا ئاسمیت لە ئەنجامی ئەرکەکەیدا سەرکەوتنێکی بەدەست نەهێنا و لەوانەیە زۆر شتیشی دەست کەوتبێ، لە مانگی مارسی ۱۹۹۲دا، ڕاست ۱۰ ڕۆژ پاش گەڕانەوە لە سیدنی کۆچی دوایی کرد. ڕاگەیەندرا کە هۆی مردنەکەی ڕاوەستانی دڵ بووە.

شتێک کە ئەوکاتەی لە نیویۆرک لە دادگا بێتاوان ناسرام، فێری بووم، توانای چاپ و بڵاوکردنەوەی بابەتەکان و ترس و سامێکە کە ئەوانەی دەیانەوێ ڕاستییەکان بشارنەوە لێیان هەیە. بۆیە، لە ژوئەنی ١٩٩١دا، ئەمن گرێبەستێکم دەگەڵ بنکەی بڵاوکردنەوەی Allen and Unwin بۆ نووسینی ئەم کتێبە ئیمزا کرد. وا دیار بوو حکوومەتی ئیسرائیل، لەو باسە ئاگادار بووە و لە ماوەیەکی کورتدا، کەسایەتییەکی ناسراو و پایەبەرزی ئیسرائیلی هاتە سەردانم. ئەم کەسە «ئێهوود ئۆلمەرت» Ehud Olmert وەزیری ئەوکاتی لەشساغی و دۆستی زۆر نزیکی شامیر بوو. ئەو پێشنیاری پێکردم کە ئەگەر واز لە نووسینی ئەم کتێبە بێنم، هاونیشتمانەتیی ئوستڕالیام بۆ وەردەگرێ. (چۆنی وەردەگرت؟ نازانم) و دەستەبەریش دەبێ کە ئیسرائیل کاری بە کاری من نەبێ. بەڵام، ئەمن پێشنیارەکەیم قبووڵ نەکرد.

کەچی، ئەوە تازە سەرەتای کار بوو. پاش ئەوەی لە ساڵی ١٩٩١دا کتێبەکانی گری سیک و سەیموور هێرش بڵاو بوونەوە و هەردووکیان لە کتێبەکانیاندا منیان بە سەرچاوەیەکی گرنگ ناو برد، ڕاگەیەنە گشتییەکان هێرشێکی توند و بەردەوامیان بەدژی من دەست پێکرد. گۆڤاری تایم یەکەمینیان بوو کە لە ژمارەی ٢٨ی ئۆکتۆبری ١٩٩١ی خۆیدا، منی بە درۆزنێکی پیشەیی و دروستکەری داستانگەلی دوور لە ڕاستی ناو برد.

گۆڤاری Newsweek بە هاودەنگیی تەواو دەگەڵ گۆڤاری تایم لە ژمارەی ١٤ی نۆڤامبری ١٩٩١ی خۆیدا، نووسینێکی دوولاپەڕونیویی لەبارەی منەوە چاپ کرد و منی بە «ئیسرائیلییەکی دوورخراوەی نەناسراو» و «وەرگێڕێکی پێشووی حکوومەتی ئیسرائیل» ناو برد. لەحاڵێکدا ئەو گۆڤارە بە نابەدڵی پێی لەوە نا کە بەئاسانی ناتوانرێ قسەکانی من بە نەدیتراو دابنرێن، بەوحاڵە ئاکامی وەرگرت، لە هێندێ

حاڵەتدا کە گوتوومە «پێکەوە ناسازێن». نووسینەکە بە زەحمەتێکی زۆر حاشای لە نەخشی من لە لەقاودانی مەسەلەی ئێران – کۆنتڕادا؛ کرد. بەڵام دیارە ئاماژەی بە شایەتیدانی ڕاجی سەمغئابادی لەکاتی دادپرسیی مندا نەکرد.

حەوتووی دواتر، ڕۆژی ١١ی نۆڤامبر، گۆڤاری نیووزویک دووبارە بابەتەکەی هێنایەوە گۆڕێ و ٧ لاپەڕە لە گۆڤارەکەی خۆی بۆ OktoberSurprize تەرخان کرد و ئەوی بە «پلانی ئازادی بێ-کۆنترۆڵ» ناو برد. دواتر «ستیڤ ئێمێرسۆن» Steve Emerson بە نیازی خەراپەوە لە گۆڤاری New Republic و Wall Street Journalدا هێرشی کردە سەرم. ئەو لە ژمارەی ١٨ی نۆڤامبری ١٩٩١ی نیورێپووبلیکدا منی بە «وەرگێڕێکی پلەنزم» ناو برد و ئیدارەی پێوەندییەکانی دەرەوەی ڕێکخراوی هەواڵگریی سوپای ئیسرائیلی بە «یەکێک لە بێبایەخترین» ڕێکخراوە هەواڵگرییەکانی ئیسرائیل ئەژمار کرد. ئێمێرسۆن لە ژمارەی ٢٧ی نۆڤامبری ١٩٩١ی واڵ ستریت ژۆرناڵدا، منی بە «درۆزنێکی نزم» ناو برد. ئەو بە جیددی داوای لە هێرش کرد کە لەسەر چاپی بابەتەکانی من لە کتێبەکەیدا لەبارەی ئەو سووکایەتییەوە کە بە ماکسوێڵم کردوە و ئەو شتە ناڕەوایانە کە داومنەتە پاڵی، داوای لێبووردن لە بنەماڵەی ماکسوێڵ بکا.

لەو کاتەدا وا دەهاتە بەرچاو کە ماکسوێڵ دەتوانێ بە تەواوی خۆی بپارێزێ و بەرگری لەخۆی بکا. هەروەک چاوەڕوانیش دەکرا، ڕۆژنامەکانی، لە لەندەن، نیۆیۆرک و تەل ئەبیب هێرشی توندیان کردە سەر من.

لە جەرگەی ئەو هەموو هەڵلاوهەنگامە ڕەخنەگرانەیەدا کە بۆ عەیبدارکردنی من بەرز بوونەوە، هێندێ نووسینیش چاپ و بڵاو کرانەوە کە ئیددیعا و قسەکانی منیان پشتڕاست دەکردنەوە. گرنگترینیان نووسراوێک بوو کە بە دوو بەش لە ژمارەکانی ژانویە و

فێوریەی ساڵی ١٩٩٢ی ڕۆژنامەی Davatدا لەلایەن «پازیت ڕاڤینا»وە لەژێر ناوی «ئەتۆ کێی، ئاری بن مۆناشێ»دا لە ئیسرائیل چاپ و بڵاو کرایەوە. نووسەری ئەو وتارە نووسی: «لەو وتووێژانەدا کە دەگەڵ کەسانێکم کردوون کە کاریان دەگەڵ بن مۆناشێ کردوە، ئەم نوکتەیە چەند جار پشتڕاست بۆوە کە ئەو دەستی بە کاروباری زۆر هەستیاری هەواڵگری ڕاگەیشتوە.» و ڕاست لە کاتێکدا ئەم کتێبە بۆ چاپ ئامادە دەکرا، ڕۆژی ٧ی ژانویەی ١٩٩٢ بڵاوکراوەی The Village Voice نووسینێکی بەهۆی «کرێگ ئاونگەر»ەوە چاپ و بڵاو کردەوە. ئەو لە زمانی دۆست و هاوکاری پێشووم، «مۆشێ هیبرۆنی»یەوە نووسیبووی: «بن مۆناشێ، ڕاستەوخۆ لەژێر چاوەدێریی مندا خزمەتی دەکرد. ئەو بۆ بەشی دەرەوەی ئیدارەی پێوەندییە دەرەکییەکان کاری دەکرد و دەستی بە کاروباری زۆرزۆر هەستیاری هەواڵگری ڕادەگەیشت.»

بێجگە لەو هێرشانە کە ڕاگەیەنە گشتییەکان کردیاننە سەر من، کەسانێکی دیکەش پێوەندییان پێوە گرتم و بە شێوەیەکی میهرەبانانە، هەوڵیان دا، من لە نووسینی ئەم کتێبە بگێڕنەوە. بۆ نموونە، یەکێک لە دۆستانی پێشووم کە لە «مۆساد» کاری دەکرد، دیسامبری ١٩٩١ بە ڕێکەوت لە لەندەن دەگەڵم بەرەوڕوو بوو و گوتی، چەند باش بوو کە دوای ئەو هەموو ساڵە دەتبینمەوە. ئەگەرچی، ئەمن لەبارەی ئەم کتێبەوە هیچ قسەم بۆ نەکردبوو، دوو ڕۆژ دواتر تەلەفونی بۆ کردم و لەبارەی چوونەپێشی کتێبەکەوە پرسیاری کرد. دوایە گوتی: «ئاری، بەڵام هەر کارێک دەکەی، وڵاتەکەتت لەبیر نەچێ. هەر کارێکت کردوە و هەر قوربانییەکی لەوڕەوتەدا دراوە، هەمووی بۆ ئیسرائیل بووە.»

پرسیم: «مەبەستت ئەوەیە کە ئەمن قوربانیم داوە؟»

وەڵامی دایەوە: «تەنیا ئێمەت لەبیر بێ. ئەمە تەنیا شتە کە لە تۆمان دەوێ. کاروبار و بابەتی دیکەش هەن کە نابێ قسەیان لەبارەوە بکرێ...»

هەوڵی قورستریش بۆ پێشگیری لە چاپ و بڵاوبوونەوەی ئەم کتێبە درا. ئەو نووسەرانەی لە ئوستڕالیا، بۆ نووسینی ئەم کتێبە کاریان دەگەڵ دەکردم، چەند جار هەڕەشەی کوشتنیان لێکرا. بڵاوکەرەوەیەکی ئەمریکایی کە بۆ چاپ و بڵاوکردنەوەی ئەم کتێبە موعامەلەم دەگەڵ کردبوو، لە ئەنجامی کارەکە کشایەوە. بڵاوکەرەوەیەکی بریتانیایی کە ئامادە بوو ئەم کتێبە چاپ و بڵاو بکاتەوە، لەدوا ساتەکاندا پەژیوان بۆوە. بەخۆشییەوە Sheridan Sqaure Pryss لە نیۆیۆرک و Allen andunwin لە سیدنی، گوێیان نەدایە ئەو هەڕەشانە کە لەدژیان کرابوون و ئەم کتێبەیان چاپ و بڵاو کردەوە.

ئەدی دارایی «سەرمایەی ڕەش» چیی بەسەر هات؟ دارایی ئیسرائیل لە «سەرمایەی ڕەش» دەوری ٧٨٠ ملیۆن دۆلار (بە سوودەوە) و دارایی ڕێکخراوی CIAی ئەمریکاش ٧٨٠ ملیۆن دۆلاری دیکە (بە سوودەوە) بوو. بۆ سیاسەتمەدارێکی زیرەک، یان کارگوزارێکی هەواڵگریی نهێنی، ئەمە بڕێکی یەکجار زۆرە و بەتایبەتی چونکە ئەمە وەک دارایی بەرنامە بوودجەیی‌یەکان، خەرجەکەی وەبەر هیچ ڕێسایەک ناکەوێ و دەکرێ بەبێ هەر جۆرە بەرپرسیارییەک خەرج بکرێ.

ساڵی ١٩٩١، دەوری ٨٠ ملیۆن دۆلار لە دارایی «سەرمایەی ڕەش»ی ئیسرائیل کە لە بانکەکانی ئوستڕالیا دانرابوو، گوازرایەوە بۆ وڵاتانی پێشووی بلووکی خۆرهەڵات، ١٠٠ ملیۆن دۆلاری دیکەش، لە حیسابەکانی بانکەکانی وڵاتانی ئورووپای خۆرهەڵات هەڵگیرا و درا بە حیزبێکی سیاسیی ئیسرائیلی (نە حیزبی لیکوود و نە حیزبی

کرێکار) کە پشتیوانی ئاشتی دەگەڵ فەلەستینییەکان بوو. پاشماوەی پووڵی ئیسرائیلییەکان (کە دەوروبەری ٦٠٠ میلیۆن دۆلارە) بێئەوەی ئامانج و بەرنامەیەک بۆ کەلکلێوەرگرتنی لەبەر چاو بگیرێ، بە بانکەکانی سەرانسەری دنیا سپێردرا.

بەڵام دارایی «سەرمایەی ڕەش»ی ڕێکخراوی CIAی ئەمریکا. لە ئووتی ساڵی ١٩٩١دا ئێمە ڕێک کەوتین کە کۆنترۆڵی وی بە «ڕابێرت ماکسوێل» بسپێرین و ئەویش بەنۆرەی خۆی قەرار بوو بیداتەوە ئەمریکایییەکان، بەڵام ئەو پاش وەرگرتنی دراوەکە، خۆی لە ئەنجامی ئەو کارە دزیەوە.

ئەمڕۆ، ئەمن پیاوێکی تەنیام. دوای ئەوەی ڕەوتی دادپرسییەکەم کۆتایی هات، لە وڵاتی کۆماری «دومینیکەن» دەمەویست «ئۆرا»ی هاوسەرم تەڵاق بدەم، بەڵام چەند مانگ دواتر ئاگادار بوومەوە کە ئەو پێشتر لە ئیسرائیل منی تەڵاق داوە. لە ئۆکتۆبری ساڵی ١٩٨٩وە «شیرا»ی کچمم نەدیوە. ئەمن ئێستا سەربە هیچ وڵاتێک نیم، خەڵکی هیچ وڵاتێک نیم. ئەمن خەڵکی دنیام، خەڵکی هیچ کوێ.

کاتێک ئاوڕ لە ڕابردوو دەدەمەوە، دەتوانم بڵێم ساڵەکانی دەیەی ١٩٨٠ ساڵانێکی بەدنیهاد بوون کە کەمترین نیشانەیان لە بایەخە ئینسانییەکان تێدا بەدی دەکرا. ئەگەرچی لە قووڵایی دڵمەوە بۆ ئەو ڕەنج و ئازارانە بەداخم کە تووشی ئێرانییەکان بوون، بەوحاڵە دەزانم، کاتێک پێ لەوە دەنێم کە لەو نەخشەی لەو ڕووداوەی ئێراندا هەمبووە، خەفەت دەخۆم، کارێکی لەڕادەبەدەر سادە ئەنجام دەدەم. ئەمن هەروەها خەفەت دەخۆم کە ئیسرائیل درێژەی بە پەرەپێدانی بەرنامە ئەتۆمییەکەی دا و ئێمە نەمانتوانی دەستمان بە ئاشتی دەگەڵ فەلەستینییەکان ڕابگا.

بەڵام، لەوە کە ئەزموونەکانم، توانایان پێدام لە نزیکەوە بە چاوی خۆم ببینم ڕێکخراوە هەواڵگرییەکان، پتر لە ڕادەی بیرکردنەوە،

دەسەڵاتیان بەسەر سیاسەتی دەرەوەی وڵاتانی وەک ئەمریکا و ئیسرائیلدا دەڕوا، هیچ بەداخ نیم. لەحاڵێکدا وەختێک ڕێکخراوە هەواڵگرییەکان ئەرکیان ئەوە بوو لە گرتنی بڕیارە سیاسییەکاندا یارمەتیی ڕێبەران بدەن، ئەمڕۆ عەمەلیاتی شاراوەی ڕێکخراوە هەواڵگرییەکان و سیاسەتەکانی دەرەوە دەگەڵ یەکتر تێکهەڵشێلراون و لێک جیا ناکرێنەوە. ئامرازە نهێنییەکانی کۆکردنەوەی پووڵی «سەرمایەی ڕەش»، عەمەلیاتی شاراوە و بڵاوکردنەوەی درۆودەلەسە و سیاسەتبازیی فێڵ و فریو، لە دنیای سیاسەتدا ئەوەندە پەرەیان گرتوە کە نێوەرۆکی سیاسەت و کاروباری سیاسییان بەتەواوی گۆڕیوە. لەبەر ئەو هۆیانە، ئەمڕۆ کۆمەڵە کەسێکی کەم، کە هیچ کەس بۆ کاروباری هەمووانی هەڵینەبژاردوون و دەسەڵاتی پێ نەسپاردوون، دەتوانن سیاسەتی وڵاتی خۆیان بێننە ژێر چۆکی خۆیان.

هاوکارانی پێشووی منیش، سەوداگەرانی ئەو کەرەسە جەنگییانە کە ئەمن ئەو هەموو کڕین و فرۆشتنەم دەگەڵیان هەبوو، ئێستاش درێژە بە پیشەکەیان دەدەن و تەنانەت لە هەلومەرجی نەگونجاویشدا حازر نین، دەست لە بازرگانییە پڕسوودەکەیان هەڵگرن. ئەگەر هێندێ وەخت شەڕی گەورەگەورە لە ئارادا نەبن، هەمیشە وردەشەڕ لە گۆشەوکەناری دنیادا هەن. ڕووداوگەلی وەک ئەوەی لە ئورووپای خۆرهەڵات — لە یۆگۆسلاوی و لە کۆمارەکانی پێشووی شووڕەوی — دەگوزەرێن دەرفەتی کاری بەسوود بۆ ئەوان پێکدێنن. هەرئێستا کە لێرە دانیشتووم، دەتوانم بێنمە بەر چاوم کە ئەوان لە دەوری مێزەکانیان دانیشتوون و چاوەڕێی ڕووداوگەلی گەورە گەورەن کە برەو بە بازاڕەکەیان ببەخشن، ڕاست وەک ئەوەکەی ئێران و عێراق. ڕەنگە لە هیندوستان و پاکستان گیانی خەڵکێکی زۆر بێ جووڵاندنی سۆزی ئینسانی بۆ ماوەیەکی درێژ ببنە قوربانی و لە خۆرئاوا هیچ-

کەس گوێ بەوە نادا کە چکەسێک دەبێتە قوربانی. کانەکانی ژێر هەمیشە دەبێ لە ناکۆکییە شەڕخوڵقێنەکاندا بدۆزیەوە.

ئەمن ئێستا بوومە پیاوێکی بێفیزتر لە ساڵەکانی دەیەی ۱۹۷۰ کە لە ڕێکخراوی هەوالگریی ئیسرائیل دامەزرام. ئەمڕۆ ئەو ڕاستییە تاڵە فێر بووم کە هەموو کەس لەم جیهانەدا بەهەڵە دەچێ و هێندێک هەڵە ئەوەندە گەورەن کە قەرەبوو ناکرێنەوە. ئەمن هەروا بۆچوونم بەرامبەر بە ئیسرائیل و جوولەکەکان گۆڕاوە. ئەوکاتەی گەنج بووم، دەگەڵ هەستی ناسیۆنالیستیی زۆر لە ئیسرائیلییەکان هەستی هاودڵی و یەکیەتیم هەبوو. ئەمن ئەوکات ئەو باوەڕە خۆبینانە و خۆپەرستانەیەم هەبوو کە ئێمە دوور لە هەڵەین، بەڵام هەموو کەسی دیکە لە هەڵەدایە. ئەمن باوەڕم بەوە هەبوو کە لەپێشدا دەبێ ئیسرائیل و جوولەکەکان بمێنن و پاشان خەڵکی دیکە. ئەمن ئەو کات باوەڕم بەوە هەبوو -هەروەک ئینجیل دەڵێ- ئیسرائیلی و جوولەکەکان نەتەوەی هەڵبژێردراوی خودان.

دیارە ئەمن ئێستاش باوەڕم وایە کە جوولەکەکان نەتەوەی هەڵبژێردراوی خودان. بەڵام، ئیدی پابەندی ئەو باوەڕە نیم کە بناخەی موعامەلەی کەرەسەی شەڕ دەگەڵ ئێرانییەکانی لەسەر دانرابوو. ئەو باوەڕە ئەوە بوو کە «باشترە لاوانی ئەوان لەجیاتی لاوانی ئێمە بکوژرێن.» بنیادەمەکان هەموو ئینسانن، هەموومان هەڵبژێردراوی خواین.

وەرگێڕ:

خوێندنەوەی ئەم کتێبە سەرەڕای ئەوەی کۆمەڵە زانیارییەکی بەنرخ و کەمباسکراو لە بارەی بڕگەیەکی گرنگی مێژووی خۆرهەڵاتی نێوەڕاستەوە دەدا بە خوێنەر، پەنجەرەیەکیشی بەرەو دنیای پڕڕەمزوڕازی دەزگا هەواڵگرییەکان بەڕوودا دەکاتەوە و دەیباتە عالەمێک کە نە بەزەیی دەناسێ، نە وەفا و نە شتێک بە ناوی ئەخلاق. ئەوەی لەوێدا زاڵە تەنیا قازانج و دەسەڵاتپاراستنە و لەو نێوەدا ئەگەر گەلان و مرۆڤەکانیش ببنە قوربانی کەس مچوڕکی پێدا نایە.

"دەبا خوێن بێ و سەران بەرێ چەرخی کارگەیان بگەڕێ
پێدەکەنن، پێدەکەنن بە بڵێسەی ئاوری شەڕێ"

«هێمن»

چاپی دووەم

٢٠٢١